الدار العربية للعلوم ناشرون
Arab Scientific Publishers, Inc.

# بە دەم ڕێگاوە گوڵچنین

## قوتابخانەکانی ڕۆژنامەوانیی کوردی و سەردەمی قەڵەم و موراجعات

نەوشیروان مستەفا ئەمین

کتێبی دووەم
بەرگی دووەم

# بەدەم ڕێگاوە گوڵچنین؛
# قوتابخانەکانی ڕۆژنامەوانیی کوردی و سەردەمی قەڵەم و موراجعات

## کتێبی دوەم- بەرگی دوەم

نەوشیروان مستەفا ئەمین

# بەدەم رێگاوە گوڵچنین؛
# قوتابخانەکانی رۆژنامەوانیی کوردی و
# سەردەمی قەڵەم و موراجعات

کتێبی دوەم- بەرگی دوەم



# ناوەرۆک

## بەشی یەکەم:

# ژیان: بە تەمەنترین رۆژنامەی کوردی

## بەشی دوەم:

# سەردەمی قەڵەم و موراجەعات

## بەشی سێیەم:
# بابەتی رۆژنامەوانی

# بەشی یەکەم*

# ژیان:

# بە تەمەنترین رۆژنامەی کوردی

1938 - 1926

* ئەم بەشەی ئەم کتێبە پێشتر، ساڵی (2002) بەم ناونیشانە: (ژیان: بە تەمەنترین رۆژنامەی کوردی 1926 - 1938) بە کتێبێکی سەربەخۆ چاپ و بڵاو کراوەتەوە.

# رۆژنامەی ژیان

ژ 1 ی (ژیانەوە) کە لە 18 ی ئاغستۆس (ئـاب)ی 1924 دا لـە سـلێمانی دەرچـوە، لـە ژێـر ناوەکـەی‌دا بەمجۆرە خۆی بە ناسین داوە: "ئەم غەزەتەیە غەزەتەیەکی حکومەتیە هەفتەی جارێک دەردەچـێ"، بـەڵام لـە ژ 20 بە دواوە گۆڕیویێتی بە: "ئەم غەزەتەیە غەزەتەیەکی سیاسی، ئەدەبی، ئیجتیماعی‌یە، هەفتەی جارێک دەردەچێ"

ژ 1 ی (ژیان) کە لە 21 ی کانونی دوەمی 1926 دا لە سلێمانی، راستەوخۆ دوای راگرتنی (ژیانـەوە) و وەکو درێژەکێشانی ئەو، دەرچـوە. بـە هـەمان پێناسـەی ژیانـەوە خـۆی بـە ناسـین داوە: "ئـەم غەزەتەیـە غەزەتەیەکی سیاسی، ئەدەبی، ئیجتیماعی‌یە، هەفتەی جارێک دەردەچێ" بـەڵام لـە ژ 63 ی سـاڵی 2 بـە دواوە گۆڕیویێتی بەمە: "هەمو شتێک ئەنوسێ، هەفتەی جارێک دەرئەچێ، غەزەتەیەکی کوردیە"

لە هەمو ژمارەکانی دا رۆژی بڵاوبونەوەی یەکەم ژمارەی دوبارە کردۆتەوە: (تـاریخی ئینتیشـار 21 ی کانونی سانی 1926 سلێمانی)

## 1. قۆناغەکانی دەرچونی

ژیان لە 21 ی کانونی سانی 1926 دا لە سلێمانی بەم سەروتارە دەستی بە دەرچون کردوە:

"مەعلومە کە لیوای سلێمانی مەعروزی ئەو ئینقیلابە بو کە دیمان و لە حەقیقەت دا مەحکومی مەحو بـو. غەزەتە مەحبوبەکەشمان هەروەها توشی ئەو تەئسـیراتە هـات، رونـاکی نـەما بـو، تاریـک مـابوەوە. نیهایـەت شــەفەقەتی حــامی موعــەزەم بــە دوایــی هێنــانی ئــەو فەلاکەتــە، ئێمــەی ژیانــدەوە و نــوری غەزەتەکــەمان هەڵگیرسایەوە. بۆ ئەوەی ئەم حاڵە تەسویر بکا ناوی نرا (ژیانـەوە). (ژیانـەوە) هـەتا مـودەتێکی موناسـیب فەلاکەتی رابوردوی بە ئاوازێکی حەزین و بە ئادابێ کە دڵ بتوێنێتەوە، ئەی دا بە گوێ و ئەیخستە بـەرچاوی خوێندەواران. بەو نەوعە دەرسێکی عیبرەتی ئەدا.

"دیسان هەر لەبەر ئەوەی موقەدەرات و ئیستیقبالمان ساغ نەبوبوەوە، دەورەی ژیانەوەش بۆ ئێمە ئەبو بە بەرزەخێکی ژین و مردنی وەها، غەزەتەکەمان کە میسالێکی ئەم وەتەنەیە، یاخو سینەمایەکە کـە موقـەدەرات و مەوجودیەتمان پەردە پەردە نیشان ئەدا، سورەتی حەقیقیەی پێ دەرنەئەخرا و حەقیقەت مەغدور بو".

[ ژیان ] صحیفه ۱

هر ... تعلق مخابرات بناوی
... ەوە اکری

اعلانات

بەهر ... ٦ انه دەسینریت

# ژیان

ابونه
بە ۲ مانگ روپیه و نیویك
بە شش مانگ ۳ روپیه
بە سالیکی شش روپیه یە
لە ۳ مانگ کمتر ابونه قید ناکری

مانیع انتشار
۷ کانون ثانی ۱۹۲٦ سالیان
صحفەی بە آنەیکه

ام غزتەیە غزتەیکی سیاسی ، ادبی ، اجتماعی یە
هفتة جار یك دردەچی

بو دروەوە بدل ابونه
... روپیه و نیوه
نسخەی بە آنەیکه

سال ۱ ژمارە ۱ (پنجشنبه) ٥ رجب ۱۳٤٤ ۲۱ کانون ثانی ۱۹۲٦

## ناوی تازەی غزتەکان

معلومه کە لوای سلیمانی معروض او انقلابە بو کە دیمان و لە حقیقتدا محکوم محو بو . غزتە محبوبەکیشیان هر وها نوشی او تاثیراتی هات ، روناکی نمابو . تاریك مابووە نهایت شفقت حامی معظم بە دوابی هینان او تلافاتە ، اعادەی ژیاندەوە و نور غزتەکانیشیان هاکیرسایەوە .
اوه ام حالە تصویر بکا او نرا ژیانەوە . ژیانەوە هتا مدتیکی مناسب فلاکت رابوردوی بە آوازیکی ... بە ادای کە دل بتوینیتەوە ایدا بە گوی رای خستە برچاوی خویندەواران بو نوعە دوسیکی مرقی ادا .
ژیان هرله راوە مقدرات و استقبالمان ساغ نەبووە . دورە ژیانەوەش بو ایە ابو بە برزخیکی ژین و مردن ، ها غزتەکان کە مثالیکی ام وطنەیە باخو سیمابیکە کە مقدرات وموجودیتمان پردە پردە نیشان ادا صورت حقیقیە بی هونە اخر او حقیقت مقدور بو .
پیام خیر کە مژدەدانەوە وطنە خوشەویستەکانی گیاند روحیکی تازە دا و سعادتیکی ابدی بخشی بومان .
بو مناسبتەوە غزتە ژیانەوەش کرتە هوەییکی تازە و کشاوە . ... بوو و ژیانمان تمثیل ، ارشاد بکا
ناوی نرا « ژیان » تنها لە ناوی پیشوی بەلا بردنی دو (ە) و (و) یك دوایەوە . انجا امید کورەمان هیە کە لەمودوا ام غزتە خوشەویستەمان نائل معاونت هەمو لایك بی و مقالات فائدەدار کە مناسبتی بی بە ژیانمان و بە پیشکوتن و سعادتمان بو ام غزتەیە بنیرن .
ایتر خوای تعالی « ژیان » مان مبارك و مسعود بفرمویت .

---

## بو خذمت خویندەوار و نی کیشتو و برادران وطن

ای برایینه : هەموتان ئەیزانن لە پاش فلاکت و دیتن مصیبت زور گەورە گەورە گیشتوینە ئەم دەورەیە کە وا بە بەر چاوەوە نشانەی سعادت واقبال لی دەرکەوتوە . خوا لیمان مبارك بفرمویت .
دو سال لەو پیشیان زور چاك لە بر چاوە کە شەو و روژ استراحت مادی ومعنوی نمابو ام عالمە کوتبوە حال و درجەییکی واوە کە دست لە حیات و ثروت برابو ، شووا بو . ئەمەیش هر سببی هنی بدبین ، بدخواه ملك و ملت بو نهایت کە ئەبو ملت چارەسرییکی خوی بکا ، و هول بدا بو ... برین خوی ... کوچەلەییکی مشفق ، ... ییکی ... وکو

"پـەیامی ئـەخیر، کـە مـژدەی مانـەوەی وەتەنـە خۆشەویسـتەکەمانی گەیانـد، رۆحێکـی تـازەی دا و سەعادەتێکی ئەبەدی بەخشی بۆمان. بـەو موناسـەبەتەوە غەزەتـەی (ژیانـەوە)ش کەوتـە دەورەیـەکی تـازە و گەشاوە و، بۆ ئەوەی بون و ژیانمان تەمسیل و ئیرشاد بکا نـاوی نـرا (ژیـان) تـەنها لـە نـاوی پێشـوی بـە لابردنی دو (ە) و (و) یَکی دواییەوە. ئینجا ئومێدی گەورەمان هەیە کە لەمەودوا ئەم غەزەتـە خۆشەویسـتەمان نائیلی معاوەنەتی هەمو لایەک ببێ و، مەقالاتی فائیدەدار، کە موناسەبەتی ببێ بە ژیانمان و بـە پێشـکەوتن و سەعادەتمان، بۆ ئەم غەزەتەیە بنێررێت.

"ئیتر خوای تەعالا (ژیان)مان موبارەک و مەسعود بفەرموێت."

خوێندنەوەی ئەم سەروتارە رێبازی رەسمیی رۆژنامەکە رون ئەکاتەوە.

سەرەتا ئیشارەت بەوە ئەدا کە بە هۆی نامەزرانی حکومەتی کوردستان و شۆرشی شێخ مـەحمودەوە ئـەم وڵاتە خەریک بوە لەناو بچێ، تا (حامی موعەزەم) کە مەبەستی بریتانیایە فریای کەوتوە و رزگاری کردوە.

ئینجا ئیشارەت بەوە ئەدا کە بە هۆی کێشەی ولایەتی موسڵەوە چارەنوسی ناوچەکە دیار نەبوە ئاخۆ ئەخرێتە سەر تورکیا، یان ئەدرێ بە عیراق. بۆیە رۆژنامەکە نـاو نـراوە (ژیانـەوە)، بـەڵام دوای ئـەوەی ئـەم کێشەیە بە لادا کەوتوە و، موسڵ بە یەکجاری خراوەتە سەر عیراق، ئیتر وەکو نیشانەی قوناغی نوێی ژیـانی سیاسی ناوچەکە ناوی رۆژنامەکەیش لە (ژیانەوە) کراوە بە (ژیان).

### 1. 1. سەردەمی محەمەد ئەدیب

سەرەتا کە ژیان دەرچوە کێ سەرنوسەر یا بەرێوەبەری بوە نەنوسراوە و دیـار نیـە. ج. ص (جـەمیل صائیب) سەروتار و چەند وتارێکی سیاسی لە چەند ژمارەیەکی سەرەتادا نوسیوە، خوێنەر وا ئەزانێ ئەو بوە سەرنوسـەری رۆژنامەکـە. بـەڵام پـاش چەنـد ژمارەیـەک دەنگـی نـەماوە. بەشـدارییەکـەی لـە نوسـینەکانی رۆژنامەکەدا، وەکو بەرچاو ئەکەوێ، هەر بە درێـژە پێـدانی بڵاوکردنـەوەی چیرۆکـی (لـە خـەوما) یـە، کـە لـە سەردەمی ژیانەوە وە دەستی پێ کرد بو.

لە ژ 1 ی 21 ی 1 ی 1926 – ژ 81 ی 1 ی 9 ی 1927 وا باوە کە محەمەد ئەدیب عەزیز (م. أ) و (م. أد) بوە.

بە بۆنەی تێپەڕبونی ساڵێک بە سەر دەرچونیدا، ژیان نوسیوێتی:

"دوەم ساڵی ژیان

"(ژیان) پێی نایە بەهاری دوەم ساڵی عومری. ئەم لاپەڕانە کە هەمو وەختێ مودافەعەی حەقی کردوە و لە حەقیقەت جیا نەبۆتەوە و، کە یەگانە ئامالی لە رێگای سەربەرزی و پێشکەوتنی کورد و ئەم لیوایەدا سەرفی مەساعی بوە، ئەمرۆ بە واسیتەی هیمەت و چاودێری سەعادەتمەئاب جەنابی موتەسەرپف، کە بە هـەمو نـەوعێ بۆ بەرزبونەوەمان تێ ئەکۆشێ، بە گوڵدەستەیەکی علم و ئەدەب ناوبردنی لایقە. (ژیان) بۆ نەشری ئـەفکاری موفیدە سەحیفەیەکی حوڕ و سەربەزادە. لە بەر ئەمە رەغبەت پێ دان و بە خێو کردنی لە سەر هـەمو کوردێـک پێویستە."(ژیان، ژ 51، 27 ی کانونی سانی 927)

### 1. 2. سەردەمی عەلی عیرفان

لە ژ 82 ی 20 ی 9 ی 1927 دا، عەلی عیرفان بە ناونیشانی (تەشەکورات و رجا) نوسیوێتی:

"چونکە جەنابی ئەدیب ئەفەندی مودیری مەتبەعەی ژیان تەعین کراوە بە کاتبی مالیەی سـلێمانی، لەبـەر مەشغولیەتی عەلاوەی نەیئەتوانی ئەم وەزیفەیەیش ئیفا بکات، ئیستیعفای کرد.

"لەسەر تەنسیب و ئەمری موتەسەرِیفی مەعالی هیمەم بەندە بۆ ئیفا کردنـی ئـەم وەزیفەیـە تەنسـیب و تەعین فەرموراوم. چونکە مەتبەعە واسیتەی تەرەقی وەتەنە و غەزەتەیش زبانی حسیات و تـەرجومانی ئامـالی میلەتە، مەعەل ئیفتیخار ئەم وەزیفەیەم قبوڵ و دەرعوهدە کرد.

"بۆ خاتری غەزەتەکەمان رۆژ بە رۆژ تەرەقیەک پیشان بـدا و بـۆ سـاحەی مەدەنیـەت هـەنگاو بهـاوێ ئیستیرحام لە هەمو منەوەران و ئەدیبان ئەکەم لە ناردنی مەقالە و شیعر غەزەتەکەمان بێ بەش نەهێڵنەوە."

ژیان لەم سەردەمەدا هەوڵی داوە زیاتر پێش بکەوێ، لە ژ 134 دا نوسیوێتی:

"بۆ زانینی هەمو قاریئینی کیرام

"مەعلومی هەمو قاریئین و مشتەریە کیرامەکانمانە کە لە کوردسـتانی جنـوبیدا، سـلێمانی کـە عادەتـەن وەکو مەرکەزێکی عمومیـەتی، تـەنها ئـەم غەزەتەیـەی تیـا ئینتیشـار ئـەکات و، چونکـە ئەسـباب و ئـەدەواتی مەتبەعەکەمان نوقسان بو لە هەفتەی دەفعەیەک زیاتر قابیل نـەبو غەزەتەکـەمان ئینتیشـار بکـات، لەبـەر ئـەوە مومکین نەبو هەمو حەوادیسێک و مەعلوماتێک لە وەقتی خۆیا دەرج بکرێ.

"حکومەتی محەلیە و، بیلخاسە سەعادەتی موتەسەرِیفی ئەکرەمی، دەرکی ئەم حاڵە و ئـەم نوقسـانیەتەی فەرمو و، بۆ ئیستیکمالی هەمو نەواقیساتێکی مەتبەعەکەمان لەگەڵ بەلەدیەدا مەشوەرەتی فەرمو و، بـە واسـیتەی هیمەتی موشار ئیلەیهی و بەلەدیەوە بۆمان ئیکمال کرا و، لە 1 ی ئەم مانگەوە هەفتەی دو کـەرِەت: دوشـەموان دەفعەیـەک و پێنجشـەموان دەفعەیـەک، غەزەتەکـەمان ئینتیشـار ئـەکات. وە تـەبیعی لەمـەودوا مەتبەعەکـەمان مەسرەفێکی فەوقەلعادە زیاتر بە ناوی خزمەتی میلەت و وەتەنەوە ئیختیار ئەکات، لەبەر ئەوە رجـا ئەکـەین لـە مشتەریەکانمان کە معاوەنەتمان بفەرمون و، لە وەقت و میعادی خـۆیدا بـەدەلی ئابونـەی غەزەتەکـە بـە نـاوی بەلەدیەوە بۆمان رەوانە بفەرمون و، رجایش لە منەوەر و عالم و فازیلەکانی کوردستان ئەکەین کە لـە خسـوس ناردنی مەقالەی موفیدەوە معاوەنەتمان بفەرمون."

ئەمە دوەمین جـار بـو لـە سـلێمانی رۆژنامەیـەک بتـوانێ حەفتـەی دو جـار دەربچـێ. جـاری یەکـەم پێشکەوتن بو. جاری دوەم ژیان. ئەمەیش دەری ئەخا کە ئەگەر رۆژنامەوانیی کوردی دۆخێکی لـە بـاری بـۆ برەخسایە، شان بە شانی رۆژنامەکانی بەغداد و وڵاتانی دراوسێ پـێش ئەکـەوت و ئـەبو بـە رۆژانـە. بـەڵام هەمو جارێ قۆرتی سیاسی رۆژنامەوانیی کوردی بردۆتەوە بۆ دواوە.

لە ژ 82 ی 20 ی 9 ی 1927– ژ 259 ی 4 ی 9 ی 1930 کە عەلی عیرفـان سەرنوسـەری بـوە، ژیان لەو رۆژانەدا دەورێکی کاریگەری هەبوە لـە داکـۆکی مـافی نەتـەوەیی کـورد و، نواندنـەوەی جموجـوڵی سیاسی چالاکەکانی کورد و، هاندانی خەڵک بۆ داوای مافی نەتەوەییان. لەبەر ئـەوە دوای روداوەکـانی 6 ی رەشی ئەیلولی 1930 کە لە سلێمانی زۆر شت گۆڕاوە، پێ ئەچێ عەلی عیرفان یـش گیرابـێ و لـە ژیـان دور خرابێتەوە.

### 1. 3. سەردەمی حسێن نازم

لە ژ 260- ژ 320 حسێن نازم سەرنوسەر بـوە. لـەو ماوەیـەدا دیـارە ژیـان ئـەو نەختـە ئازادیـەی هەیبوە، نەیماوە. پیرەمێرد لە ژ 313 دا نوسیوێتی:

"(ژیان) مان هەندێ لە رێ لای دابو
لالوت بوین، لامان باوی نەما بو
ئەمجارە هەمو بۆی تێ دەکۆشین
کەمی و لاسەنگی بۆ دادەپۆشین"

### 1. 4. سەردەمی پیرەمێرد

لە ژ 321 ی 9 ی 5 ی 1932 ەوە پیرەمێرد بۆتە بەڕێوەبەری.

لە ژ 322 ی 19 ی 5 ی 1932 دا بە بۆنەی مردنی حسێن نازمەوە، پیرەمێرد بە ناونیشـانی (رازی برادەری) نوسیویێتی:

"زۆر دڵشکستم بە کۆچکردنی هامدەردێکی وەک حسێن نازم بەگ. گەرچی منـیش رێبـوارم و نزیـک بە بوارم بەڵام هێشتا هیوادارم. (ژیان) مان نزیک بو بە نەمان چونکو ئیتر بەلەدیە هیچی پێ خەرج نەدەکرا. ناچار لە گۆشەنشینی هاتمە دەرێ و، دەستم دایە داوێنی (ژیـان) چـاک چـاکی لـە دەسـت نـادەم. ئێسـتا بـە سەرپەرشتی ژیان و چاپخانەکەم وەک خۆم بێ بەها و بە هیوای بێتە بەها گرتۆتە ئەستۆ، ئەزانم بـاوەڕم پـێ دەکەن کە تێ دەکۆشم پەنا بە ئیزادەی پاک دەیبەینە سەر، ئەمەندە هەیە هەمو کاڵایە بە خریـدار دێتـە بـرەو، من بە خریدارەکان دەنازم و پشتیوانیەیش لە خوا دەخوازم."

لە ژ 321– ژ 406 ئیتر پیرەمێرد سەرپەرشتی کردوە. بـەڵام رۆژنامەکـە هـەر بـە نـاوی شـارەوانی سلێمانی‌یەوە بوە.

لـــە ژ 407 ی 16 ی 8 ی 1934 – 553 ی 10 ی 3 ی 1938 پیرەمێـــرد چاپخانەکـــەی لە شـارەوانی سـلێمانی بـە کـرێ گرتـوە. ئیمتیـازی رۆژنامەکەیشـی بـە رەسـمی بـە نـاوی خۆیـەوە تۆمـار کردوە.

لە ژ 553 بە دواوە مەجید یەعقوبی، موتەسەڕیفی ئەوسای سـلێمانی کـە تورکومـانێکی کوردنەویسـت بوە، رۆژنامەکەی داخستوە.

(ژیان) ی سەردەمی پیرەمێرد پێویستی بە لێکۆڵینەوەیەکی سەربەخۆ هەیە.

سەرنوسەرەکانی ژیان لە بواری رۆژنامەوانی‌دا پیاوی کارامـە و، لـە بـواری نوسـین‌دا بـە توانـا و لـە رۆشنبیریی گشتی‌دا شـارەزا بـون. بـەڵام دوای ئـەوەی وەزیفەکـەیان گوێزراوەتـەوە مەیـدانێکی تـر، ئیتـر دەستیان لە رۆژنامەوانی و نوسین هەڵگرتوە. لە ناویـان‌دا هـەر پیرەمێـرد هـەتا سـەر رۆژنامـەوانی کردۆتـە (پیشە) ی خۆی.

## 2. نوسەرەکانی

ژیان رۆژنامەی شارەوانی سلێمانی بوە.

پێنـاچێ سەرنوسـەر و دەسـتەی نوسـەرانی دیـاریکراو و هەمیشـەیی هـەبوبێ. ئـەوەی بۆتـە مودیری مەتبەعەکەی شارەوانی، لە هەمان کاتدا بۆتە بەڕێوەبەر و سەرنوسـەری رۆژنامەکـەیش. ئەوانـە یـش وتاریان بۆ نوسیوە خۆبەخش بون. هەر کەسەیان، جیاواز لە دنیای رۆژنامەوانی، ئیشـوکاری تایبـەتی خـۆی هەبوە.

چاوگێڕانێ بە سەد ژمارەی دو ساڵی یەکەمی ژیان‌دا، کۆمەڵێ ناو و ناونیشان بەرچاو ئەکـەون. بـەڵام زۆریان لە پاش ماوەیەک ون بون و لە دنیای نوسین و رۆژنامەوانی کوردی‌دا دەنگیان نەماوە.

ژمارەکـانی سـەرەتا 1 و 2 و 8 چەنـد وتـارێکی بـە قەڵـەمی ج. ص (جـەمیل صـائیب) تـێ‌دا بڵاوکراوەتەوە. وەکو خاوەنی رۆژنامەکە ئەدوێ و ئەنوسێ. بـەڵام دوای چەنـد ژمارەیـەک دەنگـی نوسـینی نەماوە. تەنیا (لە خەوما)کەی بە ئەڵقە بڵاو کردۆتەوە.

ئەحمەدی عەزیز ئاغا، لە ژ 2 و 5 و 44 و 48 دا چەند وتـارێکی سیاسـی و پـەروەردەیی نوسـیوە. پاش چەند ژمارەیەک ئەویش دەنگی نەماوە.

کوردی (مستەفا سائیب)، کە نوسەرێکی رۆشنبیر و توانا بوە، لە ژ 9 و 10 دا بە 2 ئەڵقە (بۆ مەبعوسە موحتەرەمەکان) و، لە ژ 35 و 36 و 40 و 41 دا بە 4 ئەڵقە (کورد بۆچی پێش ناکەوێ؟) و، لە ژ 52 دا (تەربیە لە ئەقوامی ئەنغلۆ - ساکسۆن دا) چەند وتارێکی نوسیوە.

م. نوری (شێخ نوری شێخ ساڵح) کە یەکێ لە نوسەرە بە برشتەکانی ئەو زەمانە بوە، جگە لەوەی لە ژ 20 ەوە زنجیرەیەک وتاری لە سەر (ئەدەبیاتی کوردی) بڵاو کردۆتەوە، لە ژ 26 و 27 دا لە سەر کوردایەتی کەرکوک (جواب بۆ غەزەتەی نجمە) ی نوسیوە. هەروەها لە ژ 4 و 9 و 45 چەند شیعرێکی بڵاو کردۆتەوە. لەوانە، شیعرێکی لە ژ 49 دا بە بۆنەی تێپەڕینیساڵی شومی 1926 ەوە.

رەشید نەجیب، کە یەکێ لە نوێکەرەوەکانی شیعری کوردییە لە ژ 54 و 91 و 94 دا چەند شیعرێکی نوێی بڵاو کردۆتەوە. هەروەها نوسەرێکی توانای ئاگاداری روداوەکانی دنیای نوێ بوە، لە ژ 137 و 138 و 139 و 142 و 146 دا چەندین وتاری کۆمەڵایەتی بە پێزی نوسیوە.

ع. عەزیز (عەبدوڵا عەزیز) کە مامۆستایەکی رۆشنبیر و کوردپەروەری هەولێری بوە، لە ژ 29 و 51 و 145 و 148 دا چەندین وتاری لەسەر زمانی کوردی و پەروەردە و تەرجومەی کوردی کتێبەکانی مەکتەب، نوسیوە.

ع. واحید مەجید کە دواتر بە ئیمزای (ع. و. نوری) کتێب و وتارەکانی بڵاو کردۆتەوە، لە ژ 30 و 31 دا (تاریخی: ئەڵمانیا، ئیتاڵیا لە پێش وریابونەوەی ئەوروپا و لە دوایی‌دا) لە ژ 34 و 36 دا (نیزامی مەداریس لە ئینگلتەرە، ئەڵمانیا، ولایاتی موتەحیدەی ئەمەریقا و فەرانسە چۆنە؟) ی نوسیوە.

م مەعروف (میرزا مارف) لە ژ 38 و 39 و 41 و 63 و چەند ژمارەیەکی تری‌دا بە ناوی (حەقائیقی وەجیزە) هەندێ قسەی نەستەقی، بە زمانێکی خەست، لە رستەی چڕوپڕدا، لە شێوەیەکی فەلسەفی‌دا داڕشتۆتەوە.

حەسەن کوردستانی کە ئەبێ نازناوی یەکێ لە رۆشنبیرەکانی ئەو سەردەمە بێ، لە ژ 3 دا وتارێک و، لە ژ 16 و 17 دا وتارێکی تێۆری لەسەر (وەتەن – میلەت، وەتەنی – میلیەت) نوسیوە.

مستەفا شەوقی و عەونی (عەونی حاجی گورون) لە ژ 6 دا، رەمزی لە ژ 7 دا، زەکی سائیب (مستەفا سائیب) لە ژ 61 دا، فەتحوڵا ئەسعەد لە ژ 53 دا، شاکیر فەتاح لە ژ 52 دا، محەمەد زەکی لە ژ 55 و 56 دا، ئەمان و چەند کەسێکی تر هەریەکە یەک وتار یان زیاتریان بڵاوکردۆتەوە.

محەمەد ئەدیب عەزیز کە ئەبێ مودیری مەتبەعە و سەرنوسەری غەزەتەکە بوبێ، تا ژ 61 هیچ وتارێکی بە ناوی خۆیەوە بڵاو نەکردۆتەوە، بەڵام لە ژ 61 بە دواوە بە ئیمزای (م. أ.) و (م. أد.) زۆری سەروتارە گرنگەکانی ژیانی نوسیوە.

پیرەمێرد کە لەو ماوەیەدا وەکو ژ 6 لە ژێر سەرناوی (هاتنەوە)دا نوسیوێتی: "پێرێ لە موعتەبەرانی وڵات جەنابی حاجی تۆفیق بەگ تەشریفی هێنایەوە سلێمانی. عەرزی بەخێر هاتنی ئەکەین." ئیتر بە یەکجاری سلێمانی کردۆتە مەڵبەندی ژیانی خۆی. لە ژ 9 ەوە بە شیعرێک کە بە شێوەی کۆن (بە نەشئەی نوتقەکەی مەندوبی سامی)یەوە داینـاوە و بە ئیمزای (کوردی) ەوە بڵاوی کردۆتەوە، دەستی کردوە بە بڵاوکردنەوەی بەرهەمەکانی. دوای ئەوە شیعرەکانی تری لە ژ 13 و 36 و 37 و 40 و 45 دا بە شێوەی تازە هۆنیوەتەوە. پیرەمێرد پشتیوان و هاندەرێکی بە هێزی نوێکەرەوەکانی شیعری کوردی بوە.

فایەق بێکەس لە ژ 10 و 80 و 87 و 101 دا و، قانع لە ژ 42 دا، کە رەنگە ئەوە یەکەمین شیعری چاپکراوی بێ و، حەمدی لە ژ 60 دا و، عەلی کەمال باپیر لە ژ 75 دا و، فایەق زێوەر لە ژ 14 و 46 دا شیعریان بڵاو کردۆتەوە.

(ژیان) لە سەردەمی عەلی عیرفاندا بە دەگمەن شیعری تێدایە، بە دەگمەن نوسینی نوسەرانی تری بـڵاو کردۆتەوە. پێ ئەچێ هەمو بابەتەکانی رۆژنامەکە خۆیان ئامادەیان کردبێ.

## 3. بڵاوکردنەوەی

رۆژنامە بەوەندە تەواو نابێ نوسینی بۆ ئامادە بکرێ و چاپ بکرێ، بەڵکو گرنگترین قۆناغی، جۆری بڵاوکردنەوەیەتی.

لە کوردستان دامەزراوێکی تایبەتی بۆ بڵاوکردنەوە و پەخشی چـاپکراو نـەبوە. ژیـان خۆیشـی نـەی توانیوە دەزگایەکی پەخش دامەزرێنێ. لە زۆری شارەکانی کوردسـتاندا کتێبفرۆشـی و ناوەنـدی تایبـەتی بـە فرۆشتنی کتێب و رۆژنامە نەبوە. تا ماوەیەکی درێژ یش دەزگایەکی رێکوپێکی پۆست نەبوە. رێگاوبـان کـەم و خراپ و، ئۆتۆمۆبێل زۆر کەم، بەڵکو دەگمەن بوە. بۆ هەندێ لە قەزا و ناحیـەکان رێگـەی ئۆتۆمۆبێـل هـەر نـەبوە، بـە وڵاخ هـاتوچۆی بـۆ کـراوە. سـەرەڕای ئەمانـە هـەمو، بـە هـۆی شۆرشـەکەی شـێخ مـەحمودەوە رێگاوبانەکان نائاسایی بون. بە زۆری بە قافڵە و لە گەڵ زرێلی جەنگی هاتوچۆ کراوە.

ئەمانە هەمو کاریان لە بڵاوکردنەوەی رۆژنامەکە کردوە.

ژیان چەندی لێ چاپ کراوە، چەندی لێ ساغ بۆتـەوە و گەیشـتۆتە دەس خوێنـدەواران و، گەیشـتۆتە چەند شار و شوێن و چەندی ماوەتەوە؟ لەبەر ئەوەی لیست و ئەدرەس و دەفتەرەکانی ئەو زەمانە لەبەر دەس دا نین، بە وردی نازانرێ.

بە مەزەندە، بە پێی توانای هونەری چاپخانەکە و بە پێی توانای مادی رۆژنامەکە، نابێ لە هەزار دانە تێ پەڕی بێ کە بۆ ئەو رۆژگارە ژمارەیەکی گونجاو بوە.

هەر بە هۆی ژیان خۆیەوە ئەزانرێ کـە ژیـان: جگـە لـە سـلێمانی و دەوروبـەری، گەیشـتۆتە بەغـداد، کەرکوک، چەمچەماڵ، هەولێر، کۆیە، شەقڵاوە، رەواندز..

لە ژ 97 دا ئەم (تکا) یەی بڵاو کردۆتەوە:

"لە موەزەفینی دائیرەی مەتبەعە تەیب ئەفەندی بۆ کۆکردنەوەی بەدەلاتی ئابونەی ژیان نێررا بۆ لیـوای کەرکوک، هـەولێر، قـەزای چەمچـەماڵ. تکـا لـە مشـتەریەکانمان ئەکـەین بەدەلاتەکـەی بـە تـەواوی تەسـلیم و معاوەنەتی لازمەی لە حەق ئیجرا بفەرمون."

لە ژ 184 دا ئەم ئاگاداریەی بڵاو کردۆتەوە:

"... لە موەزەفینی مەتبەعە شێخ تەیب ئەفەندی بۆ کۆکردنەوەی بەدەلاتی غەزەتەکە نێررا بـۆ کـەرکوک، هەولێر، رەواندز، کۆیە، شەقڵاوە، ئیستیرحام ئەکەین معاوەنەتی بفەرمون و بەدەلاتەکـەی بـە تـەواوی تەسـلیم بکەن."

لە ژ 220 یش دا ئەم ئاگاداریەی بڵاو کردۆتەوە:

"تکایەکی تایبەتی

"ئیدارەی غەزەتەکەمان، بۆ کۆکردنەوەی بەدەلاتی ئابونە، ئەوی لە خزمەت ئەو زەواتە کیرامانەیە کە لـە بەغدادن، جەنابی شاکیر موجریم ئەفەندی کردوە بە وەکیل، دەفتەرێکی موسەدەقی بۆ نـاردوە، ئیسـتیرحام لـە مشتەریەکانی بەغدادمان ئەکەین ئەو میقدارە پارەیەی کە لە خزمەتیانایە و کە لای شاکیر ئەفەندی مەعلومە بـە تەواوی تەسلیمی بفەرمون.

"ئومێدی قەوی‌مان بە کرێـارە موحتەرەمـەکانمان هەیـە کـە بـۆ یاریـەدانی غەزەتەکـەمان هـەمو نەوعـە معاوەنەتێک درێغ نەفەرمون و تیکراری ئیستیرحام ئەکەین بەدەلاتەکەی بە تەواوی تەسلیم بفەرمون. ژیان"

لە دو مەسەلەی گرنگدا کە ژیان لەسەری نوسیون، لە ڕەواندزەوە بۆ هاودەنگی تەلگراف و نامەی پێ گەیشتوە. جاری یەکەم کە بەرپەرچی قسەکانی داود حەیدەری داوەتەوە لە مەجلیسی مەبعوسان دا سەبارەت بە خوێندنی زمانی کوردی. جاری دوەم کە پشتیوانی لە ئیسماعیل بەگی ڕەواندزی کردوە سەبارەت بە دژایەتی تەجنیدی ئیجباری.

ژیان چەند جارێ میعادی دەرچونی گۆڕیوە، بۆ ئەوەی لە گەڵ ڕۆژانی هێنان و بردنی پۆستەدا ڕێک بکەوێ، لە ژ 77 دا نوسیویێتی:

"گۆڕینی میعادی دەرچونی غەزەتەکەمان

"لەبەر ئەمەی لە هەفتەیەک دا جارێک پۆستە هاتوچۆ ئەکات و ئەو جارەیش بەر ڕۆژی سێشەمە پێش دەرچونی غەزەتەکەمان ئەکەوێ، بۆ ئەمەی غەزەتەی کڕیارەکانی دەرەوەمان زۆر دوا نەکەوێ، میعادی دەرچونی غەزەتەکەمان گۆڕی و وەکو پێشو کردمانەوە بە ڕۆژی پێنجشەمە. لەمەودوا هەمو جارێ لەو ڕۆژەدا دەر ئەچێ."

## 4. سەرچاوەی دارایی

سەرچاوەی دارایی ژیان بریتی بوە لە: پارەی ئابونەکانی و، دەرامەتی لە ئیعلان.

لە لاجانگی چەپی ناوچەوانی ژمارە 1 دا نوسراوە:

"بەدەلی ئابونە بە 3 مانگ ڕوپیەونیوێک، بە 6 مانگ 3 ڕوپیەیە. لە 3 مانگ کەمتر ئابونە قەید ناکرێ. بۆ دەرەوە بەدەلی ئابونە حەو ڕوپیەو نیوە. نوسخەی بە ئانەیەکە."

لە لاجانگی ڕاستی ناوچەوانیدا نوسراوە:

"بۆ هەمو شتێک موخابەرات بە ناوی ئیدارەخانەوە ئەکرێ. ئیعلانات بە دێڕێک 6 ئانە دەسێنرێت."

لە ژ 134 ەوە، لە باتی جارێک، هەفتەی دو جار دەرچوە، لەبەر ئەوە ئابونەکەی زیادی کردوە، بەڵام نرخی بڵاوکردنەوەی ئیعلان وەکو خۆی ماوەتەوە. لە لاجانگی چەپی ناوچەوانی یەکەم لاپەڕەیدا نوسیویێتی:

"کڕیار

"بە شەش مانگ پێنج بە ساڵێک دە ڕوپیە دەدا. بۆ دەرەوە ئوجرەتی پۆستەی عەلاوە ئەکرێ. شەش مانگ کەمتر ئابونە قەید ناکرێ.

"ئیعلانات

"دێڕێک 6 ئانە دەسێنرێت.

"یەکی بە ئانەیەکە."

ئەو سەردەمە عیراق هێشتا لە ژێر دەستی ئینگلیزدا بوە. دراوی تایبەتی خۆی نەبوە، بە دراوی هیندی سەودا کراوە. لەبەر ئەوە نرخی ئابونە و ئیعلان بە ڕوپیەی هیندی دیاری کراوە.

دوای ئەوەی دراوی عیراقی گۆڕاوە، لە باتی ڕوپیە و ئانە و پای هیندی، دینار و فلسی عیراقی خستۆتە بازاڕەوە، (ژیان) یش ڕاگەیاندنەکەی بەم جۆرە لێ کردوە وەکو لە ژ 322 دا نوسیویێتی:

"کڕیار

"بە شەش مانگ 225 بە ساڵێک 450 فلس دەدا. بۆ دەرەوە ئوجرەتی پۆستەی عەلاوە ئەکرێ.

"ئیعلانات

"لە دێڕێکەوە هەتا شەش مەقتوعەن 225 و لە شەش زیاتر جگە لە 225 فلسەکە بۆ دێڕە زیادەکانیش دێڕی 28 فلس ئەسێنرێ.

"نوسخەی بە پێنج فلسە"

**4. 1. ئابونە**

ئابونەکانی بە زۆری بریتی بون لە فەرمانبەرانی داوودەزگاکانی حکومەت، چ لە ناو شار و چ لە دەرەوەی، هەروەها هەندێ لە بازرگان و سەرانی عەشائیر و موختار و کوێخای گوندەکان.

پارەی ئابونە، وەکو لەم ئاگاداریەدا نوسراوە، ئەبو بە ناوی سندوقی بەلەدیەوە بنێردرێ:

"بۆ زانینی مشتەریە کیرامیەکانمان

ئیدارەخانەکەمان چونکە مەئمورەکانی موکەفەل (رەنگە ئەمە هەڵەی چاپ بێ و مەبەستی موکەلەف بێ) نین و، زاتەن مەربوتی بەلەدیەیشە، ئیستیرحام ئەکەین هەر پارەیەک ئەنێرن بۆ ئەم ئیدارەیە رەئسەن بە ناوی سندوقی بەلەدیەوە ئیرسالی بکەن. (ژ)"

ژیان لە ساڵی یەکەمیدا داوای پارەی لە ئابونەکانی نەکردوە، بەڵام لە ساڵی دوەمیەوە چەندین جار و بە چەند چەشنی جیاواز، داوای لێ کردون:

لە ژ 55 و 56 و 59 و 61 و 64 و 69 و 74... دا ئەم داوایەی دوبارە کردۆتەوە:

"ژیان

"ئەتانەوێ ئەم قەزاتەیە بەرێوە بچێ و بژی حەقی کریاریەکەی دوا مەخەن و زو بینێرن."

لە ژ 58 دا نوسیویێتی:

"تکا لە کریارە موحتەرەمەکانمان

"لە کریارەکانی دەرەوەمان خاسەتەن تکا ئەکەین کە بۆ ئەمەی بە رێکوپێکی غەزەتەکانیان پێ بگات و، مەیدانی گلەیی نەمێنێ، لەمەودوا لوتفەن لە گۆرینی ناوونیشانیان زو خەبەردارمان بفەرمون.

"وە دیسان تکا ئەکەین ئەوانەی کە قەرزداری ژیانن و بەدەلاتی ئیشتیراکیان پڕ نەکردۆتەوە بە بێ دواخستن بە ناوی ئیدارەخانەوە بە ناردنی هیمەت بفەرمون."

لە ژ 79 دا نوسیویێتی:

"تکا لە کریارەکانی دەرەوەمان

"تا ئێستا بۆ ناردنی بەدەلاتی ئابونە کە لە بەقایادا ماوەتەوە گەلێ جار عەرزمان کرد. کریارە موحتەرەمەکانی دەرەوەمان لە گەڵ ئەمەی کە ئەمرۆ مودەتێکە غەزەتەمان دەرئەچێ هێشتا ئەعزەمیان بەدەلاتی ئیشتیراکیان نەداوە، ئەمە ئەبێتە مانیعی بەرێوەچونی (ژیان) مان. بۆ هەمو لایەک خسوسی میقداری مەتلوباتمان عەرز کردوە، رجا ئەکەین بە بێ دواخستن هەرکەسە حسابی خۆی پڕ بکاتەوە و دیسان تکا ئەکەین بۆ ئەمەی مونتەزەمەن غەزەتەکانیان پێ بگات و مەیدانی گلەیی نەمێنێ لەمەودوا لوتفەن لە گۆرینی ناوونیشانیان زو خەبەردارمان بفەرمون."

لە ژ 89 دا نوسیویێتی:

"بۆ کریارە موحتەرەمەکانمان

"تەبیعی هەمو ئەیزانن ئیدارەکەمان مەساریفاتی زۆرە. بۆ تەبعی غەزەتەیەک پارەیەکی زۆر لازمە. موقابیل بە هەمو سەرفیاتێ واریداتی پێویستە. رجا لە کریارەکانمان ئەکەین و ئەم مەسئەلەیە حەواڵەی ویجدانیان ئەکەین، ئەوانەی کە حەقی دو ساڵ سێ ساڵیان لە سەرە و لە ئیبتیدای نەشری ئەم غەزەتەوە هێشتا هیچیان نەداوە یا بە جارێ وە یاخود بە قیست پارەی ئابونەکەیان بنێرن. ژیان"

لە ژ 133 دا بە هەرەشەوە نوسیویێتی:

"ئاخر رجا

"هـەتاکو ئێسـتا بـۆ تـەراکومی بـەدەلاتی ئابونـەی غەزەتەکـەمان موتەعەدیـد دەفعـە رجامـان لـە مشتەریەکانمان کرد لەوانەی کە هێشتا حەقی 3 و 4 ساڵیان لایە، رجا ئەکەین بۆمان بنێرن وەئیلا وەکـو غەزەتەکەیان بۆ نانێرین مەجبور ئەبین بە موراجەعەتی قـانونی و لـە غەزەتەیشـا ناویـان دەرج ئەکـەین. ژیان"

پێ ئەچێ هەمو ئەم رجا و تکـا و هەڕەشـەیە کـەڵکی نـەبوبێ، لەبـەر ئـەوە یـەکێ لـە فەرمانبـەرەکانی چاپخانەیان ناردوە بۆ کۆکردنەوەی. لە ژ 184 دا نوسیوێتی:

"تکایەکی تایبەتی

"هەمو ئەیزانین لە موحیتی کوردستانا هەر ئەم غەزەتە کوردیە هەیە و، ئەمەیش چونکی مشـتەریەکانی معاوەنەتی ناکەن و حەقەکەی لە میعادی خۆیدا تەسلیم ناکەن نەک قابیل نیە ئینتیزامێکـی پـێ بـدرێ بـەڵکو ئەگەر هەر وا بمێنێتەوە ناژی. ساڵانەی غەزەتەکە ئەوەندە نیە کە ئەهمیەتی بێ، حـەقی چـوار سـاڵی موقابیـل حەقی ساڵێکی غەزەتەیەکی ترە. لە سەر هەمو حەمیەتمەندێک و وەتەنپەروەرێک پێویستە بە جدی معاوەنـەتی بکات و بیژێنێ.

"ئینجا بۆ ئەوەی غەزەتەکەمان بژی و بتوانین ئینتیزامێکی پێ بدەین رجا لە مشـتەریەکانی خـاریج و داخل ئەکەین وە بیلخاسە لە قیسمی مەئمورین و ئەوانەی کە هێشتا حەقی چوار ساڵیان لا ماوە و مەبلـەغێکی زۆر قەرزدارن، ئیتر مەیدانی نوسین و بەعزێ معامەلە نەدەن و، بە ئەوەل واسیتەدا بە ناوی سندوقی بەلەدیەی سلێمانیەوە چەند قەرزدارن بۆمان بنێرن و رجاکەمان تەرویج بفەرمون.

"زاتەن لە موەزەفینی مەتبەعـە شـێخ تـەیب ئەفەنـدی بـۆ کۆکردنـەوەی بـەدەلاتی غەزەتەکـە نێـررا بـۆ کەرکوک، هەولێر، رەواندز، کۆیە، شەقلاوە، ئیستیرحام ئەکەین معاوەنەتی بفەرمون و بەدەلاتەکەی بـە تـەواوی تەسلیم بکەن."

شێخ تەیب ئەفەندی بە سەرکەوتویی لە کارەکەی گەڕاوەتەوە، لە ژ 186 دا سپاسنامەیەکی نوسیوە:

"تەشەکور و بەیانی مەمنونیەت

"هەروەکو لە نوسخەکانی پێشودا بەیان کرابو، لەسەر تەنسیبی ریاسەتی بەلەدیە و تەسدیقی سەعادەتی موتەسەڕیفی ئەفخەمی بۆ کۆکردنەوەی بەدەلاتی موتەراکیمەی ژیان کە لە لیوای کەرکوک و هـەولێـر و قـەزای رەواندزدا هەی بو بۆ دەرەوە چوبوم.

"لەم جێگایانەدا لە تەعریف بە دەر یارمەتی و تەسهیلاتم بۆ نوێنرا. لە قەزای رەواندزدا ئەو معاوەنەتـە کە لە تەرەف قائیمقام جەنابی کەریم بەگەوە ئیبراز فـەرموراوە شـایانی تیزکـارە، بیلخاسـە معـاونی مـودیری پۆلیس جەنابی حەمزە بەگ بینا بە سائیقەیەکی مەحەبـەت کـە دەرحـەق بـە ئـەهلی وڵاتەکـەمان و مـەتبوعات هەیەتی، جگە لەو هەمو تەسـهیلاتەی کـە لـە رێی گردکردنـەوەی بـەدەلات کـردی و خۆشـی حـەقی سـاڵێکی پێشینەن دا، بەرامبەر بە شەخسی خۆشم بە دەرەجەیەک کە مەحجوبی لوتـف و ئینسـانیەتی بـوم خزمـەت و معامەلەی میهماننەوازی دەرحەقم کردوە. لە بەر ئەمە بە لازمم زانی کە بە ناوی ژیان و خۆمەوە عەلەنەن عەرزی تەشەکورات و بەیانی مەمنونیەت بکەم. تەیب"

### 4. 2. **ئیعلانات**

پارەی بڵاوکردنەوەی ئیعلان بۆ هەمو رۆژنامەکانی جیهان سەرچاوەیەکی گرنگی دەرامەتە. بـۆ (ژیـان) یش هەروا بوە.

ئیعلانات ئەگونجیٚ دو سەرچاوەی هەبیٚ: یەکێکیان دامەزراوە ئەهلیەکان و، ئەوی تریان دامەزراوە حکومەتی‌یەکان.

لە کوردستانی ئەو رۆژگارەدا بازاڕ زۆر تەسک و بازرگانی زۆر کەم و دواکەوتو بوە. کۆمپانیا و دامەزراوی بازرگانی خاوەن سەرمایەی ناونجی و گەورە نەبوە. لەبەر ئەوە (ئیعلانات)ی ئەهلی نەبوە. ئەگەر بوبێت یش زۆر کەم و بیٚ بایەخ بوە، هیچ کەلەبەرێکی دارایی بۆ ژیان پڕ نەکردۆتەوە.

ئیعلاناتی حکومەتی چەند جۆریٚ بون. لەوانە هی: دادگاکان، دائیرەی ئیجرا، دائیرەی تاپۆ، مەقامی موتەسەرِیفیەت، ریاسەتی بەلەدیە، کەرتەکانی پۆلیس و جەیش...

هەندیٚ لەم ئیعلاناتە سەرچاوەیەکی گرنگ بون بۆ دەرامەتی ژیان و، هەندێکی تریان رەنگە بیٚ پارە بڵاو کرابنەوە.

لێکۆڵینەوەیەکی سەربەخۆ لە سەر ژیان و ئیعلانەکانی لەم کتێبەدا نوسراوە.

## 5. هونەری رۆژنامەوانی

### 5. 1. لایەنی رۆژنامەنوسی

ئەگەر رۆژنامە بە ناوچەیی (Local) و، نیشتمانی یا نەتەوەیی (National) و، ناودەوڵەتانی یان وەکو ئەڵێن نێونەتەوەیی (International) دابەش بکریٚ، ئەوا ژیان ئەچێتە خانەی رۆژنامەی ناوچەیی‌یەوە.

ژیان لە باری رۆژنامەنوسی‌یەوە، لە چاو هەلومەرجی ئەو زەمانەی سلێمانی‌دا بگرە هی عیراقدا، بە رۆژنامەیەکی سەرکەوتو دائەنریٚ. زۆری بابەتەکانی رۆژنامەی هاوچەرخی تیٚدا بڵاو کراوەتەوە:

**هەواڵ:**

هەواڵی ناوخۆی سلێمانی و دەوروبەری

هەواڵی بەغداد و حکومەت و پارلەمانی عیراقی

هەواڵی دەوڵەتانی دراوسیٚ و گەشەکردنی پێوەندی‌یان لە گەڵ حکومەتی عیراق

هەواڵی خەباتی گەلان لە پێناوی سەربەخۆیی‌دا وەکو میسر، سوریا، هیندستان...

هەواڵی جەنگ وەکو مەنچوریا

هەندیٚ لە ئیعلانەکانیشی بە هەواڵ و، لە چاو ئەو سەردەمەدا بە هەواڵی گرنگ دائەنرێن، وەکو ئیعلانی وەرگرتنی خوێندکار لە خوێندنگەی عەسکەریی عیراق.

**ریپۆرتاج:**

ژیان چەندین ریپۆرتاجی گرنگی نوسیوە. زۆریان نرخی مێژویی گەورەیان هەیە. لەوانە: ریپۆرتاج دەربارەی سەردانی مەندوبی سامی لە سلێمانی. ریپۆرتاج دەبارەی سەردانی سەرەوەزیرانی عیراق و وەزیرەکان. ریپۆرتاج دەربارەی تەشریف هێنانی مەلیک...

**وتار:**

ژیان بە سەدان وتاری سیاسی، پەروەردەیی، کۆمەڵایەتی، ئەدەبی، ئابوری، رۆشنبیری... تێدایە.

**لێدوان:**

هەندێ جار دوای گێڕانەوەی ڕوداوێک، ژیان ڕەئی خۆی بە لێدوانێ لە پەراوێزی هەواڵەکەدا نوسیوە.

**سەروتار:**

زۆر ژمارەی، سەروتاری تێدایە. بابەتەکانی جۆراوجۆرن: سیاسی و پەروەردەیی و کۆمەڵایەتی و ئابوری... و هەندێکیشیان باس لە خەمی ڕۆژانەی ژیانی خەڵک ئەکەن و داواکاریە لە حکومەت.

**زمانی نوسین:**

ئەگەرچی ژیان چەند جارێ باسی بژاری زمانی کوردی کردوە و، لە ژ 45 دا هەواڵی پێکهێنانی (کۆمەڵی بژاری زمانی کوردی) بڵاو کردۆتەوە و، لە ژ 49 دا ئەم (تکا) یەی نوسیوە:

"هەروەکو لە خوێندەوارە موحتەرەمەکانمانەوە مەعلوم بوە ئەمڕۆ بۆ ڕێکخستنی زبانەکەمان و، لە کەلیماتی غەیرە ڕزگار کردنی لە هەمو لایەکەوە هەوڵ ئەدرێ و تێ ئەکۆشرێ، چونکە بە تەواوی زانرا کە یەکێ لە وەسائیتی سەرکەوتن، پێشکەوتنی میلەت ڕێکخستن و سەربەخۆیی زبانەکەیەتی، جا لەبەر ئەمە بە تایبەتی لەو تێگەیشتوە بیرروناکانەی کە بۆ خزمەتی هاووڵاتیەکانیان لە پەڕی ژیان دا مەقالە ئەنوسن، تکا ئەکەین بۆ ئەمەی هەمو کەسێ بە بێ گرانی تێ بگا، زۆر هەوڵ بدەن و هەتا ئەتوانن کەلیمەی کوردی پەتی ڕون و شیرین بە کەڵک بهێنن، کە مەقسەد لەو نوسینانەش قازانجی هەمو.."

ژیان خۆی لەم قۆناغەدا بە هیچ جۆرێ گوێی نەداوەتە پاکی و پاراوی زمانی نوسینەکانی. ژمارەیەکی زۆر وشەی عەرەبی بەکارهێناوە، کە ئەیتوانی لە باتیان وشەی کوردی باو بە کار بهێنێ. هەروەها هەندێ وشەی لە زمانە ئەوروپاییەکانەوە وەرگرتوە بەڵام بە فۆنەتیکی تورک نوسیونی و، کافەکانی کردوە بە قاف.

**ڕێنوسەکەی:**

ڕێنوسەکەیشی بە گشتی هەمان ڕێنوسی زمانی فارسی و عەرەبی بوە. ساڵی 1930 کە تۆفیق وەهبی بۆتە موتەسەڕیفی سلێمانی، ماوەی چەند هەفتەیەک، ژیان پێڕەوی ڕێنوسێکی نوێی کردوە، ئەگەرچی لە بزوێنەکانیدا لە هی ئەم سەردەمەوە نزیک بوە بەڵام زیاد لە پێویست (موبالەغە) لە بە کار هێنانیدا کراوە. وشە و ڕستە عەرەبیەکانیشی بەو ڕێنوسە تازەیە نوسیوە، بەڵام دواتر وازی لێ هێناوە.

### 5. 2. لایەنی ڕۆژنامەگەری

سلێمانی هەر ئەو چاپخانە کۆنەی لێ بوە کە 1920 مێجەرسۆن هێنا بوی. ماکینە و دەزگاکانی هەر کۆنەکان بون و، بە هۆی پەشێوانی هەلومەرجی سیاسی سلێمانیەوە جاروبار پەکی کەوتوە. وەستاکانی سلێمانی، لە ئاسنگەر و چەخماخساز، چاکیان کردۆتەوە. ئەم (عەفو خواهی) یە تا ڕادەیەکی باش، کەمی توانای چاپخانەکە و ڕۆژنامەکەیان ئاشکرا ئەکا: "لەبەر نەخۆشی یەکێ لە موەزەفەکانمان دو هەفتە غەزەتەکەمان مومکین نەبو دەرچێ ئیستیرحامی عەفو لە قارییئینی کیرام ئەکەین. ژیان"(ژ 132).

ڕۆشنبیرانی سلێمانی دو جار هەوڵی کڕینی دەزگای نوێی چاپیان داوە. بۆ ئەو مەبەستە لەناو خەڵکدا پیتاکیان کۆکردۆتەوە: جاری یەکەم، لە سەردەمی حوکمڕانی شێخ مەحمودا. جاری دوەم، کۆمەڵی زانستی کوردان. هەردو جار بە هۆی تێکچونی بارودۆخی سیاسی سلێمانیەوە سەری نەگرتوە. جار ناجار پەنایان بردۆتەوە بەر دەزگای چاپە کۆنەکەی ملکی شارەوانی.

ژیان، بە هەمان چاپخانە و بە هەمان قەوارە و شێوەی رۆژنامەکانی پێش خـۆی دەرچـوە کـە لـە چـاو هونەری چاپ و رۆژنامەوانی سەردەمی خۆیدا، زۆر لە دوا بوە.

کلێشەی ناوەکەی لە ژ 1- 11 ئەوە بوە کە بە جۆرێکی سادە لە سلێمانی لەسـەر تەختـە هەڵکـەنراوە. بەڵام لە ژ 12 بە دواوە کلێشەکەیان گۆڕیوە بە یەکێکی کە کە حوزنی و یومنی دروستیان کـردوە. لـە ژ 12 دا بەم بۆنەیەوە نوسیوێتی:

"عەلەنەن تەشەکور

"زۆر زۆر سـەربەرز و خۆشـحاڵ بـوین بەمـەی کـە غەزەتەکـەمان خـۆی بردۆتـە دڵـی بـرا کـوردە موحتەرەمەکانمانەوە و لە هەمو لایەکەوە بۆ یاریەدان و پێشکەوتنی غەزەتەکە هـەوڵ ئـەدرێ. هـەر بـەم فکـرە بەرز و بڵندە ئـەمجارە لـە بەغـداوە لـە لایـەنی حـەکاکی بـە نـاو جـەنابان: حـوزنی و یـومنی ئەفەندیـیـەوە سەرلەوحەیەک بۆ غەزەتەکەمان بەو نەخش و نیگارە، بەو نوسینە جوان و شـیرینەی خۆیـان کـە دڵـی هـەمو کەسی بردوە، بە دیاری بۆمان نێرراوە. لە سایەی ئەم هیمەتە گەورەوە (ژیان) جەژنی بو بە دو.

"لە بەر ئەمە بە هەمو هێز و قوەتی دڵ تەشەکوراتی خالیسانەمان پێشکەش و بە دڵ و گیـان تەقـدیری ئەم خزمەت و هیمەتە گەورەیەیان ئەکەین و، لە جیاتی ئەم دیاریە بە قیمەتە (ژیان) ناوی موحتەرەمی (حـوزنی و یومنی) لە سەر سەری هەتا بژی ئەنوسێ و تەقدیسی ئەکات."

حوزنی لەو کاتەدا هێشتا رۆژنامەوانی نەکردبو بە پیشە لە بەغداد دوکانی حەکاکی هەبوە.

هەمو ژمارەکانی 4 لاپەڕەی 32 بە 20 سم بوە (جگە لە چەند بۆنەیـەکی کـەم کـە بـە هـۆی روداوی گرنگەوە کراوە بە 6 لاپەڕە یان پاشکۆیەکی لە گەڵ چاپ کـراوە) و، هـەر لاپەڕەیەکیشـی 2 سـتونی تـێدا نوسراوە.

مانشێتی نەبوە. خەتاتی تێدا بە کار نەهاتوە. حەرفی سەردێڕی وتار و مەتنەکەی یەک جـۆر و یـەک قەوارە بون. چەند حاڵەتێکی زۆر دەگمەن نەبێ کە هەندێ سەردێڕ بە حەرفێکی کـەمێ ئەسـتورتر نوسـراون. ئەوانی تری هەموی وەکو یەکە.

لە هیچ ژمارەیەکیدا وێنە و کاریکاتێر نیە.

## 6. نرخی مێژوی ی

ژیان بۆ مێژوی نوێی کورد، سەرچاوەیەکی دەوڵەمەنی جێ باوەڕە.

### 6. 1. بۆ مێژوی سیاسی

روداوەکانی کوردستانی عیراق، هەواڵەکانی شۆڕشی شێخ مـەحمود و، پێوەنـدی لـە گـەڵ ئینگلیـز و عیراق، مەبعوسەکانی کورد و پارلەمانی عیراقی، پێوەندی عیراق لە گەڵ تورکیا و ئێران و، رەنگدانـەوەی لـە جوڵانەوەی کـوردا، روداوەکـانی کوردسـتانی تورکیـا، روداوەکـانی کوردسـتانی ئێـران، پێوەنـدی عیـراق و دراوسێکانی، پێوەندی عیراق و ئینگلیز، گفتوگۆی ئەشرافی سلێمانی و نوێنەرانی عیراق و بریتانیـا، کـورد و پەیماننامەی 1930 ی عیراقی– ئینگلیزی...

### 6. 2. بۆ مێژوی رۆشنبیری

کۆمەڵی زانسـتی کـوردان، کۆمـەڵی بـژاری زمـانی کـوردی، یانـەی سـەرکەوتنی کـوردان لـە بەغـداد، بڵاوکراوەی کوردی، هەواڵی رۆژنامەکانی عیراق، تەمسیل، وەرزش...

**6. 3. بۆ مێژوی ئەدەبی**

لێکۆڵینەوەی ئەدەبی، نوێکردنەوەی شیعری کوردی، بانگەواز بۆ زیندوکردنەوە و چاپکردنی بەرهەمی شاعیرەکان...

**6. 4. بۆ مێژوی خوێندن و پەروەردە**

کردنەوەی مەکتەب، سیستەمی پەروەردە، پرۆگرامەکانی خوێندن...

**6. 5. بۆ مێژوی کۆمەڵایەتی**

داکۆکی لە ژن، داکۆکی لە جوتیاران، چاک کردنی ژیانی دانیشتوانی لادێ...

چەند تێبینییەک:

1. مامۆستایان ڕەفیق ساڵح و سدیق ساڵح خەریکی ئامادەکردن و لێکۆڵینەوەی هەمو ژمارەکانی (ژیان)ن لە چەند بەرگێک دا. بەرگی یەکەمیان بڵاوکردۆتەوە.
بڕوانە:
ڕۆژنامەی ژیان ژمارە 1– 81، ئامادەکردنی: ڕەفیق ساڵح، لێکۆڵینەوەی سدیق ساڵح، یەکەم بەرگ، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، 2002.
کاک سدیق ساڵح ل 5 – 99 ی ئەم بەرگەی تەرخان کردوە بۆ لێکۆڵینەوەیەکی وردی ناوەڕۆک و پێڕستی بابەت و ژیننامە و وێنەی نوسەرەکانی ئەم 81 ژمارەیە.
ژمارەکانی ژیان بە پاکی و جوانی چاپ کراونەتەوە. ڕەنجی ئەم دو جوامێرە بۆ ژیاندنەوەی سامانی ڕۆژنامەوانیی کوردی شایانی ڕێزلێنان و پشتیوانیی کۆڕ و کۆمەڵە ڕۆشنبیرییەکانی کوردە.

2. لە کاتی ئامادەکردنی ئەم باسەدا ئەو بەرگەی ژیان کە لە بەردەستی مندا بو ئەم ژمارانەی ناتەواو بو:
81/ 85/ 100/ 127/ 141/ 143/ 144/ 147/ 159/ 162/ 169/ 171/ 175/ 176/
182/ 183/ 193/ 198/ 201/ 202/ 203/ 205/ 210/ 212/ 214/ 215-219/ 221/
236/ 252/ 253/ 265/ 269-278/ 280-282/ 290-293/ 296/ 320/ 321/
ڕەنگە لە هەندێ لەو ژمارانەدا باس و بابەت و هەواڵی گرنگ هەبن. بەڵام من نەمتوانی کەڵکیان لێ وەربگرم.

3. لەم بەشەدا هەندێ بابەتی گرنگ و بایەخدار شایەنی بڵاوکردنەوە بون، بەڵام چونکە لە بەشی دوەم: (کوردستانی عیراق 1928- 1931: سەردەمی قەڵەم و موراجەعات) دا هەن، بە پێویستم نەزانی. خوێنەر ئەگەر ویستی ئەتوانێ ئەو بابەتانە لەو کتێبەدا بخوێنێتەوە.

# ژیان و هەواڵەکانی شێخ مەحمود

## 1. شەڕی هەمەلایەنەی ئینگلیز دژی شێخ مەحمود

### 1. 1. جائیزە بۆ کوشتنی

لە ئابی 1924 دا جەعفەر عەسکەری وازی لە وەزارەت هێنا. مەلیک فەیسەڵ، یاسین هاشمی تەکلیف کرد وەزارەت پێک بهێنێ. عەبدولموحسین سەعدون لە وەزارەتەکەی یاسین هاشمیدا بو بە وەزیری کاروباری ناوخۆ. لە حوزەیرانی 1925 دا کە یاسین هاشمی ئیستیقالەی کرد، مەلیک فەیسەڵ سەرلەنوێ عەبدولموحسین سەعدونی تەکلیف کرد وەزارەت پێک بهێنێ. ئەوە سێیەمین وەزارەتی سەعدون بو. رەشید عالی گەیلانی لەم وەزارەتەدا وەزیری داخلیە بو. جوڵانەوەکەی شێخ مەحمود هاوزەمان بو لە گەڵ ئەم ئاڵوگۆڕە وەزارییانەدا.

عەبدولموحسین سەعدون کە هاوزەمانی شۆڕشەکانی شێخ مەحمود، 2 جار ببو بە وەزیری کاروباری ناوخۆ و، 3 جار ببو بە سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیرانی عیراق، بۆ ئەوەی ئاسایش بگەڕێتەوە بۆ کوردستان، کوردستان بە بێ بەرەنگاری ببەسترێ بە دەزگای بەڕێوەبەرایەتی عیراقەوە، لایەنگری لە ناوبردنی شێخ مەحمود بو. سەعدون ئەم رایەی خۆی بە ئاشکرا دەربڕی بو.

عەبدولموحسین سەعدون، سەروەزیرانی ئەوسای عیراق دوای گەڕانەوەی لە سەردانی سلێمانی، لەو کۆبونەوەیەدا کە لە 4 ی 6 ی 923 دا لە کۆشکی شاهانەدا لە بەغداد، بە ئامادەبونی فەیسەڵ (مەلیکی عیراق)، هێنری دوبس (مەندوبی سامی بریتانی لە عیراق)، سێر جۆن سالمۆن (فەرماندەی گشتی هێزەکانی بریتانیا) و چەند کاربەدەستی ئینگلیزی و عیراقی تر، کە بۆ لێدوانی هەلومەرجی سلێمانی کردیان. سەعدون بە راشکاوی وتی: "هەمو خەڵک، جگە لە هەندێ سەرۆک عەشیرەت، بە هەمو هێزیانەوە ئەیانەوێ بخرێنە سەر عیراق. شێخ مەحمود لەبەر چاوی خەڵک کەوتوە. هەمویان رقیان لێی ئەبێتەوە، کە لێی ئەپونگێنەوە چونکە لە دەستدرێژییەکانی ئەترسن. لایەنگرانی شێخ مەحمود زۆر کەمن." سەعدون بۆ ئەوەی ئینگلیزەکان لە شێخ مەحمود تیژ بکا ئینجا وتی: "حکومەتی بریتانی درێخی لە یارمەتیدانی شێخ مەحمود نەکرد و چاکەیەکی زۆری لە گەڵ کرد، کەچی سودی نەبو. شێخ مەحمود کابرایەکی (شریر)ە دوای تەجروبەکانی رابوردو نابێ پشتی پێ ببەسترێ. ئەگەر بتوانرایە لە ناو ببرێ، ئەوسا رێککەوتن لە گەڵ کورد ئاسان ئەبو."

ئەگەرچی لە مانگی حوزەیرانی 1925 دا عیراق بە تەنگوچەڵەمەیەکی وەزاریدا تێ ئەپەڕی، یاسین هاشمی ئیستیقالەی ئەکرد و وەزارەتەکەی ئەڕوخا و، وەزارەتێکی تازە لە سەر تەکلیفی مەلیک فەیسەڵ، بە سەرۆکایەتی عەبدولموحسین سەعدون تەشکیل ئەکرا، بەڵام دیارە ئەم ڕوداوانە کاریان لەو بڕیارە نەکردوە کە ئەنجومەنی وەزیران لەسەر داوای مەندوبی سامی بە دەستیەوە بوە.

"بڕیاری چوارەمی ئەنجومەنی وەزیران لە دانیشتنی 13 ی حوزەیرانی 1925 دا:

"نوسراوی (ژمارە بی. ئـۆ/ 122 ی 8 ی حوزەیرانی 1925) ی موستەشاری فەخامەتی مەندوبی سامی عیراقی خوێندەوە سەبارەت بە تەرخان کردنی 100 هەزار ڕوپیە پاداشت (جائیزە) بۆ گرتن وە یا کوشتنی شێخ مەحمود و، کەریمی فەتاح بەگ و سابیری کوڕی. لەوە 60 هەزار ڕوپیەی بۆ کوشتن وە یا گرتنی شێخ مەحمود و، 20 هەزار ڕوپیەیش بۆ هەر یەکێ لە کەریمی فەتاح بەگ و سابیری کەریم بەگ. بەو مەرجەی ئەو پارەیەی بۆ کوشتنی یەکێ لەو سێیانە ئەدرێ چواریەکی ئەو پارەیە بێ کە بۆ گرتنیان ئەدرێ. ئەنجومەنی وەزیران بڕیاریدا ئەم پێشنیارە قبوڵ بکا."

"بڕیاری دوەمی ئەنجومەنی وەزیرانی لە دانیشتنی ڕۆژی 30 ی حوزەیرانی 1925 دا:

"نوسراوی (بی، ئـۆ/ 151 ی 19 ی حوزەیرانی 1925) ی فەخامەتی مەندوبی سامی خوێندەوە، سەبارەت بە ڕاسپاردنی موفەتیشی ئیداری سلێمانی بۆ دانی جائیزە بۆ ئەو مەبەستەی لە بڕیاری چوارەمی دانیشتنی 13 ی حوزەیرانی 1925 دا باس کراوە، بۆ کەسانێک جگە لە ئەفرادی هێزی ئاسوری. ئەنجومەنی وەزیران بڕیاری دا دەسەڵات بدا بە موفەتیشی ئیداری سلێمانی کە بۆ هەندێ کەسی هەڵبژێردراوی ڕون بکاتەوە کە ئەگەر ئەنجامی ویستراو بە هۆی ئەوانەوە بو جائیزەکەیان ئەدرێتی بەو مەرجەی لە سنوری ئەو مەبلەغەدا بێ کە ئەنجومەن لە دانیشتنی 13 ی حوزەیرانی 1925 دا موافەقەتی لە سەر کردوە."

تەرخانکردنی 60 هەزار ڕوپیە بۆ گرتن وە یا کوشتنی شێخ مەحمود، لەبەر ئەوە بوە کە شێخ مەحمود سەرکردەی جوڵانەوەکە بوە. لایان وا بوە بە لەناو بردنی ئەو جوڵانەوەکە یش تەواو ئەبێ. هی کەریمی فەتاح بەگ و سابیری کوڕی یشی لەبەر ئەوە بوە تاوانبار بون بە کوشتنی کاپتان بۆند و ماکانت کە دو ئەفسەری ئینگلیزی بون.

لەو کاتەدا سێر هێنری دوبس مەندوبی سامی بوە لە عیراق، کاپتن لاین موفەتیشی ئیداری سلێمانی بوە. پێ ئەچێ نەیانویست بێ تەرخان کردنی ئەم جائیزەیە لەناو خەڵکدا بڵاو بکەنەوە، بەڵکو ویستویانە لە ڕێگەی چەند کەسێکی هەڵبژێردراوەوە کارەکە ئەنجام بدەن. بەڵام سەرەڕای تەرخان کردنی ئەم پارە زۆرە، نەیانتوانیوە کەسانێک پەیدا بکەن شێخ مەحمودیان بۆ بکوژێ.

### 1. 2. شێواندنی ناوبانگی

دەسەڵاتدارانی ئینگلیز بۆ شێواندنی ناوبانگی شێخ مەحمود و زڕاندنی ناوی خۆی و لایەنگرەکانی، هێرشێکی پرۆپاگاندەی فراوانیان دەس پێ کردوە، لە لایەکەوە ژیان کەوتۆتە نوسینی وتار و لێدوان و، لە لایەکی ترەوە بە تۆمەتی بەفیڕۆدانی پارەی شارەوانی داویانەتە دادگا.

#### 1. 2. 1. وتاری ڕۆژنامە

"قەت گورگ ئەبێ بە شوانی مەڕ؟

"مودەتێکی زۆر ئەم وەتەنە مەعسومە بە دەست بەعزێ خائینانی خۆیەوە ئەینالاند. هەر ڕۆژێ بە نەوعێ، هەر سەعاتێ بە بەهانەیەک، ئەم میلەتە مەزڵومەیان ئیغفال ئەکرد. ئەم خائینانە گاه بە مەسئەلەی

موصل و هاتنەوەی تورکەوە میلەتیان ئەتۆقاند، گاە بە وەعدەی ئیستیقلالیەتی کوردەوە سەریان لەم خەلقە ئەشێواند. تا لە نەتیجەدا بون بە سەبەبی ئەم فەلاکەتە عەزیمە کە دیمان.

"لە روی ئەم بەدخواهانەوە ئەوی لەمەوپێش زانی بومان، ئەوی کە چەند ساڵ لەمەوبەر بیست بومان، لە بیرمان چوەوە. لە تەرەقیاتی عەسری حازر مەحرومیان کردین، ئیستراحەتیان لێ سەلب کردین، لە تێگەیشتن و پێشکەوتنی پەنجا ساڵ دوایان خستین. وەلحاسڵ ئەوی مەتلەبیان بو لە خراپە بە سەرمانا ئیجرایان کرد.

"فەقەت مەسئەلەی مەشهورە: (چرای دز ناگاتە بەیانی) شوکر ئێستا میلەت بە تەواوی لە فکری ئەمانە گەیشت، مەنفەعەتپەرستی ئەم خائینانەی کەشف کرد.

"ئیتر تێ گەیشتن کە مەقسەدی ئەمانە تەنها مەنفەعەتپەرستی، تەنها ئینتیقام جویی، تەنها تەرەفداری جەهالەت و شەقاوەت بو. هەوڵ و تەقەلایان هەر بۆ ئەشقیا حیمایە کردن، هەر بۆ میلەت تاڵان کردن و خۆ دەوڵەمەند کردن بو.

"ئیتر شوکر هیچ کەس بە قسەی ئەم خائینانە باوەڕ ناکات.

"چاوی رەشیان کاڵ بوەوە، هیچ گورگ نابێ بە شوانی مەڕ، هیچ زەمانێک پشیلە نابێ بە ئێشکچی گۆشت.

"حقوقی میلەت کەی بە جەردەیی و دزی و درۆزنی سەنراوە؟ تاڵان کردنی دێهات، روتاندنەوەی میلەت، روتکردنەوەی کاروان، کوشتنی رێبوار، تو خوا کەی ئیستیقبالی قەومێ تەئمین و روناک ئەکات؟

"ئیدیعای حقوق بۆ بە دەست خستنی حقوق ئەکرێ، بۆ غەسبی حقوق ناکرێ. فیداکاری بۆ محافەزەی شەرەف و ناموس، بۆ تەئمینی ئیستراحەت و تیجارەت، بۆ تەرەقی عیلم و مەعاریف لازمە، نەک بۆ نەهێشتنی شەرەف، نەک بۆ سەلبی ئیستراحەت، نەک بۆ هەڵگرتنی عیلم و مەعاریف.

"ئەم میلەتە کەی ئەیویست وای بۆ بکرێ، تا وای لێ بکرێ؟

"ئیتر ئەی خائینانی وەتەن! ئەمین بن دایکی وەتەن ئیتر ئێوە بە ئەولادی خۆی قبوڵ ناکا، چونکە وەجاختان کوێر کردوە، چونکە نمەک بە حەرامیتان لە گەڵ کرد.

"ئەی دوشمنانی میلەت! موحەقەق بزانن میلەتی کورد ئیتر ئێوەی لە قەیدی کوردیەت و لە زومرەی بەشەریەت دەرهاویشتوە.

"ئەی گومراهانی تەریقی سەلامەت! لێتان مەعلوم بێ میلەت رێگای نەجاتی خۆی دۆزیوەتەوە، عەنقەریب سەعادەتی ئەبەدی خۆی دەست ئەکەوێ و ئێوەش وەکو فاسقی مەحروم لە دورەوە مەئیوس و مەحروم ئەمێننەوە.

"ئەی بەدخواهان، وەی مەنفەعەتپەرستان! ئیتر ئەمین بن ئەو ناوە ناشیرینە، ئەو لەکە چرکنە، تا ئەبەد بۆ ئێوە باقیە، وەکو خاڵێکی رەش لە ناوچاوانتان ناسرڕێتەوە.

"ئیتر هەر لە ئێستاوە کفن بۆ خۆتان ببڕن لە هەمو شتێک چاکترە، تا ئێوە خراپیی بکەن نەفرەتی میلەت زیاد ئەکا و ئەمین بن جەزای خۆتان بە چاوی خۆتان لە دەست میلەتی خۆتانی ئەبینن!"(ژیان، ژ 3، 4 ی شوباتی 926)

"دەنگی دەهۆڵ لە دور خۆشە!

"هەرچەند ئەم غەزەتەیە هەمو وەختێ مەسلەکێکی ئیعتیدالکارانە تەعقیب و زبانێکی مولایمانە محافەزە ئەکات، بەڵام هیچ وەختێکیش چاکە و خراپەی لە بیر ناچێ. بۆ ئەوانەی کە چاکەیان بۆ میلەت پیشان داوە و ئیستراحەتی میلەتیان تەئمین کردوە، دائیمەن خۆی بە مەدیونی شوکرانیان ئەزانێ و عەلەنەن عەرزی تەشەکوراتیان ئەکات. وە بۆ ئەوانەش کە خراپەی بە میلەت گەیاندوە و خیانەتیان لە گەڵ میلەت کردوە، لە

تەشهیر و تەنفیرکردنیان قسور ناکات. لە بەر ئەمە هەتا ئێستا ئەم غەزەتەیە چەند جارێک بە لیسانی حـال و قال بە سورەتێکی ئینتیباهی خیانەتی و خراپەی شێخ مەحمودی خستۆتە بەر نەزەری دیقەت، داخل و خـاریج و، بە ناو خەلقا ئیعلانی کردوە.

"بەڵام ئەڵێن: (دەنگی دەهۆڵ لە دور خۆشە) ئەترسـم هـەنگێ کـەس ئـەم حەقایقـە ئینکـار بکـا و بـە نەوعێکی تر حەملی بکا، وەکو عەبدولکەریم ریفی و شێخ سنوسی، ئەمیش بـە سـاحیبی قـودرەت و غایەیـەک بژمێرن. لە بەر ئەمە مەجبور بوین ئەوی دەرحەق بەم شەخسە دیبێتمان و بیستبێتمان بەیانی بکەین.

"ئەم شەخسە بێجگە لەوەی کە هەمو میلەتی روتاندەوە و خەزێنـەی مالیـەی تـاڵان کـرد و، بـۆ ئامـالی غەیرە مەشروعەی خۆی پەخشانی کرد، میقدارێ پارەش کە لە تـەرەف حەمیەتمەنـدانی کـوردەوە بـۆ هێنـانی ماکینەیەکی چاپ کۆ کرابوەوە قوتی دا و، دیسانەوە بەمەش چاوی تێر نەبو پارەیـەکی زۆری بەلەدیـە کـە لـە سندوقی بەلەدیەدا مەوجود بو، وە سیرف عائیدی بەلەدیە بو، وە حەقی حکومەتی بە سەرەوە نەبو، وە ئیجابی ئەکرد تەنها سەرفی عیمران و نەواقیسی مەملەکەت بکرێ، بەم سورەتە کە لەمـەولا بـەرە بـەرە دەرج و ئـیعلان ئەکرێ سەرفی کردوە و، ئەم سەرفیاتە لە یەومیەی ئەو مودەتەی بەلەدیـەدا موقەیـەد و مـەوجودە. ئینجـا هـەر تەماشای بکرێ و عیبرەت وەرگیرێ!"(ژیان، ژ 7، 4 ی مارتی 926)

لە ژمارەکانی 8– 11 و 14 دا لیستەی ئەو خەرجی‌یانەی بڵاو کردۆتەوە.

شێخ مەحمود نفوزێکی گەورە و رێزێکی زۆری لە ناو کوردا، بە تایبـەتی لـە نـاو خـەڵکی ناوچـەکانی سلێمانی و کەرکوک و گەرمیان دا هەبوە. ئەم بابەتانە و چەندین بابەتی تر کە ژیان بڵاوی کردونەتـەوە، بـۆ زراندنی ناوی شێخ مەحمود و، پوچەڵ کردنی ناوەرۆکی سیاسی و نەتەوەیی شۆڕشەکەی بـوە. بەشـێک بـوە لەو هێرشە فرە لایەنەی کراوەتە سەری. بەڵام ئەم شاڵاوە بەرفراوانەی جەنگی پروپاگاندە دژی شێخ مـەحمود کارێکی ئەوتۆی لە بیروبۆچون و هەڵوێستی زۆر لە نیشـتمانپەروەرانی کـورد نـەکردوە. هـەر لـەو رۆژانـەدا (جەمعیەتی زەردەشت) کە لە لایەن چەند لاوێکی نیشتمانپەروەرەوە بـە نهێنـی دامـەزراوە، نامـە و نوێنـەریان ناردۆتە لای شێخ مەحمود. تکایان لێ کردوە ببێتە سەرۆکی (جەمعیەت)ەکەیان، لە گەڵ حکومەت پێک نەیەت و درێژە بە تێکۆشان بدا.

بڕوانە: د. کەمال مەزهەر: چەند لاپەڕەیەک لە مێژوی گەلی کورد، بەرگی دوەم، هەولێر.

### 1. 2. 2. دانی بە دادگا

بەشێکی تری جەنگی پرۆپاگاندە دژی شێخ مەحمود، بریتی بوە لەو شکاتەی شارەوانی سـلێمانی لـێی کردوە سەبارەت بە خەرج کردنی ئەو پارەیەی لە لایەن خەڵکەوە کۆ کرابوەوە بۆ کڕینی دەزگای چاپ.

**"ئیعلان**

"بینا لە سەر دەعوای دائرەی بەلەدیەی سلێمانی لەسـەر مـودەعی عەلـەیهی حەفیـدزادە شـێخ مـەحمودی کوڕی شێخ سەعید، مەحکەمەی بیدایەتی سلێمانی بەپێی مادەی 1462 و 1606 لـە مەجەلـە و مـادەی 97 و 100 لە ئوسولی محاکەماتی حقوقیە غیابەن حوکمی دا بە سەر مودەعی عەلەیهی شێخ مەحمود بـە تەئدیـەی دە هەزار وشەصت و چوار روپیە و نیو و سی و هەشت لیرەی عەینی عوسـمانی، ئـەو مەبلەغـەی کـە لـە وەختـی خۆیدا لە تەرەف ئەهالی سلێمانیەوە بۆ کڕینی ماکینەی تەبع تەبەڕوع کـرا بـو، وە مـودەعی عەلـەیهی غەسـبی کرد بو، لە گەڵ فائیزی نیزامی صەدی نۆ، لە تاریخی تەلەب کە موسادیفی 30 ی کـانونی سـانی 926 ەوە

هەتا حینی تەئدیە و تەحمیلی مەساریفی محاکەمە پێنج سەد و سی و پێنج روپیە ئوجرەتی محامی بۆ سێ جەلسە و، صەد و پەنجا روپیە ئوجرەتی تەنزیمی لەوایحی قانونیە و پارەی پول و ئوجرەتی مومەیزین و ئیعلان لە سەری. وە لە بەر ئەمە کە مودەعی عەلەیهی شێخ مەحمود محەلی ئیقامەتی مەجهولە بە سورەتی ئیعلان لەم غەزەتەدا ئەم حوکمە تەبلیغی ئەکرێ کە لە تاریخی نەشریەوە هەتا پانزدە رۆژ حەقی ئیعتیراز و لە پاش ئەوە هەتا سی رۆژ حەقی ئیستینافی هەیە. ئەگەر لە زەرفی ئەم مودەتەدا بە ئەم توروقی قانونیەیە تەوەسول نەکا ئەم حوکمە کەسبی قەتعیەت دەکا."

3 ی شوباتی 926 مەحکەمەی بیدایەتی سلێمانی"(ژیان، ژ 3، 4 ی شوباتی 926)

**"ئیعلان**

"حەفیدزادە شێخ مەحمود کوڕی شێخ سەعید بە پێی ئەو ئیعلامە کە بە تاریخی 3 ی شوباتی 926 و عەدەد 7 لە مەحکەمەی بیدایەتی سلێمانی سادر بوە و لە تەرەف دائیرەی بەلەدیەوە تەنفیزی حوکمی تەلەب کراوە، بە تەئدیەی دە هەزار و شەستوچوار روپیە و نیو و حەوت ئانە و، سی و هەشت لیرەی عەینی عوسمانی لە بەر ئەمەی مەحکوم عەلەیهی ئەمڕۆ محەلی ئیقامەتی مەجهولە ئەوا بە ئیعلان ئیخبار دەکرێ کە لە تاریخی نەشرەوە هەتا مانگێک خۆی وە یا وەکیلێکی لە دائیرەی سلێمانی ئیسپاتی وجود وە ئەم مەبلەغە تەئدیە نەکات، حوکمی ئەو ئیعلامە بە سورەتی حیجز و فرۆشتنی ئەموالی مەنقولە و غەیرەمەنقولەی تەنفیز دەکرێ."

10 شوباتی 926 رەئیسی ئیجرای سلێمانی "(ژیان، ژ 4، 11 ی شوباتی 926).

### 1. 3. وشک کردنی سەرچاوەکانی دەرامەتی

شێخ مەحمود ئەرکێکی دارایی گەورەی لەسەر شان بوە. بەرپرسی دابینکردنی پێویستییەکانی ژیانی خێزانەکەی خۆی و هەمو چەکدارەکانی بوە. نە هیچ دەوڵەتێک هەبوە یارمەتی دارایی بدا و، نەخۆیشی دەزگایەکی دارایی هەبوە ئەم کارە ئەنجام بدا. سەرچاوەی دەرامەتی بریتی بوە لە ملکانەی زەوی و زاری گوندەکانی خۆی و، لەو باجەی لە دانیشتوانی دێهات و خێڵە رەوەندەکانی کۆ کردۆتەوە.

وەزارەتەکەی سەعدون بۆ بنبرکردنی بزوتنەوەکە، رێوشوێنی وشک کردنی سەرچاوەی دەرامەت و دارایی شێخ مەحمودی دانا. لە لایەکەوە بە زەوت کردن و دەس بەسەرا گرتنی هەمو موڵکەکانی خۆی و کوڕەکانی و هاوسەرەکانی و خوشکەکەی و، لە لایەکی ترەوە بە رێگرتن لە کۆکردنەوەی باج و سزادانی ئەوەی باجی ئەدا:

**"ئاگاداری**

"بۆ زانینی هەمو، سورەتێکی قەراری مەجلیسی وزەرا کە لە خسوس موسادەرەی ئەملاکی شێخ مەحمود و ژنەکانیەوە دەرچوە، لێرە نیشانی قارئینی کیرامی ئەدەین:

"وەزارەتی داخلیەی عیراق

ژمارە 1165 تاریخ 6 ی مایسی 1926

"ئەمری وەزاری

"بە موجیبی قەراری مەجلیسی وزەرا کە لە تاریخی 2 ی مارتی 926 دەرچوە و بینا لە سەر ئەو سەلاحیەتەی کە بە موجیبی مادەی 27 ی قانونی مونازەعاتی جەزائیە و مەدەنیەی عەشائیر بە من دراوە ئەمرمان کرد کە جەمیعی ئەملاکی شێخ مەحمود کوڕی شێخ سەعیدی بەرزنجی و، ژنەکانی: عایشە خان و

بەهیە خانم، بە ناوی حکومەتەوە موسادەرە بکرێ و بفرۆشرێ بە شەرتێ قیمەتەکانیان بە موجیبی ئەوامیرێک کە لە ئاخرییا سادر ئەبێت سەرف بکرێت." (ژیان، ژ 18، 27 ی مایسی 1926).

**"بۆ زانینی هەموو**

"داخلی قەزای شارباژێڕ لە دێی کەناروێدا یانزدە پارچە زەوی بەراو کە ناویان: زەمینی کۆتەرە وشکەڵ کە بە دێبەری حەمە شولە و زەمینی خوارماڵ کە بە دێبەری برایمی فەقێ عەلی و زەمینی بەرباغ کە بە دێبەری قادری فەقێ عەلی و زەمینی بەرماڵان کە بە دێبەری شەریفی فەقێ عەلی و دو زەمینی تر کە هەردوکیان ناورێیان پێ ئەڵێن و بە دێبەری حەمە شولە مەشهورن و سێ پارچەی تر کە هەرسێکیان بە زەوی بەرماڵانی میری و ماڵان و سەرئەستێڵ کە هەردوکیان بە دێبەری مەلا محەمەد و ئەحمەد موسا مەشهورن و، بە ناوی شێخ مەحمودەوەن. ئەم زەوییانە موقابیل بە تەلەبی بەلەدیە خرانە مەوقیعی موزایەدەوە بینائەن عەلەیهی لە ئیعتیباری نەشری ئەم ئیعلانەوە هەتا سی رۆژ هەرچی تالبە صەدی دە تەئمینات بهێنێت و موراجەعەت بە دائیرەی ئیجرای سلێمانی بکات."

26 ی ئەیلولی 926 رەئیسی ئیجرای لیوای سلێمانی"(ژیان، ژ 35، 30 ی ئەیلولی 926)

**"ئیعلان**

"نەزەر بە موندەرەجاتی ئیعلامێک کە لە تەرەف بەلەدیەی سلێمانیەوە بۆ تەنفیز بەم دائیرەیە تەودیع کرا بو شێخ مەحمودی حەفید مەحکومی تەئدیەی دە هەزار و شەست و چوار روپیە و نیو و سی و هەشت لیرەی عوسمانی بوە بۆ بەلەدیە وە لە بەر ئەوەی مەحکوم عەلەیهی بە رەزای خۆی لە تەئدیەی مەبلەغی مەحکوم بیهی ئیمتیناعی کرد، لە سەر تەلەبی مەحکوم لەهو ئەم دائیرەیە حیجزی سیانزە دوکان لە شاری سلێمانی و پەنجا پارچە زەوی بەراو کە لە دێی کەنارو و کانی سپیکە و کەڵەکن و داریکەلی واقیعن قەراری داوە، بینائەن عەلەیهی لە تاریخی ئەم ئیعلانەوە هەتا سی رۆژ ئەگەر مەحکوم عەلەیهی تەئدیەی مەبلەغی مەحکوم بیهی لە گەڵ مەساریفاتی سائیرەی نەکات، ئەم موڵکانە کە حیجز کراون عەلەل ئوسول بە تالیبی دەفرۆشرێت و لە قیمەتەکەی مەبلەغی مەحکوم بیهی ئیستیفا دەکرێ. لە بەر ئەمە ئیعلان کرا."

رەئیسی ئیجرای لیوای سلێمانی."(ژیان، ژ 16، 13 ی مایسی 926)

**سزادانی جاف**

"چەند ساڵێکە بەعزێ لە عەشائیری جاف ئیستیفادەیان لە وەزعی مەملەکەت کرد و لە راووڕوت و جەردەیی و ئەزیەتی فەقیر و فوقەرا قسوریان نەکرد بو، وە بوبون بە باعیسی زۆر موشکیلات لە ئیشوکاری حکومەت دا و ئەمنیەت و ئاسایشی لیوایان ئیخلال کرد بو.

"ئەمجارە جەنابی موفەتیشی ئیداری غەیور، بە ئۆردویەکەوە تەشریفی لە شارەزوردا دەوریەیان فەرمو، وە بەو موناسەبەتەوە هەم هەمو شارەزوریان لە تەعەڕوزات و تەجاوزاتی جاف محافەزە و حقوقی زۆر مەغدوریان جێبەجێ کرد و، دیسان لەم دو تائیفە شەڕارە، لە رۆغزادی هەزار و لە تەرخانی پێنجسەد سەر حەیوانی بە جەزا لێ سەندن. فەقەت لە هەمو شتێک چاکتر 9 کەس لە ناودارانی رۆغزادی و تەرخانییان دەردەست و، مەحفوزەن سەوقی مەرکەزی لیوا فەرمون. ئەو 9 کەسە ناویان لە خوارەوە نوسراوە. ئەلئان لە دائیرەی پۆلیس مەحبوسن و لە مەقامی موتەسەڕیفیەوە بۆ حوسنی سلوک و حیفزی نیزام، داوای تەعەهود و زەمانیان لێ کراوە و، سەنەدی ئەوە بدەن دائیمەن موتیعی ئەمری حکومەت بن.

"بەم موناسەبەتەوە تەبریکی هیمەتی جەنابی موفەتیشی ئیداری ئەکەین کە حەقیقەتـەن ئـەم هیمـەت و فەعالیەتەی شایانی تەقدیر و سەنایە و، واسیتە بو بۆ چاوشکاندنی ئەشقیا و ئەشرار.

قادری وەیسی، رۆغزادی. رەشید باوەجان، رۆغزادی. ئەحمەد شاسـوار، رۆغـزادی. رۆسـتەمی حەمـەی مەحمود، رۆغزادی. فارس عەزیز، رۆغزادی. عەبدولکەریم رۆبیتەن، رۆغزادی. فەتاح کامەران، رۆغـزادی. حەمـە حەسەن مەحمود، تەرخانی. حەمەی شاسوار، تەرخانی" (ژیان، ژ 41، 11 ی تشرینی سانی 926)

**"قادری وەیسی**

"لە روئەسای رۆغزادی قادری وەیسی کە مودەتێکە لە گـەڵ بـەعزێ لـە روئەسـای تـری رۆغـزادی و تەرخانیدا گیرا بو، لە سەر تەنسیبی مەقامی موتەسەرڕیفیەت بەرامبەر بە 5 هەزار روپیـە تـەئمینات کـە داویـە بەرەڵا کرا، بە شەرتێ کە لەمەودوا لە هەمو خسوسێکەوە ملکەچی حکومەت بێ و، لەم مـودەتی دو سـاڵەدا کـە بۆیان داناوە بە هیچ کلۆجێ بزوتنەوەیەک کە ببێتە باعیسی تێکدانی ئەمن و ئاسایش لێی رو نەدا. هەروەکو زانراوە دەرحەق بە رەفیقەکانی تریشی تـەتبیقی ئـەم کەیفیەتـە نیـەت کـراوە." (ژیـان، ژ 58، 17 ی مـارتی 927)

**"تەعویزات**

"ئەو هەزار و پێنجسەد سەرمەڕەی کە بە جەزا لە روغزادی و تەرخانی سەندرا و کە فرۆشرا تەقریبـەن بایی چواردە هەزار روپیە بو، ئەمجارە لە سەر تەنسیبی حکومەت وا قەرار درا بـە سـەر ئـەوان کەسـانەدا کـە لەمەوپێش لە لایەنی ئەم دو عەشیرەتەوە توشی زەرەر و زیان بون دابەش بکـرێ. لـە عەدالـەت و مەرحەمـەتی حکومەت و لە عالیجەنابیی موتەسەرڕیف، کە بێ شوبهە بۆ ئەم خسوسـە هیمـەتیان روی داوە، بـە زیـاد بـێ." (ژیان، ژ 56، 3 ی مارتی 927)

## 1. 4. راونانی هێزەکانی

شـێخ مـەحمود، ئەگـەرچی چەنـدین ئەفسـەری دەرچـوی ئاکـادیمی جـەنگی ئەسـتەموڵ و چەنـدین رۆشنبیری شارەزای لە گەڵ بوە، بەڵام ستراتیجێکی جـەنگی دیـاریکراوی نـەبوە کـە ئامـانج و تاکتیـک و جۆری شەڕەکانی و، مەیدانەکانی کار و چالاکیەکانی و، شێوەی رێکخستنی هێزەکانی، دیاری بکا.

شێخ مەحمود و هێزەکانی بە زۆری خۆیان لە شەڕ لاداوە. هەڵوێسـتی (دیفـاعی سـەلبی) یـان گرتـوە. هەمیشە چاوەڕێ بون دوژمن هێرشیان بهێنێتە سەر. سەرکردایەتی جەنگی و سیاسیی بریتـانی لـە عیـراقدا، بەو هەمو تەجروبەیەوە کە لە بواری جۆراوجۆری جەنگدا هەی بوە، بە هێزی ئاسمانی و زەمینی هەمیشـە لـە راونانی شێخ مەحمود و هێزەکانیدا بوە. هێزەکانی شێخ مەحمود کە لە تاقمی خێڵەکی نارێکوپێک، بگـرە بـێ سەر و بەردا ساز درا بون، تواناى پەلاماردان و بەرگری هێزی بریتانی و عیراقیان نەبو، بە تایبەتی چونکە ماوەی چەند ساڵێکی خایاند. لەبەر ئەوە هەمیشە لە کەمبونـەوە و هـەڵوەرین دا بـون. لێیـان ئـەگیرا، لێیـان ئەکوژرا و لێیان تەسلیم ئەبوەوە.

ئەگەرچی لەو ماوەیەدا ژمارەیەکی زۆر شەڕ و پێکدان لـە ناوچـەی جیـاوازی دور لـە یـەک دا روی داوە، هێزی شاهانەی ئاسمانیی ئینگلیز بە چالاکی بەشداری هێرشەکانیان کردوە و، دەیان گوندیان وێـران و، سـەدان باخ و خەرمانیان ئاگر تێ بەرداوە و، دەیان چەکداری شۆڕش و هاوڵاتی مـەدەنییان کوشـتوە، بـەڵام ژیـان زۆر کەم ئەو روداوانەی تۆمار کردوە. یەکێ لەو روداوانە هەواڵی (کوشتنی کەریم بەگ) ە کە بەمجۆرە نوسیوێتی:

"کەریم بەگ کە مودەتێکە بە خەباسەت و شەقاوەتی بێ ئینسافانە و بێ دینانە عالەمی لیوایەکی ڕەنجیدە و دڵخون کرد بو، وە لە دەنائەت و جەردەیی ئانێک فاریغ نە ئەبو، لە گەڵ ئەمەیش دا هەمو وەختێ لە ترسی قیوای حکومەتی کوناوکون خۆی ئەشاردەوە، ئەوا ئەمجارە لە شەڕێک دا کە لە گەڵ دێی قەرەتامور دا کردویەتی، کە دێیەکە لە دێهاتی دەوری چەمچەماڵ و یونس ئاغای مەحمود ئاغا گەورەیانە، کوژراوە. دائیر بە کوشتنی ئەم پیاوە، ڕاست و درۆ، گەلێ تەواتورات هەیە، سەحیحەکەی ئەمەیە کە ئێمە لە مەنبەعێکی مەوسوقەوە وەرمان گرتوە:

"مەرقوم کەریم بەگ خۆی و تاقمێک لە هەمپاکانی چەند ڕۆژێ لە پێش کوشتنیا لەو دێهاتی دەوروپشتی چەمچەماڵەدا ئەسوڕانەوە و هەر شەوە میوانداریان بە دێیەک ئەکرد. نۆرە دێتە سەر قەرەتامور. یونس ئاغا لە هاتن مومانەعەتیان ئەکات و، خەبەری لێ ئەگێڕێتەوە کە تۆ لە حکومەت عاسیت و پیاوێکی جەردەی، لەبەر ئەمە مەسئولیەت ناهێنمە سەر خۆم. ئەویش کە پەردەی مەغروریەت چاوی داپۆشی بو گوێ ناداتێ. لە سەر ئەمە لێیان ئەبێ بە شەڕ. لەو شەڕەدا پیاوێکی کەریم بەگ و کوێخاکەی قەرەتامور ئەکوژرێ، کەریم بەگیش بریندار ئەبێ و بڵاوەی لێ ئەکرێ. هەر لە تەئسیری ئەو برینە لە پاش یەک دو سەعات خاتیمە بە حەیاتی شەقاوەتی کەریم بەگ دێت. لە غەزەتەکانی بەغدادا کە نوسراوە لە شەڕێک دا لە گەڵ جەیش کردویەتی کوژراوە بێ ئەسڵە. ڕاستیەکەی ئەمە بو کە عەرزمان کردن." (ژیان، ژ 24، 15 ی تەموزی 926).

**کەریم بەگی فەتاح بەگ** لە سەرانی تیرەی بەگزادەی هەمەوەند بوە. هەر لەو کاتەوە کە شێخ مەحمود بو بە حوکمداری کوردستان کەریم بەگ بە دڵسۆزی دایە پاڵ شێخ مەحمود، تا کوژرا لێی جیانەبوەوە.

دوای گیرانی شێخ مەحمود لە حوزەیرانی 1919 دا و، دورخستنەوەی بۆ هیندستان، کەریم بەگ خۆی بە دەستەوە نەدا و بە یاخێتی لە ئینگلیز مایەوە. هێزێکی لە هەمەوەند ساز دا، شان بە شانی دەیان کەسی کە لە جەباری و جاف و پشدەری، بەرگری داگیرکەرانی ئینگلیزی و، داوای گەڕانەوەی شێخ مەحمودی ئەکرد.

لە حوزەیرانی 922 دا لە گوندێکی دەوری چەمچەماڵ کاپتن بۆند و کاپتن ماکانت، دو ئەفسەری ئینگلیزی کوشت. کاپتن بۆند حاکمی سیاسی چەمچەماڵ بو. بەمەیش بو بە دوژمنی ژمارە یەکی ئینگلیز. ئەو کاتە 10 هەزار روپیە (پاداشت) یان تەرخان کرد بۆ لە ناو بردنی.

کاتێ هێزی تورک گەیشتە ڕەواندز، کەریم بەگ چوە لایان و، لە شەڕی دەربەندی ڕانیەدا لە 23 ی ئابی 922 دا کە هێزی ئینگلیز زۆر بە خراپی شکا، بەشداریەکی کاریگەری کرد. ئەم شەڕە و، چەند شەڕێکی تر و زیادبونی جموجوڵی دوژمنانی ئینگلیز کاربەدەستانی ئینگلیزی ناچار کرد، بیر لە چۆڵکردنی سلێمانی و هێنانەوەی شێخ مەحمود بکاتەوە.

کاربەدەستانی ئینگلیز لە ئەیلولی 922 دا سلێمانیان چۆڵ کرد. لە کاتێکدا پیاوماقوڵانی سلێمانی خەریکی ڕێکخستنی کاروباری سلێمانی بون، کەریم بەگ بە هێزێکەوە گەیشتە ناو شار. مستەفا پاشای یامڵکی گرت کە یەکێ بو لە دوژمنە سەرسەختەکانی کەمالیەکان. بە تەما بو بە گیراوی بینێرێ بۆ ئۆزدەمیری فەرماندەی مەفرەزەکەی تورک لە ڕەواندز، بەڵام خەڵک مستەفا پاشایان بەرەڵا کرد و ڕێگەیان بە کەریم بەگ نەدا ئەم کارە ناپەسندە بکا.

کاتێ شێخ مەحمود گەڕایەوە، کەریم بەگ دیسانەوە دایەوە پاڵ شێخ مەحمود. بەڵام لە بەر ئەوەی لە لایەن ئینگلیزەوە بە تاوانبارێکی خواستراو دانرا بو، سەرەتا شێخ مەحمود لە خۆی نزیک نەخستەوە تا نێوانی بە ئاشکرا لە گەڵ ئینگلیز تێک چو.

کە شێخ مەحمود سلێمانی بە جێ هێشت و روی کردە ئەشکەوتی جاسەنە، کەریم بەگ لە دەوری سلێمانی مایەوە. کاتێ ئینگلیز بۆ جاری دوەم سلێمانی چۆڵ کردەوە، پێشرەوی هیزەکانی شێخ مەحمود کە چونەوە ناو شاری سلێمانی، کەریم بەگ بو.

کەریم بەگ بەشداری دەیان شەڕی کردبو دژی ئینگلیز و شارەزاییەکی زۆری پەیدا کردبو لە شەڕی پارتیزانیدا. هەر بۆیە ئینگلیز نەی توانی زەفەری پێ بەرێ. دوای کوشتنی ئەم، ئەگەرچی سابیری کوڕی و چەندین کەس لە پیاوە ناسراوەکانی هەمەوەند لە ریزی شۆڕشدا مابون، بەڵام شێخ مەحمود بە کوشتنی کەریم بەگ یەکێ لە باشترین فەرماندە دڵسۆزەکانی لە دەس دا.

**"موەفەقیەتێکی گەورە**

"ئەمجارە حکومەت پێی زانی کە 5 کەس لە ئەشقیاکان دوبارە هاتونە سەر ئەهالیە هەژارەکە و دەستیان کردوە بە هاتوچۆ کردن و خۆ بە خێو کردن و زک لەوەڕانن. فەورەن قوەتێکی موناسیبی رێک خست و ناردی. ئەم قوەتە شوێنی ئەم جەردە بێ ئینسافانە هەڵئەگرن تا ئەیانکەن بە دێی سیتەک دا. بە تەدبیرێکی باش هەر چوار ئەترافی دێیەکە ئەگرن، بێ ئەمەی کە مەجالی موسادەمە و مودافەعەیان بهێڵرێت، ئەیان گرن. ئێستا لە سلێمانی حەپسن و، ناویان ئەمانەیە کە لە خوارەوە نوسراوە. هەرکەسێ کە لە تەرەف ئەمانەوە تەجاوز وە یا غەدرێکی لێ کراوە ئەتوانێ موراجەعەت بە حکومەت بکات.

"شێخ تەها کوڕی سەید ئەحمەدە پچکۆلە. کوێخا عەزیزی خەمزە. ئیسماعیل شەریف. عەزیز فەتاح. خەلیل ئیسماعیل." (ژیان، ژ 43، 25 ی تشرینی سانی 926)

## 2. گفتوگۆی شێخ مەحمود و ئینگلیز

لە تەموزی 926 دا یەکێ لەو فرۆکانەی کە بۆردومانی کوردستانی ئەکرد، لە بەر ئەوەی تێکچونێکی تەکنیکی تێ دا دروست بو، ناچار بو بنیشێتەوە. فرۆکەوانێک و میکانیکیەکی تێ دا بو. هەردوکیان بە دیل گیران و برانە لای شێخ مەحمود. ئەویش لە لای خۆی لە گوندی وڵەژێر گلی دانەوە. شێخ مەحمود ویستی ئەمە بکات بە هۆی دەسپێکردنی گفتوگۆ لە گەڵ ئینگلیز. چەند جارێ نامە و نێردراو لە نێوانیاندا هاتوچو. سەرەنجام وا رێ کەوتن مەندوبی سامی بۆ بینینی شێخ مەحمود بێتە خورماڵ. مەبەستی سەرەکی مەندوبی سامی لەم بینینە، ئازادکردنی دیلەکان بو نەک گفتوگۆی سیاسی.

### 2. 1. گفتوگۆ لە خورماڵ

مەندوبی سامی، سێر هێنری دوبس، لە بەر نەخۆشی یان خۆ نەخۆش خستن نەچو. لە باتی ئەو کۆرنوالیس، کە ئەودەم موستەشاری وەزارەتی داخلیەی عیراق بو، رۆژی 9 ی 10 ی 926 چو بۆ نزیک خورماڵ بۆ بینینی شێخ مەحمود. شێخ مەحمود لە گەڵ خۆی هەردو دیلی هێنا بو بە سەلامەتی تەسلیمی کۆرنوالیسی کردن. ماوەی چەند سەعاتێ گفتوگۆیان کرد. خواستەکانی شێخ مەحمود دو جۆر بون: هەندێکیان تایبەتی بو، پێوەندی بە گێڕانەوەی ماڵ و مڵکەکانی خۆیەوە و بە چۆڵکردنی پێنجوینەوە هەبو، بۆ ئەوەی لێی دابنیشێ. هەندێکیشیان گشتی بون، پێوەندییان بە مافی نەتەوەیی کوردەوە هەبو. شێخ مەحمود داوای ئەکرد حکومەتێکی کوردی سەربەخۆ لە ژێر ئینتیدابی بریتانیدا دروست بکرێ.

کۆرنوالیس بە راشکاوی بە شێخ مەحمودی راگەیاند کە مەسەلەی حکومەتی کوردی بابەتی باس نیە. بۆ ئەوەی واز لە خۆی بهێنن و مڵک و ماڵەکانی بۆ بگێڕنەوە، ئەبێ دەس نەخاتە کاروباری سیاسیەوە و لە

شارێکی خواروی عیراق یا لە گوندێکی ئێران دور لە سنوری عیراق دابنیشێ و، دەس وەرنەداتە کاروباری حکومەتی عیراقەوە.

ژیان هەواڵی هاتن و گەڕانەوەی کۆرنوالیسی بۆ سلێمانی نوسیوە. هەروەها هەواڵی بەرەڵاکردنی فرۆکەوانەکان یشی بڵاو کردۆتەوە. بەڵام باسی یەکتربینین و گفتوگۆکانی شێخ مەحمود و کۆرنوالیسی بە ئەنقەست پشت گوێ خستوە. هەواڵەکەی بەمجۆرە بڵاو کردۆتەوە:

"هەواڵی ناوشار

"تەشریف هێنان

"7 ی مانگی جاری، ڕۆژی پێنجشەمە، وەکالەتەن لە بری فەخامەتی مەندوبی سامی، مەعالی موستەشاری وەزارەتی داخلیە جەنابی میستەر کۆرنوالیس، لە گەڵ سکرتێری خاسی فەخامەتی موعتەمیدی سامی جەنابی کەپتان هۆلت، یەومی مەزکور سەعات 8 و نیوی غروبی بە ئۆتۆمۆبێل تەشریفیان هێناوەتە سلێمانی. بە سورەتێ کە لایەق بە شان و شەرەفیان بێ ئیستیقبالێکی موحتەشەمیان بۆ کرا. لە مەقامی عالی موتەسەڕیفیەوە بە سورەتی مەخسوسە ئەشراف، تیجار، ڕوئەسای دەوائیر و، مەئمورین لە گەڵ قوتابیانی هەردو مەکتەب، دەعوەت کرابونە جێگای تەیارە. سەعادەتمەئاب جەنابی موتەسەڕیف و موفەتیشی ئیداری بە ئۆتۆمۆبێل تا ئەو لای قلیاسان بە پیریانەوە چوبون. موتەباقی هەیئەتی موستەقبیلین هەمو لە جێگای نیشتنەوەی تەیارە چاوەڕوانی هاتنیان ئەکرد. تەقریبەن لە سەعات 8 بەولاوە ئۆتۆمۆبێلەکان دەستیان کرد بە هاتن. لەم میانەدا ئۆتۆمۆبێلێک کە مەعالی جەنابی موستەشاری تیا بو روی کردە خەلقەکە. لە تەرەف تەلەبەکانی مەکتەبەوە تەرفیقەن بە سەدای ئاهەنگداری مۆزیقەوە گۆرانی بە خێر هاتن تەغەنی کرا. وە لە تەرەف فائیقەوە (شەش ساڵەیە) لە مەقامی بە خێر هاتن دا ئەم دو مەسرەعەی ژێرەوە خوێندرایەوە.

"مەغریب کە بو بە مەشریق و ڕۆژی لەسەر هەڵات

پایز بەهارە ئەودەمی تەشریفی ئێوە هات

ئەم هاتنە نیشانەی هات و سەعادەتە

مەکتەب عمومی عەرزی بە خێر هاتنت دەکات

جەنابی موستەشار زۆر پێخۆشحاڵ بو.

"لە پاشا لە تەرەف جەنابی موتەسەڕیفەوە کە بە پیریەوە چو بو وە لە خزمەتیا گەڕابوەوە، بیلعموم موستەقبیلین بە جیا جیا تەقدیم کران. ئیلتیفاتی بە هەمو لایەک ئیبراز فەرمو. لە دوای تەواوبونی مەراسیم تەشریفیان هاتە ناو شار و لە دائیرەی عالی موتەسەڕیفیدا دابەزی. لە سەعات 9 دا ئەشراف، تیجار، ڕوئەسای دەوائیر، دەستە دەستە بۆ عەرزی خۆشئامەدی لە جێ و مەقامی جەنابی موفەتیشی ئیداریدا بە مولاقاتی موشار ئیلەیهی موشەڕەف بون.

"یەک دو ڕۆژ تەشریفی لێرە مایەوە. لە پاش بینینی ئیشوکاری مەودوعەی خۆیان بەیانی دوشەمە بە ئۆتۆمۆبێل گەڕانەوە. لە گەڵ بە خێر هاتن خوا حافیزییان لێ ئەکەین." (ژیان، ژ 37، 15 ی تشرینی ئەوەلی 926)

**تێبینی**: فائیق، کە ئەو کاتە شەش ساڵە و، ئەم شیعرەی خوێندۆتەوە فایەق هوشیار بوە و شیعرەکەیش هی پیرەمێردی باپیرێتی.

**"بەرەڵابون**

"ئەو دو تەیارەچیەی کە لە تەرەف شێخ مەحمودەوە گیرا بون و مودەتێکە لەوێ مابونـەوە ئـەمجارە لـە سایەی هیمەت و وەسـاتەتی مـەعالی جـەنابی موستەشـارەوە نـەجات درا. وە رۆژی یەکشـەمەی رابـوردو بـە ئۆتۆمۆبێل رۆیشتنەوە بەغداد." (ژیان، ژ 37، 15 ی تشرینی ئەوەلی 926)

بەڵام ژیان لە بۆنەیەکی تردا یەکتربینینی شێخ مەحمود و کۆرنوالیسی ئاشکرا کردوە. کۆرنـوالیس لـە 18 ی 10 ی 928 دا سەردانی سـلێمانی کـردوە. بـەو بۆنەیـەوە ژیـان لـە ژ 132 دا ریپۆرتـاجێکی بـڵاو کردۆتەوە و، لە سەروتاری ژ 133 دا لە ژێر سەردێڕی (چاکە لە فکر ناچێتەوە) نوسیویێتی:

"دیسان مەعلوممانە و هێشتا لە فکرمان نەچۆتەوە کـە لـە وەقتێکـا عمـومی میلەتـەکانی دراوسـێمان لـە رەحەتی و ئیستراحەتا بون، کەچی ئێمە بە واسیتەی بەعزێ ئەسبابەوە لە ناو وەرتەیەکی فەلاکەت و ئینقیلابـا گێژمان ئەخوارد و، ئەم فەلاکەتە مـودەتێکی چەنـد سـاڵی دەوامـی کـرد و حـەتا کـە حکومـەتیش تەشـریفی هێنایەوە دیسانەوە بە تەواوی ئەمنیەت و ئاسایشێک تەئمین نەکرا هەتا دەرەجەیەکی لێ هـات، کـە سـەروەتی مەملەکەتەکەمان زایع و دەرگای تیجارەتمان بەسترا، میلەتی بێ قـوت دەسـتەوئەژنۆ دانیشـت و کـە حکومـەتی فەخیمە زانی ئیتر بە بەریەوە نەماوە و میلەتەکە موتەنەبیـە بـوە و، ئـەو معامەلـە خراپانـەی لـە فکـری خـۆی دەرهێناوە و پەشیمان بۆتەوە. ئیتر بە جدی بۆ رەفعی ئەم حاڵە قەراری قەتعی دا.

"مەعالی کۆرنوالیس وەکو گەلێ مەسائیلی موهیمتری عیراقی حەل فەرموە، بۆ حەلی ئەم مەسئەلەیەش بە جدی سەعی فەرمو و، تەشریفی هێنایە سلێمانی و لێرەیشەوە چوە خورمـاڵ و، لـەوێ لـە گـەل شـێخ مـەحمود ئەفەندیدا مولاقاتی فەرمو و، لە داخلی بەعزێ شەرائیت موما ئیلەیهی عەفو فـەرمو و، نەتیجـە ئـەم ئینقـیلاب و فەلاکەتەی بە ئەبەدی رەفع فەرمو."

## 2. 2. گفتوگۆ لە بەغداد

بۆ درێژە پێ دانی گفتوگۆ، شێخ مەحمود بە نوێنەرایەتی خۆی سەید ئەحمەدی بـەرزنجی ناردۆتـە بەغـدا. سەید ئەحمەد رۆژی 21 ی 10 ی 926 گەیشتۆتە سلێمانی و لەوێوە چۆتە بەغداد. گفتوگۆکـانی لـە بەغـداد لـە گەڵ سەید ئەحمەد کراوە وەکو ئەوە وا بون کۆرنوالیس لە خورماڵ لە گەڵ شێخ مـەحمودی کـردون. مەرجـەکانی بۆ شێخ مەحمودیان داناوە قورس بون. ئینگلیز تەنانەت ئامـادە نـەبوە (لێبـوردنی گشـتی) بـۆ شـێخ مـەحمود و هاوکارەکانی دەربکا. بەرنوسی ئەو بەڵگەیەی کە بە ناو رێککەوتنە لە نێـوان شـێخ مـەحمود و حکومـەتدا و، لـە راستیدا ئەتوانرێ بە (مەرجنامەی ئینگلیز و بەڵێننامەی شێخ مەحمود) ناوببرێ، ئەمە دەقەکەیەتی:

"بۆ دەفعی مەراقی خوێندەوارانی ژیان و تەعدیلی فکری بەعزێ ئیفراتپەروەران بۆ نەشـری شـەرائیتی ئینقیاد و ئیتاعەتی شێخ مەحمود ئەفەندی لە حکومەت موساعەدەمان وەرگرت. ئەوا سورەتێکی ئـەو شـەرائیتە کە لە مەقامی عالی موتەسەریفیەوە دەستمان کەوتوە، عەینەن دەرجی ستونی ژیانی ئەکەین:

"وەزارەتی داخلیە
"ژمارە 225
"تاریخ 19 ی کانونی سانی 927
"بۆ رەوانەکراو جەنابی سەید ئەحمەد ئەفەندی

"لە بەر ئەوەی کە لە بەینمان دا دەرهەق بە ئیشوکاری شێخ مەحمود ئیتیفاق پەیدا بو، لە شـکلی کاغـەزێک دا نوسینی بەشێکی نەتائیجی گفتوگۆکەمان موناسیب ئەبینم، کە ئەمانەیش لە مەوادی ژێرەوە عیبارەتە:

1. شێخ مەحمود تەعەهود ئەکات کە هەتاکو حکومـەتی عیـراق لـە حوسـنی نیـەت و ئیخلاسـیەتی بـە تەواوی کەسبی ئەمنیەت ئەکات، خۆی و کوڕەکانی: شێخ ڕەئوف و شێخ لەتیف و، ژنـەکانی: عایشـە و بەهیـە خانم، لە گەڵ فاتمە خانی خوشکی، لە دێی وڵەژێر کە لە ئەرازی ئێران دایە ئیقامەت بکەن.

2. شێخ مەحمود تەعەهود ئەکات نە خۆی و نە ئەوانەی کە لە مادەی یەکـەم دا ناویـان بـراوە، بـە بـێ ئیزنی حکومەتی عیراقیە داخل بە ئەرازی عیراق نەبن.

3. شێخ مەحمود تەعەهود ئەکات نە خۆی و نە ئەوانەی لـە مـادەی یەکـەم دا ناویـان بـراوە، بـە هـیچ سورەتێ و لە هیچ جێگایەک، دەست نەخەنە ئیدارەی حکومەتی عیراقیـەوە و، بـۆ ئەمـە پیاوەکـانی تریشـیان تەشویق نەکەن، لە گەڵ ئەمەیش دا خۆی و ئەوانی تر لە تەداخول بە ئوموری سیاسیەی عیراق ئەبێ خۆیـان بپارێزن.

4. شێخ مەحمود تەعەهود ئەکات شێخ باباعەلی کوڕی لە مەکتەبێک دا کـە حکومـەت قبـوڵی بکـات بۆ خوێندن ڕەوانەی بەغدای بکات، جگە لەمەیش ئـەم کـوڕەی بـە بـێ ئیزنـی حکومـەت بەغـدا بـە جـێ نەهێڵێ.

5. شێخ مەحمود لە ڕوی ئەو کردەوانەوە کە ئیرتیکـابی کـردوە بـۆ ئیجـرای هـەمو قـەرارێک کـە لـە مەحاکیمی مەدەنیەوە دەرئەچێ لە نەتیجەی ئەو دەعاویەی کە لە لایەنی ئـەفرادی میلەتـەوە لـە عەلـەیهی ئیقامـە کراوە مەسئولیەت قبوڵ ئەکات.

6. بە شەرتێ ئەم تەعەهودانە بە جێ بهێنـرێ، حکومـەتی عیـراق بـە پـێی فەقـەراتی ژێـرەوە بـە دانەوەی ئەو مڵکانە کە موسادەرە کراون و، حەقی موڵکیەتی عائید بـە شـێخ مـەحمود و کوڕەکـانی شـێخ ڕەئوف و شێخ باباعەلی و شێخ لەتیف و ژنەکانی عایشە و بەهیە خانم لە گەڵ فاتمـە خـانی خوشـکیە، موافەقەت ئەکات.

ا. شێخ مەحمود لە بری ساحیب موڵکەکان بۆ ئیدارەی ئەو موڵکانە وەکیلێ وە یا چەنـد وەکیلێـک کـە حکومەت بە باشی بزانێ تەعین ئەکات.

ب. ئەم وەکیلە وە یا وەکیلەکان لە موداخەلەی ئوموری ئیـداری و سیاسـی حکومـەتی مـەنع ئـەکرێن و هەچ وەکیلێ بێ ئیتاعەتی ئەم ئەوامیرە، وە یا لە تەئدیەی ڕسومی موعتادەی حکومەتی ئیزهـاری عیجـز بکـات حەقی حکومەتە دەستبەجێ عەزلی بکا و، لە جێی ئەو بۆ تەعین و دانانی یەکێکی تر لـە گـەڵ شـێخ مـەحمودا تەرتیبات ئیجرا ئەکرێ.

د. لە ساڵی 1921 بەم لاوە هەر ئەملاکێ لە تـەرەف شـێخ مـەحمودەوە وە یـا لـە تـەرەف یـەکێ لـەو زاتانەی کە ناویان لە مادەی یەکەم دا نوسراوە ئیسـتیملاک کرابـێ، حـەقی حکومەتـە بیداتـەوە بـە سـاحیبی پێشویان، بە شەرتێ ساحیبی موڵکەکان ئەو پارەیەی کە موقابیل بەو موڵکانە وەریان گرتوە بە شێخ مەحمـود وە یا بەو زاتانەی کە ناویان لە مادەی یەکەم دا بەیان کراوە ئیعادە بکەنەوە.

7. ئەگەر شێخ مەحمود وە یا یەکێ لەو زاتانەی کە ناویان لـە مـادەی یەکـەم دا سـیبقەتی کـردوە هـەر وەختێ لە تەنفیزی یەکێ لەو شەرتانەی کە لە سەرەوە نوسراوە عیجز بنوێنێ حکومەتی عیراق لە هەمو نەوعـە مەسئولیەتێ تەخەلی ئەکات و بۆ ئیتیخازی تەدابیری زەروریە سەربەست ئەمێنێ.

8. تەرتیباتی مەزکور هەر کە خرایە مەوقیعی تەنفیزەوە حکومەت بەرامبەر بە ئـەتباعی شـێخ مـەحمود سیاسەتێکی مولایم وەرئەگرێ و لەمانە چەند کەسێک نەبێ ئیستیسنا ئەکرێن ئـەوانی تـر عومـەن لـە پـاش وەرگرتنی تەعەهودی حوسنی سلوک بۆ دێهات و جێگای خۆیان بە گەڕانەوەیان موساعەدە ئەکرێن.

ئەو کەسانەی ئیستیسنا ئەکرێن وەختی خۆی لیستەیەکی بە شێخ مەحمود ئەدرێ.

9. هەچ واریداتێ بە ناوی حکومەتەوە قەید کرابێ لە ئەملاکی شێخ مەحمود وە یا لە ئەملاکی ئەوانەی کە ناویان لە مادەی یەکەم دا نوسراوە موافەقەت پەیدا بو کە نەیاندرێتەوە.

10. بێینە سەر مەسائیلی عمومیەی کوردایەتی: مەعلومی عالەمە کە بۆ تەتبیقی ئەو سیاسەتەی دەرحەق بە کوردەکانی عیراق لە تەرەف عیسبەتول ئومەمەوە دانراوە حکومەتی بریتانیا و عیراق بەرامبەر بە عیسبەتول ئومەم لە ژێر تەعەهودێکی موقەدەس دان. وە لە بەر ئەمەی لەم خسوسەوە ئەم دو حکومەتە مەسئولن ئەم مەسئەلەیە ناخرێتە مەوادی موزاکەرەکەمانەوە.

11. موافەقەتی تەحریریەتان لەم خسوسەوە بە زویەکی زو ناردنی ئارەزو ئەکەم. بە گەیشتنی ئەم کاغەزە بۆ لای شێخ گەڕانەوەتان و لە نەتایجی موزاکەرە بۆ ئاگاادارکردنی مانعێک نابینم. موافەقەت و ئیسپاتی عەمەلی حوسنی نیەتی شێخ مەحمود بە چونە وڵەژێر، وە بە ناردنی شێخ باباعەلی کوڕیان بۆ بەغدا دیاری ئەدا. ئەوا حکومەت بۆ ئیجرای ئەو قیسمەی کە بەری ئەکەوێ حازر و ئامادەیە.

موستەشاری وەزارەتی داخلیە" (ژیان، ژ 70، 21 ی حوزەیرانی 927)

## 2. 3. گوشاری زۆرتر

شێخ مەحمود قبوڵکردنی ئەو مەرجانەی پێ قورس بو، سەرەتا دەستی دەستی پێ کردن، ئەیویست کاربەدەستانی ئینگلیز قانیع بکا، پێنجوینی بۆ چۆڵ بکەن لێی دابنیشێ. ئینگلیزەکان یش نوقتە لاوازەکانی شێخ مەحمودیان دۆزی بوەوە، ئەیانویست بێ ئەوەی هیچ ئیمتیازێکی بدەنێ، بە زویی ملی پێ کەچ بکەن.

### ئاڵوگۆڕی موتەسەریفەکان

ئەنجومەنی وەزیرانی عیراقی ئاڵوگۆڕێکی لە موتەسەریفەکانی لیوا کوردنشینەکاندا کرد. ئەحمەد بەگی تۆفیق بەگ کە دوای گرتنەوەی سلێمانی و نوساندنی یەکجارەکی بە حکومەتی عیراقەوە، کرا بو بە موتەسەریفی سلێمانی، ئیستیقالەی کرد. ئیستیقالەکەی قبوڵ کرا. لە جێگەی ئەو ئەحمەد عوسمان کە کەسایەتیەکی هەولێریی باوەڕپێکراوی ئینگلیز بو، وە لەو کاتەدا موتەسەریفی هەولێر بو، گوێزرایەوە بۆ سلێمانی.

"قەراری مەجلیسی وزەرا: مەجلیسی وزەرا بە تەعینی نائیبی رەئیسی مەحاکیمی مەدەنیەی لیوای دیالە عومەر نەزمی بەگ بۆ موتەسەریفیەتی کەرکوک و، بە تەحویلی موتەسەریفی کەرکوک عەبدولمەجید بەگ بۆ موتەسەریفیەتی ئەربیل و، دیسان بە تەحویلی موتەسەریفی لیوای ئەربیل ئەحمەد بەگ بۆ موتەسەریفیەتی لیوای سلێمانی و، بە قبوڵ کردنی ئیستیعفای موتەسەریفی ئێرە ئەحمەد بەگ قەراری داوە." (ژیان، ژ 61، 14 ی نیسانی 927).

ژیان ریپۆرتاجێکی دەربارەی (رەسمی ئیستیقبال بە تەشریف هێنانی موتەسەریف) بەمجۆرە نوسیوە:

"19 ی مانگی حالی، رۆژی سێشەمە سەر لە بەیانی، بە تەلسزێک خەبەری حەرەکەتی سەعادەتمەئاب جەنابی موتەسەریف درا بو. وە بینا لە سەر تەنسیب و تەرتیبی ئیدارەی بەلەدیە بۆ ئیستیقبال، عمومی رونەسای دەوائیر و گەلێ لە ئەشراف و تیجاری مەملەکەت لە گەڵ قوتابیانی هەردو مەکتەب، دەعوەت کرانە سەر جادەی موشیرئاوا. لەمبەر و لەوبەری جادەکە لە سەعات 5 ی عەرەبیەوە هەیئەتێکی گەورە گرد بوەوە و دەست بە چاوەڕوانی کرا. تەقریبەن لە سەعات 9 ی عەرەبیدا ئەو ئۆتۆمۆبێلەی کە جەنابی موتەسەریفی هەڵگرت بو لە بەردەمی موستەقبیلین دا وەستا. تەلەبەکانی مەکتەب دەستبەجێ رەسمی سەلامیان بۆ ئیجرا کرد. موتەسەریف کە تەشریفی هاتە خوارێ لە لایەنی سکرتێری موفەتیشی ئیداری میستەر ریچارد، کە لام

وایە بە ناوی موفەتیشی ئیداریەوە بۆ ئیستیقبال هات بو، عەرزی بە خێرهـاتنی کـرا و، لـە تـەرەف رەئیسـی بەلەدیەوە هەیئەتی موستەقبیلین یەکە یەکـە تەقـدیم کـرا. موشـار ئیلـەیهی گـەڵێ ئیلتیفـاتی ئیبـراز فـەرمو وە موسافەحەی لە گەڵ هەموا کرد. لە دوای خیتامی خۆشئامەدی رو بە شار سواری ئۆتۆمۆبێلەکەی بوەوە و، بـەم سورەتە مەراسیمی ئیستیقبال دوایی هات.

"حوسنی ئیدارە و مەزیاتی عالیەی جەنابی موتەسەریف وارەستەی ئیزاحە. بە هیواین ئەو تەئەسورەی کە لە قبوڵی ئیستیعفای موتەسەریفی پێشومانەوە پەیدا بوە بە خەدەماتی نافیعە بۆ وڵاتەکەمان تەلافی بکـات. بەم موناسەبەتەوە لە وەزیفـەی تازەیـان دا موەفەقیـەت و سـەعادەتی تەمـەنا ئەکـەین." (ژیـان، ژ 62، 21 ی نیسانی 927).

**هێرش بۆ سەر پێنجوین**

"دەنگوباس:

"19 ی مانگی حالی کە رۆژی تەشریف هێنانی سەعادەتمەئاب موتەسەریف بو، بـە گەیشـتنی موشـار ئیلەیهی، هەر ئەو رۆژە میقدارێکی زۆر عەسکەر لە جەیشی عیراق و لیوی بە تـۆپ و موهیمـاتێکی زۆرەوە، لـە گەڵ مەفرەزەیەکی پۆلیسی سوارە، رو بە پێنجوین حەرەکەتیان کرد بو، لـە رێگـا توشـی تـاقمێ لـە چەتـەکان ئەبن. لە شەڕێک دا کە لە بەینی تەرەفەین دا روی داوە چەتەکان 5 مـەقتول و چەنـد برینـدارێکیان بـە جـێ هێشتوە و، بەرامبەر بە سەتوەتی قیوای حکومەتی مقاوەمەت و موقابەلەیان پێ نەکراوە و رایان کردوە. لـەم لا تاقە نەفەرێک کوژراوە. لە 23 ی نیسان دا قوەتەکە بە بێ موقابەلە داخلی پێنجوین بون.

"ئیتر ئەمجارە حکومەت بە تەواوی و قەتعی لە پێنجوین ئەمێنێتـەوە و ئیـدارە تەشـکیل ئـەکات. هـەچ تەواتورێک لەم خسوسەوە بە نەوعێکی تر بگێڕرێتەوە بێ ئەسڵە. حەقیقەتی حاڵ ئەمەیە کە بەیانمان کرد.

"لەو رۆژەوە کە عەسکەر بۆ پێنجوین حەرەکەتی کردوە ئەو تاقمە چەتە خوێڕییانە کـە لـە دێهاتـەکانی دەوری شار بە شەو بە دزیەوە ئەچونە سەر لادێییـەکان و ئەبونـە باعیسـی تێکـدانی ئیسـتراحەتیان هـەمو بەرتەرەف کراون. وە لە سایەی هیمەت و حوسنی تـەدبیری جـەنابی موتەسـەریفەوە لـەو نـاوەدا ئاسـایش و ئەمنیەتێکی تەواو دامەزراوە." (ژیان، ژ 63، 28 ی نیسانی 927).

"بۆ زانینی هەمو:

ئەوا لە تاریخی ئەمڕۆوە ئەمرێک کە بە ژمارە 555 رۆژی 927/2/23 تەعمیم و ئیسدار کرابو لـەغو کرایەوە. یەعنی لەمەولا سەوقی ئەموال بۆ پێنجوین و ئیخراجی ئەموال بۆ مـەریوان و هـەورامان و سـائیری سەفەحاتی ئێران لە پاش کەمالی معامەلەی قانونیە لە گومرگی سلێمانی و لای مودیری پێنجوین مەمنوع نیە و، هەرکەسێ ئەتوانێ ئەوەلەن موراجەعەت بە دائیـرەی گـومرگی سـلێمانی بکـا و مـوافیقی قـەوانین و ئەنزیمـە معامەلاتی لازمە جێبەجێ بکات و ئەمجا ئەموال سەوق بکات. فەقەت لازمە ئەو ئەمواڵە ئەوەلەن بچێتە پێنجوین و مودیری پێنجوین خەبەردار بێ و معامەلەی لازمەی ئیجرا بکـات ئینجـا مەئزونـە بـۆ هـەر لایـەک مەتلوبـە سەوق بکرێ و، موحتاج بە وەرگرتنی کەفالـەت نیـە. موتەسـەریفی سـلێمانی" (ژیـان، ژ 63، 28 ی نیسـانی 927).

لە گەڵ ئەو لەشکرکێشیەدا دیارە دانیشتوانی پێنجوین شـارەکەیان چـۆڵ کـردوە بۆیـە موتەسـەریفی سلێمانی ئەم (ئیعلان) ەی بۆ بڵاو کردوەتەوە:

"حکومەت ئەمجارە کە بە قوەتی عەسکەریەوە هاتۆتە پینجوین بەم فکرە هاتوە کە دائیمی لە پێنجـوین دابنیشێ و محافەزەی ناحیەی پێنجوین و ئەهالی موتیعە تەمامەن بکات، ئێوە کە ئەهالی ناحیەی پێنجوینن بە

نامی حکومەت ئیخبارتان ئەکەم ئەمجارە حکومەت بە دائیمی لەوێ دائەنیشێ و تەشکیلاتی حکومەتی تەمامـەن ئیجرا ئەکات. ئەو کەسەی کە لەم سەفەرەدا مقاوەمەتی حکومەتی نەکردبێ حکومـەت قەتعیـەن عەلاقـەی ناکـا. لازمە کەس نەترسێ و ئەهالی هەرکەس بێتە سەر مڵک و ئاوەدانی خـۆی و بـە کاسبی خـۆی مەشـغوڵ بـێ. حکومەت بە حەق محافەزەی ئەهالی موتیعە دەکات. موتەسەڕیفی سلێمانی" (ژیان، ژ 64، 5 ی مایسی 927)

"دەنگوباس:

"لە سەر رێی پێنجوین

"رۆژی 1 ی مانگ مەفرەزەیەکی عەسکەری و قافڵەیەک کە شەش صـەد بـار ئـەرزاقی پـێ بـو رو بـە پێنجوین حەرەکەت ئەکەن. بۆ دوەم رۆژ لە نزیکی بادانە توشـی تـاقمێکی ئەشـقیا دەبـن کـە بـۆ تەعـەڕوزی عەسکەر خۆیان لە ناو دار و درەخت دا شاردبوەوە. بەدبەختانە نازانن کە سیلاحشۆر و پیلانگێڕێکـی وەکـو کاپتن لاینیان لە گەڵ دایە، کە حەیاتی خۆی لە مەیدانی حەرب و جیدال دا رابواردوە، لە هـەمو لایەکـەوە بـە جارێک قوەتەکە ئەدەنە بەر دەسترێژ. عەسکەرەکان هیچ ئەهمیەت نادەن بەم تەقانە. دەستبەجێ لە سەر ئەمر و تەرتیبی جەنابی موفەتیش بۆ دەفعیان 20 نەفەرێک لە عەسـکەری لیـوی ئاسـوری جـوێ ئەبێتـەوە و بـە بـێ ئەمەی ئەهمیەت بدەنە گولـەی تفەنگی ئەشقیا هجوم ئەکەنە سەریان. نوقاتی حاکمەیان لێ ئەگرن و ئەیاندەنـە بەر تفەنگ. لە نەتیجەدا ئەشقیاکان تارومار بون و 4 کەسی موناسیبیان لێ کوژراوە کـە عیبـارەتن لـە: شـێخ رەشیدی باغ، شێخ نوری قزلەر و 2 کابرای چنگنیانی. لە عەسکەر قەتعیەن تەلەفیات نەبوە. لـە پـاش دەفـع و تەنکیلی ئەم نەختە مانعەیە دیسان ئەکەونەوە رێ و ئەچنە پێنجوین.

"حکومەت هەر لە سلێمانیەوە هەتا پێنجوین لە مەواقیعی موهیمەدا دەستی کردوە بە دروسـتکردنی نوقتـەی پۆلیس، ئەم نوقتانە بۆ تەئمینی ئاسایش و محافەزەی حقوقی ئەهالی و سەربەسـتی تیجـارەت و ئامەدوشـود بـۆ پێنجوین پڕە لە پۆلیس. ئومێد ئەکەین کە حکومەت لەمەودوا بەربەسـتی شـەقاوەت و راووروتـی جـەردەکان بکـا تاوەکو میلەت لە ژێر سێبەری ئەمنیەت و ئاسایش دا بحەوێتەوە." (ژیان، ژ 65، 12 ی مایسی 927)

"راپۆرتی پۆلیس

"نزیکی 10– 15 نەفەرێک لە چەتەکان لە گەرمیان ئەبن و لە چونی قیوای حکومـەتی بـۆ پێنجـوین و حـەرەکاتی عەسکەریە خەبەر وەرئەگرن، بۆ ئەمەی خۆیان رزگار کەن و دەقیقەیە زوتر ئیلتیحاق بە رەفیقەکانی تریان بکەن، لـە 22 ی مانگی رابوردودا بۆ ئەودیو ئەگەڕێنەوە. لە رێ توشی کابرایەکی ئـابڵاخی دێـن، لـە ئەندێشـەی ئـەوە کـە نـەک خەبـەری حکومەتیان لێ بدا، بۆ تەخویف تەقەی لێ ئەکەن. لە ئەسـەری تەسـادوف و بەدبـەختی کـابرا، بـەر گولـەیەک ئەکـەوێ و ئەکوژرێ.

"لە 18 ی نیسانەوە تا 2 ی مایس لە داخل و خاریجی لیوادا، شایانی قەید، هیچ وقوعـاتێکی تـر روی نەداوە." (ژیان، ژ 64، 5 ی مایسی 927).

"خولەی دەوڵەتیار، کە مودەتێکە دێهاتی ئەم قەراغ شارەی بە راووروت تەعجیز کرد بو و، لە ئەشقیایی و جـەردەیی‌دا گەیشـت بـوە دەرەجـەی نیهایـەت. بینـا لـە سـەر تـەعلیمات و ئـەوامیرێک کـە لـە مـەقامی موتەسەڕیفیەوە تەبلیغ کرا بو، وەکیلی مودیری قەرەداغ، لە گەڵ باشچاوەشـی پۆلیسـی ئـەوێ، بـەیانی 2 ی مانگی حاڵ ئەدەن بە سەر ئاوایی خێوەتەی بازیان و لە ناو ئاغاسوری‌دا لە گـەڵ کوێخـادێ و زرکـورێکی‌دا ئەیگرن.

"موکافاتەن لە بری ئەم خزمەت و فەعالیەتە، لە لایەنی سەعادەتمەئاب جەنابی موتەسەڕیفەوە، عەبایـەکی نایاب بە وەکیلی مودیری قەرەداغ رەشید ئەفەندی و سـەعاتێکی بـاش لـە گـەڵ قۆردۆنێـک بـە باشچاوەشـی پۆلیسی ئەوێ بابەشێخ و، هەر یەکە سەرو ئەسپێکیان پێ بەخشراوە." (ژیان، ژ 65، 12 ی مایسی 927).

"شەوی 15 ی مانگ تاقمێک لە چەتەکان، لە ژێر مەعیەتی سابیری کەریم بەگ و ئەمینی حەمەی ئیمام دا، لە ناو هێرشی برسێتی چونەتە قەرەتۆغان و، لە پاش خۆ تێر کردن لە ئوڵوبەوە تێ ئەپەڕن. لەوێ توشی وڵاخەکانی رەشیدی حاجی فەتاح و سائیرە دێن، کە لە چایردا بون، لەم فرسەتە بیلئیستیفادە وڵاخەکان ئەدەنە پێش خۆیان و ئەچنە هەزارمێرد. حکومەت هەر کە بەمەی زانی و لە حاڵ ئاگاهدار بو، دەستبەجێ لە سەر ئەمری عالی موتەسەریفی مەفرەزەیەکی پۆلیس لێرەوە، قوەتێکی تریش لە مەرکەزی ناحیەی سەرچنار (لە) باوەگێڵدییەوە سەوق ئەکەنە سەریان. ئەم دو مەفرەزەیە پاش و پێشیان لێ ئەگرن و ئەیاندەنە بەر دەستڕێژی تفەنگ. لە نەتیجەی موسادەمەدا قیسمێک لە وڵاخەکان ئیستیرداد ئەکەنەوە و دوانی ناوداریان لێ ئەکوژن، لە پۆلیسەکانیش یەکێ کوژراوە. چەتەکان کە ئەبینن تەنگیان پێ هەڵچنراوە ئیتر مقاوەمەتیان پێ ناکرێ و بە روکاری بەرانان دا فیرار ئەکەن. لە لایەنی قوەتەکە بیلتەعقیب لە دەوری خێوەتە خراونەتە موحاسەرە و، لێرەوە دیسان میقداری کافی عەسکەر و پۆلیس رەوانە کراوە. ئومێدی قەوی وایە کە تاقیان لێ دەرنەچێ وهەمویان بگیرێن و، خاتیمە بە حەیاتی شەقاوەت وجەردەییان بهێنن." (ژیان، ژ 66، ژ17 ی مایسی 927).

"ئەو تاقمە چەتەیەی کە نوسی بومان لە خوار ئوڵوبەوە وڵاخیان فڕاندوە و، لە نەتیجەی شەڕێک دا لە هەزارمێرد لە گەڵ مەفرەزەی پۆلیس دا بویانە ئیستیرداد کراوەتەوە و، لە دەوری خێوەتە خراونەتە موحاسەرەوە شەوێ لە فرسەت.. خۆیان گوم کردوە و بە فیرار موەفەق بون و مەعلوم نیە بۆ چ لایەک رۆیشتون. فەقەت هەروەکو قسەی لێ ئەکەن بۆ ئەودیو گەڕاونەتەوە. حکومەت بۆ مەنعی ئەم نەوعە تەجاوزاتە بە کەمالی جدیەت تەدابیری لازمەی وەرگرتوە و لەو رۆژەوە ئەسەری چەتە لەو ناوەدا نەماوە و ئومێد ئەکرێ لە سایەی ئەم تەدابیرەوە لەمەودوا مەیدانی روانی ئەم نەوعە شتانە بگیرێ. ئیتر موەفەقیەتی حکومەت ئەخوازین." (ژیان، ژ 67، 24 ی مایسی 927).

"ئەو قوەتە تەعقیبیەیە کە لە لیواوە تەرتیب کراوە و لە ناحیەی بازیان دا تەعقیبات ئەکەن، یەک دو رۆژ لەمەوپێش لە پشت هەنجیرەوە توشی دو سوار دەبن، لە تەرەف رەئیسی قوەتەکەوە بۆ تەحقیقی هەویەتیان ئەمر بە راوەستانیان ئەدەن، لە گەڵ ئەمەی ئیتاعەت و ئیمتیسالی ئەمرەکە ناکەن، موقابەلەیان ئەکەن. لە سەر ئەمە لە تەرەف مەفرەزەکەوە ئەدرێنە بەر تەقە. لە نەتیجەدا هەردو سوارەکە ئەکوژرێن. وەختێ کە جەنازەکانیان هێنایە شار، تەحەقوقی کرد کە یەکێکیان لە چەتە مەشهورەکانی هەمەوەند کەریم ئەحمەد سەلیمە و ئەوی تریشیان خەلقی سلێمانی عەبدوڵا کوڕی قادرە." (ژیان، ژ 68، 31 ی مایسی 927).

## 2. 4. **مەندوبی سامی لە پێنجوین**

ژ 66 ی 17 ی مایسی 927 ریپۆرتاجێکی درێژی لە ژێر سەردێڕی (مەراسیمی ئیستیقبال) دا سەبارەت بە سەردانی مەندوبی سامی بۆ سلێمانی نوسیوە. لە سەرەتاکەیدا ئەڵێ: "خەبەری تەشریف هێنانی فەخامەتمەئاب مەندوبی سامی عالەمی ئێرەی غەرقی سرور و خۆشی کرد. ئەم زاتە بڵند و بە قیمەتە و، ئەم داهی سیاسەت و مەقدەرەتە، سەری سێیەمین جارە سلێمانی بە وجودی خۆیان موشەرەف ئەکا، کە هەر هاتنێکی بۆ تەئمینی رەفاە و سەعادەتی قەومی نەجیبی کورد، هەر تەشریف هێنانێکی.. حەل و کردنەوەی گرێیەکی سیاسی و ئیداری وەتەنی موعەزەزی خۆشەویستی ئێمە بوە، جگە لە مانە لە سایەی عەزمی.. و تەشوبوساتی لایەتەزەلزەلی موشار ئیلەیهییەوە کە حکومەتی عیراق نائیلی ئیستیقلالیەتێکی تام و ئێمەیش مەزهەری کوردیەت و.. میللی خۆمان بوین و لە مەجلیسی عیسبەتول ئومەم دا بۆمان.. قەرار کراوە، ئەم خدمەتە شایستەیە و ئەم سەعیە مەشکورە لە سەر هەمو عیراقیەک بیلخاسە لە سەر هەمو کوردێکی عیراقی پێویستە تیزکار و تەئیدی بکات."

رۆژی 14 ی مایسی 927 مەندوبی سامی بە ئۆتۆمۆبێل گەیشتۆتە سلێمانی. بۆ پارێزگاری کاروانەکەی و پیشاندانی دەبدەبە و دەسەڵاتی ئینگلیز، دو فرۆکە بە سەر ئۆتۆمۆبێلەکەیەوە فریوە. بۆ پێشوازی لێ کردنی "هەیئەتێکی گەورە لە روئەسای دەوائیر و مەئمورین، عولەما، ئەشراف، روئەسای عەشائیر، تیجار، تەلەبەکانی مەکتەب و قیتعەیەکی عەسکەری گەورەی لیوی ئاسوری لەمبەری جادەی مشیرئاواوە و جەمعێکی غەفیر لە سائیری ئەسناف و تەبەقاتی ئەهالی لەوبەری جادەی مەزکور گرد بوبونەوە..."

وەکو ژیان لە ژ 67 ی 24 ی مایسی 927 دا نوسیویێتی: "فەخامەتی مەندوبی سامی کە تەشریفیان هێنا بوە ئێرە لە پاش ئەمەی دو رۆژ لێرە مایەوە و گەلێ کەس بە مولاقاتی موشەڕەف بو و لەم مولاقاتەدا بەو کەلیماتە نازکە بە قیمەتانەی خۆی فەرەح و خۆشی خستە دڵی هەمو لایەکەوە و، هەر تەعلیمات و ئەوامیرێک ئیجاب بکا ئیعتا و لە پاش ئەمەی بەعزێ جێگا وەکو خەستەخانە، مەکتەب و سائیرەی زیارەت فەرمو، بۆ تەواو کردنی ئەم سەفەرەی کە دەستی دابویە، دوەم رۆژی گەیشتنیان بە تەیارە تەشریفی فەخامەتیان بۆ ناحیەی خورماڵ و پێنجوین چو. لە تەرەف مەئموران و ئەشرافی محەلیەی ئەوێوە بە سورەتێک کە لایەقی شان و شەرەفیان بێ ئیستیقبال کراوە. فەخامەتی مەندوب لە ئەسنای مولاقات دا پێی گەیاندن کە حکومەت بۆ تەئمینی ئاسایش و ئیستراحەتی ئەهالی، بۆ مەنعی هەمو نەوعە تەجاوزاتێک و لەو ناوەدا بۆ دامەزراندنی نفوزی حکومەتی هەچ تەدابیرێک ئیجاب بکات وەری گرتوە. لە گەڵ ئەمەیش دا فەرمویەتی: لازمە ئیمتیسالی ئەوامیری حکومەت بکەن و هەرکەسە لە داخلی وەزیفەی خۆیدا حەرەکەت بکات تاوەکو بە تەواوی مەرحەمەتی حکومەت جەلب بکەن."

مەندوبی سامی دوای سەردانی خورماڵ و پێنجوین گەڕاوەتەوە سلێمانی و بەیانی رۆژی 17 ی مایس بە ئۆتۆمۆبێل رۆیشتۆتەوە. سەردانی مەندوبی سامی لە پێنجوین و خورماڵ، کە دو مەڵبەندی نفوزی شێخ مەحمود و تازە داگیر کرا بون، بێگومان بۆ جێگیرکردنی هێزەکانی حکومەت و دڵنیاکردنیان بوە.

## 2. 5. هەڵوەرینی هێزەکان

هێزەکانی شێخ مەحمود، بە هۆی ناهەمواری باری ژیان و راونانی ئاسمانی و زەمینیی بەردەوام و نائومێدی لە دوارۆژی سیاسی کەوت بونە هەڵوەرین. هەندێ لە چاکترین شەڕکەرەکانی خۆیان بە دەستەوە ئەدا. ژیان هەندێ لەم روداوانەی تۆمار کردوە و، هەندێکیشی نەنوسیوە. لەوانەی تۆماری کردون:

"هاتن

قائیمقامی ئەلەبجە جەنابی حامید بەگ تەشریفی هاتوە، لە ئەشقیای مەشهورە خەلیفە یونس کە مودەتێکە موتەوالیەن عەرزی دەخالەت بە حکومەت ئەکا، ئەمجارە هاتە سلێمانی و لە مەرکەزی لیوادا عەرزی ئینقیاد و نەدامەتی کرد لەسەر کەفالەت تەئمین و ئینجا تەرخیس کرا." (ژیان، ژ 38، 21 ی تشرینی ئەوەلی 926).

"کوڕی شێخ قادری شێخ سەلام، جەنابی عەبدوڵا عادل ئەفەندی کە لە لای شێخ مەحمود یوزباشی بو و، مودەتێکە ئینفیکاکی کردوە بۆ تەئیدی ئەم جوێبونەوەیە هاتۆتە سلێمانی و، بە حوسنی نیەت تەعەهودی بە حکومەت داوە." (ژیان، ژ 68، 31 ی مایسی 927).

"شێخ سەعیدی باغ

"شێخ سەعیدی باغ کە چەند رۆژێ لەمەوپێش کوڕێکی کوژرا و، خۆشی ئامەدوشودی حکومەتی نەئەکرد هاتە سلێمانی و بە موجیبی مادە 43 ی قانونی عەشایەر کەفالەتی لێ سەنراوە. لە گەڵ ئەمەیش دا تەعەهودی کردوە سوارەکانی تری کە لەویو ماونەتەوە بۆ دەخالەت بیانهێنێت." (ژیان، ژ 68، 31 ی مایسی 927).

"شێخ عەبدولعەزیزی شێخ عەلی

شێخ عەبدولعەزیز کوڕی شێخ عەلی دەرەمیانە کە مەشهورە و مودەیەکە ئیتاعـەتی ئـەوامیری حکومـەتی ناکا لە سەر تەلەبی سەعادەتمەئاب جـەنابی موتەسـەڕیف هاتۆتـە سـلێمانی و بـە پـێی مـادە 43 ی قـانونی عەشایەری کەفالەتی لێ سەندراوە.

"لە حەرەکاتی پێنجوین و هاتنی جەنابی موتەسەڕیفی تازەوە تا ئێسـتا لـە چەتـە و موتەهەمـەکان 21 کەس عەرزی دەخالەت و ئینقیادیان بـە حکومـەت کـردوە و ڕەبتـی کەفالـەت کـراون." (ژیـان، ژ 68، 31 ی مایسی 927).

## 3. کەنارەگیری

### 3. 1. ناردنی بابەعەلی بۆ بەغداد

شێخ مەحمود (مەرجنامە)کەی ئینگلیزی قبوڵ کرد. کەوتە جێبەجێ کردنی بەڵێنەکانی. بە پێی مادەی 4 ی ئەو بەڵێننامەیە بابەعەلی کوڕی نارد بۆ ئەوەی بچێ لە بەغداد بخوێنێ.

"دەنگوباس

"هاتن

"ڕۆژی دوشەمە دوێنێ کە موصادیفی 6 ی حوزەیرانی 927 بو، شێخ باباعەلی ئەفەنـدی کـوڕی شـێخ مەحمود ئەفەندی لە گەڵ جەنابی ماجید ئەفەندیدا بەو شەرائیتی حکومەتیـەوە کـە لـە تـەرەف جـەنابی شـێخ مەحمود ئەفەندیـەوە قبـوڵ و ئیمـزا کـراوە، تەشـریفیان هاتـە سـلێمانی و لـە مـاڵی سـەعادەتمەئاب جـەنابی موتەسەڕیف دا میوان بون. هەروەکو خەبەرمان وەرگرتوە جـەنابی شـێخ باباعـەلی ئەفەنـدی تەشـریفیان بـۆ بەغدا ئەچێ و جەنابی ماجید ئەفەندیش بۆ ئەو دیو ئەگەڕێتەوە. لە بـەر ئـەوەی ئـەم هاتنـە ئیسـتیراحەت و مەنافیعی میلەتی تیا متەسەویرە بە خێر هاتنیان ئەکەین." (ژیان، ژ 69، 7 ی حوزەیرانی 927).

"شێخ بابا عەلی

"جەنابی شێخ باباعەلی ئەفەندی کە تەشریفیان هێنابوە ئێرە ڕۆژی 9 ی حوزەیران بۆ کەرکوک و، لـە پـاش ئـەوەی چەنـد ڕۆژێ لـە کـەرکوک ماوەتـەوە، بـۆ بەغـدا حەرەکـەتیان فـەرموە." (ژیـان، ژ 70، 21 ی حوزەیرانی 927).

حکومەت ئەم هەنگاوەی شێخ مەحمودی بە نیشانەی کۆتایی هاتن بە چالاکی چەکدار داناوە بۆیە ئـەم هەواڵەی بڵاو کردۆتەوە:

"لە بەر ئەمەی وەزعیەت چاک بو و، ڕێگاوبان بە تەواوی کەسبی ئەمنیەتی کـرد، هـەروەکو خـەبـەرمان وەرگرتوە لە مەقامی عالی موتەسەڕیفیەوە بۆ لابردنی مومانەعـەتی سـەیر و سـەفەری ئۆتۆمۆبێـل، ئـەهالی بـە تەنها و بۆ ئەمەی بە کەمالی سەربەستی و بە ئارەزوی خۆیان بە بێ زرەهلـی هـاتوچۆ بکـەن، تـەلغرافێک بـۆ موتەسەڕیفی کەرکوک لێ دراوە. ئیتر لەمەودوا هەمو کەسێ بە ئارەزوی خۆی ئەتوانێ هاتوچۆ بکات." (ژیان، ژ 69، 7 ی حوزەیرانی 927).

### 3. 2. سەروەزیران لە سلێمانی

"فەخامەتی ڕەئیسەل وزەرا

"ڕۆژی سێشەمە کە موسادیفی 28 ی مانگ بو، سەر لە بەیانی لە سەعات 11 ی عـەرەبیدا، فەخامـەتی ڕەئیسەل وزەرا جەنابی جەعفەر پاشای عەسکەری بە تەیارە تەشریفیان هێنایە ئێرە. لـە جێگـای نیشـتنەوەی تەیارە لە تەرەف ئومەرا و زابیتانی جەیشەوە بە ئیحتیرام ئیستیقبال کران. لەوێوە بە ئۆتۆمۆبێل تەشـریفیان

هێنایەماڵی سەعادەتی جەنابی موتەسەڕیف. لە پاش نـەختێ ئیسـتراحەت و چـا خواردنـەوە بـە پـێ هاتنـە دائیرەی حکومەتی، لە بەر دائیرەی موتەسەڕیفی‌دا لە تەرەف عولەما، ئەشراف، رونەسای دەوائیر و مـەئمورین و لە گەڵ قوتابییەکانی مەکتەبەوە بە سورەتێ کە لایەق بە شان و شەرەفی فەخامەتیان بێ راسیمەی سـەلام و ئیستیقبالیان بۆ بە جێ هێنا. لە پاش قەدەرێک لە مەقامی موتەسەڕیفی‌دا عمومی موستەقبیلینی قبوڵ و دەرحەق بە هەمویان بە کەلیماتی نازکانە ئیبرازی ئیلتیفات و مەحەبەتی فەرمو. نزیکی یەک دو سەعات لێـرە مانـەوە و دیسان بە تەیارە تەشریفیان رۆیشت. وا بە هیواین کە ئەم تەشریفە ببێتە واسیتەی رەفاە و سەعادەتی مڵک و میلەت. بەم موناسەبەتەوە بە خێر هاتن و خوا حافیزی ئەکەین.

"وەختێ کە فەخامەتی رەئیسەل وزەرا تەشریفی هێنا غەزەتەکەمان لە تەواو بونا بـو بـەڵام بـۆ ئەمـەی بەم هاتنە بیرازێنینەوە دوامان خست." (ژیان، ژ 71، 28 ی حوزەیرانی 927)

عبدالرزاق الحسني کە پیاوێکی ئاگاداری روداوەکانی ئەو سەردەمە و نوسـەری (مێـژوی وەزارەتـەکانی عیراق) ە لە (ص 48، ج 3، گ 6، تـاریخ العـراق السیاسـي الحـدیث) دا نوسـیوێتی: لـە 28 ی حـوزەیرانی 1927 دا جەعفەر عەسکەری بە فڕۆکە چو بۆ سلێمانی و، لە گەڵ شێخ مەحمود کۆ بوەوە و، ئیقنـاعی کـرد سەردانی بەغداد بکا. بەڵام لەم ریپۆرتاجەدا هیچ ئیشارەتێکی بۆ ئەو باسە تێ دا نیـە و، هـیچ نیشـانەیەکیش نیە بۆ ئەوەی لەو رۆژە دا شێخ مەحمود لە سلێمانی بوبێ.

لەو ماوەیەدا ئـەوە چەنـدەمین جـار بـو خـەڵکی سـلێمانی کـێش بکـرێن بـۆ ئـەو جـۆرە پێشـوازیە رەسمی‌یانە.

### 3.3. چونی شێخ مەحمود بۆ بەغداد

شێخ مەحمودیش خۆی ئامادە کردوە بۆ سەردانی بەغداد، پێش ئەوەی ئەم سەردانە بکات موتەسەڕیفی سلێمانی چۆتەوە پێنجوین. یەکێ لەو کارانـەی ئـەنجامی داوە، بـە لادا خسـتنی کێشـەی هاوکارەکـانی شـێخ مەحمود بوە بە پێی مـادەی 8 مـی بەڵێننامەکـە. دەسـەڵاتی بریتـانی ئامـادە نـەبوە (لێبـوردنی گشـتی) بـۆ بەشدارانی شۆڕشەکەی شێخ مەحمود دەر بکا، بەڵکو لە گەڵ هەریەکێ بـە جیـا رەفتـاری کـردوە. هەنـدێکی بەخشیوە (تەعەهودی حوسنی سلوک)ی لێ وەرگرتون و (وەسیقەی تەئمین)ی داونەتێ، لە هەنـدێکیش خـۆش نەبوە.

"دەنگوباس- تەشریف بردن

مەعلومی هەمومانە کە سەعادەتمەئاب جەنابی موتەسەڕیف لەو رۆژەوە تەشریفیان هێناوەتـە ئێـرە هـەر خەریکی دامەزراندنی ئەمنیەت و ئاسایش و تەئمینی مەنافیعی میلـەت بـوە. بـۆ ئیسـتراحەتی عمـوم راحـەتی خۆی سەلب کردوە و لە ئۆغری ئەم مەقسەدەدا هەر مانیعە و مەحزورێک هاتبێتە سەر رێ بـە عـەقلی سـەلیم و فکری ئیسابەتکارانەی خۆیان بە لابردنی موەفەق بوە. برینەوە و رەفعی ئیختیلافـی بـەینی شـێخ مـەحمود و حکومەت بۆ ئەمە دەلیلی کافیە. ئەمجارە بە عـەینی مەقسـەد بـۆ دەور و تەفتیشـی قـەزای ئەلەبجـە و ناحیـەی پێنجوین و ئەو ناوە لە 15 ی حوزەیران دا بە ئۆتۆمۆبێل تەشریفیان بردۆتە موان. لەوێ لە تەرەف قایمقامی ئەلەبجە حەمید بەگـەوە ئیسـتیقبال کـراوە. رۆژی 16 گەیشـتۆتە پێنجـوین. لـەوێش لـە تـەرەف مـەئمورینی مەحەلیەوە لە پاش ئیستیقبالێکی موحتەشەم لە گەڵ جەنابی شێخ مەحمود ئەفەندی‌دا مولاقاتی کردوە. جەنابی موتەسەڕیف لەم سەفەرەیان دا بۆ دەخالەت پێ کـردن بـە بـەگزادەی هـەورامی تـەدابیر و تـەرتیباتی قەویـەی ئیتیخاز فەرموە. بۆ ئەم سەفەرە بە کولفەتە کە لە رێی رەفاە و سـەعادەتی مڵـک و میلـەت دا ئیختیـار کـراوە موەفەقیەتی ئەخەسی ئامالمانە." (ژیان، ژ 70، 21 ی حوزەیرانی 927).

"دەنگوباس- هاتنەوە:

"لە نوسخەی ڕابوردومان دا بۆ هەڵەبجە و پێنجوین تەشریف بردنی جەنابی موتەسەڕیفمان نوسی بو، وە نوسی بویشمان لە گەڵ جەنابی شێخ مەحمود ئەفەندیدا مولاقاتی فەرموە. جەنابی شێخ مـەحمود ئەفەنـدی ڕۆژێک لە پێنجوین تەشریفیان ماوەتەوە. لە پاش ڕۆژەودوا بۆ وڵەژێر عەودەتیان فەرموە.

"جەنابی موتەسەڕیف لە زەرفی 3 ڕۆژدا کە لە پێنجوین ماونەتـەوە بـە ڕێکخسـتنی ئومـوری ئیـداری ئەوێ ئیشتیغالی فەرموە. لە بەگزادەکانی هەورامی: جەعفەر بەگ، حەمە شەریف بەگ، ئاغا بەگ، حەمە ڕەشـید بەگ و فەرەج بەگ، لە سەر تەدابیرێ کە لە تەرەف جـەنابی موتەسـەڕیفەوە ئیتیخـاز فـەرموراوە بـە حوسـنی سلوک و تەئمینی ڕێگای بەینی هەڵەبجە و پێنجوین تەعەهودیان داوە.

"لە زابیتان: یونس ئەفەندی، ڕەمزی ئەفەندی، حیکمەت ئەفەندی، سـەبری ئەفەنـدی، ڕەشـید ئەفەنـدی، حەسەن ئاغا. لە عەشائیر: ئەحمەدی کەریم بەگی هەمەوەند، هەر 3 برای ئەمینی حەمەی ئیمام، سـەیدەی شـێخ عەلی کانی کەوە، شێخ عـەلی سـەرکار و کوڕەکـانی، ئەمانـە بـە خـۆی و پیاوەکانیانـەوە. تـاقمی سـۆفیوەند، غەوارەی جاف، شێخ عارفی بانی بنۆک، لە گەڵ قیسمێک لە ئەهالی شار و جێگایـانی سـائیرە، نزیکـی 120 کەسێ لە چەتەکان چونەتە پێنجوین و، لە خزمەت جەنابی موتەسەڕیف دا، تەعەهودی حوسـنی سـلوکیان داوە و وەسیقەیان وەرگرتوە.

"لە دوای تەواوبونی ئەم ئیشانە ڕۆژی 19 ی مانـگ جـەنابی موتەسـەڕیف بـە کـەمالی ئیحتیـرام تەشیع کراوە و، لە ڕێی خورماڵ، بیارە، تەوێڵەوە تەشریفیان هاتۆتەوە هەڵەبجە. لـە هەڵەبجـەیش 3 ڕۆژ ماونەتـەوە. عمـومی دەوائیـری حکومـەتی تـەفتیش، مەکتـەبی زیـارەت، وە بـۆ ئەمـەی لـە ڕێی بـەعزێ ئیحتیاجاتی تەلەبەکان دا سەرف بکرێ 80 ڕوپیەی بە مەکتەب تەبەڕوع فـەرمو. ڕۆژی 14 ی مانـگ بـە سواری تا سەراو و بە ئۆتۆمۆبێل بۆ سلێمانی عەودەتیان فەرمۆتەوە. بە خێر بێنەوە." (ژیـان، ژ 71، 28 ی حوزەیرانی 927).

"دەنگوباس

"هاتنەوەی جەنابی شێخ مەحمود ئەفەندی بۆ سلێمانی و بۆ بەغدا ڕۆیشتنی

"لە پاش مقاوەمەت و سەباتێکی 3 ساڵی، جەنابی شێخ مەحمود ئەفەندی تێ گەیشت و لێی مەعلوم بـو کە بەرامبەر بە قوەت و عەزمی لایەتەزەلزەلی حکومەتی لە سەر ئەو نەوعە ئەحواڵە دەوام و ئیسـرار کـردن نـە بۆ خۆی و نە بۆ میلەتەکە خێرێک نابەخشێ و فائیدەیەکی تیا نیە، بە پێی ئـەو شـەرائیتە کـە لـە نوسـخەی ڕابوردودا نەشرمان کرد، لە گەڵ حکومەت دا تەئلیفی بەینی کـرد و ڕێـک کـەوت. بـۆ تەئیـدی ئـەم خسوسـە ڕۆژی شەمە کە موسادیفی 9 ی مانگ بو، تەشریفیان هاتە ئێرە. ماجید ئەفەندی و گـەلێ لـە پیاوەکـانی تـری خۆی لە خزمەتا بو. یەک دو ڕۆژ لێرە مانەوە و لە پاش دا بە ئۆتۆمۆبێل بۆ بەغدا تەشریفیان ڕۆیشت. ئێمـە بە کەمالی مەمنونیەتەوە بە خێر هاتن و خواحافیزیان ئەکەین، چونکە مەنافیعی وڵات، سەرکەوتن و تـەرەقی میلەت، وەکو ئێستا بە ژینێکی بێ غائیلە و، بە ئەمنیەت و ئاسایشێکی تەواوەوە بەستراوە." (ژیـان، ژ 72، 5 ی تەموزی 927)

شێخ مـەحمود چەنـد ڕۆژێ لـە بەغـداد ماوەتـەوە. مەنـدوبی سـامی و مـەلیک فەیسـەڵی بینـوە. دوای گەڕانەوەی بۆ کوردستان چۆتە گوندی پیران. بێ ئەوەی دەس وەر بداتە کاروباری سیاسیەوە، بە گۆشەگیری لەوێ دانیشت.

## 4. هەڵسەنگاندنی جوڵانەوەکە

ژیان لە ژ 76 ی دا نوسیویێتی:

"مەسئەلە و خەبەری ئیتاعەتی جەنابی شێخ مەحمود ئەفەندی بە حکومەتی عیراقیـە، لـە گـەلێ غەزەتـەدا بیلخاسە لە غەزەتەکانی سوریە و میصر و سائیرەدا، بە کەمالی ئیهتیمامەوە نەشر و قەید کراوە و، بەم سورەتە ناوی شێخ مەحمود و کوردستان بۆتە سەرمایەی خەبەراتی غەزەتەکانی دەرەوە."

ژیان سەروتاری ژ 69 ی 7 ی حوزەیرانی 927 ی بۆ هەڵسەنگاندنی شـێخ مـەحمود و شۆرشـەکەی تەرخان کردوە. لە وتارێکدا بە قەڵەمی م. ا. لە ژێر سەردێری (مەسەلەی شێخ مەحمود) دا نوسیویێتی:

"ئەمرۆ مودەتێکی زۆرە لە ناو خاس و عام دا، لە دەر و ژور دا، ناوی شێخ مەحمود بە سەر زبانەوەیـە و مەوزوعی بەحسە. بەعزێک تەقدیر، بەعزێک تەنقید و، حەتا بەعزێ کەسیش زۆر بە خراپ ناویان ئـەبرد و ئەهێنا.

"ئەگەرچی شێخ مەحمود لەم مودەتە درێژەدا بە لای خۆیانەوە گۆیا خزمەتی میلەتی کورد و مـەفکورەی کوردایەتی ئەکات، فەقەت لە حەقیقەتی حاڵ دا بو بە واسیتەی گـەلێ خراپـە و مـانیعی تـەرەقی و دواکـەوتنی میلەت و زەربەیەکی گەورەی لە مەفکورەی کوردایەتی دا، لە بەر ئەمە کە خیلافی وەعد و بەڵێنی خۆی هەڵئەستا و، هەمو وەختێ تەریقی نیزاع و ئیختیلافی ئیختیار ئـەکرد و، رێـک نەئەکـەوت، دوچـاری غـەزەبی حکومـەت بوبو. ئەویش کە یەئسی حاسڵ کردبو، بە فکری نواندنی ئیقتیـدار و قـوەتی خـۆی و، دواخسـتنی ئومـوری ئیدارەی حکومەتی، لە هەمو لایەکەوە تەعجیزاتی ئـەکرد و، بـۆ ئیستیحسـالی ئـەم مەقسـەدە لـە هـیچ شـتێک تەرەدودی نەئەکرد.

"تاقمێک لە ئەشرار و جەردە بێ ئینسافەکان لەم وەزعە بیلئیستیفادە لێی گرد بونەوە و، بە بێ خەبـەر و رەزامەندی ئەو، هەر رۆژە بە نەوعێ راووروت، تاڵان و کوشتاریان، لـە ئـەهالی و لـە دێهاتـەکانیان ئـەکرێ. رێی تیجارەت، مەیدانی فەلاحەت و زەراعەت، خۆلاسە هەمو کار و کاسـبی میلەتەکـەیان تەحدیـد کـرد بـو و، خست بوە ژێر تەهدیدەوە. بۆ مەنع و نەهێشتنی ئەم ئەحواڵە حکومەت بە کەمالی جدی تێ ئەکۆشی و هەوڵی ئەدا، بەڵام ئەمانە لە بەر ئەمەی موقابەلەی عەزم و قـوەتی حکومـەتیان پـێ نەئـەکرا، بـە دزیـەوە لـە فرسـەت، بیلئیستیفادە، ئەم کارانەیان ئەکرد. هەوڵ و تەقەلای حکومەت عەقیم ئەمایـەوە، خسوسـەن ئیسـتیلا نـەکردنی پێنجوین، کە ئەهمیەتێکی فەوقەلعادەی هەبوە و، بوبوە موجیبی غروریان. لـەم ئاخریـەدا گرتنـی پێنجـوین و، لەوێ دا تەئسیسی ئیدارەی حکومەتی، خاتیمەی بەم کەشمەکەشە هێنا.

"ئەمجا جەنابی شێخ مەحمود ئەفەندی کە زانی لەمە زیاتر بە دەمیەوە نەماوە و بەرامبەر سەتوەت و قـوەتی حکومەتی نەتیجەی مقاوەمەت، زەرەری خۆی و میلەتە، عەرزی ئینقیاد و موتاوەعەتی بە حکومەت کـرد. هـەروەکو لە مولحەقی ژمارە 68 ی ژیان دا نوسیومانە، لە سایەی خلوسی نیەت و حوسنی تەدبیری سەعادەتمەئاب جـەنابی موتەسەریف و موفەتیشی ئیداریەوە، کە بۆ تەئمینی ئیستراحەتی میلەت و کردنەوەی رێگای کار و کاسبی هـەوڵ ئەدەن، بە برینەوەی ئەم ئیختیلال و ئیختیشاشە، موەفەقیەت پەیدا بو. ئیتر هەمو کەسێ ئـەتوانێ بـە حوریـەت و سەربەستیەکی تەواوەوە، لە ژێر ئیدارەی حکومەتیدا، بۆ ئیشوکاری خۆی بە هەمو لایەک دا بێـت و بـڕوا. ئیتـر بۆ تەرەقی و پێش خستنی وڵاتەکەمان مانیعی تێکۆشین هیچ شتێک نـەما. بینائـەن عەلـەیهی، لـە سـەر هـەمومان پێویستە بە جدی بۆ مەنافیعی میلەت و ئیسلاحی وڵاتەکەمان هەوڵ بـدەین. لـە کـردەوە و حەرەکـەتێ کـە ببێتـە باعیسی تێکدانی ئەم وەزع و رابیتەیە خۆپاراستن موجیبی سەعادەت و ئیستیراحەتی میلەتە، عەکسی حاڵ ئـەمین بن وەکو پێشو فەلاکەت و سەرگەردانیە." (ژیان، ژ 69، 7 ی حوزەیرانی 927)

ئەم وتارە، ئەگەرچی بە ئیمزای م. ا. واتە محەمەد ئەدیبی بەڕێوەبەری ڕۆژنامەکە بڵاو کراوەتەوە، بەڵام بیر و بۆچون و هەڵوێستی ڕەسمی دەسەڵاتدارانی ئینگلیز و عیراق دەرئەبڕێ بەرامبەر شێخ مەحمود و جوڵانەوەکەی. ئێستا دوای تێ پەڕ بونی ئەو هەمو ساڵە بە سەر ناوەرۆکی ئەم وتارەدا و، دوای ئەوەی بەشێکی گرنگی (دۆکۆمێنتەکانی) حکومەتی بریتانی و، بەشێکی (وثائق) ی حکومەتی عیراقی، بۆ خوێندنەوە و تاووتوێ کردن، لە بەردەستی لێکۆڵەوەرەدایە هەڵسەنگاندنی حوکمە سیاسیەکانی ناو ئەم وتارە کارێکی دژوار نیە.

## 5. تێهەڵچونەوە و وازهێنانی یەکجاری

بۆ دەربڕینی ناڕەزایی لەسەر ئەوەی مافی نەتەوەیی کورد لە پەیماننامەی عیراقی– بریتانیدا باس نەکرابو، خەڵکی سلێمانی بڕیاریان دا کە بەشداری لە هەڵبژاردنی دەورەی سێیەمی مەجلیسی نوابدا نەکەن. ئەو مەجلیسەی ئەبو پەیماننامەکە تەسدیق بکا. بەڵام کاربەدەستانی بریتانی و عیراقی ئەیانویست، هەرچۆنێ بێ ئەگەر بە رواڵەت و روکەشیش بێ، هەڵبژاردن لە سلێمانی بکرێ.

ڕۆژی 6 ی ئەیلولی 1930 کە ئەبو هەیئەتی تەفتیشیە لە سەرای سلێمانی دا کۆ ببێتەوە بۆ سەرپەرشتی هەڵبژاردنی مەبعوسەکانی سلێمانی، شاری سلێمانی خرۆشا. دوکان و بازاڕ داخرا و، خەڵک لە بەر دەرکی سەرای سلێمانی کەوتنە خۆپیشاندان دژی هەڵبژاردن. لە ئەنجامدا بو بە تەقە. جەیشی عیراقی بۆ دامرکاندنەوەی خۆپیشاندانەکە تێکەڵاوی روداوەکە بو. دەیان کەس کوژران و، دەیان کەس بریندار بون و، دەیان کەسایەتی ناسراوی سلێمانی گیران. ئەم روداوە شێخ مەحمودی بزواند و لە گۆشەگیری دەرچو. 3 ئەفسەری کورد: مەحمود جەودەت، حەمید جەودەت، کامیل حەسەن، ریزی جەیشی عیراقی‌یان بە جێ هێشت و دایانە پاڵ شێخ مەحمود.

شێخ مەحمود چەند نامەیەکی بۆ موفەتیشی ئیداری سلێمانی، مەندوبی سامی بریتانی لە عیراق، کۆمەڵەی گەلان نوسی. داوای لێ کردن کە حکومەتی عیراق لە زاخۆوە هەتا خانەقین چۆڵ بکات و، دەوڵەتێکی کوردی سەربەخۆ لە ژێر ئینتیدابی بریتانیا یا هەر یەکێ لە دەوڵەتە گەورەکان دروست بکرێ. کاربەدەستانی بریتانی زۆر بە توندی چونەوە بە گژ ئەم داوایانە و بە گژ شێخ مەحمودا. لە زنجیرەیەک شەڕ و پێکادان دا کە دواییینیان لە گوندی ئاوباریک بو، بە شکان و خۆبەدەستەوەدانی شێخ مەحمود کۆتایی هات.

ژیان هەندێ لەو بەڵگانەی تۆمار کردوە، لەوانە:

"صورەتی ئەو کاغەزانەیە کە لە تەرەف فەخامەتمەئابان مەندوبی سامی و وەزیری داخلیەوە بۆ شێخ مەحمود نێرراوە:

وەزارەتی داخلیە

ژمارە: س/2537

ڕۆژ: 1930/10/20

بۆ شێخ مەحمود ئەفەندی

بە پێی ئەو مقاوەلەیەی کە لە ساڵی 1927 دا ئیمزاتان کردوە بۆ مەوادی خوارەوە تەعەهودتان کردوە:

1. کە خۆت و کوڕەکانت و ژنەکانت و فاتمە خانی خوشکت لە دێیەک دانیشن کە خاریجی حدودی عیراق بێت.

2. کە خۆت و ئەو کەسانەی لە فەقەرەی یەکەم دا ناویان زیکر کراوە بە بێ ئیزن و موساعەدەی حکومەت داخلی مەملەکەتی عیراق نەبن.

3. کە نە خۆت و نە هیچ کەس لەو شەخسانەی لە سەرەوە زیکر کراون بە هیچ نەوعێ نە لە لیوای سلێمانی و نە لە جێگایەکی تردا لە عیراق دا موداخەلەی ئیدارەی حکومەتی عیراق نەکەن و بۆ ئەم مەقسەدە خەلقی تر تەشویق نەکەن و، چ خۆت و چ ئەوان لە هەمو مەسائیلێکی سیاسیە کە عەلاقەی بە عیراقەوە بێ لە موداخەلەکردنی ئیجتیناب بکەن.

کەزالیکە موافەقەت کرا کە ئەگەر خۆت وە یا هەر کام لەو شەخسانەی کە بەحسیان کرا لە هەر وەقتێک دا یەکێ لەم شەرتانەیان بە جێ نەهێنا حکومەتی عیراق هیچ مەسئولیەتێکی بە سەرەوە نەمێنێ و هەر ئیجرائاتێ بە لازمی بزانێ بۆ ئیتیخازکردنی سەربەست بێ.

ئەگەرچی لە 10 ی ئەیلول دا لە تەرەف فەخامەتمەئابان موعتەمید ئەلسامی و وەزیری داخلیەوە ئەو تەعەهودانەی کە داوتانە بە حکومەتی عیراق هێنرایەوە بیرتان و ئەگەرچی تەوسیە کران لە کەمالی سکونەت دا لە دێی پیران دا بمێننەوە، ئێوە گوێتان نەدایە ئەو ئیختارانە و بێ ئیزن داخلی خاکی عیراق بون.

دیسانەوە وەکیلی موتەسەرپیفی سلێمانی لە کاغەزی 18 ی ئەیلول دا ئیخباری کردن کە ئێوە موغایری ئارەزوی فەخامەتمەئابان مەندوبی سامی و وەزیری داخلیە حەرەکەت ئەکەن و شەرائیتی ئەو ئیتیفاقنامەیە کە ئیمزاتان کردوە شکاندوتانە و بۆی نوسین کە بۆ ئەو دێیە کە خاریجی حدودی عیراقە فەوڕەن عەودەت بکەنەوە و ئەو 3 زابیتە کوردە کە لە جەیشی عیراق رایان کردوە و زانرا بو کە لە لای ئێوەن تەسلیمیان بکەنەوە.

ئەم ئەوامیرەی کە وەرتان گرت دیسانەوە خستتانەوە گۆشەی نسیانەوە و لەو وەختەوە بەو غایەیە کە شۆڕش بەرپا بکەن لە مەناتیقی لیوای سلێمانیدا ئەسورێنەوە.

لە 2 ی تشرینی ئەوەل دا تەکلیفی موفەتیشی ئیداری سلێمانیتان کردوە کە لە شارباژێڕدا مولاقاتتان بکات و موفەتیشی موما ئیلەیهی جوابی دانەوە کە لە بەر ئەوەی بە بێ ئیزنی حکومەت داخلی خاکی عیراق بون و لە بەر ئەوەی ئیتاعەتی ئەو ئیختارات و ئەوامیرەتان نەکردوە کە تەوجیهتان کراوە، مومکین نابێ کە مولاقاتتان بکات و دیسانەوە تەبلیغتان کرا کە بێلا تەئخیر بۆ پیران بگەڕێنەوە.

وا ئێستا عەینی ئەوامیرتان بۆ تیکرار ئەکەمەوە کە بۆ پیران عەودەت بکەنەوە و ئیختارتان ئەکەم بە گەیشتنی ئەم کاغەزە ئەگەر دەستبەجێ ئیتاعەتی ئەوامیری سالیفەل زیکر نەکەن لە حەق خۆتان و ئەتباعتان ئیجرائات ئیتیخاز ئەکرێ و هەر ئەملاکێکتان لەم مەملەکەتەدا بێ موستەحەقی موسادەرە ئەبێ.

وەزیری داخلیە"

....

"ئیدارەی موعتەمیدی سامی لە عیراق

تاریخ: 20 ی تشرینی ئەوەلی 1930

بۆ شێخ مەحمود ئەفەندی

سەلەفی من چەند کاغەزێکم لە ئێوەوە وەرگرتوە بەڵام هەتا لە خاکی عیراق نەچنە دەرەوە و ئەو تەعەهوداتەی کە کردوتانە و لە ئیتیفاقنامەی ساڵی 1927 دا ئیمزاتان کردوە بە جێ نەهێنن پێم ناکرێ موخابەرەتان لە گەڵ بکەم.

دیارە دەر خاتری ئەکەن کە یەکێ لە شەرائیتی ئیتیفاقنامەی مەزکور ئەوە بو کە بێ ئیزنی حکومەت داخلی عیراق نەبن و بە هیچ کلوجێ دەخلتان بە سەر ئیدارەوە نەبێ کە حکومەتی عیراق لە لیوای سلێمانی وە یا لە جێگایەکی تری عیراق تەعقیبی ئەکات و بۆ مەقسەدێکی وەها کەسی تر تەشویق نەکەن و لە مەسائیلی سیاسیەی عیراق خۆتان دور بگرن.

ئێوە بەو ئیختاراتە کە تەوجیهتان کراوە ئیتاعەتتان نەکردوە و، گوێتان نەداوەتە ئەو نەسیحەتانە کە لە تەرەف فەخامەتمەئابان وەکیلی مەندوبی سامی و وەزیری داخلیـەوە لـە کاغـەزی رۆژی 10 ی ئـەیلولی 930 بۆتان نوسراوە و، دیسان موخالەفەتی ئەوامیری وەکیلی موتەسەرڕیفی سلێمانی پشتان کردوە کـە بـە تـاریخی 18 ی ئەیلولی 930 بۆی ناردون و، لەو کاغەزەدا ئەمری پێ کرد بون کە ئـەبێ دەرحـاڵ لـە ئـەرازی عیـراق بچنە دەرەوە. وا ئێستا منیش ئەمەوێ ئیشراکی ئەو ئەمرانە بکەم کە لە تەرەف وەزیـری داخلیـەوە بـە ئێـوە دراوە، بۆ ئەوەی کە فەورەن لە خاکی عیراق بچنە دەرەوە و ئیتر واز لە موداخەلە کردنـی ئومـوری حکومـەتی عیراق بهێنن و، بەم واسیتەیەوە ئیختارتان ئەکەم کە عەدەم ئیتاعەت بەم ئەمرانـە ئەبێتـە مـوجیبی عاقیبـەتێکی وەخیمە بۆ خۆتان و تەرەفدارانتان.

مەندوبی سامی عیراق."

"بەیاننامە بۆ کوردەکانی لیوای سلێمانی

"بە پێی ئیتیفاقنامەیەک کە لە ساڵی 1927 دا ئیمزای کردوە شێخ مەحمود تەعەهودی کرد بو کە لە دێیـەک دا لە خاریجی حدودی عیراق ئیقامەت بکا و بە بێ ئیزنی حکومەت داخلی عیراق نەبێتەوە و بە هـیچ وەسـیلەیەک نـە لە لیوای سلێمانی و نە لە هیچ جێگایەکی تری عیراق دا موداخەلەی ئیدارەی حکومەتی عیراق نەکا.

"شێخ مەحمود ئەم شەرتانەی هەمو شکاندوە و هەرچەند ئەمری پێ کراوە کـە خـاکی عیـراق بـە جـێ بهێڵێ ئیتاعەتی ئەو ئەمرانەی نەکردوە کە دراوێتێ و لەم چەند هەفتەی رابوردودا لە مەناتیقی لیوای سلێمانیدا دەستی کردوە بە سوڕانەوە و لەوێدا تەشەبوسی کردوە کە لە زدی حکومەت شۆڕش بەرپا بکا.

"لە بەر ئەوە ئەمری پێ کراوە فەورەن خاکی عیراق بە جێ بهێڵێ و ئەگەر ئیتاعەتی ئەم ئەمرە نەکا لـە حەقی خۆی و ئەتباعی ئیجرائاتی لازمە ئیتیخاز ئەکرێ.

"بینائەن عەلەیهی وا ئیختارتان ئەکـەین کـە هەرکـەس پـەنا بـدا بـە شـێخ مـەحمود و ئـەتباعی وە یـا معاوەنەتیان بکا خۆی توشی جەزای شەدید ئەکا.

1930/10/20." (ژیان، ژ 262، 6 ی تشرینی دوەمی 1930).

"داخلی

"لە زابیتانی جەیش، رەئیس ئەوەل مەحمود جەودەت و مولازمی ئەوەل حەمید جەودەت، کـە مودەتێـک لەمەوپێش لە جەیشی عیراقی فیراریان کرد بو ئەمشەوی رابوردو لە سلێمانی تەسلیمی نەفسیان بـە حکومـەت کرد." (ژیان، ژ 266، 1 ی کانونی سانی بە هەڵە 1930 نوسراوە، راستەکەی 1931 ە).

"تەبلیغی رەسمی

"ئەو ئالای سواری لە گەڵ قوەتی پۆلیس کە لە ژێر قوماندەی عەقید (قائیمقام) ئیسـماعیل نـامیق بـەگ دا بو لە تاریخی 5 ی نیسانی 931 رویان کرد بوە ئیستیقامەتی دێی ئاوباریک کە ئیسـتیخبارات کـرا بـو کە شێخ مەحمود خـۆی و ئـەتباعی لـەوێن و قـوەتی مـەزکورە دێی ئاوباریـک ئیحاتـە ئەکـەن و لـە تـەرەف تەیارەشەوە موتەمادیەن ئەشقیاکان و دەوروپشتی دێی مەزکور بۆمباردومان ئەکـەن. وە لـە پـاش نیـوەڕۆوە هەتا تاریکەشەو بە شیدەت موسادەمە دەوام ئەکات. قوەتی جەیش بە دەرەجەیەکی کە شایانی ئیفتیخـار بێـت ئیبرازی شەجاعەت و بەسالەت ئەکەن و لەم موسادەمەیەدا 4 عەسکەر و 1 زابیت شەهید و 14 عەسـکەر و 1 زابیت بریندار ئەبێت.

"تەلەفیات و خەسارەتی شێخ مەحمود جدەن زۆر و بە دەرەجەیەک ئەبێت کە تەنها لە دێی ئاوباریـک لە ئەشقیاکان 10 کوژراو و مەیتی دو کەس لە روئەسا کە یەکێکیان شێخ عەلی کوڕی رەحیم کە خزمـی شـێخ مەحموده لە بەینی ئەم کوژراوانەدا دینراوه.

"وە لەو رێگای کە ئەشقیاکان فیراریان لێ کردوه خوێنێکی زۆر دیار بـوه کـە دەلالـەت لـە سـەر ئەمـە ئەکات کە شێخ مەحمود تەلەفیاتێکی زۆری داوه و بریندارێکی زۆری لە گەڵ خۆی نەقل کردوه.

"ئەو عەشائیرەی کە معاوەنەتی شێخ مەحمودیان ئەکرد هەمو بڵاو بونەوه. ئێستاکە شێخ مەحمود تەنها لە نەجات دانی رۆحی خۆی زیاتر شتێکی تر تەفەکور ناکات.

"ئەمرۆ مەوسوقەن زانیومانە کە شێخ مەحمود تەنها لە گەڵ 5 و 10 سواریدا لە شاخی قەرەتاغ تــێ پەڕ بوه.

"قوەتی جەیش و پۆلیس بـۆ مـەحوکردنی شـێخ مـەحمود و ئـەتباعی بـە شـیدەت لـە تـەعقیب دایـە و مەحوکردنیان قەویەن مەئموله." (ژیان، ژ 279، 16 ی نیسانی 1931).

چەند تێبینی‌یەک:

1. م. ر. هاوار: شێخ مـەحمودی قارەمـان و دەوڵەتەکـەی خـواروی کوردسـتان، بـەرگی دوەم، لەنـدەن 1991.

1. 1. ل 574 دەربارەی ئەو جائیزەیەی کە بۆ کوشـتنی شـێخ مـەحمود دانـراوه، ئـەڵێ: 20 هـەزار روپیە بوه، لەوەدا پشتی بە یادداشتەکانی شێخ رەئـوفی شـێخ مـەحمود بەسـتوه، بـەڵام شـێخ رەئـوف باسـی نەکردوه کە پشتی بە چ سەرچاوەیەک بەستوه. راستەکەی 60 هەزار روپیە بوه نەک 20 هەزار.

2. بۆ بڕیارەکانی ئەنجومەنی وەزیران بڕوانە:

1.2. الدکتور غسان العطية: (العراق، نشأة الدولة 1908- 1921)، ترجمة عطا عبـدالوهاب و تقـديم حسين جميل، دارالسلام، لندن 1988. ص 18.

2.2. السيد عبدالرزاق الحسني: تاريخ العراق الساسي، ج 3، ط 6. ص 309.

1. 2. ل 703– 704 دەربـارەی رۆژی چـونی شـێخ مـەحمود لـە سـلێمانیەوه بـۆ بەغـداد زانیـاری جیاوازی لە سەرچاوەی جیاوازەوه راگوێزاوه. ئاگاداری‌یەکانی ژیان لەو بارەیەوه، کە سەرچاوەیەکی ئاگاداری دەستی یەکەمی کاتی روداوەکەیە، رەنگە لە هەمویان زیاتر جێگای باوەڕ بێ.

3. دەربارەی هەڵوێستی سەعدون لە شێخ مەحمود بڕوانە:

الدکتور لطفي جعفر فرج عبدالله: عبدالمحسن السعدون و دوره فـي تـاريخ العـراق السياسـي المعاصـر، بغداد 1988. ص 107.

# ژیان و

# مەبعوسەکانی کورد

## 1. مەجلیسی تەئسیسی و مەجلیسی نواب

## مەجلیسی تەئسیسی

1924/8/2 –1924/3/27

### 1. دامەزراندنی دەوڵەتی عیراق

#### 1. 1. حکومەتی خۆجێیی

کاتێ یەکەمین جەنگی جیهانی بڕایەوە، هێزەکانی بریتانیا ولایەتە عوسمانیەکانی بەسرا و بەغدادی داگیر کردو، لەبەر دەروازەی ولایەتی موسڵ دا راوەستا بو. پاش چەند رۆژێ ئەوێ یشی داگیر کرد.

لە رۆژگاری جەنگدا بریتانیا و فەرەنسا و روسیا بە نهێنی لە ناو خۆیاندا پێک هات بون لەسەر دابەشکردنی میراتیەکانی دەوڵەتی عوسمانی، لەوانە ئەم 3 ولایەتە. بە هۆی هەڵگیرسانی شۆڕشی ئۆکتۆبەری 1917ەوە، روسیا لەو سەودایە دەرچو بو. دوای جەنگ دەوڵەتە براوەکان چەندین کۆبونەوەیان کرد بۆ بڕیاردان لە چارەنوسی ناوچە داگیرکراوەکان. لە کۆنفرەنسی سان ریمۆدا، بابەتێکی تازەیان بە ناوی (ئینتیداب) ەوە لە باتی (داگیرکردن) داهێنا. مەبەست لە ئینتیداب ئەوە بو ئەو وڵاتانەی کە هێشتا نەگەیشتونەتە پلەیەکی ئەوتۆی پێشکەوتن، بتوانن خۆیان بەڕێوە ببەن، دەوڵەتێکی پێشکەوتو بەڕێوەی ببات و یارمەتی بدات، تا ئەویش ئەگاتە پلەیەک بتوانێ خۆی بەڕێوە بەرێ. بڕیاریاندا هەر 3 ولایەت کە دواتر دەوڵەتی عیراقیان لێ دروست کرا، بخرێتە ژێر ئینتیدابی بریتانیەوە.

دەنگدانەوەی بڕیاری ئینتیداب نیشتمانپەروەرانی عیراقی وروژاند. ساڵی 1920 شۆڕشێکی فراوان و توندوتیژ دژی داگیرکەرانی ئینگلیز لە عیراق دەستی پێ کرد. ئەم شۆڕشە کە چەند مانگێکی خایاند لە مێژوی عیراقدا بە (سەورەی عشرین) ناسراوە. کوژاندنەوەی لە لایەن ئینگلیزەوە خەرجێکی زۆری گیانی و مادی تێ چو. دەسەڵاتی داگیرکەری ئینگلیز بۆی دەرکەوت حوکمی راستەوخۆی عیراق گران ئەکەوێ لە سەری. بۆ خاوکردنەوەی هەلومەرجی ئاڵۆزی عیراق، سێر پێرسی کۆکسی نارد، ئەویش بۆ یاریدەدانی خۆی

بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری عیراق، بڕیاری دا حکومەتێکی خۆجێیی لە چەند کەسایەتیەکی عیراقی پێک بهێنێ. کۆکس داوای لە سەید ئەورەحمانی گەیلانی نەقیبی ئەشرافی بەغداد کـرد کـە پیـاوێکی دینیـی بـە سـاڵاچوی دۆستی ئینگلیز بو، سەرۆکایەتی ئەو حکومەتە بکا.

### 1. 2. وەزارەتەکانی نەقیب

یەکەمین وەزارەتی

ئەورەحمان نەقیب دوای راوێژ و پرسورا، بە موافەقەتی کۆکس، یەکەمین وەزارەتی لە 25 ی تشـرینی یەکەمی 1920 دا پێک هێنا. ئەم وەزارەتە کە پێک هات بو لە 9 وەزیری خاوەن وەزارەت و لە 12 وەزیـری بێ وەزارەت هیچ کوردێکی تێدا نەبو. لەو کاتە یشدا هێشتا چارەنوسـی سیاسـی کوردسـتان بـە لایـەک دا نەکەوت بو.

هەمو وەزارەتێک (موستەشار)ـێکی ئینگلیزی بۆ دانرا بو، دوا بڕیار بە دەس ئەو بو.

ئەرکی سەرەکی وەزارەتەکەی نەقیب، هێمنکردنەوەی هەلومەرجی عیراق و خۆشکردنی زەمینەی بەیعەت بو بە فەیسەڵ. جەعفەر عەسکەری وەزیری جەنگ و، ساسۆن حسـقیل وەزیـری دارایـی لـەم حکومەتـەدا، لـە گەڵ کۆکس مەندوبی سامی، لە مارتی 921 دا چون بۆ بەشداری کۆنفرەنسی قاهیرە، کە بڕیاری دا عەرشـی عیراق بە فەیسەڵی کوڕی شەریف حسێن بسپێرێ.

لە 29 ی حوزەیرانی 921 دا فەیسەڵ لە حیجازەوە گەیشتە بەغداد.

لە 11 ی تەموزی 921 دا، وەزارەتەکەی نەقیب فەیسەڵی بـە مـەلیکی عیـراق راگەیانـد بـەو مەرجـەی حکومەتەکەی: (دەستوریی، نوێنەرایەتی، دیمۆکراتی و گرێدراوی قانون بێ)

لە 23 ی ئابی 921 دا ئاهەنگی تاجگوزاری مەلیک فەیسەڵی یەکەم لە ساحەی برج الساعة لە بەغـداد، بە ئامادەبونی مەندوبی سامی بریتانی و، ئەندامانی وەزارەتەکەی نەقیب، بەرپا کرا.

بەمـەیش ئیتـر ئیشـی وەزارەت تـەواو بـو، هـەمان رۆژی تـاجگوزاری ئیسـتیقالەی دا بـە مـەلیک فەیسەڵ، بۆ ئەوەی ئیتر ئەو بە پێی دەسەڵاتەکانی خۆی، کەسێ بۆ سـەرۆکایەتی وەزارەت و پێکهێنـانی هەڵبژێرێ.

دوەمین وەزارەتی

لـە 10 ی ئـەیلولی 921 دا مـەلیک فەیسـەڵ، سـەرلەنوێ ئـەورەحمان نـەقیبی تـەکلیف کـرد وەزارەت تەشکیل بکات.

لە 12 ی ئەیلولی 921 دا ئەورەحمان نەقیب دوەمین وەزارەتی خۆی لە 9 وەزیر تەشکیل کرد. لە ناو ئەوانەدا موسوڵمانی سونی و شیعە و، جو و مەسیحی تێدا بـو. لـەم وەزارەتـە یـشدا وەکـو ئـەوەی پێشـو، کەسی کوردی تێدا نەبو.

ئەرکی سەرەکی وەزارەت ئامادە کردنی پەیماننامەیەک بو لە نێوان عیراق و بریتانیـادا، کـە ئینتیـدابی بریتانی لە عیراق دا جێگیر بکا.

لەو ماوەیەدا فەیسەڵ بۆ نەشتەرکاری ریخۆڵە کوێرە لە نەخۆشخانە کەوت. کـۆکس خـۆی راسـتەوخۆ سەرپەرشتی کاروباری وەزارەتی ئەکرد. بەوپەڕی توندیەوە لە گەڵ نەیارەکانی بەستنی پەیمانەکە جوڵایـەوە. هەنـدێ لـە وەزیرەکـان وازیـان هێنـا و، نـارەزایی لـە نـاو خـەڵکدا زۆر بـو. دوای دەرچـونی فەیسـەڵ لـە نەخۆشخانە، نەقیب لە 19 ی ئابی 922 دا ئیستیقالەی دا و قبوڵ کرا.

سێیەمین وەزارەتی

بە هۆی ئەو ناڕەزاییە زۆرەوە کە لە نەقیب هەبو، فەیسەڵ ئەیویست لە باتی ئەو یـەکێکی کـە تـەکلیف بکا وەزارەت پێک بهێنێ. بەڵام لە ژێـر گوشـاری کـۆکس دا سـەرەنجام لـە 28 ی ئـەیلولی 922 دا دیسـان ئەورەحمان نەقیبی تەکلیف کرد بۆ جاری سێیەم وەزارەت پێک بهێنێ.

ئەرکی سەرەکی وەزارەت ئیمزا کردنی پەیمانی عیراقی– بریتانی و، هەڵبژاردنی ئەندامانی (مەجلیسـی تەئسیسی) بو، کە یەکێ لە ئەرکە سەرەکیەکانی ئەبو تەسدیق کردنی پەیمانی گۆرین بێ.

لە 10 ی تشرینی یەکـەمی 922 دا ئەنجومـەنی وەزیـران پەیمانەکـەی ئیمـزا کـرد. بـەڵام بـە هـۆی ناڕەزایی و (موقاتەعە) ی خەڵکەوە، بە تایبەتی عولەمای شیعە، نەیتوانی هەڵبژاردنی مەجلیسی تەئسیسـی، کـە فەیسەڵ (ئیرادەی مەلەکی) بۆ دامەزراندنی دەرکردبو، ئەنجام بدا.

نەقیب لە 15 ی تشرینی دوەمی 922 دا ئیستیقالەی کرد.

## 2. مەجلیسی تەئسیسی

### 2. 1. پێکهێنانی

مەلیک فەیسەڵ، عەبدولموحسین ئەلسەعدون کە لە وەزارەتەکەی نەقیب دا وەزیری ناوخۆ و، لایـەنگری ئەوە بو بە زۆر یش بێ هەڵبژاردنی مەجلیسی تەئسیسی ئەنجام بدرێ، تەکلیف کرد وەزارەت پێک بهێنێ.

لە 20 ی تشرینی دوەمی 922 دا سەعدون یەکەمین وەزارەتی خۆی و، چوارەمین وەزارەتی لە مێژوی دەوڵەتی تازە دامەزراوی عیراق دا تەشکیل کرد. لە پێش دا ناجی ئەلسویدی بە وەزیری ناوخۆ دانرا بو، بـەڵام بۆ ئەوەی سەعدون دەستی ئاواڵە بێ بۆ ئەنجامدانی هەڵبژاردنی ئەندامانی مەجلیسی تەئسیسـی، سـویدی یان لە وەزارەتی ناوخۆوە گوێزایەوە بۆ وەزارەتـی داد و، سـەعدون خـۆی کاروبـاری وەزارەتـی نـاوخۆی گرتـە دەس.

عالمەکانی شیعە کە فتوای موقاتەعەی هەڵبژاردنیان دابو، سەعدون دوریخستنەوە بۆ دەرەوەی عیـراق و کەوتە نواندنی زەبروزەنگ. بێ ئەوەی لە هیچ بپونگێتەوە و، گوێ لە رەخنەی کـەس بگـرێ، وەکـو الحسـني ئەڵێ: "لە جەوێکی پڕ لە زۆر و تۆقاندن دا" هەڵبژاردنی ئەنجام دا.

ژ 19 ی ئومێدی ئیستیقلال، زمانی حکومەتی کوردستان، هـەواڵی بەشـێ لـە هەڵبژاردنـەکانی لـە ژێـر ناوی (مەجلیسی مەبعوسانی عیراق) دا بەمجۆرە بڵاو کردۆتەوە:

"سامەرە، کازمیە، بەغداد، بەعقوبە، ئەربیل و کۆیە، بۆ مەجلیسی مەبعوسانی عیراق ئەعزایان ئینتیخـاب کردوە." رۆژنامەکە ناوی مەجلیسەکەی بە هەڵـە لـە بـاتی (مەجلیسـی تەئسیسـی) بـە (مەجلیسـی مەبعوسـان) نوسیوە.

ناوچەی سلێمانی بە هۆی شۆڕشی شێخ مەحمودەوە نائـارام بـو. شـاری سـلێمانی لـە ژێـر دەسـەڵاتی حکومەتی کوردستان دا بو، لە بەر ئەوە کاربەدەسـتانی ئینگلیـز و عیـراق نەیانئـەتوانی وەکـو لیواکـانی تـر هەڵبژاردنی تێ دا ئەنجام بدەن. ئەیشیانویست نوێنەرانی سلێمانی هەرچۆنێ بێ لەم مەجلیسەدا بەشـدار بـن. لە بەر ئەوە رێگەیان دا لە کەرکوک کۆ بینەوە و 5 کەسیان بە نوێنەری سلێمانی بۆ مـەجلیس هـەڵبژارد. ئـەم کارە ناڕەزایی حکومەتی کوردستانی وروژانـدوە. بۆیـە ئومێـدی ئیسـتیقلالی زمـانی حکومـەتی کوردسـتان، مەزبەتەیەکی بڵاو کردۆتەوە کە ژمارەیەکی زۆر لە: "ئەشرافی مەملەکەت، عولـەمای کیـرام، توجـاری مەملەکـەت، بازرگان، ساداتی کیرام، موسەوی مەملەکەت، کەوشدروی مەملەکـەت، بـەقاڵی مەملەکـەت، ئاسـنگەری مەملەکـەت" ئیمزایان کردوە. تێی دا نوسیویانە:

"وەکو لە جەرائیدی العراق و سائیری بەغداد دا خوێندراوەتەوە گۆیا بۆ لیوای سلێمانی: عیزەت بـەگی عوسمان پاشا و، ئەحمەد بەگی تۆفیق بەگ و، میرزا فەرەج و، محەممەد بەگی فەتاح بەگی جاف، بیلا ئینتیخاب بە مەبعوس تەعین کراون.

"ئەمە تەصادوفی غەریبە. بە قەوانینی ئەساسیە مەبعوس بە ئینتیخاب تەعین کـردن حقـوقی مییلییەیـە. فەقەت نازانین چۆن ئەم زەواتە بە بێ مەعلوماتی میللەت بە مەبعوس ناسـراون. وا بـزانین ئەمانـە بـە تـەعین مەئمورییەتی مەبعوسی‌یان تەوجیە کراوە....

"ئێمە ئەگەر مەبعوس ئینتیخاب بکەین بۆ تەئمینی حقوقی میلیە و ئیکمالی نەواقیصی داخلیمان لە نـاو خۆمان دا لە خۆمان بە ئوصولی ئینتیخاب ئەو کەسانە کە شەرائیتی قانونیـەیان تیـا مـەوجود بـێ ئینتیخـاب ئەکەین. ئەمرۆ ئـەم وەزیفەیـە هـەتا ئینکیشـافی حەقیقـەت و تەسـلیمی حقـوق و مەوجودییـەتمان، تـەودیعی مەجلیسی میللی‌مان کردوە.

"وەکو وتمان چونکە ئەم مـەبعوسـانە بـە ئینتیخـابی ئێمـە نـەکراوە ئیعتیمادیشـمان پێیـان نیـە. لـە موقەڕەرات و تەعەهوداتیشیان عەلاقەدار نین." (ئومێدی ئیستیقلال، ژ 22، 10 ی نیسانی 1923)

شێخ قادری برای شێخ مەحمود یش، یەکێ بوە لەوانەی بە نوێنەری سلێمانی دانراوە، بـەڵام لێـرەدا بـە هەڵە یان بە ئەنقەست ناوی نەنوسراوە، بەڵام لە ژ 23 دا بەمجۆرە هەڵەکەیان راست کردۆتەوە:

"ئیعتیزار: لە نوسخەی هەفتەی رابوردوی ئومێدی ئیستیقلال دا کە بە تاریخی 10 ی نیسان و ژمـارە 22 لە خصوص مەبعوسانی سلێمانی کە بەحس کرا بو لەو میانـەدا حەفیـدزادە شـێخ قـادر ئەفەنـدی لـە بـەر حاڵەتی رەمەزان سەهوەن داخل نەکرا بو."

وەزارەتەکەی سەعدون توشی تەنگوچەڵەمەی دارایی بو، لە 16 ی تشرینی دوەمی 923 دا ئیستیقالەی کرد.

### 2. 2. کۆکردنەوەی

لە 22 ی تشرینی دوەمی 923 دا جەعفەر عەسکەری یەکەمین وەزارەتی خۆی کە پێنجەمین وەزارەتـی عیراق بو، پێک هێنا.

ئەرکی ئەم وەزارەتە ئەوە بو: مەجلیسی تەئسیسی، کە ئەندامـەکانی هـەڵبژێررابون، کـۆ بکاتـەوە، بـۆ ئەوەی تەسدیقی پەیماننامەی عیراقی– بریتانی و، رێککەوتننامەی مالی و عەسکەری و عەدلی بکا و، دەستوری عیراق و، قانونی هەڵبژاردنی مەجلیسی ئوممە پەسند بکا.

ئەگەرچی هەندێ لە سیاسیەکانی عیراق، لە باسکردنی پـرۆژەی ئـەم بەڵگـە گرنگانـەدا کـە پەیکـەرەی دەوڵەتی تازە دامەزراوی عیراقیان دروست ئـەکرد، بەشـداری‌یان کـرد بـو، بـەڵام هـەمو پرۆژەکـان لـە لایـەن شارەزایانی بریتانیەوە ئامادە کرا بون و، دوا قسە بۆ ئەوان بو.

### 2. 3. ئەرکەکانی

27 ی ئازاری 1924 مەجلیسی تەئسیسی دەستی بە کۆبونەوە کرد. (خیتابی عەرش) خوێندرایەوە. لـەم خیتابەدا ئەرکەکانی مەجلیس دیاری کرابون. دەقی موعاهەدەی عیراقـی– بریتـانی و مولحەقـەکانی، بـە 4 زمـان: ئینگلیزی، عەرەبی، تورکی، کوردی، چاپ کرا بو، بۆ خوێندنەوەی بە سەر ئەندامانی مەجلیسدا دابەش کرا.

11 ی حوزەیرانی 1924 مەجلیس، موعاهەدەی بریتانی– عیراقی تەسدیق کرد.

11 ی تەموزی 1924 پرۆژەی دەستوری پەسند کرد.

2 ی ئابی 1924 قانونی هەڵبژاردنی مەجلیسی ئوممە (مەجلیسی نواب و مەجلیسی ئەعیان) ی دانا.

لە سەردەمی وەزارەتەکەی عەسکەریدا مەجلیسی تەئسیسی لە 49 جەلسـە دا کـە 4 مانـگ و 7 رۆژی خایاند ئەرکە دیاریکراوەکانی خۆی بە جێ گەیاند.

بەمجۆرە هەر 3 ئەرکی بە جێ هێنا و، ئیتر هیچ هۆیەک بۆ مانەوەی نەما. بەوە یـش هـەم وەزارەت و هەم مەجلیس ئیشیان تەواو بو.

### 2. 4. هەڵوەشاندنەوەی

ژیانەوە بەمجۆرە هەواڵەکەی راگەیاندوە:

"مەجلیسی تەئسیسی‌ی عیراق

"وەکو لە جەرائیدی بەغدادا خوێندراوەتەوە دەورەی ئەمساڵی مەجلیسی‌ی تەئسیسیی عیراق نیهایـەتی هات و ئەعزاکانی هەرکەسە گەڕاوەتەوە بۆ شوێنی خۆی." (ژیان، ژ 1، 18 ی ئاغستۆسی 1924)

لـە 2 ی ئـابی 924 دا جەعفـەر عەسـکەری، پـاش ئـەوەی ئەرکـەکانی وەزارەتەکـەی بـە جـێ هێنـا، ئیستیقالەی لە وەزارەت دا. هەر لەو ژمارەیەدا (ژیانەوە) هەواڵی (گۆڕانی قابینە) ی لە رۆژنامـەی (المفیـد) ەوە بەمجۆرە وەرگرتوە:

"وەزارەتی جەعفەر ئەل عەسکەری پاشا ئیستیعفایان کردوە. ئیرادەی ملوکانە سادر بوە کـە وەزارەتـی فەخامەتی یاسین ئەل هاشمی بەم رەنگە کە لە ژێرەوە نوسراوە تەشەکول بکات:

| | |
|---|---|
| وەزیری داخلیە | عەبدولموحسین سەعدون |
| وەزیری مالیە | ساسۆن حسقیل |
| وەزیری ئەوقاف | ئیبراهیم ئەل حەیدەری |
| وەزیری عەدلیە | رەشید عالی ئەل گەیلانی |
| وەزیری ئەشغال | موزاحیم ئەل ئەمین ئەل پاچەچی |
| وەزیری مەعاریف | شێخ محەمەد رەزا ئەل شبیبی |
| وەکیلیی وەزیری دیفاع | |
| رەئیس ئەل وزەرا | یاسین ئەل هاشمی |

ئەم هەیئەتە تازەیە رۆژی 3 ی ئاغستۆسی 924 دەسـتیان کـردوە بـە ئـیش. (ژیانـەوە، ژ 1، 18 ی ئاغستۆسی 1924)

## 3. مەجلیسی ئوممە

مەجلیسی ئوممە ئەبو لە 2 مەجلیس پێک بێ: مەجلیسی نواب و مەجلیسـی ئـەعیان، کـە یەکـەمیان بـە هەڵبژاردن و دوەمیان بە تەعیین دائەنران.

### 3. 1. مەجلیسی نواب

بە دو قۆناغ، لە لایەن مونتەخیبی ئەوەلی و مونتەخیبی سانی‌یەوە، بۆ هەر 20 هـەزار پیـاو 1 نائیـب، بۆ دەورەیەکی ئینتیخابی کە ئەبو 4 ساڵ بێ، هەڵئـەبژێردرا. هـەمو دەورەیـەکی ئینتیخـابی ئـەبو 4 دەورەی ئیجتیماعی ئیعتیادی ساڵانەی هەبێ کە لە 1 ی تشرینی دوەم دا دەستی پێ ئەکرد. لە کاتی پێویست دا مەلیک ئەیتوانی بانگیان بکا بۆ ئیجتیماعی نائیعتیادی.

ژمارەی ئەندامانی مەجلیسی نواب تا 1935 بریتی بو لە 88 ئەندام و دوای ئـەوە لـە بـەر زۆربـونی ژمارەی دانیشتوانی عیراق کرا بە 118 نائیب.

**3. 2. مەجلیسی ئەعیان**

هەمویان لە لایەن مەلیکەوە تەعیین ئەکران. ئەبو ژمارەیان لە چواریەکی ژمارەی مەجلیسی نواب زیـاتر نەبێ. لەو کاتەدا بە هەمویان 20 عەین بون. بۆ 8 ساڵ تـەعین ئـەکران. بـەڵام ئـەبو هـەر 4 سـاڵ جارێـک نیوەیان بگۆڕدرێ.

هەردو مەجلیس لە یەک کاتدا کۆ ئەبونەوە و کۆبونەوەکانیشیان پێکەوە تەئجیل و تەعتیل ئەکرا.

پرۆژەی قانون لە لایەن مەجلیسـی نوابـەوە ئامـادە ئـەکرا و ئـەنێردرا بـۆ مەجلیسـی ئـەعیان. ئەگـەر پەسندی بکردایە ئەڕۆیشت بۆ جێبەجێ کردن. ئەگەر ئیعتیرازی لێ بگرتایە، لە کۆبونەوەی هاوبەشـی هـەردو مەجلیس دا بۆ ئەوەی پەسند بکرێ ئەبو زۆرایەتی دوسێ‌یەک بە دەس بهێنێ.

شاعیری بە ناوبانگی عیراق مەعروف رەسافی کە خۆی یەکێ لە سیاسیە ئاگادارەکانی عیراق بوە و لـە ناو روداوەکان دا ژیاوە، دەربارەی (مەجلیسی ئوممە) لە شیعرێکی‌دا وتویەتی:

علم ودستور ومجلس امة
كل عن المعنى الصحيح محرف
واتە: بەیداخ و، دەستور و، مەجلیسی ئوممە
هەمویان لە مەعنای راستەقینەیان لادراون

چەند تێبینی‌یەک:

1. دەربارەی مەلیک فەیسەڵ بڕوانە:

علاء جاسم محمد: الملك فيصل الاول حياته و دوره السياسـي فـي الثـورة العربيـة و سـورية والعـراق 1883– 1933، بغداد، 1990.

2. دەربارەی مەجلیسی تەئسیسی بڕوانە:

1.2. محمد مظفر الادهمي: المجلس التأسيسي العراقي، وزارة الاعلام، بغداد، 1976.

2.2. السيد عبدالرزاق الحسني: تاريخ العراق السياسي، ج 3، ط 6، بيروت، 1983.

3. دەربارەی عەبدولموحسین سەعدون بڕوانە:

الدكتور لطفي جعفر فرج عبدالله: عبدالمحسن السعدون و دوره فـي تـاريخ العـراق السياسـي المعاصـر، بغداد، 1979.

4. دەربارەی جەعفەر عەسکەری بڕوانە:

علاء جاسم محمد: جعفر العسكري و دوره السياسي و العسكري في تاريخ العـراق حتـى عـام 1936، بغداد، 1987.

5. دەربارەی یاسین هاشمی بڕوانە:

سامي عبدالحافظ القيسي: ياسين الهاشمی ودوره فی السياسـه العراقيـة بـين عـامی 1922 – 1936، الجزء الاول البصره 1975، الجز الثانى بغداد 1975.

6. دەربارەی نوری سەعید بڕوانە:

عبدالرزاق احمد النصيري: نوري السعيد و دوره في السياسة العراقية حتى عام 1932، بغداد، 1987.

# مەجلیسی نواب
# (دەورەی یەکەم)

1928/1/19 – 1925/7/16

## 1. دەورەی ئینتیخابیی یەکەم

لە 2 ی ئابی 924 دا یاسین هاشمی یەکەمین وەزارەتی خۆی و شەشەمین وەزارەتی لە عیراق دا پێک هێنا. ئیبراهیم حەیدەری، لەم وەزارەتەدا وەزیری ئەوقاف بو.

ئیبراهیم حەیدەری، کوردێکی هەولێری و، کەسایەتیەکی ناسراو بو. بە مەلایەتی چوبوە ئەستەمول و لە دواساڵەکانی دەوڵەتی عوسمانیدا گەیشت بوە پلەی شێخ ئەل ئیسلام. تا لە ئەستەمول بو لە گەڵ کۆڕ و کۆمەڵە و گۆڤارە کوردیەکاندا هاوکاری ئەکرد. دوای گەڕانەوەی بۆ عیراق لە وەزارەتەکەی یاسین هاشمی دا (924-925) بو بە وەزیری ئەوقاف و، دواتر مەلیک فەیسەڵ تەعینی کرد بە (عەین) لە مەجلیسی ئەعیان دا.

لە 19 ی تەموزی 924 دا سلێمانی داگیرکرایەوە و بەیەکجاری خرایە سەر عیراق.

لە 15 ی تشرینی دوەمی 924 دا ئیرادەی مەلەکی دەرچو بۆ هەڵبژاردنی مەجلیسی نواب.

وەزارەتەکەی یاسین هاشمی ئیستیقالەی کرد. مەلیک فەیسەڵ دیسانەوە سەعدونی تەکلیف کرد وەزارەت پێک بهێنێ. (ژیانەوە) هەواڵەکەی، بەمجۆرە بە لێدوانێکی خۆیەوە، بڵاو کردۆتەوە:

"گۆڕانی هەیئەتی وزەرا

"بە پێی خەبەرێ کە تازە لە بەغداوە هاتوە هەیئەتی وزەرای عیراق گۆڕاوە و هەیئەتی تازە وەکو نوسراوە دانراون:

| | |
|---|---|
| عەبدولموحسین بەگ | رەئیس ئەل وزەرا و وەزیری خاریجیە |
| رەشید عالی گەیلانی | وەزیری داخلیە |
| رەئوف بەگی جادرچی | وەزیری مالیە |

| | |
|---|---|
| ناجی سویدی | وەزیری عەدلیە |
| سەبیح نەشئەت | وەزیری دیفاع |
| عەبدولحسەین چەلەبی | وەزیری ئەشغال |
| حیکمەت سلێمان | وەزیری مەعاریف |
| حەمدی بەگ پاچەچی | وەزیری ئەوقاف |

"خوابکەم پێ و قدومی هەمو لایەکیان بۆ میلەتی عیراق بە خێر و سەعادەت بێ و عەرزی تـەبریکات و تەمەنای موەفەقیەتیان ئەکەین. لە ناو ئەم زاتە موحتەرەمانەدا، سەبیح نەشئەت بـەگ، کـە یـەکێ لـە ئـەعازیمی کوردە و مەبعوسی ئەربیلە، لە دڵی هەمو کوردێک دا جێگایەکی زۆر بەرز و بە قیمەتی هەیە. ئەمساڵ لە گەڵ هەیئەتی عیسبەتول ئومەم دا کە بۆ تەحدیدی حدودی شـیمالی موسـڵ تەشـریفیان هـات بـو جـەنابی سـەبیح نەشئەت بەگیش لە...(کۆپیەکەی نەخوێنرایەوە.نم)" (ژیانەوە، ژ 29، 1 ی تەموزی 1925)

سەبیح نەشئەت کە وەکو ژیانەوە نوسیوێتی لە ئەعازیمی کورد بوە، ئەبێ پیاوێکی هەڵکەوتو لە هـەمان کات دا جێگەی بڕوای ئینگلیز و مەلیک فەیسەڵ بوبێ چونکە چەندین پلە و پایەی بەرزی لە حکومەتی عیراق دا پێ سپێردراوە. چەند جارێ بۆتە وەزیر و، دوای ئیمزاکردنـی رێککـەوتنی تورکیـا و عیـراق دانـراوە بـە وەزیری مفەوەزی عیراق لە تورکیا تا لەوێ مردوە. ژیان بە بۆنەی مردنیەوە نوسیوێتی:

"زیاعێکی گەورە

"ئەنقەرە، وەزیری مفەوەزی عیراق لە تورکیا مەعالی سەبیح نەشـئەت بـەگ رۆژی 19ی ئـەم مانگـە لـە ئێستانبول بەر رەحمەتی خوا کەوت. خودای تـەبارەک و تـەعالا سـەبر و تەسـەلا بـە عائیلـەی کەدەردیـدەی ئیحسان بفەرموێ." (ژیان، ژ 188، 25 ی تەموزی 1929)

## 1 . 1. پێکهێنانی مەجلیس

لە کاتی هـەڵبژاردنی دەورەی ئینتیخـابی یەکـەم دا، لـە سـلێمانی رۆژنامـەی (ژیانـەوە) و لـە بەغـداد (دیاریی کوردستان) دەرئەچون. هەردوکیان هەندێ لە هەواڵەکانی ئەم هەڵبژاردنەیان بڵاو کردۆتەوە.

(دیاریی کوردستان) کە لە بەغداد بە کوردی و عەرەبی و تورکی، دەرچـوە، ئـەنجامی هەڵبژاردنـەکانی هەمو عیراقی نوسیوە. لە ژ 7 ی دا لە ژێر سەردێڕی (ئینتیخابی مەبعوسان) دا نوسیوێتی:

"9 ی حوزەیرانی 1925– 1341 رۆژی دوشەمو لە بەغدا و لە دەرەوە نوابی عیراق ئینتیخاب کـرا. لەم نزیکانە کۆ دەبنەوە و دەست ئەکەن بە ئیش. ئێستە هەر ناویـان عـەرز دەکـەین. ئینشـائەڵڵا بـەرە بـەرە رەسمی هەمویان نیشان ئەدەین. خوا موەفەقیان بکا."

ئینجا بە ریز ناوی نائیبەکانی بەغداد، دیالە، دلێم، حلە، کەربەلا، کـوت ئـەل ئیمـارە، دیوانیـە، بـەسـرا، عەمارە، مونتەفیک، موسڵ، کەرکوک و ئەربیلی بڵاو کردۆتەوە. ئەوانەی دوایی بەمجۆرە بون:

"نوابی موصل: ئەرشەد ئەل عومەری، زیا بەگ ئال شەریف بەگ، عـەلی ئـەل ئیمـام، ئیبـراهیم کـەمال، سەعید چەلەبی حاجی سابیت، سابیت عەبدەلنور، حازم بەگ ئال شەمدین ئاغـا، شـێخ نـوری ئـەل بریفکـانی، هەیبەتوڵا ئەفەندی موفتی عەقرە، ئەلخوری یوسف خەیات، رەئوف شەماس ئالوس، ئیسحاق ئەفرایم.

"نوابی کەرکوک: نەشئەت بەگ، شێخ حـەبیب ئەفەنـدی تاڵـەبانی، رەفیـق ئەفەنـدی خـادیم سـوجادە، سەعید ئەفەندی صەلاحیە.

"نوابی ئەربیل: صەبیح نەشئەت بەگ، داود بەگ ئەل حەیدەری، یوسف ئیبـراهیم ئەفەنـدی، ئیسـماعیل بەگ، عەبدوڵا موخلیص بەگ."

لە داوێنی ئەم لیستەیەدا وتارێکی بە ناونیشانی (نائیب– مەبعوس: نارراو) نوسیوە، ئەڵێ:

"لە بەر ئەمەی کە دیاریی کوردستان سیاسی نیە، لە حەق نەتیجەی ئینتیخابات موتالەعات و ئیجتیهادات نانوێنین. فەقەت بە ناوی هەیئەتی ئیجتیماعیەوە ئەتوانین نەختێ بەحس لە حقوقی ئیجتیماعی و ئەدەبی خۆمان بکەین."

بە هۆی هەلومەرجی تایبەتی سلێمانیەوە هەڵبژاردن لەوێ دوا کەوتوە. دیاریی کوردستان لە ژ 8 ی دا ناوی (نوابی سلێمانی) یشی بڵاو کردۆتەوە:

"رۆژی 24 ی حوزەیرانی 925 لە سلێمانیش مەبعوسان ئینتیخاب کرا. جەنابی محەمەد ساڵح بەگ محەمەد عەلی بەگ بە 145، میرزا فەرەج حاجی شەریف بە 137، محەمەد ئەمین بەگ بیگباشی ئەرکان حەرب بە 125، ئەحمەد موختار بەگ عوسمان پاشا بە 110 رەئی، بون بە مەبعوسی سلێمانی عەرزی تەبریکات دەکەین، لە سەر خێر و نەفعی مەملەکەت و میللەت موەفەق بن."

(ژیانەوە) یش کە لە سلێمانی دەرچوە لە ژێر سەرناوی: (ئینتیخابی مەبعوس) دا، بێ ئەوەی باسی وردەکاری رەوتی هەڵبژاردن و قۆناغەکانی بکا، هەواڵی هەڵبژاردنی مەبعوسەکانی سلێمانی بەمجۆرە بڵاو کردۆتەوە:

"رۆژی چوارشەمە 24 ی مانگ ئینتیخابی مەبعوس تەواو بو لە نەتیجەدا:

"محەمەد ساڵح بەگی محەمەد عەلی بەگ بە 145 رەئی، میرزا فەرەجی حاجی شەریف بە 137 رەئی و، ئەمین زەکی بەگی بیگباشی ئەرکانی حەرب بە 125 رەئی، ئەحمەد بەگی عوسمان پاشا بە 110 رەئی، بۆ مەبعوسی لیوای سلێمانی ئینتیخاب کران و دانران.

"ئەم زەواتە موحتەرەمانە، کەوا بۆ مەبعوسی لیواکەمان هەڵ بژێرراون، بەناوی هەمو میللەتەوە عەرزی تەبریکیان ئەکەین و، بەدڵ و بەگیان دۆعای موەفەقیەتیان تەقدیم ئەکەین. ئومێدمان وایە کە ئینشائەڵڵا ئەم وڵاتە بە واسیتەی هیمەت و سەعی ئەم زەواتە موحتەرەمەوە زۆر شتی باش و چاکی بۆ ببێ و بچێتە ریزی وڵاتانەوە. زاتەن ئەمەل و ئومێدی زۆر زلی ئەم وڵاتە بەستراوە بە نەتیجەی سەعی و هیمەتی ئەمانەوە. سا خوا تەوفیقیان بدا ئامین." (ژیانەوە، ژ 28، 26 ی حوزەیرانی 1925)

وازهێنانی ئەحمەد موختار جاف

"ئیعلان

"بە پێی تەلغرافێکی بێتەل کە لە وەزارەتی جەلیلەی داخلیەوە بۆ مەقامی موتەسەریفی هاتوە ئەحمەد موختار بەگ لە مەبعوسی ئیستیعفای کردوە و ئوصولەن لە جیاتی مومائیلەیهی مەبعوسێکی تر ئینتیخاب بکرێ. بینائەن عەلەیهی هەرکەسێ تالیبە بۆ مەبعوسی لە تاریخی ئینتیشاری ئەم ئیعلانەوە لە غەزەتەی ژیان دا تا دو هەفتە نامزەدیی خۆی ئیعلان بکا.

دائیرەی بەلەدیەی سلێمانی" (ژیان، ژ 3، 4 ی شوباتی 1926)

نامزەدکردنی مستەفا پاشا

لە جێی ئەحمەد موختار چەند کەسایەتی ناسراوی سلێمانی کە بێگومان خاوەن نفوز و لایەنگر بون، حاجی مستەفا پاشای یاملکیان بۆ نوێنەرایەتی سلێمانی، لە ژ 5 ی ژیان دا بەم نامەیە ناودێر کردوە:

"بۆ مودیری موحتەرەمی غەزەتەی ژیان

"ئێمە کە لە ئەشراف و تیجار و منەوەرانی سلێمانی‌ین، لەبەر ئەوە کە حاجی مستەفا پاشا بـە زاتێکـی موقتەدیر و بە لیاقەت ئەزانین وە بۆ ئەوەی کە سلێمانی لە مەجلیسی نواب دا تەمسیل بکـات لـە گـەڵ صـەد کەس رەفیقمان نامزەدیی موشار ئیلەیهی ئیعلان دەکەین و لە مونتەخیبی سانیەکانمان ئومێـد ئەکـەین کـە بـۆ مەبعوسی ئینتیخابی بفەرمون.

فەتاح بەگ زادە: ئەحمەد. عەبدورەحمان ئاغا زادە: محەمەد ناجی. حاجی ئیبـراهیم خـەفاف. حەسـەن ئاغا زادە: حاجی. محامی رەفیق. تۆفیق قەزاز. رەشید مەستی. مەعروف بەگ زادە: فـائیق. حـاجی شـەریف زادە: فەتاح. حاجی فەتاح زادە: رەمزی."

پێ ناچێ ئینگلیز رای لە حاجی مستەفا پاشا بوبێ لە بەر ئەوە هەڵ نەبژێرراوە.

## 1. 2. چاوەروانیەکانی خەڵک لە مەبعوسەکان

لە عیراقی تازە دامەزراودا، ئەوە جاری یەکەم بـوە هـەڵبـژاردن بـۆ دانـانی نوێنـەرانی خـەڵک بکـرێ. کوردستان بە تایبەتی ناوچەی سلێمانی، لە 1919 ەوە تا ئەو کاتە لە هەلومەرجێکی نائاسایی‌دا ژیاوە. ئـارام و ئاسایش، بازاڕ و بازرگانی، کاروان و هاتوچۆ، خوێندن و پەروەردە، دەوام و دائیرەکانی حکومەت، هـەموی تێک چو بو. دامەزرانی 3 جار حوکمرانی کوردی و روخانی و، ئـازاد بـونی سـلێمانی و بۆردومـانکردنی و چۆڵکردنی چەند جارەی و داگیرکردنەوەی، خەڵکی توشی بێزاری و داهێزران کردبو، بە هیوا بون دەرویەکی رەحمەتیان لێ بکرێتەوە.

لە 19 ی تەموزی 924 دا سلێمانی لە لایەنی هێزی زەمینی عیراقـی و بریتـانی یـەوە، بـە پشـتیوانی هێزی شاهانەی بریتانی داگیر کرا و شێخ مەحمود و هێزەکانی کشانەوە بۆ شاخەکان. سلێمانی بە یـەکجاری وەکو لیوایەک خرایە سەر عیراق. دەزگای بەرێوەبەرایەتی عیراقی تێدا دامەزرا. لەو هەڵبژارنە یـش‌دا کـە بـۆ مەجلیسی نواب کرا، دانیشتوانی سلێمانی بە خواهیشت بێ یان بە زۆر، بەشدار بون.

تەجروبەی پارلەمانی لە عیراق دا، تەجروبەیەکی تازە بو. ئەوەندە چاوەڕاوی باشی بۆ کرا بو، خـەڵک پێیان وابو گیروگرفتەکانیان چارەسەر و، هەمو پێویستیەکانیان بۆ دابین و، هەمو ناتەواویەکانیـان بـۆ پـڕ ئەکاتەوە. خەڵک هێشتا شارەزای فرۆفێڵی ئینگلیـز و گەمـەی پارلـەمان و تەڵەکـەبازی سیاسـیە پیشـەییەکان نەبوبون. بە نیەتێکی پاک و بە دڵێکی سافەوە، لە (مەجلیسی مەبعوسان) چاوەڕوانی زۆر شتی باش بون.

هەر لەم روانگەیەوە (ژیانەوە) لە ژێر سەردێڕی (چیمان ئەوێ لە مەبعوسەکانمان؟) نوسیوێتی:

"بە ناشوکری نەبێ ئەوەندە ئیحتیاجمان زۆرە، هێندە کـەموکوڕی‌مان هەیـە، هـەر نـازانین داوای چـی بکەین، چونکە هەرچی بڵێین کەمە. وڵاتەکەمان لە مەعاریف، لە صەنایع، لە تیجارەت، لە زەراعەت، خولاصـە لـە هەرچی ئاساری ئاوەدانی و گەورەیی و بەرزی بێ بەشە. بە هەر لایەکدا ئەڕوانی وێرانی ئەبینی. خـۆ جـارێ لە پێش هەمو شتێکمانەوە ئەوی بۆ ئێمە پێویسـتە ئاسـایش و ئەمنیەتـە کـە بـۆ ئـەو خصوصـە ئەوەلـەن لـە حکومەت دوەمین لە مەبعوسەکانمان ئەپارێینەوە کە مەرحەمەت بفەرمون و هەوڵمان بۆ بدەن بـۆ دامەزرانـدنی وڵاتەکەمان. ئەمجار لە پاش ئەوە ئەوەی بناغە بێ بۆ گەورەیی و سەربەرزی‌مان مەعاریفە و مەکتـەب، مەکتەبـە و مەعاریف، یەعنی مەعاریف، مەعاریف...

"چونکە دیارە کە مەعاریف بو وردە وردە، بەرە بەرە، ئەخلاقمان باش ئەبێ، تیجارەتمان سەر ئەکەوێ، زەراعەتمان زیاد ئەکا، صنعەتمان زۆر ئەبێ.

"ئەمرۆ کە حکومەت حکومەتی خۆمانە و حاکمیەتی میلیەمان هەیە، کەچی لە هەمو لیوای سلێمانیا تـەنیا مەکتەبێکی ئیبتیدائی هەیە، کە ئەویش لە بەر ناعیلاجی نەبێ پێی نابێژرێ مەکتەب. سەیری کەرکوک کەن بـە

بن دەستمانەوە، نامە خوای لێ بێ، مەدرەسەی عیلمیەی، لە هەمو گەڕەکێ مەکتەبێکی ئیبتیدائی، مەکتەبی صەنائیعی، مەکتەبی کچانی، مەکتەبی خریستیان و موسەوی، بگرە و بەردەی مەعاریفی، هەرا و زەنای کەشافەی، تاقمی تەداروکی مەکتەبەکانی، شەوق و زەوقی قوتابییەکانی، ئینسان حەیرانی ئەبێ. لای ئێمەش هەر راووڕوت و کەرفڕاندن و دڵ داخورپاندنە.

"ئێمە ئەوەڵەن بە پەلەپەل ئیستیرحامی ئەوە ئەکەین کە مەبعوسەکانمان بە هەمو هێز و قوەتی خۆیان هەوڵمان بۆ بدەن کە تەئمینی ئەمنیەت و سەربەستیمان بۆ بکەن. ئەمجار مەکتەب و مەعاریفمان بۆ بگەیەننە دەرەجەیەکی باش و لائیق. ئێمەیش لە بەرەوە ئیحتیاجاتی ترمان عەرز ئەکەین." (ژیانەوە، ژ 34، 6 ی ئاغستۆسی 1925).

ژیان، کە راستەخۆ دوای ژیانەوە دەرچوە، بە ئیمزای (کوردی) ئەویش بە دو ئەڵقە نامەیەکی کراوەی (بۆ مەبعوسە موحتەرەمەکان) ناردوە. لە ئەڵقەی 1 دا نوسیویێتی:

"لە پێش هەمو شتێکا بە دڵ تکا ئەکەم، بێ زەحمەتی ئەم مەعروزاتە قبوڵ بفەرمون و بە ئەهمیەت بیخوێننەوە، چونکە ئەم هاوارە هی شەخصێ نیە، هی دوان نیە، بۆ قەومێکە، بۆ میلەتێکی هەژار و بەجێماوە، عائید بە ژین و مردنی قەومێکی بێ کەسە.

"وەکو رۆژ لای جەنابتان مەعلومە کە ئیمرۆ، ئەم زەمانە، هیچ میلەتێ بێ عیلم و عیرفان، بێ عیرفان و عیلم، ناژی و حەقی ژیانی نیە. هەچ میلەتێ بیەوێ لە صنعەت، لە تیجارەت، لە زەراعەت و لە هەمو شتێکا پێشکەوێ، لە پێش هەموا ئەبێ کردن و پێکهێنانی ئەمانە بزانێ، کە ئەمانەش بە عیلم و عیرفانەوە ئەبێ.

"بەڵێ، ئێستا تیجارەکانمان تیجارەتی خۆیان ئەکەن، بەڵام بێ زەحمەتی بڕوانن چۆن تیجارەتێکە؟ کتێبی تیجارەتیان موقابیل بە (دەفتەری ئوصولی تیجارەت، حساباتی مالیە) ی عالەمە؟ وەکو کتێبەکەی مەلا یونس تێکەڵ و پێکەڵە هەزار چەشنەیە. ساڵی لە روی نەزانین و نەخوێندنەوە چەند هەزار روپیە زەرەر و زیان ئەکەن.

"بەڵێ، ئێستا جوتیارەکانمان جوت ئەکەن، بەڵام بە رەحمێکی دەرونیەوە بڕوانن بزانن تا گای لەڕ و بێ فەڕ پەیدا ئەکەن و خەرمان هەڵ ئەگرن، چەند جار ئەزیەت و ناخۆشی ئەبینن؟ خۆ صنعەت لای ئێمە هەر.. نا باسی بکرێ.

"ئینجا تا میلەتەکەتان ئەمە سەویە و عیرفانی بێ، ئەمە بەهرە و زانستی بێ، لەم عەصری پێشکەوتن و ژیانەدا قابیل نیە.. دەوام بکا.

"بۆ چاک کردنی ئەمانە، بۆ پێشکەوتنی.. زەراعەت و هەموشتێکمان لە پێش هەمو شتێکا عیلم و عیرفان پێویستە، بۆ ژین و ژیان عیرفان و عیلم لازمە، ئەمیش بە سایەی مەکتەب و مەدرەسەوە ئەبێ. میلەتانی تر هەر یەکە میقدارێک پێشکەوتون وا بە چوار پەل خەریکی مەعاریفن، ئێمە کە دواکەوتوی هەمو قەومێکین، ئەبێ بڕفین، بڕفین مەعریفەت پەیدا بکەین و بڕفین و نەوەستین.

"ئەفەرمون مەقصەد لەمانە چیە؟ ئەوە چیە مەکتەب و مەداریس، ئەوە چیە عیلم و مەعاریف هەمانە، بەڵام بێ زەحمەتی تۆزێ بڕواننە وڵاتەکەمان، ئەو وڵاتە عەزیزە ئێوە ئیمرۆ وەکیلی ئەو قەومەن کە تیایە، بڕوانن سەویە و عیرفانی ئەو میلەتە مەزڵومە کە ئێوەی ناردوە بۆ پێکهێنانی ئامالی، کە ئێوە لیسان حاڵی ئەو میلەتە بەسەزمانەن.

"هەر لە سنجارەوە تا شارەزور بڕوانن دو مەکتەب، دو صنعەتخانە، دو مەکینەی تیا نیە کە پێی ببێژرێ واسیتەی پێشکەوتن و مایەی هونەر. بۆچی لە بەر چی؟ بەڵێ ئەفەرمون سلێمانی تا ئێستا لە بەر

شۆرش و هەرا هیچی بۆ نەکراوە بەڵام ئـەی کۆیـە، رەوانـدز، هـولێر، ئـاکرێ و بادینـان، دهـۆک و زاخـۆ و سنجار، ئەمانە چی و بۆچی وا وێرانەن. بۆچی کوردستان هەر سلێمانیە؟ بە هەمو مەکتەبەکانی کوردستان دو موعەلیمی چاک، دو کتێبی تیا نیە و نیە.. کوانێ موعەلیمە کوردەکان، ئەوانەی وەختی خۆی لە مەکاتیبی عیلمیە و، ئیستە لە دارەل موعەلمینی دەرچون لە کوێن و چییان لێ هات؟

"ئەی مەبعوسانی کیرامی کورد!

"ئێوە کە وەکیلی میلەتی کوردن، ئێوە کە تیمسالی رۆحی قەومی کوردن، بە دڵ تکاتان لێ ئەکـەم ئیتـر بە رەحمەوە بە چاوێکی پڕ دیقەتەوە بڕواننە حاڵمان، حاڵی ئیقتیصادی، عیلمی و ئیجتیماعیەمان، بـزانن لـە چ سەفالەت و سەرگەردانیەکاین، بزانن چەند جاهیل و پاشکەوتوین؟ ئەمانە وەزیفەی مەودوعەی ئێوەیـە... ئـەوە کۆیە، هەولێر، ئاکرێ و زاخۆ، دو مامۆستای وای تیا نیە کە بە کەڵک بێ و کوردی بـزانن و مناڵـەکانمان تـێ بگەیەنن، کەچی ئەوە عەمارە، مەجەر، دیوانیە، بەصرە، عانە، هەریەکە یەکـدو موعـەلیمی کـوردی لێیـە، بـۆچی ئەوانە لە وڵاتان دەربەدەر بن و وڵاتەکەی خۆمان لە بـەر بـێ موعـەلیمی دامـاو و پەککـەتو بـێ. ئەمـە چـۆن پێشکەوتنێکە؟" (ژیان، ژ 9، 18 ی مارتی 926).

لە ئەڵقەی 2 هەمیدا نوسیویێتی:

"ئەمجارە مەسئەلەیکی زۆر موهیم و نازک هەیە کە عائید بـە رۆحـی پێشـکەوتنی میلەتەکەیـە ئەمـەوێ عەرزتان بکەم.

"ئیمڕۆ هەمو میلەتێ بۆ پێشکەوتنی عیرفانی خۆی ئوسولی پرۆغرامێکی رێوپێک تەعقیب ئـەکا کـە لـە سەر ئەوە بڕۆن. هیچ قەومێ نیە بێ پرۆغرام بژی، هیچ جەمعیەتێک نیە بێ پرۆغرام ئیش بکـا، بـەو چەشـنە مەعاریفیش لە سەر پرۆغرامێک ئەبێ بڕوا. عیراقیش وا خەریکە پرۆغرامێکی تازە بۆ مەعاریف رێـک ئـەخا. لێرەدا وەزیفەیەکی زۆر گەورە و نازک ئەکەوێتە سەر ئێوە کە عائید بە ئیستیقبالی میلەتەکەتانە، عائید بە ژین و مردنی قەومەکەتانە.

"خۆیشـتان ئـەزانن هـیچ قـەومێ رۆحـی میلـەتێکی تـری نیـە. هـەچ میلەتـە بـە عەنعـەنات و عـادات و قاعیدەیەک کە موافیقی تەبع و رۆحی خۆی بێ بەڕێوە ئەچێ و تابیع بـە عـادات و قـەوانینی میلـەتێکی تـر نابێ.

"لە بەر ئەوە بە دڵ ئیستیرحام ئەکـەین و ئەپاڕێینـەوە و تەلـەبی دوشـتی گـەورە، پێویسـت و نـازک ئەکەین: (پرۆغرامێک بۆ مەعاریفی کورد، دارولموعەلیمینێکی کوردی) هەردوکیان بۆ قەومی کـورد ئیمـڕۆ زۆر زۆر پێویست و موهیمە، زۆر گەورەیە. مەعاریف بێ ئوسول و پرۆغرام نابێ، مەداریس بێ مامۆستا نابێ.

"تەلەبەی کورد ناتوانێ بە فەصاحەتی عەرەبی عیلم و فەن فێر بێ و تەحصـیل بکـا. هـەمو تەلەبەیـەکی کورد ئیستیعدادی فێربونی ئەم عەرەبیە قورسەی نیە. ئەگەر دارولموعەلیمینێ نەکرێتەوە بـە کـوردی، سـبەینێ موعەلیممان نامێنێ، پەکمان ئەکەوێ لە بەر بـێ موعـەلیمی. ئینجـا ئـەو وەختـە یـا موعـەلیمی بێگانـە و زمـان نەزانمان بۆ ئەنێرن یا مەکتەبەکان ئەبێ داخرێ. کە بە هەردولادا، بە هەردو چەشن، مردنی میلـەتی لـە دوایـە، تاریکی ژینی ئەولادی وەتەنی تیایە، کە هیوامان هەیە ئێوەیش حەز بە هیچیان نەکەن و نەتانەوێ.

"لە بەر ئەوە زۆر بە زویی و بە عەجەلە دارولموعەلیمینێکمان ئەوێ. دارولموعـەلیمینێکمان ئـەوێ و زۆر زو ئەمانەوێ. وەکو مەداریس بێ موعەلیم نابێ، تەحصیل و تەعلیمیش بێ پرۆغرام و ئوصول نابێ. پرۆغرامێ کە بەغدا تەرتیبی بکا حەتا جوزئێکیشی موافیقی رۆحی میلەتی ئێمـە نیـە و بـۆ ئێمـە ناشـێ. ئێمـە لـە سـەر پرۆغرامێ کە موافیقی رۆحی قەومی عەرەب بـێ نـاتوانین بـڕۆین بـەڕێوە و نـاژین. نەتیجـەی تـەتبیقی ئـەو

پرۆغرامە زیان و دواکەوتنە. پرۆغرامێکمـان ئـەوێ کـە مـوافیقی رۆحـی میللیمـان بـێ، کـە ئاسـاری رۆحـی قەومیمانی تیا بێ. لە بەر ئەوە پرۆغرامێکی خصوصیمان ئەوێ بۆ مەعاریفی کورد و، زۆر پێویستمانە.

"ئەمانە کە عەرزی جـەنابتانم کـردوە هـەمو ئەساسـی سـەرکەوتن و پێشـکەوتنمانە. بـێ ئەمانـە، بـێ پێکهێنانی ئەمانە پێشکەوتن و بەرزی نابێ، نیە. داواکردنـی ئەمانـە حەقمانـە، حقوقێکـە عالـەمی مەدەنیـەت و قەوانین پێی بەخشیوین و ئیمڕۆ ئێمە مالیکی ئەم حقوقەین، داواکردنی عەیب و ناحەق نیە. داوا نـەکردنی و بەجێ نەهێنانی عەیب و عارە. دیسان بە ناوی ژین و ژیانی قەومێکەوە ئەپاڕێمەوە و هاوار ئەکەم بە ئەهمیەت بڕواننە ئەم مەعروزاتە، ئەم هاوار و داوایە و بۆمان بکەن، بۆمان ئیجرا بفەرمون.

"میلەت بێ علیم و عیرفان ناژی، عیلم و مەعریفەت بێ مەکتەب نابێ، مەکتـەب و مەدرەسـە بـێ موعـەلیم نابێ و مەعاریفی هیچ میلەتێ لە سەر پرۆغرامی میلەتێکی تر ناڕوا و پرۆغرامێکی خصوصیی ئەوێ، ئەگینا نە پێشکەوتنمان ئەبێ، نە سەرکەوتنمان ئەبێ و نە ژیان. ئینجا ئیمڕۆیە رۆژی خزمەت و هیمەت، رۆژی لوتـف و مەرحەمەت." (ژیان، ژ 10، 25 ی مارتی 1926).

لەو سەردەمەدا عیراق تازە خەریکی دانانی سیستەمی پەروەردە و پرۆگرامەکانی خوێنـدنی سـەرەتایی و ناوەندی و دوا ناوەندی بو. بۆ ئەم مەبەستە (ساطع الحصري) کە پـەروەردەکارێکی نەتەوەپەرسـتی عـەرەب بو، هێنرا بو بۆ عیراق و کرا بو بـە بەڕێوەبـەری گشـتی پـەروەردەی هـەمو عیـراق. کاروبـاری پـەروەردەی کوردستان بەشێ بو لە هی هەمو عیراق. حوسەری یەکێکە لە تیۆریسیەنەکانی بیـری نەتـەوەیی عـەرەب. هـەر بەو گیانە یش ئەیویست سیستەمی پەروەردەی عیراق و پرۆگرامـەکانی خوێنـدن بـۆ قوتابیـانی مەکتەبـەکان دابنێ. زۆر لە هەوڵەکانی مەبعوسەکانی کورد و مامۆستا شـارەزاکانی بـواری پـەروەردەی کـوردی، لـە لایـەن ئەمەوە تەگەرەی لێ ئەدرا و، نەیئەهێشت جێبەجێ بکرێن.

هەڵبژاردەی کورد ئەگەر لەوەوپێش داوایان ئەکرد زمانی خوێندن لە قوتابخانـەکاندا کـوردی بـێ، لـەم نامەیەدا (کوردی) لەوە تێ پەڕیوە و داوای دو بابەتی زۆر گرنگی کردوە:

**یەکەمیان**، دانانی پرۆگرامێکی خوێندن و پەروەردەی تایبەت بە کورد کە جیاواز بێ لە هی عـەرەب و، لە گەڵ گیانی نەتەوەیی کوردا بگونجێ.

**دوەمیان**، کردنەوەی دامەزراوێکی تایبەتی بۆ پێگەیاندنی مامۆستای کورد.

داوای یەکەمیان، بە بیانوی ئەوەی کە پەروەردە و پێگەیاندنی نەوەی تازە پێگەیشتوی عیراق، بـە عـەرەب و کوردەوە ئەبێ بەشێ بـێ لـە سیاسـەتی ناوەنـدی دەوڵـەت، نـە لـە سـەردەمی پاشـایەتیدا و نـە لـە سـەردەمی جمهوریدا، سەرەڕای ئەوەی بوبو بە داوای جوڵانەوەی نەتەوەیی کورد و لە هەمو خولەکانی گفتوگۆی نوێنـەرانی شۆڕشی کورد و حکومەتی عیراقدا خراوەتە بەر باس و مشتومڕ، بەڵام هەرگیز جێبەجێ نەکرا.

داوای دوەمیان، دەیان ساڵ هەوڵی سەرومڕی ویست تا لـە حـەفتاکانی سـەدەی بیسـتەم دا پـەیمانگای پێگەیاندنی مامۆستایان لە هەندێ لە شارەکانی کوردستاندا کرایەوە.

### 1. 3. ئیجتیماعەکانی مەجلیس

دەورەی ئینتیخابیی مەجلیسی نواب ئەبو 4 ساڵ درێژە بکێشێ. هەمو ساڵێک یەک ئیجتیماعی ئیعتیادی هەبێ لە 1 ی تشرینی دوەم دا دەستی پێ بکا. ئەگەر هەڵبژاردن پێش ئـەم کاتـە بکرایـە و مـەلیک بـە ئیـرادەی مەلەکی داوای کۆبونەوەی لێ بکردنایە، یاخود ئیجتیماعی ئیعتیادی لە کاتی دیاریکراوی خۆیدا کارەکـانی تـەواو نەکردایە و، مەلیک ئیرادەی تەمدیدی بکردایە، بەم کۆبونەوانە ئەوترا ئیجتیماعی غەیر ئیعتیادی.

دەورەی یەکەم هەردو جۆر ئیجتیماعی کردوە.

(ژیانەوە) هەواڵی یەکەم کۆبونەوەی بەمجۆرە راگەیاندوە:

"کردنەوەی مەجلیسی میلی

"بە پێی خەبەرێ کە لە بەغدادەوە هاتوە رۆژی پێنجشەمە 16 ی تەموزی 925 موصادیفی 24 ی زیلحیجەی 1343 بە ئیرادەی ملوکانە مەجلیسی میلی عیراق گوشاد ئەکرێ.

"ئەم رۆژە رۆژێکە بناغەی سەعادەتی میلەتی عیراق دائەمەزرێنێ و رێگەی فەلاح و صەلاح نیشان ئەدا. دڵ فەرەح ئەکاتەوە، چاو رون ئەبێتەوە، غونچەی ئومێد ئەگەشێنێتەوە. خودا بە گەورەیی خۆی ئەم رۆژە موبارەکەمان بۆ بە خێر بگێرێ و خۆشی و سەعادەتی زۆر بە سەرمانا داببارێنێ ئامین." (ژیانەوە، ژ 31، 16 ی تەموزی 1925)

ئەم کۆبونەوەیە، کە رەشید عالی گەیلانی بە (رەئیسی مەجلیسی نواب) و یوسف سویدی بە (رەئیسی مەجلیسی ئەعیان) هەڵبژارد، سەرەتای کاری مەجلیس بو. لە بەر ئەوەی نەکەوت بوە بەر 1 ی تشرینی دوەم بە ئیجتیماعی غەیر ئیعتیادی (کۆبونەوەی نائاسایی) دائەنرا. لە 16 ی تەموزەوە تا 29 ی تشرینی یەکەمی 925 ی خایاند، 47 جەلەسەی تێدا کراوە.

ئیستیقالەی سەعدون

ئیجتیماعی ئیعتیادی (کۆبونەوەی ئاسایی) ساڵانەی مەجلیس، بە پێ ی قانون، ئەبو لە 1 ی تشرینی دوەمدا دەست پێ بکا. سەعدون سەروەزیرانی عیراق، حیکمەت سلێمان کە وەزیری ناوخۆ بو لە وەزارەتەکەیدا، ناوزەد کرد بۆ سەرۆکایەتی مەجلیس. بەڵام مەجلیس رەشید عالی گەیلانی بە رەئیسی خۆی هەڵبژارد. سەعدون ئەمەی بە تێشکان بۆ خۆی ژمارد. داوای لە مەلیک کرد یان مەجلیس حەل بکا یان ئیستیقالە لەم قبوڵ بکا. لە بەر ئەوەی مەجلیس تازە هەڵبژێررا بو، مەلیک بە چاکی نەزانی مەجلیس حەل بکا، ئیستیقالەی لە سەعدون قبوڵ کرد و، دیسان جەعفەر عەسکەری تەکلیف کرد وەزارەت پێک بهێنێ. لەم بارەیەوە ژیان نوسیوێتی:

"خەبەراتی بەغدا:

"قابینەی تازە: بینا لە تەلغرافێ کە لە وەزارەتی جەلیلەی داخلیەوە بۆ سەعادەتمەئاب موتەسەریف هاتوە قابینەی تازەی عیراق بەم نەوعە تەشەکولی کردوە:

| | |
|---|---|
| جەعفەر پاشا ئەلعەسکەری | رەئیسەل وزەرا و وەزیری خارجیە |
| رەشید عالی بەگ ئەلگەیلانی | وەزیری داخلیە |
| یاسین پاشا ئەلهاشمی | وەزیری مالیە |
| رەئوف بەگ جادرچی | وەزیری عەدلیە |
| نوری سەعید پاشا | وەزیری دیفاع |
| ئەمین زەکی بەگ | وەزیری ئەشغال و مواسەلات |
| سەید عەبدولمەهدی | وەزیری مەعاریف |
| ئەمین عالی بەگ باش ئەعیان | وەزیری ئەوقاف" |

(ژیان، ژ 43، 25 ی تشرینی سانی 926)

یەکەم ئیجتیماعی ئیعتیادیی مەجلیس کە لە 1 ی تشرینی سانی 925 تا 15 ی حوزەیرانی 926 ی خایاند، 54 جەلەسە بوە.

"دوەمین دەفعە بۆ مانگێکی تر جەلەساتی مەجلیسی مەبعوسـان تەمدیـد کـرا." (ژیـان، ژ 18، 27 ی مایسی 926)

"هەواڵی بەغداد

"ڕەئیسی تازەی مەجلیسی مەبعوسان

"لە پاش قبوڵی ئیستیعفای ڕەئیسی پێشو فەخامەتی ڕەشید عالی بەگ بە ئەکسـەریەتی ئـارا وەزیـری داخلیە مەعالی حیکمەت بەگ سلێمان بۆ ریاسەتی مەجلیسـی مەبعوسـان قبـوڵ و ئینتیخـاب کـرا. ئیشـوکاری وەزارەتی داخلیە بە وەکالەت موەقەتەن ڕەئیسەل وزەرا فەخامـەتی عەبدولموحسـین بـەگ ئـەیبینێ." (ژیـان، ژ 19، 3 ی حوزەیرانی 926)

دوەمین ئیجتیماعی ئیعتیادی

"میزانیەی عومومی

هەمو وەزارەتەکان خەریکی ئیحزار کردنی میزانیەی عومومی تازەن. لـە بـەر ئەمـەی لـە ئـەوەل مـانگی ئیجتیماع دا تەقدیمی پارلەمان ئەکرێ موحتەمەلە لە ئەواخیری مانگی جاری دا فسولی میزانیەکە تەواو بکرێ." (ژیان، ژ 39، 28 ی تشرینی ئەوەلی 926)

"گوشادی دەورەی دوەمی مەجلیسی میلی

"ئیرادەی مەلەکی صادر بوە بۆ گوشادی دەورەی دوەمی مەجلیسـی میلـی عیـراق لـە ئـەوەلی تشـرینی سانیدا." (ژیان، ژ 41، 11 ی تشرینی سانی 926)

لە داڕشتنی ئەم هەواڵەدا دو هەڵـەی تـێدا کـراوە: یەکـەم، لـە بـاتی (دەورەی دوەمـی مـەجلیس) ئـەبو بینوسیایە (ئیجتیماعی دوەمی مەجلیس) چونکە وشەی دەورە بۆ کۆبونەوە بە کار نەهێنراوە، بەڵکو بۆ هـەمو ماوەی مەجلیس بوە، کە ئەبو 4 ساڵ بێ. دوەم، مەجلیسەکە ناوی (مەجلیسـی نـواب) یـان وەکـو ژیـان پـێی وتوە (مەجلیسی مەبعوسان) بوە نەک (مەجلیسی میلی).

"ڕەئیسی تازەی مەجلیسی مەبعوسان

"بینا لە سەر ئینحیلالی ریاسەتی مەجلیسی مەبعوسان بە ئەکسەریەتی ئارا فەخامـەتی عەبدولموحسـین بەگ سەعدون بە ڕەئیسی مەجلیس هەڵبژێرراوە. لـە ڕێی ئامـالی میلـەت دا موەفەقیـەت و عـەرزی تـەبریکات ئەکەین." (ژیان، ژ 46، 16 ی کانونیئەوەلی 926)

دوەمین کۆبونەوەی ئاسایی کە لە 1 ی تشرینی دوەمی 926 دا دەستی پێ کرد و تا 30 ی نیسـانی 927 درێژەی هەبوە 54 جەلسە بوە.

لە بەر ئەوەی ئەنجومەن بەرنامەی کارەکانی تەواو نەبوە ژیان هەواڵی داوە:

"هەواڵی بەغداد

"دەنگ وا بڵاوە کە مەجلیسی مەبعوسان لە پاش تەواو بـونی ئـەم دەورەیـەی، کـە لـە ئـەواخیری ئـەم مانگەدا دوایی دێت، بۆ باس کردن لە بەعزێ ئوموراتی موهیمەی حکومـەت کـە پێیـان ئەسـپێررێ، بـۆ گـرد بونەوەیەکی فەوقەلعادە قەرار بدەن." (ژیان، ژ 61، 14 ی نیسانی 927)

"هەواڵی بەغدا

"لە غەزەتەکانیەوە

"لە پاش تەواو بونی مودەی ئیجتیماعی مەجلیسی مەبعوسان بۆ تەصدیق و ئیبرامی میزانیەی ساڵی تازە و بەعزێ لەوائیحی قانونیەی تر حکومەت بۆ گردبونەوەیەکی فەوقەلعادە مەجلیس دەعوەت ئەکات." (ژیان، ژ 64، 5 ی مایسی 927)

کۆبونەوەی نائاسایی کە 3 ی ئایار تا 8 ی حوزەیرانی 927 ی خایاند 24 جەلسە بو.

"ئیرادە

"ئیرادەی مەلەکی صادر بوە کە لە 1 ی تشرینی سانی دا مەجلیسی مەبعوسان ئیجتیماع و دەست بکات بە ئیش." ژیان، ژ 88، 1ی تشرینی سانی 927)

لە ژ 89 دا چەند هەواڵێکی مەجلیس و وەزارەتی بە جیا جیا و بە دوای یەکدا بڵاو کردۆتەوە کە هەمویان پێوەندییان بە یەکەوە هەیە. ئەیتوانی و ئەبو تێکەڵاویان بکا و بیان کا بە یەک یا دو هەواڵ. هەواڵێکیان دەربارەی ئیفتیتاحی مەجلیس و هەڵبژاردنی رەئیسەکانی و تەئجیل کردنی و، ئەوی تریان دەربارەی ئیستیقالەی وەزارەت بوایە. بەمە یش ئەیتوانی لە بە کارهێنانی وشە و داگیر کردنی جێگای ناو رۆژنامەکەدا پاشەکەوت بکا و، باشتر سەرنجی خوێندەوار بۆ هەواڵەکە رابکێشێ.

"هەواڵی داخلی

"رەسمی ئیفتیتاحی مەجلیسی مەبعوسان و ئەعیان

"رۆژی 1 ی تشرینی دوەم رەسمی ئیفتیتاحی مەجلیسی مەبعوسان و ئەعیان ئیجرا کراوە و دەستیان کردوە بە ئیش." (ژیان، ژ 89، 8 ی تشرینی سانی 927)

"ئیجتیماعی مەجلیسی مەبعوسان و ئەعیان

"لە 1 ی مانگا مەجلیسی مەبعوسان و ئەعیان ئیجتیماعیان کردوە لە نەتیجەی ئینتیخاباتا بە ئەکسەریەت فەخامەتی عەبدولموحسین بەگ ئەلسەعدون ئینتیخاب فەرموراوە بە رەئیسی مەجلیسی مەبعوسان و لە نەتیجەی ئینتیخاباتی مەجلیسی ئەعیانا یوسف ئەفەندی سویدی ئینتیخاب فەرموراوە بە رەئیسی مەجلیسی ئەعیان." (ژیان، ژ 89، 8 ی تشرینی سانی 927)

"تەئجیلی مەجلیسی مەبعوسان و ئەعیان

"لە سەر ئیرادەی مەلەکیە مەجلیسی مەبعوسان و ئەعیان چل و پێنج رۆژ تەئجیل کراوە." (ژیان، ژ 89، 8 ی تشرینی سانی 927)

### 1. 4. هەڵوەشاندنەوەی مەجلیس

**"ئیستیعفای یاسین پاشا ئەلهاشمی**

"وەکیلی رەئیسەل وزەرا و وەزیری خاریجیە مەعالی یاسین پاشا لە وەکالەتی هەردولا ئیستیعفای کردوە و ئیستیعفاکەی قبوڵ کراوە و هەتا عەودەتی فەخامەتی جەعفەر پاشا ئەم وەکالەتە با ئیرادە تەودیعی مەعالی رەشید عالی بەگ ئەلگەیلانی فەرموراوە." (ژیان، ژ 89، 8 ی تشرینی سانی 927)

جەعفەر عەسکەری ئیستیقالەی کرد. مەلیک جارێکی کە سەعدونی تەکلیف کرد وەزارەت تەشکیل بکا. سەعدون بۆ ئەوەی ئەم تەکلیفە قبوڵ بکا مەرجە کۆنەکەی خۆی، لەمەڕ هەڵوەشانەوەی مەجلیس دانایەوە.

مەلیک ئەم جارە قبوڵی کرد. سەعدون (سێیەمین وەزارەتی خۆی) لە 14 ی کانونی سانی 928 دا پێک هێنا. ژیان هەواڵەکەی داوە:

"سقوت و تەشکیلی قابینە

"لـە بـەر ئـەوەی فەخامـەتی رەئیسـەل وزەرا جەعفـەر پاشـا لـە ریاسـەتی قابینـە ئیسـتیعفای کـرد و ئیستیعفاکەیشی لە تەرەف جەلالەتی مەلیکەوە قبوڵ فەرمورا، ئیرادەی ملوکانە صـادر بـو کـە فەخامـەتی سـێر عەبدولموحسین بەگ ئەلسەعدون رەئیسەل وزەرایـەتی دەرعوهـدە و قابینـە تەشـکیل بفـەرموێت. لـە تـەرەف فەخامەتیەوە قابینە لەم زاتانە کە لە خوارەوە ئیسمیان دەرج کـراوە تەشـکیل و کورسـی وەزارەتیـان ئیشـغال فەرموە:

"رەئیسەل وزەرا و وەزیری خاریجیە و وەکیلی وەزیری دیفاع سـێر عەبدولموحسـین بـەگ ئەلسەعدون

| | |
|---|---|
| وەزیری داخلیە | عەبدولعەزیز بەگ ئەلقەساب |
| وەزیری عەدلیە | حیکمەت سلێمان بەگ |
| وەزیری مالیە | یوسف غنیمە |
| وەزیری مەعاریف | تۆفیق بەگ ئەلسویدی |
| وەزیری زەراعەت و رەی | سلێمان ئەلبەراک |
| وەزیری ئەشغال | عەبدولموحسین ئەلشەلال |
| وەزیری ئەوقاف | ئەلشێخ ئەحمەد داود |

(ژیان، ژ 98، 17 ی کانونی سانی 1928).

ئەگەرچی هێشتا مەجلیس ماوەی قانونی خۆی تەواو نەکرد بو، لە کاتێک دا ئەمـە یەکـەمین مەجلیسـی نیابی، واتە یەکەمین دەسەڵاتی دانانی قانون و لێپێچانەوەی وەزارەت بو لە عیراق دا. لە سەر داوای سـەعدون، سەرۆکی دەسەڵاتی جێبەجێ کردن، ئیرادەی مەلەکی بۆ هەڵوەشاندنەوەی ئەم و هەڵبژاردنی مەجلیسـێکی نـوێ دەرچو. ئەمە بو بە پێشینەیەکی خراپ لە ژیانی پارلەمانیی عیراقیدا. دەسەڵاتی قـانون دانـان (مـەجلیس) لـە بـەردەم دەسـەڵاتی جێبـەجێکردن (وەزارەت) دا لاواز بـو. مـەجلیس ئەگـەر ویسـتەکانی وەزارەتـی جێبـەجێ نەکردایە هەمیشە ترسی هەڵوەشاندنەوەی هەبو.

وەزارەتی ناوخۆ هەواڵی هەڵوەشاندنەوەی مەجلیسی بەمجۆرە دابەش کرد:

"فەسخی مەجلیس

"سورەتی موتەرجەمەی تـەلغرافی ژمـارە 1067 و رۆژی 19 ی 1 ی 28 ی وەزارەتـی داخلیـە: "بـۆ موتەسەڕیفی سلێمانی

"لە بەر ئەوەی کە ئەساسی مەشروتیەت ئیجاب بە موازەنەتێکی قەوی ئەکات لە بەینی قیـوای ئیجرائیـە و قیوای تەشریعیەدا و، ئەم موازەنەتەیش مەنوتە بە مەوجودیەتی شوعباتی پارلەمێنتۆ کە سـاحیبی مەقاسـیدی موعەیەنە و غایەی مەعلومە بن، وە لە بەر ئەوەی کە ئەوزاع ئیسپاتی کردوە مەجلیسـی ئوممـەت لـە وەزعیـەتی حازریدا ئەو فیرقانەی تیا نیە تەئمینی مەوجودیەتی ئەم موازەنەتە بکا و لە بەر ئـەوەی حکومـەت مەسـائیلی زۆر موهیمی بـە دەسـتەوەیە کـە مـەنافیعی ئەهـەمی میلـەتی تیایـە، وەکـو: موعاهـەدەی ئینگلیـز و عیـراق و، ئیتیفاقنامەی مالی و عەسکەری و، مەسئەلەی دیفاعی وەتەنی، کە ئیجاب ئـەکات لـە هـەمویان میلـەت خەبـەردار

بکرێت کە حسیاتی خۆیان نیشان بدەن و فرسەتیان بدرێتێ کە لەم خسوساتەوە بە واسیتەی مومەسیلیانەوە خواهیشی خۆیان بکەن، بۆ فەسخی مەجلیسی ئوممەت و موباشەرەت بە ئینتیخابات بۆ مەجلیسی تازە، موافیقی مادەی 26 ی قانونی ئەساسی، ئیرادەی مەلەکی صادر بو. ئەمرۆ مەجلیس فەسخ بوەوە. بۆ مەعلومات بۆ ئەوەی فەورەن موافیقی قانون دەست بە ئینتیخابات بکرێ نێررا." (ژیان، ژ 99، 24 ی کانونی سانی 928)

## 2. هەواڵەکانی

ژیان پەیامنێرێکی تایبەتی نەبوە تا هەواڵی گفتوگۆکانی ناو مەجلیس و ئەنجومەنی وەزیرانی و ململانێی تاقم و دەستە جیاوازەکانی بۆ بنوسێ. وەکو بە رۆژنامەکەدا دەرئەکەوێ، سەرچاوەی وەرگرتنی هەواڵەکانی: یەکەم، موتەسەرِیفیەتی سلێمانی و دوەم، رۆژنامەکانی بەغداد بوە.

لە مەجلیسی نوابدا بابەتی جۆراوجۆر باس کراوە. گەلێ جار کێشە و مشتومڕ و دەمەقاڵێ لە نێوان نائیبەکاندا قەوماوە. بابەتی زۆری سیاسی بە تایبەتی دەربارەی پێوەندی عیراقی و بریتانی و پەیمانەکانی نێوان هەردولا باس کراوە. رۆژنامە عەرەبیەکانی بەغداد زۆر جار گفتوگۆکانی ناو مەجلیسیان گێڕاوەتەوە. بە چاک یان بە خراپ لە سەریان نوسیوە، پشتیوانییان لێ کردوە یا لە دژی وەستاون. بەڵام ژیان خۆی لە گێڕانەوەی ئەو مشتومڕانە بواردوە و دور و نزیک توخنیان نەکەوتوە. بە تایبەتی چونکە نائیبە کوردەکان کەم وا بوە لە گفتوگۆیەکدا هەڵیان دابێتی و، بیروبۆچونی تایبەتی خۆیان لە بەردەم مەجلیسدا دەربڕی بێ. لە کاتی دەنگ داندا یان خۆیان دزیوەتەوە یان بە قازانجی بریتانیا دەنگیان داوە. ئەوەتا ژیان لە وتارێکیدا تیری توانج لە مەبعوسەکانی کورد ئەگرێ و رو بە داود حەیدەری، یەکێ لە مەبعوسەکانی کورد، ئەڵێ: "ئەگەر لە مەجلیس دا مەقسەد لە موعارەزە و موناقەشە، جەلبی زەرەر و روخاندنی ئەساساتی میلیەی خۆمان بێ، وەکو مەبعوسەکانی ئێمە ئیختیاری سکوت و ئیعلانی بێ تەرەفی کردن، بە لامەوە گەلێ چاکتر و موسیبترە."

هەواڵەکانی ژیان دەربارەی گفتوگۆکانی ناو مەجلیس و بڕیارەکانی و چالاکی ئەندامەکانی بڵاوی کردونەتەوە، جگە لە هەندێ بابەتی کە پێوەندییان بە کاروباری کوردەوە هەبوە، ئەوانی تر بابەتی ئەوەندە گرنگ نەبون جێگەی بایەخ پێ دانی خوێندەواری کورد بن. لەوانە:

### 2. 1. هەواڵی مەجلیس

جگە لە هەواڵی ئینتیخاب، گوشادی مەجلیس، ئیجتیماع، تەعتیل و تەئجیل، فەسخ و حەلی مەجلیس، هەندێ لە دەنگوباسەکانی ناو مەجلیسی بڵاوکردۆتەوە، وەکو:

"موزاکەراتی مەجلیسی نیابی

"بۆ مەحوکردنەوەی تۆوی کوللە و ئیتیخازی تەدابیری لازمە لە پێش حلولی وەختی ژیانەوەیدا لە تەرەف مەبعوسەکانی موصلەوە موتەفیقەن تەقریرێک تەقدیمی مەجلیس و موزاکەرەی لە سەر کراوە." (ژیان، ژ 47، 23 ی کانونی ئەوەلی 926)

"موقەرەراتی مەجلیسی مەبعوسان

"لە پاش موناقەشە و رێکخستنی لایحەی فەرشکردنی جادەکانی بەغدا موافەقەتی لە سەر نوێنراوە." (ژیان، ژ 48، 30 ی کانونی ئەوەلی 926)

"وەزارەتی زەراعەت لە مەجلیسی مەبعوسان دا

"ئەو لائیحە قانونیەیە کە بۆ دامەزراندنی وەزارەتی زەراعەت بە مەجلیسی مەبعوسان درا بو قبوڵ کرا. مودیریەتی زەراعەت و، ئەملاکی ئەمیریە و، بەیتەرە، خراونەتە ژێر تابیعیەتی ئەم وەزارەتەوە." (ژیان، ژ 61، 14 ی نیسانی 927)

"میزانیەی ساڵی 928

"بەغداد، مەجلیسی مەبعوسان میزانیەی ساڵی 928 ی تەسدیق کردوە کە واریداتەکەی عیبارەت بـو لـە 70.681.070 و مەساریفاتەکەیشی 69.780.644 روپیە و لەمـەدا واریـدات و مەسـاریفاتی شـەمەنەفەری عیراق و ئیدارەی ئەسکەلەکانی تیادایە." (ژیان، ژ 131، 4 ی تشرینی ئەوەلی 1928)

## 2. 2. سەردانەوەی مەبعوسەکان لە سلێمانی

پێوەندی بەردەوامی نێوان هەڵبژێرەر و هەڵبژێرراو شتێکی زۆر گرنگە بۆ ئەوەی هەڵبژێرراو هەمیشـە ئاگـای لـە هـەمو لایەنـەکانی هەلومـەرجی ژیـانی سیاسـی، ئـابوری، کۆمەڵایـەتی، ڕۆشـنبیری، پـەروەردەیی.. دانیشتوانی ناوچەی هەڵبژاردنەکەی بێ و، بەردەوام لە گفتوگۆ و دانوسەندن دا بێ لـە گـەڵ یـان، بـۆ ئـەوەی هەمیشە جێگەی باوەڕ و متمانەی هەڵبژێرەرەکانی بێ.

مەبعوسەکانی سلێمانی:

میرزا فەرەجی حاجی شەریف، یەکێ لە دەوڵەمەنەکانی سلێمانی بوە. بەڵام کار و کاسـبی و سـەرمایەی لە بەغدا و، خۆیشی نیشتەجێی هەمیشەیی بەغداد بوە.

ئەمین زەکی بەگ ماوەیەکی زۆر ئەفسەر بوە لە ئۆردوی عوسمانیدا و، دوای گەڕانەوەی بۆ عیـراق لـە بەغداد نیشتەجێ بوە، جاروبار بۆ ئیشوکار هاتۆتەوە بۆ سلێمانی.

لە ناو ئەوانەدا تەنیا محەمەد ساڵح بەگ ماڵی لە سلێمانی بوە و، لە پشـوەکانی مـەجلیسدا گەڕاوەتـەوە سلێمانی، هەمو جار ژیان بە خێر هاتنەوەی کردوە.

"هاتنەوە

"بە موناسەبەتی تەواو بون و تەعتیلی جەلەساتی مەجلیسی مەبعوسان هەفتـەی رابـوردو لـە بەغـدادەوە مەبعوسی موحتەرەم محەمەد ساڵح بەگ تەشریفی هێناوەتەوە سلێمانی. بـە نـاوی عومـەوە عـەرزی بـە خێـر هاتنی ئەم نائیبە بە هیمەتەمان ئەکەین." (ژیان، ژ 23، 8 ی تەموزی 926)

"ڕۆیشتن

"مەبعوسی موحتەرەم جەنابی محەمەد ساڵح بەگ بـە موناسـەبەتی گوشـادی مەجلیسـی مەبعوسـان بـە قافلەی ئۆتۆمۆبێلی رابوردو تەشریفی بۆ بەغداد ڕۆیشتوە. تەمەنای موەفەقیەت و خوا حافیزی ئەکەین."(ژیان، ژ 40، 4 ی تشرینی سانی 926)

"هاتنەوە

"مەبعوسی موحتەرەم جەنابی محەمەد ساڵح بەگ بە موناسەبەتی تەواو بونی دەورەی مەجلیسـی میلـی تەشریفیان هێناوەتەوە. بە خێر بێنەوە." (ژیان، ژ 70، 21 ی حوزەیرانی 927)

هەواڵی دوەم دو سەرنج هەڵئەگرێ:

یەکەمیان، لە ناو مەبعوسەکانی سلێمانیدا، تەنیا محەمەد ساڵح بـەگ مـاڵی لـە سـلێمانی بـوە، بۆیـە لـە ژیاندا بە زۆری هەواڵی (هاتن و ڕۆیشتن) ی ئەو لە پشوەکانی ئەنجومەندا نوسراوە.

دوەمیان، بە هۆی شۆڕشی شـێخ مـەحمودەوە ڕێگاوبانـەکان نائـەمین بـون، لـە بـەر ئـەوە بـە (قافلـە) هاتوچۆیان کردوە.

### 2. 3. زمانی هەواڵەکان

ژیان لە گێرانەوەی هەواڵەکانی مەجلیسەکانی عیراقدا دەقاودەق هەمان وشەگەلی قانونەکانی عیراقی لە باتی وشەی کوردی بە کار هێناوە وەکو:

ئینتیخاب: هەڵبژاردن.

ئیرادەی مەلەکی: ویستی شاهانە.

ئیستیعفا: وازهێنان.

ئیستیدعا: بانگ کردن.

ئیجتیماع: کۆبونەوە.

تەصدیق: پەسند کردن.

تەصویت: دەنگدان.

تەرشیح: پاڵاوتن.

تەمسیل: نواندن.

تەودیع: پێ سپاردن.

تەعتیل: راگرتن.

تەئجیل: دواخستن.

تەشکیل: پێکهێنان.

جەلەسە، جەلەسات: دانیشتن.

حەل: هەڵوەشاندنەوە.

دەورەی ئینتیخابی: خولی هەڵبژارن.

دەفتەری تەسجیل: دەفتەری تۆمارکردن.

رەئیس: سەرۆک.

ریاسەت: سەرۆکایەتی.

سقوت: کەوتن، روخان.

عزو، ئەعزا، ئەعزایەتی: ئەندام، ئەندامان، ئەندامەتی.

عەین، ئەعیان: پیر، پیران، لە باتی سیناتۆر.

فەسخ: هەڵوەشاندنەوە.

فیرقە: حیزب، پارتی.

قەرار، قەرارات: بڕیار.

قوای ئیجرائیە: دەسەڵاتی جێبەجێ کردن.

قوای تەشریعیە: دەسەڵاتی قانون دانان.

لایحە: پرۆژە، گەڵاڵە.

مەجلیسی مەبعوسان، مەجلیسی نواب، مەجلیسی نیابی، مەجلیسی ئوممەت، مەجلیسی میللی: لە باتی ئەنجومەنی گەل.

مەنتیقەی ئینتیخاب: ناوچەی هەڵبژاردن.

مەبعوس. مەندوب.

مومەسیل: نوێنەر.
موزاکەرە، موزاکەرات، موناقەشە: گفتوگۆ، وتووێژ.
مونەتەخیب، مونەتەخیبی ئەوەل، مونەتەخیبی سانی: هەڵبژێرەر، هەڵبژێرەری یەکەم، هەڵبژێرەری دوەم.
مەشروتیەت: دەستوری.
موقەڕەڕات: بڕیار.
مەزبەتە: مەزبەتە.
معامەلەی تەحلیفیە: سوێنددان.
نائیب: نوێنەر.
نەتیجەی ئینتیخاب: ئەنجامی هەڵبژاردن.
نەزارەت: چاودێری.
نوتقی ئیفتیتاحی: وتاری کردنەوەی ئەنجومەن.
وەکیل: نوێنەر.
هەیئەتی تەفتیشیە: دەستەی پشکنین. هەیئەتی موختاریە.

هەندێ وشەی فارسی، وەکو:
نامزەد: پاڵاوتن.
گوشاد: کردنەوە.
هەندێ وشەی ئەوروپایی بە تورکی کراوی وەکو:
قابینە. پارلەمێنتۆ. پارتی. پرۆغرام.

## 3. بابەتی پێوەندیدار بە کاروباری کوردەوە

### 3. 1. ئیمزا کردنی پەیماننامەی عیراقی- بریتانی

"تەسدیقی موعاهەدەی تازە

"بینا لە تەلغرافێکی رەسمی کە بە تەلغرافی بێتەل بۆ جەنابی موتەسەڕیف هاتوە مەجلیسی مەبعوسان موعاهەدەی تازەی بریتانیا و عیراقی بۆ 25 ساڵ قبوڵ کردوە." (ژیان، ژ 1، 21 ی کانونی سانی 926)

ژیان لە ژ 4 ی‌دا دەقی پەیماننامەکەی بڵاو کردۆتەوە. تەسدیق کردن و تەعدیل کردنی مادەکانی پەیماننامەی عیراقی- بریتانی، بوبو بە یەکێ لە کێشە سەرەکیەکانی هەمو وەزارەت و مەجلیسەکان و، بەردەوام ئەم کێشەیە هەڵی ئەدایەوە.

ئەم پەیمانە کە پێوەندی هەمەلایەنەی نێوان عیراق و بریتانیای رێک ئەخست و، هەرچەند ساڵێ جارێ (تەعدیل) ی تێ‌دا ئەکرا، ئەبو باسی دابینکردنی پاشەرۆژی سیاسی کوردیشی تێ‌دا بێ. مەبعوسەکانی کورد، ئەگەرچی دەنگیان بۆ پەسندکردنی داوە، بەڵام لە بارەی ناو نە هێنانی مافی کوردەوە بێ دەنگ بون. هەر ئەم مەسەلەیەش بو کە لە کاتی هەڵبژاردنەکانی دەورەی سێیەمی ئینتیخابی مەجلیس‌دا لە 6 ی ئەیلولی 1930 دا لە سلێمانی تەقیەوە و، بو بە هۆی روداوەکانی شەشی رەشی ئەیلول.

### 3. 2. ئیمزاکردنی پەیماننامەی تورکی– بریتانی– عیراقی

یەکێکی تر لە کارەکانی مەجلیس، تەسدیقی رێکەوتننامەی تورکی– بریتانی – عیراقی بـوە "سـورەتی موتەرجەمەی تەلغرافی بێتەل ژمارە 8058 و رۆژی 14 ی حوزەیرانی 1926 ی وەزارەتی جەلیلـەی داخلیـە بۆ موتەسەڕیفی لیوای سلێمانی:

"مەجلیسی مەبعوسان ئەم بەیانیە موعاهەدەی تورکی تەسدیق کرد، نوقاتی ئەساسیە عیبارەتە لـەوە کـە حکومەتی تورکیا ئیعتیرافی بە ئیستیقلالیەتی عیراق کرد و، ولایەتی موسڵ کە موافیقی خەتی برۆکسل تـەعین کراوە بە جوزئێکی موتەمیمی عیراقی ناسیوە. نوسخەی موعاهەدەکە بە پۆستەدا نێرراوە. ئەم نوقتە مەسـعودە کە لەمەدا تەئسیسی موناسەباتی دۆستانە لە گەڵ حکومەتێکی دراوسێمانا کراوە و کە بە واسـیتەی ئـەوەوە تاجی زەفەر لە سەر جەهد و تەشەبوساتی ئێمە دانراوە، لازمە حەفلەی بۆ ئیجرا بکرێـت." (ژیـان، ژ 21، 17 ی حوزەیرانی 926)

لە ژ 22 و 23 دا تێکستی رێکەوتننامەکەی بڵاو کردۆتەوە.

زۆری مادەکانی ئەم رێککەوتنە پێوەندیـیان بە سەرکوتکردنی بزوتنەوەی نەتەوەیی کوردەوە هەبوە لە هەردو دیوی سنوردا. مەبعوسەکانی کورد لە مەجلیسدا، نەک هیچ قسەیەکیان لە سەر نەکردوە، بەڵکو هەمویان دەنگیان بۆ پەسند کردنی داوە. ئەگەرچی ژیان هـیچ لێـدوانێکی تایبـەتی خـۆی نەنوسـیوە، بـەڵام وتـارێکی تەرجومە کراوی بڵاو کردۆتەوە مەبەستی راستەقینەی رێککەوتنەکەی رون کردۆتەوە.

### 3. 3. خوێندن بە زمانی کوردی

داود حەیدەری لە کاتی گفتوگۆکانی ناو مەجلیسدا، دژی کردنی خوێندن بە زمانی کوردی لە لیواکـانی سەروی عیراقدا دواوە، م. ا (محەمەد ئەدیب) لە ژێر سـەردێڕی (بـۆ مەبعوسـێکی حـەق لـە ژێـر پـێ نـەر) دا بەرپەرچی داوەتەوە و، داکۆکی کردوە لە مافی فێرکردن بە زمانی کوردی و نوسیوێتی:

"لە ژمارە 2149 ی غەزەتەی العراق دا دیمان کە مەجلیسی نیابی لە ئەسـنای موزاکـەرە و موناقەشـەی میزانیەی مەعاریف دا نوابی موحتەرەمەی کەرکوک و ئەربیل، جەنابان: نەشئەت ئیبراهیم و یوسـف ئیبـراهیم و ئیسماعیل بەگی رەواندزی، ناتەواوی مەعاریفی ئەلویەی شیمالیە و عەدەم عینایەتی حکومەتیان تەنقیـد و، لـە ئەلویەی مەزکوردا بە کوردی تەعمیمی تەدریساتیان داوا کردوە، لە گەڵ ئەمانەیش دا کردنـەوەی مەکتـەبێکی سانەوی لە ئەربیل و ئیکمالی سانەوی کەرکوکیان تەلەب و بەیان کردوە و، جەنابی ئەمین زەکی بەگ تەئیـدی فەرموە.

"موقابیل بەم ئیدیعا حەقانە یەکێ لە رەفیقەکانیان جەنابی داود حەیدەری بەگ، کە ئەویش بۆ تـەئمینی مەنافیع و مەقاسیدی مەشروعەی میلەت رەوانەکراوی ئەربیلە وتویەتی: (لە ئیدیعای لزومی تەدریسات بە زبـانی کوردی موخالیفی رەفیقەکانمم و، لە سەر موسامەحە کردنی تەدریسات بە زبانی کـوردی، مـەعاریف بـە هـەمو هێزی خۆم تەنقید ئەکەم. لە ئەلویەی سەرودا مەعاریف زۆر ناتەواوە، قوتابیەکانی ئەو ناوە نـە بـە کـوردی و عەرەبی و نە بە تورکی ئەتوانن قسە بکەن) لە بـەر ئەمـەی ئـەم قسـانە لـە زبـانی مەبعوسـێکی کـوردەوە لـە مەجلیسی میلەت دا بەیان کراوە و بۆ عالەمی کوردایەتی تەجاوزێکە، مـەجبور بـوین کـە بڵێـین ئـەم بەیاناتـە لیسان حالی هیچ فەردێکی میلەت نیە، ئیلا جەنابی مەبعوس خۆی نەبێ.

"ئەوەڵەن، سەرفی نەزەر لەمەی کە کوردی حەقی مەشروع و لیسانی میللیمانە و، لە نەتیجەی فەلاکـەت و مسیبەتی گەورە گەورەدا نائیلی بوین و، بە قەراری لایەتەزەلزەلی جەمعیەتێکی وەکو عیسـبەتول ئومـەم پێمـان بەخشراوە، ئەمڕۆ هەمو میلەتێ موقەدیمەی خوێندن و تەحسیلیان بە لیسانی مادەرزادی خۆیـان دائەمـەزرێنن.

حەتا بۆ تەئمینی ئەم مەقسەدە حکومەتی مەتبوعەی عادلەی عیراقیش لـە کـەرکوک دا بـە تـورکی موسـاعەدەی تەدریساتی لوتف کردوە، زیرا لە لایەنی هەمو ئەسحابی عەقلی سەلیم و شارەزایانی ئوسـولی فـەنی تـەعلیم و تـەدریس موسـەدەقە، کـە تەحسـیلی ئیبتیـدائی بـە لیسـانی میللـی ئـەو تەلەبانـە بکـرێ چـاکتر و شـایانی ئیستیفادەترە، لەمەی کە بە زبانی بێگانە بکرێ.

"سانیەن، لە ئەلویەی شیمالیەدا، لە سەر بە کوردی تەدریسات، موجیبی تەنقید مـەعاریف نیـە، لـە پـێش هـەمو شـتێک دا دانیشـتوانی ئەلویـەی شـیمالیە بـە ئەکسـەریەت کـوردە و، ئەمـەیش لـە دوای تـەدقیقات و وردبونەوەیەکی ئاشکرایی‌دا غەیر قابیلی ئینکار سابیت بوە، لە بەر ئەمە شایانی تەنقید مەعاریف نیە بە کورد خولقاو بونمانە و، ئەو کەسەیە کە ئەم حەقەی پێ بەخشین.

"سالیسەن، قوتابیەکانمان زۆر چاک ئەتوانن بە کوردی قسە بکەن. ئەگەر نەیکەن ئەبێ چۆن کوردێک بن؟ وە لە بەر ئەمەی یەکێ لە مەوادی پرۆغرامی تەدریسـات زبـانی عەرەبیـە هـیچ شـوبهەی نیـە عـەرەبی‌یش ئەزانن. بینائەن عەلەیهی جەنابی داود حەیدەری بـەگ هـەروەکو موخـالیفی ڕەفیقـەکانی بـو، بەیانەتەکەیشـی خیلافی حەقیقەت و واقیع بو.

"جدەن جای تەئەسوفە مەبعوسێک کە بۆ تەئمین و ئامال و مەقاسیدی کۆمەڵێک ڕەوانە کرابـێ و لـەو مەوقیعەدا حەقی تەکەلومی بە سایەی ئەوانەوە دەست کەوتبێ، کەچی بیلعەکس زەربە لە بناغەی ئەمـەلی میلـەت بدا و بیەوێ بیروخێنێ و، لە حەقێک کە بە هەزار کوێرەوەری و فەلاکەت دەستڕەسی بوین، مەحرومان بکات. ئەگەر لە مەجلیس دا مەقسەد لە موعارەزە و موناقەشە، جەلبی زەرەر و ڕوخانـدنی ئەساسـاتی میلیـەی خۆمـان بێ، وەکو مەبعوسەکانی ئێمە ئیختیـاری سـکوت و ئیعلانـی بـێ تـەرەفی کـردن، بـە لامـەوە گـەلێ چـاکتر و موسیبترە." (ژیان، ژ 68. 31 ی مایسی 1927).

لە ژمارەی دواتری‌دا دیسان ژیان هاتۆتەوە سەر باسی ئەم مەسەلەیە و نوسیوێتی: "دائیر بە قسـەکانی داود حەیدەری بەگ

"موقابیل بە قسـەکانی مەبعوسـی هـەولێر جـەنابی داود حەیـدەری بـەگ کـە لـە مەجلیسـی نـواب لـە موناقەشەی میزانیەی مەعاریف دا لە عەلەیهی تەعلیمی کوردی دەرمیانی کرد بو ژیان وەزیفەی مەودوعەی خۆی بە جێ هێنا. لە گەڵ ئەمەیش دا سورەتی تەلغرافێ کە بە ئیمزای چەند زاتێک لە ڕەواندزەوە بۆمان هـاتوە و لە ئەساس دا یەکسەر بۆ موما ئیلەیهی داود حەیدەری بەگ لێ دراوە، لە پاش خستنە سـەر کـوردی تـەلغرافی مەزکور بە کەمالی ئیفتیخارەوە دەرج و نەشر ئەکەین:

"لە مەجلیسی نواب دا بۆ داود حەیدەری

"لە ئەسنای موزاکەرەی میزانیەی مەعاریف دا لە عەلەیهی تەعلیمی کـوردی موناقەشـەکەتان لـە غەزەتـەدا خوێندرایەوە، حیرەتمان کرد، ئێوە کە ئاگاداری ئیحتیاجاتی مەملەکەت و ئارەزوی میلەت نین، ڕجا ئەکەین بەم نەوعە جەسارەت مەنوێنن.

ڕەئیسی بەلەدیە، محەمەد عەلی. ڕەئیسی دەرگەلە، محەمەد ئەمین. ڕەئیسی باڵەک، شێخ محەمەد. ئەعزای ئیدارە، مستەفا محەمەد ساڵح ئەفەندی. ڕەئیسی زراری، ئەسعەد." (ژیان، ژ 69. 7 ی حوزەیرانی 1927)

داود حەیدەری کوڕی ئیبراهیم حەیدەری بوە، لە ئەستەموڵ حقوقی خوێند بو، لە وەزارەتەکـەی تۆفیـق سویدی دا (1929) بو بە وەزیری داد.

**3. 4. تەجنیدی ئیجباری**

دوای تەواوبونی جەنگ، گەلی بریتانی داوای گێڕانەوەی کوڕەکانی و داوای کەمکردنەوەی باری گرانی باجی سەردەمی جەنگی ئەکرد. مەسرەفی هێزەکانی بریتانیا لە عیراق دا کە لە پارەی باجدەری بریتانی ئەدرا، بەمجۆرە بو:

| | |
|---|---|
| 1920 –1921 | 32.000.000 لیرەی ئیستەرلینی |
| 1921 –1922 | 23.355.950 لیرەی ئیستەرلینی |
| 1922 –1923 | 7.807.384 لیرەی ئیستەرلینی |
| 1923 –1924 | 5.740.358 لیرەی ئیستەرلینی |
| 1924 –1925 | 4.479.754 لیرەی ئیستەرلینی |
| 1925 –1926 | 4.118.400 لیرەی ئیستەرلینی |

بڕوانە: (عبدالله فهد النفیسي: دور الشیعة في تطور العراق السیاسي الحدیث، دار النهار للنشر، بیـروت، 1973. ص 172)

یەکێ لەو مەسەلانەی لە کۆنفرەنسی قاهیرەدا باس کرا، کەمکردنەوەی خەرجی بریتانیـا بـو لـە عیـراق. بـۆ ئەوەی خەرجی کەم بکاتەوە ئەبو هێزەکانی کەم بکاتەوە. بۆ ئەوە یش هێزەکانی کەم بکاتەوە، بێ ئەوەی ناوچەکـەی لە دەس دەربچێ، ئەبو هێزێکی خۆجێیی لە باتی‌یان پێک بهێنـێ. لـە کۆنفرەنسـی قـاهیرەدا کـە جەعفـەر عەسـکەری وەزیری جەنگی حکومەتی تازە دامەزراوی عیراق ئامادەی بو، بڕیار درا جەیشی عیراقی دروست بکـرێ بـۆ ئـەوەی جێگەی هێزەکانی بریتانیا بگرێتەوە بۆ پاراستنی عیراق، بە تایبەتی بۆ پاراستنی ئاسایشی ناوخۆی.

نەتەوەپەرستەکانی عەرەب ئەم هەواڵەیان بە خۆشـیەکی بـێ ئەنـدازەوە وەرگـرت و، دوای گەڕانـەوەی جەعفەر عەسکەری لە قاهیرە بۆ بەغداد، کەوتنە دانانی ڕێوشوێنی دامەزراندنی جەیشی عیراقی. ژمارەیـەک لـە ئەفسەرانی دەرچـوی ئاکادیمیـە جەنگیـەکانی تورکیایـان کـۆکردەوە. لـە نـاو ئەوانـەدا چەنـد ئەفسـەرێکی کوردیشیان تێدا بو. یەکەم یەکەی جەنگی‌یان بە ناوی (فـەوجی ئیمـام موسـای کـازم) ەوە دروسـت کـرد و، یەکەم (عەمەلیاتی عەسکەری) یشیان پەلامارىانی سلێمانی بو.

هەر لە سەرەتاوە مشتومڕ، دەربارەی جـۆری دروسـتکردنی جەیشـی عیراقـی، لـە نێـوان دو بۆچـونی جیاوازدا دەستی پێ کرد. بۆچونێکیان کە بیری نەتەوەپەرستەکانی عەرەبی ئەنوانـدەوە داوای دروسـتکردنی جەیشیان ئەکرد لە سەر بنچینەی (تەجنیدی ئیجباری) و، بۆچونێکی تر کە بە زۆری بیری سەرانی خێڵـەکانی ئەنوانـدەوە دژی تەجنیـدی ئیجبـاری و لایـەنگری پێکهێنـانی جـەیش بـون لـە سـەر بنچینـەی (تەتـەوع). کاربەدەستانی بریتانی پشتیوانی‌یان لە بۆچونی دوەم ئەکرد. ئەم کێشـەیە چـوە نـاو مەجلیسـەوە. زۆر جـار پرۆژەی قانونەکەی ئەهێنرایە مەجلیسەوە یان دوا ئەخرا، یـان دەنگـی تـەواوی وەرنەئـەگرت. تـا سـەرەنجام تەجنیدی ئیجباری لە عیراقدا بو بە قانون.

مەبعوسەکانی کورد، هەمیشە دەنگیان بۆ ئەو بۆچونانە داوە کە ئینگلیزی لە پشت بوە، لە بەر ئەوە لەو قۆناغەدا، چ بە دەنگدان لە مەجلیسدا و چ بە نوسین لە رۆژنامەدا، دژی تەجنیدی ئیجباری راوەستاون. (ژیان) یش داکۆکی لە هەمان هەڵوێست کردوە. لە سـەروتارێکیدا بـە ناونیشـانی (تەجنیـدی ئیجبـاری و مەنـدوبی هەولێر) نوسیوێتی:

"لەم چەندانەدا لە رۆژنامەی (بەغـداد تـایمس) دا مەقالەیـەک لـە خسـوس تەجنیـدی ئیجباری‌یـەوە بـە ئیمزای مەبعوسێکی موقتەدیری کورد نوسرا بو خوێندمانەوە و، لە عەینی زەمانا بەعزێ رەدیەی پڕ هەیەجانی غەزەتەی العراق و العالم العربی‌یشمان دی.

"لەبەر ئەوە مەسئەلەی تەجنیدی ئیجباری عادەتـەن قەزیەیـەکی حەیاتیەیـە بـۆ عەناسـیری موتەحیـدەی عیراق وبیلخاسە لەم وەقتەدا کە لەم خسوسەوە لە لەندەن مفاوەزە جەرەیان ئەکات. بە لازممـان زانـی ئێمـەیش لەم جیهەتەوە فکری خۆمان بەیان بکەین. موحەڕیڕی العراق لە ردیەکەی‌دا ئەڵێ مەبعوسێک نـاتوانێ فکرێکـی زاتی خۆی بە غایەیەکی میلی نیشان بدا، فەقەت موحـەریر ئەگـەر نـەختێ زیـاتر مـەعنای کەلیمـەی (نائیـب و مومەسیل) ی لێک بدایەوە، تێ ئەگەیشت کە هەر قسەیەک لە دەمـی مەنـدوبێک بێتـە دەرەوە عەکسـی سـەدای خیتابی 20 هەزار شەخسە کە موقەدەرات و موقەرەراتی حال و ئیستیقبالی خۆیانیان تەسلیم کـردوە. جـدەن شایانی ئیستیغرابە کە مەبعوسێک بتوانێ بە ناوی وەکالەتی میلیەوە لە مەجلیسا رەفز وە یـا تەسـدیقی هـەمو نەوعە قەوانین و نیزاماتێ بکا، فەقەت نەتوانێ فکرێکی خۆی کە خۆلاسەی ئەفکاری عمومیەی موەکیلـەکانێتی، بە غەزەتە نەشری بکا.

"لە حالێکا مەبعوسێک لە مەسئەلەیەکی وا موهیم دا سەلاحیەتداری بەیانی رەئـی میلەتەکـەی نـەبێ، عەجەبا غەزەتەیەک بـۆ نەشـری ئـەفکاری زاتـی خـۆی چ سـەلاحیەتێک ئـەبینێ و، عەکسـی ئـەم فکـری مەندوبەی لە چیەوە دەرک کرد و حوکمی پێ ئەکات. ساحیبی ئەم رەدیەیانە لازمە بزانێ کـە مەبعوسـێک شارەزا و تێگەیشتو و زینفوزی وەک رەواندزی تـاکو بـە تـەواوی مـەزەڕەت وە یـا مەنفەعـەتی تـەتبیقی تەجنیدی ئیجباری محاکەمە و لەم خسوسەوە ئەفکار و ئارا و قابیلیەتی میلەتەکەی خۆی تەحلیل نـەکردبێ سەربەخۆ قسەی وا ناکات. وەک لە سەرەوە وتمان فکـری رەوانـدزی خۆلاسـەی فکـری ئـارای عمومیـەی میلەتی کوردە.

"وە ئەم فکر و قەراری میلەتی کوردە و ئەم نائیبەمان هەر بۆ ئەمە نیە کە بێ لێکدانەوە فکرێـک وە یـا رێگایـەکی موخالەفـەت بگـرێ و زیایەتیـەک تـەعقیب بکـات، بـەڵکو ئـەزانێ کـە لـە تـەتبیقی ئەمـەدا وەکـو مەنفەعەتێکی نابێ، بیلعەکس زەرەرێکی زۆری ئەبێ بۆ میلەت و وەتەنەکە.

"ئەگەر بە تەواوی ئەم مەسەلەیە محاکەمە بکەین وابزانم کەس نیـە حـاڵی حـازر تـەتبیقی ئـەم قانونـە موهیمە بە چاک بزانێ. چونکە تەبیعی واسیتەی تەتبیقی تەجنیدی ئیجبـاری بـۆ ئەوەیـە کـە میلەتەکـە فێـری خەدەمات و وەزائیفی عەسکەریە بکات، کە لە حالێکی تەعەڕوز و هجوما وەتەنەکەی لـە ئیسـتیلای ئـەجانیب و دوشمن محافەزە بکات و بپارێزێ، فەقەت محافەزەی وەتەن بە خۆشەویستنەوە ئەبێ، وەتـەن خۆشەویسـتنیش بە نیسبەت میلەتەکەوە لە گەڵ عەقل و عیلما مەبسوتەن موتەناسیبە.

"میلەتێک هەتا عەقل و سەویەی بە دەرەجەیەک نەگەیشتبێ کە پێی ببێژرێ تەکامولی کردوە ئەم فکـرە عالیەی نابێ.

"هەرچەند ناتوانم بڵێم میلەتی عیراق هەموی جاهیل و ئەم فکرە عالیەی نیـە، فەقـەت ئـەتوانم بڵـێم بـە ئەکسەریەت و حەتا قیسمێکی زۆری هێشتا کۆچەرە، بۆنی مەدەنیەتی نەکردوە، عادەتەن لە وەزعیەتی دنیا بـێ خەبەرە و هێشتا چونکە هیچ مەکتەبێکی نەدیوە لە عیلم و مەعریفەت بێ بەهرە ماوەتەوە، حاسلی وەحشیە. لـە بەر ئەمە لەمانە هیچ ئومێد ناکرێ کە ئەم فکرە عالیەیان هەبێ و وەتەنەکەیان خۆش بوێ."عەجەبا هـیچ ئومێـد ئەکرێ کە معێدیەک وە یا شارەزوریەک بۆ محافەزەی وەتەنەکەی رۆحی فیدا بکـات و موقابیـل بـە گوللــە و بۆمبا رابوەستێ؟

"لە بەر ئەوە هەتا ئەم عەشائیرانەمان و جاهیلەکانمان لە نوری مەعاریف بەهرەمەند ئەبن و حسی عالی محافەزەی وەتەن پەیدا ئەکەن و بە واجیبی ئەزانن و تەعەڕوزی وەتەنەکەیان بە تەعەڕوزی ناموسیان ئـەزانن، باش نیە ئەم قانونە تەتبیق بکرێ و ئەم فکرە بهێنرێتە حەیزی فیعلـەوە، چونکـە وەکـو وتمـان غـەیری ئەمـە ئیستیفادەی لێ ناکرێ و ئەبێ بە واسیتەی رەنجیدەی دڵی ئـەم نەوعـە ئینسـانانەمان و ئەشـبێ بـە سـەبەبی

ئیختیلافاتی ئەهالی، ئێستا بۆ ئێمە لازمە لە پێش ئەمەدا سەعی بکەین کە تەدریجەن بە قەدەر قوەت و ئیقتیداری حکومەتەکەمان عمومی میلەتەکەمان ئینتیسابی مەعاریف بکات، جاهیلی نەمێنێتەوە، غەیری ئەمەیش هەوڵ بدەین بۆ ئیکمالی ئەو هەمو نەواقیسانەمان کە لە ئیقتیسادیات، تیجارەت، زەراعەت و مەعاریف.. دا هەمانە.

"ئەوساکە میلەتەکەمان پێش کەوت و حسی محافەزەی وەتەنی پەیدا کرد و تەعەشوقی بە وەتەنەکەیەوە کرد تەتبیقی ئەم قانونە لازمە و بەڵکە واجیبە.

"حەتا ئەمەیش دەلیلە حکومەتی ئێرانی دراوسێمان کە هەمو ئەیزانین حکومەتێکی چەند کۆنە و بە تەواوی موستەقیلە فەقەت چونکە هێشتا میلەتەکەی ئەکسەریەتی جاهیلە لە دوای ئەوەیش کە قانونی موکەلەفیەتی عەسکەریەی لە مەجلیسی مەبعوسانیا تەسدیق کرا هێشتا ناتوانێ تەتبیقی بکات.

"کەواتە لە جیاتی تەجنیدی ئیجباری ئەگەر تەتبیقی قانونی تەدریساتی ئیجباری، هیچ نەبێ قیسمی ئیبتیدائی بکرێ باشترە و نەفعی زیاتر ئەبینن." (ژیان، ژ 92، 29 ی تشرینی سانی 927).

دەربارەی پێکهێنانی جەیشی عیراقی و مشتومڕی تەجنیدی ئیجباری بڕوانە:

الدكتورة رجاء حسين حسني الخطاب: تأسيس الجيش العراقي وتطور دوره السياسي من 1921– 1941، ط 2، بغداد، 1982.

جارێکی تریش ئەم کێشەیە هاتۆتەوە کایە (ژ128).

### 3. 5. وەزارەتی تازە کوردی تێدا نیە

وەزارەتەکەی سەعدون، هیچ وەزیرێکی کوردی تێدا نەبوە. ژیان لە سەر ئەوە بە دەنگ هاتوە، لە ژێر سەردێڕی (وەزارەتی تازە) دا نوسیوێتی:

"ئەمساڵ بە نەزەری تاریخی سیاسی عیراقەوەساڵێکی موستەسنا و موهیم بو، لە لایەکەوە ئەعزای وەزارەتی سابیقە بە کەمالی گەرمی و جدیەت خەریکی مفاوەزە بون لە لەندەن، لەم لایشەوە بە عەینی گەرمی و حەرارەت رۆحی موعارەزە لە زیاد بونا بو. لە سەرێکەوە فەعالیەت و موجاهەداتی وەفدی عیراقی تەقدیر ئەکرا، لە تەرەفێکی کەوە بە شیدەت تەنقید و موئاخەزە ئەکرا. خولاسە لەم بوحرانەدا روئەسای سیاسەت رێگای خۆیان ون کرد، سیاسەتی داخلیەیان کامیلەن وە یا تەقریبەن لە بیر چوەوە، نیهایەت لە هەوایەکی وا پڕ فەرتەنەدا قابینەی تازە تەشەکولی کرد.

"ئەمینم هەروەکو من، هەمو فەردێکی کورد، کە خەبەری زانی جەنابی فەخامەتمەئاب حەزرەتی عەبدولموحسین بەگ ئەلسەعدون تەشکیلی وەزارەت ئەکات، زۆر کەیفخۆش بو، چونکە ئەوەل داخلکەری وەزیری کورد بە قابینەی عیراق حەزرەتی عەبدولموحسین بەگ بو. لە بەر ئەوە ئێمە لە هەمو خسوسێک و حقوقێکەوە ئەمەلی گەورەمان بەو زاتە موحتەرەمە هەیە. غەیری ئەمەیش هەمو کەس ئەیزانێ کە فەخامەتی لە هەمو کەسێ زیاتر لە سەرامەدانی ئەشرافی عیراقە و ئەنجەبی نوجەبای میلەتی نەجیبەی عەرەبە. تەبیعی زاتێکی وا نەجیب و داهی، هەمو وەقتێک کەرەم و سەخای ئەبێ و، حەقیقەتەن جوزئی تەئەمولێک لە لیستەی وەزارەتی تازە بکرێ، مەعلوم ئەبێ کە ئەقەلیاتی عیراق هەر یەکە لە صورەتی شەخسێ وە یا دو شەخسا تەجەسومی کردوە و بە کەمالی هەیبەت و ویقار لە سەر کورسی وەزارەت دانیشتوە، کەچی قەومی بەدبەختی کورد بە نەزەر ئەم ئەقەلیاتەوە ئەکسەریەتێکی عەزیمە تەشکیل ئەکەن و، ئەگەر موافیقی عەدل و مساوات و بە پێی نفوسی مەوجودەی حەرەکەت بکرایە، حەقی ئیشغالی 3 کورسی‌یان ئەبو. مەعەلئەسەف سەماحەتی بەخشینی کورسیەکیشمان لە گەڵ نەکرا.

"ئێمە قەومی کورد، هیچ وەقتێـک نەمانویسـتوە و نامانـەوێ حەرەکـەتێک کـە زەرە بـۆنی تەفرەقـە و (جیایەتی) تیا بێ بیکەین، فەقەت ئەبینین ئێمە موقابیل بە خلوس و ئیعتیمادمان لە تەنها کورسـیەکی وەزارەت مەحروم ئەبین.

" لە گەڵ ئەمەیش دا کە ئەم مەحرومیەتە و ئەم تـەجاوزی حەقـە، بـە ئینتیـزار و عەدالەتـەوە موقابەلـە ئەکەین، کەچی یەکێ لە غەزەتەکانی بەغداد بە سورەتی ئیسـتیهزا ئەنوسـێ کـە کورسـیەکی وەزارەت بـۆ بـرا کوردەکانمان هەڵگیراوە فەقەت فەخامەتی عەبدولموحسین بەگ تەشەئومی لە ئایەتی (تسعة رهط یفسدون فـي الارض) کردوە و نایەوێ وەزارەتی نۆیەم بدا بە کەس وە یا بە تەعبیرە ئەسـەحەکەی بیـدا بـە کـورد، نـەکو ئیفسادی ئەرزی عیراق بکەن.

"سوبحانەڵا! ئەوەلەن، زاتێکی نەجیب و قەدرزان و تێگەیشتوی وەکو فەخامـەتی موحسـین بـەگ هـیچ وەقتێک فکرێکی وای نەکردوە و نایکات. سانیەن، تیفلی مەشروتیەتی عیراق هـەتا ئێسـتا 5 بـاوک و یـا 5 وەزارەتی دی، لەمانە تەنها دوانی ئەخیر کورسیەکی کوردی تێدا بو، نازانم کام یەک لەم پێنجە بە سـەمیمیەت و جدیـەتێکی وەتەنپەروەرانـە بـۆ مـەنافیعی موڵـک و میلـەت تـێ هـەڵچون و چ خدمـەتێکی موهیمیـان بـۆ ئوممەتەکەیان و، چ ئەسەرێکی تەرەقی سیاسی، ئیجتیماعی، ئیقتیسادییان پیشان دا و موفسیدی نۆهـەم لـێی تێک دان؟ یاخود ئەبێ رەشیی شەخسێک بەرامبەر بە رەشیی و ناقدومی هەشت کەس چ تەئسیرێکی ببـێ کـە ئیفسادی ئەرزی عیراق بکات؟

"ئێمە بە ناوی سەلامەتی وەتەنەوە ئارەزومان وابو کـە هـەمو عەناسـیری موختەلیفـەی عیـراق دەسـت بدەنە یەک و موتەفیق بن و رێگای نەشر و دەرکەوتنی بەعزێ قسە و نوسین نـەدرێ، کـە ببـێ بـە سـەبەبی تەفرەقە و برودەتی بەینی کورد و عەرەب.

"وە دیسان بە نـاوی عـەدل و مسـاواتەوە ئارەزومـان ئـەکرد کـە رەئـیس وزەرای تـازە لـە تەشـکیلی قابینەکەیدا قەومی کورد بە ئەکسەریەتی موهیمەیەوە لە بیر نەچوایەوە و بە سەخا و کەرەمێکی سـەعدونیەوە ئەویش وەکو ئەقەلیاتەکانی تر نائیلی دو وە یا کورسیەک بکردایە." (ژیان، ژ 102. 16ی شوباتی 1928)

## 4. هەڵسەنگاندنی کاری مەبعوسەکانی کورد

"بە موناسەبەتی حلولی ئیجتیماعی میلیەوە بۆ مەندوبە موحتەرەمەکانمان

"نائیب و واجیباتی

"ئوصولی نیابەت ئوصولێکی دیمۆقراسیە. ئەمڕۆ دەرەجەی ئەهمیەت و لزومی وەک (موتاعەرەفە) یـەکی لێ هاتوە و لێدوانی زائیدە. ئەساسی مەوزوعی ئێمە تەدقیق و تەحقیقی ئەم ئوصولی موهیمـەی حەیاتیـە نیـە، چونکە تەقریبەن لە ئەواخیری عەسری هەژدەمەوە هەتا ئێستا، عولەما، تێگەیشتوانی غەرب و شـەرق خـەریکی تەشریحی ئەم مەسئەلەیەن. باوەڕ ناکەم کەس مابێ ئینکاری چاکی ئەم ئوصولی ئیدارەی حکومەتە بکات.

"ئەوی ئێمە کردومانە بە سەر لەوحەی مەقال: وەزیفە و واجیبـاتی وکـەلای ئومەتـە. لاعەلەلتـەعین هـەر ئوصولێک وەلەو حائیزی هەمو نەوعە ئەوصافێکی نافیع بێ، بە شەرتێ حوسنی ئیدارە و ئیسـتیعمال نـەکرێ، فائیدەیەکی مەتلوبەی لێ ئستیحصال ناکرێ. بینائـەن عەلـەیهی ئـەم ئوصـولی نیابەتـەیش ئەگـەر لـە تـەرەف ساحیب لیاقەت و ئیقتیدارەوە تەتبیق نەکرێ، لە جێگەی نەفع زەرەر ئەبەخشێ.

"لە پاش ئەم موقەدیمەیە بێینەوە سەر رۆحی مەسئەلە، ئێوە ئەی حەزەراتی وەکیلانی ئومـەتی بێچـارەی کورد، ئەم خیتابەمان لە گەڵ ئێوەیە. ئەبێ بزانن کە هەمو قەوانین و نیزاماتی حکومەت تـا ئێـوە تەسـدیقی نەکەن ناکرێ، وە لەم خسوسەوە مەسئول، ئەم مەجلیسەی ئێوەیە، ئەم مەجلیسە بـە جـارێ تەمسـیلی میلـەتی

عیراق و فەردەن فەردەن هەر ئەعزایەکیشی تەمسیلی میلەتەکەی خۆی ئەکات، کولی مەندوبێک لـە تـەرەف 25 هەزار کەسەوە تەوکیل کراوە وحقوقی ئەم 25 هەزار کەسە تەودیعی ئۆباڵی ئەو کراوە، ئەو کورسیەی کـە لـە مەجلیسا ئیشغالی ئەکەن شەرەفێکی 25 هەزار کەسی هەیە و ئەبێ بزانن کە دائیمەن هەر یەکێک لە ئێوە 50 هەزار چاو چاوەڕوانی خزمەت و فەعالیەتی لێ ئەکات.

"ئەمە 3 دەورەی ئیجتیماعیەی موهیمی نیابیەتان تێ پەڕان کەچی هێشتا میلـەت لـە ئێـوە بـە تـەواوی سەعیەک و فەعالیەتێکی نەدی. تەبیعی لە حەزەراتی ئێوە بەعزێکتان چاوتان پێ کەوتوە وە یا بیسـتوتانە کـە ئەلویەکانی جنوب ئەمڕۆ لە خسوس هەمو شتێکەوە تەکامولی کردوە هەمو ماڵەزەمەیەکی بـۆ ئیحـزار و هـەمو ئیحتیاجاتێکی دەفع کراوە، تەبیعی لیوائەکانی خۆیشتان دیوە. لازمە موقایەسەی بکەن. عەجەبا ئەسـبابی ئـەم هـەمو نوقسـانیەتە و دواکەوتنـەمان نـازانن. تـەبیعی ئـەیزانن کـە مەندوبـەکانی ئـەوان لـە داخلـی حـدود و سەلاحیەتی خۆیانا هەمو نەوعە تەشەبوساتێکیان کردوە. واجیباتی مەودوعەی خۆیـان بـە جـێ هێنـاوە و بـۆ میلەتەکەیان تێ کۆشاون. هەتا بەم نەوعە میلەتەکەیان مەمنون و خۆشیان لای ئەوان خۆشەویست کردوە.

"ئەبینن کە ئەکسەر لە نوابەکانی جنوب بۆ فەحس و تەدقیقی ئیحتیاجاتی ئیقتیسادی، عیلمـی، سـیحی ئەسوڕێنەوە و حەتا خاریجی مەنتیقەی ئینتیخابیەیان ئەگەڕێن، لە زەرورەت و لەوازیماتی میلەت تێ ئەگەن، بۆ پێکهێنانی ئەمانە ئیرشاد و تەوصیەی حکومەت ئەکەن و، بەو نەوعە واجیباتی موقەدەسەی خۆیان ئیفا ئەکەن. کەچی هێشتا زۆر لە ئێوە ئەمەندە مەراقی نەکردوە کە لە داخلی مەنتیقەی ئینتیخابیەکەی خۆیا گەشـتوگوزارێ بکات، ئیحتیاجاتی زەرورەتی میلەتەکە تەدقیق و بۆ ئیکمالی نەواقیسی تەشەبوسێک بکات.

"وەقتێ بێ لێکدانەوە کە دەستی تەسویتیان بۆ قانونی (رەسمی فەواکیهە و ئەسـمار) هـەڵبڕی ئەبوایـە بتانزانیایە کە فەرمانی ئیفلاسی و مەحوبونەوەی میلەتێک ئیمزا ئەکەن.

"لازم ئەکات حەزەراتی ئێوەش، عمومی مەندوبەکانی کورد: لە زەمانی عوتلـەدا گەشـتوگوزاری عمـومی ئەرازی لیوا، قەزا، ناحیە، حەتا دێهاتەکانی مەنتیقەکەتان و مەنتیقەی یەکتری بفەرمون و، لە رۆحی ئیحتیاجاتی میلەتەکە تێ بگـەن و هـەموتان دائیمـەن موتـەفیق عـەینی وەکـو رۆحێکـی جیسـمێک حەرەکـەت بکـەن، ئـەم نەواقیساتانە و ئیحتیاجاتی میلەتەکە ئەبینن ئیرشاد و تەوسـیەی حکومـەتی بکـەن و ئەگـەر وا بـەو نەوعـە ئیتیفاق و شارەزای مەناتیقی یەکتری بین ئەتوانن دائیمەن لە مەجلیسا کیتلە و پارتیـەکی مـوهیم و بـە قـوەت تەشکیل و ئیحتیاجاتی میلەتەکە بە ئەکسەریەت بە حکومـەتی ئیکمـال بکـەن. وە میلەتەکـە لـە زەرەر و زیـان محافەزە و ویقایە بفەرمون، ئەوسا میلەت بە کەمالی جدیەتەوە فەخرتان پێوە ئەکات و بە موقەدەستان ئەزانێ.

"ئیتر رجا ئەکەین کارێکی وا بکەن کە بۆ ئینتیخاباتێکی کە بە شەرەفەوە ئومێدی تەوکیل کردنتان لـە میلەتەکە بکەن. ئیتر ئینتیزاری فەعالیەت و مەسـاعی مەشـکورەتان ئەکـەین." (ژیـان، ژ 87، 25 ی تشـرینی ئەوەلی 1927).

پێ ئەچێ ئەم وتارە نائیبە کوردەکانی توڕە کردبێ بۆیە لە ژ 96 دا لە ژێر سەرناوی (تەلەبی عەفو) دا وتارێکی تری نوسیوە. وتارەکە گۆیا داوای لێ بوردن لە نائیبەکان ئەکا، بەڵام وەکو لـە نـاوەرۆکی وتارەکـەدا دەرئەکەوێ، تەنیا باسی ئەمین زەکیی بە چاکە کردوە و داوای لێبوردنی بە تەنیا لـەو کـردوە، بـە چەشـنێکی ناراستەوخۆ رەخنە و گلەییەکانی خۆی لە نائیبەکانی تر دوبارە کردۆتەوە. نوسیوێتی:

"لە غەزەتەی ژمـارە 87 و 25 ی تشـرینی ئـەوەلی 927 دا بـە موناسـەبەتی کۆبونـەوەی مەجلیسـی مەبعوسانەوە لە خسوس نائیبە موحتەرەمەکانمانەوە مەقالەیەکمان نوسی بو، وەکو زانیومانە ئەم مەقالەیـە بـوە بە سەبەبی دڵگیری قیسمێک لە مەندوبەکانمان.

"ئێمە هەمو وەقتێک ئەم زاتانە موقەدەس و، عادەتەن چونکە وەکیلمانن بە گەورەی خۆمان و، بە موحتەرەم و عالی هەمو قەومەکەمانی ئەزانین.

"مەعلومی هەمو شەخسێکە ئەمڕۆ میلەتی کورد لە هەمو قەومێک باخسوس لە دراوسێکانمان زیاتر دواکەوتوە و ئەمڕۆش عەسری تەرەقی و هەوڵدان و پێشکەوتنە. میلەتێکی دواکەوتو تەبیعی ناژی و ئەگەر هەروا بمێنێتەوە حەقی ژیان و حەتا نان خواردنی نابێ و بە بەشەر ناناسرێ. لە بەر ئەوە ئێمەش مەجبور بوین بۆ خاتری تەلافی مافات بکەین و هەر بەم نەوعە نەمێنینەوە وەکیلە موحتەرەمەکانمان تەشویق بکەین کە لە خەلقی کە زیاتر سەعی‌مان بۆ بفەرمون، کە خێراتر بۆ ساحەی مەدەنیەت هەنگاو بهاوین.

"ئێمە قەت ئینکاری سەعی و فیداکاری ئەم زاتانە ناکەین و مەندوب و وەزیرێکی وەکو مەعالی ئەمین زەکی بەگ کە عیلم و عیرفان و فەزیلەتی ئەمڕۆ فەوقی هەمو کەسێکە و بە ئومێدی خدمەتی وەتەن و میلەتەکەی لە دیارێکی دورەوە تەیی مەسافەی کرد لە حالێکی وا موهیم دا کە میلەت زۆر لزومی بە زات و شەخسی وا فەعال بو تەشریفی هێنایەوە و، لەوسایشەوە هەمو ئانێک بە هەمو قوەتیەوە بۆ تەرەقی و پێکهێنانی هەمو مالەزمەیەک و نوقسانیەتی میلەتەکە هەوڵ و تەقەلای دا و، ئەمڕۆکە هەمو ئەیبینین زۆر نوقسانیەتی بۆ ئیکمال کردین. کە دائیمەن لە پێش چاوی میلەتە و لە فکر ناچێتەوە. عەجەبا چۆن ئەبێ لە عەلەیهی ببین. حاشا ئێمە قەت جەسارەتی وا ناکەین زاتی عالی و شەخسی وا موقەدەس دائیمەن تەقدیر و تەقدیس و ئیلەل ئەبەد تەمەنای موەفەقیەت و تەشەکوری خەدەماتی مەشکورەی ئەکەین.

"ئیستیرحام ئەکەین کە بە نەزەرێکی خراپ تەماشای مەقالەکە نەفەرمون، چونکە لە غەیری ئەوە کە زیاتر بۆ هەوڵدانی ئیکمالی نوقسانیەتی میلەتەکە نەبێ تەشویقیان بکەین هیچی تر ناڵێین و، هیچ حەقێکمان نیە بیڵێین و، دائیما تەمەنای موەفەقیەتیان ئەکەین. هەر بژین."

# 2. ژیان و مەجلیسی نواب (دەورەی دوەم)

## (19 ی ئایاری 1928 – 1 ی تەموزی 1930)

### دەورەی ئینتیخابیی دوەم

### 1. وتارەکانی ژیان

"قسەی حەق وەلەو رەقیش بێ نابێ کەس پێی ناخۆش بێ

"وەکو تەماشا ئەکەم و ئەبینم، لە سلێمانی و لە خاریج، زۆر کەس و ئەنواعی ئینسان خۆی حازر کردوە و تەشەبوسات ئەکەن بۆ ئەوە کە بین بە مەبعوس.

"ئەم زەواتانەش قیسمێکیان بە بێ مەسئولیەت موقابیل بە میلەت خوا کردونی بە مەبعوس و بە قەد مەبعوسێ کە بۆ میلەتی خۆی سەرفی حەمیەت و غیرەتی کرد بێ، حورمەت و شەرەف و ئەملاک و سەروەتیان هەیە و، لە نەزەر عموم دا زۆر بە ئیعتیبار و نفوزن، لاکین مەعەلئەسەف چونکی لەمەوپێش تەحسیلی مەکتەب لەم مەحیتەدا موهیم و مەتلەب نەبوە، باخسوس بۆ پیاوێک کە ساحیبی سەروەت و ئەمەلاک بوبێ، دڵی نەهاتوە ئەولاد لە خۆی دور بخاتەوە و بینێرێتە مەکتەب و زیاتر مەغرور بە سەروەت و ئەملاک و ئیعتیباری ئەولادی لە تەحسیلی مەکتەب و مەکاتیبی عالی مەحروم کردوە و بە سایەی شەرەف و ئەملاکیانەوە بە حورمەت ژیاون و، ئێستایش لە نەزەر ئەهالیدا ئەو شەرەف و حورمەتە باقیە، فەقەت چونکە لە مەکاتیبی عالیدا تەحسیلیان نیە ئەم وەزیفە موهیمەیان پێ ناکرێ، هەر تیا مەحجوب ئەبن، چونکە ئەمڕۆ وەزیفە نیە کە لە وەزیفەی مەبعوسی موهیمتر بێ وەکو وەزیفەی تر نیە هەر موقابیل بە شەخسێک مەحجوب بێ. مەحجوبی مەبعوسی موقابیل بە میلەتێکە. مەبعوسێ موقتەدیر و زبان زان و عالم و ساحیب ویجدان و بە حەمیەت بێ، میلەتێک بەرز ئەکاتەوە و وڵاتێک مەعمور و ئاوەدان ئەکات. خوانەکردە عەکسی ئەمە بێ، میلەتێک دوا ئەخات و وڵاتێک وێران ئەکات و خۆشی رەزیل و بێ حورمەت ئەبێ.

"کەوابو یەکێ لە هەمو خسوسێکەوە خۆی لایق نەبینێ و نەزانێ لەم وەزیفەیەدا مەحجوب نابێ، نابێ و حەیفە تەشەبوس بەم وەزیفەیە بکات و ئۆباڵی میلەتێک بخاتە ئەستۆی خۆی و ئیعتیباری خۆی لای میلەتەکە مەحو بکاتەوە. بەعزێکی تر هەن کە خۆیشیان ئەیزانن ئەم وەزیفەیەیان پێ ئیفا ناکرێ و ناشبن بە

مەبعوس کەچی مەنفەعەتی زاتی سەوقیان ئەکات تەشەبوس بۆ ئەم بارە قورسە بکەن. ئەمانەش دو کەلیمە خوێندنی ئیبتیدائی وە یاخود چەن ڕۆژێک لە مەئموریەت دا موستەخدەم بون، چوار کەلیمە فێر بون سەوقی ئەم تەشەبوسەی کردون. مەبعوسی هەر تەنها بە خوێند و خوێندەواریش تەواو نابێ، نابێ لە بەر بێ مەئموریەتی و یاخود بۆ تەرەقی مەئموریەت تەشەبوس بکات، مەبعوس ئەبێ میلەتپەروەر بێ، ساحیب ئەخلاق، ویجدان و ڕەحم بێ، عالم و زبان زان بێ، مەوقیعی ئیجتیماعی لای میلەتەکەی ببێ، مەنفەعەتپەرست نەبێ، لە ئیحتیاجاتی میلەت چاو نەپۆشێ، بە سەبات بێ، ڕۆحی خۆی فیدای مەنفەعەتی میلەت بکات و بتوانێ موجادەلە لە گەڵ ئەو تەحسیلدیدانە بکات کە لەو مەجلیسەدا موجادەلە و سەعی بۆ وەتەنی خۆیان ئەکەن، چونکە هەمو ئەیزانین لەو مەجلیسەدا حەیات و مەمات بەش ئەکرێ. هەر میلەتێک مەبعوسی چاکی ببێ بەر حەیات ئەبێ، عەکسی چاک بێ مردن بەشێتی.

"ئەمجا کەوا بو حەیفە گوهەردۆڕاندن، ڕجا ئەکەم لە سەر ئێوە فەرزە بەم نفوز و حورمەتەوە سەعی بکەن و تەنویری ئێمەمانان بکەن تا بە عموم پیاوی لایەق، تەجرەبەدیدە و ئەربابی خۆی بدۆزینەوە کە ئەم بارە گرانە بدەین بە سەریانا. ئەم قسانەم بە بێ ئەدەبی عەد مەکەن وەڵا کەسم نیە چاوی لە مەبعوسی بێ و خۆیشم لە ئێوە نالایەقتر! حەقبێژی قسەڕەق" (ژیان، ژ 101، 9 ی شوباتی 1928)

"خیتابێکە موقابیل بە هەمو میلەتی کورد

"ئێوە هەمو ئەیزانن بە پێی قەراری عیسبەتول ئومەم ئەمڕۆ ئێمە لە گەڵ حکومەتی عیراقا ئەژین و هەمو موقەدەراتێکمان لە گەڵ ئەوانایە. لە هەمو شتێک زیاتر سەبەب و ئالەتی تەرەقی و تەعالی میلەتێک قەوانین و نیزاماتی حکومەتەکەیە، یەعنی تەرەقی میلەتێک لە گەڵ قەوانینی حکومەتەکەیا مەبسوتەن موتەناسیبە، باش بێ ئەبێ بە واسیتەی تەرەقی میلەتەکە، خراپ بێ میلەتەکە دوا ئەخات و مەحوی ئەکاتەوە. وە هەمویش ئەیزانین ئەم قەوانین و نیزاماتە هەموی بۆ تەدقیق و ئیسلاح و تەسدیقی تەودیعی مەجلیسی مەبعوسان ئەکرێ. تەبیعی ئەوسا هەمو مەبعوسێک لە گەڵ قابیلیەتی میلیەی و ویسعەتی ئەرازی لیواکەیدا موقایەسەی ئەکات، ئەگەر بۆ تەرەقی و پێشکەوتنی لیواکە موفید بو تەسدیق وەئیلا بە ئیعتیرازێکی مەعقول هەتا ئەبێ بە سەبەبی تەرەقی لیواکەی بۆ ئیسلاحی هەوڵ ئەدا. ئینجا کەوابو بۆ ئەم جێگایە پیاوی فەعال، موقتەدیر، وەتەنپەروەر و میلەت خۆشەویست بە عەمل دێ.

"ئەمڕۆ لیواکانی کورد دواکەوتوی هەمو عیراقە. ئەمیش بە واسیتەی مەبعوسەکانمانەوە بو. چونکە ئەو مەبعوسانەی کە لە ئەوەل دەورەدا ئینتیخابمان کردن هەموی نا فەقەت بە ئەکسەریەت هیچ ئەوسافێکی مەبعوسیان تیا نەبو. پیاوی ئەو مەجلیسە نەبون. هەر یەکەیان بۆ مەنفەعەتی خسوسی خۆیان مەنفەعەتی عمومی میلەتەکەیان واز لێ هێنا بو. بۆ خاتری خۆیان گەورە بین هەر یەکە ئینتیسابی کرد بو بە یەکێ لە وەزیرەکان و پیاوە بە دەستەکانی ترەوە. عادەتەن وەکو مادونێکی ئەوان تابیعی هەمو ئەفکار و ئەوامیریان بون. هەتا نەتیجە وا دوایان خستین و لە هەمو ئەسبابێکی تەرەقی مەحرومیان کردین.

"ئینجا میلەت خۆ ئەمانەمان زانی لەوانەوە تەجرەبەیەکی باشمان دی. لازمە عەقلمان بێتەوە سەر. هەموئەهالی لیوایەک بە جدی تێ بکۆشین کە بۆ ئەم جێگایە پیاوی باش، فەعال، موقتەدیر، میلەتپەروەر و وەتەن خۆشەویست ئینتیخاب بکەین. چونکە ئەمە بۆ حەیات و ئیستیقبالێکی چوارساڵیە. خودانەخواستە ئیتر ئەگەر لەم حاڵەیش زیاتر دوا بکەوین، جەبری مافاتی قابیل نابێ و پەشیمانی فائیدە ناکات. ئیتر خۆتان و غیرەتتان (حب الوطن من الایمان) ئەبێ بە دڵ و بە گیان بۆ وەتەنەکەمان هەوڵ بدەین." (ژیان، ژ 103، 23 ی شوباتی 1928)

"بە موناسەبەتی ئینتیخاباتی تازەی مەبعوسانەوە چەند قسەیەکی رەق ئەمما خۆش

"لەم بەینەدا بە موناسەبەتی ئینتیخاباتی تازەی مەبعوسانەوە شاری سلێمانی وەزعیەتێکی عەجایبی بە سەرا هاتوە. لە هەمو کۆلانێک، لـە هـەمو چایخانەیـەک و دیوەخانەیـەک، قسـە و بەحسـی مەبعوسـی تیکرار ئەکرێتەوە. حەتا دەوائیری حکومەت، ستونی غەزەتە، بەم مەوزوعە ئیشغال کـراوە. هەرکەسـە بـە نەوعێک تەشویقات بۆ خۆی وە یا بـۆ خزمێـک و دۆسـتێکی ئـەکات. ئەوانـەی کـە ئیقتیـداری کـاتبێکی دائیرەیەکیان نیە هەوای مەبعوسی کەڵلـەیانی پڕ کردوە. ئەوانەی تا ئەمرۆ کوردیەت و میللیەتیان پێ عـار بوە ئەمرۆ بە لافی فیداکاری و وەتەنپەروەری گوێی عالـەمیان کـەڕ کـردوە. هـەر کەلەیـەک هـەر ئانێـک نەوعێک نەقەرات تیکرار ئەکاتەوە. وەکو بەرخەکە ئێستا، دایکی مـن رەش بـو، هـەر یەکـە رۆژی نەوعـە ئەلبیسە لە بەر ئەکات و لە نەوعە شکلێکی موختەلیف دا خۆی نیشانی میلـەت ئـەدات، خـۆ موخابـەرات و کاغەزی ئیلتیماس ئەوەندە زۆر بوە پۆستەی ئەوەندە گران کـردوە کـە موتەعەهیـد بـە ئۆتۆمۆبێـل پـێی هەڵناگیری. ئیشتیاق و فیداکاری بەعزێک ئەوەندە لە غەلەیان دایـە کـە تەحـەمولی جـوابی کاغـەزەکانیان ناتوانن بکەن خۆیـان بیلـزات بـە شـوێن کاغـەزەکانیان دا دێنـە سـلێمانی. زائیـرین ئەوەنـدە زۆر بـوە دیوەخانانی پڕ کردوە. ئێمە بیستومانە کە لە کوردستانا هـەر گـەزۆ ئـەبارێت، نـەمانزانیوە کـە ئەمسـاڵ پەڵەی مەبعوسی داوە. فەقەت ئەی میلەت! ئەی برادەرینە! قسەی راستتان عەرز بکەم، ئەم هەمو فیداکاریـە، ئەم کوسرەتی ئیشتیاقە، ئەم کۆمەڵە لاف و گەزافە، موحەقەق بزانن هەر بۆ معاشە مەبزولەکەیـە، هـەر بـۆ پڕکردنی گیرفانە لە مەسکوکاتی متەنەویعە.

"خۆزگە حکومەت ئەم خزمەتی وەتەنەی مەجانەن تەکلیف بکردایە و معاشی مەبعوسی بکردایە بە صەد روپیە، ئەو حەلە فیداکار، وەتنپەروەر بوار دەری ئەخست. بە ئیعتیباری عموم نالێم، فەقەت بە ئەکسەریەت کـە زاهیرەن بە زمان ئەم وەعدانە بە ئێوە ئەدەن، ئەم فیداکاریەی کە پێ نیشانی ئەدەن، کەچی لە دڵـدا لـە گـەڵ شتێکی کە خەریکن. ئەوان پلانی خۆیـان دەمێکـە رێـک خسـتوە: لـەم ئـەدواری ئیجتیماعـەدا چەنـد معـاش وەرئەگرن؟ چەندی سەرف ئەکەن؟ چەندی پاشەکەوت ئەکەن؟ هەمویان حساب کردوە. لـە سـەر چ جادەیـەک، کەلاوەی چ قوڕبەسەرێک بە هەرزان ئـەکڕن و لـەو کەلاوەیـەدا چ نەوعـە بینایـەک دروسـت ئەکـەن؟ وە یـا چ دێیەک ئەکڕن هەموی بەرێکوپێکی پرۆغرامەکەی کە بە خەیاڵ تەرتیبیان کـردوە لـە گیرفانیانایـە. (مزگـەوت روخاوە، میحرابی ماوە).

"ئەی میلەت! موحەقەق بزانە ئەبێ خۆت بەزەییت بە خۆتا بێتەوە.

"فەقەت ها ئەم قسانەم بۆ ئەوە نیە کە ئێوە مەئیوس بن، زاتەن لە سـەرەوە وتـم ئـەم قسـەیەم بـە ئیعتیباری عمومی نیە، لە ناو خۆتانا ئینسانی فیـداکار، وەتەنپـەروەر، موسـتەعید هەیـە. زۆر چـاک چـاو بگێرە، زەریف ورد بەرەوە، لە روا دامەمێنە، خزم و ئاشنا تەماشـا مەکـە، ئـەوی بـە کـەڵکت دێـت، ئـەوی دەرمانی دەردت ئەکا، ئەوی ئیعتیمادت بە عیلم و سەویەی هەیە، ئەوی قیمەتی لای تۆ مەعلوم و موجەڕەبە، حاسلی ئەوی حەیات و مەماتی ئەوێی، سەعادەت و فەلاکەتی لە گەڵ تۆدا موشتەرەکە، ئـەوە هـەڵبژێرە، پرۆغرامی داوا لێ بکە، پشت بە یەکێک ببەستە (مەبەستە. نم) کە ئاگرت تێ بەر بـدا و خـۆی لـە دورەوە سەیرت بکات ئیتر:

من انچه شرط بلاغ است با تو میگویم

تو خواهی از سخنم پند گیر و خواهی ملال" (ژیان، ژ 104، 1 ی مارتی 1928).

## 2. پێکهێنانی مەجلیس

### 2. 1. نامزەدیی

"ئـەمجارە بـۆ ئـەوەی لـە تـەرەف ئـەهالی لیـوای سـلێمانیەوە ئینتیخـاب بکـرێن و بـبن بـە مەنـدوب مـوافیقی ئیستیدعایەک کە تەقدیمیان کردوە جەنابان: نامیق بـەگ کـوڕی عـەلی پاشـا کـە دانیشـتوی موسـڵە و، ئەحمـەد نـوری ئەفەندی مودیری پۆستە و تەلغرافی کەرکوک نامزەدیی خۆیان ئیعلان کردوە." (ژیان، ژ 102، 16 ی شوباتی 928).

"بۆ زانینی هەمو

"ساکینی قەزای هەڵەبجە جەنابی ئەحمەد بەگ زادە عەلی بەگ بۆ ئەوەی لە تەرەف ئەهالی ئەم لیوایەوە ئینتیخاب بکرێ و ببێ بە مەبعوس بە ئیستیدعای رەسمی نامزەدی خۆی وەزع کردوە.

"جەنابی سەبری ئەفەندی حاجی عەلی ئاغا بۆ ئەوەی لە لیوای سلێمانی‌دا ئینتیخـاب بکـرێ و ببـێ بـە مەبعوس ئەمجارە لە تەرەف دو سەد شەخسی ئەم لیوایەوە بە مەزبەتە تەرشیح و نامزەدیـان وەزع کـردوە." (ژیان، ژ 105، 8 ی مارتی 928).

"نامزەدیی

"لە ئەشرافی سلێمانی موتەقاعید میرلیوای ئەرکانی حەرب موحتەرەم حاجی مستەفا پاشا بۆ مەبعوسـی لیوای سلێمانی نامزەدیی خۆی وەزع و ئیعلان فەرموە.

"لە بەگزادەی جاف جەنابان ئەحمەد موختار بەگ و جەمال بەگی کوڕی جەمیل بەگ لە هەڵەبجـەوە و، لە خەڵقی سلێمانی و دانیشتوی بێـروت سـابیق بیکباشـی ئـەرکان حـەرب جـەنابی ئەحمـەد زەکـی بـەگ لـە بیروتەوە بۆ ئەوەی لە تەرەف ئەهالی ئەم لیوایەوە ئینتیخاب بکـرێن و بـبن بـە مـەبعوس نـامزەدیی خۆیـان وەزع کردوە." (ژیان، ژ 108، 5 ی نیسانی 1928).

"بۆ زانینی هەمو

"موحتەرەم جەنابی سەیفوڵا بەگ کوڕی عیزەت بەگ بۆ ئەوەی ئینتیخاب بکرێ و ببـێ بـە مەبعوسـی ئەم لیوایە لە تەرەف ئەهالیەوە بە مەزبەتەیەکی دوصەد ئیمزایی نامزەدییان تەلەب و وەزع کردوە.

"جەنابی ماجید ئەفەندی کوڕی مستەفا ئەفەندی قازی بۆ ئەوەی ئینتیخـاب بکـرێ بـە مەبعوسـی ئـەم لیوایە لە تەرەف ئەهالیەوە بە مەزبەتەیەکی دوصەدوپەنجا ئیمزایی نامزەدییان تەلەب و وەزع کردوە." (ژیان، ژ 110، 19 ی نیسانی 1928).

"بۆ زانینی هەمو

"لە خەڵقی سلێمانی دانیشتوی بەغداد حاجی مەلا سەعید ئەفەندی کەرکوکلی زادە بۆ ئەوەی لە تـەرەف ئەهالی لیوای سلێمانیەوە ئینتیخاب بکـرێ بـە مـەبعوس لـە سـەر پرۆغرامێکـی کـە لـە ژێـرەوە دەرج کـراوە نامزەدیی خۆی وەزع کردوە:

1. موعاهەدە لە گەڵ ئوممەت ئەکەم کە بە قەدەر تاقـەت سـەعی بکـەم بـۆ ئیسـتیقلالی تـام کـە هـیچ گرێیەکی تیا نەبێ.

2. غایەی ئەمەلم ئەمەتە میلەتی عیراق و بریتانیای عوزما دائیمەن لە حالی دۆستی و مەسالیحی ئینگلیز لە عیراقا مەحفوز ببینم.

3. سەعی و تەشویقی سوڵتاتی محەلیە ئەکەم بۆ تەعدیلی بەعزێ قەوانین و ئەشکالی مەوزوعەی حازرە وەک ئوسوڵی جیبایەت (ضریبە) بە سورەتێک موافیقی مەسلەحەتی زوراع و موکەلەفین بێ.

4. موافەقەت لە سەر هیچ قەرارێک ناکەم لە مەجلیس دەرچێ کە حقـوقی میلـەت پایـەماڵ بکـات وە یـا موخیلی ئیستیقلال بێ." (ژیان، ژ 111، 26 ی نیسان 1928).

"بۆ زانینی هەمو

"مەعالی ئەمین زەکی بەگ بۆ ئەوەی لە تەرەف ئەهالی ئەم لیوایەوە ئینتیخاب بکرێ بە مەبعوس بە تەلغراف نامزەدیی وەزع فەرموە.

"تەلغرافێک کە لە ئەحمەد نوری ئەفەندیەوە هاتوە

"بۆ حەمیەتمەندانی ژیان

"وەکو لە وەقتی خۆیا لە گەڵ سەعادەتی موتەسەڕیف و زەواتی موحتەرەمەوە قسە کرا بو دیسان تەرشیحم بە واسیتەی حکومەتی مەرکەزیەوە تەمەنا ئەکەم. فائیدە لە ئێمە مەئمولە. کەرکوک ئەحمەد نوری" (ژیان، ژ 113، 10 ی مایسی 1928).

## 2. 2. دیاری کردنی مونتەخیبی ئەوەلی

هەڵبژاردن ڕاستەخۆ نەبوە، بەڵکو بە چەند قۆناغێک دا ڕۆیشتوە. سەرەتا لیستی ناوی ئەوانە دیاری کراوە کە مافی دەنگدانیان هەبوە. چونکە دانیشتوانی وڵات هەمویان مافی دەنگدانیان نەبوە. ئافرەت مافی دەنگدانی نەبوە، ئەم مافە بە تەنیا هی پیاوان بوە. لە ناو پیاوانیشدا ئەوانەی کە ملک و ماڵێکی دیاریکراویان هەبوە و ساڵانە لە چەردەیەکی دیاریکراو زیاتر باجیان داوە. بەمانە وتراوە مونتەخیبی ئەوەلی. هاووڵاتیانێک کە موڵک و ماڵیان نەبوە مافی دەنگدانیان نەبوە. مونتەخیبی ئەوەلی مافی هەڵبژاردنی مەبعوسی نەبوە، بەڵکو مافی هەڵبژاردنی چەند کەسێکی هەبوە لە گەڕەکەکەی خۆیاندا کە پێیان وتراوە مونتەخیبی سانەوی. مونتەخیبی سانەوی مافی هەڵبژاردنی مەبعوسەکانی هەبوە.

"ئیعلان

| | |
|---|---|
| گۆیژە | دەرگای مزگەوتی شێخ محەمەدی ئالەکی |
| مەڵکەندی | پێش چایخانەی حەمەئاغای ئەوڕەحمان ئاغا |
| دەرگەزێن | دەرگای خانەقای مەولانا |
| کانی ئاسکان | دەرگای مزگەوتی گەورە |
| سەرشەقام | دەرگای مزگەوتی مەلا حامید |
| چوارباغ | دەرگای خانەقای مەشوی |
| جولەکان | کەنشتەی قەرەداغی |

دەفتەری مونتەخیبی ئەوەلی محەلەکانی شاری سلێمانی، کە لە هەیئەتی موختاریەوە وەرگیراوە، بەو جێگایانەی کە لە سەرەوە نوسراوە لە ڕۆژی 20 ی شوباتی 928 دا تەعلیق کراوە. ئەوانەی کە ئیسمیان لەو دەفتەرانەدا تەسجیل نەکراوە وە یا ئەوانەی کە حەقی رەئیان نیە و لەو دەفتەرەدا تەسجیل کراون، حاسلی ئەو شەخسانەی کە ئیعتیرازێکیان هەیە لە تاریخی تەعلیقەوە هەتا حەوت ڕۆژ ئەتوانن موراجەعەت بکەن بە هەیئەتی تەفتیشیە و ئیعتیرازەکەیان دەرمیان بکەن لە دوای ئەم مودەتە ئیعتیراز قبوڵ ناکرێ. بۆ ئاگاداری ئیعلان کرا. هەیئەتی تەفتیشیە" (ژیان، ژ 103، 23 ی شوباتی 1928).

### 2. 3. هەڵبژاردنی مونتەخیبی سانەوی

"هەواڵی داخلی

"ئینتیخابات

"بە موناسەبەتی تەواوبونی دەفتەری مونتەخیبە ئەوەڵەکان هەیئەتی شوعبەی ئینتیخابیەی سلێمانی و میعادی قانونیەوە، دەست کرا بە ئینتیخابی مونتەخیبە سانیەکانی ناوشار.

"لە گەڕەکی مەڵکەندی، جەنابان: حەمە ئاغای عەبدوڕەحمان ئاغا و، مەحمود ئەفەندی رەئیسی بەلەدیە و، میرزا ئەحمەدی حاجی قادر و،

"لە گەڕەکی گۆیژە، جەنابان: حاجی مستەفا پاشا و، حاجی ئیبراهیم ئاغا و، میرزا تۆفیق قەزاز و،

"لە گەڕەکی دەرگەزێن، جەنابان: حاجی مەلا محێدین ئەفەندی و، غالب ئاغا و، مەجید ئەفەندی و،

"لە گەڕەکی کانی ئاسکان، جەنابان: مەجید ئەفەندی حاجی رەسول ئاغا و، شێخ محەمەد ئەفەندی گوڵانی و، کەریم بەگی محەمەد فوئاد بەگ و،

"لە سەرشەقام، جەنابان: حاجی مەلا خالید و، مستەفا ئاغا و،

"لە چوارباغ، جەنابی: مەلا خالید ئەفەندی کوڕی مەحوی ئەفەندی و،

"لە جولەکان، جەنابی: ساڵح بنەشی.

"لە نەتیجەی ئینتیخاباتا بە مونتەخیبی سانیەتی ئینتیخاب کراون.

"وە دەست کراوە بە ئینتیخابی ناحیەکانی مەربوتی لیوایش لە نەتیجەدا ئەوانیش عەرز ئەکرێ." (ژیان، ژ 109، 12 ی نیسانی 1928).

"ئینتیخابات

"لە دوای تەواوبونی ئینتیخاباتی مونتەخیبە سانیەکانی ناوشار لە نەزارەتی ئەعزایانی هەیئەتی تەفتیشیەدا دەست کرا بە ئینتیخاباتی مونتەخیبی سانی ناحیەکانی مەربوتی سلێمانی. وە لە نەتیجەی ئینتیخاباتا:

"لە ناحیەی تانجەرۆدا، جەنابان: مودیر رەشید ئەفەندی غەفور، مەئمورمال قادر ئەفەندی، تەحسیلدار فایەق ئەفەندی، عەبدوڵا ناجی ئەفەندی، رەشید مەستی ئەفەندی، حاجی حەمەئاغا، حەمە رەشید ئەفەندی حاجی ئیبراهیم ئاغا، شێخ قادری عەتار، ئەحمەد بازیانی و،

"لە ناحیەی سەرچناردا، جەنابان: مودیر محەمەد فوئاد بەگ، ئەحمەد بەگ سەعید بەگ، عیزەت بەگ عوسمان پاشا، غەفور ئەحمەد و،

"لە ناحیەی قەرەداغ دا، جەنابان: سەعید ئاغای جەعفەران، شێخ سەعیدی تیمار، کوێخا نەجم زۆراب، رۆستەم عەبدولقادر، فەخری واسیف بەگ، شێخ نوری ئەفەندی شێخ بابا عەلی و،

"لە سورداشی جنوبیدا، جەنابان: مودیر شێخ یوسف ئەفەندی، حاجی ئەمین کاکەحەمە، جەلال سائیب ئەفەندی، تۆفیق فایەق... محەمەد بەگی حاجی رەسول بەگ، عەبدوڵا ئەفەندی کاتب... حاجی ئەحمەد و،

"لە سورداشی شیمالیدا، جەنابان: حاجی محەمەد ئەفەندی حاجی کەریم، محەمەد ساڵح بەگ، حەکیم حاجی فەرەج، عەزیز کوێخا ئەحمەد و،

"لە ناحیەی سرۆچک دا، جەنابان: عەزمی بەگی بابان، شێخ رەزای شێخ محەمەد، شێخ حسێن سەید ئەحمەد، شێخ عەبدولی شێخ عەلی، شێخ مەحمودی شێخ عەلی و،

"لە ناحیەی بازیان دا، جەنابان: مودیر فەقێ محەمەد ئاغا، میرزا مارف و، قادر ئەفەندی موهەندیس.

"لە تەرەف ئەهالیەوە بە مونتەخیبی سانی ئینتیخاب کراون." (ژیان، ژ 113، 10 ی مایسی 1928).

حکومەت بۆ ئەوەی ئەنجامی هەڵبژاردن مسۆگەر بکات و، ئـەو نائیبانـە دەربچێنـێ کـە خـۆی دیـاری کردون، هەمیشە هەوڵی داوە مونتەخیبی سانەوی لەوانە هەڵبژێردرێن کە گوێرایەڵی ئامۆژگاریەکانی حکومەت بون. وەکو لەم ناوانەدا دەرئەکەوێ ژمارەیەکی زۆری مونتەخیبە سانەویەکانی قەزا و ناحیـەکانی سـلێمانی، لـە دانیشتوانی ناوچەکە نین، بەڵکو موچەخۆرەکانی حکومەتن.

### 2. 4. هەڵبژاردنی مەبعوسەکان

"ئینتیخاب

"لە دوای تەواوبونی ئینتیخابی مونتەخیبە سانیەکانی لیوای سلێمانی ڕۆژی 9 ی 5 ی 28 لـە نەفسـی شار و لە هەمو مەرکەزی قەزای مولحەقەدا دەست کرا بە ئینتیخابی مەبعوسان. نەتیجە جەنابان: مەعالی ئەمین زەکی بەگ و، سەیفوڵا بەگ و، سەبری بەگی حاجی عەلی ئاغا و، محەمەد ساڵح بەگ، ئەکسـەریەتیان ئیحـراز کرد و بون بە مەبعوس. خوا لێیان موبارەک کا تەمەنای موەفەقیەت و خدمەتیان ئەکەین.

"لە نەتیجەی ئینتیخاباتی لیوای کەرکوک دا، جەنابان: مستەفا ئەفەندی یـەعقوبی زادە و، سـەعید ئەفەنـدی ئەهلی کفری و، حاجی عەلی قیردار و، محەمەد بەگی فەتاح بەگ، ئەکسەریەتیان ئیحراز کرد و بون بە مەبعوس.

"لە نەتیجەی ئینتیخاباتی لیوای هەولێردا، جەنابان: جەمال بـەگی بابـان، ئیسـماعیل بـەگی ڕەوانـدزی، مەعروف عەلی ئەسغەر ئەفەندی، داود بەگی حەیـدەری، عەبـدوڵا ئەفەنـدی مـوفتی، بـە ئەکسـەریەت بـون بـە مەبعوس.

"وە لەم خسوسەوە لە هەفتەی ئاتیدا موفەسەلەن موتالەعەی خۆمـان عـەرزی قـارئینی کیـرام ئەکـەین." (ژیان، ژ 114، 17 ی مایسی 1928).

### 2. 5. ئیجتیماعی مەجلیس

"هەواڵی داخلی

"ڕۆژی شەمەی 28/5/19 بە راسیمەیەکی موتەنتەن مەجلیسی مەبعوسان ئیجتیمـاعی کـردوە، لـە دوای خوێندنەوەی نوتقی ئیفتیتاحیەی جەلالەتی مەلیکی موعەزەم، یەک یەک معامەلـەی تەحلیفیـە مەبعوسـەکان ئیفـا کراوە و لە پاشا دەست کراوە بە ئینتیخابات بۆ رەئیس تەعین کردن نەتیجە بـە ئەکسـەریەتی ئـارا وەزیـری داخلیە مەعالی عەبدولعەزیز بەگی قەساب بە رەئیس و مەبعوسی هەولێر داود حەیدەری بەگ بە نائیبی رەئیس ئینتیخاب کراون." (ژیان، ژ 115، 24 ی مایسی 1928).

## 3. چاوەڕوانیەکانی ژیان

"لەمەولا ئومێدی قەویمان بە مەبعوسەکانمانە

"لە ئیجتیماعی دەورەی پێشودا بە ئەکسـەریەت میلـەت لـە وەکیلـەکانی رازی نـەبو و هـیچ ئومێـدێکی فەعالیەتیان لێ نەئەکرد. فەقەت ئەم ئینتیخابە لە هەمو جێگایەکا باخسوس لە ئەلویە و قەزاکانی کوردسـتان دا بە سورەتێکی باش نەتیجەی هات. ئەوانەی کە میلەت ئارەزوی ئەکردن ئەکسەریەتیان ئیحراز کرد و بـون بـە وەکیلی میلەت. چونکە هەمویان موجەڕەب، عالم، فازیل، وەتەنپەروەرن، ئومێدی قەویمان پێیانە. وە موحەقـەق حەسەبەل مەتلوب وەزیفەی مەودوعەی خۆیان بە جێ ئەهێنن و لە دەرەجەی ئیمکـان دا بـۆ تـەرەقی و تـەعالی میلەتی وەتەنەکە تێ ئەکۆشن و، بۆ خاتری ئەوانەیش کە نایانناسن بۆیان مەعلوم ببێ کە چ نەوعە زەواتـێکن یەکە یەکە لە ژێرەوە تەرجومەی حالیان عەرزی قارئینی کیرام کرا."

ئینجا دێتە سەر باسی ژیننامەی:

مەبعوسەکانی سلێمانی: ئەمین زەکی بەگ، محەمەد ساڵح بەگ، سەیفوڵا بەگ، سەبری بەگ.

مەبعوسەکانی هەولێر: جەمال بەگی بابان، ئیسماعیل بەگی رەواندزی، داود بەگی حەیدەری، مەعروف ئەفەندی عەلی ئەسغەر (مەعروف جیاوک)، عەبدوڵا ئەفەندی موفتی.

مەبعوسەکانی کەرکوک: حاجی عەلی ئەفەندی قیردار، مستەفا بەگ یەعقوبی زادە، سەعید ئەفەندی، محەمەد بەگی فەتاح بەگ.

مەبعوسی قەزا کوردەکانی مولحەقی موسڵ: حازم بەگ، هەیبەتوڵا ئەفەندی، شێخ عەبدوڵا ئەفەندی شێخ نور محەمەد.

لە کۆتایی وتارەکەدا نوسیوێتی:

"ئینجا کە تەرجومەی حالی وەکیلە خۆشەویستە تازەکانمان عەرزی قارئینی کیرام کرد، میلەت قەناعەتی کامیلەی هەیە کە بۆ ئەم دەورەی حازرەیە زەواتی موقتەدیری دۆزیوەتەوە و لە حوسنی ئینتیخاب دا ئیسابەتی کردوە. ئەمجا رجا و ئیستیرحامیان لێ ئەکەین کە ئیتر ئەبێ بۆ تەرەقی و تەعالی میلەتەکە لە دەرەجەی ئیمکان دا سەعی و جەهد بفەرمون و تەبیعی ئەوانیش ئەیزانن کە میلەت و وەتەنەکەمان چەند دواکەوتوە. لە خسوس مەعاریف، تیجارەت، سیحەت، رێگا، وەسائیتی نەقلیە، زەراعەت، سەنایع و گەلێ ئەسبابی تەرەقی ترەوە مەحرومین. بۆ ئیستیکمالی ئەم نەواقیسانە یەگانە ئەمەلمان ئیتر بەمانە. لە هەمو خسوسیاتێکمانەوە ئەمان مەسئولن و، فەریزەی زیمەتیانە واجیباتی مەودوعەی خۆیان بە جێ بهێنن و میلەت دوچاری ئینکیساری خەیاڵ نەکەن. ئیتر ئومێدی قەویمان هەر بەم زاتانەیە و هەر بەم دەورەیەیە. ئومێد ئەکەین شەو و رۆژ سەعیمان بۆ بکەن و بمانخەنە رێزەی دراوسێکانمانەوە. خوانەخواستە ئەگەر خدمەتمان نەکەن و وەزیفەی خۆیان بە جێ نەهێنن ئیتر ئەبێ میلەت قوڕ بکا بە سەری خۆیا دەستەونەژنۆ مەئیوس ببێ. لە بەر ئەوە دائیمەن ئینتیزاری جەهد و کۆششیان ئەکەین.

"خودا بە حوسنی نیەتەوە موەفەقیان کات و موقابیل بە میلەتەکە روسوریان کات." (ژیان، ژ 115، 24 ی مایسی 1928).

ژیان ئەم پەیامەی ئاڕاستەی مەبعوسەکان کردوە:

"بۆ وەکیلە موحتەرەمەکانمان

"ئەی وەکیلانی میلەت!

"ئەی ئەو زاتانەی کە موقەدەراتی میلەتێکیان تەودیع کراوە!

"ئەی ئەوانەی کە ئەم وەزیفە موقەدەسە، موهیمە، حەیاتیەیان قبوڵ کردوە!

"ئەی ئەو شەخسانەی میلەت موقابیل بە هەمو چاکەیەکیان تەقدیر و خراپەیەکیان مەسئولیان ئەکات!

"ئەی وەکیلە موحتەرەمە کوردەکان! ئەم خیتابەمان لە گەڵ ئێوەیە و ئەم هاوارەمان هەر موقابیل بە ئێوەیە.

"ئێمە نامانەوێ بەحسی دەورەکانی کە بکەین. لە دەورەکانی کەدا ئەوی ئیشێکی کردبێ و حسابێکی دابێ بە میلەتەکەی خۆی، هەر مەعالی ئەمین زەکی بەگی وەکیلی موحتەرەممان بو.

"بەڵام تو خودا: ئێوە هیچ بە عمومی زانیوتانە و لێکتان داوەتەوە کە چ وەزیفەیەکی موقەدەس و حەیاتیتان تەودیع کراوە و گرتوتانەتە ئەستۆی خۆتان؟ عەجەبا نازانن وەتەنەکەتان لە چ حاڵێکایە؟ غەیری حقوق، لە هەمو ئاسارێکی عیمران و تەرەقی، لە مەعاریف، صەنایع، تیجارەت، زەراعەت، ئیقتیصادیات دا چەند

مەحرومە؟ وە ئەگەر هەر وا بمێنێتەوە چەند مەحکومی مردنە؟ وە نازانن بۆ ئەوەی بژی، تەرەقی بکات، حقوقی چنگ کەوێ، هیوا و ئومێدی هەر بە ئێوەیە؟

"ئێوە ئەبێ بزانن کە ئینتیخاب کردەی میلەتێکی یەک ملیۆن نفوسیین و، لە دواتانەوە پشتیوانێکی موهیم و بە قوەتی وەکو ئەم میلەتە هەیە. وە ئەبێ بزانن و لە هەمو کەسێکی مەعلوم بکەن کە ئەمڕۆ لە مەجلیسی مەبعوسانی عیراقدا کۆمەڵێکی زۆر هەیە کە تەمسیلی شەعبێکی موهیمی وەکو کورد ئەکات.

"موقابیل بەم وەزیفە موهیمەیەتان و لە حاڵێکا کە ئەزانن میلەتەکەتان ئەمەندە دواکەوتوە و ئەبێ فەوقەلحەد سەعی بۆ بکرێت، کەچی مەعەلئەسەف هەتاکو ئێستا نە لە مەجلیس دا و نە لە خاریجەوە بە نەشریات و تەشەبوسات کەس خدمەتێکی لە ئێوە نەدی و فەعالیەتێکتان نەنواند و تەئمینی یەکێ لە مەقاصیدی میلەتتان نەکرد.

"ئیستیرحام ئەکەین ئەم مەعروزاتەمان بە شتێکی خراپ تەلەقی نەکەن و بزانن ئیتر میلەت بە بەریەوە نەماوە و لە تاوانا هاوار ئەکات و لە ئێوە زیاتر کەسێکی کە شک نابات.

"ئیتر ئەبێ لە نەزەر میلەتەکەدا خۆتان روسور بکەن وە با دائیمەن میلەت بە موقەدەسی ناوتان ببات و ئیسمتان بە شەرەفەوە بە زەڕکەفتی ئاڵتون بنوسرێ. ئەبێ ئەمجارە بە قەتعی بە ئیتیفاق و یەکزبانیەوە بۆ ئەم میلەتە مەزڵومەتان سەعی و هیمەت بفەرمون.

"بۆ ئەوەی لە گەڵ میلەتی عەرەب و حکومەتی عیراق وەکو برا بژین بە قەدەری ئیمکان بۆ ئیکمالی نەواقیصاتمان و بۆ تەئمینی ئەسبابی تەرەقیمان هەوڵ بفەرمون.

"ئیتر دیسانەوە رجا ئەکەین بۆ ئەوەی قسەی ئەم لا و ئەو لا ببڕێ و کەس حەقی گوتنی نەمێنێ، بۆ ئەوەی لە نەزەر میلەتەکەدا هەر یەکێکتان مەوقیعێکی عالیتان ببێ، ئەبێ لەمەودوا هەمو وەقتێک لە مەجلیس دا فەعالیەتی ئێوە ببینن." (ژیان، ژ 164، 4 ی نیسانی 1929).

## 4. داواکاری مەبعوسەکان

### 4. 1. دەبارەی مەعاریف

"سورەت و تەرجومەی تەقریرێکی مەبعوسە موحتەرەمەکانی کوردە کە لە خسوس مەعاریفەوە داویانە بە وەزارەتی مەعاریف:

"بۆ وەزارەتی جەلیلەی مەعاریف

"لە فەخامەتتانەوە مەعلومە کە جیهەتی شیمال لە خسوس عەلاقاتی سیاسیە و ئیقتیسادیەوە لە ناو حکومەتە گەنجە تازە پێگەیشتوەکەمانا ئەهمیەتێکی گەورەی هەیە، لە بەر ئەمە لازمە ئیزالەی هەمو مەوانیعێک بکرێ لە خسوس نەشری مەعاریفەوە، وە ئەو شتانەی کە جەهل لائەبات پێویستە ئیکمال بکرێ.

"چونکە لە مەنتیقەی شیمالا مەعاریف زۆر سست ئەڕوا و زۆر دواکەوتوە لازمە بۆ ئەوەی دەرەجەی مەتلوبە بگەیەنرێ معاوەنەتی بکرێ بە نەوعێک مساوی بێ بە مەنتیقەکانی تری عیراق.

"ئەو سەبەبانەی کە مەعاریفی ئەم مەنتیقەیەی دواخستوە ئەمانەن:

1. نەبونی کتێبانی تەرجومەکراو بە کوردی کە لیسانی تەدریسیەی ئەو مەنتیقەیە و عیبارەتە لە چەند لیوا و قەزایەکی موهیم کە تول و عورزی لە زاخۆوەیە هەتاکو پێنجوین و خانەقین و بەدرە.

2. کەمێتی موعەلیم لەو مەنتیقەیەدا.

3. بۆ ئەوەی ئیرشاد و موراقەبەیەکی تەواوی موعەلیمەکان و مەکتەب بکات و تەرەقی و تەعمیمی مەعاریف بکات و لە سەر یەک رێ و یەک پرۆغرام تەدریس و تەدەروسیان پێ بکات بۆ ئەم مەنتیقەیە مودیرێکی مەعاریف نیە.

4. لەم مەنتیقەیەدا مەکتەبێکی موکەمەلی سانەوی نیە کە ببێ بە کەفیل و بە واسیتەی تەواوکردنی ئەو عیلمانەی کە تەلەبەکان لە مەکاتیبی ئیبتیدائیەدا خوێندویانە و، بۆ ئەوەی کە لە وێدا لەزەت لە خوێندن وەرگرن و عیلمێکی چاک فێری تەلەبەکان بکرێت بە نەوعێک کە بتوانن بچنە مەکاتیبی عالیەوە.

5. ئەم مەنتیقەیە مەحرومە لە مەکتەبێکی دارولموعەلیمین کە مەوجودیەتی ئەلزەمە و یەگانە واسیتەیە بۆ ئەوەی موعەلیمی موقتەدیر پێ بگەیەنێ کە بتوانن چاک بە کوردی تەدریس بکەن.

6. لە بەر فەقیری ئەهالی ئەو مەنتیقەیە ناتوانن و مومکینیان نابێ ئەولادەکانیان بۆ ئیکمالی تەحسیلی سانەوی و عالی بنێرن بۆ مەرکەزی حکومەت.

7. زۆر ئەسبابی تر هەیە کە بوە بە سەبەبی ئەوە کە ئەبەوەینەکان ئیهتیمام ناکەن بۆ ئەوەی ئەولادەکانیان بنێرنە مەکتەب. ئەو رێیەی کە لازمە لە خسوس نەشری مەعاریفەوە تەبەعیەتی بکرێ ئەوەیە کە ئەو نوقسانیەتەی و ئەو سستیەی لە خسوس مەعاریفەوە هەیە و زیهنی ئەهالیەکەی ئیشغال کردوە کە ئیهتیمام بە مەعاریف ناکەن لازمە لابرێ، کە ئەمانەن:

1. تەشکیلی (لیجنەیەکی تەرجەمە و تەئلیف) کە ئەعزاکانی لە عالم و منەوەرە مونتەخەبەکانی کوردەکان بێ، کە موافیقی پرۆغرامی مەعاریف کتێب تەئلیف و تەرجەمە بکەن. وە ئیعتیقادمان وایە کە ئەم لیجنەیە ئیشەکانیان زۆر چاک و بە تەواوی بە جێ ئەهێنن. وەزارەتی مەعاریف بۆ ئەم خسوسە مەساریفێکی زۆری ئەبێ و ئەگەر وەزارەتی مەعاریف لە حالی حازردا مەعزور بو لە تەشکیل کردنی ئەو لیجنەیە کە زۆر پێویستە بۆ لابردنی تەزەبزوب هیچ نەبێ رجا ئەکەین رەسمەن ئیعلانی بکات کە ئەو کەسانەی موافیقی پرۆغرامی مەعاریف کتێبێک تەرجەمە وە یا تەئلیف ئەکەن بە نیسبەت چاکیی کتێبەکەیانەوە ئیکرامیەیەکی ئەدرێتێ کە ئەقەلەن لە 500 روپیە کەمتر نەبێ و، ئەگەر ئەم مەسئەلەیە تەرک بکرێ بۆ تەشەبوسی شەخسی جوان نابێ، چونکە ئەمە لە میلەتێکا ئەکرێ کە لە ناویانا عیلم موتەرەقی بێ و قەدری مەعاریف بزانن. وە ئەگەر مەعاریف ئەم مەسئەلەیە بۆ تەشەبوسی شەخسی تەرک بکات باوەڕ ناکەین هیچ کەسێک لە خۆیەوە ئەم خدمەتە بکات چونکە بۆ خۆی ئینتیفاعێکی مادی و زەروری تیا نابینێ.

2. بۆ ئەوەی موعەلیمی موقتەدیر، عالم بۆ سینفە سانەویەکان چنگ بکەوێ لازمە وەزارەتی مەعاریف لە خسوس زیادی معاشەوە ئیهتیمام بکات، چونکە ئیعتیقادمان هەیە کە پیاوی زۆر موقتەدیر، عالم هەیە لە وڵاتەکەمانا فەقەت لە بەر معاش کەمی ئینتیساب ناکەن بە مەعاریفەوە.

3. لازمە دائیرەیەکی مەعاریف لەم مەنتیقەیەدا تەشکیل بکرێ بە شەرتێک مەرکەزەکەی لە وەسەتی ئەم مەنتیقەیەدا بێ کە بتوانێ موراقەبەی هەمو مەکتەبەکان بکات و لازمە مودیرێکی وای بۆ تەعین بکرێ کە لە مەداریسی عالیە دەرچوبێ کە موقتەدیر بێ حالەتی مەعاریفی بگەیەنێ بە حەدێکی مەتلوبە. وە بونی ئەم دائیرەیەیش زەروریە بۆ نەشری عیلم و مەعریفەت و، حکومەت لە تەشکیل کردنی ئەم دائیرەیە مەسرەفێکی زۆری نابێ بە نیسبەت ئێستاوە کە بۆ تەفتیش و موراقەبەی لیوای سلێمانی و کەرکوکی داوە بە بەغداد هەولێر و ئەقزیەکانی شیمال وەکو زاخۆ، دهۆک، عیمادیە، عەقرە... ی داوە بە موصل. لەمەدا هەم لە خسوس مەعاریفەوە و هەم لە خسوس تەدریساتەوە خراپە چونکە تابیعی مەنتیقەیک نین تەدریسیان وەکو یەک نابێ و غەیری ئەمیش چونکە موفەتیشین و مودیرینی ئەم مەنتیقانە کوردی نازانن هیچ فائیدەیەکیان لێ حاسل نابێ.

4. ئیکمال و تەنزیمی مەکاتیبی سانەوی بە سورەتێکی وا کە حەسەبەل مەتلوب تەکەفولی تەربیەی تەلەبەکان بکات و ئیحتیاجیاتیان دەفع بکات. ئەمما لە خسوس ئەو مەحزورەوە کە تەلەبەکان چونکە بە عەرەبی ناخوێنن لە مەکاتیبی عالیەدا موشکیلات ئەبینن ئەمیش راست نیە چونکە ئەم مەحزورە بە زیادکردنی ئەوقاتی تەدریسیەی دەرسی عەرەبی لە سینفە سانەویەکانا لائەچێت.

5. کردنەوەی مەکتەبێکی دارولموعەلیمین بۆ ئەوەی ئیحزاری موعـەلیمی موقتـەدیری چـاک بکـات کـە بتوانن لە سەر ئوسولی تازە و موافیقی مەتلوب تەلەبەکان پێ بگەیەنن.

6. کردنەوەی مەکاتیبی کچان.

7. هەر وەقتێک مەکتەبەکان و مەعاریفی ئەم مەنتیقەیە بەم نەوعە کە عـەرزمان کـرد تـەنزیم کـرا ئـەو وەقتە ئەبەوەینەکان شەوقیان ئەبێ کە منالەکانیان بنێرنە مەکتەب بۆ تەحسیل.

ئینجا ئستیرحام لە وەزارەتی مەعاریف ئەکەین کە ئیهتیمامێکی کافی و تەواو بەم مەعروزاتەمان بکـات و لەم ساڵەوە دەست بکا بەم ئیسلاحاتە مەتلوبە و قەتعیـە و ئیزالـەی هـەمو مـەوانیعێک بکـات کـە ئـەبێ بـە سەبەبی عەدەم تەرەقی مەعاریفی ئەم مەنتیقەیە و ئێمەیش پێشەکی تەشەکوری ئەکەین.

بەغداد 1 ی حوزەیرانی 1928

مەعروف جیاووک نائیبی ئەربیل، ئیسماعیل ڕەواندزی نائیبی ئەربیل، محەمەد ساڵح نـائیبی سـلێمانی، محەمەد جاف نائیبی کەرکوک، سەبری نائیبی سلێمانی، عەبدوڵا موفتی نائیبی ئـەربیل، جـەمال بابـان نـائیبی ئەربیل، سەیفوڵا نـائیبی سـلێمانی، محەمـەد سـەعید نـائیبی کـەرکوک." (ژیـان، ژ 118، 21 ی حـوزەیرانی 1928).

ژیان لە ژێر ئەم یادداشتەدا نوسیویێتی:

"بـۆ ئـەوەی فەعالیـەت و ئیقتیـداری مەبعوسـە موحتەرەمـەکانمان لـە میلـەت بگەیـەنین، ئـەو عـەزم و تەشەبوساتەی کە بەم مودەتە کەمە لە خسوس مەعاریفی وڵاتەکەمانەوە کردویانە عەرزی قارئینی کیرام کرا."

لە پاش ستایشی ئەمین زەکی ئینجا ئەنوسێ:

"تەبیعی لەم دەورەیەدا چونکە مەبعوسەکانی تریشمان هـەمو موقتـەدیر و فـەعالن لـە ئێسـتاوە سـەعی خۆیان پیشانی میلەتەکە دا ئومێد ئەکەین ئیتر بە سەبەبی فەعالیەت و عەزمی میلەتپەروەرانەیانەوە ڕۆژ بە ڕۆژ بەرەو تەرەقی برۆین و ئیستیرحام ئەکەین بۆ خاتری قەتعی موەفەقیەت بکـرێ تەشـریکی مەسـاعی بکـەن و دەست لە ناو دەستی یەکتری بۆ بە جێ هێنانی هەمو ئامالێکی میلەتەکـە بـەزلی مەسـاعی و هیمـەت بفـەرمون چونکە لەم عەسرەدا هەمو شتێک بە یەکبونی ئەفکار و تەوحیدی مەساعیەوە پێک دێت. ئیتر دائیمەن تەمـەنای موەفەقیەت و ئینتیزاری مەساعی حەسەنەیان ئەکەین خوا تۆفیقیان بدات."

### 4. 2. ویستنێکی مەشروع

لە ژ 166 ی 11 ی نیسانی 1929 دا بە ناونیشانی (ویستنێکی مەشروع)، دەقی یادداشـتی هەنـدێ لـە مەبعوسـەکانی کـوردی بـڵاو کردۆتـەوە سـەبارەت بـە هەنـدێ مـافی نەتـەوەیی کـورد، ئەمـە بـە لوتکـەی چالاکی‌یەکانیان دائەنرێ. لێرەدا لایەنی کەمی خواستەکانی گەلی کوردیان پشت ئەستور بـە بیـانوی قـانونی، بەڕێوەبەرایەتی، ئابوری، پەروەردەیی... دیاری کردوە و، داوایان لە کاربەدەستانی عیـراق و بریتـانی کـردوە، بۆ قازانجی عیراق و کورد جێبەجێی بکەن:

ژیان لە پێشەکی یادداشتەکەدا نوسیویێتی:

"بۆ تەلەبی تەتبیقی ئەو ئیمتیازەی کە هەیئەتی عالی عیصبەتول ئومـەم لـە حـەلی ولایـەتی موصـلا بـە کوردەکانیان بەخشیوەو بۆ ئەوەی ئەم حقوقە و ئەم ئیمتیازە بە تەواوی لە هەمو موحیتی کوردسـتانا تـەتبیق بکرێ لە 4 ی ئەم مانگەدا لە تەرەف مەبعوسە موحتەرەمە کوردەکانەوە تەقریرێک تەقدیمی ڕەئیسـەل وزەرای عیراق و فەخامەتی مەندوبی سامی کراوە، بۆ ئەوەی هەمو کوردەکان لەم مەسئەلەیە حاڵی ببن صورەتێکی‌یشی بۆ دەرجی لە غەزەتەدا بۆ ئیدارەخانەی ژیان نێردراوە.

"وا صورەتی ئەو موتالەبەیەی کە وەکیلە موحتەرەمە خۆشەویستە بە قیمەتەکانمان تەلـەبیان کـردوە بـە تەرجومە کراوی نەشر کرا. وە دەرەجەی حسیات و مەسروریەتی میلەتەکـەیش بەرامبـەر بـەم فەعالیەتـەی کـە وەکیلـە خۆشەویسـتەکانمان بـۆ محافـەزەی حقـوق و بـۆ بەرزبونـەوەی وڵات و میلەتەکـەمان کردویانـە بـە موفەصەلی عەرز ئەکرێ."

ئینجا دەقی یادداشتەکەی نوسیوەتەوە:

"فەخامەتی رەئیسەل وزەرای عیراق

"صورەتێکی بۆ فەخامەتی مەندوبی سامی عیراق

"لەو وەقتەدا کە لیجنـەی عیسـبەتول ئومـەم خـەریکی حـەلی مەسـئەلەی موسـڵ بـو، لـە تەقریرەکـەیانا تەوسیەیان کرد بو بۆ دانی بەعزێ ئیمتیازاتی ئیداری بە میلەتی کورد.

"لە خسوس ئیدارەیانەوە و بۆ تەئمینی مەسالیحیان سەلاحیەت و حورپـەتێکی کامیلیـان پـێ بەخشـی بون، بەڵام مەعەلئەسەف ئەم ئیمتیازاتە کـە لازم بـو لـە عمـومی کوردسـتانا تـەتبیق بکـرێ، هـەر مونحەسـیر کراوەتە سەر لیوای سلێمانی و هەولێر و ئەم رێیەی لە خسوس تەتبیقی ئەم ئیمتیازەوە حـالی حـازر گیـراوە، فائیدەیەکی علمی، ئیقتیسادی و ئیدارەیەکی باش، کە رەغبەتیان لە سەری بێ بە کوردەکان نابەخشێ.

"وە مەعلومە ئەم ئوسولە و ئەم رێیەی کە ئێستا بـۆ تـەتبیقی ئـەم ئیمتیـازە گیـراوە و حکومـەت زۆر سعوباتی تیا ئەکێشێ، نەتیجە فائیدەیەکی باشیشی نابێ بۆ کوردەکان.

"کەواتە لازمە بۆ تەتبیقی ئەم ئیمتیازە تەشکیلاتێکی عمومی و واسیعتر بکرێ کە زیاتر مولائیم بێ بۆ حقوقی کوردەکان، ئەو وەقتە بە تەبیعی ئەم بارە قورسەیش لە سەر شانی حکومەت سوک ئەبێتەوە.

"بە قەلبێکی سەمیمیەوە ئیستیرحام ئەکـەین تەماشـای مەتالیبـەکانی خوارومـان بکـەن و، بـە عەجەلـە تەوەسول و سەلاحیەت بدەن بۆ ئەم تەشکیلاتە مەتلوبە موسیبەیە.

1. لە فەخامەتتانەوە مەخفی نیە کە لیوای موسڵ لە وەزعیەتی حـازرەیدا عیبارەتـە لـە 24 ناحیـە و 9 قەزا و ئەم قەزایانەیش ئەمانەن: شێخان، عەقرە، زێبار، عەمادیـە، زاخـۆ، دهـۆک، تەلەعفـەر، سـنجار و نەفسـی قەزای موسڵ. وە ئەگەر بڵێین ئەکسەریەتی عەشایەر و ئەهالی ئەم قەزایانە موافیقی لوغەت، تـاریخ و عادەتیـان کوردن شتێکی تازە ناڵێین و، ئەو خەریتەیەی کە لیجنەی عیسبەتول ئومەم لە سەر ئەساسـێکی جنسـیەت لـەم خسوسەوە رەسمی کردوە لە بەر چاومانە و بە ئاشکرا ئیسپات و ئیزاحی ئەمە ئەکات.

"غەیری ئەمەیش جدەن زۆر زەحمەتە بۆ موتەسەریفی لیوای موسڵ کـە دائیمـەن لـە نـاو ئـەم مەنتیقـە واسیعەدا بگەڕێ و ئاگاهداری هەمو ئەحوالی ئەهالیەکە بێ و، دیسانەوە بۆ ئـەهالیش زۆر زەحمەتـە کـە بـۆ ئیشی حکومەتیان دائیمەن بێنە مەرکەزی لیوا و، لە بەر رێ دوری و لە بەر ئەوەی کە لە زبانی کـوردی زیـاتر لیسانێکی کە نازانن و، لە بەر ئەوەی کە وەزعیەتی مالیەیشیان موساعید نیە، لـە بـەر ئـەوە ئیقتیـراح ئەکـەین تەشکیلی لیوایەکی کوردی بکەن کە مەرکەزەکەی دهۆک بێ و بە لیـوای دهـۆک نـاو ببـرێ و، قـەزای عـەقرە، زێبار، عەمادیە، زاخۆ، مولحەقی ئەم لیوایە بن و تەشکیلاتی ئەم لیوایەش بە پێی تەشکیلاتی لیواکانی ئێسـتای شیمال بێ و، معامەلاتی رەسمیەیان بێ بە کوردی.

2. وە لە فەخامەتتانەوە مەخفی نیە کە موازەنە و مقیاسی میلەتێک هەر مەعاریفە و هەر مەعاریف ژیـن و سەعادەت و ئیستیقبالی میلەتێک تەئمین ئەکات. وە عەکسی ئەمە ئەگەر میلـەتێ مـەعاریفی نـەبێ مـەحکومی مردن و زیلەتە و، ئەگەر بە مونسیفانە تەماشـای وەزعیـەتی مـەعاریفی لیـوا کوردیـەکان بکـەین و لـە گـەڵ مەعاریفی مەنتیقەکانی کەدا موقایەسەی بکـەین موتەئەسـیفانە چاومـان پـێ ئەکـەوێ کـە مـەعاریفی مەنتیقـەی کوردسـتان بـە دەرەجەیـەک دواکـەوتوە کـە ئینسـان موتەئەسـیر ئـەکات. وە وا ئـەزانین ئـەم دواکەوتنـەی

مەعاریفیش هەر لە بەر ئەوەیە کە مەربوتی مودیریەتی عمومیە لە بەغداد کە هیچ ئیهتیمـام ناکـات بـۆ ئیکمـالی ئەو واسیتانەی کە مەعاریفی ئەم مەملەکەتەی پێ تەرەقی ئەکات. وە غەیری ئەمیش ئەسبابێکی تری هەیە کە بە نیسبەتی سەدەوە میقدارێکی زۆر کەمی بـۆ مەسـاریفی کوردسـتان سـەرف ئـەکرێت و ئیهتیمـام ناکرێـت بـە تەرجومە و تەئلیفی کتێبان.

"لە بەر ئەوە ئیقتیراحیش ئەکەین کە بۆ مەعاریفی ئەم لیـوا کوردانـە مودیریـەتێکی مـەعاریف تـەعین بکرێ کە مودیرەکەی کوردێک بێ و مەرکەزەکەیشی لە یەکێ لەم لیوا کوردییانەدا بێ.

"تەوحیدی ئیدارەی چوار لیوا کوردەکە بکرێت کە سلێمانی، کەرکوک، هەولێر و دهۆکە. وە بـۆ ئەمانـە تشکیلی موفەتیشیەتێکی عام بکرێت کە رەئیسەکەیان یەکێ بێ لە کوردەکان کە ئیقتیداری کیفایـەتی بـۆ ئـەم وەزیفەیە مەعلوم بێ کە موراقەبەی هەمو ئیشوکاری ئەم لیوایانە بکات و موتەسەڕیفی لیواکانیش موراجەعـەتی پێ بکەن و، سەلاحیەتێکی تەواویشی بدرێتێ و مەربوتی پایتەختی حکومەتی عیراق بێ و، لە لیـوا کوردەکانـا تەمسیلی هەمو وەزارەتەکان بکات. وە بۆ ئوموری مالیە، ئیقتیسادیە، سـیحیە، عەدلیـەیش هەیئـەتێکی لـە ژێـر دەستا بێ بۆ ئیستیشارە.

4. تەلەب لە حکومەت ئەکەین کە سەعی بکات بۆ تەعدیلی بەعزێ مەواد لە قەوانینی عیراق دا، ئەوانـەی کە ئەزانرێ بە نەزەری وەزعیەتی جوغرافیای ئەو مەنتیقەیەوە بۆ حقـوقی ئەهالیەکـەی موسـاعید نیـە تـەتبیق بکرێ و ئیقتیراح ئەکەین تەتبیقی مەوادی قانونی ئەرازی بکەن بە سورەتێک کە دائیرەی تاپۆ بە حەقی قەرار بتوانێ تەسجیلی ئەرازیـیان بۆ بکات بۆ مودەتێک کە لە دو ساڵ کەمتر نەبێ بۆ ئەوەی کـە تەسـهیلاتێک بـێ بۆ مەسالیحی ئەهالیەکە و تەشجیعیشیان بکات کە بۆ تەسجیلی ئەرازیەکانیان تەشەبوس بکەن بە مەجانی.

5. ئیقتیراح ئەکەین بودجەی عمومی ئەم مەملەکەتە مەنتیقەیە موافیقی نیسـبەتی لای خـوارەوە سـەرف بکرێ. لە میزانیەی عمومی ئەو مەبلەغەی کە بۆ دەوائیری مەرکەزیـە تەخسـیس ئـەکرێ لـێی تـەنزیل بکـرێ باقیەکەی تری مساواتەن، یا بە نیسبەتی نفوس، وە یا بە پێی واریداتیان، بـە سـەر لیواکـانی کـەدا تەقسـیم بکرێ و، لازمە مەسئەلەی گومرگی عمومییش بە نەزەرێکی دیقەت بگیرێ.

ئەی فەخامەتمەئاب! لە گەڵ ئەو حسیاتە چاکەی ئێمـە هەمانـە بەرامبـەر بـە حکومـەت هـیچ مانعێـک نابینین بە ئیحتیرامەوە مەتالیبی میلەتەکەمان تەقدیمتان بکەین بە سیفەتێک کە رەئیسی حکومەتەکەن و، رجـا ئەکەین ئەم مەتالیبە بە نەزەرێکی دیقەت تەحقیق بفەرمون کە چەند بۆ زەراعەت و تەرەقی ئـەرازی و تـوروقی مواسەلاتمان چاکە و، لە تەتبیقا چەند ئیدارەمان تەوسیع و وەزعیشـمان چـاک ئـەکات. ئێمـە غـەیری شـتێک نەبێ، کە تەتبیقی زۆر باش و مومکینە، تەلەبێکی تر ناکەین کـە بـۆ حاڵـەت و وەزعیـەتی مالیـە و سیاسـیەی عیراق خراپ بێت.

دیسانەوە تەعزیماتی فائیقەمان تەقدیم ئەکەین.

ئیسماعیل نائیبی هەولێر. جەمال کەزا (مەبەست ئەویش نائیبی هـەولێرە. نـم)، محەمـەد سـاڵح نـائیبی سلێمانی. سەیفوڵا نائیبی سلێمانی. حازم نائیبی موسڵ. محەمەد جاف نائیبی کەرکوک."

لە پەراوێزی ئەم یادداشتەدا پێویستە چەند تێبینییەک تۆمار بکرێ:

**یەکەمیان،**

ئەم یادداشتە ئیمزای هەمو مەبعوسە کوردەکانی پێوە نیە. لە مەبعوسەکانی سلێمانی: ئەمین زەکی بەگ و صەبری حاجی عەلی ئاغا، لە مەبعوسەکانی هەولێر: داود حەیدەری و مەعروف جیاوک و عەبـدوڵا مـوفتی، لە مەبعوسەکانی کەرکوک: حاجی عەلی قیـردار و مسـتەفا یـەعقوبی (ئـەم دوانـە تورکومـان بـون) و سـەعید

ئەفەندی (مەبعوسی کفری)، لە مەبعوسەکانی بادینان: هەیبەتولا ئەفەندی و عەبدولا نور محەمەد، ئیمزایان نەکردوە. بۆچی ئیمزایان نەکردوە؟ بۆ وەلامدانەوەی ئەم پرسیارە پێویستە لێکۆڵەر بگەڕێتەوە بۆ فایلە نهێنیەکانی ئەو سەردەمەی عیراق و بریتانیا.

**دوەمیان،**

لەم یاداشتەدا داوای جیاکردنەوە و یەکخستنی قەزا و ناحیە کوردنشینەکانی موسڵ و دروستکردنی لیوایەکی تازە بە ناوی (لیوای دهۆک) هەوە کراوە، بەلام هەندێ ناوچەی لێ دەرهێنراوە.

**سێیەمیان،**

لەو سەردەمەدا چالاکەکانی کورد داوای دروستکردنی لیوایەکی تریشیان کردوە لە قەزا و ناحیە کوردنشینەکانی جنوبی عیراق، کە بەشێ بون لە لیواکانی بەغداد و عەمارە وەکو کفری، خانەقین، مەندەلی، بەلام لەم یاداشتەدا باس نەکراوە. مەعروف جیاوک ئەم باسەی کردۆتەوە:

"سوئالی مەبعوسی هەولێر حەزرەتی مەعروف بەگ جیاوک

"بەغداد: وەقتی خۆی مەبعوسی موحتەرەمی هەولێر مەعروف بەگ جیاوک بەرامبەر بە وەزارەتی داخلیە ئیقتیراحێکی کرد بو کە حکومەت پێویستە دو لیوای تازە ئیحداس بکا یەکێکیان بە ناوی دهۆکەوە و ئەوی تریان بە ناوی باجەلانەوە. لە بەر ئەوە مەعلوم نەبوە حکومەت چ قەرارێکی داوە دیسانەوە پرسیاری لە وەزارەتی داخلیە کردوە." (ژیان، ژ 223، 16 ی کانونی سانی 1930).

**چوارەمیان،**

ئەم داواکارییانە ئەگەر لە کاتی خۆیدا جێبەجێ بکرایە لەوانە بو زۆر لەو گیروگرفتانەی بە درێژایی مێژوی عیراق لە نێوان بزوتنەوەی نەتەوەیی کورد و حکومەتی عیراق دا رویان داوە، نەقەومانایە.

حکومەتی عیراق لە 1969 دا قبوڵی کرد لیوای دهۆک دروست بکرێ، ئەویش بە ناتەواوی و دوای ئەوەی زۆر جێگەی کوردنشینی لێ دەرهێنا و، هەندێکی تەعریب کرد. لیوای باجەلان، نەک هەر دروست نەکرا، بەڵکو زۆری ئەو ناوچانە بە تەواوی تەعریب کران، هەمو کوردەکانیان لێ دەر کرد و عەرەبیان هێنایە شوێنەکانیان.

ساڵی 1970 دوای داننان بە مافی نەتەوەیی کوردا لە سەر بنچینەی ئۆتۆنۆمی هەندێ لەم داواکارییانە بە نیوەوناچڵ سەلمێنرا. سلێمانی و هەولێر و دهۆک لە یەکەیەکی بە ناو ئۆتۆنۆم دا یەکخران، بەلام کەرکوک و زۆر لە ناوچە کوردنشینەکانی موسڵ و جنوبی عیراقی لێ دەرهێنرا. مەجلیسێکی تەشریعی و مەجلیسێکی تەنفیزییان بۆ ناوچەی ئۆتۆنۆم دروست کرد. کورد بە گشتی بەم کارانە رازی نەبو، چونکە ئەمانەیان بە شێواندنی مافەکانیان دانا نەک بە سەلماندنی.

## 4. 3. هەوڵی یەکتەنی ئەمین زەکی

ئەمین زەکی کە لەم دەورەیە و لە دەورەی پێشودا مەبعوسی سلێمانی بوە چەند جارێ بۆتە وەزیری مەعاریف و ئەشغال و مواسەلات. لە گەڵ ئەوە یشدا هەندێ هەوڵی یەکتەنی داوە. بە تایبەتی بۆ کاروباری خوێندن و پەروەردە و کردنەوەی رێگاوبان. هەوڵەکانی خۆی لە دەورەی یەکەمدا لە نامیلکەیەکی سەربەخۆدا بە ناونیشانی (محاسەبەی نیابەت) چاپ و بلاو کردۆتەوە. لەم دەورەیەشدا دو تەقریری داوە بە مەجلیس و (بەیانات) ێکی درێژی لە مەجلیسدا داوە. ژیان پوختەی هەردو تەقریر و، دەقی بەیاناتەکەی بلاو کردۆتەوە:

خۆلاسەی دو تەقریر

"خۆلاسەیەکی دو تەقریری مەبعوسی موحتەرەمی سلێمانی مەعالی ئەمین زەکی بەگە کە تەقدیمی مەجلیسی عالی مەبعوسانی کردوە لە خسوس: مەعاریفی کوردستان و، تەشکیلی لیجنەیەکی عیلمی بۆ تەئلیف و تەرجومەی کتێبانی تەدریسیەی کوردی و، بۆ ئیحداس و تەشکیلی مودیریەتێکی مەعاریف و، تەعینی موفەتیشینی کورد بۆ مەنتیقەی کوردەکان.

"خۆلاسەی تەقریری ئەوەل:

"لە لیوای موصل، هەولێر، کەرکوک و سلێمانی دا حالی حازر 38 مەکتەبی کوردی تیا مەوجودە. لە مەکاتیبی ئیبتیدائی، سانەوی کوردەکانا لە سەر مینهاجی رەسمی مەعاریف بۆ 58 مەوزوع، کە مەجبورن تەدریسی بکەن، تەنها بۆ دەرسێکیان کتێبی کوردی هەیە. بۆ مەوزوعەکانی کە، چونکە کتێب نیە، تەلەبەکان مەجبورن نۆت بگرن و لە سەر ئەو نۆتانە مەحکومی سەعی کردنن. لاکین لە سینفی ئەوەلیەکانا، چونکە تەلەبەکان بە تەواوی ناتوانن بنوسن، مومکینیان نابێ نۆتێکی سەحیح بگرن و لە خاریجی ئیمکانیانایە، لە غەیری ئەوەی کە بە غەڵەت و بە عەجەلە دەفتەرەکانیان رەش و پڕ بکەنەوە، ناتوانن سەعیەکی تر بکەن، لە بەر ئەمە زیهنیان بە مەعلوماتی غەیرسەحیحە ئیشغال و مانگو ئەکرێ. هیچ ویجدانێک قبوڵی ناکات ئەم تەلەبانە کە ئومێدی ئیستیقبالی کوردەکانن بە مەعلوماتی غەیرسەحیحە زیهن و دەماغیان مشەوەش و زەهراوی بکرێ.

"مەجبورین ئەم مەکتەبانەی کە کراونەتەوە بیکەین بە موئەسەسەیەکی مەعریفەت، بە وەسائیتی تەدریسیەی چاک مادەتەن وە مەعنەن تەجهیزیان بکەین. لە بەر ئەمە ئیستیرحام ئەکەم بۆ ئەوەی دەستبەجێ دەست بکەن بە تەرجومە و تەئلیف، بە عەجەلە (لیجنەیەکی دائیمی) تەشکیل و لە کوردە منەوەرە موقتەدیرەکانی ئێرە ئەعزای بۆ تەعین بکەن."

"خۆلاسەی تەقریری دوەم:

"ئەو مەکتەبانەی کە لە لیوای سلێمانی، کەرکوک، هەولێردا مەوجودن قیسمێکیان لە تەرەف مودیریەتی مەنتیقەی موصل و قیسمێکیان لە تەرەف مودیریەتی مەنتیقەی بەغدادەوە ئیدارە ئەکرێن. لە بەر ئەمەی کە مودیری هەردو مەنتیقەکان کوردی نازانن و عادەتەن بێگانەن بەم لیسانە ناتوانن تەفتیش و موراقەبەی مەکتەبەکان بکەن و، لە قودرەتی تەدریسیەی موعەلیمەکان تێ ناگەن و بە تەواوی عاجزن کە ئیسلاحی تەرزی جەرەیانی ئوسولی تەدریسیەی مەکتەبەکان بکەن. لە بەر ئەم وەزعیەتە چونکە مەکتەبە کوردیەکان لە موراقەبە و نەزارەتێکی موتەمادی مەحرومن و نەتیجە بوە بە سەبەبی عەدەم تەرەقی و تەکامولیان. لە بەر ئەوە تەلەب ئەکەم ئەو مودیریەتی مەنتیقەی کە دوسێ ساڵ لەمەوپێش بۆ ئەم خسوسە هەبو بە عەجەلە ئیحداس و ئیعادەی بفەرمونەوە و مەکاتیبی سلێمانی، کەرکوک و هەولێر ڕەبتی ئەم مودیریەتە بکەن و مودیرێکی کوردی بۆ تەعین بفەرمون.

"وە لە عەینی زەمان دا بۆ 16 مەکتەبە کوردیە کە لە لیوای موصل دا هەیە، بۆ تەفتیش و موراقەبەیان موفەتیشینی کوردی موقتەدیر ئیستیخدام و عەلاوەی قادرۆی مەنتیقەی موصلی بکەن. موحەقەق لێم مەعلومە کە مەجلیسی عالیتان ئەبێ بە زەهیری ئەم تەلەب و ئومێدم تەرویج ئەفەرمون." (ژیان، ژ 118، 21 ی حوزەیرانی 1928).

تێبینی:

1. بەیاناتی ئەمین زەکی لە مەجلیسی مەبعوسان دا لە ژمارەکانی 128 و 129 و 130 و 131 و 133 و 134 و 137 دا بڵاو کراوەتەوە.

2. ئەمین زەکی لە نامیلکەیەک دا بە ناوی (محاسبەی نیابەت) ەوە باسی هەوڵەکانی خۆی ئەکا لە دەورەی یەکەم دا.

بەو بۆنەیەوە کە ئەمین زەکی هەڵبژێرراوە بە نائیبی رەئیسی مەجلیس ژیان نوسیوێتی:

"تەشەکوری مەبعوسەکان ئەکەین

"مەجلیسی مەبعوسان لە ئیبتیدای 1 ی ئەم مانگەدا بە سورەتێکی ئیعتیادی ئیجتیماعی فەرمو. لە دوای خوێندنەوەی خیتابی عەرش موافیقی قانون داخلی مەجلیس دەست کرا بە ئینتیخابی رەئیس و نائیبی رەئیس. نەتیجە: بە ئەکسەریەتی ئارا فەخامەتی عەبدولعەزیز بەگ قەساب رەئیسی سابیق دیسانەوە بە رەئیس و مەندوبی موحتەرەمی سلێمانی مەعالی ئەمین زەکی بە نائیبی رەئیس ئینتیخاب کران...." (ژیان، ژ 138، 19 ی تشرینی دوەمی 928)

ژیان لە (ژ 132) دا (تەشریف) هێنانی (رەئیسی عالی مەجلیسی مەبعوسان) عەبدولعەزیز قەساب (سیرف بە فکری سیاحەت و بۆ چاو پێ کەوتنی سلێمانی) و، لە (ژ 138) دا هەواڵی سەردانی جەمال بابان و سەیفوڵا بەگی بڵاو کردۆتەوە و سەروتاری (ژ 139) ی تەرخان کردوە بۆ ستایشی (ئەم دو سیما عالیە چونکە نەونیهالێکی پێگەیشتوی باغی ئەم وەتەنەن و لە عائیلەیەکی گەورەی ساحیب حقوق و خۆشەویستی ئەم خاکەن و چونکە خۆیشیان زۆر خەدەماتی فائیقەیان لە نەزەر ئەم میلەتەدا سیبقەتی کردوە...).

### 4. 4. دەنگدانەوەی داواکاریەکان

ئەو یاداشتەی هەندێ لە مەبعوسەکان دەربارەی مافی نەتەوەیی کورد دایان بە سەروەزیرانی عیراق و مەندوبی سامی، لە ئاستی جیاوازدا بە جۆری جیاواز دەنگی داوەتەوە:

**لای کورد**

ژیان لە پاینی یاداشتەکەدا ئەم لێدوانەی خۆی نوسیوە:

"ئەی وەکیلانی میلەت، ئەی خۆشەویستانی هەمو قەومی کورد!

سورەتی تەرجومەکراوی تەقریرە بە قیمەتەکەتان کە لە نوقتەی محافەزەی حقوقی میلەتی کوردەوە داوتانە لە سەرەوە دەرج کرا.

"فەعالیەت و جدییەتێک کە بۆ ئیحقاقی حەقێکی مەشروعی کوردەکان و بۆ تەرەقی و تەعالی‌یان ئیبرازتان فەرموە، سرور و خۆشیەکی خستە دڵی هەمو میلەتی کوردەوە.

"میلەت خۆی زۆر بە بەختیار ئەزانێ کە وەکیلێکی عالی و بە قیمەتی وەکو ئێوەی هەیە. بۆ ئەم مەتالیبە مەشروعەی کە ویستوتانە هەمو پشتیوانین.

"بە خسوسی بە ناوی ژیانەوە و بە عمومی بە ناوی میلەتی کوردەوە تەشەکورتان ئەکەین. هەر بژین! ژیان" (ژیان، ژ 166، 11 ی نیسانی 1929).

لە ژ 166– 167 دا تەلگرافی پشتیوانی سەرۆکی شارەوانی سلێمانی و سکرتێری کۆمەڵی زانستی و ژمارەیەکی زۆر لە رۆشنبیر، بازرگان، کەسایەتی ناسراو، سەرانی عەشایەری سلێمانی بڵاو کردۆتەوە.

ژیان لە سەروتاری ژ 167 دا بە ناونیشانی: (ئەم ئیمتیازەی کە بە کوردەکان بەخشراوە تەتبیقی مەجبوریە) نوسیوێتی:

"لــە رۆژنامــەی ژمــارە 167 (راســتەکەی ژمــارە 166 ە. نــم) و 11 ی نیســان تاریخــا ســورەتی تەرجومەکراوی تەقریرێکی وەکیلە خۆشەویستەکانمان نەشر کرد کە بۆ تەتبیقی ئەو ئیمتیازەی کە عیسـبەتول ئومەم بە کوردەکانی بەخشیوە، بە حکومەتیان دابو.

"ئێمە ئەمانەوێ بەرامبەر بەم تەقریرە و موقابیل بەم تەلەبە مەشروعەیە حسیاتی خۆمان و میلەتەکـەمان عەرز بکەین.

"لە هەمو میلەتی عیراق و خسوسەن لە پیاوە سیاسیەکانیەوە مەخفی نیە کە میلـەتی کـورد و هـەمو پارچەیەکی – ئەوانەی لە ژێر ئیدارەی تورک وە یا ئێرانا ئەژیان – وەکو سائیری ئەقوامی زەعیفەی تـر هەرچەند ئیدارەیەکی سەربەخۆیان نەبو، بەڵام لەو زەمانەیش دا دیســانەوە عەنعـەناتی تاریخیـە، زبـان و هەمو عاداتیان محافەزە کرد بو، بەڵام وەقتێک کە هەمو حکومەتە گەورەکان پرنسـیپی جـەنابی ویلسـنیان قبوڵ کرد و کە نەتیجەی شەڕی گەورە هات و لە دوای موتارەکە و موسالەحە ئەکسەر لەو میلەتە زەعیفانـە ئیستیقلالیەتی تامەیان درایە و ئەوانی تریشیان مەسەلەن وەکو عیراق، سوریە، فەلەسـتین و کوردسـتان... چونکە قابیل نەبو و نەیانتوانی بە تەنها بۆ خۆیان بژین قەرار درا هەتا قابیلیەت پەیدا ئەکەن بە سورەتی ئینتیداب بژین.

"دیسانەوە مەخفی نیە وەقتێک کە حکومەتی فەخیمە و عیراق ئەم وڵاتەی ئیستیلا کرد، حقوقی تەواوی بە کوردەکان بەخشی و لە ژێر ئیدارەی حکومەتی فەخیمەدا ئیدارەیەکی سەربەخۆیان بۆ تەشکیل کـرا، بـەڵام وەقتێک کە عیراق داوای حقوقی موقەدەسەی خۆی کرد، چونکە مەعلوم بو کە عیـراق هـەر عـەرەب نیـە و، لـە ئەقوامی موختەلیفە تەشەکولی کردوە، چونکە مەعلوم بو لە گەڵ کوردەکانا ئەکسەر مەنافیعیان موشـتەرەکە و لازم و مەلزومی یەکترین و باخسوس لە حەلی ولایەتی موسڵا چونکە لیجنەی عیسبەتول ئومـەم لـێی مـەعلوم بو کە ئەکسەری سەکەنەی ئەم ولایەتە کوردە و عادەتەن وڵاتێکی کوردیە، مەجبورەن لە سەر فکـر و تەنسـیبی حکومەتی فەخیمە و بە قەراری عیسبەتول ئومەم ئیدارەی ئەم دو میلەتە تەوحید کرا و لە هەردولا حکومەتێکی عیراق هێنرایە وجود. وە بۆ ئەوەی ئەم دو میلەتە هەتاکو سەر بە یەکەوە بـژین موتەئەسـیر نـەبن و حقـوقی یەکتری غەسب نەکەن. وە هـەردولا عەنعـەناتی میلیەیـەیان بـاقی بـێ و بـەو نـاوەوە تـەرەقی بکـەن، بـەعزێ ئیمتیازیان دا بە کوردەکان و، لە عەلاوەی کوردستان بە عیراق دا ئەم ئیمتیازە بە شەرت گیـرا. بـەڵام چونکـە لەوساوە ئەم ئیمتیازە قیسمێکی کەمی لە بەعزێ وڵاتە کوردەکانا تەتبیق ئەکرێ و لە ئەکسەری وڵاتـەکانی تـرا بە قەتعی هیچی تەتبیق نەکراوە. ئەم موحیبەتە و ئەم رابیتەیە کە لیجنەی عادیلەی عیسبەتول ئومەم ئەیویسـت بە تەواوی تەئمین نەکرا.

"لە بەر ئەوە چونکە میلەتی کورد زانی ئەگەر مەسئەلە هەروا بمێنێتەوە نەک تەرەقی ناکا بەڵکو رۆژ بە رۆژ بەرەودوا ئەڕوا بە قەتعی قەراری دا کە داوای حقوقێکی مەشروعەی خۆی بکات و، نەتیجە لە سەر ئارەزو و خواهیشی عومیەی میلەتەکە وەکیلانی میلەت تەلەبی ئەم حقوقەیان کرد.

"ئینجا ئەی وەتەنپەروەرە موحتەرەمەکان، ئەی پیاوە سیاسیەکانی عیراق! ئەبێ بـزانن ئـەم مەسـئەلەیە هەر فکرێکی خسوسـی وەکیلـەکانمان نیـە، بـەڵکو ئارەزویـەک و تەلـەبێکی قـەتعی عمـومی میلـەتی کـوردە. تەئمینتان ئەکەین ئەم مەسئەلەیە بە واسیتەی ئەسبابێکی ترەوە پەیـدا نـەبوە. بـەڵکو کـورد مـەجبورە تەلـەبی حقوقێکی مەشروعی خۆی بکات.

"ئێوە چۆن میلیەتی خۆتان خۆش ئەوێ و ئەتانەوێ حوڕ و سەربەست بژین، کوردیش بۆ عەینی غایە هەوڵ ئەدات و، لازمە ئینسان مادام میلەتپەروەر بو حورمەتی میلیەتی میلەتێکی تریش بگرێ و، ئەمە لە دنیـادا قانونێکی تەبیعیە.

"وە دیسانەوە ئەبێ بزانن ئەم ئیمتیازە کە دراوە بە کوردەکان هەر بۆ ئەوەیە کە موجیبەتێکی ئەبەدی بەین تەئمین بکات و هەر بۆ ئەوەیە کە مەنافیعێکی موشتەرەکی لێ بێتە وجود و، بەم سەبەبە هەردولا تەرەقی بکەن. لە بەر ئەوە ئەبێ ئەم ئیمتیازەی کە پێیان بەخشراوە حەرفیەن تەتبیقی بکەن و حەتا لەمیش زیاتر و لە پێش خۆتانەوە بۆ تەرەقی و تەعالییان سەعی بکەن، وە ئیلا ئەگەر هەروا بمێنێتەوە نەک هەر کوردەکان دوا ئەخات، بەڵکو ئەبێ بە سەبەبی دواکەوتنی هەردولا.

"ئیستیرحام ئەکەین، وەکیلەکانمان، بۆ ئەوەی ئارەزوی عمومی ئەم میلەتە تەئمین بکرێ، ئەبێ بۆ ئەم مەسئەلەیە بە جدی سەعی بکەن و لێی سارد نەبنەوە و بە عەجەلە و بە قەتعی ئەم ئیمتیازە لە هەمو کوردستانا تەتبیق بکەن و، رجایش لە حکومەت و ئەولیای ئومور ئەکەین بۆ ئەوەی ئەم وەحدەتە هەر باقی بێ، ئیستیرحامنامەی ئەم میلەتە و وەکیلەکانمان تەرویج بفەرمون، کە نەتیجە حکومەتێکی گەورە و موتەرەقی و بە ناوی عیراقەوە لێوە بێتە وجود." (ژیان، ژ 167، 15 ی نیسانی 1929).

**لای رۆژنامەکانی عیراق**

بۆ زانینی دەنگدانەوەی ئەم یادداشتە لە رۆژنامە عەرەبیەکانی عیراق دا پێویست ئەکا سەیری رۆژنامەکانی ئەو کاتە بکرێ. ژیان وەڵامی یەک رۆژنامەی داوەتەوە کە ئەویش العراقە.

"جوابی غەزەتەی العراق بە تاریخی 9 ی نیسانی 929

"بەرامبەر بەو تەقریرەی کە وەکیلە خۆشەویستەکانی میلەتی کورد بۆ تەلەبی حقوقی میلەتەکە دابویان لە غەزەتەی العراق ی 9 ی نیسانی 929 تاریخ دا چاومان بە چەند دێرێک کەوت.

"ئێمە چونکە زبانی حاڵی میلەتی کوردین هەرچەند لە سەرمان واجیب بو جوابی بدەینەوە بەلام بۆ ئەوەی حسیاتی کوردەکان تەحریک و نەتیجە شتێکی خراپ تەولید نەکات نەمانویست دورودرێژ جوابی بدەینەوە.

"هەر ئەمەندە ئەڵێین بۆ العراق زۆر عەیب و فکرێکی غەڵەتە کە بە هەمو حسیاتەوە میلەتێکی شەجیع، ساحیب شەرەفی وەکو کورد تەهدید ئەکات و ئەیترسێنێ بەوەی کە ئەڵێ (کوردەکان تەلەبی وا بکەن وەکو ئیدیعای ئەرمەنیەکانی لێ دێت کە موقابیل بە تورکیا کردیان و نەتیجە بەم حاڵە گەیشتن).

"ئەی ساحیب و موحەڕیڕی العراق! بە جدی عەرزت ئەکەین کورد هیچ وەقتێک خۆی بە ئەرمەنی نازانێ و عیراقیش بە تورکیا. کورد بەو شەرتە لە گەڵ عیراقا ئەژی، نەک وەکو غەزەتەکانی خاریج ئەڵێن و ئەنوسن (ئەبێ ئەم دو میلەتە وەکو بریتانیا و ئسکۆتلاند بژین و تەماشای یەکتری بکەن) بەڵکو کورد ئەیەوێ زیاتر تەماشای بکرێ.

"رجا لە ئەولیای ئومور ئەکەین ئەگەر ئەیانەوێ ئەم دو میلەتە بە یەکەوە بژین نابێ مەیدان بدەن شتی وا بنوسرێ، چونکە غەزەتەکانی کوردیش مەجبور ئەبێ موقابیل بە هەمو تەعەڕوزێک نەک مودافەعە، بەڵکو هجوم بکات. هەر ئەوەندە ئەڵێین." (ژیان، ژ 167، 15 ی نیسانی 929).

**لای کاربەدەستان**

لە ژیان دا هیچ جۆرە کاردانەوەی کاربەدەستانی عیراقی و بریتانی بە دی ناکرێ بەلام بێگومان لە بەر ئەوەی بە باشیان نەزانیوە هیچیان لێ جێبەجێ نەکردوە.

## 5. هەڵوەشاندنەوەی مەجلیس

"حەلی مەجلیسی مەبعوسانی عیراق و،

"ئەمری ئینتیخاباتی تازە

"بەغداد: ئیرادە دەرچوە لە سەر حەلی مەجلیسی مەبعوسان و دەستکردن بە ئینتیخاباتی تازە." (ژیان، ژ 249، 7 ی تەموزی 1930).

عیراق لەو ماوەیەدا نائارامیەکی سیاسی- وەزاری زۆری بە خۆیەوە دیوە. چەند جارێ وەزارەتەکان گۆڕاون.

عەبدولموحسین سەعدون لە نیسانی 1929 دا ئیستیقالەی کرد. مەلیک فەیسەڵ تۆفیق سویدی تەکلیف کرد وەزارەت پێک بهێنێ:

"وەزارەتی تازەی عیراق

"لە غەزەتەکانی بەغدادەوە – 29 و 30/4/ 929

"مەعلومە کە لە بەر بەعزێ مەسائیلی سیاسیە چەند مانگێک لەمەوپێش وەزارەتی عیراق کە قابینەی فەخامەتی سەعدونیان پێ ئەوت ئیستیعفای کرد بو و هەتا ئەم بەینە هەر بە وەکالەت ئیشی ئەکرد و حکومەتی عیراق لە حالێکی موشکیل دا مابوەوە، بەڵام لەم ڕۆژانەدا بۆ ئەوەی ئیتر نیهایەت بەم حالە بهێنرێ دەست کرا بە تەشەبوسات بۆ ئەوەی قابینەیەکی تازە تەشکیل بکرێ. نەتیجە قەرار درا کە لە ریاسەتی فەخامەتی تۆفیق بەگ ئەلسویدیدا وەزارەت تەشەکول بکات.

"ڕۆژی یەکشەمەی 29/4/28 بە موناسەبەتی دەرچونی ئیرادەی ملوکانەوە لە دائیرەی ڕەئیسەلوزەرای عیراق حەفلەیەکی موحتەشەم کرا و هەمو گەورەی دائیرەکان و موستەشارەکانی حکومەتی فەخیمەی ئینگلیز کۆبونەوە لە حالێکا کە فەخامەتی تۆفیق بەگ ئەلسویدی یش لەوێ حازر بو.

"وە لەو حەلەدا وەکیلی ڕەئیسی دیوانی مەلەکی و مورافیقی خاسی جەلالەتی مەلیک بە ئۆتۆمۆبێلی مەخسوسی ملوکانە تەشریفیان هێنایە ئەو مەوقیعەوە. لە تەرەف تاقمێک پۆلیسەوە و هەمو حازیرونەوە ئیستیقبال کران.

"ئیرادەی جەلالەتی مەلیک کە لە بابەت ڕەئیسەل وزەرایەتی تۆفیق بەگ سویدیەوە دەرچوبو تەسلیمی سکرتێری مەجلیسی وزەرا کرا. لە دوای ئەوەی کە مەراسیمی ئیحتیرامکارانە بۆ ئیرادەکە کرا لە تەرەف سکرتێری مەجلیسەوە بە دەنگێکی بەرز خوێنرایەوە کە مەئالەکەی لای خوارەوە عەرز کرا.

"لە دوای ئەوەی کە فەخامەتی تۆفیق بەگ سویدی بەرامبەر بە ئیرادەکە تەشەکوراتی لازمەی بە جێ هێنا و هەمو حازیرون موبارەکبایی‌یان لێ کرد بە ئۆتۆمۆبێلی خسوسی تەشریفی بردە قەسری مەلەکی و بیلزات لەوێش بەیانی مەمنونیەتی فەرمو." (ژیان، ژ 172، 6 ی مایسی 1929).

"سورەتی ئیرادەکەی جەلالەتی مەلیکی گەورەی عیراق

"فەخامەتی وەزیر تۆفیق سویدی!

"بینا لە سەر ئیستیعفای فەخامەتی عەبدولموحسین بەگ و بینا لە سەر ئەوەی کە ئیعتیمادی تەواوم بە دیرایەت و ئیخلاسی ئێوە هەیە وا مەنسەبی ئەلوزەرایەتیم تەودیع کردی کە ئێوەش بە عەجەلە وەزیرەکانی ڕەفیقتان ئینتیخاب بکەن و ناویان عەرز بکەن. هەر خوا موەففەقیەت ئەدا. فەیسەڵ مەلیکی عیراق" (ژیان، ژ 172، 6 ی مایسی 1929).

لێدوانی ژیان:

"ئەم ئیرادەیە لە 28 ی نیسانی 929 و 19 ی زیلقەعیدەی 1347 لە قەسری مەلەکیدا نوسراوە.

"لە سەر ئەمە فەخامەتی رەئیسەلوزەرایش لە عەینی رۆژدا وەکو لە غەزەتەی پێشودا ناویان عـەرز کـرا، مەعالی وەزیرەکانی ئینتیخاب فەرموە و عەرزی جەلالەتی مەلیکی کردوە.

"تەشکیلی قابینەی تازەی عیراق لە سەرەوە عەرز کرا. ئەم قابینەیـە و ئـەم وەزیـرە موحتەرەمانـە چونکـە هەمویان لە کۆمەڵی (تقدم) ن و ئەم کۆمەڵەیش لە عیراقا ئەهمیەت و مەوقیعێکی بەرزی هەیە و ئەکسەریەتی پەیـدا کردوە و لە هەمو شتێکا ساحیب رەئین. جگە لەمەیش چونکە ئەمجارە لەم قابینەیەدا دو وەزیری کـوردیش هەیـە، ئومێدمان گەورەیە کە بە هەمویەتی بۆ عیراق و بە تایبەتی بۆ کوردستان خدمەتێکی گەورە بفەرمون.

"جگە لەمەیش جاران کەلە هەمو قابینەیەک دا وەزیرێک هـەبو ئـەمجارە دو وەزیـری کـوردی تێدایـە، ئەمەش دەلیلە کە ئیتر لە بەینی ئەم دو میلەتەدا فەرق و فروق نەماوە و ئیتر هەردولا وەکو بـرا ئـەژین و بـۆ عەینی غایە کە بەرزی و بڵندی و پێشکەوتنی عیراقە سەعی ئەکرێ. ئەمەیش ئینکار ناکرێ کە ئەم چاودێرییە و ئەم لوتفی حکومەتە هەموی بە سەبەبی هەوڵ و تەقەلای وەکیلە موحتەرەمەکانمانەوە پێک هاتوە.

"لە بەر ئەوە بە ناوی میلەتی کوردەوە موبارەکبایی لە وەزیرە موحتەرەمەکانمان و تەمەنای موەفەقیـەتی ئەم قابینەیە ئەکەین.

"دیسانەوە ئیستیرحام و تەمەنایان لێ ئەکەین کە بە هەمو توانایانـەوە بـۆ پێشـکەوتنی عیـراق و بـۆ ئیکمالی نەواقیساتی کوردستان جەهد بفەرمون." (ژیان، ژ 172، 6 ی مایسی 1929).

"پرۆگرامی وەزارەت

"بەغداد، هەرچەند بە رەسمی هێشتا پرۆگرامی وەزارەتی تازە مەعلوم نەبوە، بەڵام لە ئـەوەل ئیجتیمـاع دا قەراریان داوە لە پێش هەمو شتێکا بۆ بەرزی و بڵندی و دەوڵەمەندی عیراق چی پێویستە ئیجرای بکـەن و بودجە بەو نەوعە تەنزیم و ئیسلاح بکـەن کـە نەتیجـە زەرەر و زیـانێکی نـەبێ بـۆ عیـراق. وە بـۆ تـەئلیفی جەیشێکی مونتەزەمی عیراق سـەعی بکـەن ئایـا بـە سـورەتی ئیجبـاری وە یـا غـەیرە ئیجبـاری، قـەوانین و معامەلاتی نفوس ئیکمال بکەن.

"وە بۆ عەدەم ئیستیخدامی هنودی غەیرە عیراقی سەعی بکەن و لـە جـێی ئـەوان عیراقـی ئیسـتیخدام بکەن." (ژیان، ژ 172، 6 ی مایسی 1929).

........

وەزارەتەکەی سویدی تەمەنی درێژ نەبو. مەلیک داوای ئیسـتیقالەی لـێ کـرد و، سـەرلەنوێ سـەعدونی تەکلیف کردەوە.

"قابیتەی تازەی عیراق

"لە سەر ئیستیغفای فەخامەتی تۆفیق بەگ سویدی رۆژی 19 ی ئەم مانگە ئیرادەی ملوکانە صادر بـو بە تەعینی فەخامەتی سێر عەبدولموحسین بەگ ئەلسەعدون بۆ رەئیس ئەلوزەرایەتی و فەخامەتیشی وەکو لای خوارەوە دەرج کراوە ناوی ئەو وەزیرانەی دا کە داخلی قابینەکەی ئەبن.

"لە عەینی رۆژدا ئیرادە سادر بو بۆ تەعینی موشار ئیلەیهیماش و بەم موناسەبەتەوە لە دیوانی رەئـیس ئەلوزەرادا کۆمەڵێک بەسترا لە دوای خوێندنەوەی ئیرادەکە حازیرون دوعای عومر و ئیقبالی جەلالەتی مـەلیکی موعەزەمیان کرد.

| | |
|---|---|
| ڕەئیس ئەلوزەرا و وەزیری خاریجیە | فەخامەتی سێر عەبدولموحسین بەگ ئەلسەعدون |
| وەزیری داخلیە | مەعالی ناجی پاشا ئەلسویدی |
| وەزیری مالیە | مەعالی یاسین پاشا ئەلهاشمی |
| وەزیری عەدلیە | مەعالی ناجی شەوکەت |
| وەزیری ئەشغال و مواسەلات | مەعالی ئەمین زەکی بەگ |
| وەزیری دیفاع | مەعالی نوری پاشا ئەلسەعید |
| وەزیری مەعاریف | مەعالی عەبدولحسەین چەلەبی |
| وەزیری ڕەی و زەراعەت | مەعالی عەبدولعەزیز بـەگ قەسـاب (ژیـان، ژ 200، 26 ی ئەیلولی 1929) |

**سەعدون خۆی کوشت**

"زیاعێکی ئەلیم

"لە حالێکا کە غەزەتەکەمان لە تەواوبون دا بو بە شیدەتی ئەسەفەوە خەبەرمان وەرگرت کە ڕەسمەن بۆ مەقامی سەعادەتی موتەسـەڕیفی تـەلغرافێک هـاتوە مەئالەکـەی ئەمەیـە کـە: فەخامـەتی سـێر عەبدولموحسـین ئەلسەعدون ڕەئیس ئەلوزەرای عیراق ئەمشەوی ڕابوردو لـە مـاڵی خـۆیدا (ئینتیحـار) و وەفـاتی کـردوە. وە وەسێتێکی تاریخی بۆ ئەولادی بە جێ هێشتوە.

"ئەم خەبەرە فەجیعە وەکو سائیقەیەکی ناگەهانی زەربەیەکی لە عالەم دا و ڕەعشەیەکی ئەبـەدی خستە وجودی هەمو کەسێکەوە. جەدەن غەیبوبەتی ئەبەدی ئەم داهیەیە کە لە عیراقـا ئەوەڵـەمین زات و موشار بیلبەنان و باعیسی فەخری عمومی بو، جێی تەئەسوفە و هەتاکو قیامەت ئەم ئەسەفە باقی ئەبێ لە فکر ناچێتەوە.

"بە ناوی عمومە عیراق و خاسەتەن بە ناوی میلەتی کـوردەوە ئیزهـاری ئەسـەف و بـەیانی تەعزیـەت ئەکەین. وە بەم موناسەبەتەوە لە هەمو مەراکیزدا بەیداخی حکومەت شۆڕ کرایەوە.

"لەم خسوسەوە لە غەزەتەی ئاتیدا دەرەجەی ئەسەفی میلەتەکەمان و تەفسیلاتی لازمـە عـەرز ئەکـەین." (ژیان، ژ 211، 14 ی تشرینی دوەمی 1929).

بۆ ئەوەی ئەو بۆشاییەی بە خۆکوشتنی سەعدون دروست بو بو پڕ بکرێتەوە. فەیسەڵ ناجی سـویدی تەکلیف کرد وەزارەت تەشکیل بکا.

"قابینەی تازە

"ئیرادەی ملوکانە سادر بوە بۆ تەشکیلی وەزارەتی تازە لە ڕیاسەتی ناجی پاشا ئەلسویدیدا، بـەڵام لـە بەر وەفاتی عەبدولموحسین بەگ ئەلسەعدون هیچ مەراسیمێکی بۆ ناکرێ. وەزیرەکان وەکو لای خوارەوەن:

| | |
|---|---|
| ڕەئیس ئەلوزەرا و وەزیری خاریجیە | ناجی پاشا ئەلسویدی |
| داخلیە | ناجی شەوکەت |
| مالیە | یاسین پاشا ئەلهاشمی |
| عەدلیە | عەبدولعەزیز قەساب |
| وەزیری دیفاع | نوری پاشا ئەلسەعید |
| مواسەلات و ئەشغال | مەعالی ئەمین زەکی بەگ |

رەی و زەراعەت خالید سلێمان
وەزیری مەعاریف عەبدولحسەین چەلەبی
(ژیان، ژ 213، 21 ی تشرینی دوەمی 1929)

وەزارەتەکەی ناجی سویدی تەمەنی کورت بو. عیراق لە بەردەم گرێدانی رێکەکوتننامەیـەکی گرنـگ دا بو لە گەڵ بریتانیا. بەندەکانی ناو رێککەوتنەکە بە ئاسانی و بە بێ مشتومڕ، نەیئەتوانی لـە مـەجلیس تـێ بپەڕێ. نوری سەعید وەزارەتی نوێی پێکهێنا. نوری پاشا بۆ ئەوەی دەنگی ئەندامانی مەجلیس بۆ موافەقـەت لە سەر پەیماننامەکە زامن بکا، وەزارەتێکی پێک هێنا کە هەڵبژاردنێ بکا ئەنجامەکەی مسۆگەر بێ.

"مینهاجی قابینەی تازەی عیراق

"بەغـداد، رەئـیس وزەرای عیـراق فەخامـەتی نـوری پاشـا ئەلسـەعید ئـەو مینهاجـەی کـە لـە گـەڵ وەزیرەکانیا قەراریان داوە تەعقیبی بکەن تەقدیمی جەلالەتی مەلیکی فەرموە و جەلالـەتی مـەلیکی موعـەزەمیش قبوڵی فەرموە.

"مینهاجەکەیان عیبارەتە لە 3 مەسئەلە:

1. بۆ وەرگرتنی ئیستیقلالیەتی تامی عیراق لە گەڵ داری ئیعتیمادا دەست کـردن بـە موزاکـەرە بـۆ موعاهەدەیەکی تازە.

2. مەسئەلەی ئیقتیسادیاتی عیراق.

3. وەرگرتنی مەسئولیەت یەعنی ئیدارەی داخلی عیراق لە عیراقییەکان مەسئول بـێ." (ژیـان، ژ 233، 3 ی نیسانی 1930)

## 3. ژیان و مەجلیسی نواب (دەورەی ئینتیخابیی سێیەم)
**(1932/11/8 – 1930/11/1)**

### دەورەی ئینتیخابیی سێیەم
### "ئینتیخاباتی تازەی مەبعوسان

"لە وەزارەتی داخلیەوە رەسمەن ئەمر دراوە کە پێویستە لە هەمو مەناتیقی عیراق دا لە رۆژی 10 ی تەموزدا موافیقی قانونی ئینتیخابات دەست بکرێ بە موعامەلەی ئینتیخابیە و ئەبێ لە 10 ی ئەیلول دا تەواو بێ." (ژیان، ژ 250، 10 ی تەموزی 1930).

### 6 ی رەشی ئەیلول

ئەرکی سەرەکی ئەنجومەنی داهاتو ئەوە بو کە پەیماننامەی بریتانی– عیراقی پەسند بکات. نوری سەعید ئەیویست ئەنجومەنێک هەڵبژێردرێ بێ مشتومڕ و بگرەوبەردە دەنگ بە قازانجی پەیماننامەکە بدا. پاش ئیمزا کردنی ئەم پەیمانە عیراق لە ژێر ئینتیدابی بریتانی دەرئەچو، بە ناو سەربەخۆیی وەرئەگرت و، ئەبو بە ئەندامی کۆمەڵەی نەتەوەکان.

لە هیچ مادەیەکی ئەم پەیمانەدا ئیشارەت بۆ دەستەبەرکردنی مافی نەتەوەیی کورد نەکرابو. بە تایبەتی ئەو مافانەی کاتی نوساندنی ولایەتی موسڵ بە عیراقەوە داوا لە عیراق کرا بو دەستەبەریان بێ. نیشتمانپەروەرانی کورد ئەترسان دوای ئیمزا کردنی ئەم پەیمانە، حکومەتی عیراق لەو مافانە پەشیمان ببێتەوە کە بەڵێنی بە کورد دابو، لە بەر ئەوە لە سلێمانی بڕیاری (موقاتەعە) یان دا.

رۆژی 6 ی ئەیلول کە ئەبو دەنگدەرانی سلێمانی بۆ هەڵبژاردنی (هەیئەتی تەفتیشیە) لە سەرای سلێمانیدا کۆ ببنەوە، خەڵکی سلێمانی، بە تایبەتی قوتابیانی کۆمەڵەی زانستی کوردان و دوکاندارەکانی ناو بازاڕ و گەنجەکانی شار بۆ خۆپیشاندان و دەربڕینی نارەزایی لە بەر دەرکی سەرا کۆبونەوە. کاروباری سلێمانی کە لەو کاتەدا بە دەس کاپتن گاون وەکیلی موفەتیشی ئیدارییەوە بو، بۆ بڵاوە پێ کردنی خۆپیشاندەران کەوتە بەکارهێنانی زەبروزەنگی پۆلیس. لە نێوان خۆپیشاندەران و هێزەکانی پۆلیسدا

پشێوی دروست بو. لە هەردو لا چەند کەس بریندار بون و کوژران. گاون هێزەکانی جەیشی عیراقی بانگ کرد بۆ ئەوەی پشێوییەکە دابمرکێننەوە. جەیش بە توندی لە بەشدارانی خۆپیشاندانەکەی دا، دەیان کەسی لێ کوشتن و، دەیان کەسی لێ بریندار کردن. بە زۆر بڵاوەی پێ کردن و زیاتر لە 100 کەسیان راپێچی زیندان کرد. ئەگەرچی بە هۆی ئەم روداوەوە هەڵبژاردن دوا کەوت، بەڵام پاش چەند رۆژێ ئەنجامیان دا.

ژیان لە ژێر سەردێڕی (ئینتیخابات لە سلێمانی) نوسیوێتی:

"رۆژی 15 ی 9 ی 1930 لە مەقامی موتەسەرپیفیەت دا عمومی ئەشراف و تیجار و سائیری تەبەقەی ئەهالی بۆ ئینتیخابی هەیئەی تەفتیشیە کۆبونەوە. لە نەتیجەدا زەواتی ئاتیە بە ئەکسەریەتی ئارا بە ئەعزای هەیئەتی تەفتیشیە ئینتیخاب کران:

چەند رەئی بوە: 34 حاجی ئیبراهیم ئاغا، 22 مەجید بەگی حاجی رەسول بەگ، 22 غالب ئاغا، 21 حاجی ئەحمەدی حاجی کەریم، 20 عەبدولکەریم ئەفەندی عەلەکە، 19 سەید ئەحمەدی توتونچی، 17 کەریم بەگی محەمەد بەگ، 16 حاجی کاکەحەمە، 15 حاجی مەلا محێدین، 15 حاجی عەلی حاجی حەسەن ئەفەندی." (ژیان، ژ 260، 22 ی ئەیلولی 1930).

"گوشادی مەجلیسی مەبعوسان

"رۆژی 1 ی مانگ ئەعزاکانی مەجلیسی نیابی بە ئیحتیفالێکی موحتەشەم کۆبونەوە. لە پاش قیرائەتی خیتابی ئەلعەرش بە ئەکسەریەتی ئارا فەخامەتی جەعفەر پاشای عەسکەری بە رەئیس ئینتیخاب کراوە و، دیسان لە نەتیجەی ئینتیخابات دا مەعالی سلێمان بەگ ئەلبەراک بۆ نائیبی ئەوەل و عەلی ئەفەندی ئیمام بۆ نائیبی دوەمی رەئیس، ئەکسەریەتیان ئیحراز کردوە." (ژیان، ژ 262، 6 ی تشرینی دوەمی 1930).

ژیان کە لە سەرەتاوە بە گەرمی هەواڵی رەوتی هەڵبژاردنی دەورەی یەکەم و دوەمی نوسی بو، هەواڵی دەورەکانی تری بە کورتی و سەرپێیی باس کردوە و، ئەو گەرمییەی جارانی نەماوە. رەنگە ئەوە یش بگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە ئیتر تێگەیشتون مەجلیس ئەو دەزگایە نیە کە ئەمان ئەو هیوا زلانەیان لە سەر هەڵ چنی بو.

# 4. ژیان و مەجلیسی نواب (دەورەی ئینتیخابیی چوارەم)

**(**1934/9/4 – 1933/3/8**)**

ژیان، ژ 353 ی 13 ی شوباتی 1933 ئـەنجامی دەورەی چـوارەمی هـەڵبژاردنی نائیبـەکانی لیـوای سلێمانی بەمجۆرە بڵاو کردۆتەوە:

"سەرەتای دەرکەوت نوابی تازە

"دەمێکە زۆر کەس ئاواتەخوازە

"ئەم چەندانە دەروژوری شار، بێ بوارە و بوار، خەریکی هەڵبژاردنی مونتەخیبی سانی بـون. دەسـتەی هیواداررانی مەبعوسی بە هەمو لایەکا تەقەلایان بو، تا رۆژی ئەم چوارشەموی رابوردوە کە رۆژی هیـوا و بـێ هیوایی بو، مونتەخیبە سانیەکان لە دائیرەی بەلەدیەدا کۆبونەوە صـندوقی یانصـیبی بـەخت و نصـیب دانـرا. چواردەوری بە چاودێری و سەرپەرشـتی رەئیسـی بەلەدیـە و هەیئـەتی تەفتیشـیە تـەنرا. ئینجـا هـەر کەسـە سەروپەڕەی بە مۆری وەرگرت، بردیە لایەکەوە بە دزیەوە چەند کەسی هەڵبژارد، نـاوی نوسـین و بـە دەسـتی خۆی خستیە ناو صندوقەکەوە. لە دوایی‌دا هەمو لایەک راوەستا بون سەرنجیان ئەدا صندوق کرایەوە، رەئـی کۆکرایەوە، دەعوا بڕایەوە، لە نەتیجەدا وا دەرکەوت هەر مەبعوسەکانی پێشومان بونەوە، تـەنها ئەحمـەد بـەگی وەسمان پاشا دەرچوە، لە جێی ئەو صەبری ئەفەندی حاجی عەلی ئاغا دێتە کایەوە. خوا لێیان پیرۆز کا ببنە خێر و بە سەر وڵاتەکەمانا بڕژێن.

"ئەو زاتانەی کە هەڵبژێرراون بۆ مەبعوسی ئەمانەن کە لە خوارەوە نوسراون: جـەنابی محەمـەد سـاڵح بەگی محەمەد عەلی بەگ، جەنابی سەیفوڵا بەگ، جەنابی ئەحمەد بەگی محەمەد سـاڵح بـەگ، جـەنابی صـەبری ئەفەندی حاجی عەلی ئاغا."

"موافیقی قانونی ئەساسی نیوەی حەزەراتی ئەعزایانی ئەعیان بە قورعە ئیخراج کران

"بە موناسەبەتی تەواوبونی مودەیانەوە بۆ ئەوەی بە قورعە نیـوەی ئـەعزا موحتەرەمـەکانی مەجلیسـی ئەعیان ئیخراج بکرێن و سەرلەنوێ بە ئیرادەی مەلەکی ئەعزا تـەعین بکرێتـەوە، رۆژی 13 ی ئـەم مانگـە لـە دائیرەی مەجلیسی ئەعیان دا بە پێی مادەی 32 ی قانونی ئەساسی دەست کرا بە معامەلەی قورعەکێشان.

لە ریاسەت و نەزارەتی جەلالەتی مەلیکی موعەزەم دا فەخامەتی رەئیسـەل وزەرا و فەخامـەتی رەئیسـی مەجلیسی ئەعیان و رەئیسی مەجلیسی مەبعوسان لە دائیـرە و سـالۆنی مەجلیسـی ئـەعیان دا کۆبونـەوە و لـە حالێکا کە هەمو ئەعزایانی ئەعیان و ئەعزایانی مەبعوسان و مەعالی وەزیرەکـان حـازر بـون دەسـت کـرا بـە قورعەکێشان و لە نەتیجەی قورعەدا لـە ئـەعزایانی ئـەعیان سـەماحەت ئەلسـەید محەمـەد ئەلسـەدر و، ئەلشـێخ عودەی ئەلجەریان و، ئاسەف قاسم ئاغـا و، ئەلسـەید عەبـدولاّ ئەلنـەقیب و، فـەخرەدین ئـال جـەمیل، یوسـف عەمانۆیل، حاجی حەسەن ئەلشەبوت، عەبدولکەریم ئەلسەعدون، مەولود پاشا ئەلموخلیس، حاجی مـەحمود ئـەل ئوسترابادی، لە جێی خۆیان مانەوە.

وە سـەماحەتی جـەمیل ئـەل زەهـاوی، یوسـف سـویدی، حـاجی سـەعید ئاغـا، مـەناحیم دانیـال، عەبدولحسەین، ئیبراهیم حەیدەری، عەبدولغەنی کوبە، محەمەد عەلی فازل، سـالّح پاشـا بـاش ئـەعیان، عەبـدولاّ سافی، دەرچون.

بەم نەوعە قورعەکێشانەکە دوایی هات. وە لە دوای تەواوبونی مـەسـئەلەکە جەلالـەتی مـەلیکی موعـەزەم بیلزات خۆی خوتبەیەکی عالی خوێندەوە و لە معامەلە و حـەرەکاتی ئـەم بەینـەی هـەمو ئـەعزایانی مەجلیسـی ئەعیان بەیانی مەمنونیەتی فەرمو." (ژیان، 181 ی 24 ی حوزەیرانی 1929).

"ئەعزاکانی تازەی مەجلیسی ئەعیان

"بەغداد: رۆژی 22 ی ئەم مانگە ئیرادەی ملوکانە صادر بو لە خصوص تەعینی زەواتی لای خـوارەوە بۆ ئەعزایەتی مەجلیسی ئەعیان:

"ئیبراهیم ئەفەندی ئەلحەیدەری، حاجی سەعید ئاغای مەعروف ئاغا، السید نوری ئەفەندی السید عزیـز الیاسری، عەبدوللـەتیف پاشا ئەلمەندیل، عەبدولاّ صـافی ئەفەنـدی، محەمـەد عـەلی ئەفەنـدی ئـال بـەحرەلعلوم، محەمەد عەلی ئەفەندی ئەلفازیل، مەناحیم ئەفەندی دانیال.

"حکومەت ئێستا خەریکی تەرشیحی زاتێکیانە بۆ ریاسەتی ئەم مەجلیسە وەکـو ئـەڵێن یـا سـەماحەتی شێخ ئیبراهیم ئەفەندی ئەلحەیدەری وە یا محەمەد عەلی ئەفەندی ئەلفازیل ئەبێ بە رەئیس." (ژیـان، ژ 207 ی 28 ی تشرینی یەکەمی 1929).

# ژیان و داکۆکی لە ئافرەت

## 1. ژیان و ژن

یەکێ لەو بابەتانەی ژیان تەرکیزی کردۆتە سەر کێشەی ئافرەت بوە. ئەمەیش وەنەبێ کـاری یەکتـەنی یا دەس پێشکەری یەکێ لە نوسەرەکانی ئەو کاتە بوبێ، بەڵکو بەشێ بوە لە ڕێبـازی فکـریی ڕۆژنامەکـە. لـە هەمو قۆناغەکانی دەرچونی دا و لە لایەن چەند نوسەری جیاوازەوە، باس کراوە.

لە بیستەکانی سـەدەی بیسـتەمدا لـە زۆر شـوێنی دنیـادا ئـافرەت بـێ بـەش بـوە لـە مـافی سیاسـی، کۆمەڵایەتی، ئابوری، ڕۆشنبیری. تەنانەت لە وڵاتێکی وەکو بریتانیادا ئـافرەت تـازە خـەریک بـو هەنـدێ لـە مافەکانی وەربگرێ، لەوانە مافی دەنگدان لە هەڵبژاردنی گشتیدا.

کوردستان لەو سەردەمەدا زۆر دواکەوتو بو. شارەکانی پچوک و بە ژمارە کەم و لـە روی ئـاوەدانی و شارستانیەوە زۆر لە دوا بون. زیاتر لەوەی لە شار بچن، شارەدێ بون. زۆرایەتی خەڵک و، بە گشتی ئـافرەت نەخوێندەوار بون. دانیشتوانی شار لە چاو دانیشتوانی دێهاتدا زۆر کەم و، پێوەندی دەرەبـەگی و خێڵایـەتی بـە سـەر پێوەنـدی کۆمەڵایـەتیدا زاڵ و، تێگەیشـتن و بیرکردنـەوە و ڕەفتـاری لادێ بـاو بـو. لـە دێهـاتدا، شیربایی، ژن بە ژن، ژن لە تۆڵەی خوێن دا دان، گەورە بە پچوک و، فرەژنی، لە ژنهێنان و شوکردندا نەریتی کارپێکراو بو.

ئەگەر لە وڵاتانی وەکو تورکیا و ئێران و میسر... جوڵانەوەی ژنان بـۆ چـاکردنی بـاری کۆمەڵایـەتی خێزان و بە دەسهێنانی مافی ئافرەت دەستی پێ کردبێ، ئەوا لە کوردستان دا بە هـیچ جـۆرێ بزوتنەوەیـەکی لەو بابەتە لە کایەدا نەبوە. ئەم هەنگاوەی ژیان لەو کاتەدا ناویەتی دەسپێشکەری پیاوان بوە. بێ ئەوەی هـیچ گوشارێکی ئافرەتیان لە سەر بوبێ، بەشێ بوە لە بیروباوەڕی هـەڵبژاردەی کـورد بـۆ نوێکردنـەوەی کۆمـەڵی کورد و هەنگاونان بەرەو کۆمـەڵی پێشـکەوتوی شارسـتانی. لـە دو تـوێی وتارەکـان و هەواڵـەکاندا، داوای دابینکردنی مافی خوێندن، کارکردن، ئازادی هەڵبژاردنی هاوسەر، مافی دەنگدان لە هـەڵبژاردنـی گشـتیدا، بـۆ ئافرەتی کورد ئەکەن. بە واتەیەکی تر مافی بەشداری لە ژیانی کۆمەڵایـەتی، ئـابوری، ڕۆشـنبیری، سیاسـی... کۆمەڵ دا.

## 1 .1. پایەی کۆمەلایەتی ئافرەت

ژیان بە قەڵەمی نوسەری جیاواز، چەندین وتاری لە سەر باری کۆمەلایەتی خێزانی کورد و، شوکردن و ژنهێنان، و پلەی کۆمەلایەتی ئافرەتی کورد نوسیوە. زۆر بە توندی هێرشی کردۆتە سەر نەریتی باو و هەلومەرجی دواکەوتوی کۆمەڵ. رەخنەی لە پیاوی کورد گرتوە سەبارەت بە رەفتاری نادروستی لە گەڵ ژنی کوردا. داکۆکی کردوە لە مافی ئافرەت و، مافی بێ چەندوچونی خوێندن، کارکردن، هەڵبژاردنی هاوسەر و، رەئی دان. لە پێکەوەنانی خێزان دا داوای کردوە لە پێش ژنهێنان و شوکردندا، بۆ ئەوەی زمانی لە یەک گەیشتن بدۆزنەوە، کوڕ و کچ یەکتری ببینن و پێکەوە قسە بکەن و، لە نێوان کچ و کوردا هاوکوفی، بە تایبەتی لە تەمەندا هەبێ.

لەو سەردەمەدا هیچ قانونێکی دانراو نەبوە بۆ رێکخستنی (باری کەسایەتی) و بۆ پاراستنی مافی ئافرەت. لە دادگا و لە ناو کۆمەڵدا، پیرەوی بنەماکانی شەریعەتی ئیسلامی کراوە. بە هۆی دواکەوتنی کۆمەڵ و، نەخوێندەواری و نەزانی ژنانەوە، پیاو بە یارمەتی هەندێ مەلای کۆنەپەرست و کۆلکە مەلا، بە خراپترین شێوە ژنی چەوساندۆتەوە و مافەکانی خواردوە. نوسەرانی ئەم وتارانە بۆ ئەوەی بەڵگە و بەهانەکانیان بە هێز بێ و، لە روی دینی‌یەوە نەتوانن بەرپەرچیان بدەنەوە، شایەتی‌یان لە ئایەتی قورئان و حەدیسی پێغەمبەر هێناوەتەوە.

**گوزیدە عەزیز خانم**، مدیرەی مەکتەبی کچانی سلێمانی، لە وتارێکدا لە ژێر سەردێڕی (ژن و تەئسیراتی لە حەیاتی مەدەنیەت دا) کە بە بۆنەی کردنەوەی مەکتەبی کچانەوە بۆ (ژیان) ی نوسیوە، ئەڵێ:

"ژنێتی، مەوجودیەتێ کە قیسمێکی تری حەیات و حەتا قیسمی موهیمی ئیشغال کردوە، نابێ تەئسیراتی ژن لە حەیات دا لە پێش چاو دور بخرێتەوە و، ئەبێ بکرێ بە رەهبەری بەرزبونەوەی ئەو هەنگاوانە کە لە رێگای مەدەنیەت و تەرەقیدا ئەهاوێژرێ. ژن حەیات مەسعود و ژن حەیات رەزیل ئەکات. ئەم دو قوەتە کە دوشمنی یەکترن بە عیلم و جەهلی ژن دێتە وجود. ژن ئەم دو ئیستیعدادەی هەیە ئەو میلەتانە کە ئەم قیسمە بەشەرە سوئی ئیستیعمال ئەکەن ناتوانن لە بەلای جەهالەتی خۆیان رزگار بىن و مەحکومی ئەم ئافەتەن.

لە ئودەبای فرانسز مادام ئەڵێ: (ژن ماڵ ئەکات و ژن ماڵ وێران ئەکات) بە چ بەلاغەت و زبانێکی فەصیحەوە گوتراوە ئەگەر بیخەینە بەر چاوی تەئەمول ئەو میلەتانە کە ژنێتی‌یان بەرز کردۆتەوە، خۆیان بەرز کردۆتەوە، زیرا ژن میلەت پێ ئەگەیەنێ. وە ژن پیاو پێ ئەگەیەنێ. ئەو مەوجودیەتە کە لە زەرەیەک قەهرەمانێکی گەورە دێنێتە وجود. لەو وەقتانەدا کە لە باوەشی شەفەقەتی خۆیا بە لایلایە و لاواندن پێ ئەگەیەنێت لە مەوجودیەتی مادی و مەعنەوی خۆی بەشی ئەدات." (ژیان، ژ 13، 22 ی نیسانی 1926).

**فائیق زێوەر**، کە ئەوسا گەنجێکی تازە پێگەیشتو بوە، لە وتارێکی کەدا نوسیوێتی:

"لە مەسائیلی ئەخلاق و ئیجتیماعیات دا لە پاش ئایەت و حەدیس ئەتوانم بڵێم ئەقوالی حوکەما و ئودەبا لازمە بکرێ بە دەستورەلعەمەل هەمو کەس ئیتاعەی بکا. ئێمە ئەقوامی شەرق هەروەکو دەستی چەپمان گۆج کردوە، هەمو ئیشێکمان هەر بە دەستی راستە، لە جیسمی بەشەردا عوزویەکی لەتیفی وەکو ژنانمان بێ، لە ئەکسەری حقوق مەحروممان کردوە. باوجود خیتابی ئیلاهی و ئەوامیری حەدیس تەنها رو ناکاتە پیاوان بۆ عیلم و عەمەل و سەعی و ئیتاعەت و سائیرە، هەردولا موکەلەفن کەچی لە مەیدانی موبارەزەدا تەنها پیاو وجودی بۆتە نیشانەی تیری بەلا و موصیبەت، ئەم مەوزوعە ئەگەرچی بە چەند جیلد تەواو نابێ ئەما لەتەرەف

فەیلەسوفی عیراق زەهاویەوە بە شیعرێکی عەرەبی خزمەتی ژنیش بۆ وەتەن چەند لازمە وەهای بەیان فەرموە، وەکو نەقشی بەرد لە هەمو دڵێکا جێگیرە. ئەو شیعرە جوانە نەمتوانی بە عەرەبی تەخمیسی بکەم ناچار بە کوردی تەخمیسم کرد هەتا ئەو قەولی حەکیمانەیە بخەمە بەرچاوی تێگەیشتوانی وڵات و بکرێ بە دەستورەلعەمەل:

بۆ وەتەن غیرەتی ژان دارکە لە دنیا مەشهور
ڕێگەیی حەق دەگرێ رابیعە بێ یا مەنسور
خدمەتی جەنەت ئەکەن هەردو چ غیلمان و چ حور
(یرفع الشعب فریقان اناث وذکور
وهل الطائر الا بجناحیه یطیر) (ژیان، ژ 67، 24 ی مایسی 1927).

**فایەق بێکەس** ساڵانێک دواتر، بەمجۆرە باسی دەوری ژنی کردوە لە خەباتی نیشتمانیدا:
(نێر و مێ هەردو بە جوتە، بۆ وەتەن هەوڵێ ئەدەن
دورە دەرچونمان لە دیلی، مەل بە باڵێ نافڕێ)
**م. ئەدیب** بەڕێوەبەری رۆژنامەکە لە یەکێ لە وتارەکانیدا نوسیوێتی:
"لە ساحەی مەدەنیەت دا، تەرەقی و تەعالی میلەت، بە تەکامولی فکری و پێگەیشتنی هەردو فیرقەی میلەتەوە بەستراوە کە لە ژن و پیاو موتەشەکیلە. تەرازویەک کە هەردولای لە عەینی قورسایی‌دا نەبێ چۆن کەسبی موازەنەت و بەرامبەری ناکا و بەم لا و بەو لادا دێ، میلەتیش لە مەیدانی پێشکەوتن دا ژن و پیاوی دەرەجەی تەحصیل و تەربیەیان یەک نەبێ، ئەو سەعی و کۆششەی ئەکرێ موتەساویەن بۆ هەردولا نەبێ و، بە یەکەوە شاهڕاهی تەرەقی نەگرن بیلتەبع موازەنەت و بەرامبەرێتی پەیدا نابێ و سەر ئەکات. ئێمە کە بە نیسبەت میلەتانی ترەوە دواکەوتومان پێ ئەڵێن و مادامکە ئارەزو و فیکری سەرکەوتن و پێشکەوتنمان هەیە، لازمە جنسی لەتیف کە عوزوی موهیمترین و بەشی بە قیمەتترینی میلەت تەشکیل ئەکەن موافیقی مەتلوب پێ بگەیەنین. دایک، کە مەحصولی ئەم جنسەیە ئەگەر باش ئیحزار بکرێ ئەولادی موستەقبەلی سبەینێی وەتەن بە موکەمەلیەتیەکی مادی و مەعنەویەوە دێتە وجود. ئەم دەستورە گۆپکەی ئەمەل و فکری هەمو پیاوێکی تێگەیشتوی وەتەنە." (ژیان، ژ 78، 18 ی ئاغستۆسی 1927).

"…. ئەو میلەتانە کە ئەمڕۆ بەرز و بڵند بونەوە و تەکامولیان کردوە… ئەم ئوصولە تەعقیب ئەکەن، نەتیجە ئەمڕۆ لە هەمو ئەوروپا، ئامریقا و لە قیسمێک میلەتە موتەمەدینەکانی شەرق دا ژن و پیاو وەکو یەک تەحصیل ئەکەن و بۆ رابواردنی حەیاتی ئیجتیماعیەیان موجادەلە ئەکەن، بە نەوعێک وەکو ئێستاتیقێ کراوە ئەمڕۆ لە ناو ئەکسەری میلەتە موتەمەدینەکانا لە ژن دا خوێندەوار زیاترە. هەرچەند لە پێشا ئەم مەوزوعە لە ناو ئێمەدا کە ئەکرایەوە زۆر کەسمان تەعەجوبی ئەکرد، بەڵام ئەمڕۆ دیمان و بە تەواوی… بو کە لە ئینتیخاباتی مەجلیسی عومومی بریتانیا… قیسمێکی زۆر لە ژنەکانیان بون بە مەبعوس و حەتا ئەمڕۆ وەزیری عومالی بریتانیا ژنێکە ناوی (مارغرێت فیلدە)…" (ژیان، ژ 189، 29 ی تەموزی 1929).

## 1. 2. مافەکانی ئافرەت

لە ژێر ناوی (ئافرەت) دا، ژیان لە زنجیرەیەک وتاردا کە بێ ئیمزا و دیارە بیروبۆچونی رۆژنامەکە دەرئەبڕێ، نوسیوێتی:

"لام وایە کەس نیە نەزانێ کە ئافرەت ئافەریدەی خوایە وەکو پیاو. خوا بۆیەکی ئافەریدەی کردوە کە وەکو پیاو لە دونیادا بژی و رابوێرێ و هەرچی خوا فەرمویەتی بیکا و هەرچی نەیفەرموە نەیکات. یەعنی جگە لەوەی کە ژنە و ئافرەتە هیچ فەرقێکی تری نیە لە گەڵ پیاوا و، پیاویش جگە لەوەی کە پیاوە هیچ فەرقێکی تری نیە لە گەڵ ژنا. پیاو بۆچی خەلق کراوە ئافرەتیش بۆ ئەوە ئافەریدە کراوە." (ژیان، ژ 93، 6 ی کانونی ئەوەلی 1927).

ئینجا ئەنوسێ:

"وەکو چۆن پیاو خوێندن و تەربیەی لازمە ئافرەتیش، بە ئەمری خوایش، ئەبێ بخوێنێ و پێ بگات. چونکە ئەگەر ئەم حاڵە هەروا دەوام بکات، هەر پیاو بخوێنێ و تەربیە بدرێ و تەکامول بکا و ئافرەت هەر وا لە ژێرەوە بێ، بێ مەعریفەت و زانست بمێنێتەوە، رۆژێک دێ کە ئیتر ئافرەت لە حەیات دا، غەیری بۆ دەفعی لەزەتی پیاو زیاتر بۆ هیچی تر قیمەتێکی نامێنێ و لە بەر چاو ئەکەوێت و پەکی ئەکەوێت، لە بەر ئەوە هەروەکو خوایش فەرمویەتی ئەبێ لە گەڵ پیاوا ئافرەتیشمان پێ بگەیەنین و فێری صنعەت و مەعریفەتیان بکەین." (ژیان، ژ 93، 6 ی کانونی ئەوەلی 1927)

لە ژمارەی دوای ئەودا، درێژە بە باسەکەی ئەدا و ئەڵێ:

"بزانن ئەوی ئافرەت ئەبێ بیزانێ چیە؟ کچێک بۆ ئەوەی لە حەیات دا موەفەق بێت و پێ بگات و کە شوی کرد لە گەڵ مێردەکەیا خۆش رابوێرێ و ماڵەکەی بە رێکوپێکی ئیدارە بکا و کە منالّی بو بە وێڵ و ئوصول بە خێوی بکات و بیانکات بە ئینسان ئەبێ نەختێ عەقڵ و مەعریفەتی ببێت کە ئەویش هەر بە مەکتەبەوە ئەبێ. کچێک لە مەکتەب دا بۆ ئەمرۆی ئێمە، نەختێ خوێندن و نوسین، ئەوەندە کە مەجبور نەبێ کاغەزی مێردەکەی وە یا کەسوکارێکی بە عەرزوحاڵچیەک وە یا نامەحرەمێک بخوێنێتەوە، نەختێ حساب فێر بێ، فێری پاکی و خاوێنی، درومان و چێشت لێ نانێکی رێکوپێک، فێری منالّ بە خێو کردن و ئیدارەی ماڵ بێ و بتوانێ لە دونیادا حەیاتێکی خۆش و بێ تەگەرە رابوێرێ. ئەمانە هەمو، ئەمین بن، بە عیلم و مەعریفەت نەبێ ناکرێ.

"خوا بۆیە ئافرەتی خەلق کردوە کە وەکو پیاو ئیش بکات، بجوڵێتەوە، فێری عەقڵ و مەعریفەت و هونەر ببێ، ئیدارەی ماڵ و منالّ بکات، وەلحاصل وەکو مەخلوقێکی تەواو و کامیل بژی و بمرێ و رابوێرێ. بۆیە ئافەریدە نەکراوە ببێ بە ئالەتی بەردەستی پیاو، ببێ بە چێشتکەر و گسکدەری پیاو، بێ عەقڵ و مەعریفەت بمێنێتەوە و لەزەت و خۆشی لە دنیا و حەیات نەبینێ.

"ئافرەتێک بۆ ئەوەی بزانێ چۆن ئەژی و چی ئەوێ لە حەیات ئەبێ فێری تەربیە و تەعلیم ببێ، هەتا ئێستا وا زانراوە کە ئافرەت موتلەقەن موحتاجی وەلی‌یەکە، داماوی گەورەیەکە، بەلام ئەگەر تا ئیستە وایش بوبێ لەمەولا ئافرەت نابێ هەر تەماشای دەستی پیاو بکات و هەرچی پیاو پێی بکا قبولّی بکا. لە گەڵ ئەوەیش دا زۆر ئافرەت و ژن هەیە وەلی و گەورەیەک بۆ خۆیان پەیدا ناکەن، زۆر کچ کە کەسوکاریان نەماوە و شویان نەکردوە، زۆر ژن کە مێردەکانیان نەماوە و بێوەژن ماونەوە، زۆر دایک کە منالّی کوری نیە وە یا منالّی وردیان هەیە. ئەمانە هەمو بۆ ئەوەی لە حەیات دا بژین و نانێکی دەستی خۆیان بخۆن، ئەبێ بخوێنن، فێری مەعریفەت بین، چونکە ئەگەر ئیشێک نەزانن، عەقڵ و هونەرێک فێر نەبن، ئاخری مەجبور ئەبن یا دەستی مەرحەمەت بکەنەوە لە کۆلانان یا بچنە مالان کارەکەری بکەن. ئەمانە حەیفە وا رەزیل و سەفیل بمێننەوە و بێ کەس و بێ صاحیب بسورێنەوە. لازم ئەکا فێری صنعەت و مەعریفەتێک و ئیشێک بن..." (ژیان، ژ 94، 13 ی کانونی ئەوەلی 1927).

دو ژمارە دواتر درێژەی بە باسەکە داوە:

"چ پیاوێک هەیە کە چاوی کوێر نەبێ و زەرەیەک عەقلی ببێ تێ نەگات کە ئافرەتیش وەکو خۆی خوا ئافەریدەی کردوە بۆ جوتی ئەو، بۆ رەفیق و خۆشەویستی ئەو، بۆ عەبد و نۆکەر و چێشتکەری ئەوی خەلق نەکردوە و، ئەویش وەکو پیاو عەقڵ و چاو و زبان و هۆش و شعوری هەیە.

"لای ئێمە ئافرەت هەر بۆیە هاتۆتە سەر دونیا کە لە ماڵەوە دابنیشێ و چێشت لێ بنێ، گەندوگو پاک بکاتەوە، کە ئیشی نەبو غەیبەت بکا و بنێشت بجوێ و تەشی بڕێسێ. لای ئێمە ئافرەت نابێ لە ماڵ بێتە دەرێ. وەکو زەمانی یۆنانی قەدیم هەر بۆ حەمام و سەرقەبران بێنە دەرێ. فەقەت پیاو بە هەوەسی خۆی رابوێرێ، کەیف بکا و بژی. ئەگەر موراجەعەت بە (قورئان) و قەوانین و ویجدانیش بکەن، ئەبینن کە ئەمە زوڵمێکی یەکجار گەورەیە. غەدرێکی زۆر زلە پیاو لە ئافرەتی ئەکات، چونکە بە واسیتەی ئەوەی کە ئافرەت لە ماڵ دا حەپس ئەکەن و تەنها بۆ چێشت لێ نان و نوێن داخستن ئەیهێنن، قیسمێکی زۆر لەم مەخلوقاتە، لەم میلەتە، مەحکومی مردن و سستی و ئیش نەکردن ئەکەن..." (ژیان، ژ 96، 3 ی کانونی سانی 1928)

لە وتارێکی کەدا کە ئەم پرسیارەی کردوە بە سەردێڕی: (دوارۆژی وڵاتەکەمان بە چی باش ئەبێ؟) و، هەر خۆی لە سەردێڕی هەمان وتاردا نوسیوێتی: (پێشکەوتنی ژنانمان) بە ئیمزای (لاوێک) لە هەمویان رونتر باسی مافەکانی ئافرەت ئەکا و ئەڵێ:

"قەدری ژن لە لای ئێمە لە پێش دا و ئێستاش هەروەها زانراوە کە ژن ئەبێ هەر لە ماڵەوە بێت و ئیشی ماڵ بکات، وەکو چێشت لێ نان و گەسک دان و جل شتن و بەعزێ ئیشی تر کە لە ماڵ دا دەیکەن. بە خوا ئەمە حەقی ژن نیە. ژنیش هەروەکو پیاو حەقی خوێندن و حەقی کاسبی کردنی هەیە، حەقی رەئی هەیە لە ناو کۆمەڵ دا..." (ژیان، ژ 247، 26 ی حوزەیرانی 1930).

### 1. 3. پێکەوەنانی خێزان

ژیان لە ژێر سەرناوی (ئیزدیواج) دا نوسیوێتی:

"لە قورئانی گەورەدا لە لایەن ئیزدیواجەوە نصوص و ئایاتی زۆر جوانی تیایە، وەکو ئەفەرموێ (ان خلق لکم انفسکم ازواجا لتسکنوا الیها وجعل بینکم مودة ورحمة) کە لەم ئایەتەدا بە تەواوی دیارە کە ئافرەت بۆ عەبدایەتی نا، بۆ ئەوەی ببێ بە رەفیق و خۆشەویستی پیاو خەلق کراوە. کەچی ئەگەر ئینسان بروانێتە معامەلەی پیاوی ئێستا دەرحەق بە ئافرەت و ئەم ئایەتە گەورەیە بخوێنینەوە لە معامەلە و بێ ویجدانی پیاو هەر وا موتەئەسیر و شەرمەزار ئەبێ. چونکە لای ئێمە وا زانراوە کە ئافرەت هەر بۆ دەفعی لەزەتی پیاو، بۆ ئیشکردن و چێشت لێ نان، هاتۆتە سەر دونیا. موافیقی ئەو ئایەتە موبارەکە رابیتەیەک، کە بە موحیبەت و لوتف وجودپەزیر ئەبێت، لە بەینی ژن و مێردا بە واسیتەی هەنێ لە مەلا جاهیلەکانەوە هاتۆتە سەر ئەوەی ئافرەت ببێ بە ئالەتی بەردەستی پیاو و بەو چەشنە هەرچی خراپ بێ دەرحەق بە ئافرەت رەوا ئەبینرێ." (ژیان، ژ 96، 3 ی کانونی سانی 1928).

لە ئەڵقەی چوارەمی ئەم باسەدا نوسیوێتی:

"بە هەمو مەزەبێ، بە هەمو قورئان و ئەحادیس، دەرئەکەوێت کە لازم ئەکات لە وەختی ئیزدیواج دا دەسگیرانەکان یەکتری ببینن. بەعزێ شتی زۆر جوزئی و هیچ هەیە کە زۆر ئەهمیەتی ئەدەینێ، بەڵام ئەوی کە پێویستە بیکەین بە جێی ناهێنین، چونکە جاهیل و نادان، کەر و بێ عەقڵ، هەر شتی خراپ و بێ مەعنا ئەکەن.

"تو خوا با بۆتان وەصف و تەعریف بکەم کە لای ئێمە ژنهێنان چۆنە؟ نا ئەستەغفیرەڵا، ژن هێنان نا، ژن کرین چۆنە؟ چونکە لێرە کچ وەکو ترۆزی و خەیار ئەفرۆشرێ نادرێ بە شو. بەڵام باسـی ژنهێنـانی لای عەشائیر و دێهاتی ناڵێم، چونکە شوکردنی ئەوان موافیقی عەقڵ و عادەت چاویان بە یەکتری ئەکەوێت، هەر لە مناڵیەوە لە گەڵ یەک دا هەڵئەسن و دائەنیشن و ئیش و فرمان ئەکەن." (ژیان، ژ 97، 10 ی کانونی سانی 1928).

لـە سـەروتاری ژ 121 دا لـە ژێـر سـەردێری (لێـرەدا هـیچ ریعایـەتی ئوصـولی ژنهێنـان نـاکرێ) نوسیوێتی:

"هەتا ئێستا لە خسوس حقـوقی ئـافرەت و ژنهێنانـەوە زۆر دواویـن، فەقـەت چونکـە ئـەم مەسـئەلەیە مەسئەلەیەکی رۆحی موهیمە ئەمانەوێ دیسانەوە لێی بدوێین.

"هەرچەند بەعزەن لە تەئەهول کردن دا ئینسان نەختێک عەزاب ئەکێشێ و توشی غەم و ئەزیـەت دێـت و، بەعزەن پەشیمان ئەبێتەوە، بـەڵام ئەگـەر ژنهێنـان کـە مـەعقول و ریعایـەتی هـەمو ئوصـولێکی بکـرێ، بـە ئەکسەریەت زۆر باش ئەبێ و پەشیمانی لە دوا نابێ و بۆ بەشەریش خدمەت ئەکا.

"مەعلومە ئەگەر ژنهێنان نەبوایە بە مودەتێکی کەم زو بەشەر دوایی ئەهات و نەئەما، ژنهێنان وەکـو بـۆ زیادی و دەوام و مانەوەی بەشەر باشە، بۆ گۆرینی ئەخلاقی خراپی ئینسان بە چاکە و بـۆ زۆر خسوسـیاتی ژن و مێردەکە بە کار دێت، بە شەرتێک ناڵێم بە پێی قەوانینی مەدەنیە هیچ نـەبێ وەکـو شـەریعەتی خۆمـان ئەمر ئەکات وا بکرێ.

"مەعەلئەسەف لێرەدا چونکە تەماشا و رەهبەری ئوصولی ژنهێنـان نـاکرێ، زۆر لـەو کەسـانەی کـە ژن ئەهێنن پەشیمان ئەبنەوە وە یا توشی ژیانێکی ناخۆش و تاڵ دێن، وە بەعزەن بەم سەبەبەوە ئـەخلاقی ژن و مێردەکەیش تێک ئەچێ.

"بە پـێی قـەوانینی مەدەنیـە و شـەریعەتی ئیسـلامیەیش لازمـە لـە ژنهێنانـا ئـەوەل دەفعـە تەماشـای (هاوکوفی) بکرێ و هیچ نەبێ ئەگەر دەفعەیـەکیش بـێ کـوڕ و کچەکـە یـەکتری ببیـنن. وە چـاکتر لازمـە لـە ئەخلاقی یەکتری شارەزا ببن. فەقەت لێرەدا بە عمومی هەتا شەوی مولاقاتیان نە ژنەکە کوڕەکـە و نـە کوڕەکـە ژنەکە ئەبینێ و، لە بەر ئەمـە زۆر دەفعـە واقیـع ئـەبێ کـە لـە ئـەوەل دەفعـەی ئیجتیماعیانـا جیـا ئەبنـەوە و هەردوکیان توشی فەلاکەت و زەرەر و بێ ئەخلاقی ئەبن.

"لە بەر ئەوە پێویستە لە ژنهێنان دا زۆر ریعایەتی هـاوکوفی بکـرێ، کـە یـەعنی ئـەبێ کـچ و کوڕەکـە ئەخلاقیان، سەویەیان، عیلمیان، سەروەتیان، لە هەمو زیاتر عومریان وەک یەک بێ. ئەگەر ئـەم موناسـەبەتە لـە بەینیانا مەوجود نەبێ موحەققەقە هەتاکو سەر بە یەکەوە نابن و هیچ قوەتێ بە یەکیانەوە نانوسێنێ. وە ئەگەر تەماشای هاوکوفی کرا ئەوسا دائیمەن موحیبەتێکی دائیمی لە بەینیاندا ئەبێ و هەردوکیان هـەتاوەکو ئـاخری حەیات خۆش رائەبوێرن.

"غەیری ئەمەیش ئەکسەری دێهاتەکانمان و زۆری عەشـیرەتەکانمان حقوقێـک نـادەن بـە ژن، عادەتـەن وەکو حەیوان تەماشایان ئەکەن و، وەکو لە جنسی بەشەر نەبن وایان ئەزانن و تەماشا ئەکەن. وە کچـەکانیان عادەتـەن یـا وەکـو حـەیوان ئەیانگۆڕنـەوە وە یـا ئەیانفرۆشـن. وە پیاوێـک کـە ژن بێنـێ پێویسـتە هـەمو سەروەتەکەی سەرف بکات و بـەعزەن بەمـەیش ئیکتیفـا نـاکرێ ئـەبێ بـۆ ژنهێنـان هـەمو مڵـک و ماڵەکـەی بفرۆشێ، سەرفی بکات وە یا ئەگەر بیگۆڕنەوە ژن بە ژن بکەن لەوێشا هیچ تەماشای عومر، سەروەت، عائیلـە، حاصلی هاوکوفی ناکەن. بەعزەن پیاوێک 60 سـاڵی عـومرە، کـە کـوڕی کوڕەکەیشـی ژنـی هێنـاوە، کـەچی کچەکەی ئەدات بە کچێکی 14 ساڵەیی بۆ خۆی. ئینجا ئەگەر تەماشای ئەمە بکرێ هەمو کـەس بـۆی مـەعلوم

ئەبێ کە لەمەدا چەند حقوقی ئەو کچە زایع ئەبێ. وە یاخود لە دانی کچێکی 14 ساڵە بە پیاوێکی پیری 60 ساڵەدا چەند فەلاکەت، موسیبەت و غەم و حەسرەت لە بەینیانا پەیدا ئەبێ.

"غەیری ئەمەیش ئینسان نابێ بێ لێکدانەوە ژن بێنێ. شەخسێک کە ویستی ژن بێنێ پێویستە لە پێش هەمو شتێکا تەماشای ئیستیقبالی خۆی بکات و ئەبێ بە نەوعێک ئیقتیداری بێ و موستەقبەلی تەئمین بێ، کە ئەگەر چوارپێنج منداڵیشی بێ بتوانێ موافیقی مەتلوب منداڵەکانی بە خێو و پەروەردە بکات، چاک پێیان بگەیەنێ چونکە پیاوێک کە سەروەتی نەبو و لە ئیدارەی خۆی عاجز بو ئەگەر تەشکیلی عائیلەی کرد بە کردنی توشی سەفالەت و پەرێشان ئەبێت. لە بونی هەر منداڵێکیا وەکو جینایەتێکی کردبێ وا موعەزەب ئەبێ. تەبیعی چونکە منداڵەکانی بۆ بە خێو ناکرێ. هەموی مەعلول، سەفیل و برسی... کۆمەڵێکی عاتیل ئەکا بە بار بە سەر هەیئەتی ئیجتیماعیەوە. وە هەموی بە سەبەبی ئەمەوەیە کە لەم موحیتەدا دائیمەن، بێ ئیش، سەرسەری، سواڵکەر، زۆرە و ئەمانیش هەموی مەزەڕەتێکی زل تەشکیل ئەکەن بۆ بەشەر.

"زۆر عەیبە کە لەم عەسری مەدەنیەتەدا و، لە حاڵێکا کە ئەوروپاییەکان و ئامریقاییەکان ئەم مەسئەلەیەیان لە هەمو شتێک زیاتر گرتوە، حەتا بەم سەبەبەوە خەریکن ئیسلاحی بەشەر بکەن و عیرقەکەیان بە قوەت، فەعال و خوێنێکی گەرمی فەعالیان بۆ پەیدا بکەن، کەچی ئێمە هێشتا ژن بە حەیوان بزانین و هیچ تەماشای مەسئەلەی ژنهێنان نەکەین، چونکە ئەم مەسئەلەیە لە هەمو شتێک زیاتر بوە بە سەبەبی تێکدانی ئەخلاقمان. پێویستە زۆر بە ئەهمیەتی بگرین و ریعایەتی ئوصولی ژنهێنان بکەین."

ر. ن. **(رەشید نەجیب)** لە زنجیرە وتارێک دا کە بۆ (نەخۆشی ئیجتیماعی‌مان) ی تەرخان کردوە، لە ئەڵقەی سێیەمی‌دا لە ژێر سەردێڕی (ژن هێنان، بناغەی ژیان) دا بە ئوسلوبێکی ئەدەبی نوسیوێتی:

"سیفاتی ئەساسیەی خێزان، لام وایە، رەفیقەی مێرد بون، دایکی ئەولاد کردن و کەیبانویەتی ماڵە.

"رەفاقەتێکی ئەبەدیەی حەیات روکنی ئەوەل و ئەهەمی ئەم سێ کوچکەیەیە. بە زەنی من پیاوێک تا بە تەواوی لە هەمو سیفات و مەزییەتی ئافرەتێک تێ نەگا، چاک لێی حاڵی نەبێت، مومکین نیە بە سەمیمیەت و جدیەتیەکی تامەوە رەبتی قەلبی لە گەڵ بکات. وە سەمیمیەت، موحیبەت، یەکگرتنی دڵ، لازمە بێ بە سەبەبی یەککەوتنی دەست. لە لانەی عائیلە ئیجاب ئەکات هالآوی موحیبەت، هالەی عەشق، هەڵسێت نەکو گڕی قەهر و کڵپەی غەزەب. لازمە دەستی مێرد بە رەعشەی غەرامەوە بلەرزێت، نەک بە لرفەی قینەوە و، لام وایە خوا چاوی ئافرەتی تەنها بۆ فرمێسکی سرور هەڵرژاندن خەلق کردوە نەک بۆ گریانی تەحەسور.

"حوسن، لە نوقتە نەزەرێکەوە ئاهەنگ، تەوازونە، وە چۆلەکەش کە جریوەیان یەکی گرت دەنگێکی خۆشی مۆسیقی لێ حاصل ئەبێت، فەقەت لە گەڵ قیڕەی قەلەرەشێکی تێکەڵاو بو بە جاڕێ تێکی ئەدات. وەستانی کائیناتیش هەر نەتیجەی ئاهەنگ، تەوافوق و تەوازونێکە.

"شەرتی جوانی، خۆشی و سەعادەتی عائیلەش ئاهەنگ و ویفاقە، ئەدنا سەکتەیەک لە حەیاتی ژن و مێردی‌دا ئەم شیعرە جوان و رەوانە لەنگ و سەقەت ئەکات. ئاهەنگی عائیلە بە تەوافوقی زەوق، تەتابوقی حوسن، تەوازونی زهنیەت و عەقلی ژن و مێردەوە مومکینە.

"مەعازەڵا یەک نەگرتنی ئەمانە یا شۆڕشێکی ئەبەدی بەینی عائیلە دێنێتە وجود وە یا تەلاق.

"موحەقەق هەمو تێگەیشتویەک لە گەڵ من دا ئیعتیراف ئەکات دۆزینەوەی جوتێک حائیزی ئەم شەرائیتە بێت هەر وا ئاسان نیە، بیلخاصە لە سەر ئوصول و تەریقەی تەئەهولی ئێمە بەڵکە مەحاڵە. مێردی قوڕ بە سەر لای ئێمە هەتا شەوی زەفاف حەتا لە رەنگی (رەفیقەی موستەقبەلی) و ئافرەتی بەدبەخت لە دەنگی (رەفیقی ئاتی) بێ خەبەرە.

"وە کەزا هەمو تێگەیشتویەک پێی لێ ئەنێت، بە سەبەبی عـەدەمی مـەعاریف و تـەرزی ئیزدیـواجێکی نامەعقولەوە هەمو رۆژێ شاهیدی هەزاران فەجائیعی عائیلە ئەبین. لەو لاوە ماڵێک شەو و رۆژ، خورتە، شەڕ و گریانی ژن، هەر رۆژە نارۆژێک تۆران، پیاو بە سەبەبی نارێکی و یەکنەگرتنی دڵـەوە ئەکسـەری ئـەوقاتی لـە خاریج دا بە ئەنواعی لەهو و سەفاهەت سەرف ئەکات.

"لەم لاوە، هێشتا دوەم مانگی تەئەهول تێ نەپەڕیوە، مێردی بێچارە عەدەم ئیمکانی یەکبونی لـە گـەڵ ئەم ژنەیدا حس کردوە. خەریکە و هەوڵ ئەدات بۆ ژنی دوەم. نەتیجـە دوژنـی، هەوێسـاری، مـەعلومی هـەمو لایەکە ژن کە لە ماڵ دا هەر یەکێک بـو نـورە، بـو بـە دو ئـاگرە. ئـەم دوانـەش یـەک لـە قینـی یـەک مـاڵی مێردەکەیان وێران ئەکەن و نیزاعێکی ئەبەدی لـەو ماڵـە دەسـت پـێ ئـەکات." (ژیـان، ژ 142، 2 ی کـانونی ئەوەلی 1928).

## 2. مەکتەبی کچان لە سلێمانی

خوێندنی نوێی حکومەتی لە سلێمانی دا لە چاو ناوچەکانی تری کوردستان و عیراق دا، پێشـینەیەکی دێرینتری هەیە. لە کۆتایی سەدەی نۆزدەهەمەوە لە سلێمانی لە پاڵ مزگـەوت و مەدرەسـەی دینـی و حـوجرەی تایبەتی‌دا، قوتابخانەی نوێ هەبوە کە ژمارەیەکی باش خوێندەوار و رۆشنبیری پێ گەیاند. لە داوودەزگاکـانی حکومەتی عوسمانی و، دواتر لـە داوودەزگاکـانی حکومـەتی تازەدامـەزراوی عیـراق‌دا پلـە و پایـەی بـەرزیان وەرگرت. خوێندن و پەروەردە بە شێوەی نوێ بیو بە بەشێ لە ژیانی دانیشتوانی سلێمانی.

سەرەڕای هەمو ئەو کۆست و کارەساتەی بە هۆی یەکەمین جەنگی جیهانی و دواتـر بـە هـۆی شـەڕی ئینگلیز– کوردەوە بە سەر ناوچەکەدا هات بو، هەر کە هەلێکیان بۆ هەڵکەتبێ خوێندنگەکانیان بوژاندۆتەوە.

### 2. 1. کردنەوەی

رۆشنبیرانی سلێمانی هەوڵێکی زۆریان داوە بۆ ئەوەی خوێندنگەی کچان، لە سلێمانی و لە شـوێنەکانی تردا بکرێتەوە. بۆ ئەم مەبەستە هەوڵێکی زۆریان لای کاربەدەسـتانی پـەروەردە (مـەعاریف) ی بەغـداد داوە. دیاریی کوردستان کە بە 3 زمانی کوردی و عـەرەبی و تـورکی لـە بەغـداد دەرئـەچو، لـەم بـارەیـەوە چەنـد وتارێکی نوسیوە. مەبعوسەکانی کورد یش، بە تایبەتی ئەمین زەکی بەگ، چ لە ناو مەجلیسـی مەبعوسـاندا و، چ بـە هـەوڵی شەخسـی، خـەریکی ئەنجامـدانی ئـەم کـارە بـون. سـەرەنجام کارەکـەیان سـەر ئـەگرێ و خوێندنگەیەکی سەرەتایی بۆ کچان لە سلێمانی ئەکرێتەوە.

ژیان لە ژ 13 دا هەواڵی کردنەوەی بڵاو کردۆتەوە:

"مەکتەبی کچان

"لە ئیعتیباری 21 ی نیسانی 926 رۆژی چوارشەمەوە مەکتەبی کچان دەستی کردوە بە قەید و قبوڵی قوتابی. ئەوانەی حەز ئەکەن کچەکانیان بخەنە مەکتەبەوە لە تاریخی مەزکورەوە موراجەعەت بـە ئیدارەخانـەی مەکتەب بفەرمون. لە خانوەکەی عەلی بەگی فەتحولا بەگ دایە."

بۆ ئەوەی مەکتەبی کچان جێگیر بێ و ببێتە دامەزراوێکی دائیمی پێویستی بـە بینـای تایبـەتی خـۆی هەبوە. ژیان لە ژ 78 دا هەواڵی داوە:

"وەزیری ئەشغال و مواصەلات مەعالی ئەمین زەکی بەگ، کە کوردێکی میلەتپەروەر و وەتەنیە، بینا بـەم فکر و مەقصەدە، بۆ دانان و کردنەوەی مەکتەبی کچانی سلێمانی یەکانە هەوڵـدەر و سـاعی بـو، لـە رێی ئـەم خزمەتەدا لە هیچ تەشەبوسێک دوا نەکەتو، حەتا لە مەجلیسـی مەبعوسـان دا بـە دەفـەعات داوای کـرد تـا بـە

کردنەوەی مەکتەبی کچانی ئێرە موەفەق بو. ئەگەرچی ئەم لانەی ئومێدی وەتەنە کرایەوە فەقەت لە بەر ئەمەی کە بینایەکی تایبەتی نەبو وە ئەو جێگایەی کە بۆی تەخصیص کرا بو، جێگایەکی وا نەبو کە بۆ مەکتەب بە کەڵک بێ و لە گەلێ خصوصەوە نوقصانیەتی بو، لزومیەت بە ئینشا و دروستکردنی بینایەکی تایبەتی حیس کرا. دیسان لە سایەی عەزم و تەشەبوساتی جدیەی موشار ئیلەیهیەوە بۆ ئەمەیش قەرار ئیستیحصال کرا. ئەوا ئێستا لە مەوقیعێکی باش دا بناغە و تەمەڵی ئەم موئەسەسە بە قیمەتە هەڵئەدەنەوە. هەروەکو بیستومانە ئەوەل بەردی تەمەڵی ئەم جامیعەیە بە دەستی موشفیقی مەعالی جەنابی ئەمین زەکی بەگ، کە حەقێکی مەشروعی خۆیەتی، دائەنرێ."

ڕۆژی 20 ی ئاغستۆسی 927 بە ئامادەبونی موتەسەڕیف و موفەتیشی ئیداری و ئەشراف و کیباری مەملەکەت، ئەمین زەکی بەگ وەزیری مەعاریفی ئەو کاتەی عیراق، بەردی بناغەی مەکتەبی کچانی دانا. ژیان لە ژ 79 دا ریپۆرتاجێکی بە بۆنەی ئەم ئاهەنگەوە ئامادە کردوە تێیدا نوسیویێتی:

"ئەوەلەن لە تەرەف خەتیبی مزگەوتی گەورەوە خوتبەیەکی بەلیغ و چەند دوعایەکی موئەسیر خوێندرایەوە و وازیحەن بە ئایەت و حەدیس بەیانی کرد کە شەریعەتی غەڕای ئیسلامی بە ژن و پیاو موتەساویەن ئەمری خوێندن و تەعلیم ئەکا" جگە لە ئەمین زەکی، فایەق زێوەر وتارێکی بەم بۆنەیەوە خوێندەوە.

ڕۆشنبیرانی کورد بەوەندە دانەکەوتون، بەڵکو لە داواکانیان دا بەردەوام بون. وەکو ژیان لە ژ 118 دا نوسیویێتی، مەبعوسەکانی کورد لەو (تەقریرە دا) کە بە کۆمەڵ داویانە بە وەزارەتی مەعاریف، نوقتەی 6 ی خواستەکانیان "کردنەوەی مەکاتیبی کچان" بوە.

## 2 .2. هەڵوێستی جیاواز لە خوێندنی کچان

لە ژێر سەردێڕی (گفتوگۆیە: ئیفرات نە تەفریت) ژیان دەمەتەقێیەکی بە زمانی ع. و م. هوە بڵاو کردۆتەوە کە جیاوازیی بیروڕای ئەو کاتەی توێژەکانی کۆمەڵی کورد و ناکۆکی هەڵوێستیان لە خوێندن و پەروەردەی کچان ئەنوێنێتەوە.

ئەمە دەقەکەیەتی:

"لە ماڵەوە دانیشتبوم م. هاتە ژورەوە بە ناوچەوانێکی غەمگینەوە دانیشت.

ع. بۆچ وا عاجزی ئەڵێی خەبەرێکی ناخۆشت بیستوە؟

م. ئەرێ بە خوا خۆزگە بەو کەسە کە ڕۆژێ زوتر ئەمرێ و شتی خراپتر نابینێ. من ئەڵێم ئاخرزەمانە تۆ پێم بڕوا ناکەیت و، ئەڵێن مەکتەبی کچانیش دانراوە ئەمجا نۆرەی کچەکانمانە هەمو ئەفعالیان شەڕ بێ.

ع. ئەی هاوار بە ماڵم! تۆ کە خوێندەواری ئەمە فکرت بێ ئەبێ نەخوێندەوارەکان بڵێن چی؟

م. خوێندەوار و نەخوێندەوار فەرقی چیە؟ هەر کەس موسوڵمان بێ ئەزانێ ئەمە شتێکی زۆر خراپە.

ع. بۆ خاتری خوا ئەم قسەیە بەم نەوعە لای عەوام مەکە. تازە بە تەماین مۆمێکی زانستیمان لەم تاریکی جەهلە بۆ دابگیرێ، لێمان مەبە بە ڕەشەبا.

م. جارێ پێم بڵێ ئەم دینە تازەیەت کەی پەیا کردوە خۆ تۆ موسوڵمانێکی باش بویت؟

ع. من ئێستایش موسوڵمانەکەی جارانم نیهایەت ئەزانم ئیسلامیەت تەنها مەخصوصی پیاو نیە بۆ ژنیشە و خوێندنیش بۆ ئیسلامیەت زۆر موفیدە بۆیە پێم خۆشە ژنانیش خوێندەوار بن.

م. تەنها خوێندەواری باشە ئەما نوسین فێربونەکەیان خراپە.

ع. لەم فەرمودەیەت نەگەیشتم گوایە نوسین فێربون خراپە یا صوحبەت ئەکەیت؟

م. ناوەڵا صوحبەت ناکەم مەعلومە کە ژن نوسین بزانێ زۆر خراپە چونکە بیەوێ لە تەک شەخصێکی بێگانە موعاشەقە بکا بە موخابەرە زو جێبەجێ ئەکات.

ع. وەک تۆ ئەفەرمویت ژنێ کە فکری خراپەی بێ و نوسین نەزانێ رەنگە هیچی بۆ نەکرێ. ئەی ئەی پەکی ئەکەوێ!

م. دیارە پەکی ناکەوێ ئەما باسی ژنی خراپ ناکەین.

ع. دەی تو خوا ژنێکی عەفیفە بیەوێ کاغەزێ بۆ مێردی بنوسێ و خۆی نەزانێ مەجبور بێ بچێتە لای کەسێکی بێگانە و لە بەر ئەمە کە تەبیعی نایەوێ خەڵقی بزانن چی بۆ مێردی ئەنوسێ خەلوەتیش لە تەک کابرای کاتبا بکات بە تەواوی موخالیفی شەریعەتە باشە، یا خۆی بیزانێ بە دەستی خۆی بینوسێ باشە؟

م. دیارە خۆی بینوسێ باشە.

ع. ئەی کەواتا مەکتەبی کچان شتێکی زۆر باشە و بێ حیکمەتیش نیە کە حەزرەت (ص. ع) فەرمویەتی (طلب العلم فریضة علی کل مسلم ومسلمة)

م. ئاخر ئەمە ئەگەر هەر بۆ نوسین و خوێندن بوایە باش بو ئەما ئاخ فائیدەی چی؟

ع. لەم ئاخە تێ نەگەیشتم ئەترسم فێربونی نەقش و نیگار و ئەو مەعریفەتانە کە بۆ ژن لازمە بیزانێ خصوصەن موافیقی حیفزەل صیحە منداڵ پەروەردە کردن کە یەگانە سەبەبی تەئمین و تەتویلی حەیاتە بە لای جەنابتەوە وەکو فێربونی نوسینەکە خراپ بێ؟

م. ناوەڵا ئەمانە ئینکار ناکرێ کە زۆر چاکن ئەما سەربەست بونەکەیان خراپە و بێ شەرعیە.

ع. ئەی ناوی سەربەستیت هێنا برینی زلم کولایەوە ئاخر عەزیزم ئێمە هێشتا مەعنای سەربەستیمان نەزانیوە بۆیە مستمان ناکەوێ وە ئیلا سەربەستی ژنان مەعنای ئەوە نیە کە بۆ بێ شەرعی و خراپەکردن سەربەست بن.

م. بەرێ وەڵا ئەوەیە ئەی چیە؟

ع. نا بە خوا ئەوە نیە، سەربەستی هەر ئەو حوریەتەیە کە شەرع پێیانی بەخشیوە و لێیان غەصب کراوە.

م. کامەتا حوریەتی شەرعیی ژن کە غەصب کرابێ؟

ع. ئەی بێ قەزا بی خۆ مەسئەلەی تەئەهول کە دەخڵێکی گەورەی بە سەر حەیاتەوە هەیە بە جارێ شەرعیەکەی بۆتە عەیب و بێ شەرعیەکەی بۆتە عادەت. کەی ئەبینی کچێ کە درا بە شو پرسێکی پێ بکرێ بیلخاصە لە دەرەوە لە ئەموالی مەنقولە عەد ئەکرێن وەکو گا و گوێرەکە یا لە باتی خوێن ئەدرێن، یا بە پارە ئەفرۆشرێن، یا وەک سەگ بە تولە ژن بە ژنیان پێ ئەکرێ. ئەی ئەمە حوریەت غەصب کردن نیە چیە؟

م. بەڵێ وایە ئەما وا تۆ مەعنای سەربەستی وا لێ ئەدەیتەوە وە ئیلا من لە منەوەرێکی مەعاریفپەروەرم بیستوە کە مەدحی مەکتەبی کچانی کردوە کە فێری سەما ئەبن و گۆرانی ئەڵێن و سەربەست ئەبن. یەعنی بە ئارەزوی خۆیان هەرچی بکەن مەنع ناکرێن.

ع. حاشا مەعنای سەربەستی ئەوە نیە ئەما ئاخ بڵێم چی لە دەست ئەو نەوعە منەوەرانە کە بون بە گێرەشێوێنی ئەم میلەتە لە هەمو باسێکا زو باز ئەدەنە سەر بێدینی و کفر، بە نەوعێ نەفرەتی عالەمیان وەرگرتوە کە لەفزی منەوەر جێی جنێوێکی پیسی گرتۆتەوە.

م. ئەشهەدوبیلا حەقیقەتی مەسئەلە ئەمەیە ئەگەر ئەو نەوعە منەوەرانە واز لەم ئیفراتە بێ مەعنایە بێنن ئەم عالەمەیش یەکجار وا مەیلی تەفریت ناکەن وە ئیلا بەشەر چۆن لە عەلەیهی مەعاریف ئەبێ. لە هەلەبجەوە ع. صوبحی" (ژیان، ژ 60، 31 ی مارتی 1927).

## 2. 3. چالاکیەکانی مەکتەبی کچان

کچانی خوێندنگەکەی سلێمانی، لە ماوەیەکی کەم دا پێشکەوتنێکی دیاریـان بـە دەس هێنـاوە. لـە زۆر چالاکی کۆمەڵایەتی گرنگـدا بەشدار بون کە نیشانەی ئەوەن ئافرەت لە چوار دیواری ماڵ دەرچـون و پێـیان ناوەتە مەیدانێکی تازەوە کـە مەیـدانی بەشـداری ژیـانی کۆمەڵایـەتی بـوە. ژیـان هەواڵـەکانی بـە خۆشـی و پشتیوانیەوە بڵاو کردۆتەوە، لەوانە:

### 2. 3. 1. پیشانگەی ساڵانە

ژ 72 ئەم (ئیعلان) ەی بڵاو کردۆتەوە:

"سەنەی تەدریسیەی 926– 927 ی مەکتەبی کچانی سلێمانی تەواو بو، ئەو نەقش و درومانانەی کـە لە ساڵی مەزکوردا بە دەست و سەعی قوتابیەکان هاتۆتە وجود، ڕۆژی جومعە و شەمە کـە تەصـادوفی 8 و 9 ی تەموزی 927 ئەکات بۆ پیاوان و ڕۆژی یەکشەمە و دوشەمە کە بەر 10 و 11 ی مانگ ئەکەوێ بۆ ژنـان، لە بینای مەکتەب دا ئەخرێتە ساحەی تەماشاوە. لە ژن و لە پیـاو ئـەو کەسـانەی ئـارەزوی بینینـی ئەکـەن لـە میعادی موعەیەنەدا تەشریف بفەرمون. مودیرەی مەکتەبی کچان"

سەروتاری ژمارەی 73 ی ژیان بۆ ستایشی ئەم پیشانگەیە و قوتابی و مامۆستاکانیان تەرخان کراوە.

ژ 242 ی 2 ی حوزەیرانی 1930 هەواڵی داوە:

"نەقش و درومانەکانی مەکتەبی کچانی ئێرە و کەرکوک

"بە موناسەبەتی نزیک بونەوەی ئیمتیحانەوە بۆ ئەوەی ئەو ئیشـی دەسـت و درومـان و نەقشـەی کـە تالبەکانی مەکتەبی کچانی سلێمانی و کەرکوک کردویانە بخرێتـە پـێش چـاوی عمـوم و لـە گـەڵ یـەکتریدا بەراورد بکرێن چوار پێنج ڕۆژ لەمەوپێش مودیرەی موحتەرەمەی مەکتەبی کچـانی سـلێمانی بـە ئەشـیاکانەوە تەشریفی بردە کەرکوک و لە دوای ئیجرا و تەواوبونی مەعرەزی کەرکوک گەڕایەوە سلێمانی.

"موعەلیمەیەکی مەکتەبی کچانی کەرکوک لە گەڵ نەقش و درومانەکانی ئەوێدا هاتۆتە سلێمانی.

"لە بەیانی ئەمڕۆوە ئەشیای هەردو مەکتەب لە مەکتەبی کچـانی سـلێمانیدا دانـراوە و خراوەتـە پـێش چاوی عموم، لە بەیانی ئەمڕۆوە هەتاکو سبحەینێ ئێواریٚ بەیانیان هەتاکو نیوەڕوان پیاو و لە پاش نیوەڕۆوە هەتا ئێواران ئافرەت ئەتوانن بچن تەماشایان بکـەن و لـە دوای تەماشـا کـردن هـەمو کەسـێک ئـەتوانێ لـەم خسوسەوە فکری خۆی لەو دەفتەرەدا کە دانراوە بەیان بکا."

زۆر ساڵ ئەم جۆرە پیشانگایەی کاری دەستیی خوێندکارەکان دوبارە بۆتەوە. پیرەمێرد بە ئوسـلوبە ئەدەبیەکەی لە ژ 329 دا بەمجۆرە لە پیشانگەی ساڵی 1932 ئەدوێ:

"گوڵدەستەی گوڵان

"ژیان بەهاریٚ گوڵ و گوڵزاری دەوری شاری دەور کردەوە و هاوینێ گوڵزاری ناوشار دێنێتە فەڕ.

"گوڵی بەهارە، نازک و نازدارە، بەڵام ئاخ ناپایەدارە.

"گوڵێکم دەوێ گوڵان بیبینێ، شێوە و ئاینی گوڵان بنوێنێ، هەتا درەنگێ هەروا بمێنێ.

"ئەو دەسکە گوڵەم دوێنێ لە نوێنە (مەعرەز) ی مەکتەبی کچان دا دی.

"دەستی پەروەردگار لە کچۆڵەکانمان گوڵدەستەیەکی ڕازاندۆتەوە، ئەو گوڵانەیش هەریەکـە بـە دەسـتی نازک و نازداریان چەند گوڵێکی نەقش و نیگاری هونەری خۆیان هێناوەتە مەیـدان و پیشـانمان ئـەدەن. یـا خوا ئەو دەست و پەنجەیان نەڕزێ. من کە بەم پیشە (صنعەت) ی دڵپەسندە ئەمەندە چاوم ڕون بۆتەوە، تەنها

بـۆ دیـدەنی نـەقش و نیگـار نیـە، هیـوای زۆرم بـە سـەرئەنجامی ئـەم بێچـوە پەرییانەیـە کـە بـە هـۆی خوێندەواریەوە پاک و تەمیزی و شیرین دوین، دەرنزانی، منداڵ بە خێوکـەری فێـر بـبن و بـە ئامۆژگـاری و پەروەردەیی ئەمانە نەتەوەی ئایندەمان بە کەڵکی بنەچە و هاورەچەڵەکی خۆی بێ و بە خێوی مەڵبەنـد بشـێ، ئەگینا نمونەنمایی هەمو شـارێ لـە ئێمـە پێشـترە. هونەرەکـەی ئێمـە لەوەدایـە لـە (پـر) ئەمانـە فێـر بـون و رەهبەرەکەیشیان کە مودیرە باڵایە لە خۆمانە. کەوابێ تار و پۆ لە خۆیە.

"تاکو بنواڕی بەهەشتێکە بە گوڵ خەمڵیوە

"دایکی ئێمە، وەرە لێی پرسە: ئەمەی کەی دیوە؟

"تا ئێستا نەقش و نیگاری ژنانمان: خەڕەک، تەشی، کەلە ژەن، کەلە ماشەر، قانگەلە، تەشیلە، بنەزیلـە و، دوخ و، ژێ و، دەسکلوجە و، گوی چەنە و، پلی پێچ و گورزە هۆن و، بێینەوە سەرەوکاری دروماندا: تیک و بـن تیک و، تەریب و، قومامە و، قیرمە و، بەقیە و، هەڵپێچ و، پشت ماسولکە و، حەوزی و، ئاویە و، پێ چۆلەکـە و، کۆترە باریکە، ئەمانەیان ئەزانی. گۆشەگیرەمان مادە بو، سەرمێزمان سەرەویر بو، ئێستا هەندێ وردەکاریم لە ناو ئەو نمونانەدا دیوە تا لێی ورد بیتەوە شیرینە، تا دڵ بیەوێ رەنگینە. ئێستا ئێمە دەبێ مـادام بـە چـاوی خۆمان دەبینین ئەم کچانەمان بەم خوێندەواریە هونەری وا دێننە مەیدان، ئـەبێ هیوایشـمان پێیـان بـێ کـە کەڵکی ماڵداری و هاودەردی و هاوسەرییشیان پێوە دەبێ و، بە نەتەوەی چاک ئەم میلەتە لە دەست نـادانی و سەرگەردانی رسگار ئەکەن وایان لە گەڵ بژوینەوە و ئەو کەسەی کە ئەمرۆ بە دو لادا گەورەیـە دەبـێ بـاوەڕ بفەرموێ کە مودیرەکەی ئێستا ئەگەر هێجگاری بێ لە لاییدە چاکتر بە کار دێ.

"خوایە تۆ ئەم کچانەمان بگەیەنەرە ئەو هیوایەی ئێمەیە!"

**2. 3. 2. تەمسیل**

هونەری نواندن و شـانۆ ئەگـەر لـە ئـەوروپا پێشـینەیەکی کـۆنی هـەبوبێ، یـان ئەگـەر لـە شـوێنانی وەکـو ئەستەموڵ و قاهیرە و بێروت و بەغداد یش کرابێ، ئەوا لە کوردستانی عێراقدا بەگشتی و لە سـلێمانیدا بـە تایبـەتی هونەرێکی نوێ و نە ناسراو بوە. ئەم هونـەرە مامۆسـتای قوتابخانـەکان هێناویانەتـە سـلێمانی و بـە قوتابیـەکانیان جێبەجێ کردوە. ناوەرۆکی ئەو چیرۆکانەی لەسەر شانۆ نوێنراون کاریگەریەکی راسـتەوخۆیان لـە سـەر بینـەرەکانی هەبوە. بە تایبەتی لە زەمانێکـدا کە هێشتا، لەم وڵاتەدا، سینەما و رادیۆ و تەلەفزیۆن لە کایەدا نەبون.

لەو ماوەیەدا لە سلێمانی، کە رەنگە لە مێژوی ئەو شارەدا ئەوە یەکەمین جـار بـوبێ، دو جـار تەمسـیل پێشکەش کراوە:

جاری یەکەم، لە تەموزی 1926 دا قوتابیانی مەکتەب تەمسیلی (نەتیجەی سەفاهەت) و.

جاری دوەم، لە تەموزی 1927 دا قوتابیانی سلێمانی بە هاوکاری خوێندکارانی بەغداد (نیرون) یان لە بینای زانستیدا پێشکەش کردوە.

کچانیش هاتونەتە ئەم مەیدانەوە. ژیان (پرۆغرام و نوتقی تەمسیل و حەفلەکەی مەکتەبی کچان) ی بڵاو کردۆتەوە:

"پرۆغرامی حەفلەکە مادەی

1. لە تەرەف تالیبەیەکی سینفی پێنجەم حەفسە عیرفانەوە نوتقێکی کوردی کە مەئالەکەی عیبـارەت بـو لە بەخێرهاتنی میوانەکان و فەزائیلی خوێندن و تەحصیل.

2. تالیبەیەک کە بەیداخی بە دەستەوە بوە لە گەڵ 20 تالیبەی تر گۆرانی بەیداخ.

3. لە تەرەف تالیبەیەکەوە شیعری کوردی.

4. تەمسیل: ئینسان ئەوی ئەیچێنێ ئەوە ئەدروێتەوە. سێ پەردە، دو پەردەی نەسر، پەردەیە نەزم.
5. لە تەرەف تالیبەیەکەوە شیعری عەرەبی بەحس لە فەزائیلی (دەرزی و قەڵەم)
6. ریازەتی بەدەنیە لە تەرەف تالیبەکانەوە بە جلی مەخسوسی ریازەتەوە.
7. لە تەرەف نەزیهە تالیبەوە شیعری کوردی و تورکی خیتاب بە بوکەشوشەیەک.
8. لە تەرەف تالیبەیەکی ترەوە نوتقێکی مەنزومی ئینگلیزی.
9. تەمسیل: هەموی بە شیعر. دایکێکی جاهیل کە خەشخاشی داوە بە مناڵەکەی و نەسیحەتی دوقتۆرێک.
10. لە تەرەف تالیبەیەکەوە شیعری عەرەبی.
11. لە تەرەف 20 تالیبەوە گۆرانی پیرەمەگرون و سائیرە.
12. لە دوای هەموییان لە تەرەف مودیرەی موحتەرەمەی مەکتەبەوە چەند کەلیمەیەکی عەرەبی و کوردی کە زۆر عالی و موئەسیر بون." (ژیان، ژ 233، 3 ی نیسانی 1930)

ژیان ناوەرۆکی هەردو تەمسیلەکەی بەمجۆرە باس کردوە:

"تەمسیلی ئەوەل:

"ئەو تەمسیلانەی کە کردیان دوان بون و، ئەمانە هەموی لە تـەرەف قوتابیـە کچەکانـەوە و، مـودیرە و موعەلیمە موحتەرەمەکانی مەکتەبەوە ئیجرا کران.

"تەمسیلی ئەوەلیان: ئینسان ئەوی ئەیچێنێ ئەوە ئەدروێتەوە

"دو کچی قوتابی مەکتەب ئەبن: یەکێکیان، زۆر ساعی ئەبێ هەمو وەقتی خۆی بـە خوێنـدن و تەحسـیل و نەقش و درومان سەرف ئەکات و زەمانی تەحسیلی هەر بەم نەوعە شتانەوە رائەبوێرێ، خاریجی ئەمانە ئـارەزوی شتێکی تر ناکات. قوتابیە کچەکەی تریان، چونکە باوکی دەوڵەمەند ئـەبێ، بـە ئومێـدی سـەروەتی بـاوکی هـەمو وەقتی خۆی بە کەیف و زەوق و گەڕان سەرف ئەکات و ئەهمیەت نادات بە تەحسیل و خوێندنەکەی.

"لە دوای 20 ساڵی تر ئەم دو کچە کە هەردوکیان شو ئەکەن، ئـەوەلیان کـە ئـەخلاقی بـاش ئـەبێ، لـە وەقتی خۆیدا دائیمەن خوێندویەتی، هەرچەند مێردەکەیشی لـە حـەربا شـەهید ئـەکرێ، بـەڵام دیسـانەوە بـە واسیتەی سەعی خۆیەوە زۆر چاک ئەژی و 3 مناڵی ئەبێ، هەرسێکیان وەکو خۆی عالی و باش تەربیە ئەکات و ئەیانکات بە پیاو.

"کچی دوەمیان چونکە وەقتـی خـۆی سـەعی نـەکردوە و سـەروەتەکەی بـاوکی زایـع ئـەکات، ئـەویش مناڵەکانی کە بێ باوک ئەمێننەوە، مەجبور ئەبێ بە جلشۆری و کارەکەری بە خێویان بکات. نەتیجە کوڕەکەی بێ ئەخلاق ئەبێ و، رۆژێک داوای پارە لە دایکی ئەکات و، چونکە دایکی پارەی نابێ بیداتێ و، چەنـد دەفعـە بە ئەولادەکەی ئەڵێ: کوڕم بە خوا پارەم نیە خۆت ئەیزانی بە جلشۆری بە رێتانەوە ئەبـەم. بـەڵام کوڕەکـەی قانع نابێ، لە سەر پارە بە چەقۆ دایکی بریندار ئەکات.

"نەتیجەی ئەم دو کچە، ئەوی سەعی کردوە، وەقتی بە بێ هودە زایع نەکردوە، مەسعود ئـەبێ و، ئـەوی تریان کە لە دەوری تەحسیلیا تەمەڵی کردوە و، بە سەفاهەتەوە مەشغوڵ بوە، سەفیل ئەمێنێتەوە.

"ئەم تەمسیلە 3 پەردە بو، دوانی بە نەسر و یەکێکی بە شیعر ئەبێ.

"دوەم تەمسیلی:

"دایکێکی جاهیل ئەبێ لە بەر ئەوەی مناڵەکەی لە بێشـکەدا خـەوی لـێ ناکـەوێ و ئـەگری، ئـەچێت لـە سـەر تەوسیەی پرەپیرێژن دائیمەن خاشخاشی ئەداتێ و، بەم عیلاجـە مەسـمومە ئـەینوێنێ. رۆژێـک لـە دوای ئـەوەی ئـەم خەشخاشە ئەدات بە مناڵەکەی تەماشا ئەکات هەتا دو سێ سەعات لە وەعـدەی زیـاتر مناڵەکـەی خەبـەری نابێتـەوە و

ناجوڵێتەوە. کە دایکەکەی سەری هەڵئەبڕێ ئەبینێ منداڵەکەی سپی بوە، خوێنی حەرەکەت ناکات. دەست ئەکات بە گریان، دراوسێکانی پێ ئەزانن دێن بە دەنگیەوە، کە مەسئەلەکە تێ ئەگەن یەکێکیان ئەڕوا دقتۆر ئەهێنێ. کە دقتۆر دێت لە مەسئەلە ئەگات موتەئەسیر ئەبێ گەلێ لۆمەی دایکەکەی ئەکات و بە دەرمان تەداوی ئەکات، ئەیهێنێتەوە هۆش خۆی و دایکەکەی مەسرور ئەبێ. دوقتۆرەکە پێی ئەڵێ: ئەمە نەتیجەی جەهالەتە کە ئەم سەمەی ئەدەیتێ، ئەترسم دیسانەوە تیکراری بکەیتەوە. دایکەکە ئەپاڕێتەوە. تەشەکوری دوقتۆر ئەکات. شوکری خوا بە جێ ئەهێنێ. قەولی ئەداتێ، سوێند ئەخوات کە ئیتر دەرمانی وا نەدات بە منداڵەکەی و، بە قسەی پروپیرێژن نەکات.

"ئەم تەمسیلە هەموی بە شیعری کوردیە. حەقیقەتەن شیعرەکانی زۆر جوان و مەحزونانەیە. ئومێد ئەکەین ئەگەر جێ بو لە ستونێکی غەزەتەکەدا ئەم شیعرانە دەرج و عەرزی قاریئینی کیرامی بکەین." (ژیان، ژ 233، 3 ی نیسانی 1930)

ژیان ناوی نوسەری تەمسیلیەکان و ناوی ئەکتەرەکانی نەنوسیوە.

بۆ جاری دوەم، تەمسیلێکی تریان رێک خستوە:

"هەیئەتی تەعلیمیەی مەکتەبی کچانی سلێمانی بۆ تەنمیەی ئەفکاری کچە خوێندەوارەکان تەمسیلێکی عیلمی و ئیجتیماعی رێک خستوە کە مەوزوعەکەی عائید بە تەحلیلی حالەتی ئیجتیماعی نسوانی ئێرەیە و موقایەسەی گوزەرانی سائیری مەملەکەتەکانە. ئەم تەمسیلە تەنها بە واسیتەی کچانی مەکتەبەوە دێتە ساحەی تەتبیق. بە هیچ وەجهێ پیاو و کوڕی تیا نابێ و، لەم هەفتەیەدا تەرتیبی ئەکەن. ئینشائەڵا ئەمە ئەوەل قەدەمی خێری کچە خوێندەوارەکانمانە." (ژیان، ژ 324، 2 ی حوزەیرانی 1932)

## 2. 3. 3. بەشداری کۆبونەوەی گشتی

رۆژی 13 ی 6 ی 930 بە ئامادەبونی موتەسەڕیفی سلێمانی، کۆمەڵی زانستی حەفلەیەکی عمومی کردوە کە چەند سرود و شیعر و وتاری تێدا خوێنراوەتەوە.

مەبەست لە حەفلەکە کۆکردنەوەی پیتاک بوە بۆ کڕینی مەتبەعەیەک بۆ زانستی، لەم حەفلەیەدا قوتابی مەکتەبی کچان بەشدار بون، لەو ریپۆرتاجەدا کە ژیان لە ژ 245 دا بەم بۆنەیەوە نوسیویێتی، بەمجۆرە باسی بەشداری کچەکان ئەکا:

".....

"باخسوس لە دوای نوتقەکان پێنج قوتابی کچی منداڵی مەکتەبی کچان کە بۆ ئەم ئیشە حازر کرابون و کە هەر یەکە کراسێکی سپی نازکی لە بەر کرد بو وە بە ئەنواعی قردێلە – گوڵی جوان خۆیان رازانبوەوەو هەریەکە سەبەتەیەکی جوان، لە داویا لە قوماشی رۆزێت، گوڵ دانرابو و دەرزیەکی پێوە بەسترابو لە گەڵ تاقمێک کاغەزی مەتبوع کە لێی نوسرابو: (زانستی چاوەڕوانی هیمەت و موعاوەنەتی ئێوەیە) بە ریزە بە بەردەمی تەختەکانا ئەگەڕان و لە بەردەمی هەمو پیاوێکا ئەوەستان و لەو گوڵانە یەکێکیان ئەکرد بە بەرۆکیا و یەکێ لەو کاغەزانەیان ئەدانە دەست.

"بە راستی ئەم مەسئەلەیە لە هەمو شتێک زیاتر رۆحی میلەتەکەی هێنایە جۆش چونکە ئەمە هەوەڵ کەڕەتە لێرەدا لە ناو میلەتی کوردا وەکو میلەتە موتەمەدینەکان کچی مەعسوم بە شەوق و بە ئارەزویەکی تەبیعی خۆیەوە بەم تەحرە خدمەتی مەعاریف بکات و بۆ ژینی کۆمەڵیکی وا تێ کۆشێ...."

بەم بۆنەیەوە هەیئەتی ئیدارەی کۆمەڵی زانستی (تەشەکورێکی عەلەنی) یان (بە واسیتەی ژیانی خۆشەویستەوە، بەرامبەر بە مودیرە و هەیئەتی موحتەرەمەی مەکتەبی کچان) نوسیوە.

لە بەردەم مەلیک فەیسەڵدا

رۆژانی 10– 13 ی حوزەیرانی 1931 مەلیک فەیسەڵ سەردانی شاری سلێمانی و هەڵەبجەی کردوە. لەم سەردانەدا سەری لە قوتابخانەکانی سلێمانی، لەوانە قوتابخانەی کچان داوە. ژیان لە 3 ژمارەیدا هەواڵەکانی ئەم سەردانەی نوسیوە. لە ژ 288 دا باسی کردوە، کچێکی پۆلی چوارەم لە بەردەم مەلیک فەیسەڵ دا وتارێکی داوە. لە بەشی یەکەمی وتارەکەیدا بە خێرهاتنی مەلیک ئەکا و لە بەشی دوەمی دا وتویەتی:

"کەمینە تلمیزەیەکم لە مەدرەسەی کچان و، لە عەزەمەتی ئێوە مەعلومە کە ئەوەل مەداریسی ئەتفال باوەشی دایکە و، پێغەمبەرمان (ص) کە جەدی ئێوەیە فەرمویەتی: (علموا بناتکم: تەعلیمی کچانتان بکەن!) ئیهتیمام بە تەعلیمی ئێمە سەمەرەیەکی عەزیم و فائیدەیەکی گەورەی هەیە بۆ موجتەمەع لە ئاتیدا و، ئیمانمان قەویە بەمە کە جەلالەتتان بە ئیهتیمامەوە لە سەر نەشری عیلم و فەزیلەت و، حیصەی ئێمە لەمە بە سەبەبی تەوەجوهی ئێوەوە زۆر ئەبێ."

## 2. 3. 4. فێرکردنی ژنانی نەخوێندەوار

"لە مەکتەبی کچانی سلێمانیدا سینفێک بۆ ژنە نەخوێندەوارەکانمان

"... بۆ ئەوەی ئەو ژن و کچە نەخوێندەوارانەی کە ناتوانن دەوامی مەکتەب بکەن ئەوانیش فێری خوێندن و نوسین بکرێن لە مەکتەبدا سینفێکی بۆ کردونەوە و ئێواران لە سەعات 10 ی عەرەبیەوە هەتا 11 موعەلیماتەکانی مەکتەبی کچان دەرسی ئەلفبا و حساب ئەڵێنەوە." (ژیان، ژ 240، 22 ی مایسی 1930).

"زانستی ژنان

"ئەم حەرەکەتە عیلمیەی کە لە کوردستانا دەستی پێ کراوە وەنیە هەر مونحەصیر بێتە سەر پیاوەکان، بەڵکو ئافرەتەکانیشمان بە عەینی حس موتەحەسیس بون و بۆ هەمو خدمەتێک کە مەنافیعی وەتەنەکەی تیا بێ معاوەنەت ئەکەن و ئەیانەوێ بە عومومی خۆیان بە عیلم و عیرفان برازێننەوە. زاتەن مودەتێکی زۆرە سینفێکی تایبەتی بۆ ژنە نەخوێندەوارەکانمان کراوەتەوە و بە ئەکسەریەتی ئافرەتەکانمان هەمو ئێوارەیەک ئەخوێنن. ئەم دەفعەیەش بۆ ئەوەی فەرعێکی زانستی ژنان بکەنەوە کە تیا کۆبینەوە و تیا بخوێنن ئافرەتەکانمان قەراریان دا ئیجتیماع بکەن و ئیشوکاری ئەم زانستی ژنانە پێک بێنن. لە سەر ئەوە رۆژی 28 ی تەموزی 930 ساعەتی 9 ی عەرەبی لە ماڵی حەفیدزادە حەفسە خانمی نەقیب دا کۆبونەوە..." (ژیان، ژ 255، 31 ی تەموزی 1930).

لەم کۆبونەوەیەدا چەند کەسێ قسەیان کردوە. 717 روپیە یشیان کۆکردۆتەوە بۆ ئەوەی خانویەکی پێ بە کرێ بگرن و کەلوپەلی بۆ بکڕن و کتێبخانەیەکی تێدا دابنێن.

لەو ماوەیەدا جولانەوەیەکی سیاسی بۆ داوای مافی نەتەوەیی کورد دەس پێ ئەکا. ژنان یش لەم جولانەوەیەدا بەشدار ئەبن. سەرەنجامی جولانەوەکە بە 6 ی رەشی ئەیلول تەواو بو. لەوەدا زانستی کەوتە بەر هێرش، پێ ئەچێ زانستی ژنانیش بوبێ بە ژێر ئەو روداوانەوە.

## 2. 3. 5. فێرکردنی پیشە

"ئیعلان

"بۆ ئەو خانمانەی کە حەز بە فێربونی خوێندن، نوسین، درومان و نەقش ئەکەن، سینفێکی تایبەتی کراوەتەوە ئەوانەی ئارەزو ئەکەن لە ئیعتیباری 15 ی ئاغستۆسی 926 ەوە بەیانیان سەعات 8 ی زەوالی موراجەعەت بە مەکتەب بکەن.

مودیرەی مەکتەبی کچان" (ژیان، ژ 28، 12 ی ئاغستۆسی 1926).

## 3. هەواڵی ئافرەتانی دنیا

ئەو هەواڵانەی ژیان دەربارەی ئافرەت لە وڵاتانی جیاجیای دنیادا بۆ بڵاوکردنەوە هەڵی بـژاردون، هەمویان دانسقەن و بە ئەنقەست هەڵی بژاردون. ژیان ویستویەتی سەرنجی پیـاوی کـورد رابکێشـێ بـۆ ئەو گۆڕانە گەورەیەی لە دنیادا بە سەر باری کۆمەڵایەتی و سیاسی ژنـاندا هـاتوە. لەمـە یـش مەبەسـتی ئەوە بوە زەمینەی فکری لە لای پیاوی کورد خۆش بکـا بـۆ ئـەوەی داوای چـاکردنی بـاری کۆمەڵایـەتی ژنی لێ بکا.

هەواڵی ئافرەتی بریتانی

"حقوقی ژن

"ئەو لائیحەیە کە لە خصوص مساواتی ژن لە گەڵ پیاوا حکومەتی بریتانیا تەنزیمی کردوە جەلالەتی مەلیکیش تەصدیقی کردوە." (ژیان، ژ 121، 12 ی تەموزی 1928).

"ژن لە ئینتیخاباتا

"لەندەن 1 ی 9 ی 28 ئەمرۆ دەست کراوە بە تەتبیقی ئەو مەسەلەیە کـە ژن حـەقی ئینتیخابـاتی ببـێ وەکو پیاو بەو شەرتە عومری گەیشتبێ بە 21 ساڵ. فەقەت لازمە ئەو ژنانەی کە حـەقی ئینتیخابیـان کەسـب کردوە بۆ معامەلەی تەسجیلیەیان 3 مانگ لە مەنتیقەی ئینتیخابیەکەیانا بمێننـەوە لـە دوای ئیکمـالی معامەلـەی تەسجیلیە لە دوای 3 مانگی تر یەعنی لە 1 ی کانونی ئەوەلی 928 دا 5.250.000 ژن مـەوجود ئـەبێ کـە حەقی ئینتیخابیان ببێ." (ژیان، ژ 129، 20 ئەیلولی 1928)

"وەقتی ژنهێنان و شوکردن

"لەندەن: مەجلیسی عەوامی بریتانیا قانونی وەقتی ژنهێنان و شوکردنی تەصدیق کردوە. جاران کە لـە عومری 12 ساڵیدا ژن و پیاو ئەیانتوانی تەئەهول بکەن ئێستا کراوە بە 16 ساڵ." (ژیـان، ژ 174، 13 ی مایسی 1929)

هەواڵی ئافرەتی تورک

"ئەستەموڵ: هەمو ژنانی ئەنقەرە و ئەستەموڵ تەرکی پەچەگرتنەوە و روداپۆشینیان کـردوە، بـەڵام هێشتا گەلێ ژنانی بەعزێ جێگای ئەنادۆلی رویان دائەپۆشن. کۆمەڵی هەمویەتی لـە تـەرابزون قـەراری دا کە ژنانی ئەوێ بە رو بەرەڵایی بگەڕێن ئەم قەرارەش بە ئەکسەریەت بە باش بینراوە. لـە بەیانێکـدا کـە بڵاو کراوەتەوە باسی لە خراپی روداپۆشینی ژنان کردوە و وتویانە روداپۆشین بۆ ئەو ژنانەی کە بیـری خراپەیان هەیە ئەبێتە واسیتەیەکی خۆ رزگار کردن لە دەست پۆلیس، لە بەر ئەمە هەر ژنێـک بـە پەچـەوە بگەڕێ ئەگیرێ و بۆ ئیسپات کردنی هەویـەتی ئەبرێتـە دائیـرەی پـۆلیس." (ژیـان، ژ 49، 6 ی کـانونی سانی 1927).

"لە ترکیادا پۆلیسی ژن

"ئێستانبوڵ: رەئیسی ئیتیحادی ژنانی تورکیا لەتیفە بەکر خانم ئەیەوێ بـۆ ئـەوەی بـە سـەبەبی ئـەو حوریەتەوە کە دراوە بە ژنان ئەخلاقیان محافەزە بکرێ حکومەت لە ژنانیش پۆلیس تەعیین بکات. وە تەلـەبی

لە ڕەئیسی پۆلیسی نیسائی ئینگلتەرە کردوە کە سەعی بکات بۆ کردنەوەی مەکتەبێکی پۆلیسی ژنان، کە ژنە تورکەکانیش تیا بخوێنن." (ژیان، ژ 204، 14 ی تشرینی یەکەمی 1929).

"مەکاتیبی تورکیا

"ئیستانبوڵ: لە تورکیا لە 25 ی 6 ی 930 دا دەست کراوە بە ئیمتیحان. خوێندنی ئیبتیدائی مەجبوریە و، هەمو مەساریفاتی مەکتەب و موعەللیمەکان لە سەر حکومەتە و، ئیمڕۆ لە تورکیا 5883 مەکتەبی ئیبتیدائی هەیە و ئەم مەکتەبانە 11.766 موعەلیم و 385.455 قوتابی کوڕ و کچیان هەیە.

"غەیری ئەمانیش لە شارەکانا 17 و لە دێهاتەکانا 22 مەکتەبی شەو هەیە بۆ نەخوێندەوارەکان و لەم مەکتەبانەیشدا 5607 پیاو و 973 ژن تیا ئەخوێنن و 86 مەکتەبی سانەویش هەیە کە 12751 قوتابی تیا ئەخوێنن." (ژیان، ژ 248، 30 ی حوزەیرانی 1930).

"کچانی تورک تالبی ئیشتیغالن لە بەحریەدا

"لەندەن: بە پێی تەلغرافێ کە دەیلی تەلغراف لە موخابیری ئەستانبوڵەوە نەشری کردوە ئەڵێ: کچانی تورکیا تالبی ئیشتیغالن لە بەحریەدا بە سفەتی (ڕوبان و موهەندیس) بینائەن عەلەیهی مەدرەسەی بەحریە لە ئەستانبوڵ قەراری داوە کە شوعبەیە بۆ کچان بکاتەوە." (ژیان، ژ 295، 1 ی تشرینی یەکەمی 1931).

"هەواڵی ئافرەتی ئەفغانی

لەندەن: غەزەتەی دەیلی مێڵ تەلغرافێکی نەشر کردوە کە لە موخابیری کابولەوە وەری گرتوە ئەڵێ لە ژێر ئەمر و حەرەکەتی سورەیا خانم قەرالیچەی ئەفغانا حەرەکەتێکی زل هەیە لە خصوص ئەوەوە کە ژنەکان تەجەدود بکەن و مەکتەبێکی کچان لە کابول کراوەتەوە و قەراریان داوە ژنە چاکە بە عەمەلەکان لە وەزائیفی حکومەتیا ئیستیخدام بکەن و کچەکان تەربیە بکەن بۆ ئەوەی تەحەمولی هەمو ئەزیەتێک بکەن و تەقەڕوری کردوە کە بەعسەیەک لە کچانی ئەفغانیش بۆ تەعلیم بنێرنە خاریج لەم بەینەدا ئەنێررێن."

"ڕەفعی حیجاب لە ئەفغانستان

"کابول: مەلیک ئەمانوڵا خان لە مەجلیسی وەتەنیدا نوتقێکی داوە لە خصوص ڕەفعی حیجابی ئافرەتەوە و خۆی بیلزات سەرپۆشی عائیلەکەی لابردوە و لە دواییدا ئەمری کردوە جەمعیەتێک شکل بگرێت وەکو جەمعیەتی صەلیبی ئەحمەر و گوتویەتی لازمە خەستەخانەکانمان ئیصلاح و تەرتیباتی پۆلیسی سڕی و ئیدارەی عمومی بکەین." (ژیان، ژ 132، 25 ی تشرینی یەکەمی 928).

"حقوقی ژنی فەلەستین لە ئینتیخاباتا

"قودس: موافیقی قانونی بەلەدیەی تەل ئەبیب ژن حەقی هەیە کە ئینتیخاب بکات و ئینتیخابیش بکرێت. حەقیقەتەن ئەمە خەتوەیەکی تەجەدودە بۆ تەرەقی فەلەستین." (ژیان، ژ 136، 12 ی تشرینی دوەمی 1928).

"ئەحواڵی ئێران – ئینتیخاباتی ژن

"تەهران: هەتا ئێستا زۆر لائیحە تەودیعی مەجلیسی وزەرای ئێران کراوە بۆ ئەوەی ئەو ژنانەی کە عومریان گەیشتۆتە 21 ساڵ و لە مەکاتیبی ئیبتیدائیدا تەحصیلیان تەواو کردوە لە ئینتیخاباتا ڕەئیان بێ." (ژیان، ژ 138، 19 ی تشرینی دوەمی 1928).

"حقوقی ژنە یۆنانیەکان

"ئەتینە: موسیۆ ونیزەلۆس رەئیسەلوزەرای یۆنان لە مەجلیسی مەبعوسان دا بەیانی کردوە کـە لـە ئیجتیمـاعی دوهەمی حکومەت لایحەیەکی قانونیە تەوديعی مەجلیسی مەبعوسان ئەکات، کە مەزمونی لایحەی مـەزکور عیبارەتـە لـە دانی حەقی ئینتیخابات و تەصویت بە ژنانی یۆنانستان." (ژیان، ژ 186، 15 ی تەموزی 1929).

ئافرەتی حیجاز

لە ژ 329 دا ژیان ئەم هەواڵەی بڵاو کردۆتەوە، لە جۆری دارِشتنەکەی دا کە تەوس و توانجی تێدایـە، مەبەستی بڵاوکردنەوەی دەرئەکەوێ:

"دەبدەبە و دارایی مەلیکی حیجاز

"لە رۆژنامەی پێرێدا هەواڵی گوزەرانی مەلیک ئیبن ئەلسعود (کە ئەمرۆ لە مەڵبەندی پێغەمبەردا دادەنیشـێ) نوسراوە، دەڵێ: ئەم حوکمداری یەسروب و بەتحایە 184 ژنی (هەرەمە) لە هەمو تیرەیە هێناوە، هەروا یەکە یەکـە سەرگوڵی ئەو کچە نازک و نازدارانەی چنیوە و دەستی لێ هەڵگرتون. بەزەویی بە هیچیانا نەهاتوە.

"بەڵام لە دواییدا کەوتۆتە نازی ژنە ئەرمەنیەکەوە گیرۆدەی بـوە ئینجـا ئـەو بـەزەوی بـەوا نایەتـەوە، هەمو نازی دەکێشێ، وازی لە هەمو شتێ هێناوە بۆ ئەو، ئـەویش ئـەمرۆ 130 نەتـەوەی هەیـە. لـە 184 ژن 130 مناڵ 54 پوچەڵ بوە.

"ئەمیر فەیصەلی کوری

"فەیصەل سعود، کوری هەڵکەوتویەتی. ئێستا وا شارانگەردی ئەکا. لەم دوسێ رۆژانەیشا دێتە خدمـەت جەلالەتی مەلیکی ئێمە، ئێمە دەخلمان بە سەر رەسمیەتەوە نیە، بۆ دەنگوباسی نایاب ئەگەرِێین. ئەویش جـارێ سەردەفتەر 40 ژن و 30 ئەولادی هەیە. بەڵام هێشتا زۆری ماوە بە بـەرەوە تـا دەگاتـە رێـزەی بـاوکی. بـە جوتە ئەبنە (ملیۆنێر). قانونی ئیزدیواجی مەدەنی و بەختی ژنان گۆرِ هەڵتەکێنن."

## 4. هەواڵی ئافرەتانی کوردستان

ساڵی 1930 کە هەواڵی نوێکردنەوەی پەیمانی بریتانی– عیراقی بڵاوکرایـەوە و باسـی دابینکردنـی مافەکانی کورد لەو پەیمانەدا نەهات بو، جوڵانەوەیەکی سیاسی لە سەرانسەری کوردستاندا دەسـتی پـێ کـرد. بە نامە و یادداشت و تەلگراف داوایان لـە مەنـدوبی سـامی بریتـانی و کۆمـەڵی گـەلان ئـەکرد، مـافی کـورد دەستەبەر بکات. ژنانی سلێمانی بەم تەلگرافە کە لە 24 ی تەموزی 930 دا ناردویانە، بەشدار بون:

"بەغداد فەخامەتی مەندوبی سامی عیراق
فەخامەتی رەئیسەل وزەرای عیراق
سورەتی، بەغداد تایمس
سورەتی، العالم العربی
سورەتی، العراق
سورەتی، البلاد

"ئێمە ژنـانی کـورد، بـە هـەمو موجودیەتمانـەوە تەلـەبی حقـوقی مەشـروعەی کوردسـتان ئەکـەین کـە عیسبەتول ئومەم پیێ بەخشیوین و ئیعتیرافـی لـە سـەر کـراوە. ئیسـتیرحام ئەکـەین حیمایـەمان بفـەرمون. حەفسە نەقیب. حەلاوە رەمزی ئەفەندی. ئامینە غەفور ئاغا. ناهیە ساڵح ئەفەندی. حەفسە قادر ئاغا." (ژیان، ژ 254، 28 ی تەموزی 1930)

# ژیان و بزوتنەوەی رۆشنبیری

شێخ مەحمود لەو کاتەدا کە مەلیکی کوردستان، دواتر کە سەرکردەی شۆڕشی کورد بو، بەرنامەیەکی سیاسی– جەنگی رون و ئاشکرای نەبو تا هەڵبژاردەی کورد لە دەوری خۆی کۆ بکاتەوە. نە حیزبێکی سیاسی خاوەن بەرنامەی سیاسی و پێڕەوی ناوخۆی دامەزراند و نە لەشکرێکی چەکداری رێکوپێکی پێکەوە نا. بەڵکو هێزێکی نارێکوپێکی خێڵەکی لێ کۆ بوبوەوە، ئەویش لە ناوچەیەکی دیاریکراوی سلێمانی و کەرکوک دا.

ئەو هێزە بەو توانا جەنگی و سیاسیەی کە لەو کاتەدا هەیبو، بەو تاکتیکە جەنگی و بەو رێوشوێنە سیاسیەی کە پێڕەوییان ئەکرد، لە بەردەم هێزی جەنگی و سیاسی و دیپلۆماسی بریتانیای گەورەدا، کە لەو رۆژگارەدا گەورەترین زلهێزی دنیا بو، نەی ئەتوانی کاری چارەنوسساز ئەنجام بدا.

تێشکانی جەنگی شێخ مەحمود لە بەردەم هێزەکانی بریتانیادا، رۆشنبیرانی کوردی نائومێد کرد بو لەوەی کە کورد بە شەڕ لە گەڵ ئینگلیز بتوانێ شتێک بە دەس بهێنێ. کاتێ شێخ مەحمود چوە شاخ و دواتر لە گەڵ ئینگلیز پێک هات تا لە گوندێکی ئێران بە گۆشەگیری دابنیشێ، زۆری رۆشنبیرانی کورد قورسایی خۆیان خستە سەر بڵاوکردنەوەی خوێندەواری و بایەخدان بە کاروباری رۆشنبیری. کاربەدەستانی ئینگلیز یش، نەیان ئەشاردەوە کە هیچ پرۆژەیەکی سیاسی بۆ کورد لە بەرنامەیاندا نیە. ئامۆژگاری کوردیان ئەکرد بین بە هاوولاتی باشی عیراق و، رو بکەنە خوێندن و جێکردنەوەی خۆیان لە داوودەزگاکانی حکومەتدا.

هەڵبژاردەی کورد هەوڵیان ئەدا لە چوارچێوەی راسپێریەکانی کۆمەڵەی گەلان و قانونی ئەساسی (دەستور) ی عیراق و قانونەکانی تریدا، هەندێ لە مافە نەتەوەییەکان بە دەس بهێنن. عیراق کە هێشتا لە ژێر ئینتیدابی بریتانیدا بو، بە ناچاری بۆ ئەوەی دەوڵەتانی دنیا رازی بکا کە توانای خۆ بەڕێوەبردنی هەیە، چاوپۆشی لە هەندێ چالاکی کورد ئەکرد.

ژیان هاندەرێکی بە هێزی بزوتنەوەی رۆشنبیری بوە لە کوردستاندا. لە هەمان کاتدا بەشێکی باشی چالاکیە رۆشنبیریەکانی سەردەمی خۆی تۆمار کردوە. هەواڵەکانی بڵاو کردۆتەوە. لە سەر هەندێکیان ریپۆرتاجی ورد و پڕبایەخ و، بۆ پشتیوانی هەندێکیان لێدوانی جوانی نوسیوە.

## 1. کۆمەڵی زانستی کوردان

ژیان بەم لێدوانە هەواڵی دامەزراندنی (کۆمەڵەی زانستی کوردان) ی راگەیاندوە:
"مژدەیەکی گەورە بۆ هەمو کوردان
"مەعلومی خوێندەوارانی کیرامە کە تاکو ئەمرۆ هـەمو ئـارەزو و ئەمـەلمان حەسـر کردۆتـە سـەر بـڵاو کردنەوەی عیلم و مەعاریف. ئەوا ئەمرۆ شوکرەن لیللا بە کەمالی ئیفتیخار بەری ئەم سەعیە ئەخەینە بـەرچاوی میلەت. بینا لە سەر تەشەبوساتی چەند کەسانێکی میلیەتپـەروەر و تەسـدیقی وەزارەتـی داخلیـە و معاوەنـەتی گەورەی جەنابی موتەسەرِیف و، موفەتیشی ئیـداریی قـەدربان، پرۆغـرام و نیزامنامـەی (جەمعیـەتی زانسـتی کوردان) نەشر و ئیعلان دەکەین.
"ئومێد وایە کە ئەم جەمعیەتە بناغەیەکی عیلمیمان بۆ دابمەزرێنێ و پێشـەوایی هـەمو میلـەت بکـات و، ئەم تەشەبوسە خەیریەیە بۆ وڵات و میلەت ببێ بە فالێکی خێر. وە تەمەنا ئەکەین کە ئەم جەمعیەتە بە سـایەی هەمو ئەشراف و عولەما و تیجار و منەوەرینەوە بژی و بەردار ببێ.
"بە نەشر و تەقدیم کردنی ئـەم مـژدە خۆشـە و، ئـەم خەبـەرە بـە قیمەتـە (ژیـان) جـدەن مەسـرور و موفتەخیرە."

### 1. 1. پێکهێنانی

**پرۆگرام و نیزامنامەی**
"پرۆغرامی جەمعیەتی زانستی کوردان
"ناوی جەمعیەت و مەرکەزی
1. ناوی جەمعیەت: (جەمعیەتی زانستی کوردان) ە و مەرکەزی لە سلێمانیە.
مەقسەدی جەمعیەت
2. مەقسەدی جەمعیەت: تەعمیمی عیلم و مەعریفەتە لە کوردستان بە پێی ئەم وەسائیتە:
أ. بە نەشری غەزەتە و رەسائیلی موەقەتە.
ب. تەرجومە و تەئلیفی کتێبی تەدریسیە و سائیرە.
ج. مەکتەب کردنەوە و ئیجرای تەدریسات بە رۆژ و بە شەو.
د. بە سورەتی موحازەرە ئەهالی تەنویر کردن.
ە. بۆ ئیکمالی تەحسیل بۆ مەمالیکی موتەرەقیە قوتابی ناردن.
3. جەمعیەت ئەحوالی تاریخیە، جوغرافیە، ئیتنۆغرافیـەی کـوردان بـە سـورەتی مەخسوسـە تـەدقیق و مەحسولی مەساعی نەشر دەکات.
4. جەمعیەت بۆ تەئمینی مەحەبەت و موئانەسـەت لـە مابـەینی ئـەهالی و حکومـەت دا و بـۆ تەقویـەی رۆحی ئیتاعەت بە سورەتی مەخسوسە و بە واسیتەی واعیزانی مەخسوس پەند و نەسیحەت ئیجرا دەکات.
5. جەمعیەت بە هیچ سورەتێک لە گەڵ سیاسەت دا خەریک نابێ.
مەعروف بەگ زادە فائیق. مەحامی رەفیق. حاجی فـەتاح زادە رەمـزی." (ژیـان، ژ 11، 1 ی نیسـانی 1926).

نیزامنامەی داخلی

سورەتی قەید و قبوڵی ئەعزا و ئیخراجات

1. بیلا تەفریقی جنس و مەزهەب هەمو کەسێک بەو شەرائیتە کـە لـە ژێـرەوە نوسـراوە ئـەتوانێ بـە قەراری هەیئەتی ئیدارە داخلی جەمعیەت ببێ:

أ. عومری لە 20 ساڵ کەمتر نەبێ.

ب. لە حقوقی مەدەنیە ساقیت نەبێ و ساحیبی حوسنی ئەخلاق بێ.

2. هـەچ کەسـێک موخـالیفی مەقاسـیدی جەمعیـەت حـەرەکات بکـات وە یـاخود مانگانـە و دخولیـەی جەمعیەت نەدات وە یاخود حەرەکەتێک بکات کە لە ناو ئەهلی وەتـەن دا مـوخیللی شـەرەف بـێ، بـە قـەراری هەیئەتی ئیدارە لە جەمعیەت دەردەکرێت.

سورەتی تەشکیلی هەیئەتی ئیدارە و وەزائیفیان

ئەوە جاری سێیەم بو لە سلێمانی (جەمعیەت) دابمەزرێ:

**جاری یەکەم،**

حاجی مستەفا پاشای یامڵکی دوای گەڕانەوەی لە تورکیا بۆ سلێمانی، بە ڕەزامەندی دەسەڵاتی بریتانی (جەمعیەتی کوردستان) ی دامەزراند و ئیمتیازی غەزەتەی (بانگی کوردستان) ی وەرگرت.

**جاری دوەم،**

ئەحمەد بەگی تۆفیق بەگ (جەمعیەتی مودافەعەی وەتەن) ی دامەزراند.

بەراوردکردنی ئەم 3 جەمعیەتە لە گەڵ یەکتری چەند جیاوازیەک دەرئەخا:

**یەکەم،**

کۆمەڵی زانستی خاوەنی پرۆگرامێکی ڕون و نوسراو بوە. ئامانجەکانی دیـار و دیـاریکراو بـون. لـە کاتێکـدا پرۆگرامی جەمعیەتی کوردستان دیاری نەکراو و نەنوسـراو بـوە. بریتـی بـوە لـە وتـارێکی حـاجی مستەفا پاشا کە لە ڕۆژی هەڵبژاردنی دەستەی بەڕێوەبەری جەمعیەتدا لە مزگەوتی سەید حەسەن لـە سـلێمانی خوێندویەتیەوە. پرۆگرامی جەمعیـەتی مودافەعـەیش شـتێکی کـاتی بـوە بـۆ مەبەسـتێکی دیـاریکراو. کـاتێ چارەنوسی ولایەتی موسڵ بە قازانجی عیراق بە لادا کـەوتوە، ئیتـر ئـەو یـش ئیشـی نـەماوە و بـڵاوەی لـێ کردوە.

**دوەم،**

کۆمەڵی زانستی نیزامنامەیەکی نوسراوی هەبوە، جـۆری وەرگرتنـی ئەنـدام و مەرجـە قانونیـەکانی و ماف و ئەرکەکانی و، دروستکردنی داوودەزگاکانی، بە رونی دیاری کردوە.

ئەمانە بە پێشکەوتن دائەنرێن لە بیری سیاسی و قانونی هەڵبژاردەی کوردا بۆ کەڵک وەرگرتن لە مافە دەستوری و قانونیەکان.

### 1. 2. وەرگرتنی ئیجازە

### 1. 3. ئاهەنگی کردنەوەی

ژیان نوسیوێتی:

"ئیجرای ئیحتیفال بە ڕەسمی گوشادی (جەمعیەتی زانست)

"شەوی شەموی ئاتی کە موافیقی 3/2 ی نیسانی 926 ە هەیئـەتی موئەسیسـەی جەمعیـەتی زانسـتی کوردان لە دائیرەی بەلەدیەدا بە حەفلەیەک رەسمی گوشادی جەمعیەت ئیجرا دەکات.

"تەمەنا ئەکەین کـە ئـەم ئیجتیماعـە گـەورەی علمیـە ببێتـە فاتیحـەی تـەرەقی و سـەعادەتمان وە ئـەم تەشەبوسە بە ئەهمیەتەی هەیئەتی موئەسیسەی جەمعیەتی مەزکور تەقدیر و تەبریک ئەکـەین." (ژیـان، ژ 11، 1 ی نیسانی 1926).

بە بۆنەی کردنەوەی ئاهەنگەکەوە ژیان ریپۆرتاجێکی نوسیوە. بەم سەرەتا ئەدەبیە دەستی پێ کردوە:

"کردنەوەی جەمعیەتی زانستی کوردان

"لە ئەوەلی بەهاردا کە هەتا چاو بڕ ئەکا ئەڕوانی هەمو لایەک سەوز ئەچێتەوە، هـەمو دڵـێ بـە هـەوای بۆنی خۆش و پاکی بەهار ژیاوەتەوە و هەمو مێشکێ بە نەشئەی خۆشی سرورەوە حەساوەتەوە، هەمو چاوێ بە تەماشا کردنی ئەم رەنگە جوانانەی بەهار گەشـاوەتەوە، تەسـادوفی مـانگی رەمـەزانی موبـارەک ئـەکا کـە ساحیبی (شەوی لەیلەتول قەدر) ە دنیای بە یەکجار نورانی کردوە.

.....

"لە ساعەتی 2 ەوە وردە وردە میوانە موحتەرەمـەکان کـە عیبـارەت بـون لـە حـەزەراتی: موتەسـەڕیف، موفەتیشی ئیداری، موفەتیشی پۆلیس، ئامیری مەنتیقەی شەرقیە خۆی و ئەرکان و ئومەرای جەیشـی مـەحبوب و، هەمو روئەسای دەوائیر و، مەئمورین، هەمو ئەشراف و ئەعیان و عولەما و تیجـار و منـەوەرانی مەملەکـەت دەستیان کرد بە تەشریف هێنان. هەتا ساعەتی 2 و نیو نزیکی 300 کەس لەوێ کـۆ بونـەوە...." (ژیـان، ژ 12، 12 ی نیسانی 1926)

لەم کۆبونەوەیەدا مەحامی رەفیـق ئەفەنـدی (رەفیـق تۆفیـق) دوای ئـەوەی بـە نـاوی جەمعیەتـەوە بـە خێرهاتنی میوانەکانی کردوە (نوتق) ێکی خوێندۆتەوە. ئینجا موتەسـەڕیفی سـلێمانی ئەحمـەد بـەگی تۆفیـق بەگ وتاری پیرۆزبایی، حاجی تۆفیق بەگ (کە هێشتا ناوی پیرەمێردی نەکردبو بە نازنـاوی) بـەم بۆنەیـەوە شیعرێک، جەمال بابان و مستەفا قەرەداخی، وتاریان خوێندۆتەوە. لە کۆتاییدا (ئیعانە) بـۆ یارمـەتی کۆمـەڵ کۆکراوەتەوە.

وتارەکەی رەفیق ئەفەنـدی تـا ئەندازەیـەکی بـاش بیروبۆچـونی هـەڵبژاردەی کـوردی ئـەو سـەردەمە دەربارەی رێگەی گۆڕینی کۆمەڵی کورد و، مەبەست لە دامەزراندنی کۆمەڵی زانستی رون ئەکاتەوە:

"....

"ئەوا بە چەند کەلیمەیەک مەقسەدی جەمعیەت ئیزاح دەکەم:

"جەمعیەت دەیەوێ خزمەتی زانستی کوردان بکـات، بـە نـوری عیرفـان دەمـاغی کـورد هـەوێن بکـات، جەمعیەت دەیەوێ کورد وا پێ بگات، لە گەڵ مەدەنیەتی ئیمـڕۆ بتـوانێ رێ بکـات، جەمعیـەت عەلـەل ئەقـەل دەیەوێ حەرەکەتێکی علمیە و فکریە لە کوردستان دا تەولید بکات.

"هەمو رۆژێک ئەبیەین، ئەخوێنینەوە کە میلەتەکانی کـە چـی دەکـەن، لـە فەعالیـەتێکی موتەمادیـە دان. لـە لایەکەوە هەزاران مەکتەب دەکەنەوە میلەت پێ دەگەیەنن. لە لایەکەوە شاخ کون دەکەن. رێ دروسـت دەکـەن. ژێـر بەحر ئەگەڕێن. هەوا ئەپێون. لە ژێر تینی هەتاوێکی سوتێن دا، بیابانها، فـەیافیها دەگـەڕێن. لـە نـاو سـەرمایەکی زەمهەریردا قوتبەکان، شاخە سەربەرزە بەفراویەکان، تەحەڕی دەکەن. راوەستان نازانن. تەهلوکە نـازانن. یـەکێکیان توشی تەهلوکەیەک دەبێ ئەمرێ دەی کەیان بە کەمالی خۆشەویستی خۆیان ئەهاونە عەینی تەهلوکەوە.

"ئەم حەرەکەتە و ئەم فەعالیەتە بۆچیە؟

"بۆ ژیانە، بۆ سەربەرزیە، بۆ بەقای نامە. مادام کە ئێمەش میلـەتێکین و مـادام کـە بـەو سـفەتەوە کـە ئەعزایەکی مـوهیم و کـوردین، لـە جەمعیـەت دا مـەجبورین بـە حەرەکـەت، خزمـەت بـە خۆمـان، خزمـەت بـە جەمعیەتی بەشەریە، خزمەت بە مەدەنیەت، وەزیفەیەکە حال ئیجتیماع داوا لە ئێمە دەکات، ئەگـەر بێـت و ئێمـە ئەو وەزیفەیەی خۆمان بە جێ نەهێنین، تەبیعەت وەکو هـەمو عزوێکـی زائیـد و عاتیـل مـەحومان دەکاتـەوە. زاتەن ئەحفادیش ئەمەمان لێ داوا دەکـات، چونکـە ئێمـە نەهاتوینـە دنیـا هـەر بـۆ خۆمـان بـژین، ئـەبێ بـۆ ئایندەش، بۆ ئەحفادیش، ژین، سەرمایەیەک بۆ ئەوان تەرک بکەین. ئەگەر هەروا حاوربین و حـازرخۆر بـین بە دەستی خۆمان ئایندەمان و بە دەستی خۆمان، لە پێش ئـەوەی کـە بێتـە دنیـا، نەسـلی ئلتیمـان ئـەکوژین، سەر ئەبڕین.

"ئێمە نابێ لە بەر ئەوەی کە زۆر پاشکەوتوین مەئیوس بین. مەئیوسیەت مردنە. وەزیفە چەنـد گـەورە بێ، بە موشکیلات بێ، شەرەفیش بەو نیسـبەتەیە.. ئـەم حاڵـەی کـە بـە سـەر ئێمـەدا هـاتوە، بـە سـەر هـەمو میلەتەکانی کەش هاتوە. مەسەلەن، یۆنان لە زەرفی سێ عەسری حاکمیەتی تورک دا ئەوی تەماشـای دەکـرد وا تێ ئەگەیشت کە ئەم میلەتە لە زومرەی میلەتە مەرحومەکانە، لاکین وەقتێ کە نەسیمی حورییەت لـە فەرەنسـەوە بە سەر یۆنانستان دا وزان بو، ئەم میلەتە ئەو نەسیمە عەترناکەی بۆن کرد، لە خەو بە خەبەر بوەوە تەماشای مازی خۆی کرد. لەو مازیە پڕ لە ئیحتیشامە قوەتێک و ئیمانێکی وەرگرت. روی کردە ئیستیقبال بـە قـوەت و عەزمێکی نە لەرزۆکەوە دەستی کرد بـە رۆیشـتن. یۆنانسـتانیان پـڕ کـرد لـە مەکتـەب، مەدرەسـە، کتێبخانـە، جەمعیاتی عیلمیە، لە پاش مودەتێک یۆنان بوە یۆنانی ئیمرۆ کە لە بەحری سفیدا رەقابـەت لـە گـەڵ ئیتالیـا دەکات. ئەوروپا، ئەی ئەوروپا چی بو؟ لە پێش ئەوەی کە مەدەنیەتی یۆنان لە بیزانسـەوە هیجرەتـی ئـەوروپا بکات، لە پێش ئەوەی کە مەدەنیەتی یۆنان بە دەلالەتی عەرەبە ئەندەلوسی‌یەکانەوە داخلی ئەوروپا بێ، ئەوروپا چی بو؟ ئەوروپا لە ئێمە زیاتر لە جەهالەت دا بو، لە ئێمە زیـاتر پەرێشـان بـو، لاکـین فەلسـەفە و مەدەنیـەتی یۆنان چاوی کردنەوە. تەماشایان کرد ئەم ڕێیە ڕێ نیە بە سەرێدا ئەڕۆن، قرونی وستایان تەرک، بە کەمالی عەزم دەرگای عەسری حازریان کردەوە و ئەوروپا بوە ئەوروپای ئەمڕۆ.

"ئێوە ئەی موحتـەرەمین! ئیحتیمـال دەڵـێن، تـۆ بـەحس لـە حەرەکـەت، لـە فەعالیـەت، دەکـەی. چەنـد میسالێکت بۆ فەیز و بەرەکەتی فەعالیەت بۆ ئێمە هێنایەوە، تێ گەیشتین، ئەی ئێمە چی بکەین؟

"ئێمە چی بکەین؟ پێتان دەڵێم ئێستاکە چی بکەین. ئەی میلەتەکانی کە چی‌یـان کـردوە ئێمـەش ئـەوە بکەین. ئەبێ مازی‌مان زیندو بکەینەوە. مازی، بەڵێ مازی. بە کەمالی تەئەسـور ئـەڵێم ئێمـە لـە گـەڵ مـازی خۆمان هیچ عەلاقەیەکمان نەماوە. بە هیچ شتێکی خۆمان موتەئەسیر نابین. رجاتان لێ ئەکەم چەنـدمان هەیـە بە ئەشعاری حەکیمانەی نالی موتەلەزیز بێ؟ چەندمان هەیە رۆحی ئەنینداری میلەتێکی مەزڵوم و بێ کـەس لـە ئەشعاری حاجی قادری کۆیی‌دا بخوێنێتەوە؟

"ئەبێ وەکو هەمو میلەتێک مازی‌مان، مەفاخیری میلیەمان، بژێنینەوە و، لەو مازیـە قـوەت و ئیمانێـک وەربگرین و بە کەمالی عەزم رو بکەینە ئیستیقبال. جەمعیەتی زانستی پێمان دەڵێ لە هەمو جـێ و شـوێنێکی کوردستان مەکتەبێک، دارولعیرفانێک، کتێبخانەیەک، بکەینەوە. غەزەتەیـەک دەرکـەین. کـورد فێـری خوێنـدن بکەین، نوسین بکەین، ژماردن بکەین، کڕین بکەین، فرۆشتن بکەین. ئەبێ کورد بکەینـە پیـاوێکی عەسـری. ئەبێ منداڵەکانمان بنێرینە ئەوروپا لەوێ پێیان بخوێنین. کـورد ئـەوروپایی پـێ بگەیـەنین. ئـەبێ ویـداع لـە قرونی ئەولا بکەین. بەڵێ لە قرونی ئەولاین. چونکە ئێمە لە ئەم عەسری نورەدا لە هەمو شـتێکمان دا قرونـی ئەولائین. ئەبێ ویداع لە قرونی ئەولا بکەین، بـە خۆیـەوە، بـە ئوسـولی تەدریسـیەوە، بـە مەدرەسـەیەوە، بـە

تەرزی تەفەکور و تەحسیلیەوە، بە هەمو شتێکیەوە ویداع لە قرونی وستا بکەین. لە هەمو شوعەباتی حەیات دا تەجەدود بکەین. ئەبێ موحارەبە لە گەڵ جەهالەت دا بکەین. جەهالەت و نادانی لە کوردستان دا دەرکەین.

"ئەیکەن؟ ئەیکەن؟ ئەیکەن؟

"(ئەکسەر لە حازیرون بە یەک دەنگ و یەک ئاواز وتیان: ئەیکەین! ئەیکەین!)

"بەڵێ، بەڵێ ئەمینم دەیکەین. ئەگەر نەتانکردایە لێرە حازر نەدەبون. ئەمینم پرپیشکی تەجەدود کەوتۆتە کوردستان. ئەم پرپیشکە خواە ناخواە ئەمرۆ سبەینێ چرایەک دائەگیرسێنێ. ئەوی لە ژێر روناکی ئەم چرایەدا رێ نەکات ئەبێ لە بەر تینیدا بسوتێ. "وا تێ دەفکرم لە ئوفقەوە روناکی شەفەقێکی نزیک تاریکی ئەترافمان راوەدو ئەنێ. لە دوای ئەم شەفەقە سوبحێکی شەعشەعەدار چاوەرێمانە. هەزاران سەلام لەو شەفەقە، لەو سوبحە. هەزاران، هەزاران، هەزاران سەلام!" (ژیان، ژ 12، 12 ی نیسانی 1926).

## 1. 4. هەڵبژاردنی هەیئەتی ئیدارە

کردنەوەی دەرگای ئەندامەتی

"ئیعلان

"هەرکەسێ دەیەوێ داخلی جەمعیەتی زانستی کوردان بێ هەمو رۆژێ لە سەعات 6 ی عەرەبیەوە تا سەعات 10 ی عەرەبی موراجەعەت بە مەرکەزی جەمعیەت بکات کە لە ماڵی محامی رەفیق ئەفەندی دایە. هەیئەتی موئەسیسە" (ژ 12، 12 ی نیسانی 1926).

"هەیئەتی ئیدارەی جەمعیەتی زانستی کوردان

شەوی 13 ی نیسانی 926 لە دائیرەی بەلەدیەدا ئیجتیماع کرا بیلئیتیفاق زەواتی موحتەرەمەی ژێرەوە بۆ هەیئەتی ئیدارەی جەمعیەتی زانستی کوردان هەڵ بژێراون:

رەئیس: موتەسەریفی مەعاریفپەروەر

نائیبی رەئیس: رەئیس حاکمی مونفەرید جەنابی جەمال بەگی بابان

ئەعزا: قازی جەنابی شێخ مستەفا ئەفەندی قەرەداغی

ئەعزا: جەنابی محەمەد ئاغای ئەورەحمان ئاغا

ئەعزا: جەنابی عیزەت بەگی عوسمان پاشا

ئەعزا: جەنابی غەفور ئاغا

ئەعزا: جەنابی رەمزی ئەفەندی

موحاسیب: جەنابی فائیق بەگی مەعروف بەگ

موعتەمید: جەنابی رەفیق ئەفەندی محامی" (ژیان، ژ 13، 22 ی نیسانی 1926).

## 1. 5. سەرچاوەی دارایی

کۆمەڵەی زانستی رێکخراوێکی ئەهلی بوە. پارەی لە حکومەت وەرنەگرتوە. بە یارمەتی خەڵک ژیاوە. بۆ ئەو مەبەستە پیتاکیان کۆ کردۆتەوە و، ئەوانەی پارەیان داوە ناوەکانیان بڵاو کردونەتەوە.

"قائیمەی تەبەروعات بە جەمعیەتی زانستی کوردان

"ناوی ئەو زاتانەی کە پارەیان بە جەمعیەتی زانستی کوردان ئیهدا و تەبەرٖوع کردوە وا لە ژێرەوە هەرکەسە لە گەڵ میقداری ئەو مەبلەغەی کە بەخشیویە لە بەرامبەر ناویا بۆ ئەمەی هەمو لایەک ئاگاهدار بێ وا لەمەولا بەرە بەرە تەقدیمی خوێندەوارانی کیرامی ئەکەین." (ژیان، ژ 16، 13 ی مایسی 1926).

لەو ژمارەیەدا و لە ژمارەکانی داهاتودا ناوەکانیان بڵاو کراوەتەوە.

### 1. 6. چالاکیەکانی

### 1. 6. 1. خولی فێرکردنی خوێندەواری و زمان

کردنەوەی فێرکردنی بۆ تەعلیمی ئومیەکان و بۆ تەدریس و فێرکردنی زبانی ئینگلیزی چەند موعەلیمێکی بە معاش تەعین کرد... (ژ 17).

"ئیعلان

"لە جەمعیەتی زانستیدا دەرسخانەیەک ئەکرێتەوە بۆ فێرکردنی زمانی عەرەبی هەر کەس تالیبە فێری ئەم زمانە بێت موراجەعە بە مەرکەزی جەمعیەت بکا.

موعتەمیدی جەمعیەت" (ژیان، ژ 24، 15 ی تەموزی 1926).

"دو موعەلیمی ئینگلیزی و دو موعەلیمی کوردی" (ژیان، ژ 40، 4 ی تشرینی سانی 1926).

### 1. 6. 2. موحازەرە

کۆمەڵ هەندێ کۆڕی خوێندنەوەی وتاری ساز کردوە، ئەمە نمونەیەکیانە:

"لە جەمعیەتی زانستیەوە

"رۆژی جومعە پاش عەسر کە تەسادوفی 4 ی حوزەیرانی 926 ئەکات لە جەمعیەتی زانستیدا لە تەرەف جەنابی جەمال بەگی بابان موحازەرەیەکی حقوقی ئەدرێ لەمەدا بەحس لە تەشکیلاتی مەحاکیمی عمومیەی عیراق و بیلخاسە بەحس لە تەشکیلاتی مەحاکیمی سلێمانی و ئوسولی موراجەعەت کردن بە مەحاکیم ئەکرێ، هەرکەس ئارەزوی هەیە گوێی لێ بگرێ جەمعیەت منەتدار ئەبێ بە تەشریف هێنانیان." (ژیان، ژ 19، 3 ی حوزەیرانی 1926)

### 1. 6. 3. کتێبخانەی گشتی

تا ئەو کاتە سلێمانی کتێبخانەی گشتی تێدا نەبوە. وەکو لە ژ 44 دا نوسراوە جەمعیەت لە بارەگاکەی خۆیدا خەریکی رێکخستنی کتێبخانەیەک بوە.

### 1. 6. 4. "مەجموعەی زانستی

"ئەمجارە ئیجازەنامەی دەرهێنانی مەجموعەی زانستی لە مودیریەتی مەتبوعاتەوە بە سکرتێری جەمعیەتی زانستی گەیشت. ئەم مەجموعەیە وەکو خەیاڵی لێ کراوە لە حەجمی 16 وە یا 24 پەڕەییدا ئەبێ و، هەر 15 رۆژ جارێک دەرئەهێنرێ. وا بە هیواین کە بەم نزیکانە بە مەقالاتی موفیدەی زانستی و کۆیەتی و ئەخلاقیەوە بخرێتە پێش چاوی خۆشەویستانی زانست و ئەدەب." (ژیان، ژ 57، 10 ی مارتی 1927).

پێ ناچێ ئەم مەجموعەیە لەو کاتەدا دەرچوبێ.

**1. 6. 5. بژاری زمانی کوردی**

"کۆمەڵی بژاری زمانی کوردی

"مودەتێ لەمەوپێش بە موتالەعە و تـەکلیفی رەئیسـی جەمعیـەتی زانسـتی، کـە جـەنابی موتەسـەرِیفە، جەمعیەت قەراری دابو کە لە منەوەران و هونەرمەندانی وەتەن، ئەنجومەنێ تەشەکول بکا کە کەلیماتی ئەجنەبی لە زمانی کوردیدا نەهێڵن و موقابیل ئەو کەلیماتی ئەجنەبیە کـە ئـەمرِۆ زۆر موسـتەعمەلە، لـە ئەسـلی کـوردی کەلیمات بدۆزنەوە و لە جێی ئەوان داینێن. یەعنی بە کوردی (کۆمەڵی بژار). ئەو دانیشمەندانە کە سزای ئەم کارە گەورەیە بـون لـە تـەرەف جەمعیەتـەوە هـەڵبژێرران و ئاگـادار کـران. رۆژی یەکشـەمە سـەعات 10 لـە مەرکەزی جەمعیەت دا گرد بونەوە..." (ژیان، ژ 45، 9 ی کانونی ئەوەلی 1926).

لەو کۆبونەوەیەدا بریار دراوە:

"کە ئەبێ هەمو ئەعزایەکی ئەم کۆمەڵە خەریک بن بۆ دۆزینەوەی کەلیمەی کوردی و لابردنـی کەلیمـەی بێگانە و، هەفتەی دو جار لە خانوی جەمعیەتی زانستیدا کۆ ببنـەوە، هەرکـەس چـی دۆزیبێتـەوە لـە بـەر دەم هەیئەت دا بخوێنرێتەوە، لە دوای قبوڵ بدرێ بە سکرتێر کە داخلی دەفتەری تایبەتی بکات."

ئەم بریارەی کۆمەڵی زانستی لە بیستەکاندا، ئەگەرچی دیار نیە چەندی بەرهەم بوە و چیان کـردوە، بەڵام چەندین دە ساڵ پێش هەوڵی حەفتاکانی کۆرِی زانیاری کورد کەوتوە.

**1. 6. 6. تەمسیل**

یەکێ لە چالاکیەکانی کۆمەڵی زانستی تەمسیل بوە.

**1. 6. 7. یارمەتی قوتابی هەژار**

یەکێ لە کارەکانی کۆمەڵ دابینکردنی پێویستیەکانی هەندێ قوتابی دەسکورت بوە. لە ژ 44 دا باسـی یارمەتیدانی چەند خوێنکارێکی نوسیوە." (ژیان، ژ 44، 2 ی کانونی ئەوەلی 1926)

**1. 6. 8. ناکۆکی نێوان دامەزرێنەرەکانی**

ئاڵوگۆرِ لە هەیئەتی ئیداریدا

بە پێی هەندێ بەڵگەی بریتانی، مستەفا پاشای یامڵکی کە لە مانگی مایسدا گەرِاوەتەوە بۆ سـلێمانی، ویستویەتی کۆمەڵی زانستی بۆ پرِۆپاگاندەی هەڵبژاردن بۆ خۆی بەکاربهێنێ. جەمال بابـان لەمـەدا هاوکـاری کردوە. موتەسەرِیفی سلێمانی، ئەحمەد بەگی تۆفیق بەگ، ئەم کارەی پـێ بـاش نـەبوە. ویسـتویەتی کۆمـەڵی زانستی دور بێ لە کاری سیاسی، خەریکی کاروبـاری خوێنـدەواری و رۆشـنبیری بـێ. بـەڵام جـەمال بابـان ویستویەتی "دوای لابردنی موتەسەرِیف کۆمەڵ بکا بە بنکـەی بڵاوکردنـەوەی هۆشـیاری سیاسـی نەتـەوەیی کوردی" چونکە باوەرِی وا بوە کە "بیـری حـوکمی زاتـی بـۆ کوردسـتانی عیـراق بـە بـێ بـونی بنکەیـەکی رێکخراوەیی پتەو" لە جێبەجێ کردن نایە. لەسەر ئەمە ناکۆکی کەوتۆتە نێوان موتەسەرِیف و جەمال بابـان و هەندێکی تر لـە ئەنـدامانی هەیئـەتی ئیـدارە. جـەمال بابـان و مسـتەفا قـەرەداخی ئیسـتیقالەیان داوە. ژیـان ئیشارەتی بە ناکۆکیەکان نەداوە، بەڵام هەواڵی هەڵبژاردنی ئەندامانی نوێی داوە:

"ئەعزا بۆ جەمعیەتی زانستی

"لە بەر ئەوەی لە ئەعزای ئیدارەی جەمعیەت غەفور ئاغا ئەساسەن لە بەر بەعزێ ئەسبابی زاتیە قبوڵی ئەعزایەتی نەکرد بو، وە مودەتێکە لە ئەعزایان: جەنابی جەمال بەگ و شێخ مستەفا ئەفەندی، ئیستیعفایان کردبو، ئەعزاکانی تریش ئەکسەر لە بەر ئیشوکاری خسوسی مونتەزەمەن موەفەق نەئەبون بە دەوام بۆ ئیجتیماع زۆر مەسالیحی جەمعیەت سەکتەدار بوبو. بۆ ئەوەی کە ئیشوکاری جەمعیەت لە ئینتیزام دا جەرەیان بکا شەوی دوشەمە 23/22 ی ئاغستۆسی 926 هەمو هەیئەتی عمومیەی جەمعیەتی زانستی دەعوەت کران بۆ بینای جەمعیەت و لەوێدا بۆ 3 ئەعزا ئینتیخابات ئیجرا کرا. لە مەجموعی 55 رەئی تۆفیق ئەفەندی موحاسیبی لیوا بە ئیحرازی 53 رەئی و، حاجی تۆفیق بەگ بە ئیحرازی 52 رەئی و، نەجیب ئەفەندی سابیق معاونی حاکمی مونفەرید بە ئیحرازی 46 رەئی، ئینتیخاب کران بۆ ئەعزایەتی جەمعیەت. خوا لە خزمەتی میلەت و مەملەکەت دا موەفەقیان بفەرموێ." (ژیان، ژ 30، 26 ی ئاغستۆسی 1926).

کۆمەڵی زانستی بەم ناکۆکیە لاواز بوە و چالاکیەکانی کەم بۆتەوە. لەم روەوە م. ئەدیب لە سەروتاری ژیاندا لە ژێر سەرناوی (بێ رەغبەتی بە عیلم) نوسیوێتی:

"....

"جەمعیەتی زانستی کە لە تەرەف منەوەرێکی وەتەنپەروەر و خێرخواهێکی کوردەوە بە ئەزیەتێکی گەورە بە فکری گەیشتن بەم غایە و ئەمەلە بۆمان دامەزرا بو، ئاخریەکەی بە رەقابەت و لە رقی یەکتری بە دەستی خۆمان روخانمان. لێرەدا شتێکی تر هەیە لازمە بەیانی بکەین کە هەروەکو غەزەتەکەمان لە شەخسیات نادوێ و غایەی خزمەتی موڵک و میلەتە ئێمەیش بۆ ئەمەی نەڵێن ئەم نوسینە زادەی فکرێکی غەرەزکارە مەوزوعی مەقالمان کەس نیە و هەدەفی تیری تەنقیدمان ناتەواویی تەربیەی ئیجتیماعی هەموانە. لە بەر ئەمە بە بێ پەروا ئەتوانم بڵێم: ئەو بینای ئەمەلی موستەقبەلەمان جەمعیەتی زانستیە بو بە واسیتەیەکی تەئمینی مەنافیع و تەعقیبگاهی ئەغرازی شەخسیە تاوەکو هێنرایە سەر ئەم دەرەجەیە کەوا بە بەر چاومانەوەیە..." (ژیان، ژ 61، 14 ی نیسانی 1927).

بە پێی هەندێ بەڵگەی بریتانی هاوزەمان لە گەڵ دامەزراندنی کۆمەڵی زانستی کوردان لە سلێمانی، لە 21 ی حوزەیرانی 1926 دا لە کەرکوک چەند کەسایەتی ناسراوی کورد، لە وانە ئەسیری، ویستویانە ئیجازەی دامەزراندنی (کۆمەڵی زانستی) و، لە هاوینی هەمان ساڵدا لە رەواندز ئیسماعیل بەگ و هەندێ لە کەسایەتیە ناسراوەکانی ئەوێ ئیجازەی دامەزراندنی (کۆمەڵی هوشیاری) لە وەزارەتی ناوخۆی عیراق وەربگرن. بەڵام وەزارەتی ناوخۆی عیراق ئیجازەی پێ نەداون.

**تێبینی:**

بۆ کۆمەڵی زانستی و کۆمەڵەکانی تر لە بەڵگەکانی بریتانیادا، بڕوانە:

د. ولید حمدی، الکرد و کردستان في الوثائق البریطانیة، مطابع سجل العرب، 1992. ص 203–209. بەڵگەی ژمارە (FO 371 2255) ی تۆماری گشتی بریتانی و پاشکۆکانی 1 و 2 و 3 (Appendix I، II، III ) ص 203– 209.

FO 371 2255، Appendix I، II، III .

لە بەڵگەکانی ئەم کتێبەدا، هەم تێکەڵ و پێکەڵی دروست بوە، هەم هەڵە کەوتۆتە نوسینی ژمارە و رۆژی هەندێکیان.

## 2. یانەی سەرکەوتن

"کۆمەڵی یانەی سەرکەوتن

"بەغداد: نائیبی هەولێر مەعروف بەگ جیاووک لە گەڵ چەند پیاوێکی کوردی ترا لە وەزارەتی داخلیەی عیراق داوای مەئزونیەتیان کرد بو بۆ ئەوەی کۆمەڵێک تەشکیل بکەن و بە ناوی (یانەی سەرکەوتن) ەوە نادی‌یەک دابمەزرێنن.

وەزارەتی داخلیە مەئزونیەتی داونێ و لە سەر ئەوە خەریکی دامەزراننی کۆمەڵەکەن."

"ژیان: پشت بە خوا پرۆغرامی ئەم کۆمەڵە لە غەزەتەیەکی ترمانا عەرزی خوێندەوارەکانی ئەکەین، وەکو پرۆغرامەکەمان خوێندۆتەوە ئەم کۆمەڵە فکرێکی هەیە خزمەتێکی گەورەی کوردستان بکات و بۆ پێش خستن و سەرکەوتن و بڵاوکردنەوەی مەعاریفمان و بۆ بەرزی و بوڵندی زراعەت و ئیقتیسادیاتمان و بۆ تەرەقی پێ دانی سەنایعی وەتەنی‌یەمان ئەیەوێ تێ کۆشێ.

مەرکەزی گەورەی ئەم کۆمەڵە لە بەغداد ئەبێ و لە هەمو لیوا و قەزاکانی کوردستانا ناوچە ئەکاتەوە.

هیوامان وایە بە هەمویەتی کوردەکان پشتیوانی ئەم کۆمەڵە بکەن." (ژیان، ژ 241، 29 ی مایسی 1930).

"کۆمەڵی یانەی سەرکەوتن

"ئەو نادیەی کە نوسی بومان بە ناوی (یانەی سەرکەوتن) ەوە لە بەغداد لە لایەنی کوردە ئیشکەر و بە قیمەتەکانمانەوە ئەکرێتەوە رۆژی جومعە 30/5/30 لە رۆیال سینەمادا رەسمی کردنەوەی بە سورەتێکی رێکوپێک و جوان جێبەجێ کراوە. لە میعادی خۆیدا بانگ کراوەکان کە عیبارەت بون لە: مەعالی وەزیری عەدلیە و، وەزیری مەعاریف و، نەقیبول ئەشرافی بەغداد و، شاعیری شەهیر جەمیل سدقی ئەفەندی زەهاوی و، هەمو مەئمورین و زابیتان و کوردەکانی بەغداد کۆبونەتەوە و، ئەوەل جار نەشیدێکی مەلیکی بە عەرەبی و گۆرانیەکی وەتەنی کوردی‌یان گوتوە و لە دوایی‌دا لە لایەنی مارف بەگ جیاووکەوە نوتقێک خوێنراوەتەوە و بەیانی فەرموە کە غەرەز لە کۆکردنەوەی ئەم کۆمەڵە و ئەم (یانە) یە خدمەت کردنی لوغەتی کوردی و بڵاوکردنەوەی عیلم و عیرفانە لە کوردستانا. لە پاشا لە لایەنی نەریمانی کوڕی جیاووکەوە کە قوتابیەکی بچوکە قەسیدەیەکی کوردی کە هەمو بەیانی چاکێتی (یەک بون) ئیتیفاق ئەکات خوێنراوەتەوە و بە عەرەبی‌یش تەرجومەی کردوە. لە پاشانا لە تەرەف ئەدیب و خەتیبی شەهیر خەلەف شەوقی ئەفەندی داوودی‌یەوە نوتقێک خوێنراوەتەوە و هەمو نوتقەکان بە چەپڵە لێدان بەرامبەری کراوە. لە دوای ئەمانە بۆ دامەزراننی کۆمەڵی ئیشکەری یانەکە، دەست کراوە بە ئینتیخابات و ئەم پیاوانەی لای خوارەوە هەڵبژێرراون و کۆمەڵەکەیان دامەزرانوە:

| چەند رەئی وەرگرتوە | ناویان |
| --- | --- |
| 52 | ئیبراهیم ئەفەندی حەیدەری |
| 107 | ئەمین زەکی بەگ |
| 160 | مارف ئەفەندی جیاووک |
| 102 | مەحمود جەودەت بەگ |
| 87 | عەبدوڵا لوتفی |
| 94 | خەلەف شەوقی ئەفەندی |
| 86 | محەمەد عەلی ئەفەندی زابیتی تۆپچی |
| 63 | ئەحمەد ئاغای کەرکوکی |
| 58 | مەحامی عارف ئەفەندی پشدەری |

ژیان: پشت بە خوا ئەم کۆمەڵە بە هەمو لایەکی کوردستانا لق و پۆپ ئەهاوێ و میلەتی کورد بە هەمو هێزیەوە پشتیوانیی‌یان ئەکات و بۆ ئەم غایە بەرزە هەمو لایەک تـێ ئەکۆشـین و، بـەم سـەبەبەوە لـە تـاریکی جـەهل رزگارمـان ئـەبێ و وەتەنەکـەمان بـە چـرای مـەعاریف رونـاک ئەکرێتـەوە." (ژیـان، ژ 243، 5 ی حوزەیرانی 1930).

لە ژ 246 دا م. نوری بە ناونیشانی (یانەی سەرکەوتن)، شیعرێکی بڵاو کردۆتەوە لە سەرەتاکەیدا ئەڵێ:

"دوێ شەو لە خەوا سروەی بادی سەحەر ئەنگوت
وەک سوبحی بەهاران
شەو عاقیبەتی هات و دڕی سوبحی گریبان
ڕۆژ بوەوە لە کوردان
غونچەی فەرەح و نەشئە دەمی دایەوە، پشکوت
وەک چیهرەی یاقوت
ئافاقی ئەمەل بو بە چەمەنزار و گولستان
وەک ڕەوزەیی ریزوان....."

## 3. بایەخدان بە زمان و ئەدەبی کوردی

### بایەخدان بە زمانی کوردی

ڕۆشنبیرانی کورد لە عیراقدا، لە بیستەکان و سیەکانی سـەدەی بیسـتەمدا، بایـەخێکی نائاسـاییان بـە زمانی کوردی داوە و، گرنگی زمانی کوردی‌یان بـۆ بـون و مـانی کـورد ئەوەنـدە هـەڵناوە گەیشـتۆتە رادەی (موبالەغە). لەم بارەیەوە ژیان دەیان وتاری بڵاو کردۆتەوە.

زمانی ڕەسمی و دوانی ئەفغانی و تاجیک و بەشێکی هیندستان فارسی بوە. هەرگیز خۆیان بە فـارس نەزانیوە و، ناسنامەی نەتەوەیی خۆ یشیان نەدۆڕاندوە.

زمانی ڕەسمی هیند و پاکستان و فیلیپین و زۆر گەلی تر، تا ماوەیەکی درێژ، ئینگلیزی بوە، بێ ئەوەی هیچیان خۆیان بە ئینگلیز زانی بێ، یان ناسنامەی نەتەوەیی و دینی خۆیان ون کردبێ.

زمانی ئینگلیزی زمانی ڕەسمی و قسەکردنی گەلانی ئەمـەریکا، کەنـەدا و ئوسـترالیا بـوە، بـێ ئـەوەی هیچکام لەو گەلانە خۆیان بە ئینگلیز زانی بێ. تەنانەت دانیشـتوانی (شانشـینی یـەکگرتو) کـە لـە نەتـەوەی ئینگلیز و 3 نەتەوەی: سکۆت، وێڵز، ئایریش، پێکهاتوە و هەمویان خاوەنی تایبەتمەندی نەتەوایەتی خۆیـانن، کەچی ئینگلیزی زمانی کاروباری ڕەسمی و دوانی ڕۆژانەی هەمویان بوە.

زمانی ڕەسمی و دوانی چەندین گەلی ڕەشی ئەفەریقایی زمانی فەرەنسـی بـوە، بـێ ئـەوەی ناسـنامەی نەتەوەیی و دینی خۆیان لە بیر چوبێتەوە.

ئەو بایەخەی ڕۆشنبیرانی کورد بە زمانەکەیان و ئەو گرنگیـە گەورەیـەی بـۆی قایـل بـون، هەنـدێکی چاولێکەری عەرەب بوە. نەتەوەپەرستەکانی عەرەب زمانی عەرەبی‌یان بە فاکتەری سـەرەکی یـەکێتی نەتـەوەیی خۆیان ژماردوە.

**هەولێری ع. عەزیز** لە ژێر سەرناوی (زمانی کوردی) دا نوسیوێتی:

"زمان شتێکی زۆر پێویستە بـۆ گـەلی بەشـەر، زمـان ڕۆحـی فکـر مـادی تـاریخ ئاوێنـەی حـەزارەتی ئینسانیەتە. هەر بە واسیتەی زمانە ئەتوانین مازی و حال و موستەقبەلی میلەتێک تـێ بگـەین. میلـەتێکی بـێ

زمان بە مردو حساب ئەکرێ. ئەو نەوعە میلەتانە حەقیان غەسب ئەکرێ. حەقی ژینیان نامێنێ هەروەکو مەجارەکان وتویانە: (میلەتێک لە ناو زمانی خۆی ئەژی) زۆر مەعقولە زمان و میلیەت یەکن. زمانی کوردی چەند ساڵ و زەمانێک بو لە هەمو شوعبەی حەیات دەرکرابو لە سایەی هەندێک زوڵم و فەزاحەت کە هەر وەکو ئێمە گەلێ میلەتەکانی تریش لەم بەلایە لە گەڵ ئێمە موشتەرەک بون بەمجۆرە حسیاتی میلیە و تاریخی قەومیەمان ون بوبو چونکە لە ناو قەومێک هەرچەند زیعفی لوغەت پەیدا بێ بەم نیسبەتە حوبی وەتەن و قەومیەتیش کەم ئەبێ لە گەڵ ئەمەندە تەزیقات و ئینکاریەتی سیادەتی قەومیەمانیان کرد و بۆ مەحو کردنی زمانی کوردی تیانکۆشی کورد و زمانی کوردی مقاوەمەتێکی شێرانەیان نیشان دا زمان و ئەخلاق و عاداتی خۆیان محافەزە کرد تێکەڵاو نەبون. بەڵێ روناکی ئیستیقبال رەهبەری سەرکەوتنمان زمانمانە. شوکر ئەمرۆ زمانی کوردی لە کوردستانی عیراق زنجیری ئەسارەتی شکاند پەردەی سەبری دراند وەک مانگی چواردە شەو دەرکەوت بە روناکی و شەوقی خۆی چاوی گەلێ حەسودانی کوێر کرد و زیای پڕ نوری خۆی بە واسیتەی شاخی کوردستان ئینعیکاسی کوردستانی شیمالیشی ئەکات.

"بەڵێ خۆم زۆر بە بەختیار ئەزانم، پار هەرچەند ئەچومە قوتابخانەی هەولێر دەنگی مامۆستا و قوتابی بە زمانی تورکیم گوێ لێ ئەبو، هەروەک دەنگی نەکیر و مونکیر دەهشەتی ئەخستە سەر ئەعسابم، بە رەنگ زەردی و مەئیوسیەت ئەچومە دەرەوە. عەینی حاڵیشم لە دائیرەی حکومەت ئەدی. هەر رۆژێکم عەزابێک بو. ئەمساڵە کە لە جنوبی عیراق گەڕامەوە هەولێر، کە ساڵێک بو حەسرەتکەشی کوردستان بوم، چەند خۆم مەسعود زانی کە چاوم بە دائیرەی حکومەت و قوتابخانە کەوت کە زمانی کوردی ئیستیعمال ئەکەن. لەم ئەحواڵە قوتابیانی مەکتەب خۆشحاڵ و بە کەیف و رو بە خەندە بون. پرسیم چیە ئەم سرورە؟ وتیان بەشارەتت بێ کە ئەمساڵ دەرسمان بە کوردی بو، ئیمتیحانمان بە زمانی کوردی، زمانی ئاباد و ئەجدادمان ئەدا کرد.

"بەڵێ بەختیارم، مەملەکەتەکەشم بەختیارە کە مودەتێک ئەسیری زمانی جەهەنەمییان بوین (مەبەستی زمانی تورکیە. نم.) ئەمرۆ نەجاتمان بو زمانی حکومەتی بابان و حکومەتی رەواندزمان هێنایەوە فکر. بەڵێ چۆن بە کەیف نابین کە لە رەواندز جەریدەی زاری کرمانجی، لە بەغدا دیاریی کوردستان، لە سلێمانی ژیان، سەعییەکی گەورە، خزمەتێکی جدی بە جێگا ئەهێنن بۆ ئەم وەتەنە موقەدەسەمان.

"لە هەندێک بێ خەبەران ئەبیەم کە ئەڵێن کوا خۆ کورد چ حکومەت و زمانێکی بە ئەساس و قەواعیدی زمانیان نەبوە؟ بەڵێ من ئێستا نامەوێ یەک یەک حکوماتی موستەقیلەی کورد و تاریخ و جوغرافیای کوردیان بۆ بەیان بکەم چونکە وەختم نیە، بەڵام کیتابی تاریخی عمومی زۆرە و کیتابی تاریخی جەنابی حوزنی ئەفەندی و مەجموعەی مەقالاتی جەنابی جیاووک بخوێنن چاک تێ ئەگەن لە کورد و کوردستان. بەڵام لە حەق زمانی کوردی ئەمەندەیان پێ ئەڵێم قەواعید لە زمان دەرئەچێ نەک زمان لە قەواعید. مادامکی زمانی کوردی هەیە قەواعیدیشی هەیە. بەڵام هەروەکو تاریخ و هەمو ئاسارێکی کوردیان مەحو کردەوە قەواعیدی زبانەکەش کە نوسرا بوەوە لە ناویان برد بە فرۆفێڵ زەربەیەکی گەورەیان لە حەیاتی مەدەنیەمان دا. بەڵێ بۆچی نازانن ئەی بێ خەبەران زمانی تورکی لە کوردی، عەرەبی، فارسی و فرانسزی موتەشەکیلە؟ کەچی کوردی کوردیەکی پەتیە موستەقیلە لە زمانی ژاپۆن و چین و هیندی زەحمەتتر نیە. لە گەڵ فارسی چ فەرقێکیان هەیە؟ بۆچی فارسی ئەنوسرێ بۆچی کوردی نەنوسرێ؟

"غەیری حەقیقەت ئینکار کردن هیچتان لە دەستا نیە خوا عەقڵ بە ئەولادتتان ببەخشێ!" (ژیان، ژ 29، 19 ی ئاغستۆسی 1926).

## 4. بایەخدان بە ئەدەبی کوردی

**فەتحوڵا ئەسعەد** لە ژێر سەرناوی (ئاواتێکە لە هەمو دانیشوەرانی قەڵەمرەوی کوردستان دەخوازم) نوسیوێتی:

"بە دڵێکی غەمگینەوە دەڵێم: بەدبەختی ئێمە و بەدرایی تورک تا ئێستا ئەم کەشتی زیندەگانی ئێمەی وا خستبوە گێژاو و پەشێواویەوە کە نەمان توانیوە پێشەوایانی خۆمان بناسین و یادگاری عومری ئەوان کە دیوان و ئەدەبیات و داستانی نایابە لە چاپ بدەین و بە خەڵک و خوای بناسین و لە دنیادا دەر بکەوێ کە کورد چ نوعە پیاوێکی تیا هەڵکەوتوە و چ دوڕ و گەوهەرێکی لە مەیدانا بۆ نەوەی خۆی هەڵڕشتوە. ئاخ و دریغ ئەو دوڕ و گەوهەرە هەمو لە کون و قوژبنا شارراونەوە و ئێمە موروی خواستەمەنی بێگانە بە سەر خۆمان دا دەکەین، ئەو گەنجینە ئەدەبە لە سەر کاغەزی کۆنی رزیو ماونەوە ئێمە هێشتا لە دوای عەرەبی و تورکی و فارسی وێڵین، ئێستاکە لە سایەی خواوە پەناهێکی زۆر باشمان بۆ هەڵکەوتوە کە هەرچۆنێ ئارەزو بکەین بتوانین ئاساری کوردی چاپ و دابەش بکەین و پێشەوایانی میلەتەکەمان بەو یادگارە شیرینەیانەوە بژێنینەوە.

"تو خودا لێتان دەپرسم پێم بڵێن بۆچی راوەستاون. بۆچ ئاساری ئەو گەورە گەورانە ناخەنە بەرچاوی هەمو میلەتێکەوە. برادەرەکانی شیمالیمان لە گەرمەی زەبربەدەستی و بێدادی ستەمگەرەکانی ئێتیحادا دیوانی مەم و زینیان چاپ کرد و چوار ساڵ لە غەزەتەدا پارچە پارچە ئەشعاری نالی و مەولەوی و هەمو شاعیرەکانی جنوبیان بڵاو کردەوە و قاموسی لوغەتی کوردی جنوبی و شیمالییان هێنایە مەیدان، کەچی ئێمە لەم هەنگامە هەموارەدا دیوانێکی مستەفا بەگ، یا پیری شاعیرانی کوردستان مەولەوی یاخود نالی یا سالم یا وەفاییمان پێ تەبع نەکرا. من دەستەبەر دەبم لە پێش دا دیوانی مستەفا بەگ تەبع بکەم. ئینجا تکا لەو کەسانە دەکەم کە ئاساری مستەفا بەگیان لە لایە، کەم و زۆر، بۆم بنێرن و ئەگەر بە خۆڕایی نادەن بە پارە ڕێک دەکەوین. هەرچەند من خۆم دیوانێکی تەواوی حەزرەتی نالیم هەیە، فەقەت لە لام وایە چونکو مستەفا بەگ پێشتر کەوتوە سزاوار ئەوەیە لە تەبعیش دا پێش بکەوێ لە دوای ئەو بە زنجیرە ئەوانی تر بێنینە پێشەوە." (ژیان، ژ 53، 10 ی شوباتی 1927).

**زەکی سائیب** لە ژێر سەرناوی (تکایەکی تایبەتی بۆ هەمو کوردێک) نوسیوێتی:

"لای هەمو کەس مەعلومە کە میلەت بە زبانەوە ئەناسرێ. بەقای هەمو قەومێک بە زبانەوە بەندە. میلەتی بێ زبان نیە لە دنیادا. هەچ قەومێ زبانی کەوتە تەزەلزول و نەمانەوە، هەچ میلەتێ زبانی خۆی محافەزە نەکرد، ئاخریەکەی ئینقیرازە.

"میلەتی کوردیش تا ئیستە زبانی میلی خۆی لە هەمو شتێ پاراستوە. بە سایەی محافەزەی زمانیەوە ئەمرۆ میلەتی کورد ناوونیشانێکی هەیە و ئەناسرێ. ئەمرۆ لە حکومەتی عیراق دا زبانی کوردی لە رەسمیات دا مەقبولە. محافەزەی لیسانیش بە شتێک ئەبێ، پێی قسە بکرێ و بنوسرێ و بخوێنرێ. ئینسانێ کە زۆر مودەت بە زبانی باووباپیری قسەی نەکرد و نەینوسی و نەیخوێند ئەو زبانە عەزیزەی بیر ئەچێتەوە.

"میلەتی کورد تا ئیستە لە ژێر تەوقی زوڵم و جەهالەت دا بوە و بێ دەست بوە لە بەر ئەوە کتێب و ئاساری مدەوەنەی نیە و لە بەر ئەوە چاک نەناسراوە...

"لەم درێژیە مەقسەدم ئەوەیە کە منەوەران و لاوانی وڵات کە ئەم وەزیفەیەیان لە سەر شانە ئەبێ هەرچیەکیان بۆ ئەکرێ بیکەن و نەوەستن، هەر هیچ نەبێ کە خەریکی تەئلیفات و تەرجومە نابن هەرچی ئاساری پێشوانمان هەیە کۆی بکەنەوە و یەکە یەکە لە چاپی بدەن و بڵاوی بکەنەوە، تا هەم ئەو ئەسەرانە کە

نیشانەی رۆحی کوردیە لە ناو نەچێ و ساحیب ئەسەریش ناوی بمێنێ و هەم بە سایەی ئەوانەوە زمانی میلیمان محافەزە و بەردەوام بکەین. وەکو کتێب نوسینەوە و تەرجومەی کتێبی عیلمی و فەنی پێویستە، کۆکردنەوە و چاپ کردنی ئاساری پێشوانیش گەلێ موهیم و پێویستە.

"من زۆر دەمێکە بەو ئەمەلەوە خەریکم و چەند ساڵە هەرچی شیعرێک، قسە و باسێکی گەورەکانمان ببینم و ببیەم، کۆی ئەکەمەوە و حازری ئەکەم. بە دڵ ئەمەوێ تا سەر ببیەم و تەواوی بکەم لە گەڵ نوبزەیەک لە تەرجومەی حاڵی گەورەکانمان بیکەم بە کتێبێکی چاک و بیخەمە پێش دەمی هەمو کوردێک. لە بەر ئەوە زۆر تکا ئەکەم لە هەمو کوردێکی حەمیەتمەند، لە هەمو منەوەر و لاوێک ئایا تەرجومەی ئەحواڵ و سەرگوزەشتە و قسە، ئایا شیعر و غەزەلیاتی هەچ شاعیر و ئەدیبێکی کۆن و تازەی کوردیان لایە و هەیانە لوتف بکەن و بینێرن تا هەمویان کۆ بکەمەوە و لە چاپیان بدەم لە شکلی کتێبێکی مونتەزەم و موعەزەم دا کە بە سایەی هەمو حەمیەتمەندێکی کوردەوە ئەسەرێکی وا گەورە و موهیم بێتە وجود.

"وەعدیش ئەدەم هەرچی تەرجومەی حاڵی جەنابی نالی، شێخ رەزا، مەولەوی، کوردی، سالم، وەفائی، یەعنی یەکێ لە شاعیر و ئەدیبەکانم بە راستی، بە تاریخی تەوەلود و وەفاتیانەوە، بە تەواوی بۆ بنوسێ لە پاش چاپ کردنی دو کتێبی لەو کتێبە و، هەرچی 100 شیعر یەعنی 200 مەسرەع لە ئەشعار و غەزەلیاتی یەکێ لە شاعیرەکانم بۆ بنێرێ لە پاشا یەکێ لەو کتێبەی بە دیاری تەقدیم ئەکەم. مەمنونیەت و منەتداری خۆم و خزمەتی میلەتەکەش بە جیا. تکایش ئەکەم هەرکەسێ بە قەریحە و فکری خۆی ناوێکی موناسیب و جوان بدۆزێتەوە بۆ ئەم کتێبە گەورە و موهیمە." (ژیان، ژ 72، 5 ی تەموزی 1927).

زەکی سائیب ئەو (کتێبە گەورە و موهیمە) ی بڵاو نەکردۆتەوە. بەڵام خزمەتێکی گەورەی زمان و ئەدەبی کوردی کردوە. دوای ئەم تکایە لە بەغداد لە گەڵ تاهیر بەهجەت مەریوانی بە جوتە بە ناوی (کوردی و مەریوانی) یەوە زنجیرەیەک دیوانی شیعر و کتێبی کوردییان چاپ و بڵاوکردۆتەوە. لە ناو ئەوانەدا دیوانی نالی، سالم، کوردی، حەریق. بۆ ئەو رۆژگارە، کە ژمارەی هەمو چاپکراوی کوردی بە پەنجەی دەست ژمێردراون، کارێکی گەورە و گرنگ بوە.

## 5. بایەخدان بە مێژوی کورد

ژیان بایەخێکی زۆری داوە بە مێژوی گەلی کورد. بە تایبەتی لەو کاتەدا هێشتا کتێبەکەی ئەمین زەکی (خولاسەیەکی تاریخی کورد و کوردستان) بڵاو نەکرابوەوە. تەنیا کتێب لە بابەت مێژوی کوردستانەوە (غونچەی بەهارستان) ەکەی سەید حسێن حوزنی بوە.

لە ژ 156 و 157 و 158 دا لە ژێر سەرناوی (نوبزەیەک لە تاریخی کوردان) دا کورتەی تەرجومەی لێکۆڵینەوەی ئارکیۆلۆجی پرۆفیسۆر سپایسەر لە سەر شوێنەوارە مێژوییەکانی کوردستانی عیراقی بڵاو کردۆتەوە. بەم پێشەکییە دەستی پێ کردوە:

"دەرەجەی ئەهمیەت و قیمەتی عیلمی کەشفیاتی تاریخی و ئیحیای مازی میلەتێک لە هەمو کەسەوە مەعلومە و موحتاجی ئیزاح نیە. تاریخ نەهرێکە کە سەرچاوەی لە ئەزەل هەڵئەقوڵێت و مەنسەبەکەی ئەبەدە. هەرچەندە زاهیرەن لە جەرەیان دا بێ بەعزێ تەحەولات و تەقەلوبات موشاهەدە ئەکرێت، فەقەت لە حەقیقەتی حال دا ئەو هەر لە عەینی مەجرای ئەسلییەوە ئەروا. تەبەقەی حازرەی بەشەر بە ئیعتیبارێک پاشماوەی سەلەفە و یاخود هەر عەینی سەلەفە فەقەت لە شکلێکی تردا تەزاهوری کردوە، سورەتی مادیە خاریج بکرێت، لە خسوس سەجیە، ئەخلاق، زەکا، زیهنیەت و حەتا ئەسلیەتی دین و زمان، تەرزی تەلەبوس و میعمارییەوە

کوردەواری حازر هەر عەینی ئەو کوردەن کە 3 هەزار ساڵ لەمەوپێش ژیاون. بێ شوبهە ئینقیلابات، ئیحتیلالی ئەم وڵاتە لە تەرەف غەیرەوە، تەحەولی شکل، دین، زمان تەئسیرێکی موهیمی بوە بە سەر ئەم خەواسەدا، فەقەت لە گەڵ ئەوەش دا ئەسلیەتی خۆیان محافەزە کردوە و ئەیکەن. ئەم نەزەریەیە تەنها مەخسوسی ئێمە نیە، بۆ هەمو قەومێ قابیلی تەتبیقە.

"کەشفی حادیسات و ئەحوالی مازی جگە لە قیمەتی تاریخیەی، ئەهمیەتێکی حەیاتیشی هەیە بۆ تەبەقەی حازرە. بە سوئیی تالیع و بەدبەختیەوە تاریخی رابوردوی کوردان مودەتێکی مەدید و حەتا حالی حازریش مەجهول ماوەتەوە. هیچ جێگەی شوبهە نیە کە کوردستان هەروەک خاریجەن ساحیبی لەتافەتێکی فەوقەلعادەیە لە داخلیش دا ئەنواعی ئاساری تاریخی بە قیمەتی تیادا مەحفوز بو. کەشفی ئەم ئاسارە و بۆ تەنویری رابوردوی تاریکی کوردان لە مارتی 926 دا پرۆفیسۆر سپایسەر موتەخەسیسی ئاساری عەتیقەی دارەلفنونی پێنسلڤانیا ی موتەحیدەی ئامریقا هاتە ئەم مەنتیقەیە و ئەلحەق خدمەتێکی کرد کە هەمو کورد ئەبێ مەمنونی بێ.

"موشار ئیلەیهی هەر لە بازیانەوە هەتا هەڵەبجە هەرچی (گردی) دەستکردی تاریخی هەیە هەموی کەشف کرد، عەلاوەتەن ئەو مەختوتاتەی لە کیتابەکانی نەینەوادا لەم خسوسەوە نوسراوە هەموی تەدقیق کرد، لە پاش ئەم تەتەبوعە علمیە لەم چەندانەدا ئەسەرێکی زۆر قیمەتداری لە خسوس موحارەبەی بەینی (ئاسورناسرپال و زاموا) وە نەشر کردوە کە بەر وەجهی ئاتی تەلخیس کرا: ..."

لە ژ 184 و 185 و 186 دا لە ژێر سەرناوی (هاواری کوردان) دا تەرجومەی وتارێکی لە سەر نەریت و رەوشت و خوی کورد بڵاو کردۆتەوە. بەم پێشەکی‌یە دەستی پێ کردوە:

"بەیاناتێکی دوقتۆر ستاوت، مودیری مەکتەبەکانی ئامریقایە لە بەغداد کە پار لە ئاغستۆس دا  لە گەڵ میسز ستاوت دا بۆ سیاحەت و تەماشاکردنی وەزعیەتی کوردستان تەشریفیان هێنا بوە سلێمانی.

"ئەم مەقالەیە لە مەجموعەیەکی ئامریقادا نەشر کراوە و لە بەر ئەوەی سەراپا بەحسی ئەخلاق و جوبیلیەتی کوردەکان ئەکات ویستمان بە تەرجومە کراوی نەشری بکەین."

لە ژ 22 ی تەموزی 1929 دا لە ژێر ناوی (ئێمە ئەبەدەن ئەم چاکەیەی میستەر ستاوت مان لە بیر ناچێتەوە) لە پەراوێزی ئەم وتارەدا هەندێ لێدوانی خۆی بڵاو کردۆتەوە و، بە سپاس و چاکەوە باسی نوسەرەکەی ئەکا.

لە ژ 246 دا ع. و. نوری (یەکەم دەوڵەتی کورد لە عیراقا) ی لە گۆڤارێکی عەرەبیەوە کردوە بە کوردی و بەم لێدوانەی خۆیەوە بڵاوی کردۆتەوە:

".. لە ژمارەی چوارەمی مەجەللەی ئەقلامی (عەلی زەریفول ئەعزەمی) کە لە بەغداد دەرئەچێ ئەمە نوسرا بو بۆ روسوری کوردەکان لە بەر دەمی تەئریخ دا و بەعزێ بێگانەی نەفام کردم بە کوردی..."

بە دوای ئەم دا بە ئیمزای (کوردی) لە ژ 249 و 250 و 251 دا لە ژێر سەرناوی (یەکەم دەوڵەتی کوردی) دا چۆتە قوڵایی مێژوی کوردەوە.

# 6. بڵاوکراوە کوردیەکان

## 6. 1. رۆژنامە و گۆڤار

ژیان لە چاو رۆژنامە و گۆڤارە کوردیەکانی هاوزەمانی خۆیدا، لە هـەمویان تەمـەن درێژتـر بـوە و لـە هەمو یشیان رێکـوپێکتر لـە کـاتی خـۆیدا دەرچـوە. هـەواڵی دەرچـون و بڵاوبونـەوەی رۆژنامـە و گۆڤـارە کوردیەکانی، بە خۆشی و پشتیوانیەوە بڵاو کردۆتەوە:

"بانگی کوردستان

"صاحیبی ئیمتیازی بـانگی کوردسـتان سـەعادەتمەئاب جـەنابی مسـتەفا پاشـا هـەر بـەو نـاوەوە بـۆ دەرهێنانی غەزەتەیەکی سیاسی روخصەتی ئیستیحصال کردوە. ئەم رەفیقە تازە و خۆشەویستەمان تەبریک و رەواجی تەمەنا ئەکەین." (ژیان، ژ 4، 11 ی شوباتی 926).

"دیاریی کوردستان

"نوسخەی شانزدەمینی مەجەلەی دیاریی کوردستان هاتوە، پڕ لە مەقالات و خەبـەراتی بـە ئەهمیـەت و بە کەڵکە. مەقصەدی خزمەتکردنی وەتەن و مەنافیعی میلەتی کوردە. بە خوێندنەوە و ئیشتیراکی ئەم مەجموعە بە قیمەتە تەوصیەی قارئینی کیرام ئەکەین." (ژیان، ژ 21، 17 ی حوزەیرانی 926).

"زاری کرمانجی

"ئەوەل نوسخەی مەجموعەی زاری کرمانجی کە لە تەرەف صاحیبی ئیمتیاز و مدیری مەسئولی جەنابی سەید حسێن ئەفەندی موکریانی‌یەوە لە رەواندز دەر ئەهێنرێ بە ئیدارەخانەمان گەیشـت. جـدەن مەسـرور و خۆشحاڵ بوین کە مەجموعەیەکی تری وا بە قیمەت بە کوردی ببینین. ئەمە هیمەت و غیرەتێکی زۆر گەورەیـە و نیشانەی سەعادەت و تەرەقیی قەومی نەجیبی کوردە. خصوصەن هێنانـە وجـودی مەتبعەیـەک لـە رەوانـدز مەحصولی حسێکی بەرز و فەعالیـەتێکی زۆر گەورەیـە. بـە دڵ و بـە گیـان تەقـدیری ئـەم هیمەتـە و نەلـەبی موەفەقیەت و رەواجی ئەم رەفیقە بە قیمەتەمان ئەکەین." (ژیان، ژ 22، 1 ی تەموزی 926).

"رۆژنامەی زاری کرمانجی کە بەینێک لەمەوپێشەوە لە بەر بەعزێ نوقصانیەت ئینتیشاری نەئـەکرد بـە واسیتەی موعاوەنەتی قیسمێک حەمیەتمەندانەوە دەستی کردۆتەوە بـە ئینتیشـار تەمـەنای دەوامـی ئەکـەین." (ژیان، ژ 139، 22 ی تشرینی دوەمی 1928).

"داخلی:

"مدیر و موحەڕیری مەجەلەی زاری کرمانجی موحتەرەم سەید حسێن حوزنی ئەفەنـدی بـۆ پێکهێنـانی ئیشوکاری مەجەلەکەی و بڵاوکردنەوەی کتێبێک کە بەمزوانـە بـە نـاوی (ئـاوڕێکی پاشـەوە) تـەئلیفی کـردوە تەشریفی هێناوەتە سلێمانی عەرزی بە خێرهاتنی دەکەین." (ژیان، ژ 258، 28 ی ئاغستۆسی 1930).

کەرکوک

"ژیان برایەکی خۆشەویست و پشتیوانێکی بە قوەتی چنگ کەوت

"چەند رۆژێک لەمەوپێش بە سرورەوە بیستمان غەزەتەی کەرکوک کە رەفیقێکی خۆشەویستی ژیانە بە سەبەبی ئەوەوە لە کوردستان و لە ناو میلەتی کوردا ئینتیشـار ئـەکات بـۆ ئـەوەی ببـێ بـە ئاوێنـەی حـاڵ و تەرجومانی حەقیقەتی میلەتەکە ئیتر لەمەودوا قیسمێکی زۆری بە کوردی ئەنوسـرێ و ئینتیشـار ئـەکات. ئـەم

خەبەرە بە جدی سرور و خۆشیەکی تـەواوی خسـتە دڵـی میلەتەکەمانـەوە و هـەمو کوردێـک بـە پەرۆشـەوە چاوەڕوانی ڕاستی ئەم خەبەرە خۆشە و بە عەجەلە ئینتیـزاری چاوپێکـەوتنی ئـەو غەزەتـە کوردیـەی ئـەکرد. شوکور دوێنێ لە ناکاودا خەبەرەکە تەحەقوقی کرد و غەزەتەکە کە دو صەحیفەی بە کـوردی نوسـرا بـو هاتـە سلێمانی و بە داخل بونی حەیاتێکی تـازەی خسـتە وجـودی میلەتەکەمانـەوە و بـەم سـەبەبەوە (ژیـان) یـش برایەکی عەزیز و پشتیوانێکی بە قوەتی بۆ پەیدا بو.

"خوێندەوارەکانمان تاقم تـاقم بـۆ چاوپێکـەوتن و خوێندنـەوەی ئـەم غەزەتـە بـە قیمەتـە موحتەرەمـە شەتابیان ئەکرد و حەقیقەتەن ئەم مەسئەلەیە ئەمەندە خۆش بو کە لە موقابیلدا ناتوانین بە تـەواوی دەرەجـەی سروری میلەتەکەمان بەیان و تەعریف بکەین چونکە ئەم دو لیوایـە کـە دراوسـێی یـەکترین و ئەهالیـیەکـەی هاوخوێن، هەم جنس، هاوزبان و هەمو غایەیەکیان یەکە بە سەبەبی ئەوەوە غەزەتی کەرکوک هـەتا ئێسـتا بـە لیسانی محەلی و مادەرزادی خۆی ئینتیشاری نەئەکرد، لە هاواری یی‌کتری نەئەگەیشتن و بە فریـادی یـەکتری نەئەکەوتن بەڵام وا شوکور بە سەبەبی لوتفی حکومەت و مەئمورینە ئیداریە بە قیمەتەکانمانەوە ئـەم مانیعەیـە هەڵ گیرا و ئەم پەردەیەی بە سەرمانا راکێشرا بو لابرا و لە یەکتری ئاشکرا و مەعلوم بوین.

"بەرامبەر بەم حەرەکەتە مەعقولە، ئەم مژدە خۆشە و ئەم لوتفە گورەیە، عەلەنەن بە ناوی میلەتەکەمانـەوە تەشەکوری حکومەتی موشفیقە و حەقپەرستمان ئەکەین. ئومێد ئەکـەین ئیتـر ئـەم 3 بـرا عـەزیزە کـە: زاری کرمانجی، کەرکوک و ژیانە، دەست بدەن دەست و پشتیوانی یەکتری بن و بە هەمو قوەتیانەوە بۆ تـەرەقی و تەعالی موڵک و میلەتەکە هەوڵ بدەن و تێ کۆشن." (ژیان، ژ 238، 8 ی مایسی 1930)

"غەزەتەی کوردیی کەرکوک

"دیسانەوە بە خۆشیەوە خوێندمانەوە غەزەتەی کـەرکوک کـە هـەتا ئێسـتا دو صـەحیفەی بـە کـوردی دەرئەچو قەرار دراوە هەمو رۆژێکی دوشەمە دەرچێ و چوار سەحیفەی بـە کـوردی بـێ. بەرامبـەر بـەم مـژدە خۆشە میلەتەکەمان پێخۆشحاڵ بو، ئومێد ئەکەین ئەم برا خۆشەویستەمان هـەتا سـەر بـە موەفـەقی خدمـەتی وەتەن و میلەتەکەمان بکات." (ژیان، ژ 240، 22 ی مایسی 1930)

هاوار

"دیاری دیار بۆ کۆواری هاوار
هاواری کوردان لە شامەوە هات
هەواریان بەرز بێ دور بن لە نەهات
شام سەحەری دێ، سوری سوردارە
تا لە شەودا بین بەشمان هاوارە" (ژیان، ژ 330، 14 تەموزی 1932).

**6. 2. کتێب**

**6. 2. 1. کتێبی مەکتەب**

"دەنگوباس

"مژدە!.. لە سەمای مەعاریف دا ئەستێرەیەکی قیمەتدار

"ئەلفبایەکی کوردی کە موافیقی ئوسولی تەدریس و لە سەر تەرزی تازە لە تەرەف ئەحمەد ئەفەندی عەزیز ئاغاوە تەرتیب و تەئلیف کرا بو و مودەتێ لەمەوپێش لە تەرەف ئەنجومەنی مەعاریفی ئێرەوە لە پاش لێ ورد بونەوە بە باش زانرا و، بە واسیتەی لوتفی عالی‌ی موتەسەریفی مەعاریفپەروەر و موفەتیشی ئیداری عالی قەدرەوە بۆ چاپ نێررا بوە بەغدا، ئەمجارە لە تەرەف وەزارەتی جەلیلەی مەعاریفیشەوە تەسدیق و تەبع فەرموراوە و، لە مەداریسی کوردیەدا ئەمر بە تەدریسی کراوە.

"ئەمە ئەوەل ئەسەرێکی قیمەتداری کوردیە کە ئەولادی کورد ئەیگرێتە باوەش. ئومێد هەیە بە واسیتەی سهولاتێک کە لەم ئەسەرە قیمەتدارەدا پیشان دراوە ئەولادی کورد بە بێ ئەرک و ئەزیەت لە زەرفی مودەتێکی زۆر کەم دا فێری خوێندن و نوسین بن. بە هیواین ئەم پۆستەیە نوسخە چاپکراوەکانی بێتە سلێمانی. فرسەتە وەریگرن و ئیستیفادەی منداڵتانی پێ تەئمین بکەن. (سەد شوکر سمایلنامە و بیا داود نەما...)

"ژیان بەرامبەر بەم هیمەتە و لوتفە گەورەیە خۆی بە مەدیونی شوکران ئەزانێ." (ژیان، ژ 49، 6 ی کانونی سانی 1927).

لە کۆتایی بیستەکان و سەرەتای سییەکانی سەدەی بیستەم دا، هەندێ کتێبی خوێندنگە سەرەتاییەکان کراون بە کوردی. وەکو هەنگاوی یەکەم دیارە کەموکوڕی زۆریان تێدا بوە.

ع. **عەزیز** کە خۆی مامۆستای خوێندنگەی سەرەتایی و یەکێ بوە لەوانەی بەشداری تەرجومەی کتێبەکانی کردوە، وتارێکی بە چەند ئەڵقەیەک لە ژێر ناوی (مەتبوعاتمان) دا بڵاو کردۆتەوە، نوسیوێتی:

"دەرەجەی عیلم و ئیدراکی میلەتێک و نەوعی پێشکەوتنیان لە مەتبوعاتیان دەرئەکەوێ چونکە میلەتێکی دواکەوتو کە وریا بوەوە پێش هەمو شتێک هەوڵ ئەدا بۆ تەرەقی مەعاریف، کە بناغەی مەعاریفیش مەتبوعاتە وە یا بناغەی مەتبوعات مەعاریفە، لە دواییدا ئیقتیساد و، لە پێش هەمویان دا ئینجا عەمارەت و سیاسەت و سائیرە، چونکە میلەتێکی جاهیل لە روی نەزانینەوە گەلێ شت بە چاک ئەزانێ و ئەیکا نەتیجە زەرەر و زایع بونی حقوقی خۆی ئینتاج ئەکا. بۆ پێشکەوتنی مەعاریفیش یەگانە رەهبەر مەتبوعاتە کە ئەمەش ئەنواعی هەیە، مەسەلەن غەزەتە تەرجومانی حسیاتی میلەتە، کتێب و ئەدەبیات ئاوێنەی کەمالیاتی ئەو میلەتەیە و، کوتوبی عیلمی، ئەمەش یا تەئلیف وە یا تەرجومە ئەکرێ لە لوغەتێکی ئەجنەبیەوە، کتێبی مەکتەبیش لە میانەی ئەمانەدا ئەژمێررێ.

"لە زەمانی حکومەتی ئەمەویە و عەباسیەدا کە قەومی عەرەب هەوڵی تەرەقی عیلم و مەعاریفیان دا لە زەمانی هارون ئەلرەشید و مەئمون دا لە زبانی هندی، یۆنانی و فارسی بە هەزاران کتێب تەرجومە کرا بەم جۆرە مەتبوعاتیان (نوسەر لە بە کار هێنانی وشەی مەتبوعات لێرەدا بە هەڵەدا چوە. لەو سەردەمەدا مەتبەعە نەبوە تا مەتبوعات هەبوبێ. کتێبەکان بە دەس نوسراونەتەوە. نم.) پێش خست و تەرەقی‌یان کرد. هەروا ژاپۆنیاییەکان، تورکەکان لە ئیبتیدای وریابونەوەیان دا ئەوەل ئیشیان پێش خستنی مەتبوعاتیان بو.

"قەومی کوردیش لەم قەرنی ئەخیرەدا کە وریا بونەوە فەرقی ئەم نوقسانیەتەیان کرد بۆ عەینی غایە لە ئەستەموڵ لە زەمانی حکومەتی عوسمانی مەجموعەی (رۆژی کورد و هەتاوی کورد) یان نەشر کرد و بەعزێ

کتێبیان لە چاپ دا و ئێستاش لەم زەمانی حکومەتی عیراقیەش دا هەمو نەوعە موساعەدەیەک کراوە بۆ دەرهێنانی غەزەتەی سیاسی و مەجموعەی عیلمی و کوتوبی مەدرەسی و ئەدەبی و بۆ تەدقیق و لە چاپدانی کتێبی مەکتەبی لە عالم و منەوەرانی کورد لوجنەیەک هەڵبژێرراوە. وە وەزارەتی مەعاریفی عیراق بۆ تەشویق کردنی موعەلیمانی کوردی بۆ تەرجومە کردنی کتێبی مەکتەبی بە هەمو مەکتەبەکانی کوردا تەعمیمێکی بڵاو کردەوە کە ئەمە نەوعەما فرسەتێکی بەخشی بە وانەی ئارەزوی خزمەتی مەعاریفیان هەیە." (ژیان، ژ 236، 24 ی نیسانی 1930).

ع. **عەزیز** لە بەشی دوەمی وتارەکەی دا نوسیوێتی:

"بەڵام مەعلومی خوێندەوارانی کیرامە کە شەخسێک لە عیلمێک نەزانێ وە یا لە لوغەتێک تێ نەگا ناتوانێ لە تەرجومەی ئەو عیلمەدا موەفەق بێ. هەروەکو وتمان لە سایەی تەشویقی مەعاریف و بە سەعی کۆمەڵی تەئلیف و تەرجومە لەم نزیکانەدا چەند کتێبێکی کوردی تەرجومە و لە چاپ درا. بەڵام مەعەلئەسەف لە ناو ئەم کتێبانەدا بەعزێکیان لە بەر نوقسانیەتی مەتبەعەیی وە یا عیلمی ئەتوانم بڵێم کە قابیلی ئیستیفادە نین بۆ قوتابیەکانمان. خسوسەن لەمساڵی تەدریسیەدا دو کتێبی کوردی لە چاپ درا. یەکێکیان هەندەسەی سنفی چوارەم و ئەوی تریان عیلمی ئەشیای صنفی شەشەمە. ئەم دو کتێبەم زۆر بە دیقەت خوێندەوە. هەندەسەکە تەقریبەن باشە و ئیستیفادەی لێ ئەکرێ بەڵام ئەوی تریان کە عیلمی ئەشیایە و بۆ سنفی شەشەم تەرتیب کراوە کە قوتابی ئەم صنفە داخلی ئیمتیحانی موسابەقە ئەبن ئەم کتێبە سەراپا غەڵەتەش کە بە دەستیانەوە ئەبێ مەعلومی خوێندەوارانە کە زیهنی تەلەبە تێک ئەدا و دەرەجەی نەجاحی مەکتەب لە ناو مەکتەبەکانی عیراق دا دوا ئەخات. ئینجا بۆ ئەمەی کە غەڵەتی تەسحیح کراوی مەزکور بە تەبعکراوی بە دەست قوتابیەکانمانەوە بێ ئارەزوم کرد لە ستونی غەزەتەی ژیان دەرجی بکەم و ئومێد ئەکەم کە ئەم حەرەکەتەم بۆ مەکتەب و منداڵەکانمان بە خزمەت عەد بکرێ و حەمل نەکرێتە سەر غەرەز وە یا شەخسیات. مەعلومە میلەتێک پێش ناکەوێ هەتا تەنقید نەکرێ و عەیبی خۆی تەلافی نەکا. بێجگە لەمەیش لە ترسی ئەمەی کە نەوەک لە لایەکی ترەوە دەرکی ئەم غەڵەتە بکرێ با خۆمان لە دەرکی غەڵەتی خۆمان دا تەقەدوم و لە پێش ئەوان دا تەسحیحی بکەین بەڵکو لەمەولا هەرکەسێ کە کتێبێکی تەرجومە کرد ئەسەرێکی وا ئینتیخاب بکا کە لە داخلی ئیختیساسی خۆیدا بێ." (ژیان، ژ 237، 28 ی نیسانی 1930).

لە چەند ژمارەیەکی تردا هەندێ لە هەڵە و چەوتیەکانی کتێبەکەی باس کردوە.

ع. **واحید**، وەرگێڕی کتێبەکە هاتۆتە جواب. ع. واحید هەمان (ع. و. نوری) یە کە یەکێ بوە لە نوسەرە باش و پێشکەوتنخوازەکانی کورد. گەلێ بەرهەمی پوخت و جوانی هەیە. ئەگەرچی وەڵامەکەی هەندێ تورەبونی پێوە دیارە، بەڵام دەستی خستۆتە سەر هەندێ لە گیروگرفتەکانی رۆشنبیریی کوردی و لە ژێر سەردێڕی (کتێبەکانی مەکتەبەکانمان) دا نوسیوێتی:

"لە ژمارەی 237 ی رۆژنامەی ژیان دا بە ناوی ع. عەزیزەوە چەند کەلیمەیەکم دی لە بابەت کتێبی ئەشیای سینفی شەشەمەوە کە خۆم تەرجومەم کردوە و زۆر بە ناشیرینم زانی کە بێ جوابی بهێڵمەوە:

1. منیش بێ ئەمەی تەعەروزی شەخسیات بکەم بە کوردی ئەڵێم هەرچی کتێبێک کە لە مەکتەبەکانمانا هەیە و بە کوردی لە چاپ دراون هیچیان بۆ ئەوە ناشێن کە پێیان بڵێن (کتێبی مەکتەب) بۆ ئیسپات کردنی ئەم قسەیەم هەمو وەختێک ئامادەم.

2. بەڵام ئیحتیاج مەجبوری کردوین کە پێیان بڵێین کتێب. چونکە هێشتا گەنجێکمان پێ نەگەیشتوە کە لە ژێر دەستی مامۆستایەکی کوردا حیسی میللی وەرگرتبێ و بە زمانی کوردی فێری خوێندنێکی تەواو

بوبێت. لە بەر ئەوەی مەنتیقەکەیشمان بچوکە فرۆشتنی کتێبەکانمان زۆر کەمە و مەعاریفیش لە بەر ئەم سەبەبی ئەخیرە کەم یارییەی ئەو موعەلیمانە ئەدات کە کتێب تەرجومە ئەکەن.

3. ئەگەر تەرجومەی ئەم کتێبەم خراپ کرد بو بۆچی ئەمین زەکی بەگ قوبوڵی کرد. وە ئەگەر ئەو کوردی نازانێ بۆچی ئەو کتێبانەی تر کە تەدقیقی کردوە بە باش ئەدرێتە قەڵەم. خۆ من بە زۆر و پاڕانەوە کتێبەکەم پێ قبوڵ نەکرد.

من بڵێم چی ملیۆنێک کورد مەتبەعەیەکیان نیە کە چوار کتێبی لێ تەبع بکەن؟

4. ئەگەر ئەوەندە شارەزا بویت بۆچی کە پێم گوتی تەرجومەی بکە نەتکرد؟

ئیتر حورمەتی زۆر. ع. واحید" (ژیان، ژ 241، 29 ی مایسی 1930)

### 6. 2. 2. کتێبی گشتی

"تەئلیفات: پێشەوای ئاین

"کتێبێکی دینیە، بۆ تێگەیشتن لە واجبیات و شەریعەتی ئیسلامیە، لە سەر رەوشتی ئیمامی شافیعی بە ئوصولێکی رێکوپێک و کوردیەکی پەتی لە تەرەف خێوی زاری کرمانج جەنابی سەید حسێن ئەفەندی موکریانیەوە تەئلیف و تەبع کراوە.

"نوسخەیەکی ئەم ئەسەرە بە نرخە کە لە شەرت و شروتی ئیسلامێتی باس ئەکات و پێمان بەخشراوە بە ئیدارەخانەمان گەیشت. لامان وایە ئەگەر بێت و بۆ قوتابخانەکانی کورستان بخرێتە پرۆغرامەوە و لە دەرسی دین دا تەدریساتی لە سەر بکرێ ئیستیفادەی مەتلوب تەئمین ئەکات." (ژیان، ژ 58، 17 ی مارتی 927).

"رەوشت و خو

"مەعلوماتی مەدەنیە

"ئەسەرێکی بە کەڵکە، نوسخەیەکی ئەم ئەسەرە بە قیمەتە کە لە تەرەف لاوانی کوردەوە لە سەر پرۆغرامی مەعاریف بۆ مەکاتیبی کورد تەئلیف و تەرجومە کراوە بە ئیدارەخانەمان بەخشرا.

"محتەوەیاتی، بە ئوسلوب و تەرزی ئیفادەیەکی جوانەوە سەراپا رێی بونە ئینسانێکی حەقیقی نیشان ئەدات و، زۆر بە ئاسانی ئیستیفادەی قوتابیەکانمان تەئمین ئەکات. لە گەڵ ئەمەی کە نوسخەی دوەمی ئەم تەئلیفە لە ژێر چاپ دایە تەبعی گەلێ ئاساری تریشیان بە دەستەوەیە. لە رێی خزمەتی مەعاریف دا ئەم موەفەقیەتە گەورەیەی لاوەکانمان بە دڵ تەقدیر ئەکەین." (ژیان، ژ 72، 5 ی تەموزی 927).

"ئیعتیزار

"لە مێژ بو بە تەما بوین نەختێ بارسوکی قوتابیەکانی ئیبتیدائیمان بکەین. تەماشای پێڕەوی (منهج) ی وەزارەتی مەعاریفمان کرد..." (ژیان، ژ 73. 12 ی تەموزی 1927).

"خۆشی و ترشی

"نوسخەیەکی تر لە موئەلەفاتی صاحیبی زاری کرمانجی و وەتەنی حەقیقی جەنابی سەید حسێن ئەفەندی موکریانی کە لە ژێر عینوانی (خۆشی و ترشی) دا نەشری کردوە بە ئیدارەخانەمان گەیشت. حەقیقەتەن تەئلیفێکی بە قیمەت و کتێبێکی بە کەڵکە. تەوصیەی خۆشەویستانی ئاساری کوردی و کوردپەروەرەکانمانی ئەکەین." (ژیان، ژ 78، 18 ی ئاغستۆسی 927).

"مژدە بۆ کوردەکان: دەستوری کوردی

"لەم رۆژانەدا بە مەسروریەتەوە لە غەزەتەکانی بەغدادا خوێندمانەوە کە قەواعید – دەستور-ی کوردیەکەی جەنابی تۆفیق وەهبی بەگ کە چەند ساڵێکە لە گەڵ یا خەریکە جزمی ئەوەلی تەواو و تەبع کراوە.

"ئەم خەبەرە بۆ کوردەکان بەشارەتێکی خۆشە، چونکە هەمو ئەیزانین میلـەتی کـورد هەرچەنـد هەتاکو ئێستا زبانی مادەرزادی خۆی کە کوردیە محافەزەی کردوە و دائیمـەن گفتوگـۆی بـەم زبانـەی خۆی کردوە، بەڵام لە بەر ئەوەی مودەتێکی زۆر لە تەرەف تورکەکانەوە ئیستیلا کراین و لە سـەرێکی تریشەوە لە گەڵ ئێرانیەکانا دراوسێ و تێکەڵاو بوبوین موخابەراتی بەینی خۆمان بەعزەن بە فارسـی و بەعزەن بە تورکی بو وە معامەلاتی رەسمیی حکومەتی و تەدریساتی مەکاتیبیشمان بە مەجبوری بە تورکی بو.

"وەقتێک کە شەڕی گەورە دوایی هات و ئێمەیش نەجاتمان بو، بە سەبەبی ئەو فکری میلیەتەوە کە دائیمەن لە دەماغمانا نەقشی بەست بو وە بە سەبەبی موساعەدەی حکومەتی فەخیمەی ئینگلیز و عیراقـەوە وە بۆ ئەوەی زبانەکەیشمان زیندو بیێتـەوە موخابـەراتی خسوسـی بـەینی خۆمـان و معامـەلاتی رەسـمی حکومەت و تەدریساتی مەکاتیبمان کرا بە کوردی. بەڵام چونکە بۆ لیسانەکەمان دەستورێک رێک نەخرابو وە ئەو ئەلفبا و دەستورەیش کە لەم ساڵانەدا بۆمان رێک خرابـو ئیبتیـدائی بـون، زبانەکـەمان تـەکامولی نەکرد و بە مەجبوری مناڵەکانمان و کاتبەکانمان هەرکەس بۆ خۆی بە شێوەیەک ئەیخوێند و ئەینوسی بە نەوعێک کە ئەتوانین بڵێین هەتاکو ئێستا لە هەمو کوردستانا مەعلوم نـەبوە چ کاتبێـک موقتـەدیرە و کـێ چاکتر ئەنوسێ.

"تەبیعی هەمو عیلم و ئیقتیداری تۆفیق وەهبی بەگمان لا مەعلومە و ئەیزانین ئەم زاتە لە عیلم و عیرفانا مەوقیعێکی مومتازی هەیە.

"ئینجا بە تەبیعی زاتێکی وەها داهی لە نەتیجەی سەعی و کۆششی چەند سـاڵێکیا موەفـەق بـوبێ بـە دانان و تەرتیبی دەستورێکی کوردی موحەقەق ئەبێ ئەم دەستورە فەوقەلعادە بێ و ئیتر لە خوێندن و نوسینی کوردیـا موشـکیلاتێکی نەهێشـتبێ. وە غـەیری ئەمـەیش وەکـو بیسـتومانە ئـەم دەسـتورە لـە تـەرەف گـەلێ موتەخەسیسینی مەعاریف و پیاوە عالمەکانی عیراق و ئینگلیـزەوە تـەدقیق کـراوە و لـە تـەرەف هەمویانـەوە تەقدیر و بە باش زانراوە و حەتا ئەڵێن ئەگەر مناڵانی کورد لە سەر ئەم ئوسولە پێیان بخوێنرێ بـە سـەهلی بە 4 مانگ فێری خوێندن و نوسین ئەبێ.

"ئینجا لە بەر ئەوە پێویستە هەمو خوێندەوارێکی کورد یەکێک لـەم دەسـتورە بـە دەسـتیەوە بگـرێ و لەمەودوا لە نوسین و خوێندن دا تەتبیقاتی لە سەر بکات و تکایش لە ئێش بە دەستانی مـەعاریف ئەکـەین لـە ئەمساڵەوە ئەمر بدەن ئەو ئەلفبایەی کە هەمانە لە سەر ئەم دەستورە تیکرار تەبع بکرێتەوە و لە هەمو مەکاتیبە کوردیەکانا تەدریسات لە سەر ئەم ئوسولە بکرێ." (ژیان، ژ 197، 12 ی ئەیلولی 1929).

تۆفیق وەهبی لە ژیانی خۆیدا گەلێ پلە و پایـەی رەسـمیی لـە حکومـەتی عیـراق دا پـێ سـپێردراوە. ماوەیەک فەرماندەی زانستگەی جەنگی و چەند جارێک بوە بە وەزیر و بوە بە ئەندام لـە مەجلیسـی ئـەعیان دا، بەڵام ئەوەی ئەمی لە مێژوی کوردا بە زیندویەتی هێشتۆتەوە لێکۆڵینەوە زمانەوانی‌یەکانی بوە. بە تایبـەتی ئەم (دەستوری زمانی کوردی) یە، نەک وەزیفە حکومەتیەکانی.

"دیوانی کوردی

"لە تەرەف جەنابی کوردی مەریوانیەوە (دیوانی کوردی) تەبع کراوە نوسخەیەکمان موتالەعـە کـرد زۆر ئەشعاری شیرین و لەتیفی تیا موندەریجە. قەریبەن میقدارێکی موناسیب دێـت بـۆ دوکـانی وەسـتا ئەحمـەدی خاڵە عەلی خەیات بۆ فرۆشتن هەرکەسێ ئارەزوی تەرەقیاتی عونسوریە و شیرین مـەزاقی ئەشـعاری کوردیـە

هەریەکە نوسخەیەک بکرێ قیمەتی لە گەڵ مەوزوعات و موندەرەجاتی قابیلی تەوازون و تەناسوب نیە چونکە 4 ئانەیە. حەقیقەتەن ئەم دو زاتە زۆر خـادیمی مـەعاریفی کـوردین تـەبریکی حەمیـەتی وەتەنیـە و مەسـاعی نەشری ئاساری قەومیەیان ئەکەین." (ژیان، ژ 299، 9 ی تشرینی دوەمی 1931).

(لاوێکی کورد) مێژوەکەی ئەمین زەکی کە بە ناوی (خولاصـەییکی تـاریخی کـورد و کوردسـتان) ەوە بڵاو کراوەتەوە بەمجۆرە هەڵسەنگاندوە:

"تاریخی کورد

1. هەمو کوردێکی تێگەیشتو تـا ئێسـتا گرێیـەکی گـەورە کوتبـوە دڵیـەوە، ئـەو گرێیـەش نـەبونی تاریخێکی رێکوپێکی کورد بو. چونکی نەبونی ئەم تاریخە ئەبو بە سەبەبی نەزانینی رابوردوی ئەم میلەتـە و ئەم نەزانینە گەلێ زەربەی ئەدا لە مەعنەویاتی ئەم قەومە و ئەبو بە سەبەبی کوژاننەوەی ئاساری ئەجداد و ئەم ناتەواویە زۆر جار ئەفرادی ئەم قەومەی شەرمەزار و خەجاڵەت ئەکرد لـە موجادەلـەی ئیجتیمـاعی‌دا کـە واقیـع ئەبو لە بەینی کوردێک و بێگانەیەک دا.

حەقیقەتەن عەیبێکی زل و بێ ئـەمان بـو، چـونکی زۆر ناشـیرینە بـۆ ئـەفرادی قـەومێک کـە نـەزانێ ئەجدادی چین و چی بون؟

وە حالەتی ئیجتیماعیە و سیاسیە و عیلمیە و سەناعی‌یەیان چۆن بوە و چۆن حاکمیەتیان کردوە؟

چۆن کەوتونە دەورەی زیللەت و سەرگەردانی و رەزالەتەوە و ئەو قەومە چ نەوعـە عەنعـەناتێکی بـوە و هەیە؟

2. بۆ نوسینی تاریخێکی مەوسوقی کورد وەک بیسـتومە بـەعزێ کـوردی بـە ویجـدان و خوێنگـەرم هەوڵیان داوە بەڵام زەمان بوە بە مانیعی سەعی‌یان و نەتیجەی رەنجیان بەر هەوا بـوە، وە یاکردویـەتی وەک بەعزێ موحەریرینی ئەقوامی شەرقی کۆن نەختێ لە رێ لای داوە.

3. زۆر شوکر لە ناو ئەو زەواتە موحتەرەمانەدا موەففەقیەت بۆ مەعالی ئەمین زەکی بەگ حاسڵ بـوە و نائیلی ئەم دەرەجەی شەرەفە بوە. چونکە لە پاش زەحمەتێکی زۆر و لـە 250 ئاسـاری جـوێ جـوێ کـە بـە ئینگلیزی و ئەڵمانی و فرانسزی و عەرەبی و تورکی و فارسی بو، ئەسەرێکی مودهیش و موکەمەلی بۆ میلەتی کورد هێنایە وجود و بە پێی مەعلوماتێ کە لەو ئاسارانەی لە سەرەوە عەرزمان کرد ئیسپاتی کرد و دۆزیـەوە کە کورد لە نەتەوەی قەومی (گوتی) ئاریە، کە تەقریبەن لە 28 ەمین عەسری پێش میلادا لەم جێگەیەدا حـاکم و حوکمڕان بوە و ساحیبی شەوکەت و شەخسیەتێکی بەرز بوە.

وا شوکر چاپی جلدی یەکەمینی بە دو جزم تەواو کرد و زۆر بە مونتەزەمی بڵاوی کردۆتەوە کە هـەتا ئێستا هیچ کتێبێکی کوردی وا جوان رێک نەخراوە.

4. بێجگە لەو مەعلوماتەی کە وەری گرتوە بە گەلێ حەقایقی سابیتە و مادی عولەمای ئەقوامی بێگانـەی بە سورەتێکی دانایانە و بە حیس و شعورێکی بەرزەوە رەد کردۆتەوە کە جدەن شایانی ئیفتیخار و سـرورە. چونکە گەلێ عولەما بۆ کەمکردنەوەی قەومی کورد و بۆ تەشویشی ئەسـل و فەسـلی کـورد گـەلێ خورافاتیـان داخلی ئاساری خۆیان کردوە. زۆر شوکر باوکی تاریخی کورد مەعالی ئەمین زەکی بەگ رەنجی بـە زایـە دان و حەقیقەتی زۆر چاک دەرخست.

5. چونکی تاریخ خالقی شعوری میللی و موەحیدی هەمو شعورێکی قەومیە ئەمینم بەم ئەسەرە نازدارە میلەتی کورد ئاورێکی باش و بە دیقەت ئەداتەوە بۆ مازی و تۆزێ عیبرەتگیر ئەبێ و بە ئیرادەیەکی مەتین و لە سەر خۆ ئیستیقبالێکی روناک بۆ خۆی تەئمین ئەکا.

"له پێش ئەمەدا واز بێنم له قسه کردن ئیمانم هەیه بە تێگەیشتوان زو ئـەم کتێبـه عـەزیزە دائـەنێن لـه کتێبخانەکانیان دا، وه موئەلیفی خۆشەویستی موحتەرەم جلدی دوەم به زویی له چـاپ ئـەدا چونکـه زۆر زۆر موحتاجی تەنویرین.

"ئیتر خوا دڵسۆزانی میلـەتی کـورد مەسـعود بکـا. لاوێکـی کـورد" (ژیـان، ژ 302، 30 ی تشـرینی دوەمی 1931).

ئەمین زەکی بەگ له ژیانی خۆیدا گەلێ پله و پایەی بەرزی له حکومەتی تورکیا و له حکومەتی عیـراق دا پێ سپێردراوه. له عیراق چەند جارێ بۆته مەبعوس و چەند جارێ بۆته وەزیر، بەڵام ئەوەی ئـەمین زەکـی بردۆته ریزی پیاوه نەمرەکانی مێژوی کوردەوه ئەم پله و پایه رەسمی‌یانه نەبوه، بەڵکو نوسینی ئەم مێـژوه و کتێبه مێژوییەکانی تری بوه.

## 7. تەمسیل

ژیان له (هەواڵی ناوشار) دا به ناونیشانی (تەمسیل) نوسیوێتی:

"له تەرەف تەلەبەکانی مەکتەبەوه بۆ مەنفەعەتی کەشافه شەوی سێشەموی رابوردو له بینای مەکتـەب دا له ژێر عینوانی (نەتیجەی سەفاهەت) دا ریوایەیەک تەمسیل کرا. لـه گـەڵ ئەمـەی کـه ئەوەلـەمین جاریـان بـو حەقیقەتەن زۆر جوان تەمسیل کرا. مەزهەری تەقدیر و تەحسینی هـەمو لایـەک بـو. بـژی موحیبـانی عـیلم و ئەدەب." (ژیان، ژ 26، 29 ی تەموزی 1926).

رەنگه ئەوه یەکەم جار بوبێ که له سلێمانی‌دا شانۆنامەیەک پێشکەش بکرێ.

بۆ جاری دوەم شانۆنامەیەکی تر پێشکەش کراوه. لەم بارەیەوه ژیـان لـه ژێـر سـەردێری (لـه بینـای زانستی‌دا تەمسیل) ریپۆرتاجێکی له سەر نوسیوه، ئەڵێ:

"فەنی تەمسیل له هەمو جێگایەک دا رەغبەتێکی تەواو و ئیمتیازێکی تایبەتی دراوەتێ، حەتا ئەوانەی که لەم فەنە بە قیمەتەدا دەستدرێژی و ئیختیساسیان تیـا پەیـدا کـردوه بـه کـەمالی ئیحتیرامـەوه یـاد و تەقـدیر کراون، زیرا ئەم فەنە بە سەر ئەخلاقی میلەت، عاداتی مەملەکەت، ئەتوار و ئـەفکاری ئینسـان دا، تەئیسـیرێکی باش ئیجرا ئەکات.

"له لایەکەوه بینا بەم فکر و مەقصەدە و لـه لایـەکی تـرەوه لـه رێی تـەئمینی مەنفەعـەتی مـەعاریف و مەکاتیبی سلێمانی‌دا، شەوی پێنجشەمە که تەصادوفی 28/27 ی تەموزی ئەکرد، له بینای جەمعیەتی زانستی‌دا تەمسیلێکی تاریخی و ئەخلاقی له تەرەف هەیئەتی تەعلیمیەی مەکتەبی ئـەوەل و قوتابیـەکانی بەغدامانـەوه لـه ژێر شەرائیت و پرۆغرامێک که له تەرەفی هەیئەتی تەمسیلەوه تەرتیب کرابو، ئیجرا کرا. ئەم تەمسیله چونکـه له رێی خدمەتی مـەعاریف دا بـو، ئەشـراف و ریجـالی مەملەکـەت و هـەمو موحیبـان و تەرەفـدارانی عـیلم و مەعاریف، به کەمالی شەوق و شەتارەتەوه ئیجابەتیان کردبو و گردبوبونەوه.

"ئەسلی تەمسیلەکە به 5 پەردە زوڵم و ئیستیبدادی بێ ئەندازەی قەیسـەری رۆمـی مەشـهور ئیمپراتـۆر نیرونی تەصویر و له ژێر زوڵم و ئیستیبدادی ئەودا به واسیتەی سیناتۆر ومیلەتپەروەرانی رۆماوه نەجاتدانی رۆماییەکانی تەمسیل ئەکرد.

"له پەردەی ئەوەل دا، موفەصـەلەن بـۆ رزگـارکردنی میلـەت قـەراری مەجلیسـی سـینات و، سـەتوەت و حیشمەتی ئیمپراتۆر نیرون نیشان درا.

"له پەردەی دوەم دا، معامەلاتی غەدارانه و مەزاڵیمی جەبارانەی ئیمپراتۆر نیرون تەمسیل کرا.

"لە پەردەی سێیەم دا، بەزم و کەیفی ئیمپراتۆر لە گەڵ مەحبوبەیەکی‌دا و بـە سـەراچونی ئیمپراتۆریچـە و، لەو ئەسنایەیش دا سوتانی شاری رۆما و گوێ نەدانی ئیمپراتۆر بەم فاجیعەیە بە تەرزێکی حەقیقی خرایـە بەر ئەنزاری تەماشاکەرانەوە.

"لە چوارەم پەردەدا، ئیختیلال و قیامی ئەهالی، ئیجتیماعی وەتەنیەکان لە گـەڵ تەشـویق و تـەرغیباتیان ئیرائە کرا و،

"بە پەردەی پێنجەم کە ئاخر پەردە بو، لە سەر ئەحواڵی رابوردوی تەئەسوفات و پەشیمانی ئیمپراتـۆر، وە لە بەر بێ عیلاجی و بێ چارەیی مانەوەیان، ئینتیحاری ئیمپراتۆر و ئیمپراتۆریچە بە حوزن و تەئسیرێکی گەورەوە تەصویر و تەمسیل کرا.

"ئەمانە عومەن زۆر جوان و بە بێ نوقسانیەت ئیجرا کرا. لاوەکانمان لە گەڵ ئەمەی لە فەنی تەمسـیل دا ئەوەل هەنگاوە ئەیهاون دیسان شایانی تەقدیر و تیزکارن.

"ئەم تەمسیلە بۆ ئەوانەی کە میقرۆبی ئیستیبداد و فکـری زولـم و تەحـەکومیان لـە کەللـەدایە، جدەن دەرسێکی ئەخلاقی و عیبرەتێکی تاریخی بو. تەمسیل بـە چەنـد درامێکـی موزحیـک و هـەزەلی خیتامی پێ هێنرا و بڵاوەی لێ کرا. لە رێی تەعالی و تەرەقی مەعاریف دا سەعی و کۆششی هەیئـەتی تەعلیمیە و لاوەکانمان تەقـدیر و، لـەم فەنـەدا دەسـتدرێژی‌یان تیزکـار ئەکـەین." (ژیـان، ژ 76، 2 ی ئاغستۆسی 1927).

## 8. پرسەی ئەدیبان

ژیان هەواڵی مردنی هەندێ کەسایەتی بڵاو کردۆتەوە کە زانینیـان بـۆ دنیـای ئـەدەب و رۆژنامـەوانی کوردی بایەخدارن، لەوانە:

شوکری فەزلی

"انا لله وانا...

لە غەزەتەکانی بەغدادەوە بە کەمالی تەئەسور و تەئەسوفەوە خەبەری وەفـاتی شـاعیر و ئـەدیبی بـەناو مەرحوم شوکری فەزلی‌مان خوێندەوە. بۆ عالەمی کوردایەتی جدەن زیاعێکی ئەلیم و گەورەیە. حەق تـەعالا بـە رەحمەتی خۆی عەفوی کات." (ژیان، ژ 21، 17 ی حوزەیرانی 1926)

شوکری فەزلی یەکێ لە ئەدیب و رۆژنامەوانە ناسراوەکانی عیراق بوە. بە تورکی و فارسـی و عـەرەبی وتاری بۆ رۆژنامەی جیاواز نوسیوە. چەند وتارێکی بە تورکی و عەرەبی لەسـەر مێـژوی کـورد نوسـیوە. لـە گەڵ شێخ رەزای تاڵەبانی شەرە شیعری زۆری هەیە. نوسەری سەرەکی (تێگەیشتنی راستی) بوە کە دەسەڵاتی ئینگلیزی لە بەغداد بە زمانی کوردی لە 1 ی 1 ی 1918 دا دەری کردوە.

سلێمان نەزیف

"سلێمان نەزیف ئەدیبی مەشهوری ئێستامبول کـە کـوڕی سـەعید پاشـای دیاربـەکری مەشـهور بـو لـە ئێستانبول وەفاتی کردوە." (ژیان، ژ 52، 3 ی شوباتی 1927).

کەریم بەگی کەرکوکلی‌زادە

"زیاعێکی ئەلیم

"لە ئەشراف و خانەدانی سلێمانی و لە ریجالە حقوقیە مەشهورەکانمان، حاکمی مونفەریدی سلێمانی کەرکوکلی زادە عەبدولکەریم بەگ بە سەبەبی ئەو نەخۆشیەوە کە توشی بوبو دوێنێ نیوەڕۆ ئەمری خوای بە جێ هێنا.

"ئوفولی ناگەهانی ئەم زاتە قیمەتدارە تەئسیرێکی تەواوی کردە هەمو کەسێکەوە و هەمو لایەکی خستە حوزن و تەئەسورەوە.

"سەعادەتی موتەسەڕیفی ئەکرەم و روئەسای دەوائیر و عولەما و ئەشرافی شار و سائیری تەبەقاتی ئەهالی بۆ تەجهیز و تەدفینی حازری سەر جەنازەکەی بون و هەتا سەرقەبران تەشیعیان فەرمو.

"بە ناوی عمومەوە بەیانی تەعزیەت لە عائیلەی کەدەردیدەی ئەکەین و تەمەنا ئەکەین خوای تەبارەک و تەعالا تەسەلی‌یان پێ ببەخشێ و مەرحومیش غەریقی رەحمەت بکات." (ژیان، ژ 199، 19 ی ئەیلولی 1929).

کەریم بەگ، هەمان (عەبدولکەریم سلێمانی) یە کە ساڵی 1913 لە ئەستەموڵ گۆڤاری (ڕۆژی کورد) ی دەرکردبو.

## 9. هەواڵی ڕۆژنامە عەرەبی‌یەکانی عیراق و بێگانە

"غەزەتەی وطن

سکرتێری حیزبی وطنی عیراق تەلەبی لە وەزارەتی داخلیە کردوە کە مەئزونیەتی بدەنێ غەزەتەیەک بە ناوی (وطن) ەوە و بە ناوی حیزبەکەیەوە دەربێنێ." (ژ 139).

"غەزەتەی التقدم

لە بەغدادەوە لە تەرەف حیزبی تەقەدومی عیراقەوە لە تەحتی ئیدارەی سلێمان شێخ داود غەزەتەیەک بە ناوی (التقدم) ەوە ئینتیشاری کردوە." (ژ 139).

"صوت العراق

بەغداد: مەعالی موزاحیم بەگ ئەل پاچەچی تەلەبی لە وەزارەتی داخلیە کردوە کە مەئزونیەتی بدەنێ غەزەتەیەکی سیاسی بە ناوی (صوت العراق) ەوە دەر بهێنێ." (ژ 148).

"النجم

بەغداد: لە ئیدارەی پاتریارکیەی کلدانی‌دا لە موسڵ مەجەلەیەک ئینتیشار ئەکات بە ناوی (النجم) ەوە." (ژ 148).

"غەزەتەی (فتي العراق) لە موسڵ دا و عەزەتەی (الحارس) لە بەغدادا

"بەغداد: مودیریەتی مەتبوعات مەئزونیەتی داوە بە مەتی سرسم ئەفەندی کە لە موسڵ دا غەزەتەیەکی سیاسی یەومی بە ناوی (فتي العراق) ەوە دەربهێنێ.

"مەئزونیەتیشی داوە بە فائیق ئەفەندی کە لە بەغداد بە ناوی (الحارس) ەوە غەزەتەیەکی ئەدەبی دەربهێنێ." (ژ 207).

"جەمعیەتی هیدایەتی ئیسلامی
"بەغداد: کۆمەڵی هیدایەتی ئیسلامی لە بەغداد غەزەتەیەکی دەرهێناوە بە ناوی هدایتەوە و مەوزوعەکانی هەمو عیبارەتن لە مەسائیلی دینیە و ئەخلاقیەی ئیسلامیەت." (ژ 231).

سەردانی سلێمانی
"ساحیبی غەزەتەی الکرخ و سەحافی شەهیر جەنابی مەلا عەبود ئەفەندی ئەل کەرخی بۆ چاوپێکەوتنی لیواکەمان تەشریفی هێناوەتە سلێمانی. عەرزی بە خێرهاتنی ئەکەین." (ژ 84).

"مومەسیلی غەزەتەی (فتي العرب) محیّدین بەگ لە بەغدادەوە بۆ چاوپێکەوتنی لیواکەمان تەشریفی هێنا بوە ئێرە لە دوای 4 رۆژ عەودەتی فەرموەوە. خوای لە گەڵ بێ." (ژ 94).

"موعتەمیدی غەزەتەی کەرکوک
"بۆ ئەوەی بەدەلاتی غەزەتەکەیان کۆ بکاتەوە موعتەمیدێکی غەزەتەی (کەرکوک) رەفیقی خۆشەویستمان تەشریفی هێناوەتە سلێمانی. رجا لە مشتەریەکانی ئەکەین معاوەنەتی بفەرمون و بەدەلاتەکەی بە تەواوی تەسلیم بکەن." (ژ 184).

**داخستنی رۆژنامەی عیراقی**
"هەواڵی داخلی: رۆژنامەی نهضە و زمان لە تەرەف حکومەتەوە لە نەشر کردن مەنع کراوە." (ژ 88).

"غەزەتەی التقدم
بەغداد: لە بەر بەعزێ ئەسبابی سیاسیە غەزەتەی التقدم چەند رۆژێک دەرناچێ لە دوایدا لە سەر حسابی خۆی مودیری غەزەتەکە سەلمان ئەل شێخ داود دەست ئەکاتەوە بە ئینتیشاری." (ژ 174).

"غەزەتەی نهضە و وطن
بەغداد: لە سەر ئەوەی مەجلیسی وزەرای عیراق قەراری داوە غەزەتەی نهضە و وطن ئیتر ئینتیشار نەکات یاسین پاشا تەکلیفی لە ساحیبی غەزەتەی وطن کردوە بە ناوی (الشعب) ەوە و تەکلیفیش لە النهضە کراوە بە ناوی (صدى العراق) ەوە غەزەتەکانیان دەربێنن." (ژ 197).

"مەعروف ئەل رەصافی و غەزەتەی بلاد
"بەغداد: لەسەر ئەوەی مەعروف ئەفەندی ئەل رەصافی لە غەزەتەی البلادا مەقالەیەکی نوسیوە و گۆیا ئەڵێن مەقالەکە لە عەلەیهی پێغەمبەر بێ ئەدەبیەکی تیادا بوە وەکو لە مەجلیسی نیابیدا شکاتی لێ کرا و وەزیری داخلیە قەولی دا تەدقیقی مەسئەلەکە بکات.
"ئەڵێن کۆمەڵی شوبیانی موسلیمین یش لە مەحکەمەدا دەعوایان لە عەلەیهی ساحیبی مەقالەکە و ناشیرەکەی کردوە هێشتا محاکەمە نەتیجەی نەهاتوە بەڵام ئەڵێن حکومەت ئەمری داوە غەزەتەی بلاد 15 رۆژ ئینتیشار نەکات." (ژ 211).

لابردنی مەنع لەسەر جەریدەکانی تورکیا

"مودیریەتی مەتبوعات ئەوامیری لازمەی دا بە هەڵگرتنی مەمنوعیەت لە خسوس ئیـدخالی هـەمو نەوعـە غەزەتەی تورکیا بە عیراق." (ژ 38).

لابردنی مەنع لە سەر ڕۆژنامەی بلاغی میسری

"غەزەتەی بلاغ ی میسر سەربەست کراوە

"بەغداد غەزەتەی (بلاغ) ی میسری کە مەنع کرا بو بێتە بەغداد، ئەمجارە وەزارەتی داخلیە ئـەمری داوە کە سەربەست بێتە عیراق و هیچ مانعێک نیە لە هاتنیا." (ژ 207).

"مودیر و موحەریری غەزەتەی الزمان

بەغداد: لە موحەریرینی مەشهور و سـاحیب و موحـەریری غەزەتـەی الزمـان ئیبـراهیم ئەفەنـدی سـاڵح شوکر کە بەینێک لەمەوپێش چو بوە میسر، خەریکە بگەڕێتەوە سوریە و لـە شـاما هـەر بـە نـاوی الزمانـەوە غەزەتەکەی دەربهێنێ." (ژ 144).

"غەزەتەی وەفدی میصری

لەندەن: جەمعیەتی حیزبی وەتەنی میصر لە لەندەنا دەستیان کردوە بە دەرهێنانی غەزەتەیەک بە نـاوی وەفدی میسرییەوە." (ژ 146).

# ژیان و ئیعلانەکانی

## 1. ئیعلان و ژیان

یەکەم ئیعلان و دیعایەی ژیان بڵاوی کردۆتەوە بانگەشەیە بۆ خۆی:

"مەتبەعەی ژیان

"مەتبەعەی ژیان موستەعید و حازرە بۆ تەبعی هەمو نەوعە جەداویل و ئەوراقی حکومەتی و هەمو نەوعە ئەوراقی تیجاری و سری کاغەز و زەرف. کارتی ویزیت و سائیرە لە سەر تەرزی تازە و، بە دیقەتی کامیلە، بە فیاتێکی هەرزان موراجەعەت بفەرمون پەشیمان نابنەوە.

بۆ ئەمە تەجرەبە دەلیلمانە!" (ژیان، ژ 1).

"قولکسیۆن

قۆلکسیۆنی غەزەتەی پێشکەوتن، بانگی کوردستان، رۆژی کوردستان، ئومێدی ئیستیقلال، ژیانەوە، ژیان و دیاری کوردستان دەفرۆشرێت هەرکەس تالبە موراجەعەت بە عەلی عیرفان ئەفەندی بکات." (ژ 93).

### 1. 1. سەرچاوەکانی

ئیعلانەکانی ناو ژیان بە زۆری حکومەتین. کەم وا بوە ئیعلانێکی ئەهلی تێدا بێ. ئەو داوودەزگایانەی ئیعلانیان لە ژیاندا بڵاو کردۆتەوە، داوودەزگا ناوچەییە- حکومەتیەکانی سلێمانی بون. ئیعلانەکان بە زۆری ناوچەیی بون، بە دەگمەن ئیعلانی تێدایە بۆ هەمو عیراق بێ.

کاک سدیق ساڵح ئیعلانی ژمارەکانی 1– 81 ی ژیانی بەمجۆرە ژماردوە:

"ئەو 194 لاپەڕە تەواوەی ئەم بەرگەی (ژیان) 48 لاپەڕەی بۆ ئاگاداری تەرخان بوە، لەوە 52 ئاگاداری موتەسەڕیفی سلێمانی و 46 دائیرەی تاپۆ و 24 بەلەدییە و 15 مەحکەمەی سوڵح و 9 مەحکەمەی شەرعی و 11 دائیرەی ئیجرا و 5 موحاسیبی لیوا و 5 گومرگ و 21 لایەنی تری حکومییە کە سەرجەم 30 ئاگادارییە و یەکی 1– 3 یان لێ هەیە. واتە ئاگاداریەکان 16% پانتایی ئەم ژمارانەیان داگیر کردووە. 2 لاپەڕەیش بۆ 20 پرۆپاگەندەی (دیوانی مەحوی) و (مەتبەعەی ژیان) دانراوە، کە هەر هی چاپخانەکە بوون و پارەیان لە سەر وەرنەگیراوە."

### 1. 2. بابەتەکانی

ئیعلانەکان دەربارەی بابەتی جیا جیا و شتی جۆراوجۆرن. لێکۆڵینەوەیان هەندێ لایەنی ئابوری، رۆشنبیری، سیاسی، کۆمەڵایەتی، تەندروستی، قانونی... شاری سلێمانی و حکومەتی عیراق رون ئەکاتەوە.

### 1. 3. زمانەکەی

دارشتنی ئیعلانەکان بە زمانێکە ژمارەیەکی زۆر وشەی عەرەبی ناقۆلا و نائاشنای تێدا بە کار هێنراوە. جۆری دارشتن و جۆری بلاوکردنەوە و جۆری نوسینەوەی، بە هیچ جۆرێ شتێکی ئەوتۆی تێدا نیە سەرنجی خوێنەر رابکێشێ و ئارەزوی خوێندنەوەی لە لا دروست بکا.
هەندێ لە ئیعلانەکان تەرجومەن لە عەرەبیەوە. هەندێکی تریشیان هەر بە شێوە رەسمیی زمانی قانونیی حکومەتی عیراق دارێژراون.

### 1. 4. نرخی بلاوکردنەوەی

بۆ هەمو رۆژنامەیەک ئیعلان گرنگیەکی گەورەی هەیە:

**یەکەم،**

سەرچاوەیەکی سەرەکی دەرامەتی رۆژنامەکەیە. کەم وا هەیە رۆژنامە بە تەنیا بە پارەی فرۆشتنی خۆی، مەسرەفی خۆی دەر بهێنێ و بەرێوە بچێ.

**دوەم،**

ئیعلان خوێندەواری نوێ بۆ رۆژنامەکە پەیدا ئەکا. وا ئەکا ئەوانەی کەڵک لە ئیعلانەکە وەرئەگرن بۆ پەیدا کردن و خوێندنەوەی رۆژنامەکە بە دویدا بگەرێن.
بۆ ژیان یش هەروا بوە.

لە سەردەمی بەکارهێنانی روپیەدا نرخی (ئابونە بە 3 مانگ روپیەونیوێک) و، (نوسخەی بە ئانەیەک) و، ئیعلان (بە دێرێک 6 ئانە) بوە.
لە سەردەمی بەکارهێنانی دیناردا نرخی (کرێار بە شەش مانگ 225 فلس) و (یەکی بە ئانەیەک) و، ئیعلان (لە دێرێکەوە هەتا شەش مەقتوعەن 225 و لە شەش زیاتر جگە لە 225 فلسەکە بۆ دێرە زیادەکانیش دێری 28 فلس) بوە.
بۆ زانینی هێزی کرینی روپیە لە بازاری ئەو زەمانەدا، ئەکرێ کەڵک لە 2 ئیعلانی ئەو کاتە وەر بگیرێ:
یەکەم، کرێی رۆژانەی کرێکار
لەو ماوەیەدا پرۆژەی رێگای هەولێر– حاجی هۆمەران کە ئێستا بە جادەی هامیلتۆن ناوی دەرکردوە، بە دەستەوە بوە. بە هۆی سەختی و شاخاوی بونی ناوچەکەوە، بە تایبەتی لەبەر ئەوەی هێشتا ماکینەی زۆر پەیدا نەبوە، کارێکی گەورە و گران بوە، پێویستی بە ژمارەیەکی زۆر کرێکار بوە. ئەم ئیعلانەی بۆ کراوە:
"ئیعلانات: 3 هەزار عەمەلە بۆ ئیشکردن لە رێگای رەواندز بە 1 روپیە و 4 ئانە یەومیە پێویستە. موستەشاری داخلیە" (118)
دوەم، موچەی مانگانەی فەرمانبەر

"ئـیعلان: بـۆ خەسـتەخانەی مـوڵکی سـلێمانی مـانگی بـە 40 روپیـە موزەمیـدێک پێویسـتە. ئـەبێ خوێندەوار بێ و کەمێکیش ئینگلیزی شارەزا بێ و عومری لە 30 ساڵ زیاتر نەبێ. ئـەوی تالبـە موراجەعـەت بە خەستەخانە بکات." (97)

کـرێی رۆژانــەی کرێکارێـک وەکـو لــە ئیعلانەکـەدا نوسـراوە 1 روپیـە و 4 ئانــە بـوە، موچـەی فەرمانبەرەکەیش 40 روپیە بوە، ئەمیش ئەگەر مانگانەکەی بە سەر رۆژانەدا دابەش بکرێ، چەردەی رۆژانـەی وەکو کرێی کرێکارەکە دەرئەچێ.

## 2. رێکخستنی شاری سلێمانی

هەڵبژاردنی شارەوانی

"لە ریاسەتی بەلەدیەوە ئیعلان

"بۆ خسوسی ئینتیخابی 3 ئەعزا کە بۆ مەجلیسی بەلەدیـە ئینتیخـاب ئـەکرێن قائیمـەی ئەسـامی ئـەو کەسانەی کە ساڵی لە 50 غرۆشەوە هەتا 100 غرۆش زەریبەتول ئەملاک ئەدەن و حەقی تەسویتیان هەیە بۆ ئینتیخابی ئەعزای بەلەدیە، لە گەڵ قائیمەی ئەسامی ئەو کەسانە کـە سـاڵی 100 غـرۆش و لـە 100 غـرۆش زیاتر زەریبەتول ئەملاک ئەدەن و حەقیان هەیە بۆ ئەعزایەتی بەلەدیە ئینتیخاب بکرێن، لە ئیعتیبـاری رۆژی 1 ی ئەیلولی 927 ەوە لە دەرگای مزگەوتی گەورە و، مزگەوتی شـێخ محەمـەدی ئالـەکی و، خانـەقای مـەولانا و، دەرگای قەیسەری نەقیب، تەعلیق و ئیلساق ئەکرێ. هەر کەس لەو قائیمانەدا ئیسمی داخل نیە و لازمـە داخـل بێ لە تاریخی تەعلیقی ئەم قائیمانەوە هەتا 8 رۆژ لازمە ئیعتیراز و موراجەعەت بە لیجنەی ئینتیخاب بکا. لـە پاش خیتامی ئەم مودەتە هەر ئیعتیرازێ بکرێ قبوڵ ناکرێ.

دیسان بۆ ئینتیخابات و رەئی دان لە تاریخی 21 ی ئەیلولی 927 ەوە هەتا 30 ی ئـەیلولی 927 دە رۆژ مودەت تەعین کراوە، ئەو کەسانە کە ئیسمیان لەو قائیمانەدا هەیە لازمە لـە زەرفـی ئـەم 10 رۆژەدا بێنـە حزوری لیجنەی ئینتیخاب و موافیقی ئوسول پسولەی رەئی خۆیان بنوسن. لە پاش تەواوبونی ئەم 10 رۆژە ئیتر رەئی دان قبوڵ ناکرێ. بە موجیبی مادەی 29 ی قانونی ئینتیخاباتی بەلەدیە و قەراری لیجنەی ئینتیخاب بۆ ئاگاداری عموم ئیعلان کرا." (ژ 79).

بەم ئیعلانەدا دەر ئەکەوێ:

**یەکەم،**

بۆ هەڵبژاردنی ئەندامانی ئەنجومەنی شارەوانی و بۆ خۆ ناوزەد کـردن بـۆ ئەنـدامێتی ئەنجومەنەکـە، هەمو دانیشتوانی شار لەو سەردەمەدا مـافی دەنگـدانیان نـەبوە. تـەنیا ئەوانـە مـافی دەنگـدانیان هـەبوە کـە موڵکیان هەبوە و زەریبەی ئەملاکیان داوە. ئەوانیش کراون بە دو پۆلەوە: یەکەم، ئەوانەی تـا 100 قرۆشـیان داوە مافی خۆهەڵبژاردنیان نەبوە، هەر مافی دەنگدانیان هەبوە بۆ کەسـانی تـر. دوەم، تـەنیا ئەوانـەی کـە لـە 100 قرۆش زیاتر زەریبەی ئەملاکیان داوە، هەم مافی دەنگدان بۆ هەڵبژاردنی ئەنـدامانی ئـەنجومـەن و هـەم مافی خۆپاڵاوتنیان هەبوە بۆ ئەندامەتی ئەنجومەن.

**دوەم،**

ئەوانەی خانو یا زەوییان نەبوە و زەریبەی ئەملاکیان نەداوە، مافی دەنگدانیان نەبوە.

ئەم مەرجەی بۆ هەڵبژاردنی ئەنجومەنی شارەوانی (مەجلیسی بەلەدیە) کاری پێ کراوە، بۆ هـەڵبژاردنی گشتی مەبعوسەکانی (مەجلیسی نواب) یش پێڕەوی کراوە. ئـەوەی نـەی توانیـوە لـە چەردەیـەکی دیـاریکراو زیاتر زەریبە بدا، مافی دەنگدان و خۆپاڵاوتنی نەبوە.

جادە و شیو

سلێمانی بیستەکانی سەدەی بیستەم، شارێکی پچوک بوە و پێکهاتوە لە چەند گەڕەکێ، لەوانە: مەڵکەندی، گۆیژە، کانی ئاسکان، سابونکەران، دەرگەزێن، سەرشەقام، چوارباخ، جولەکان. شارەکە کەوتۆتە دەشتایی داوێنی شاخی گۆیژە و، چەندین گرد و شیوی تێدا بوە. هەر لە سەرەتاوە کە دروست کراوە، بە ڕێکوپێکی دروست نەکراوە. شەقام و کۆڵانەکانی تەنگەبەر و نارێک بون بەڵام شارێکی پاک و خاوێن بوە، چونکە چەندین کارێزی ئاوی تێدا بوە کە بە گونج راکێشراوە بۆ مزگەوت و حەمام و ماڵەکان. ئاوەڕۆی ماڵەکانیش بە زێراب چۆتە ناو شیوەکانی ناوشارەوە.

جادەکانی ناو سلێمانی نارێک و شیوەکانیشی سەر بەرەڵا بون.

شارەوانی بۆ ڕێکخستنی ناوشار، بڕیاری داوە دەسکاری جادەی سابونکەران و جادەی کانی ئاسکان بکا و سەری شیوەکان داپۆشێ. هەردو جادە ئەوساش وەکو ئێستا دو جادەی سەرەکی بون، چونەتەوە ناو جەرگەی شارەوە. ئەم پرۆژانەی خستۆتە موناقەسەوە:

"ئیعلان

"شیوی بەر ماڵی عەزیز ئەفەندی و بەر دائیرەی حکومەت، بەلەدیە بە تاق دایان ئەپۆشێ هەرکەس تالیبی موناقەسە و تەعەهودی داپۆشینی ئەم شیوانە ئەکا موراجەعەت بە مەجلیسی بەلەدیە بکات. بۆ ئاگاداری ئیعلان کرا. ئیدارەی بەلەدیە" (ژ 33).

"ئیعلان لە ریاسەتی بەلەدیەوە

"ئەو شیوانەی ناوشار کە بەلەدیە دای ئەپۆشێ و جادەی سابونکەران کە ئەمساڵ گوشاد ئەکرێ بە حسابی مەتر و فوت ئەدرێ بە قۆنتەرات. بۆ موناقەسە لە 11 ی مایسی 27 ەوە هەتا 25 ی مایسی 927 مودەت دانراوە. هەرکەسێ تالیبی موناقەسەی ئەم جادە و شیوانەیە لە زەرفی ئەم مودەتەدا موراجەعەت بە مەجلیسی بەلەدیەی سلێمانی بکا. بۆ ئاگاداری ئیعلان کرا." (ژ 65).

"لە ریاسەتی بەلەدیەوە

لە نەتیجەی موناقەسەیەک کە ئیجرا کراوە دروستکردنی جادەی سابونکەران هەر مەترو مورەبەعی بە 3 روپیە و 8 ئانە لە عوهدەی تالیبایە هەرکەس لەمە کەمتر تالیبی تەنقیسە موراجەعەت بە مەجلیسی بەلەدیە بکا." (ژ 67).

"ئیعلان لە ریاسەتی بەلەدیەوە

28 ی مایسی 927

بۆ جادەی سابونکەران کە موجەدەدن گوشاد ئەکرێ ئەو ئەملاکانە کە لازمە و تەقەروری کردوە قەتع و ئیستیملاک بکرێ نەوع و جنس و ئیسمی ساحیب و ئەو میقدارەی کە لێیان قەتع ئەکرێ لە گەڵ بەدەلێ کە لە تەرەف هەیئەتی تەخمینیە و مەجلیسی بەلەدیەوە بۆیان تەقدیر کراوە لە ژێرەوە نیشان دراوە هەرکەسێ لە داخلی قانون دا ئیعتیرازێکی هەیە لە تاریخی ئیعلانەوە هەتا 9 رۆژ لازمە دەرمیانی بکا بۆ ئاگاداری ئیعلان کرا." (ژ 68).

"ئیعلان لە ریاسەتی بەلەدیەوە

دروستکردنی جادەی سابونکەران هەر مەترو مورەبەعی بە 3 روپیە و داپۆشینی شیوەکان هەر تولی مەترویەک بە 33 روپیە لە عوهدەی تالیبانایە هەرکەسێ لەمە کەمتر تالیبی تەنقیسە موراجەعەت بە مەجلیسی بەلەدیە بکا." (ژ 68).

ژ 74 و 75 و 82 بۆ تەوسیعی جادەی کانی ئاسکان ناوی خاوەنی ئـەو مـاڵ و دوکانانـەی ئـیعلان کردوە کە بەر ئەم فراوانکردنە کەوتون.

وەکو لەو ئیعلانانەدا دەرئەکـەوێ، ئەگـەرچی پارەیـەکی زۆر دراوە بەوانـەی خـانو یـا دوکانیـان بـەر جادەکە کەوتوە، بەڵام چاکردنی ئەم دو جادەیە بەو جۆرەی ئەنجامیان داوە، نە بـۆ کاربەدەسـتانی شـارەوانی ئەوسا و نە بۆ ئەو موهەندیسانەی نەخشەکەیان کێشاوە، جێگەی شانازییە، چونکە هەردو جادە بە تەسکی و نارێکی ماونەتەوە.

"لە نەتیجەی موناقەسەیەک کـە ئیجـرا کـراوە دروسـتکردنی 2 حـەوز لـە نـاو باغچـەی بەلەدیـەدا لـە گەڵ تەنزیمی باغچەکە بە 580 روپیە لە عوهدەی تالیبیا ماوەتەوە هەرکەسێ لەمە کەمتر تـالبی تەنقیسـە هـەتا 31 ی مایسی 927 موراجەعەت بە مەجلیسی بەلەدیە بکات." (ژ 68).

### ئاوڕشێنی جادەکان

جادەکانی بە زۆری خاکی بون. لە زستاندا بون بە قوڕ و چڵپاو و بە هـاوین تـەپوتۆزی زۆریـان لـێ هەستاوە. هاوینان بۆ ئەوەی هەم تەپوتۆزەکەی بنیشێتەوە و هەم فێنک بێ ئاوڕشێن کراوە:

"ئیعلانەن لە ریاسەتی بەلەدیەوە: بۆ ئاوڕشێن کردنی جادەکانی ناوشار لە داخلی شەرائیتی موعەیەنەدا موتەعەهیدی لازمە هەرکەس تالیبی موناقەسەیە موراجەعەت بە مەجلیسی بەلەدیە بکا بۆ ئاگاداری ئیعلان کرا."

"ئاوڕشێن کردنی جادەکانی ناوشار لە داخلی شەرائیتی موعەیەنەدا مانگی بە 150 روپیە لـە عوهـدەی تالیبیایە هەرکەس تالیبی تەنقیسە موراجەعەت بە مەجلیسی بەلەدیە بکا. بۆ ئاگاداری ئیعلان کرا." (ژ 115).

### روناککردنەوەی شەقامەکان

لە بەر ئەوەی هێشتا ماکینەی بەرهەمهێنانی کارەبـا لـە سـلێمانی نـەبوە، شـەوانە بـۆ روناککردنـەوەی شەقامەکان، چرای نەوتی داگیرسێنراوە.

"ئیعلان لە ریاسەتی بەلەدیەوە: لە نەتیجەی موناقەسەیک کە ئیجرا کراوە ئـەو نەوتـەی کـە بـە بەلەدیـە لازم ئەبێ هەر قاپی بە 2 ئانە و 6 پای لە عوهدەی تالیبیایە هەرکەسێ لەمە کەمتر تالبی تەنقیسە لـە ئـەمڕۆوە هەتا 4 ی حوزەیرانی 27 موراجەعەت بە مەجلیسی بەلەدیە بکات."

### فڕێدانی خاشاک

لەبەر ئەوەی ئۆتۆمۆبێل نەبوە بۆ فڕێدانی خۆڵ و خاشاکی ناو شار، بۆ ئەم کـارە وڵاخ بـەکارهێنراوە بە تایبەتی گوێدرێژ، ئەویش پێویستی بە ئالیک هەبوە.

"لە نەتیجەی موناقەسەیەک کە ئیجرا کراوە تەنی کا بە 22 روپیە و کیلۆی جۆ بە 1 ئانە و 6 پای بۆ مەرکەبەکانی تەنزیفاتی بەلەدیە لە عوهدەی تالیبیایە هەرکەسێ لەمە کەمتر تالبی تەنقیسە لە ئەمڕۆوە هـەتا 4 ی حوزەیرانی 27 موراجەعەت بە مەجلیسی بەلەدیە بکات."

### حەمامەکان

سلێمانی لە سەرەتای دروستکردنیەوە (حەمامی گشتی) تێدا دروسـت کـراوە. ریـچ سـاڵی 1820 کـە هاتۆتە سلێمانی، بە ستایشەوە باسی باشی و پاک و تەمیزی حەمامەکانی سـلێمانی ئـەکا. حەمامـەکان لەسـەر

ئاوی یەکێ لە کارێزەکان دروست کراون، لەبەر ئەوە هەمیشە ئاویان لێ نەبڕاوە. هەندێ جار ماڵان لە کاتی پێویستدا ئاویان لە حەوزی ئەم حەمامانە بردوە، ئەبێ بێ پارە بوبێ، بۆیە پیشینان وتویانە: "پیاوەتی بە سەر ئاوی حەمامەوە ئەکا!"

وەکو دەرئەکەوێ هەندێ ڕێنمایی تەندروستی لە حەمامەکاندا پێڕەوی نەکراوە. وەکو ئەوەی خۆیان لە خەزێنەی ئاوی حەمامەکەدا شت بێ. یان بۆ ئەوەی بۆگەن نەکا، قەسابەکان لە باتی (ساردخانەی) ئەم زەمانە، بە شەو لاکی گۆشتیان لە هۆڵی ساردی حەمامەکان دا هەڵواسی بێ. شارەوانی بۆ پاراستنی تەندروستی گشتی، ئەم کارە ناتەندروستی‌یانەی قەدەغە کردوە.

"ئاگاداری ژمارە 9

لەسەر راپۆرتی تەبیبی مولکی لە نوقتەی محافەزەی سیحەتی عومومیەوە وەختی خۆی مەجلیسی بەلەدیە قەراری داوە کە حەمامەکان دەرگای خەزێنەکانیان دابخرێ و حەمامچیەکان مەنعی خەلقی بکەن کە نەچنە ناو خەزێنەوە. وە بەم رەنگە تەبلیغاتیان پێ ئیفا کراوە. ئێستا لە نەتیجەی تەفتیشدا وا مەعلوم بوە کە بەعزێ لە حەمامچیەکان ریعایەتی ئەم ئەمر و تەنبیهاتە ناکەن بینائەن عەلەیهی ئەوا ئیعلانی ئەکەین هەر حەمامچیەک بە حەق ریعایەتی ئەم ئەمر و تەبلیغاتە نەکا و دەرگای خەزێنەی شافیعی وە یا حەنەفی بکاتەوە کە خەلقی بچنە ناوی بە پێی مادەی 126 ی قانونی عقوباتی بەغدادی تەجزیە ئەکرێ. بۆ مەعلوماتی عموم ئیعلان کرا.

18 ی تەموزی 1926 ئیدارەی بەلەدیەی سلێمانی" (ژ 25 و ژ 50).

"لە ریاسەتی بەلەدیەوە ئیعلان

لە نوقتەی محافەزەی سیحەتی عومومیەوە هەرچەند لەمەوپێش ئیعلان کراوە کە دەرگای خەزێنەی حەمامەکان نەکرێتەوە و خەلقی نەچنە ناوی بەڵام وەکو خەبەر زانراوە بەعزێ لە ئەهالی قفل و دەرگای خەزێنەی حەمامەکان ئەشکێنن وە یاخود بە دیواردا سەرئەکەون و ئەچنە ناوی کە ئەمیش بیلتەبع بۆ سیحەتی عومیە موزیرە. بینائەن عەلەیهی بە موجیبی قەراری مەجلیسی بەلەدیە ئەوا ئیعلانی ئەکەین هەر کەسێک لە ئەهالی بە سورەتی دەرگا شکاندن وە یا قفل کردنەوە وە یا بە سورەتێکی ئاخر بچنە ناو خەزێنەی حەمامەوە وە یاخود هەر حەمامچیەک دەرگای خەزێنەی حەمام بکاتەوە و موساعەدە بکا کە ئەهالی بچنە ناو خەزێنەی حەمامەکەیەوە بە پێی مادەی 126 ی قانونی عقوباتی بەغدادی تەجزیە ئەکرێن. بۆ ئاگاداری عموم ئیعلان کرا." (ژ 114).

**قەسابخانە**

"ئیعلان: لە داخلی شەرائیتی موعەیەنەدا دروستکردنی قەسابخانەیەکی موەقەت بە 100 روپیە لە عوهدەی تالیبیایە هەرکەسێ تالیبی موناقەسەیە موراجەعەت بە دائیرەی بەلەدیە بکا بۆ ئاگاداری ئیعلان کرا." (ژ 90)

"لە ریاسەتی بەلەدیەوە ئیعلان

لە سەر راپۆری بەیتەری موڵکی لە نوقتەی محافەزەی سیحەتی عومومیەوە مەجلیسی بەلەدیە قەراری داوە هیچ قەسابێک نابێ لە 12 سەعات بەولاوە گۆشت بهێڵێتەوە وە یا بە شەو لە حەمام دا هەڵی بواسن و هیچ حەمامچیەکیش نابێ موساعەدە بکا کە قەساب گۆشت لە حەمامەکەیدا هەڵبواسێ. هەرکەس موخالیفی ئەم ئەمر و ئیعلانە حەرەکەت بکا بە پێی مادە 126 ی قانونی عقوباتی بەغدادی تەجزیە ئەکرێ. بۆ ئاگاداری ئیعلان کرا." (ژ 102).

**چاودێری نرخ و چۆنایەتی**

"ئاگاداری

"هەر کەسێ شکایەتی هەیە لە دوکانداریێک، کە ئەو دوکاندارە یا لە فیاتی بەلەدیە بـە زیـاتر، وە یـا بـە وەزنێک لە وەزنی بەلەدیە بە سوکتر، ئەشیا ئەفرۆشێ لازمە بە دەلائیلی سـبوتیەوە رەئسـەن موراجەعـەت بـە دائیرەی پۆلیس بکا. دائیـرەی پـۆلیس، بـە بـێ تەلـەبی مەسـرەف، تـەحقیقاتی مەسـئەلە ئـەکا. موتەسـەرپیفی سلێمانی" (ژ 15).

"ئیعلان: هیچ نانەوایەک ئەو نانەی کە دروستی ئەکەن نابێ گەنمە شامی و نۆک و جـۆ و مـەوادی سائیرەی تێکەڵاو و نانەکانیان لە هەویری فەتیر دروست بکەن. هەر نانەوایـەک ئەگـەر بـە خیلافـی ئـەم ئیعلانە حەرەکەت و نانی خراپی بۆ فرۆشتن دروست کرد وە یا بە سورەتێکی تر غەشـی تـێدا کـرد بـە پێی مادەی 126 ی قانونی عقوباتی بەغدادی تەجزیە ئەکرێ. بۆ ئاگاداری عموم ئـیعلان کـرا. رەئیسـی بەلەدیە" (ژ 133)

"لە ریاسەتی بەلەدیەوە ئیعلان: فیاتی نەوتی سپی لە تەرەف مەجلیسی بەلەدیەوە قاپی بە دو ئانە و نیو تەقدیر کراوە لە ئیعتیباری ئەمرۆوە لازمە هـەمو نەوتفرۆشـێ ئایـا دەسـتگێڕ و ئایـا دوکانـدار قـاپی نـەوتی خالیسی سپی بە دو ئانە و نیو بفرۆشن. هەرکەس لەم فیاتە بـە زیـاتری بفرۆشـێ بـە پـێی قـانون تەجزیـە ئەکرێ. بۆ ئاگاداری ئیعلان کرا." (ژ 124)

"لە ریاسەتی بەلەدیەوە ئیعلان: لە نوقتەی محافەزەی سیحەتی عمومیـەوە و لـە سـەر قـەراری مەجلیسـی بەلەدیە لازمە هەمو چایچی و لۆقەنتەچی و کەبابچی و جگـەرچـی و ئەمسـالیان خۆیـان و شـاگردەکانیان لـە نیهایەتی هەمو مانگێک دا لە 25 ی مانگەوە هەتا نیهایەتی مانگ بچنـە خەسـتەخانە بـۆ لای تـەبیبی مەلـەکی موعایەنەی سیحیە ببن، هەرکەس نەچێ و ریعایەتی ئەم ئیعلانە نەکا بە پێی مـادە 126 ی قـانونی عقوبـاتی بەغدادی تەجزیە ئەکرێ. بۆ ئاگاداری عموم ئیعلان کرا." (ژ 119).

"ئیعلان لە ریاسەتی بەلەدیەی سلێمانیەوە:

"بە موجیبی لزومێ کە لە تەرەف تەبیبـەوە نیشـان دراوە نـەزەری دیقـەتی هـەمو دوکانـداریێک جـەلب ئەکەینە سەر مەوادی ژێرەوە:

1. هەمو دوکانداریێک ئەبێ ئەو مەواد و مەئکولات و مەشـروباتە کـە لـە دوکـان دا ئەیفرۆشـن وەکـو مێوژ، خورما، تو، پەنیر، شەربەت، شەکر، دۆشاو، هەنگوین، ماست، رۆن، گۆشت، وە ئەمسالی ئەمانە کە جەلبی تۆز و مێش ئەکەن بە سورەتی دائیمە سەریان بە مەندیلێکی سپی و پاک داپۆشن.

2. دەلاکەکانیش عمومەن ئەبێ هەمو ئالات و ئەدەواتی تەراشیان دائیما لە ناو مەحلولی ئەسیدفنیک دا و لە ناو قاپی تەمیزدا محافەزە و زۆر ریعایەتی نەزافەتی ئەسباب و دوکانیان بکەن.

ئەم خسوسە بـە واسـیتەی تـەبیب و مـەئموری بەلەدیـەوە هـەمو رۆژێ تـەفتیش و موراقەبـە ئـەکرێ. هەرکەس موخالیفی ئەم ئیعلانە حەرەکەت بکا پێی مادە 126 ی قانونی عقوبات بە شیدەت تەجزیـە ئـەکرێ. بۆ ئاگاداری ئیعلان کرا "(ژ 71)

**پۆست و تەلەفۆن**

"ئیعلان

"ئێستا خەتی تازەی تەلغراف و تەلەفۆن تەواو بوە و حازرە بۆ ئیستیعمال.

"مومکینە لە مەرکەزی تەلەفۆنەوە کە لە دائیرەی پۆستەدایە بە هەر پێنج دەقیقەیەک لە گەڵ چەمچەماڵ دا بە روپیەیەک و لە گەڵ کەرکوک دا بە دو روپیە و تەلەفۆن قسە بکرێت.

"تەلغراف ئێستا بە ئینگلیزی و بە لیسانی محەلی زۆر زو ئەنێرریێت. بۆ داخلی عیراق کەلیمـەی بـە دو ئانەیە و لە روپیەیەک کەمتر تەلغراف نیە. ئیدارەی تەلغراف و تەلەفۆنی سلێمانی" (ژ 97).

"ئیعلان: ئێستا پۆستە هەمو رۆژێ مونتەزەمەن ئەچێ بـۆ کـەرکوک و لـە کەرکوکـەوە دێـت. بینائـەن عەلەیهی لە ئیعتیباری تاریخی نەشری ئەم ئیعلانەوە بە غەیرەز دائیرەی پۆستە بە هـەر واسـیتەیەک دا کاغـەز بێ ئیلساقی پولی پۆستە لە سلێمانیەوە بۆ کەرکوک و لە کەرکوکەوە بـۆ سـلێمانی نـاردن مەمنوعـە هەرکـەس خیلافی ئەم ئەمرە حەرەکەت بکات بە موجیبی 126 ی قانونی عقوباتی بەغدادی و نیزامـی پۆسـتەی مەلـەکی عیراقی تەجزیە ئەکرێ. موتەسەڕیفی سلێمانی"(ژ 105).

**ترافیکی ئۆتۆمۆبێل**

ئەم ئیعلانە، رەنگە یەکەمین رێنمایی بێ بە کوردی دەربارەی رێکخستنی هاتوچۆی ئۆتۆمۆبێل. دیـارە بە گرنگ گیراوە بۆیە لە چەندین ژمارەدا دوبارە بڵاو کراوەتەوە.

"ئیعلان: لە ئیعتیباری 1 ی شوباتی 929 هەمو وەسائیتی نەقلیە لە جیـاتی تـەرەفی چـەپ کـە ئێسـتا جاریە لازمە جیهەتی راستی رێگا بگرن.

ئەگەر دو ئۆتۆمۆبێل لە ئیستیقامەتێکا پێش وە یا پاشی یـەک بـڕۆن وە ئەگـەر ئۆتۆمـۆبێلی پشـتەوە ئەیەوێ تێپەڕی ئۆتۆمۆبێلی پێشەوە بکات لازمە ئەو ئۆتۆمۆبێلەی پشتەوە تەرەفی چەپی ئۆتۆمۆبێلی پێشـەوە بگرێ ئەمجا تێ پەڕ بکات و بڕوا. ئەگەر دو ئۆتۆمۆبێل بەرامبـەری یـەک هـاتن لـە سـەر هـەردوکیان لازمـە تەرەفی راستی رێگا بگرن ئینجا تێپەڕ بکەن بڕۆن. مودیری پۆلیس" (ژ 139).

"ئیعلان: هەرکەسێ لە خاریجی شارەوە بە سیلاحەوە بێتە سلێمانی لازمە سیلاحەکەی لەو جێگایەی کـە لێی میوانە دابنێ و جائیز نیە لە شاردا بە سیلاحەوە بسورێتەوە، کەزا ئەوانەی لە سلێمانیدا سیلاحیان هەیـە لازمە سیلاحیان لە ماڵەوە دابنێن و هەڵی نـەگرن حاسـڵی چ بـە شـەو و چ بـە رۆژ لـە شـاردا بـە سـیلاحەوە سوڕانەوە بە قەتعی مەمنوعە و لەم مەمنوعیەتدا مەئمور و غەیری مەئمور مساویە هەرکەسێ خیلافی ئەم ئـەمرە حەرەکەت بکات تەجزیە ئەکرێ. موتەسەڕیفی سلێمانی" (ژ 113).

## 3. هۆشی ژینگەیی

"ئیعلان: رەسمی دار و خەڵوز و عوشری سپیدار خراوەتە موزایەدەوە هەرکەسێ تـالیبی ئیجـارەکردنی ئەمانەیە موراجەعەت بە مەجلیسی ئیدارە و موحاسەبە بکات. مودەتی موزایـەدە هـەتا 31 ی مـارتی 926 ە. مودەتی ئیحالە لە 22 ی مانگی مەزکورەوە تا 31 ی مارتی 926ە.

بۆ زانینی هەمو کەس ئیعلان کرا وەکیلی موحاسیبی لیوا" (ژ 8)

"بۆ زانینی هەمو

لە مەقامی موتەسەڕیفیەتەوە

رەسمی دار و خەڵوز و عوشری سپیدار و عوشری ماسـی بـۆ سـاڵی 1927 لـە مالیـەوە بـە ئیجـارە ئەدرێن مودەتی موزایەدە لە 1 ی شوباتی 1927 ەوە تا 15 ی مـارتی 1927 ە ئیحالـەی لـە 16 ی مـارتی 1927 ەوە تـا 25 ی مـارتی 1927 تـەعین و تەخسـیس کـراوە ئـەوی تـالیبی ئیجارەیـە موراجەعـەت بـە مەجلیسی ئیدارە و موحاسەبەی لیوا بکات." (ژ 51).

"ئیعلان لە قائیمقامی هەڵەبجەوە

رەسمی دار و خەڵوز و عوشری سپیدار و لەوحی گوێز و مور هی قەزای هەڵەبجە بۆ ساڵی 1927 بە قەراری مەجلیسی ئیدارە لە 8 ی شوباتی 927 ەوە تا 10 ی مارتی 927 بۆ موزایـەدە و لـە 11 ی مـارتی 927 ەوە تا غایەی مارت بۆ ئیحالە مودەت تەعین کراوە بۆ ئاگاهداری کەیفیەت ئیعلان کرا." (ژ 55).

"ئیعلان:

| ئانه | روپیه | حۆقەی سلێمانی" | |
|---|---|---|---|
| . | 3 | 1 | بنێشت |
| . | 8 | 1 | سەعلەب |
| . | 7 | 1 | کەتیرەی سپی |
| . | 4 | 1 | کەتیرەی زەرد |
| 8 | 2 | 1 | کەتیرەی سور |
| 8 | 1 | 1 | مازوی شین |
| 4 | 1 | 1 | مەخلوت |
| . | 1 | 1 | مازوی سپی |

بۆ ئیستیفای عوشر و رەسمی حکومەتی ئەم فیاتانە کە لە سەرەوە نوسراوە بۆ 3 مانگ تەقدیر کراوە ئەوا موافیقی مادەی 8 ی نیزامنامەی ئەعشار بۆ زانینی هەمو کەس ئیعلان کرا. موتەسەرِیفی لیوای سـلێمانی" (ژ 34)

"ئیعلان لە مەقامی موتەسەرِیفیەتەوە:

| ئانه | روپیه | عەدەد | |
|---|---|---|---|
| | 3 | 1 | پێستی رێوی |
| | 19 | 1 | پێستی دەڵەک |
| | 10 | 1 | پێستی سەگڵاو |

بۆ ئیستیفای رەسمی حکومەتی قیمەتی پێستەی ئەم حەیواناتـە وەکـو لـە سـەرەوە نوسـراوە تەقـدیر کراوە. بۆ زانینی هەمو کەس ئیعلان ئەکرێ." (ژ 45)

"ئیعلان

| ئانه | روپیه | حۆقەی سلێمانی | |
|---|---|---|---|
| 8 | 1 | 1 | سەعلەب |
| 8 | 1 | 1 | بنێشت |
| 6 | 1 | 1 | مازوی شین |
| 4 | 1 | 1 | مازوی سپی |
| 4 | 1 | 1 | کەتیرەی زەرد |
| 8 | 1 | | کەتیرەی سپی |

فیاتی ئەم ئەشیایانە کە لە سەرەوە نیشان دراوە بۆ ئیستیفای عوشـر و حـەقی حکومـەتی لـە تـەرەف مەجلیسی بەلەدیەوە تەقدیر و لە تەرەف مەجلیسی ئیدارەوە تەصدیق کـراوە بـۆ ئـەوەی ئـەم فیاتـە لـە هـەمو کەسێکەوە مەعلوم بێ ئیعلان کرا. موتەسەڕیفی سلێمانی. (ژ 82).

"ڕەسمی ماسی بە وەعدەی ساڵێک خراوەتە موزایەدەوە هەرکەسێ تالیبی ئەم ڕەسمەیە موراجەعـەت بـە دائیرەی موحاسەبە بکات. وەکیلی موحاسیبی لیوا" (ژ 12).

وەکـو لـەم ئاگاداریيانـەدا دەرئەکـەوێ، بڕینـی دارودرەختـی لێرەوارەکـان، خـەڵوزکردن، هەڵکەنـدنی گژوگیای کێوی، ڕاوی گیاندار... ئازاد بوە. بە هیچ جۆرێ ڕێک نەخراوە و هیچ جـۆرە چاودێریـەکی لەسـەر نەبوە. خەڵک کە ئاستی هۆشیارییان زۆر نزم بوە، توانیویانە بە ئازادی چۆنیان بوێ بیکەن. ئەمە خۆی لـە خۆیدا نیشانەی نەبونی هۆشیاری ژینگەیی کاربـەدەسـتانی ئـەو سـەردەمە بـوە. هـەر ئەمـەیش بۆتـە هـۆی وێرانبونی ژینگەی کوردستان. هەندێ لەو گیاندارانە بە تەواوی لەناوچون. هەندێ گژوگیا نەماون و هەندێ لە شاخ و کێوەکان بە تەواوی روت بون.

## 4. وەرگرتنی خوێندکار

"ئیعلان: بۆ تەحسیلی فەنی بەیتەری لـە عیراقـەوە چەنـد تەلەبەیـەک ئـەنێررێ بـۆ مەکتـەبی بەیتـەری بەنغالی لە کەلکەتە. هەرکەسێ تالبە ئەوەلەن لەم مەقامە تەماشـای شـەرائیت و تەفسـیلات بکـا ئینجـا ڕەسـمەن موراجەعەت بکا. موتەسەڕیف" (ژ 10)

"ئیعلان: تالبین بە کولیەی بەیتەری بەنغالە لە ئەهالی مەحەلی پیویسـتە تەدریسـاتی بەیتـەری لـە 15 ی نیسان دا دەست پـێ دەکـرێ تەفسـیلاتی تامـە لـە دائیـرەی بەیتـەری مـولکی سـلێمانی وەردەگیـرێ. تـالبین موراجەعەت بەو دائیرەیە بکات. مودیری عامی بەیتەری بەغداد" (ژ 104).

"بۆ زانینی هەمو: بە پێی تەحریراتێک کە لـە مودیریـەتی مـەعاریفی بەغـدادەوە بـە ژمـارە 1995 و ڕۆژی 26/7/28 بۆم هاتوە ئەمساڵ لە تشرینی ئەوەل دا لە مەکتەبی سەنایعی بەغدادا سنفێکی داخلی گوشاد ئەکرێ و بۆ ئەو سنفە تەلەبە کە حائیزی ئەم شەرائیتە بن قبوڵ ئەکرێ:

1.ئەبێ لە سنفی چوارەمی ئیبتیدائی دەرچوبێ.

2. بونیە و وجودی لە سیحەت دا بێ.

3. قابیلیەتی ئیشی دەستی بێ و ئارەزوی فێربونی سەنایعی بێ.

هەرکەسێ حـائیزی ئـەم شـەرائیتەیە و تالبـە موراجەعـەت بـەم دائیرەیـە بکـات. موتەسـەڕیفی لیـوای سلێمانی" (28).

"ئیعلان: ئەمساڵ لە لیوای سلێمانییەوە بۆ مەکتەبی سەنایعی بەغداد 2 تالیـب قبـوڵ ئـەکرێ هەرکـەس ئارەزوی هەیـە بزانـێ شـەرائیتی قبـوڵ چیـە موراجەعـەت بـە دائیـرەی تـەحریراتی موتەسـەڕیفیەت بکـات. موتەسەڕیفی سلێمانی" (ژ 123).

"ئاگاداری: بەمزوانە سنفێکی موبتەدی ئەجزاچێتی لە بەغدا ئەکرێتەوە و تالب قبوڵ ئـەکرێ هەرکەسـێ ئارەزو ئەکا لەم دائیرەیە شەرائیت تەماشا بکا. موتەسەڕیفی سلێمانی"

"ئاگاداری: بۆ مەکتەبی زەراعەتی بەغدا تالب قبوڵ ئـەکرێ هەرکەسـێ تالبـە موراجەعـەت بـە دائیـرەی تەحریرات بکا. موتەسەڕیفی سلێمانی" (ژ 38).

"تەعمیم

"لاحیقە بە تەعمیمی ژمارە 288 و رۆژ 1927/7/16 ی ئەم دائیرەیەیە.

"مەکتەبی عەسکەریەی مەلەکیەی شاهانە چەند تەلەبەیک لە ئەولادی ئەهالی مەملەکەت بۆ ئەمسـاڵ قبـوڵ ئەکات، جەیش زابیتی موقتەدیری ئەوێت کە وەزیفەی ئەسلیەیان بتوانن موافیقی مەتلوب ئیفـا بکـەن بینائـەن عەلەیهی لازمە بە سورەتی خسوسـی تەلەبـەی سـنفی چـوارەمی سـانەوی تەشـویق بکـرێن کـە حکومـەت لـە موستەقبەل دا ئیستیفادەیان لێ بکات. موتەسەڕیفی سلێمانی" (ژ 77).

"ئیعلان: مەکتەبی عەسکەری ملوکانە بۆ ئەولادی رونەسـای عەشـایەر لـە بەغـداد تالیـب قبـوڵ ئـەکات. هەرکەسێ حائیزی شەرائیتە لازمە پێش 25 ی حوزەیرانی 1928 موراجەعەتنامەی بگاتە وەزارەتی دیفاع لـە بەغداد. موتەسەڕیفی سلێمانی" (ژ 117).

"ئیعلان: شـەرائیتی قبـوڵی تەلەبـە بـۆ دارولموعـەلیمینی بەغـداد لـەم دائیرەیـە و مەکتـەبی سـلێمانی‌دا مەوجودە. هەرکەسێ تالبە بۆ موتالەعە موراجەعەت بەم دو جێگایە بکات. موتەسەڕیفی سلێمانی" (ژ 128).

"بۆ زانینی هەمو: لە رۆژی 20 ی ئەیلول دا مەکتەب ئەکرێتەوە و موباشەرەت بە تەدریسـات ئـەکرێت لە ئەمڕۆوە هەرکەس تالبە موراجەعەت بە مەکتەب بکات و ناوی خۆی قەید بکات." (ژ 33).

"بۆ زانینی هەمو: رۆژی 6 ی ئاغستۆسی 1926 لـە بەغـداد ئیمتیحـانی ئەوانـە کـە تـالبی مەسـلەکی ئیدارەن ئیجرا ئەکرێ و هەرکەسێ تالبە ئەبێ رۆژی 4 ی ئاغستۆسی 1926 لە دیـوانی وەزارەتـی داخلیـەدا حازر بێ. موتەسەڕیفی سلێمانی" (ژ 25).

## 5. داهاتی حکومەت

"ئیعلان: رسوماتی بەلەدیە لە ئیعتیباری 1 ی نیسانی 926 ەوە بـە وەعـدەی سـاڵێک ئـەدرێن بـە ئیجارە و بۆ موزایەدە لە مارتەوە هەتا 20 ی مارت و، بۆ ئیحالـە لـە 21 ی مارتـەوە هـەتا 27 ی 926 مودەت دانراوە. هەر کەسێک تالیبە لە زەرفی ئەم مودەتەدا موراجەعەت بە دائیرەی بەلەدیە بکات. ریاسەتی بەلەدیە" (ژ 7).

"ئیعلان

ئانە روپیە

24500 رەسمی بارانە (ئولاغی مەکاری)

8500 زەبحیە

5100 قەپان

1650 مەیدانی ئەسپ

ئەم ڕەسمانە لە ئیعتیبـاری 1 ی نیسـانی 926 ەوە هـەتا غایـەی مـارتی 927 بـە وەعـدەی سـاڵێک ئەدرێن بە ئیجارە و بەو بەدەلانەی کە لە حـەوایان دا نوسـراوە خراونەتـە ژێـر پەیـەوە. هـەر کەسـێ تـالبی ئیلتیزامی ئەم ڕەسمانەیە موراجەعەت بە دائیرەی بەلەدیە بکات. ڕیاسەتی بەلەدیەی سلێمانی" (10).

"ئیعلان لە ریاسەتی بەلەدیەوە

ڕەسمی بارانە، زەبحیە، قەپان، دەلالیە و مەیدانی ئەسپ بۆ ساڵی 1927 لە تەرەف بەلەدیەوە ئـەدرێـن بە ئیجارە، مودەتی موزایەدە لە 1 ی شوباتی 927 ەوە هەتا 15 ی مارتی 927 و مودەتی ئیحالە لـە 16 ی مـارتی 927 ەوە هـەتا 25 ی مـارتی 927 تـەعین و تەخسـیس کـراوە هەرکەسـێ تـالیبی ئیجـارەی ئـەم ڕەسمانەیە موراجەعەت بە دائیرە و مەجلیسی بەلەدیەی سلێمانی بکات." (ژ 52).

"ئیعلان

بەدەلی سابیق

| | |
|---|---|
| 1505 | زەبحیە |
| 1930 | بارانە |
| 80 | نەوت |
| 76 | مەیدانیە |
| 80 | دەلالیە |

ئەم پێنج قەلەمی رسوماتی بەلەدیەیە کە لە سـەرەوە نوسـراوە مـودەتی موزایـەدەی لـە 18 ی شـوباتی 928 ەوە تا 15 ی مارتی 928 و مودەتی ئیحالە لە 16 ی مارتی 928 ەوە تـا 31 ی مـارتی 928 قـەرار دراوە بینائەن عەلەیهی هەر کـەس تـالیبی ئیلتیـزام کردنـی رسـوماتی مەزکورەیـە موراجەعـەت بـە مەجلیسـی بەلەدیەی هەڵەبجە بکات بۆ ئاگاداری ئیعلان کرا. قائیمقامی هەڵەبجە"

بەروبومی کشتوکاڵ

"بۆ زانینی هەمو

"بە پێی ئەمری وەزارەتی جەلیلەی مالیە کە وەرمان گرتوە بۆ شتووی ساڵی 926 ی قـەزای سـلێمانی و شارباژێر تەنی گەنم 150 و تەنی جۆ 96 روپیە کە حۆقەی سلێمانی گەنم 8 ئانە و 2 پای و جۆ 5 ئانـە و 3 پای ئەگرێتەوە و، بۆ قەزای هەڵبجە تەنی گەنم 135 و هی جۆ 110 روپیە کە حۆقەی گەنم 7 ئانە و 4 پای و نیو و جۆش بە 6 ئانە ئەگرێتەوە. فیات تەقدیر و تەسدیق کراوە و بە قەراری مەجلیسی ئیدارەیش بە ئیعتیباری لیوا حۆقەی نۆک بە 9 و نیسک بە 8 و کزن بە 6 و پۆڵکـەیش بـە 6 ئانـە فیاتیـان بـۆ تەقـدیر کراوە. ئەوا موافیقی مادەی 8 ی نیزامنامەی ئەعشار ئیعلانی کەیفیەت کرا. لە پاش خیتامی مـودەی موعەیەنـە دەست ئەکرێ بە تەحسیلات. موحاسیبی لیوای سلێمانی" (ژ 27).

"ئیعلان: بۆ ئیستیفای عوشر و حیسەی حکومەتی بۆ قەزای سلێمانی و شارباژێر تەنی گەنم بـە 100 روپیە، کە حۆقەیەکی سلێمانی 5 ئانە و 6 پای وتەنی جۆ بە 80 روپیە کە حۆقەیەکی سـلێمانی 4 ئانـە و 4 پای ئەکات. فیات تەقدیر و لە وەزارەتی مالیەیشەوە تەسدیق فەرموراوە بۆ ئەوەی موافیقی مادەی 8 ی نیـزام ئەل ئەعشار ئەوانەی موعتەریزن لە مودەی 10 ڕۆژدا ئیعتیرازاتـی خۆیـان تەقـدیم بکـەن وا ئـیعلان کـراوە. موتەسەڕیفی سلێمانی" (ژ 74)

"ئیعلان: بۆ ئیستیفای عوشر و حیسەی حکومەتی لە قەزای ئەلەبجە تەنی گەنم بە 75 و تەنی جۆ بـە 55 روپیە تەقدیر و لە تەرەف وەزارەتی مالیەیشەوە تەسـدیق فـەرموراوە. بـۆ ئـەوەی مـوافیقی مـادەی 8 ی نیزامنامەی ئەعشار هەرکەسێ ئیعتیرازی هەیە ئوسولەن موراجەعەت بکات ئیعلان کرا. موتەسەرپیفی سـلێمانی" (ژ 76).

"ئیعلانات: بۆ ئیستیفای حەقی حکومەت لـە قـەزای سـلێمانی و شـارباژێرپا بـۆ سـاڵی 926 حوقـەی سلێمانی چەڵتوک بە 9 ئانە لە تەرەف مەجلیسی ئیـدارەی لیـواوە تەقـدیر و لـە وەزارەتـی جەلیلـەی مالیـەوە تەسدیق کـراوە. ئـەوا مـوافیقی مـادەی 8 ی نیزامنامـەی ئەعشـار ئـیعلان کـرا. لـە پـاش 10 رۆژ مـودەتی ئیعتیرازی ئەم فیاتە کەسبی قەتعیـەت ئـەکات. بـۆ زانینـی هـەمو ئـیعلان کـرا. 3 ی تشـرینی دوەمـی 926 موتەسەرپیفی سلێمانی" (ژ 40).

"ئیعلان: بۆ ئیستیفای عوشر و حیسەی حکومەتی کیلـۆی توتـون ئەمسـاڵ بـە یـەک ئانـە و 2 پـای تەقدیر و لە وەزارەتی مالیەشەوە تەسدیق فەرموراوە لە ئیعتیباری ئەمرۆوە ئەم فیئاتە ئیعتیبـاری پـێ ئـەکرێ. موافیقی مادەی 8 ی نیزامنامەی ئەعشار ئیعلان کرا. موتەسەرپیفی سلێمانی" (ژ 89).

"ئیعلان: بۆ ئیستیفای حەقی حکومەتی بۆ چەڵتوکی ئەمساڵی قەزای سلێمانی و شارباژێڕ تەنی بە 1- 160 روپیە کە حوقەیەکی 6 ئانە و 6 پای و بۆ قەزای هەڵەبجە تەنی بە 7- 135 روپیـە کـە حوقەیـەکی 5 ئانە و 6 پای ئەکات تەقدیر و لە وەزارەتی مالیەشەوە تەسدیق فەرموراوە پێویستە موافیقی ئەم فیاتە عوشری حکومەتی ئیستیفا بکەن. موتەسەرپیفی سلێمانی" (ژ 92).

"بۆ زانینی هەمو:

1 حۆقەی گەنمە شامی 6، هەرزن 5، ماش 12، زەرات 4، پیاز 8، کەرەر 4 ئانە، سـیر 2 روپیـە و 8 ئانە، خەیار 4، ترۆزی 2 ئانە و 6 پای، کاڵەک 4، شوتی 3، بامیە 4، باینجان 3، تەماتە 3، لۆبیا 8، کولەکـە 4، ترێی سپی 10، ترێی رەش 6، هەنار 10، هەنجیر 12، قۆخ 14، قەیسی 12، سێو 10 ئانـە، بـادام 1 روپیە، هەڵوژە 10، ترش 10، هەرمێ 12 ئانە، کونجی 1 روپیـە، گـوێز عـەدەد هـەزار 2 روپیـە و 8 ئانـە، بەهێ 1 روپیە.

بۆ ئیستیفای حیسەی حکومەت فیاتی حاسلاتی موخەزەرات و میوە بۆ ساڵی 1926 وەکو لە سەرەوە نیشان دراوە لە تەرەف مەجلیسی ئیدارەی لیواوە قەرار دراوە. موافیقی مـادەی 8 ی نیزامنامـەی ئەعشـار بـۆ زانینی هەمو کەس ئیعلان ئەکرێ. موتەسەرپیفی لیوای سلێمانی" (ژ 40).

"تەعمیم بۆ قائیمقام و مودیرەکان

| | ئانە | پای |
|---|---|---|
| پاقلە | 1 | |
| پۆڵکە | 4 | 6 |
| نۆک | | 11 |
| نیسک | 8 | |
| کزن | 4 | 6 |

بۆ قەزای سلێمانی و شارباژێر ئەو حبوباتی کە لە سەرەوە نوسـراوە ئـەم دەفعەیـە فیـاتی لـە تـەرەف بەلەدیەوە تەقدیر و لە مەجلیسی ئیدارەوە تەسدیق و قبول کراوە پێویسـتە مـوافیقی ئـەم فیاتـە عوشـری ئـەم حبوباتە ئیستیفا بکرێ. موتەسەڕیفی سلێمانی." (ژ 79).

بە کرێ دانی دوکان

"ئیعلان: لە مەوقیعی سەقاخانەدا 3 دوکان کە عائید بە خەزێنەیە لە ئیبتیدای نیسانی 1926 ەوە هـەتا ئاخری مارتی 927 بە وەعدەی ساڵێک ئـەدرێن بـە ئیجـارە هەرکەسـێ تـالیبی ئیجارەیانـە موراجەعـەت بـە مەجلیسی ئیدارە و موحاسەبە بکات. وەکیلی موحاسیبی لیوا" (ژ 8).

مەشروبات

"ئیعلان: لە ئیعتیبـاری نیسـانی 926 ەوە تـا نیهایـەتی مـارتی 927 بـە وەعـدەی سـاڵێک مـوافیقی شەرائیتێک کە لە دائیرەی گومرگا مەوجودە عەرەق و شەراب ئەدرێ بە ئیلتیزام هەرکەس تالیبە لە 1 ی مارتی 926 ەوە موراجەعەت بە دائیرەی گومرگ و مەکوسی سلێمانی بکا. 28 ی شوباتی 926 مـودیری گـومرگ و مەکوس" (ژ 7).

"ئیعلان لە دائیرەی گومرگەوە

شەراب و عەرەقی سلێمانی لە ئەوەلی نیسانی 927 ەوە تا نیهایەتی مارتی 928 لە داخلـی شـەرائیتی گومرگا مەوجودە ئەدرێ بە ئیلتیزام هەرکەسێ تالیبی زەمائیمە لە تاریخی ئەم ئیعلانەوە موراجەعەت بە دائرەی گومرگ و مەکوسی سلێمانی بکا." (ژ 56).

"ئیعلان لە مەقامی موتەسەڕیفیەوە

| یکون | عارەق | شەراب | |
|---|---|---|---|
| 17450 | 17200 | 250 | سلێمانی |
| 2200 | 2200 | . | هەڵەبجە |

ڕەسمی عـارەق و شـەرابی سـلێمانی و هەڵەبجـە لـە موزایەدەدایـە و بـەدەلی پێشوشـیان لـە سـەرەوە نوسراوە. ئەوانی کە تالیبن موراجەعەت بە مەجلیسی ئیدارە و دائیرەی گومرگ و مەکوس بکات." (ژ 58).

## 6. ئیعلانەکانی جەیش

دوای ئەوەی لە تەموزی 1924 دا سلێمانی داگیرکرایەوە، سەرەڕای ئەوەی وەکو هەمو لیواکـانی تـری عیراق، داوودەزگای بەڕێوەبەرایەتی تێدا دانرا، بۆ پاراستنی سلێمانی لە هێرشی هێزەکانی شێخ مەحمود و بۆ سەرکردایەتی ئەو لەشکرکێشییانەی لە ناوچەکەدا ئـەکران جەیشـی عیـراق سـەربازگەیەکی هەمیشـەیی تـێدا دامەزراند.

شێخ ڕەزا لە باسی داوودەزگای حوکمڕانیی پاشایانی بابان دا وتویەتی:

دریغ بۆ ئەو زەمانە، ئەو دەمە، ئەو عەسرە،

کە مەیدانی جریدبازی لە دەشتی کانی ئاسکان بو

سەرکردەکانی جەیش دەشتی کانی ئاسکانیان بۆ بارەگاکـەیان داگیـر کـرد، کـە یـەکێ لـە خۆشـترین شوێنەکانی سلێمانی بو. ئەم سەربازگەیە کرا بوە بارەگای (آمرية المنطقة الشـرقية) و، لـە نـاو خـەڵک دا بـە

(حامیە) ناو ئەبرا. موڵکیەتی ئەرزەکە هی خەڵک بوە. شارەوانی سلێمانی بەم ئیعلانە (ئیستیملاک) ی کـردوە و، ئیتر بۆتە موڵکی دەوڵەت:

"لە ریاسەتی بەلەدیەوە ئیعلان

| قیمەتی موقەدەرە: | ئانە | روپیە |
|---|---|---|
| | .. | 7500 |

| میقدار: | ئولک | دۆنمی جەدید | نەوعی موڵک | مەوقیعی |
|---|---|---|---|---|
| | 22 | 54 | ئەرازی | کانی ئاسکان |

ئەسحابی موڵک: حاجی مەلا سەعید و ئەحمەد ئاغا و فارس ئەفەندی و وەرەسەی حاجی ئەورەحمان

موافیقی خەریتەی مورسەمە عیبارەت لە 54 دۆنمی جەدید و 22 ئۆلک قیتعەیەک ئەرازی کە لە غـەربی مەملەکەتەوە واقیعە و، بە ئەرازی کانی ئاسکان مەشهورە و، عائیدە بـەو ئەشخاسـانە کـە ئیسـمیان لـە بـاڵاوە نوسراوە، بۆ بینای قشڵەی عەسکەریە بەدەلی ئیستیملاکی بە 7500 روپیە لە تەرەف هەیئـەتی مەخسوسـەوە تەقـدیر کـراوە، هەرکەسـێ لـە عەلاقـەداران لـەم خسوسـەوە ئیفـادە و ئیعتیرازێکیـان هەیـە مـوافیقی قـانون ئیستیملاکی لازمە لە زەرفی 8 رۆژدا موراجەعەت بکەن بـە دائیـرەی بەلەدیـە و بـەیانی بکـەن. بـۆ ئاگـاداری ئیعلان کرا. 21 ی کانونی سانی 928" (ژ 100).

"لە 28/3/25 ەوە عەسکەری جەیشی عیراقی لە مەیدانی ئەنداختی گـەورە – جیـواری کـارێزی شـێخ سەعید و لە مەیدانی ئەنداختی پچوک – ئەرازی نزیکی ئاشێ کە لە سەر رێگای ئەزمڕ واقیعە، دەسـت ئەکـەن بە تەعلیم و ئەنداختی سیلاح. نـابێ قەتعیـەن ئـەهالی بـەو دو جێگایانـەدا بـڕۆن و ئـەبێ ئیجتینـاب بکـەن. موتەسەڕیف" (ژ 107).

"ئیعلان: بۆ کاروان و ئۆتۆمۆبێل و ئەرابە و ئینسان هاتوچۆکردن بە جێگای تـەیارەدا کـە لـە غـەربی شاری سلێمانی واقیعە مەمنوعە و، کاروان و ساحیب بار نابێ نـە بـە شـەو و نـە بـە رۆژ بـاری لـێ بخـات. هەرکەسێ خیلافی ئەم ئیعلانە معامەلە بکات بە مـوجیبی مـادەی 126 ی قـانونی عقوبـاتی بەغـدادی تەجزیـە ئەکرێ. موتەسەڕیفی سلێمانی" (ژ 97).

"ئیعلان: لە مەقامی موتەسەڕیفیەوە

لەمەودوا بە هیچ کلۆجێ جائیز نیە لـە وەختـی هەڵسـان و نیشـتنەوەی تـەیارەدا هـیچ کەسـێ نزیکـی جێگای تەیارە بکەوێ و، بە سەر جادەکەدا هاتوچۆ بکات. بۆ ئبگاداری کەیفیەت ئیعلان کرا." (ژ 61).

"ئیعلان: لە بەر ئەوەی هیچ حادیسەیەک رو نەدا، لەو ئەسنایەدا کـە تـەیارە ئەنیشـێتەوە و هەڵئەسـتێ، هاتوچۆکەری هەمو جیواری محەلی تەیارە بۆ چەند دەقیقەیەک لازمە خۆیان تەعتیل بکەن لە ئەسنای هەڵسـان و نیشتنەوەی تەیارەدا ئامەدوشود بە سورەتی قەتعیە مەمنوعە. موتەسەڕیفی سلێمانی" (ژ 146).

پێ ئەچێ مونتەسیبینی جەیش، بە زۆر بێ یان بە خوایشـت، قـەرزیان لـە دوکانـدارەکانی نـاو بـازاڕ وەرگرتوە و نەیان داوەتەوە بۆیە لای فەرماندەکانیان شکاتیان لێ کردون، فەرماندەکان لە باتی ئەوەی بۆیـان بسێننەوە، ئەم ئیعلانەیان بڵاو کردۆتەوە:

"ئیعلان: لە هەمو دوکاندار و کەسەبەیەکەوە مەعلوم بێت کە موقابیل بـە قـەرزی ئەشـخاس لـە معاشـی عەسکەر پارە گل نادرێتەوە. ئەوانەی کە بەم نەوعە قەرز لە گەڵ عەسکەردا ئەکەن مەسئولیەت عائید بە خۆیانە. قوماندانی تابوری چوارەمی لیوی" (ژ 69).

"ئیعلان: ئەوا ئیعلان ئەکرێ کە هیچ کەسێک لە گەڵ مونتەسیبینی جەیش دا قەرزوقۆڵە نەکات و شتیان بە قەرز پێ نەفرۆشن چونکە بۆ ئەم خسوسە دەعوا و شکایەتی هیچ کەسێک ناپرسرێ" (ژ 77).

"ئیعلان: کانتینی ئەو قەتەعاتی عەسکەریەی کە مەربوتی مەنتیقـەی شـەرقیەی سـلێمانین لـە ئیعتیبـاری تاریخی ئیحالەی قەتعیەوە بە مودەی 6 مانگ ئەدرێن بە ئیلتیزام ئەوانەی تالبن موراجەعەت بە مەقەڕی مەنتیقە بکەن. ئامیری مەنتیقە" (ژ 106).

"لە ئیعتیباری 28/7/1 ئـەرزاقی نەفـەر و ئـالیکی حـەیواناتی جەیشـی عیراقـی بـۆ مـودەتی سـاڵێک خراوەتە موناقەسەوە. ئەوانەی تالبن لازمە هەمو ڕۆژێک غەیری جومعە بەیانیان بـۆ ئەمـەی لـە شـەرائیتەکەی بگەن موراجەعەت بە مەقەڕی مەنتیقە و بە مەوقیعی قوماندانی کەرکوک بکەن.

"ئەوانەی کە موراجەعەت ئەکەن لازمە شەهادەتنامەیەکی غورفەی تیجارەتی بەغداد وە یـا موسـڵیان بـە دەستەوە بێ.

"موناقەسەکە لە ڕۆژی 22 ی مانگی مەزکور لە ساعەتی 12 دا تەواو ئەبێ.

ئامیری مەنتیقەی شەرقیە" (ژ 118).

"ئیعلانی موناقەسەی لەوازیمی ئینشائیە لە سلێمانی

1. موناقەسە بۆ لەوازیمی ئینشائیەی لیویە و لە سلێمانی جەرەیان ئەکات.

2. ئەوراقی موناقەسە لە گەڵ لیستەی ئەو مەوادانەی پێویسـتە بیلموراجەعـە لـە قومانـدانی مـەفرەزەی فەوجی دوەم وەرئەگیرێت. تالیبینی موناقەسە فیاتێک کە پێی تالبن لازمـە لـە جـەدولی لـەوازیم دا لـە خانـەی خۆیدا.. ئەو مادەیە یەک بە یەک دای بنێن، جەدوەلی لەوازیم، هـەمو ئـەوراقی موناقەسـە بـە ئیمزاکـراوی لـە زەرفێکی لۆککراودا لە گەڵ مەبلەغی 50 ڕوپیە پێشەکی تەسلیم بە قوماندانی مەفرەزەی فـەوجی دوەمـی لیـوی بکەن.

3. قوماندانی لیوی عیراق تەعەهود ناکات بە قبوڵی کەمترین وە یا هەر موناقەسەیەک بێت.

لیفتنت موئیرهید زابیت ئەل ڕوکنی لیوی عیراق" (ژ 119).

"ئـیعلان: وەزارەتـی دیفـاع، نـەقلیاتی ئـەرزاق و ئەشـیای عەسـکەریە لـە سـلێمانیەوە بـۆ نوقتـەکان ئەخاتە موناقەسەوە، هەرکەسـێ تالبـە بـۆ حـەزەر و سـەفەر موراجەعـەت بـەم دائیرەیـە بکـات. موتەسـەڕیفی سلێمانی" (ژ 70).

هەندێ جار ئیعلانیان بە زمانی عەرەبی بڵاو کردۆتەوە، وەکو:

"اعلان: يدعى الراغبون الى تقديم وسائل نقلية ميكانيكية للمنطقتين الشمالية والشرقية و نقلية حيوانـات فمن شاء الاطلاع على الشروط والتفاصيل فليطلبها من وزارة الدفاع في بغداد ومن امـراء الالويـة فـي الموصـل والسليمانية ومن موقع كركوك. وزارة الدفاع" (ژ 9)

## 7. ئیعلانەکانی پۆلیس

"ئیعلان: ئەم دائیرەیە 48 ئێستر کە بە کەڵکی رکوبی پۆلیس و چاک بێت موبایەعە ئەکات ئەوانەی کە هەیانەو ئەیفرۆشن پێش خیتامی مانگی مارتی 928 بیهێنن و موراجەعەت بەم دائیرەیە بکەن. مودیری پۆلیس" (ژ 102).

"لە دائیرەی پۆلیسەوە

"بۆ مەرکەزی پۆلیسی سلێمانی کا و جۆ لازمە و ئەخرێتە موناقەسەوە هەرکەسێک تالبە بۆ مانگی حوزەیران و تەموز و ئاغستۆس تەنی کا بە چەند و تەنی جۆ بە چەند ئەتوانن تەسلیمی بکەن بینوسن و لە ناو زەرفێکی لۆک کراودا لە پێش رۆژی 27/5/20 دا تەودیعی ئەم دائیرەیەی بکەن." (ژ 66)

"ئیعلان: لە ئیعتیباری 1 ی 9 ی 27 هوە کا و جۆ بۆ 3 مانگ بۆ ولاغی حکومەتی ئەدرێ بە قۆنتەرات ئەوانەی کە تالبن قائیمەی موناقەساتیان لە زەرفێکی داخراودا لە 29 ی مانگی جاریدا موراجەعەت بەم دائیرەیە بکەن. معاونی مودیری پۆلیس" (ژ 81).

دروستکردنی بینای مەخفەر

"بۆ زانینی هەمو: بۆ سەرای پێنجوین تەنی بەرد بە 10 تەنی قسڵ بە 55 تەنی لم بە 14، بۆ نوقتەی قزلجە تەنی قسڵ بە 70 تەنی لم بە 14 تەنی بەرد بە 10، بۆ نوقتەی ولیاوا و نۆدێ تەنی بەرد بە 6 تەنی قسڵ بە 50 تەنی لم بە 10، بۆ نوقتەی کەوڵۆس تەنی بەرد بە 6 تەنی قسڵ بە 50 و تەنی لم بە 8 روپیە. لە عوهدەی تالیبیانایە هەرکەسێ تالیبی تەنقیسە هەتا 21 ی نیسانی 927 موراجەعەت بە قۆمیسیۆنی مەخسوس بکا کە لە دائیرەی بەلەدیە ئیجتیماع ئەکا. بۆ مەعلومات ئیعلان کرا. رەئیسی قۆمیسیۆنی موناقەسە" (ژ 61).

"ئیعلان: بۆ بینای سەرای چوارتا تەنی بەرد بە 3-1 و لم و چەو بە 12 - 3 و قسڵ بە 8 - 26 و، بۆ بینای سەرای سورداش تەنی بەرد بە 6 - 1 و قسڵ بە 30 و چەو بە 12 - 2 و لم 9 - 3 و، نەقلی ئەشیا لە سلێمانیەوە بۆ پێنجوین تەنی بە 25 و، بۆ سورداش و چوارتا بە 17 و، ئوجرەتی ولاخێک لە سلێمانیەوە بۆ پێنجوین لە 5 و بۆ سورداش بە 3 و، بۆ چوارتا بە 2 روپیە، خراوەتە موناقەسەوە. کێ تالبە تا رۆژی 928/6/11 موراجەعەت بە مەجلیسی ئیدارەی سلێمانی بکات. موتەسەڕیفی لیوای سلێمانی" (ژ 117).

## 8. ئیعلانی جۆراوجۆر

پاسی سیلاح

"تەعمیم

بۆ مودیری پۆلیسی سلێمانی

بۆ قائیمقامی قەزاکان

بۆ مودیری ناحیەکان

بە ئەمری وەزارەتی داخلیە بۆ ساڵی 1928 رەسمی پاسی ئەو سیلاحانە کە ساڵی 1927 موسەجەل بون و ئەمساڵ پاسی تازەیان بۆ وەرئەگیرێ عیبارەتە لە یەک روپیە و رەسمی پاسی ئەو سیلاحانە کە لە ساڵی 1927 دا موسەجەل نەبون و لە ساڵی 1928 دا وەرئەگیرێ عیبارەتە لە دو روپیە.

مودەتی وەرگرتنی پاسی سیلاح بۆ ساڵی تازە... مانگی کانونی سانی، شوبات و مارت و لە پاش نیهایەتی مارت هەر سیلاحێکی بێ پاس بگیرێ بە موجیبی قەوانینی مەوزوعە موسادەرە و ساحیبی تەجزیە ئەکرێ موتەسەڕیفی سلێمانی" (ژ 96)

"ئیعلان
لاحیقەی تەعمیمی ژمارە 132 ی رۆژی 1928/1/18 ی ئەم دائیرەیە:
لەم مەقامەوە وا قەرار دراوە کە رەسمی پاسی تفەنگی حسکە، مارتین، بەرازکوژ، ماوزەری گەورەی کۆن، قەپاقلی، وەرندل و سائیری ئەو نەوعە سیلاحانە کە لە مۆدێلی کۆنن یەک روپیە بسێنرێت بەم نەوعە ئیفای معامەلە لازمە. موتەسەرِیفی سلێمانی" (ژ 102).

گەرای کوللە
"تەعمیم لە مەقامی موتەسەرِیفیەوە
"وا مولاحەزە کراوە ئەمساڵ کوللە گەرای زۆر داناوە و ئەم گەرایە کە ژیایەوە تەبیعی ئەبێ بە باعیسی خەساراتی زۆر لە زەراعەت و مەحسولات دا لە بەر ئەوە حکومەت چ موقابیل بە گەرای کوللە و چ موقابیل بە کوللەی ژیاوە بەعزێ تەدابیری ئیتیخاز کردوە.
"حکومەت بۆ هەر کیلۆیەک گەرای پاک کراوەی کوللە (یەعنی بە بێ خۆڵ) کە لە مەرکەزی سلێمانیدا تەسلیم بکرێت چوار ئانە ئەدات یەعنی بۆ چوار کیلۆ گەرای پاک کراوە روپیەیەک ئەدات جا لوتفەن بە هەمو لایەکدا ئیعلانی بفەرمون و عمومی ئەهالی حاڵی بکەن و زۆر بە ئەهمیەت تەرغیب و تەشویقی ئەهالی بکەن کە سەعی بکەن بۆ کۆکردنەوەی گەرای کوللە و بیهێننە سلێمانی تەسلیمی بکەن و بۆ هەر کیلۆیەکی چوار ئانە وەرگرن. ئەم مەسئەلەیە هەروەکو مەعلومتانە تەعەلوقی بە حەیاتی مەملەکەتەوە هەیە کە حەیاتی مەملەکەت مەربوتی موحسول و زەراعەتە لە بەر ئەوە ئومێد ئەکەم فەوقەلعادە سەعی بکەن بۆ تەشویقی ئەهالی. ئیتر ئیحتیرام." (ژ 50).

بڵاوبونەوەی دەردەگا
"ئیعلان: لە بەر ئەوەی دەردەگا لە لیوای سلێمانیدا بڵاو بۆتەوە بە سورەتی عمومیە هەمو لیوای مەزکور لە ئیعتیباری 9 ی ئەیلولی 1928 وە بە مەنتیقەی موسابە عەد ئەکرێ و ئیخراجی عمومی مەواشی و مەنتوجاتی حەیوانیە لە لیوای مەزکورەوە بە سورەتی قەتعیە مەمنوعە هەتا سدوری ئەوامیری ئەخیر. مودیری عامی دائیرەی ئوموری بەیتەرەی مەلەکیە" (ژ 129).

سەربڕینی مەڕی ئاوس
"ئیعلان: لەمەولا سەربڕینی مەڕی ئاوس مەمنوعە هەرکەس موخالەفەتی ئەم ئەمرە بکات بە موجیبی مادەی 126 ی قانونی عقوباتی بەغدادی تەجزیە ئەکرێ موتەسەرِیفی سلێمانی" (ژ 94).

تاپۆ
"بۆ زانینی هەمو
دائیرەی تاپۆ لە ئیعتیباری 5 ی ئەیلولەوە دەست ئەکات بە ئیش هەرچی موراجەعەتێک لە داخلی حدودی شاردا بکرێت قبوڵ ئەکرێ لە بەر ئەوە کەیفیەت ئیعلان کرا. دائیرەی تاپۆ" (ژ 31).

"ئیعلان لە مەقامی موتەسەرِیفیەوە
تەعمیم بۆ: قائیمقامەکان، مودیرانی نەواحی، روئەسای موحتەرەمەی دەوائیر

بە پێی ئەمری مودیری عامی تاپۆ دائیرەی تاپۆی سلێمانی لەمەولا مەئزونـە بـە دەرهێنـانی سـورەتی قەیدی ئەملاکی خاریجی سلێمانیش بەڵام جاریێ مەئزون نیە معامەلەی لـە سـەر بکـا هـەر سـورەت ئـەتوانێ دەربهێنێ." (ژ 45).

نیکاحی لاکۆڵان

"ئیعلان: وەکو خەبەر زانراوە بە بێ مەعلوماتی مەحکەمەی شەرعیە لە تەرەف ئەئیمە و مەلایان و موختارانەوە معامەلاتی نیکاح و تەلاق ئیجرا ئەکرێ ئەمەیش موخالیفی شەرعی شەریف و قانونە. لە ئیعتیباری نەشری ئەم ئیعلانەوە بە بێ مەعلوماتی مەحکەمە هەر ئیمام و مەلا و موختارێک معامـەلاتی نیکاح ئیجرا بکات بە پێی مادەی 126 لە قانونی عقوباتی بەغدادی تەجزیە ئەکرێ. قـازی سـلێمانی" (ژ 129).

"لە مەحکەمەی سولحی سلێمانیەوە ئیعلان

"خانویەک کە لە محەلەی جولەکان واقیعە و عائیدە بە وەرەسەی داودەکل کە سەعید و سـیوەن نـاوانن لە بەر ئەوە کە لە تەرەف مەرقومانەوە لـەم مەحکەمەیـەدا داوای ئیزالـەی شـیوعی کـراوە و لـە بـەر ئـەوە کـە قابیلیەتی تەقسیمی نەبو ئەوا خرایـە مـەوقیعی موزایـەدەوە ئەوانـەی کـە تـالبن بـە سـەدی دەی تەئميناتـەوە موراجەعەت بە مەحکەمەی سولحی سلێمانی بکەن کەیفیەت ئیعلان کرا." (ژ 94).

ژوری بازرگانی

"بۆ زانینی هەمو لە مەقامی موتەسەرپیفیەوە

"ئاگـاداری: مـوافیقی مـادە 15 ی قـانونی ئـۆدەی تیجـارەت کـە لـە سـاڵی 926 دا ئیصـدار فـەرموراوە ئـەو شەخسـانەی کـە بـە تیجـارەت وە یـا موتەعەهیـدی وە یـا دەلالـی مەشـغوڵن ئەگـەر ئیشتیراکیان بە ئـۆدەی تیجـارەتی نـەبێ وە یـا ئەعزایـەتی ئـۆدەی تیجارەتیـان قبـوڵ نـەکردبێ لـە موزایەدات و موناقەساتی حکومەتیدا قبوڵ ناکرێن. بۆ زانینی هەمو کەس ئـیعلان کـرا. موتەسـەرپیفی لیوای سلێمانی" (ژ 43).

دەفتەری نفوس

"بەیان: دائیـرەی نفوسـی عاسـیمە و خـاریج لـە ئیعتیبـاری 1 ی مایسـی 928 ەوە موباشـەرەت بـە تەوزیعی دەفاتیری جنسیە ئەکات کە لە مادە 15 ی قانونی تەسجیلی نفوس دا دەرج کراوە. مودیری نفوسـی عام" (ژ 113).

"ئیعلان: وا دەرئەکەوێ ئەهالی موراجەعەت بە دائیرەی نفوس ناکەن بۆ وەرگرتنـی دەفـاتیری جنسـیە لازمە هەمو ئەهالی موراجەعەت بە دائیرەی نفوس بکەن و دەفاتیری جنسیەی خۆیان وەربگرن. بۆ ئاگـاداری ئیعلان کرا. موتەسەرپیفی سلێمانی" (ژ 127).

## 9. ئیعلانی ئەهلی

"ئیعلان: ئەمجارە لە سەر ئوسولێکی تازە، عەسری، چاپخانەی (ئەستێرە گەشەی گەلاوێژ) کە لە پێشا بە چاپخانەی حەمە ئاغا مەشهور بو، کردومەتەوە. هەمو موبیلە و ئەسبابێکی مونتەزەمە. ئەنواعی حەلەویات، دۆندرمە، شروب، چای، قاوە، سۆدە و ناملیتمان هەیە. بە دانیشتنێکی بە قەدەر سیاحەتێ دڵ موفەڕەح و مەسرور ئەکات. چایچی: محەمەد رەشید" (ژ 108).

"موئەسەسەیەکی گەورەی بریتانیا

شیرکەتی مەحدودەی نەوتی خانەقین

وەکیلەکانی کوردستان: خواجە عەزرا، سیون یەعقوب و شەرەکای

لە سلێمانی‌دا لە جادەی دەباخانە لە ماڵی حاجی عارفی دەباخچی‌دا کە مەوقیع و ئەنباری ئەسلی‌یەتی فیاتی وەکو لای خوارەوەیە:

تەنەکەی نەوتی سپی بە 3 روپیە.

نەوتی سپی عەلامەتی ئەبونەخلە تەنەکەی بە 4 روپیە و 14 ئانە.

بانزین تەنەکەی بە 5 روپیە و 6 ئانە.

نەوتی رەش تەنەکەی بە 2 روپیە و 2 ئانە.

ئەو نەوت و بەنزینەی کە لە مەملەکەت دا لە جادەی سەرا لە ماڵی شاکیر موجریم و لە گەراجی سەید نوری نەقیب ئەکڕڕێ لە قیمەتی سەرەوە بە 2 ئانە زیاد ئەفرۆشرێ.

بێ تەنەکە قاپی نەوتی سپی بە 2 ئانە دەفرۆشرێ.

لە سلێمانی: وەکیلی قومپانیەی شیرکەتی نەوتی خانەقین فەیزی" (ژ 128).

"ئیعلان: ئەوەل ئۆتۆمۆبێلچیەک کە تا نەفسی هەڵەبجە موسافیرینی برد بێت ساحیب (ئەربیل- 22) نومرو ئوتومبیلە. لەمەودوا هەرکەسێ ئارەزوی سەفەری هەڵەبجەی هەیە موراجەعەت بە ساحیبی ئوتومبیلی مەزکور قەرەبێت بکات، تا نەفسی هەڵەبجە لە ڕێیەکی زۆر چاکەوە ئەیبات و مەمنونی ئەکات." (ژ 81).

"دقتۆر ئارنو کرنون

دقتۆری خەستەخانەکانی پاریس (فرانسە) و لۆزان ئیسویچەرەیە

دەرمانی هەمو نەخۆشێک ئەکات. خاسەتەن نەخۆشی داخلی (مەعیدە، ریخۆڵە، دڵ و سی و جگەر) و نەخۆشی ئەعسابە.

تەداوی هەمو نەوع نەخۆشی ژنانیش ئەکات.

محەلی موعایەنەی لە جادەی بەرپۆلیسخانە لە ماڵی تۆفیق ئەفەندی مەحمود ئاغادایە کە مەشهورە بە ماڵی حەمزە بەگ.

هەمو رۆژێ لە ساعەتی 8 ەوە هەتا 11 موعایەنە ئەکات." (ژ 123).

## پێشەکی*

### - 1 -

ڕۆژنامە کوردی یەکانی ساڵی 1920–1931 کە لە سلێمانی دەرچون، سەرچاوەیەکی گرنگ و پڕ بایەخن بۆ لێکۆڵینەوەی ڕوداوەکانی ئەو سەردەمەی عیراق و کوردستان. هـەواڵ، سـەروتار، وتـار، لێدوان، تەنانەت هەندێ شیعریان تێدایە کە سەرچاوەی بـەنرخن بـۆ زانینـی دەنگوبـاس و بیـروڕای گشتی ئەوکاتە.

نوسەرانی کورد، ئەوانەی لەسەر ئەم قۆناغەیان نوسیوە، هەمویان کەم و زۆر کـەڵکیان لـێ وەرگرتـون. بەڵام نوسەرانی عەرەب، بەتایبەتی ئەوانـەی لـەم سـاڵانەدا لێکۆڵینـەوەی ئاکـادیمی‌یـان لەسـەر مێـژوی عیـراق نوسیوە بۆ (جامیعە) کانی عیراق، کەسیان نەیانتوانیوە کەڵکیان لێ وەربگرن. هۆی ئەوە یش ڕەنگە نەزانینی زمانی کوردی بوبێ.

ئەو باسەی من هەڵمبژاردوە، ڕوداوەکـانی سـاڵانی 1928– 1931 ئەگرێتـەوە. پشـت ئەسـتورە بـە ڕادەی یەکەم بە نوسینەکانی ڕۆژنامەی ژیان و، بـە هەنـدێ سـەرچاوەی جۆراوجـۆری تـر دەوڵەمـەن کـراوە. (ژیان) درێژەی ڕۆژنامەکانی پێش خۆیەتی: (پێشکەوتن) کـە دەسـەڵاتی ئینگلیـز و، (بـانگی کوردسـتان) کـە مستەفا یامڵکیو جەمعییەتی کوردستان و، (ڕۆژی کوردسـتان) و (بـانگی حـەق) و (ئومێـدی ئیسـتیقلال) کـە حکومەتەکەی شێخ مەحمود و، (ژیانەوە) و (ژین) کە شارەوانی سلێمانی دەریان کردون.

ئەم ڕۆژنامانە کە ئێستا زۆر بە زەحمەت و بە ناتەواوی بەردەس ئەکەون، ئەهێنێ بـە ڕیـز سـەرلەنوێ چاپ بکرێنەوە و لێکۆڵینـەوەی هەمەلایەنـەی سیاسـی، ئـەدەبی، ڕۆشـنبیری‌یان لەسـەر بکـرێ. (تێبینـی: ئـەم بۆچونە هی کاتی چاپی یەکەمی ئەم کتێبەیە. بنکەی ژین تا ئێستا هەمو یان زۆربەیانی بە لێکۆڵینەوەوە سـەر لە نوێ چاپ کردۆتەوە).

یەکەم ژمارەی (ژیان) لە (21 ی کانونی دوەمی 1926) دا لەباتی (ژیانەوە) دەرچوە. حەفتەی جارێک لە (چاپخانەی بەلەدیە) کە هی شارەوانی سلێمانی بـوە، چـاپ و بـڵاو کراوەتـەوە. چـەن جـارێ بەڕێوەبـەر و

* ئەم بەشەی ئەم کتێبە پێشتر، ساڵی (2000) بەم ناونیشانە: (کوردستانی عیراق، سەردەمی قەڵـەم و موراجـەعات، 1928- 1931) بە کتێبێکی سەربەخۆ چاپ و بڵاو کراوەتەوە.

سەرنوسەری گۆراون. ئەو ماوەیەی کە من وەکو سەرچاوە کەڵکم لێ وەرگرتوە، عەلی عیرفان بەرێوەبەری بوە. بۆ ئەمە یش دو بەڵگە بە دەستەوەیە:

1. لە ژمارەی (82) ی رۆژی (20 ی 9 ی 1927) دا (ژیان) لە ژێر ناوی (تەشەکورات و رجا) دا لەم بارەیەوە نوسیوێتی:

"چونکە جەنابی ئەدیب ئەفەندی مودیری مەتبەعەی ژیان تەعیین کراوە بە کاتبی مالیەی سلێمانی لەبەر مەشغوڵییەتی عەلاوەی نەیئەتوانی ئەم وەزیفەیەش ئیفا بکات، ئیستیعفای کرد.

"لەسەر تەنسیب و ئەمری موتەصەریفی مەعالیهیمەم بەندە بۆ ئیفاکردنی ئەم وەزیفەیە تەنسیب و تەعیین فەرموراوم. چونکە مەتبەعە واسیتەی تەرەقی وەتەنەو غەزەتەیش زبانی حسسیات و تەرجومانی ئامالی میللەتە مەعەل ئیفتیخار ئەم وەزیفەیەم قوبوڵو دەرعوهدە کرد.

"بۆ خاتری غەزەتەکەمان رۆژ بە رۆژ تەرەقییەک پێ نیشان بدا و بۆ ساحەی مەدەنییەت هەنگاو بهاوێ ئیستیرحام لە هەمو منەووەران و ئەدیبان ئەکەم لە ناردنی مەقالەو شیعر غەزەتەکەمان بێ بەش نەهێڵنەوە.
عەلی عیرفان".

2. یەکێ لەو کەسانەی کە لە ئازاری 931 دا وەکالەتنامەیەکیان بۆ تۆفیق وەهبی ئیمزاکردوە، تا بە نوێنەرایەتی گەلی کوردی کوردستانی خوارو لەسەر مافی نەتەوەیی کورد لەگەڵ کۆمەڵەی گەلان و حکومەتی بریتانی گفتوگۆ بکا، ئەم بو. جێگەی خۆشییە بۆ رۆژنامەوانی کورد کە (3) کەس لەوانەی ئەم وەکالەتنامەیەیان لەو رۆژگارەدا ئیمزاکردوە رۆژنامەوان بون: عەلی عیرفان، بەرێوەبەری (ژیان)، مستەفا شەوقی خاوەنی گۆڤاری (پەیژە) و، حسێن حوزنی خاوەنی گۆڤاری (زاری کرمانجی).

عەلی عیرفان، کوڕی مەلا عەبدوڵڵای عیرفان و برای جەمال عیرفان بوە. جەمال عیرفان لە رۆشنبیرە هەڵکەوتوەکانی ئەو زەمانە بوە. لە سەرەتای بیستەکاندا لەسەر بیری ئازاد لە سلێمانی کوژراوە.

- 2 -

پرۆژەی ئەم کارە ئەبو 3 بەرگ بێ:

1. کوردستانی جنوبی لەژێر دەسەڵاتی ئینگلیزدا 1918– 1922
2. کوردستانی عیراق (شۆڕشی چەکدار) 1923– 1927
3. کوردستانی عیراق (سەردەمی قەڵەم و موراجەعات) 1928– 1931

ئەگەر بەتەمای تەواوکردنی هەموی بومایە ئەبو ماوەیەکی درێژ چاوەڕێ بم. لەبەر ئەوەی کتێبەکەی مامۆستا هاوار: (شێخ مەحمودی قارەمان) دەرچو، وای لێ کردم جارێ چاو لە تەواوکردنی بەرگی یەکەم و دوەم بپۆشم و خەریکی بەرگی سێیەم بم کەوا لەبەر دەس دایە.

ئەو کارەی من ناتەواوە، لەپێش هەمو شتێکدا لەو روەوە کە هیچ بەڵگەی (ملفات البلاط) ی تێدا نیە. زۆر کەم لێدوانی رۆژنامە عەرەبییەکانی بەغداد یشی تێدایە. ئەگەر لەبەر دەسدا بونایە، بێگومان ئەم کەشکۆڵەیان دەوڵەمەن ئەکرد. لەوانە بو هەندێ گۆشەی تاریکی مێژوی ئەو قۆناغەیان بۆ رۆشن بکردینایەتەوە. بەڵام لام وایە: کار ئەگەر ناتەواو یش بێ بکرێ باشترە لەوەی کە هەر نەکرێ. بۆیە لەسەر تەواوکردنی کارە ناتەواوەکەم را نە وەستاوم.

- 3 -

لە ژیانی سیاسی خۆمدا چەند جارێ توشی کەسانێ بوم، لایان وابوە کوردایەتی لەو رۆژەوە دەس پـێ ئەکا کە ئەوان دەستیان پێ کردوە. ئەم بەڵگانەی لەم کەشکۆڵەدا کۆکراونەتەوە، نیشانەی تێکۆشـانی کـوردن. بـە شـێوەی جۆراوجـۆرو لـە مەیـدانی جیـاوازدا، لـە قۆنـاغێکی دیـاریکراوی گۆشـەیەکی تـەنگی نیشـتمانە فراوانەکەماندا، لە پێناوی مافەکانی گەلی کورد کە ئێستا ناوی هەندێ لە چالاکەکان و بەشدارەکانی نەک هـەر لەبیر چۆتەوە، بگرە کوێر یش بۆتەوە.

لە خۆپیشاندانی بەردەرکی سەرای سلێمانیدا، هەزاران کەس بەشدار بون، لەوانـە دەیانیـان کـوژران و دەیانیان بریندار کران و دەیانیان گیران و سزادران. کێ ئەزانێ ئەوانە کێ بون؟.

لەو هەوڵە سیاسی‌یەدا کە سەدان کەس داویانە لە گەڵ بیلاتی شاهانەی عیراق و حکومـەتی بریتـانی و کۆمەڵەی گەلاندا، بە مەزبەتە و عەریزە و نامە و بروسکە، بۆ داننان بە مافی نەتەوەیی کورد دا. لەسـەر ئەمـە، دەیان کەس لەوانە توشی کێشەو نانبران و دورخرانەوە و زیندان بون. کێ ئەزانێ ئەوانە کێ بون؟.

شێخ مەحمود کە دواجار کەوتەوە سەرکردایەتی خـەباتی سیاسـی چەکـداری کـورد، ئـەو هێـزەی لـەو شۆڕشەدا لە گەڵی بو، لە (400) کەس زیاتر بو، لەوانـە هەنـدێکیان کـوژران و هەنـدێکیان برینـدار بـون و هەندێکیشیان گیران. کێ ئەزانێ ئەوانە کێ بون؟

هاوزەمان لەگەڵ ئەم هەوڵانەی کوردستانی عیراقدا، لە سوریا کۆمەڵەی خۆیبـون دامـەزرا. لـە تورکیـا شۆڕشی ئاگری دەستی پێکرد و بە دڕندانەترین شێوە دامرکێنرایەوە. لە ئێران سمکۆ بە فێڵ راکێشرایە نـاو داوی مردن و کۆتایی بە جوڵانەوەکەی هات.. کێ ئـەزانێ چالاکـەکان و بەشـدارەکانی ئـەم جوڵانەوانـە کـێ بون؟.

رەنگە کەم گەل هەبێ ئەوەندەی کورد لەم روەوە کەمتەرخەم بو بێ. سەرەرای ئەمە یـش هەنـدێ جـار، هەندێ کۆلکە خوێندەواری خۆ بەرۆشنبیر زان، لە نەزانی‌یەوە بـە ناهۆشـیاری یـان لـە قـین دا بـە ئەنقەسـت رابردوی گەلەکەیان و ناوی هەندێ لە چالاکەکانی بزوتنەوەکەی، بە نارەوا ئەشێوێنن.

هیوادارم ئەم هەوڵەی من بەشدارییەکی بچوک بێ لە باسکردنی تەقەللا و زیندوکردنەوەی یـادو نـاوی هەندێ لەوانەی لەو قۆناغەی خەباتی کوردا بەشدار بون و ئێستا گومناون. ئەگەر بەم کارەم توانیبێتم خزمەتێ بکەم، بێگومان بە بەختیاری‌یەکی گەورەی ئەزانم.

- 4 -

هەندێ لە ناوی کاربەدەستانی ئینگلیز وەکو: کۆرنوالیس، هۆلت، ئیدمۆندز، لاین، گاون، ئالبن و دەیـان ناوی تر.. کە لـە نـاو روداوەکـانی کوردسـتانی عیـراقدا دوبـارە ئەبێتـەوە، ئەگـەرچی لـەو قۆناغـەدا دەوری کاریگەریان لە دیاریکردنی چارەنوسی سیاسی کوردی عیراقدا هەبوە، بەڵام ئەمانە لـە کۆمـەڵی ئینگلیـز و لـە مێژوی وڵاتەکەی خۆیاندا کەسانێک نین باس بکرێن و بناسـرێن. لـە چـاو داودەزگـای گـەورە و فراوانـی ئیمپراتۆریەتی بریتانیدا فەرمانبەر و موچەخۆری بچوک و نەناسـراو بـون، بـەڵام لـە بـەختی رەشـی کـوردا ئەمانەی لێ بون بە ملۆزمی دەسەڵاتدار و بڕیار بەدەس.

- 5 -

یەکێ لە کێشەکانی نوسینەوەی وتارەکانی ئەو کاتە، کێشەی نوسینی وشە عەرەبی‌یەکانـە. بـۆ نمونـە: عصبة الامم، مندوب السامي، رئيس الوزراء، بناء عليه، مرعى الاجراء.. ئەبێ چۆن بنوسرێن؟ ئەمانە:

1. خۆیان چۆن بە ئیملای عەرەبی نوسراون، وەکو خۆیان بنوسرێنەوە؟ عصبة الامم، منـدوب السـامی، رئیس الوزراء.. وەکو چۆن لە زمانی عەرەبی‌دا ئەنوسرێن، لە مەتنی کوردییش‌دا بەهەمان ئیملا بنوسرێن؟

2. یان بە ئیملای کوردی بنوسرێن بێ ئەوەی دەسکاری حەرفە عەرەبی‌یەکان بکرێ؟ بەڵام ئەوسا یش دیسان کێشەیەکی تری نوسین دێتە پێشێ: عصبە الامم، بکرێ بـە عیصـبەتول ئومـەم، عیصـبەت ئـەل ئومـەم، عیصبەت ئەلئومەم، عیصبەتولئومەم..

3. یان حەرفەکانی (ض) و (ظ) و (ذ) بکـرێن بـە (ز) و (س) و (ژ)، (ص) بکـرێ بـە (س)، (ط) بـە (ت).. ئەوسا: عصبە الامم ئەبێ بە عیسبەتەل ئومەم، عیسبەت ئەلئومەم، عیسبەت ئەل ئومەم...

تائێستا نوسەرانی کورد لەسەر هەڵبژاردنی یـەکێ لـەم ڕێنوسـانە سـا غ نەبونەتـەوە. هـیچ دەزگایـەکی دەسەڵاتدار یش ڕێنوسێکی پەسند نـەکردوە و نەسـەپاندوە. لەبـەر ئـەوە هەرکـەس بـەپێی سـەلیقەی خـۆی ئەینوسێ. ئەوە یش پاشاگەردانی‌یەکی ئاشکرایە. من یش لەم ڕووەوە بە سەلیقەی خۆم ڕێگەی دوەمـم گرتـوەو وشە عەرەبی‌یەکان، بێ ئەوەی حەرفە عەرەبی‌یەکانی بگۆڕم، وەکو خۆیان بە ئیملای کوردی نوسیوەتەوە.

## - 6 -

کێشەیەکی تر، کێشەی وەرگێرانی بەڵگە ئینگلیزی و عەرەبی‌یەکانی ئەو سەردەمەیە. بۆ ئەوەی ناکۆکی لە نێوان مەتنە کوردی‌یەکانی ئەو زەمانە و حەفتەنامەی ژیان و بەڵگەکانی پەیوەندیداردا دروست نـەبێ، ئـەبێ بە چ زمان و زاراوێ تەرجومە بکرێن؟ بەهەمان زمان و زاراوی ئەو زەمانە بنوسین: جمعیـتی اقـوام، وزارتـی مستملکات، حزبی عملە، یان بە زمان و زاراوەی ئێستایی تەرجومەی بکەین و بنوسین کۆمەڵەی گەلان، پـارتی لەیبەر، وەزارەتی کۆڵۆنییەکان.. ئاخۆ ئەمە سەر لە خوێندەوار ناشێوێنی؟ بـۆ ئـەم کێشـەیەش تائێسـتا هـیچ دەزگایەکی دەسەڵاتدار بڕیارێکی لێ نەداوە، هەرکەسێ بە سەلیقەی خۆی ئەینوسێ. من یش هەروام کردوە.

## - 7 -

لێرەدا بە پێویستی ئەزانم کە لە دڵەوە سپاسی بەرێز مامۆستا مستەفا دەلۆیی بکـەم کـە لـە دوسـەرەوە خۆم بە قەرزاری ئەزانم. چونکە بیری کۆکردنەوەی ئەم کەشکۆڵە و لێدوانی باسەکانی، بەهۆی ئەو فایلەوە لـە لای من دروست بون کە لە هاوینی 1995 دا لە سـلێمانی دایمـێ. هـەروەها بەشـێکی گرنگـی بەڵگـەکان بـە تایبەتی لێدوانی ڕۆژنامـە عـەرەبی‌یـەکان، مـەحزەری کۆبونـەوەکانی مەجلیسـەکانی نـواب و ئـەعیان، هـەردو بەیاننامەی خۆپیشاندانەکانی سلێمانی لەو فایلەوە وەرگیراون. ئەمە سەرەرای ئەوەی کەڵکێکی زۆریشـم دیـوە لە لێدوانەکانی ئەو و ئەو گفتوگۆیانەی لـە گـەڵ هەنـدێ بەشـدار و شـایەتەکانی ڕوداوەکـانی ئـەو سـەردەمە کردونی.

# 1. کورد و پارلەمانی عیراق

## 1. 1. مەجلیسەکان

### 1. 1. 1. مەجلیسی تەئسیسی

لەکاتی هەڵبژاردنی مەجلیسی تەئسیسی‌دا، بەشێکی کوردستان بە تایبەتی ناوچەکانی سلێمانی‌و کەرکوک، بەهۆی جوڵانەوەکانی شێخ مەحمودەوە نا ئارام بو. رەوتی هەڵبژاردن، وەکو حکومەتی بریتانیا ئەیویست نەرۆیشت. لەبەر ئەوە ئەوانەی ویستیان لەباتی سلێمانی لەم هەڵبژاردنەدا بەشدار بن، بانگ کران بۆ کەرکوک.

ئەرکی سەرەکی مەجلیسی تەئسیسی پەسندکردنی پەیماننامەی عیراقی- بریتانی و، دانانی (قانونی ئەساسی عیراق) بو کە بەرنوسی هەردوکیان، لەلایەن کاربەدەستانی بریتانی‌یەوە ئامادە کرابون. ئەگەرچی لەناو مەجلیس‌دا تاقمێ لە نائیبەکان دژی پەسندکردنی پەیمانەکە بون، بەڵام لەسەر هەڕەشەی مەندوبی سامی، مەلیک فەیسەڵ بە نیوەشەو زۆری نائیبەکانی کۆکردەوە. ئەندامانی مەجلیس بە زۆرایەتی دەنگ پەیمانەکەیان پەسند کرد. نائیبە کوردەکان هەمویان بە قازانجی پەسندکردنی، دەنگیان دا.

ئەگەرچی لەم مەجلیسەدا چەندین پیاوی ناسراوی کورد ئەندام بون، بەڵام پێناچێ کەسێکیان بە قازانجی کورد و سەلماندنی مافە نەتەوەیی‌یەکانی قسەیەکیان درکاندبێ.

لەم مەجلیسەدا و لە هەمو مەجلیسەکانی دوای ئەمیش‌دا کورد بەشدار بو. بەڵام وەکو تۆفیق وەهبی لە یادداشتەکەی‌دا بۆ کۆمەڵەی گەلان نوسیوێتی: ژمارەی نائیبەکانی کورد لە مەجلیسی نوابدا لە چاو ژمارەی دانیشتوانی کوردستان‌دا زۆر کەمتر بوە. لە (88) نائیب تەنیا (11)یان کورد بون.

لەپاڵ مەجلیسی نوابدا مەجلیسی ئەعیان یش دامەزرێنرا. نیوەی ئەندامانی ئەم مەجلیسە لەلایەن مەلیکەوە دائەنرا. لەمیش‌دا ژمارەی کورد کەم بوە. لە (20) عەین تەنیا (2)یان کورد بون.

### 1. 1. 2. گلەیی لە نائیبەکانی کورد

رۆژنامەی (ژیان)ی سلێمانی لەسەر ئەم نائیبانە، بەوپەڕی توندی‌یەوە لە سەروتارێکی‌دا نوسیوێتی: "ئەمە 3 دەورەی ئیجتماعییەی موهیمی نیابییەیان تێ پەڕان، کەچی میللەت لە ئێوە بە تەواوی سەعییەک و فەعالییەتێکی نەدی".

ئەگەرچی لە ژمارەیـەکیتریدا لەسـەر ئـەم وتـارە، پۆزشـی بـۆ نائیبـە کوردەکـان هێناوەتـەوە، بـەڵام لـە وتارەکانی دواتریدا، بەتایبەتی لەکاتی هەڵبژاردنی خولی تـازەدا، بـەر ڕەخنـەی تونـدوتیژی داون و نوسـیویێتی: "ئەمڕۆ لیواکانی کـورد دواکـەوتوی هـەمو عیراقـە. ئەمـەیش بـە واسـیتەی مەبعوسـەکانمانەوە بـو، چونکـە ئـەو مەبعوسانەی کە لە ئـەوەڵ دەورەدا ئینتیخابمـان کـردن، هـەموی نـا، فەقـەت بـە ئەکسـەرییەت هـیچ ئەوصـافێکی مەبعوسیان تیا نەبو. پیاوی ئەو مەجلیسە نەبون. هەریەکێکیان بۆ مەنفەعەتی خسوسی خۆیان مەنفەعەتی عمـومی میللەتەکەیان واز لێ هێنا بو، بۆ خاتری خۆیان گەورە بین هەر یەکە ئینتیسابی کرد بو بە یەکێ لـە وەزیرەکـان و پیاوە بەدەستەکانی ترەوە. عادەتەن وەکو مادونێکی ئەوان تابیعی هەمو ئەفکارو ئەوامیریان بون هەتا نەتیجـە وا دوایان خستین و لە هەمو ئەسبابێکی تەرەقی مەحرومیان کردن." ژیان، ژ103، 23 ی 2 ی 1928

### 1. 1. 3. **هەڵبژاردنی** 928

لە جەنیوەری 1928 دا مەلیک فەیسەڵ بۆ دوەمین جار داوای لە عەبدولموحسـین ئـاڵ سـەعدون کـرد وەزارەت پێک بهێنێ. لەو کاتەوە کە بوبو بە مەلیکی عیراق (1921) تا ئەو کاتـە (1928)، ئـەوە شەشـەمین وەزارەت بو لە مێژوی دەوڵەتی تازە دامەزراوی عیراقدا، لەسەر تەکلیفی مەلیک فەیسەڵ پێک بهێنـرێ. مـەلیک فەیسەڵ وەزارەتەکانی زو زو ئەگۆڕی. نەی ئەویست هیچ کام لە سەرۆکی وەزارەتەکان ماوەیەکی درێژ لەسـەر کار بمێنێتەوە.

سەعدون وەک مەرجی پێشەکی وەرگرتنی ئەم کارە، داوای لە مەلیک کـرد مـەجلیس هەڵبوەشـێنرێتەوە، هەڵبژاردنی تازە بۆ دانانی مەجلیسێکی نوێ بکرێ. بیانویشی بۆ هەڵوەشاندنەوەی ئـەوە بـو: وەزارەتەکـەی ئەو چەند ئەرکێکی قورسی لە ئەستۆدایە، لەوانە: چاوگێڕانەوە بـە پـەیمانی عیراقـی– بریتـانیو ڕێککـەوتنی جەنگیو داراییو، مەسەلەی تەجنیدی ئیجباری. بۆ ئەنجامدانی ئەم کارانە یش پێویسـتی بـە زۆرایـەتییـەکی پتەو و نەگۆڕ هەیە لەناو مەجلیسدا کە پشتیوانی لە وەزارەتەکەی بکا. مەجلیسی کۆن بەهۆی ناکۆکی حیزبـە بەشدارەکان و ناکۆکی ئەندامەکانیەوە، لەرزۆک و نائارام بو.

مەرجەکەی قبوڵ کرا. سەعدون وەزارەتی پێک هێنا. لەو وەزارەتەدا هیچ وەزیرێکی کـوردی تیـا نـەبو. پاش چەند ڕۆژێ لە دامەزراندنی وەزارەتەکەی سەعدون، مەجلیسی کۆن هەڵوەشێنرایەوە. وەزارەتی ناوخۆ بە بروسکە موتەسەڕیفەکانی ئاگادار کرد کە دەسبەجێ دەس بکەن بە هەڵبژاردن.

هەڵبژاردن لە عیراقدا هەمیشە جێگەی ڕەخنە بوە. چونکە حکومـەت هەمیشـە و لـە هـەمو شـوێنێ بـە ئاشکرا دەستی تێ وەرداوە. لـە دیـاری کردنـی نـاوی پاڵێوراوەکـان و لـە دەرچوانـدن و دەرنەچوانـدنیاندا بڕیاردەر بوە.

لەم بارەیەوە جارێک نوری سەعید لە بەردەمی مـەجلیسدا وتویـەتی: "ئـاخۆ لـە تواناداﻳـە، سـوێندتان ئەدەم بە یەزدان، نائیبێ، پایەی لە وڵاتدا هەرچیەک بو بێ و هەرچەندێک خزمەتی دەوڵەتی کردبێ دەربچـێ، ئەگەر حکومـەت نەیـەت بیپـاڵێوێ؟ مـن گـرەو ئەکـەم لـە گـەڵ ئـەو کەسـەدا کـە چەنـد بـە پلـەو پایـەو بـە نیشتمانپەروەری خۆیەوە بنازێ، با ئێستا ئیستیقالە بکا و بڕوا، هـەڵبژاردن ئەکەینـەوە بـەڵام نایخەینـە نـاو لیستەی حکومەتەوە، ئینجا ببینین ئاخۆ ئەم نائیبە پایەبەرزەی کە چەند و چەند لایـەنگری لەپشـتە، ئـەتوانێ دەربچێ بە نائیب؟."

ئەوسا هەمو هاوڵاتییەک مافی دەنگدانی نەبوە. تـەنیا ئەوانـە مـافی دەنگـدانیان هـەبوە کـە خـانو و زەویوزاریان هەبوە. هەڵبژاردن بە دو قۆناغ ئەنجام دراوە. لە قۆنـاغی یەکـەمدا ئەوانـەی مـافی هـەڵبژاردنیان هەبوە (ناخیبی ئەوەلی) تاقمێکیان هەڵبژاردوە (ناخیبی سانەوی)، ئەوان نائیبەکانیان هەڵبژاردوە.

لە شوباتی 1928 دا هەڵبژاردنی (ناخییی ئەوەڵ و سانەوی) تەواو کرا. حکومەت بۆ ئەوەی پاڵێوراوەکانی خۆی دەربچێنێ، لە هەمو جێیەک دەستی خست بوە ناو هەڵبژاردنەکەوە. سەرۆکەکانی یەکە ئیدارییەکان: موتەسەریف، سەرۆکی شارەوانی، قایمقام، مدیری ناحیە.. لەناو ریزی (ناخییە سانەوییەکاندا) بون، بۆ ئەوەی دەرچونی پاڵێوراوەکانی حکومەت مسۆگەر بکەن.

گلەییەکی زۆر هاتە سەر ئەم هەڵبژاردنە. سەدان سکاڵا و شکات بۆ مەلیک و دادگاکان نوسران. سەعدون کە سەرۆکی وەزیران بو، خۆیشی لە رەخنە رزگاری نەبو. ناوی لە لیستەی (ناخییە سانەوی) یەکانی بەغدادا بو، کەچی لەسەر شاری بەسرا هەڵبژێردرا بو بە نائیب. لە کاتێکدا نە خەڵکی ئەوێ و نە دانیشتوی ئەوێ، نە خانو یشی لەوێ هەبو. ئەمە یش پێچەوانەی قانونی هەڵبژاردن بو. بۆ دەمکوتکردنی نارەزایی، سەعدون هەندێ لە رۆژنامەکانی داخست.

### 1. 1. 4. مەجلیسی نواب

لەکاتی ئەو هەڵبژاردنەدا کوردستان ئارام بو. شێخ مەحمود دوای پێکهاتنی لە گەڵ بریتانیا (1927) لە گونـدی پیرانـی سەرسـنوری ئێـران، بە گۆشـەگیری دانیشـت بـو. دەسـتی وەر نـە ئەدایـە نـاو کاروبـاری سیاسییەوە. پێ ئەچێ خـەڵکی کوردسـتان بەتایبـەت لـە ناوچـەی سـلێمانی، هیوایـەکی زۆریـان لەسـەر ئـەم هەڵبژاردنە هەڵچنی بێ، بە گەرمی بەشدارییان تیا کردوە.

رۆژنامەی ژیان لەم بارەیەوە نوسیوێتی: "لەم بەینەدا بە موناسەبەتی ئینتیخاباتی تـازەی مەبعوسـانەوە شاری سلێمانی وەزعیەتێکی عەجایبی بەسەرا هاتوە. لە هەمو کوڵانێک، لە هەمو چایخانەیەک و دیواخانەیـەک قسە و بەحسی مەبعوسی تیکرار ئەکرێتەوە. حەتا دەوائیری حکومەت، ستونی غەزەتە، بەم مەوزوعـە ئیشـغال کراوە. هەرکەسە بە نەوعێک تەشویقات بۆ خۆی وە یا خزمێک و دۆستێکی ئەکات. ئەوانـەی کـە ئیقتیـداری کاتبیەکی دائیرەیەکیان نیە هەوای مەبعوسی کەلەیانی پڕ کردوە. ئەوانەی تا ئەمڕۆ کوردییەت و میللییەتیان پێ عار بوە ئەمڕۆ بەلافی فیداکاری و وەتەنپەروەری گوێی عالەمیان کەڕ کردوە."

"..... زائیرین ئەوەندە زۆر بوە دیوەخانانی پڕ کردوە. ئێمە بیستومانە کە لە کوردسـتانا هـەر گـەزۆ ئەبارێت، نەمانزانیوە کە ئەمساڵ پەڵەی مەبعوسی داوە." ژیان، ژ104، 1 ی 3 ی 1928

لەم هەڵبژاردنەدا زۆر کەس خۆیان ناودێر کردوە، لەوانە هەندێکیان لە هاوکارانی پێشوی شێخ مەحمود بون، وەکو مستەفا پاشای یامڵکی کە لە کابینەی شێخ مەحمودا وەزیـری مـەعاریف و، ماجیـد مسـتەفا کـە تـا ساڵی 1927 یەکێ لە هاوکارە نزیکەکانی بو.

هەڵبژاردن لە سلێمانی و لە شوێنەکانی تری کوردستان، وەک شوێنەکانی تری عیراق بو. سەرۆکەکانی وەحدە ئیدارییەکان نەک ویستی ئازادی دەنگدەرەکان، دەستی بڕیاردەریان هەبو لە هەڵبژاردنی نائیبـەکاندا. لە ئەنجامی هەڵبژاردنەکەی 4 ی 1928 دا چەنـد کـوردێ لـە مەجلیسـی نـوابی عیراقـیدا، بـون بـە نائیـب. رۆژنامەی ژیان بە درێژی لەسەر رابوردوی هەر یەکێکیانی نوسیوە، بە ستایشێکی زۆرەوە ناویان ئەبا.

ئەگەرچی هەندێ لـەم نائیبـە کوردانـە خوێنـدەواری خـاوەن شـەهادە و رۆشـنبیری شـارەزای کاروبـاری سیاسی و بەڕێوەبەرایەتی بون، لەناو کۆمەڵدا خاوەن پلـەی کۆمەڵایـەتی بـەرێز بـون، بـەڵام زۆریـان دانیشـتوی بەغداد و دور بون لە کۆمەڵی کوردەوە. سەرەرای ئەوە یش، هەندێکیان ئەگەرچی بە رێچەڵەک کورد بـون، بـەڵام هەستی نەتەوەیییان تێدا نەبوە. زیاتر لەوەی دڵسۆزی مەسەلەی کورد بـن، بـۆ پارێزگـاری پلـەو پایـەی خۆیـان گوێڕایەڵی ئامۆژگارییەکانی کاربەدەستانی ئینگلیـز و دڵسـۆزی عەرشـی عیراقـی بـون. بـۆ ئـەوەی دڵـی وەلـی نیعمەتەکانیان لە خۆیان نەڕەنجێنن، هەندێ جار دژی خواستە نەتەوەیییەکانی کورد وەستاون.

### 1. 2. هەوڵی نائیبەکانی کورد

له 19 ی 5 ی 1928 دا مەجلیس کرایەوە. پێ ئەچێ لە سەرەتادا زۆر لـە دڵسـۆزانی کـورد ئومێـدی زۆریان لەسەر هەڵبژاردنی ئەم نائیبانە هەڵچنی بێ و بەتەمای دەسـکەوتی زۆر بـوبن. بـەڵام کـە هـیچ جـۆرە چالاکییەکی دیاریان نابێ، لێیان ئەکەونە ڕەخنەو لێدوان.

ژیان یش چەند سەروتارێکی بۆ ڕەخنە لێ گرتنیان نوسیوە. ژیان لەم ڕووەوە نوسیوێتی: "موقابیل بەم وەزیفە موهیمەیەتان و لە حاڵێکا کە ئەزانن میللەتەکەتان ئەمەندە دواکەوتوەو ئەبێ فەوقەلحـەد سـەعی بۆ بکرێت کـەچی مەعەلئەسـەف هـەتاکو ئێسـتا نـە لـە مـەجلیس داو نـە لـە خاریجـەوە بـە نەشـریات و تەشەبوسات کەس خدمەتێکی لـە ئێـوە نـەدیو فەعالیـەتێکتان نەنوانـدو تـەئمینی یـەکێ لـە مەقاصـیدانی میللەتتان نەکرد".

لەو ماوەیەدا نائیبەکان کەوتنە جموجوڵ و پێشکەش کردنی عەریزە.

### 1. 2. 1. کاروباری خوێندن

کاربەدەستانی عیراق، بە بیـانوی نائـارامیو نـەبونی ئاسایشـەوە، کوردسـتانیان لـە هـەمو رویەکـەوە پشتگوێ خست بو. یەکێ لەو مەسەلانەی نائیبەکانی کورد گرنگی‌یەکی زۆریان پێداوە، مەسـەلەی پەرەپێـدانی خوێندن و کردنی بە کوردی بوە. لەم ڕووەوە ئەمین زەکی بەگ دو ڕاپۆرتی گرنگی ئامـادە کـردوە کـە پشـت ئەستور بون بە ژمارە و پاساوی بەجێ.

لە یەکەمیاندا ئەڵێ: "لە لیوای موصل، هەولێر، کەرکوک و سلێمانیدا حاڵی حازر 38 مەکتـەبی کـوردی تیا مەوجودە، لە مەکاتیبی ئیبتیدائیو سانەوی کوردەکانا، لەسەر مینهاجی ڕەسمیی مەعاریف بـۆ 58 مـەوزوع کە مەجبورن تەدریس بکەن تەنها بۆ دەرسێکیان کتێبی کوردی هەیە. بۆ مەوزوعەکانی کە چونکـە کتێـب نیـە تەلەبەکان مەجبورن نۆت بگرن و لەسەر ئەو نۆتانە مـەحکومی سـەعی کـردنن. لاکـین لـە صـینفە ئەولیـەکانا چونکە تەلەبەکان بە تەواوی ناتوانن بنوسن مومکینیان نابێ نۆتێکی صەحیح بگرن.." ژیـان، ژ118، 21 ی 6 ی 1928

لە ڕاپـۆرتی دوەمدا ئـەڵێ: "ئەگـەر تەماشـای واریـداتی لیواکـان بکـەین و موقایەسـەی بکـەین لەگـەڵ مەصاریفێکا کە بۆ مەعاریفیان تەخصیص کراوە لـە سـاڵی 926– 927 دا ئـەبینین ئـەو مەبلەغـەی، کـە بـە غەیری مەکتەبە عومیەکان، بۆ لیوای بەغداد صەرف کراوە عیبارەتە لە 38% بە نەزەری واریداتەکەیـەوە. لـە موسڵ دا 19% لە کەربەلادا هەتا 12.5% لە دلێم دا هەتا 10% لـە کـەرکوک دا 9% لـە دیالـەو بەصـرادا 8% لە مونتەفیک 7% لە کـوت دا 5.4% لـە حللـەو عـەمارەدا 5.3% لـە ئـەربیل دا 3.2% لـە دیوانیـەدا 2.5% لە سلێمانی 1%.

"ئێستا موراجەعەت بە ویجدانی پاک و مونەزەهتان ئەکەم عەجـەبا ڕوسـتە بـۆ مـەعاریفی لیـوای بەغـداد لـە 38% بە نەزەری واریداتەکەیەوە صەرف بکرێ کەچی لە لیوای سلێمانیدا 1% زیاتر صەرف نـەکرێ وە یـا وەکـو ئەبینین لە لیوای دیوانیە و هەولێردا 2.5% یا 3.5% صەرف بکرێ؟" ژیان، ژ 129، 20 ی 9 ی 1928

لە 1 ی 6 ی 1928 دا نائیبەکانی هەولێر: مـەعروف جیـاوک، ئیسـماعیل ڕەوانـدزی، جـەمال بابـان، عەبدوڵلا موفتیو نائیبەکانی کەرکوک: محەممەد سەعید، محەممەد جاف و نائیبەکانی سلێمانی محەممەد صـاڵح، صەبری، سەیفوڵلا خەندان، بە کۆمەڵ یادداشتێکیان دا بە وەزارەتی مـەعاریفی عیـراق. لـەم یادداشـتەدا داوای چاک کردن و گەشەپێدانی خوێنـدن و پـەروەردەیان کـرد بـو لـە جیهـەتی شـیمال دا. کومـەڵێک پێشـنیاری گرنگیان خستوەتە بەردەم کاربەدەستانی ئەو دەمی عیراق، لەوانە:

1. دامەزراندنی دەزگایەکی تایبەتی بۆ سەرپەرشتی کاروباری خوێندن لە لیوا کورد نشـینەکان دا، کـە ناوەندەکەی لە یەکێ لەو شارانەدا بێ.

2. پێکهێنانی لیجنەیەک بۆ دانانی کتێب و، وەرگێرانی کتێبی قوتابخانەکان بۆ کوردی.

3. کردنەوەی فێرگەیەک بۆ پێگەیاندنی مامۆستایان.

4. کردنەوەی قوتابخانە بۆ کچان.

5. کردنەوەی قوتابخانەی سەرەتایی لەو شوێنانەی پێویستن.

6. کردنەوەی قوتابخانەی سانەوی.

## 1. 2. 2. کاروباری ئابوری

کوردستان لەو سەردەمەدا لە هەلومەرجێکی ئابوری دواکەوتودا بوە. زەرەرو زیانی گیـانی و وێرانــی سەردەمی جەنگی جیهانی و، دوای ئەوە یش نائارامی سەرومڕ، لەشکرکێشی و بۆردومان و شـەڕی بـەردەوام، وڵاتەکەی بەجارێ دواخست بو. ئەگەرچی ئەم نائیبانە چەند تەقەلایەکیان دا بۆ ئەوەی بودجەی تەرخان کراو بۆ کردنەوەی قوتابخانە، نەخۆشخانە، ریگاوبان، لە کوردستاندا زیاد بکەن، بەڵام هەمیشە بە بیـانوی نـەبونی پارەوە زۆر لەم پێشنیارانە رەت ئەکرانەوە. لە کاتێکدا بەردەوام سـەرا و مەخفـەری پـۆلیس و سـەربازگەیان دائەمەزراند.

کاتێ باسی دواکەوتنی کوردستان و زۆرلێکراوی کورد ئەکرا، هەندێ لە رۆژنامـەکانی بەغـداد ئـەیان نوسی: ئەم قسانە بێگانە فێری کردون، ئەگینا ژمارەکان پیشانی ئەدەن کە پارەی زۆر لە کوردستان دا خـەرج کراوە. لە وەڵامی یەکێ لەم وتارانەدا کە رۆژنامەی (البلاد) ی بەغدادی لەم بارەیەوە بـڵاوی کردبـوەوە، نـائیبی هەولێر مەعروف جیاوک نوسیویێتی: "ئەو نوسەرە ئەڵێ: وڵاتی کورد، لەو پارەیەی خەزێنـە دەسـتی ئەکـەوێ، پارەیەکی زۆری تێدا سەرف کراوە. با بچێت سـەیری بودجـەی گشـتی بکـا بزانـێ جگـە لـە دروسـتکردنی مەخفەر و قەڵا کورد چی تری لێ دیوە؟ منیش ئەڵێم شارەکانی کـورد شـت کـرین و فرۆشـتنیان هـەر لە گەڵ شارەکانی عیراقە، ئەویش چونکە بە هەرزان دەستیان ئەکەوێ".

تۆفیق وەهبی یش لە یادداشتەکەیدا بۆ کۆمەڵەی گەلان ئەگێرێتەوە، کـاتێ کـە موتەسـەرِیفی سـلێمانی بوە، داوای کردنەوەی نەخۆشخانەیەکی کرد بو، بە بیانوی نەبونی پارەوە داواکـەیان رەت کردۆتـەوە، کـەچی کە موتەسەرِیفی موسڵ لە هەمان ماوەدا داوای دروستکردنی زیندانێک ئەکا، یەکسەر پارەی دروسـتکردنی بـۆ تەرخان ئەکەن. ئەم سیاسەتەی حکومەت دیارە بەم چەند نائیبە نەئەگۆرا، لەبەر ئەوە نەیانتوانی دەسـکەوتێکی ئەوتۆ بە دەس بێنن.

## 1. 2. 3. کاروباری بەرێوەبەرایەتی

لوتکەی چالاکییەکانی نائیبە کوردەکان لە مەجلیسی نوابی عیراقـیدا ئـەو یادداشـتەیە کـە ئیسـماعیل بەگی رەواندزی، جەمال بابان، محەممەد سالح بەگ، سەیفوڵڵا خەندان، حازم شەمدین، محەممەد بەگی جاف، لە مانگی 4 ی 1929 دا داویانە بە سەروەزیران و مەنـدوبی سـامی بریتانیـا لـە عیـراق. لـەم یادداشـتەدا داوا ئەکەن:

1. لیوایەکی تازە بە ناوی لیوای دهۆک لە قەزا کوردییەکانی موسڵ دروست بکرێ.

2. پەروەردەو خوێندنی ناوچە کوردییەکان لە بەغداد و موسڵ جیا بکرێتەوە، دەزگایـەکی تایبـەتییان بۆ دابمەزرێ کە ناوەندەکەی لە یەکێ لە لیوا کوردییەکاندا بێ.

3. لیوا کوردییەکانی عیراق: هەولێر، سلێمانی، کەرکوک و دهۆک لە یەکەیەکی بەڕێوەبەرایەتی‌دا یەک بخرێن. پشکنەرێکی لێوەشاوەی کورد بۆ سەرپەرشتی کردنی دابنرێ، لە ڕێگای ئەم پشکنەرەوە بپەسرێ بە بەغدادەوە.

4. بودجەیەکی تایبەتی بۆ ئەم دەزگایە تەرخان بکرێ.

چالاکەکانی کورد لەو سەردەمەدا جگە لە لیوای دهۆک، داوای پێکهێنانی لیوایەکی تریشیان کردوە لە ناوچە کوردنشینەکانی دیالە و کوت بە ناوی لیوای باجەلانەوە. لەم عەریزەیەدا ئەمان توخنی ئەو باسە نە کەوتون. پێ ئەچێ ئەوە یش بۆ ئەوە بو بێ ئینگلیز نەڕەنجێنن. چونکە هەر لە سەرەتاوە ئینگلیز دژی ئەم پرۆژەیە بوە.

نیشتمانپەروەرانی کورد بە خۆشییەکی گەورەوە ئەم هەواڵەیان وەرگرت. چەندین بروسکەی پشتیوانی‌یان بۆ ناردن. بەڵام ئەم خواستانە نەک هەر لە مەجلیس‌دا باس نەکران و فەرامۆش کران، وەک ئەگێڕنەوە مەلیک فەیسەڵ لەسەر ئەم یاداشتە وتویەتی: "ئەگەر بەدەستم بوایە ئەوانەی ئەمەیان نوسیوە هەڵم ئەواسین!". کاربەدەستانی ئینگلیز یش بە جوڵانەوەیەکی جیابونەوەخوازی‌یان دانا. نائیبە کوردەکان ئیتر تەمێ خواردو بون. بۆ ئەوەی رقی کاربەدەستانی عیراق هەڵنەستێنن، جارێکی تر توخنی باسی لەو بابەتە نە کەوتن.

## 1. 3. کوردو ئینگلیز

### 1. 3. 1. توانجێکی ڕاست بەڵام ناڕەوا

نەتەوەپەرستەکانی عەرەب، هەتا ئێستا یش لایان وایە ئەم داواکاری‌یانە بە هاندانی ئینگلیز بوە. بۆ ئەوەی هەڵوێستی حکومەتی عیراق لە گفتوگۆکانی‌دا لە بەرامبەر ئینگلیزدا لاواز بێ، ناچار بێ مەرجە قورسەکانی قبوڵ بکا. بێگومان ئەمە تۆمەتێکی بێ جێیە، چونکە:

یەکەم: دەوڵەتی عیراق، خۆی لە بنچینەدا دروستکراوی ئینگلیز بو. هەر ئینگلیز یش لەسەر پێ ڕایگرت و لە هەڕەشەی ناوەکی (کورد و شیعە) و دەرەکی (تورک) پاراستی.

دوەم: خواستەکانی کورد ڕەوا بون. ئەگەر ئەوان داواکانی کوردیان بسەلماندایە، ئەیانتوانی بە هەڵوێستێکی بەهێزەوە لە بەرامبەر ئینگلیزدا ڕا بوەستن. داوای نائیبە کوردەکان لە پارلەمانی عیراق بۆ بایەخدان بە خوێندەواری و، کردنەوەی قوتابخانە و کردنی کتێبی قوتابخانەکان بە کوردی، چ زیانێکی لە گەلی عیراق و نەتەوەی عەرەب ئەدا؟. یان یەکخستنی ناوچە کوردنشینەکان و هەبونی جۆرێ لە بەڕێوەبەرایەتی ناوخۆ لە ژێر دەسەڵاتی ناوەندیی عیراق‌دا، چ زەرەرێکی بە سەربەخۆیی عیراق و قازانجەکانی نەتەوەی عەرەب ئەگەیاند؟. بەڵام ئەوانە هەمیشە (تەنازول)یان بۆ ئینگلیزو هێزەکانی دەرەوە پێ سەربەرزانەتر بوە لە (تەنازول) بۆ کورد.

ئەم قسەیە لە ناو کورد یش‌دا دەنگی داوەتەوە. زۆر کەس لە ڕۆشنبیرانی ئەو زەمانە بەدگومان بون لە هەندێ لە سیاسی‌یە چالاکەکانی کورد. لایان وابوە ئەو کارانە بە فیتی ئینگلیز ئەکەن بۆ ئەوەی بە وەزیفەیەکی گەورە پاداشتیان بدەنەوە، یان کێشەیەک دروست ئەکەن بۆ ئەوەی سەرنجی ئینگلیز بەلای خۆیاندا ڕا بکێشن، تا ناچار بن بە دامەزراندنیان لە دەزگایەکی حکومەتی‌دا دەمکوتیان بکەن. بێکەس لەم بارەیەوە وتویەتی:

بێتو بەینی... و... زەڕڕیەک تێک چێ ئیتر
مەسئەلەی کوردایەتی ئەوسا بەجارێ خەست ئەبێ!
دیارە بێکەس مەبەستی لە تێکچونی بەینی عەرەب و ئینگلیز بوە.

یەکێ لەو توانجانەی نوسەرانی عەرەب لە کوردی ئەگرن، ئەوەیە نائیبە کوردەکان لە پارلەمانی عیـراقدا لە کاتی دەنگداندا هەمیشە دەنگیان بەو پرۆژە و پەیمان و ڕێککەوتننامانە داوە کە بە قازانجی ئینگلیز بـون. پێداچونەوەی لیستی ناوی دەنگدەرەکان، ڕاستیی ئەم قسـەیە ئەسـەلمێنێ. بـەڵام ئەمـە تـوانجێکی ڕاسـتە بـۆ سەلماندنی بەدگومانیەکی نارەوا.

1. هەڵوێسـتی نەتەوەپەرسـتەکانی عـەرەب، چ ئەوانــەی کاربەدەسـت و سیاسـی بـون، چ ئەوانــەی ڕۆژنامەوان و نوسەر، لە مەسەلەی کوردو خواستە نەتەوەیی‌یەکانی دۆستانە نەبوە، بەڵکو گـرژ و تونـد بـوە. ئەمە یش ترسێکی ڕەوای لەلای کورد بـە گشـتی دروسـت کـردوە کـە ئەگـەر کاربەدەسـتانی عـەرەب چـاوی ئینگلیزیان لێ دیار نەبێ، ئەوا کورد ئەفلیقێننەوە. تورک چی بەسەر ئەرمەنی‌و کـورد هێنـاوە، عـەرەب ئـەمان یش بەهەمان دەرد ئەبا. ڕۆژنامە عەرەبی‌یەکانی بەغداد لەم جۆرە هەڕەشانەیان ئەدا بـە گـوێی کـوردا. لەبـەر ئەوە بۆ پاراستنی خۆیان کە لایەنی لاوازو ژێردەستە بون، لە چەوسـاندنەوەی عـەرەب کـە لایـەنی بـەهێز و دەسەڵاتدار بوە، بون و مانەوەی ئینگلیزیان لە عیراق دا بـە پێویسـت زانیـوە. لـەم ڕوانگەیـەوە بـە قـازانجی ئەوان دەنگیان داوە.

2. ئەوانەی بون بە نائیب و عەین، ئەگەرچی زۆریان لەناو شوێنەکانی خۆیاندا، پیاوی ناسـراو و خاوەن پلـەو پایـەی کۆمەڵایـەتی بـون، بـەڵام هیچکـام لـەم نائیبانـە بـە ئـازادی لەلایـەن کـورد خۆیـەوە هەڵنەبژێردراون. بە یارمەتی ئینگلیز و بە هـۆی ئەوانـەوە گەیشـتونەتە مەجلیسـەکانی نـواب و ئـەعیان. لەمەدا خۆیان بە قەرزاری ئینگلیز زانیوە، نەک بە هی گەلی کورد یا بە هی گەلی عیراق. بۆ دانـەوەی ئـەم قەرزە و دەستەبەرکردنی دەرچونەوەیان لە خـولی داهـاتوی هـەڵبژاردندا، دەنگیـان بـە قـازانجی ئینگلیـز داوە.

### 1. 3. 2. هەڵوێستی ئینگلیز لە خواستەکانی کورد

هەڵوێستی ئینگلیز بە ڕونی لەو نامەیەدا دەرئەکەوێ کە (کیلبێرت کلایتن) ی مەندوبی سامی بریتانی لە بەغداد، دەربارەی عەریزەی نائیبەکانی کورد لە 20 ی 4 ی 1929 دا، واتە دەسـبەجێ دوای پێشکەشـکردنی، بۆ سەرۆکی وەزیرانی عیراقی نوسیوە و بە ڕاشکاوی ئەڵێ:

"...لە بەر ئەوە، من لام وایە کە شتێکی بنەرەتی‌یە هـەر ئارەزویـەک بـەرە و جیابونـەوەخوازی لـەناو ئەرزەیەکی هەر بەشێکی تایبەتی ئەم نەتەوەیەدا هەبێ دابمرکێنرێتەوە...".

بە پێی تێگەیشتنی مەندوبی سامی، خواستەکانی ناو عەریزەکە دو جۆرن:

یەکەمیان ئەوانەن کە پێوەندی‌یان بە خوێندن و پەروەردە هەیە. دوەمیان ئەوانەن کە پێوەنـدی‌یـان بـە یەکخستنی لیوا کوردی‌یەکانەوە هەیە لە بەڕێوەبەرایەتی‌یەکی نیمچە ئۆتۆنۆمدا. بیرورای خـۆی، کـە بێگومـان بڕیاردەر بوە لە سیاسەتی حکومەتی عیراقیدا، بەم جۆرە ڕون کردۆتەوە:

"دەربارەی خاڵی یەکەم، من هەمو هاودەردی‌یەکم هەیـە لە گەڵ ئـارەزوی کوردەکـاندا بـۆ گەشـەپێدانی پەروەردە کە تایبەتمەندی‌یان بپارێزرێ لەناو سنوری ئەو بەڵێنانەدا کە پێشتر لەم نامەیەدا باسم کـردن. بـەڵام من هیچ بیانویەکم نیە، باوەڕ بەوە بکەم کە حکومەت درێخی کردوە لە لێکۆڵینەوەی بەرژەوەندی‌یەکانی کـوردا لەم بارەیەوە لەناو سنورە تەسکەکانی توانای داراییدا. شتێکی ئاشکرایە لە دۆخی دارایی ئێستای دەوڵـەتدا، مەحاڵە بتوانێ هەمو پێویستی‌یەکانی پەروەردە لە وڵاتدا بە تەواوی جێبەجێ بکا و ئەمە تـەنیا کـاتێ ئـەکرێ کە گەشەکردنی ئابوری بوژانەوەیەکی گەورە و پارەی پێویسـت پەیـدا بکـرێ بـۆ دامەزرانـدنی سیسـتەمێکی تەواوی پەروەردە، کە هەمومان بە ئاواتی ئەخوازین.

خاڵی دوەم، شتێکە ئەبێ حکومەت بـە پـێی پێویسـتیـیـەکانی کارامـەییو گونجـانی بەڕێوەبەرایـەتی مامەڵەی لە گەڵ بکا. بەڵام وەکو سەرەتایەکی گشتی دژی دانانی هەر ڕێوشوێنێکم کە بەرەو جیابونەوەخوازی بچێ نەک یەکێتی، من لام وایە کە باشترین قازانجی نەک هەر هی دەوڵەت بەگشـتی بـەڵکو هـی کـورد یـش بەتایبەتی، لەوەدایە کار بکەن بۆ پشت بەستن بە یەکتری و هاوکاری نزیکتر...".

مەندوبی سامی بۆ ئەوەی ڕێ لـە هـەر هـەوڵێکی تـر یـش بـبـرێ کـە ڕەنگـە لای وەزارەتـی دەرەوەی حکومەتی بەریتانی بدرێ، لە نامەیەکـدا کە بۆ ئەم مەبەستە بۆ بەرپرسی کاروباری ڕۆژهەڵاتی نوسیوە، ئەڵێ: "لەم دواییانەدا بزوتنەوەیەکی جیابونەوە خوازانـە لـە لیـوا کـوردییـەکانـدا سـەری هەڵداوەتـەوە کـە خـۆی نواندوە لە ژمارەیەک عەریزەدا کە دراون بە مەلیک، سەرۆکی وەزیران و من...".

مەندوبی سامی لە گەڕانەوەیدا بۆ عیراق، یەکێ لەو باسـانەی لـە نـاو گفتوگۆکـانیدا لە گەڵ سـەرۆکی وەزیرانـی تورکیـا و وەکیلـی وەزیـری دەرەوەی کـردوە، کێشـەی کـورد بـوە. لـەو ڕووەوە بـە ڕاشـکاوی بـە کاربەدەستانی تورکیای وتوە کە سیاسەتی بەریتانی لە عیـراقدا ئەوەیـە: "کـورد هـان بـدەن وەکـو هـاوڵاتی دڵسۆز و ڕازی لەناو دەوڵەتی تازەی عیراقدا بژین"و، ئـەڵێ: "بیـری دامەزرانـدنی کوردسـتانێکی سـەربەخۆ شتێکی گەوجانەو لە کردن نەهاتوە. هەر واتەواتێک دەربارەی ئەوەی کە حکومەتی خاوەن شـکۆ هـانی شـتی وا ئەدا درۆیە...".

## 1. 4. بەڵگەکانی: کورد و پارلەمانی عیراق

### 1. 4. 1. لە العراق ەوە:

"شکڵی ئیدارەی مەخسوسە لە مەنتیقەی کوردیدا لە نوتقی ڕەئیسەل وەزراوە تەلخیص کراوە:

"ئەم وڵاتە ئەگەر حقوقی جەمیعی عەناصری عیراقی تەئمین نەکرێ مومکین نیە بژی لازمە کـە حقـوقی کورد بدرێ. وە لازمە هەرچەند موەزەفی ئەوان بێ لە خۆیان و لە ناو خۆیـان دا تـەعیین بکـرێ. وە لوغـەتی کوردی لوغەتی ڕەسمیی بێ و لە مەدرەسەکانیان دا تەدریسات بە لوغەتی کوردی بێ. ئێمە لەسەر خۆمان فـەرز کردوە ئەم حەقە بدەین.

"لە پاش ئەو شەرتە کە ئیعلان کراو هەمو مەندوبەکانی عیـراق بـە چاکیـان بینـی بـە هـەمو وەزارەتـا تەبلیغی ئاتی ئیجرا کرا: شوبهە نیە کـە مـەعالی ئێـوە ئاگاتـان لـە تەعـەهودی ڕەئیسـەل وزەرا هەیـە کـە لـە مەجلیسی نوابا داویە و بۆ ڕۆژی ئەوەڵ ئیعلان کراوە ئەو خیتابە سیاسیە تەزەمونی ئەوە ئەکا کـە حکومـەت ئەم مەنهەج و مەسلەکە قبوڵ بکا لە ئیدارەی مەناتیقی کوردی دا عمـومی مـوەزەفین لـە خۆیـان بـێ و لوغـەتی کوردی لوغەتی ڕەسمیی بێ. فەخامەتی ڕەئیسەل وزەرا ئەمری پێ کردین کە ڕجا لە ئێوە بکـەین بـۆ تـەتبیقی ئەمە بەزلی جەهد بکەین." (ژیان، ژ13، 22 ی 4 ی 926)

### 1. 4. 2. بۆ مەبعوسێکی حەق لە ژێر پێ نەر

"لە ژمارەی 2149 غەزەتـەی ئـەلعیراق دا دیمـان کـە لـە مەجلیسـی نیـابیدا لـە ئەسـنای موزاکـەرە و موناقەشەی میزانیەی مـەعاریف دا نـوابی موحتەرەمـەی کـەرکوک و ئـەربیل جـەنابانی نەشـئەت ئیبـراهیم و یوسـف ئیبـراهیم و ئیسـماعیل بـەگی ڕەوانـدزی ناتـەواوی مـەعاریفی ئەلویـەی شـیمالیەو عـەدەم عینایـەتی حکومەتیان تەنقیدو، لە ئەلویە مەزکوردا بە کوردی تەعمیمی تەدریساتیان داوە، لەگەڵ ئەمانەیش دا کردنـەوەی مەکتەبێکی سانەوی لە ئەربیل و ئیکمالی سانەوی کەرکوکیان تەلەب و بـەیان کـردوەو جـەنابی ئـەمین زەکـی بەگ ئەمەی تەئید فەرموە، موقابیل بەم ئیدیعا حەقانەیە یەکێ لە ڕەفیقەکانیان جەنابی داود حەیدەری بەگ کـە

ئەویش بۆ تەئمینی مەنافیع و مەقاصیدی مەشروعەی میللەت رەوانەکراوی ئەربیلە وتویەتی: "لە ئیدیعای لزومی تەدریسات بە زبانی کوردی موخالیفی رەفیقەکانمم، وە لەسەر موسامەحەکردنی تەدریسات بـە زبـانی کـوردی، مەعاریف بە هەمو هێزی خۆم تەنقید ئەکەم. لە ئەلویەی سەرودا مەعاریف زۆر ناتەواوە، قوتابیەکانی ئەو ناوە نە بە کوردیو عەرەبیو نە بە تورکی ئەتوانن قسە بکەن

"لەبەر ئەوەی ئەم قسانە لە زبان مەبعوسـێکی کوردەوە لە مەجلیسی میللەت دا بەیان کراوەو بۆ عالـەمی کوردایەتی تەجاوزێکە، مەجبور بوین کە بڵێین ئەم بەیاناتە لیسـانی حـاڵی هـیچ فـەردێکی میللـەت نیـە ئـیللا جەنابی مەبعوس خۆی نەبێ.

"ئەوەلەن: صەرفی نەزەر کە کـوردی حـەقی مەشـروع و لیسـانی میللیمانـە و لـە نەتیجـەی فەلاکـەت و موصیبەتی گەورە گەورەدا نائیلی بوین و بە قەراری لایەتەزەلزەلی جەمعیەتێکی وەکو عیصبەتول ئومـەم پێمـان بەخشراوە، ئەمرۆ هەمو میللەتێ موقەدیمەی خوێندن و تەحصیلیان بە لیسانی مادەرزادی خۆیان دائەمـەزرێنن، حەتتا بۆ تەئمینی ئەم مەقسەدە حکومەتی مەتبوعەی عادلەی عیراقیش لـە کـەرکوکـدا بـە تـورکی موسـاعەدەی تەدریساتی لوتف کردوە زیرا لە لایەنی هەمو ئەصحابی ئەقڵی سەلیم و شارەزایانی ئوصـوڵی فـەنی تـەعلیم و تەدریس موصەدەقە کە تەحصیلی ئیبتیدائی بە لیسانی میللی ئەو تەلەبانە بکرێ چاکترو شایانی ئیسـتیفادەترە لەمەی بە زبانێکی بێگانە بکرێ.

"سانیەن: لە ئەلویەی شیمالیە دا لەسەر بە کوردی تەدریسات موجیبی تەنقیدی مەعاریف نیـە، لـە پـێش هـەمو شـتێک دا دانیشـتوانی ئەلویـەی شـیمالی بـە ئەکسـەریەت کـوردە و، ئەمـەیش لـە دوای تـەدقیق و وردبونەوەیەکی ئاشکرایی دا غەیرە قابیلی ئینکار سابیت بوە، لە بەر ئەمە شایانی تەنقیـد مـەعاریف نیـە بـە کوردی خوڵقاو بونمانە، وە ئەو کەسیە کە ئەم حەقەی پێ بەخشین.

"سالیسەن: قوتابییەکانمان زۆر چاک ئـەتوانن بـە کـوردی قسـە بکـەن، ئەگـەر نەیکـەن ئـەبێ چـۆن کوردێک بن؟ وە لە بەر ئەمەی یـەکێ لـە مـەوادی پرۆغـرام تەدریسـاتی زبـانی عەرەبییـە هـیچ شـوبهەی نیـە عـەرەبییش ئـەزانن. بینائـەن عەلـەیهی جـەنابی داود حەیـدەری بـەگ هـەروەکو موخـالیفی رەفیقـەکانی بـو، بەیاناتەکەیشی خیلافی حەقیقەت و واقیع بو. جددەن جای تەئەسـوفە مەبعوسـێک کـە بـۆ تـەئمینی ئامـاڵ و مەقاصیدی کۆمەڵێک رەوانە کرابێ و لەو مەوقیعەدا حەقی تەکەللومی بە سایەی ئەوانەوە دەست کەوتبێ کـەچی بیلعەکس زەربە لە بناغەی ئەمەلی میللەت بدا و بیەوێ بیروخێنێ و لـە حـەقێک کـە بـە هـەزار کـوێرەوەری و فەلاکەت دەسترەسی بوین مەحروممان بکات. ئەگەر لـە مـەجلیسدا مەقسـەد لـە موعـارەزەو موناقەشـە جـەلبی زەرەرو روخاندنی ئەساساتی میللیەی خۆمان بێ، وەکو مەبعوسەکانی ئێمە ئیختیـاری سـکوت و ئیعلانـی بـێ تەرەفی کردن بەلامەوە گەلێ چاکترو موصیبترە! م.ا." (ژیان، ژ68، 31 ی 4 ی 927)

### 1. 4. 3. بۆ وەکیلە موحتەرەمەکانمان

"ئەی وەکیلانی میللەت!

"ئەی ئەو زاتانەی کە موقەدەراتی میللەتێکتان تەودیع کراوە!

"ئەی ئەوانەی کە ئەم وەزیفە موقەدەسە، موهیمە، حەیاتییەتان قوبوڵ کردوە!

"ئەی ئەو شەخصانەی میللەت موقابیل بە هەمو چاکەیەکیان تەقدیرو خراپەیەکیان مەسئولیان ئەکات!

"ئەی وەکیلە موحتەرەمە کوردەکانمان! ئەم خیتابەمان لەگەڵ ئێوەیە. وە ئەم هاوارەمان هەر موقابیل بە ئێوەیە.

"ئێمە نامانەوێ بەحسی دەورەکانی کە بکەین. لە دەورەکانی کەدا ئەوی ئیشـێکی کردبـێو حسـابێکی دابێ بە میللەتەکەی خۆی، هەر مەعالی ئەمین زەکی بەگی وەکیلی موحتەرەممان بوە.

"بەڵام توخوا ئێوە هیچ بە عمومی زانیوتانەو لێکتان داوەتەوە کە چ وەزیفەیەکی موقەدەس و حەیاتیتان تەودیع کراوەو گرتوتانەتە ئەستۆی خۆتان؟ عەجەبا نازانن وەتەنەکەتان لە چ حاڵێکایە، غەیری حقوق، لە هەمو ئاسارێکی عیمران و تەرەقی لە مەعاریف، صەنایع، تیجارەت، زەراعەت، ئیقتیصادیات دا چەندە مەحرومە؟ وە ئەگەر هەروا بمێنێتەوە چەند مەحکومی مردنە. وە نازانن بۆ ئەوەی بژی، تەرەقی بکات حقوقی چنگ کەوێ هیوا و ئومێدی هەر بە ئێوەیە؟

"ئێوە ئەبێ بزانن کە ئینتیخاب کردەی میللەتێکی یەک ملیۆن نفوسین. وە لە دواتانەوە پشتیوانێکی موهیم و بەقوەتی وەک ئەم میللەتە هەیە. وە ئەبێ بزانن و لە هەمو کەسێکی مەعلوم بکەن کە ئەمڕۆ لە مەجلیسی مەبعوسانی عیراق دا کۆمەڵێکی زۆر هەیە کە تەمسیلی شەعبێکی موهیمی وەکو کورد ئەکات.

"موقابیل بەم وەزیفە موهیمەیەتان و لە حاڵێکا کە ئەزانن میللەتەکەتان ئەمەندە دواکەوتوە و ئەبێ فەوقەلحەد سەعی بۆ بکرێت کەچی مەعەلئەسەف هەتاکو ئێستا نە لە مەجلیسدا و نە لە خاریجەوە بە نەشریات و تەشەبوسات کەس خدمەتێکی لە ئێوە نەدی فەعالیەتێکتان نەنواند و تەئمینی یەکێ لە مەقاصیدانی میللەتتان نەکرد." (ژیان، ژ 164، 4 ی 4 ی 929)

### 1. 4. 4. ویستنێکی مەشروع

"بۆ تەلەبی تەتبیقی ئەو ئیمتیازەی کە هەیئەتی عالی عصبە الامم لە حەلی ولایەتی موصلا بە کوردەکانیان بەخشیوە و بۆ ئەوەی ئەم حقوقە و، ئەم ئیمتیازە بە تەواوی بە هەمو موحیتی کوردستانا تەتبیق بکرێ لە چواری ئەم مانگەدا لە تەرەف مەبعوسە موحتەرەمە کوردەکانەوە تەقریرێک تەقدیمی ڕەئیسەلوزەرای عیراق و فەخامەتی مەندوبی سامی کراوە. وە بۆ ئەوەی هەمو کوردەکان لەم مەسئەلەیە حاڵی ببن صورەتێکیشی بۆ دەرجی لە غەزەتەدا بۆ ئیدارەخانەی ژیان نێرراوە.

"وا صورەتی ئەو مەتالیبەی کە وەکیلە موحتەرەمە خۆشەویستە بە قیمەتەکانمان تەلەبیان کردوە بە تەرجومەکراوی نەشر کرا.

"وە دەرەجەی حسیات و مەسروریەتی میللەتەکەیش بەرامبەر بەم فەعالیەتەی کە وەکیلە خۆشەویسەکانمان بۆ موحافەزەی حقوق و بۆ بەرزبونەوەی وڵات و میللەتەکەمان کردویانە بە موفەصەلی عەرز ئەکرێ.

"فەخامەتی ڕەئیسەلوزەرای عیراق!

"صورەتێکی بۆ فەخامەتی مەندوبی سامی عیراق!

"لەو وەقتەدا کە لوجنەی عصبە الامم خەریکی حەلی مەسئەلەی موصل بو، لە تەقریرەکەیانا تەوصیەیان کرد بو بە دانی بەعزێ ئیمتیازاتی ئیداری بە میللەتی کورد.

"لە خسوس ئیدارەیانەوە بۆ تەئمینی مەصالیحیان صەلاحیەت و حوڕیەتێکی کامیلەیان پێ بەخشی بون، بەڵام مەعەلئەسەف ئەم ئیمتیازاتە کە لازم بو لە عمومی کوردستانا تەتبیق بکرێ هەر مونحەصیر کراوەتە سەر لیوای سلێمانی و هەولێر و، ئەم ڕێیەی لە خسوس تەتبیقی ئەم ئیمتیازەوە حاڵی حازر گیراوە فائیدەیەکی عیلمی، ئیقتیصادی و ئیدارەیەکی باش کە ڕەغبەتیان لەسەر بێ، بە کوردەکان نابەخشێ.

"وە مەعلومە ئەم ئوصولە و ئەم ڕێیەی کە ئێستا بۆ تەتبیقی ئەم ئیمتیازە گیراوە و، کە حکومەت زۆر صعوباتی تیا ئەکێشێ، نەتیجە فائیدەیەکی باشیشی نابێ بۆ کوردەکان. کەواتە لازمە بۆ تەتبیقی ئەم ئیمتیازە تەشکیلاتێکی عمومی و واسیعتر بکرێ کە زیاتر مولائیم بێ بۆ حقوقی کوردەکان و ئەو وەقتە بە تەبیعی ئەم بارە قورسەیش لە سەرشانی حکومەت سوک ئەبێتەوە.

"بە قەلبێکی صەمیمیەوە ئیستیرحام ئەکەین تەماشای مەتالیبەکانی خوارومان بکەن. وە بە عەجەلە تەوەسول و صەلاحیەت بدەن بۆ ئەم تەشکیلاتە مەتلوبە موصیبەیە.

1. لە فەخامەتتانەوە مەخفی نیە کە لیوای موصل لە وەزعیەتی حازرەی دا عیبارەتە لە 24 ناحیەو 9 قەزا، وە ئەم قەزایانەیش ئەمانەن: شێخان، عەقرە، زێبار، عەمادیە، زاخۆ، دهۆک، تەلەعفەر، سنجارو، نەفسی قەزای موصل. وە ئەگەر بڵێین ئەکسەریەتی عەشائیر و ئەهالی ئەم قەزایانە موافیقی لوغە، تاریخ و عادەتیان کوردن شتێکی تازە ناڵێین. وە ئەو خەریتەیەی کە لوجنەی عصبە الامم لەسەر ئەساسێکی جنسیەت لەم خسوسەوە رەسمی کردوە لە بەر چاومانە و بە ئاشکرا ئیسپات و ئیزاحی ئەمە ئەکات.

"غەیری ئەمەیش جددەن زۆر زەحمەتە بۆ موتەصەریفی لیوای موصل کە دائیمەن لە ناو ئەم مەنتیقە واسیعەدا بگەرێ و ئاگاداری هەمو ئەحواڵی ئەهالیەکە بێ و، دیسانەوە بۆ ئەهالیش زۆر زەحمەتە کە بۆ ئیشی حکومەتییان دائیمەن بێنە مەرکەزی لیواو، لە بەر رێ دوری و لە بەر ئەوەی کە لە زبانی کوردی زیاتر لیسانێکی کە نازانن و لە بەر ئەوەی کە وەزعیەتی مالیەیشیان موساعید نیە لە بەر ئەوە ئیقتیراح ئەکەین تەشکیلی لیوایەکی کوردی بکەن کە مەرکەزەکەی دهۆک بێ و بە لیوای دهۆک ناو ببرێ و، قەزای عەقرە، زێبار، عەمادیە، زاخۆ، مولحەقی ئەم لیوایە بن و، تەشکیلاتی ئەم لیوایەش بەپێی تەشکیلاتی لیواکانی ئێستای شیمال بێ و موعامەلاتی رەسمیەیان بێ بە کوردی.

2. وە لە فەخامەتتانەوە مەخفی نیە کە موازەنە و میقیاسی میللەتێک هەر مەعاریفە و هەر مەعاریف ژین و سەعادەت و ئیستقبالی میللەتێک تەئمین ئەکات. وە عەکسی ئەمە ئەگەر میللەتێ مەعاریفی نەبێ مەحکومی مردن و زیللەتە. وە ئەگەر بە مونصیفانە تەماشای وەزعیەتی مەعاریفی لیوا کوردیەکان بکەین و لەگەڵ مەعاریفی مەنتیقەکانی کەدا موقایەسەی بکەین موتەئەسیفانە چاومان پێ ئەکەوێ کە مەعاریفی مەنتیقەی کوردستان بە دەرەجەیەک دواکەوتوە کە ئینسان موتەئەسیر ئەکات. وە وا ئەزانین ئەم دواکەوتنەی مەعاریفیش هەر لە بەر ئەوەیە کە مەربوتی مودیریەتی عومیە لە بەغداد کە هیچ ئیهتیمام ناکات بۆ ئیکمالی ئەو واسیتانەی کە مەعاریفی ئەم مەملەکەتەی پێ تەرەقی ئەکات. وە غەیری ئەمیش ئەسبابێکی تری هەیە کە بە نیسبەت صەدەوە میقدارێکی زۆر کەمی بۆ مەعاریفی کوردستان صەرف ئەکرێت. وە ئیهتیمام ناکرێ بە تەرجومەو تەئلیفی کتێبان.

لە بەر ئەوە ئیقتیراحیش ئەکەین کە بۆ مەعاریفی ئەم لیوا کوردانە مودیریەتێکی مەعاریف تەعین بکرێ کە مودیرەکەی کوردێک بێو مەرکەزەکەیشی لە یەکێ لەم لیوا کوردیانە بێ.

3. تەوحیدی ئیدارەی چوار لیوا کوردەکە بکرێ کە سلێمانی، کەرکوک، هەولێر و دهۆکە. وە بۆ ئەمانە تەشکیلی موفەتیشیەتێکی عام بکرێت کە رەئیسەکەیان یەکێ بێ لە کوردەکان کە ئیقتیداری کیفایەتی بۆ ئەم وەزیفەیە مەعلوم بێ کە موراقەبەی هەمو ئیشوکاری ئەم لیوایانە بکات و موتەصەریفی لیواکانیش موراجەعەتی پێ بکەن و صەلاحیەتێکی تەواویشی بدرێتێ و مەربوتی پایتەختی حکومەتی عیراق بێ و، لە لیوا کوردەکانا تەمسیلی هەمو وەزارەتەکان بکات. وە بۆ ئومووری مالیە، ئیقتیصادیە، صحیە، عەدلیەیش هەئیەتێکی لەژێر دەستا بێ بۆ ئیستیشارە.

4. تەلەب لە حکومەت ئەکەین کە سەعی بکات بۆ تەعدیلی بەعزێ مەواد لە قەوانینی عیراق دا ئەوانەی کە ئەزانرێ بە نەزەر وەزعیەتی جوغرافیای ئەو مەنتیقەیەوە بۆ حقوق ئەهالیەکەی موساعید نیە تەتبیق بکرێ و، ئیقتیراح ئەکەین مەوادی قانونی ئەرازی بکەن بە صورەتێک کە لە دو ساڵ کەمتر نەبێ بۆ ئەوەی کە تەسهیلاتێک بێ بۆ مەصالیحی ئەهالیەکەو تەشجیعیشیان بکات کە بۆ تەسجیلی ئەرازییەکانیان تەشەبوس بکەن بە مەجانی.

5. ئیقتیراح ئەکەین بودجەی عومی ئەم مەملەکەتە– مەنتیقەیە موافیقی نیسبەتی لای خوارەوە صەرف بکرێ: لە میزانیەی عومی ئەو مەبلەغەی کە بۆ دەوائیری مەرکەزیە تەخصیص ئەکرێ لێی تەنزیل بکرێ باقیەکەی تری مساواتەن یا بە نیسبەتی نفوس وە یا بە پێی واریداتیان بەسەر لیواکانی کەدا تەقسیم بکرێ. وە لازمە مەسئەلەی گومرگی عومیش بە نەزەرێکی دیقەت بگیرێ.

"ئەی فەخامەتمەئاب! لەگەڵ ئەم حسیاتە چاکەی ئێمە هەمانە بەرامبەر بە حکومەت هیچ مانعێک نابینین بە ئیحتیرامەوە مەتالیبی میللەتەکەمان تەقدیمتان بکەین بە صیفەتێک کە رەئیسی حکومەتەکەن و رجا ئەکەین ئەم مەتالیبە بە نەزەرێکی دیقەت تەحقیق بفەرمون کە چەند بۆ زەراعەت و تەرەقی ئەرازی و توروقی مواصەلات مان چاکە و لە تەتبیقا چەند ئیدارەمان تەوسیع و وەزعیەتمان چاک ئەکات. ئێمە غەیری شتێک نەبێ کە تەتبیقی زۆر باش و مومکینە تەلەبێکی تر ناکەین کە بۆ حالەت و وەزعیەتی مالیەو سیاسیەی عیراق خراپ بێ.

دیسانەوە تەعزیماتی فائیقەمان تەقدیم ئەکەین.

ئیسماعیل نائیبی هەولێر، جەمال بابان کەزا، محەممەد صالح نائیبی سلێمانی، سەیفوڵڵا نائیبی سلێمانی، حازم نائیبی موصل، محەممەد جاف نائیبی کەرکوک." (ژیان، ژ 166، 11 ی 4 ی 929)

### 1. 4. 5. **ئەی وەکیلانی میللەت!**

ئەی خۆشەویستانی هەمو قەومی کورد!

"صورەتێکی تەرجومەکراوی تەقریرە بە قیمەتەکەتان کە لە نوقتەی محافەزەی حقوقی میللەتی کوردەوە داوتانە لە سەرەوە دەرج کرا.

"فەعالەت و جیدیەتێک کە بۆ ئیحقاقی حەقێکی مەشروعی کوردەکان و بۆ تەرەقی و تەعالییان ئیبرازتان فەرموە، سرورو خۆشییەکی خستە دڵی هەمو میللەتی کوردەوە.

"میللەت خۆی زۆر بە بەختیار ئەزانێ کە وەکیلێکی عالی و بە قیمەتی وەکو ئێوەی هەیە. بۆ ئەم مەتالیبە مەشروعە کە ویستوتانە هەمو پشتیوانتانن.

"بە خسوسی بە ناوی ژیانەوەو بە عومی بە ناوی میللەتی کوردەوە تەشەکورتان ئەکەین هەربژین." (ژیان، ژ 166، 11 ی 4 ی 929)

### 1. 4. 6. **جوابی غەزەتەی العراق بە تاریخی 9 ی 4 ی 1929**

"بەرامبەر بەو تەقریرەی کە وەکیلە خۆشەویستەکانی میللەتی کورد بۆ تەلەبی حقوقی میللەتەکە دابویان بە غەزەتەی العراق 9 ی 4 ی 1929 تاریخ دا چاومان بە چەند دێرێک کەوت.

"ئێمە چونکە زبانی حاڵی میللەتی کوردین هەرچەند لە سەرمان واجب بو جوابی بدەینەوە بەڵام بۆ ئەوەی حسیاتی کوردەکان تەحریک و نەتیجەی شتێکی خراپ تەولید نەکات نەمان ویست دورودرێژ جوابی بدەینەوە. هەر ئەمەندە ئەڵێین بۆ العراق زۆر عەیب و فکرێکی غەڵەتە کە بە هەمو حسیاتیەوە میللەتێکی شەجیع، صاحیب شەرەفی وەکو کورد تەهدید ئەکات و ئەیترسێنێ بەوەی کە ئەڵێ: "کوردەکان تەلەبی وا بکەن وەکو ئیدیعای ئەرمەنییەکانی لێ دێت کە موقابیل بە تورکیا کردیان و نەتیجە بەم حاڵە گەیشتن.

"ئەی صاحیب و موحەریری العراق! بە جدی عەرزت ئەکەین کورد هیچ وەقتێک خۆی بە ئەرمەنی نازانێ و عیراقیش بە تورکیا. کورد بەو شەرتە لەگەڵ عیراقا ئەژی نەک وەکو غەزەتەکانی خاریج ئەڵێن و

ئەنوسن: "ئەبێ ئەم دو میللەتە وەکو بەریتانیا و ئوسکۆتلاندا بژین و تەماشای یەکتری بکەن" بەڵکو کورد ئەیەوێ زیاتر تەماشای بکرێ.

"رجا لە ئەولیای ئومور ئەکەین ئەگەر ئەیانەوێ ئەم دو میللەتە بە یەکەوە بژین نابێ مەیدان بدەن شتی وا بنوسرێ. چونکە غەزەتەکانی کوردیش مەجبور ئەبێ موقابیل بە هەمو تەعەروزێک نەک مودافەعە بەڵکو هجوم بکات. هەر ئەوەندە ئەڵێین." (ژیان، ژ 167، 15 ی 4 ی 929)

**1. 4. 7. لە گیلبێرت کلایتنەوە بۆ عەبدولموحسین ئال سەعدون**

لە گیلبێرت کلایتن (Gilbert Clayton)، مەندوبی سامی بریتانی لە عیراق

بۆ عەبدولموحسین ئال سەعدون، سەرۆکی وەزیرانی عیراق

بەغداد، 20 ی 4 ی 1929

"لەم یەک دو حەفتەی رابوردودا، کۆپی چەند عەریزەیەکم پێ گەیشتوە کە دراون بە حکومەت، یان بە بێ ناو بڵاو کراونەتەوە، لە لایەن ئەندامانی کۆمەڵگای کوردیيەوە. لەوانە ئەو عەریزەیەی کە دراوە بە پایەبەرزتان. لام وایە ئەمە هەلێکە بۆ ئەوەی بیروڕای خۆم لەسەر مەسەلە گشتیيەکە بۆ پایەبەرزتان رون بکەمەوە.

"پایەبەرزتان باش ئاگادارە لەو مەرجگەلەی کۆمەڵەی نەتەوەکان دەربارەی پاراستنی هەندێ ماف و ئیمتیازاتی کوردەکان لە عیراقدا دای نابون. ئەم مەرجانە کران بە مەرجی بەلاداخستنی رەزامەندانەی کێشەی سنوری موسڵ و، حکومەتی خاوەن شکۆی بریتانیا یش دڵنیاییدا بە کۆمەڵە کە ڕێزیان ئەگیرێ. حکومەتی عیراق یش هاوبیر بو لەم دڵنیایی دانەدا. منیش دڵنیا کرام کە بە دڵسۆزيیەوە بەڵێنەکانی کە دراون بەجێ هێناوە و، لە پاشەڕۆژ یشدا هەروا بەردەوام ئەبێ.

"لەلایەکی ترەوە، ویستی حکومەتی خاوەن شکۆی بریتانیایە ببینێ یەکگرتنی هەمو ئەو توخمانەی کە دانیشتوانی عیراق پێک ئەهێنن لە دەوڵەتێکی جێگیر و پێکەوە گونجا و. هەر بە پێڕەوی سیاسەتێکی وەها عیراق ئەتوانێ ببێ بە ئەندامێکی بەهێز و گەشاوەی کۆمەڵگای گەلان.

"لە بەر ئەوە، من لام وایە کە شتێکی بنەرەتیيە هەر ئارەزویەک بەرەو جیابونەوەخوازی لەناو ئەرزەیەکی هەر بەشێکی تایبەتی ئەم نەتەوەیەدا هان نەدرێ، ئامانج ئەبێ پشت بەستن بێ بە یەکتری و هاوکاری بێ لە نێوان کۆمەڵگا جیاوازەکاندا. هیوادارم لەچەند ساڵی داهاتودا پێشکەوتنێکی دیار لە گەشەکردنی ئابوریدا ببینرێ. شتێکی ئاشکرایە کە هەر یەکێتی ئامانج ئەتوانێ زیادبونی گشتی لە خۆشگوزەرانیدا دابین بکا، ئاسودەیەک کە هاوبەشە جیاوازەکانی دانیشتوان وەکو یەک هاوبەشی بن.

"من وا تێبینی ئەکەم خواستە تایبەتییەکانی کە لە عەریزەکەدا خراونەتە بەرچاو ئەمانەن:

أ. پەرەپێدانی دامودەزگا پەروەردەیيەکان لە ناوچە کوردیيەکاندا.

ب. دامەزراندنی لیوایەکی کوردیی جیاواز کە ناوەندەکەی لە دهۆک بێ و، سەرەنجام یەکخستنی هەمو لیوا کوردیيەکان لە چەشنی پشکنەرایەتی (موفەتیشییەت) ی نیمچە ئۆتۆنۆم دا.

"دەربارەی خاڵی یەکەم، من هەمو هاودەردیيەکم هەیە لە گەڵ ئارەزوی کوردەکاندا بۆ گەشەپێدانی پەروەردە کە تایبەتمەندیيان لەناو سنوری ئەو بەڵێنانەدا یە کە پێشتر لەم نامەیەدا باسم کردن. بەڵام هۆیەک نیە کەوا بکات لەو باوەڕەدا بم کە حکومەت درێخی کردوە لە لێکۆڵینەوەی بەرژەوەندیيەکانی کوردا لەم بارەیەوە لەناو چوارچێوەی دارایيدا. شتێکی ئاشکرایە لە دۆخی دارایی ئێستای دەوڵەتدا، مەحاڵە بتوانێ

هەمو پێویستی‌یەکانی پەروەردە لە وڵاتدا بە تەواوی جێبەجێ بکا. ئەمە تەنیا کـاتێ ئـەکرێ کـە گەشـەکردنی ئابوری بوژانەوەیەکی گەورەو پارەی پێویست پەیدا بکرێ بۆ دامەزراندنی سیستەمێکی تەواوی پەروەردە، کە هەمومان بە ئاواتی ئەخوازین.

خاڵی دوەم شتێکە ئەبێ حکومەت مامەڵەی لە گەڵ بکا بە پێی پێویستی‌یەکانی کارامـەیی و گونجـاوی و بەرێوەبەرایەتی. بەڵام وەکو سەرەتایەکی گشتی دژی دانانی هەر ڕێوشوێنێکم کە بـەرەو جیابونـەوەخوازی بچێ، نەک یەکێتی. من لام وایە کە باشترین قازانجی نەک هەر هی دەوڵەت بەگشتی بەڵکو هی کورد یش بـە تایبەتی، لەوەدایە، کاربکەن بۆ پشتبەستن بەیەکتری و هاوکاری نزیکتر بۆئەوەی هەمو کەرتەکانی دانیشـتوان، وەکو یەک بەشداربن. لەزیادکردنی ئەو گەشانەوەیەدا، کە باوەڕم وایە لەئەنجامی تەقەلاکانی حکومـەتدا ئـەبێ بۆ گەشەپێدانی سەرچاوەکانی وڵات. (بەڵگەی ژمارە FO371 ی 13759)

### 1. 4. 8. لە گیلبێرت کلابتنەوە بۆ سێر جۆن ئی شەکبێرگ

لە گیلبێرت کلایتن (Gilbert Clayton)، مەندوبی سامی بریتانییەوە لە عیراق
بۆ سێر جۆن ئی. شەکبێرگ (Shuckburg)، لە داونینگ ستریت، لەندەن
بەغداد، 22 ی 4 ی 1929

"لەم دواییانەدا بزوتنەوەیەکی جیابونەوەخوازی لە لیوا کوردی‌یەکاندا سـەری هەڵداوەتـەوە، کـە خـۆی نواندوە لە ژمارەیەک عەریزەدا کە دراون بە مـەلیک، سـەرۆکی وەزیـران و مـن. هەنـدێک یـش بـەبێ ئیمـزا بڵاوکراوەتەوە کە زۆر توندرەوانەترن و، کۆپی‌یەکانی ئەوان یـش لەلایـەن موفەتیشـە ئیـداری‌یـەکانی ناوچـە کوردی‌یەکانەوە نێردراون.

عەریزەکان بە زمانێکی هێمن داڕێژراون و بەشێوەیەکی سەرەکی باسی داوای دامودەزگای پەروەردەیی زۆرتر ئەکەن لە زمانی کوردی و، یەکخستنی لیوا کوردی‌یەکان لە ناوچەیەکی جیاوازدا سەر بەخۆیان بێ.

مەلیک و هەروەها کۆرنوالیس، هەردوکیان پێشنیاریان کرد کە ئەم بزوتنەوەیە ئەبێ لـە سـەرەتاکەیەوە مەهار بکرێ بۆ ئەوەی گرنگی‌یەکی گەورەتر پەیدا نەکا. پێ ئەچێ بەشێکی بگەڕێتەوە بۆ ئـەو تەنگوچەڵەمـە وەزاری‌یە و، لەوانەیە زۆرتر یـش بگەڕێتـەوە بـۆ هـاتنی مـن بـۆ ئێـرە و بەدەسـتهێنانی پشـتیوانی مـن لـە ئاواتەکانی کورد. لە بەر ئەوە، من وام بیـر کـردەوە شـتێکی باشـە پـاڵ بـدەم بـە پـاڵ ئـارەزوی حکومـەتی عیراقەوە، بیروبۆچونی خۆم بۆ ئەوان لەسەر ئەم مەسەلەیە دەربیڕم. نامەیەکم بـۆ سـەرۆکی وەزیـران نوسـی، لەوە کۆپی‌یەکت لەگەڵ ئەم بەریدەدا پێ ئەگا.

ویستم لەم مانگەدا سەری لیواکانی سەرو بدەم، بەڵام چونکە تەنگوچەڵەمەی وەزاری بەلادا نەکەوت بو، ئەبو سەردانەکەم واز لێ بهێنم، بەڵام وا دەرئەکەوێ نەچونەکەم بە خێر گەڕابێتەوە.

لام وایە نابێ ئەمە ببێتە هۆی بەهەڵە تێگەیشتن. بەڵام پێم وایە باشە هەنـدێ شـت لـە بـارو دۆخەکـە بزانی، بەتایبەتی چونکە زۆر لەوانەیە هەندێ مەزبەتە لەسەر ئەم مەسەلەیە ڕێ بدۆزێتـەوە بـۆ لای سـکرتێری دەوڵەت یا شوێنی تر. (بەڵگەئ ژمارە FO371 ی 13759)

### 1. 4. 9. بۆ مەندوبە موحتەرەمەکانمان

بە موناسەبەتی حلولی ئیجتیماعی میللییەوە بۆ مەندوبە موحتەرەمەکانمان، نائیب و واجیباتی:

"ئوصوڵی نیابەت ئوصوڵێکی دیموقراسیە. ئەمڕۆ دەرەجەی ئەهمییەت و لزومی وەک (موتاعەرەفە)یەکی لێ هاتوەو لێدوانی زائیدە. ئەساسی مەوزوعی ئێمە تەدقیق و تەحقیقی ئەم ئوصـوڵی موهیمـەی حەیاتیـە نیـە،

چونکە تەقریبەن لە ئەواخیری عەصری هەژدەمەوە هەتا ئێستا، عولەما، تێگەیشتوانی غەرب و شەرق خەریکی تەشریحی ئەم مەسئەلەیەن. باوەڕ ناکەم کەس مابێ ئینکاری چاکی ئەم ئوصوڵی ئیدارەی حکومەتە بکات.

"ئەوەی ئێمە کردومانە بەسەر لەوحەی مەقال: وەزیفەو واجیباتی وکەلای ئوممەتە. لا عەلەل تەعین هەر ئوصولێک وەلەو حائیزی هەمو ئەوصافێکی نافیع بێ، بە شەرتی حوسنی ئیدارە ئیستیعمال نەکرێ، فائیدەیەکی مەتلوبەی لێ ئیستیحصال ناکرێ. بینائەن عەلەیهی ئەم ئوصوڵی نیابەتەیش ئەگەر لە تەرەف صاحێب لیاقەت و ئیقتیدارەوە تەتبیق نەکرێ لە جێگەی نەفع زەرەر ئەبەخشێ.

"لەپاش ئەم موقەدیمەیە بێینەوە سەر رۆحی مەسئەلە، ئێوە ئەی حەزەراتی وەکیلانی ئوممەتی بێچارەی کورد، ئەم خیتابەمان لەگەڵ ئێوەیە. ئەبێ بزانن کە هەمو قەوانین و نیزاماتی حکومەت تا ئێوە تەصدیقی نەکەن ناکرێ، وە لەم خسوسەوە مەسئول، ئەم مەجلیسەی ئێوەیە. ئەم مەجلیسە هەمو بەجارێ تەمسیلی میللەتەکەی خۆی ئەکات. کولی مەندوبێک لە تەرەف 25 هەزار کەسەوە تەوکیل کراوە و حقوقی ئەم 25 هەزار کەسە تەودیعی ئۆباڵی ئەو کراوە. ئەو کورسیەی کە لە مەجلیس دا ئیشغالی ئەکەن شەرەفی 25 هەزار کەسی هەیە. ئەبێ بزانن کە دائیمەن هەر یەکێک لە ئێوە 50 هەزار چاو چاوەروانی خزمەت و فەعالییەتی لێ ئەکات.

"ئەمە 3 دەورەی ئیجتیماعییەی موهیمی نیابیەتان تێ پەران، کەچی میللەت لە ئێوە بە تەواوی سەعیەک و فەعالیەتێکی نەدی، تەبیعی لە حەزەراتی ئێوە بەعزێکتان چاوتان پێ کەوتوە وەیا بیستوتانە کە لە ئەلویەکانی جنوب ئەمڕۆ لە خسوس هەمو شتێکەوە تەکامولی کردوە، هەمو مالەزمەیەکی بۆ ئیحزارو هەمو ئیحتیاجاتێکی دەفع کراوە. تەبیعی لیواکانی خۆیشتان دیوە. لازمە موقایەسەی بکەن. عەجەبا ئەسبابی ئەم هەمو نوقصانیەو دواکەوتنە نازانن؟ تەبیعی ئەیزانن کە مەندوبەکانی ئەوان لە داخڵی حدود و صەلاحییەتی خۆیانا هەمو نەوعە تەشەبوسێکیان کردوە. واجیباتی مەودوعەی خۆیانیان بەجێ هێناوە و بۆ میللەتەکەیان تێ کۆشاون. هەتا بەم نەوعە میللەتەکەیان مەمنون و خۆشیان لای ئەوان خۆشەویست کردوە.

"ئەبینین کە ئەکسەر لە نوابەکانی جنوب بۆ فەحص و تەدقیقی ئیحتیاجاتی ئیقتیصادی، عیلمی، صیحی، ئەسورێنەوەو حەتا خاریجی مەنتیقەی ئینتیخابییەکان ئەگەرێن لە زەرورەت و لەوازیماتی میللەت تێ ئەگەن. بۆ پێکهێنانی ئەمانە ئیرشادو تەوصیەی حکومەت ئەکەن و بەو نەوعە واجیباتی موقەدەسەی خۆیان ئیفا ئەکەن. کەچی هێشتا زۆر لە ئێوە ئەمەندە مەراقی نەکردوە کە لە داخڵی مەنتیقە ئینتیخابیەکەی خۆیا گەشتوگوزارێ بکات. ئیحتیاجاتی زەرورەتی میللەتەکە تەدقیق و بۆ ئیکمالی نەواقیصی تەشەبوسێک بکات.

"وەقتێ بێ لێکدانەوە کە دەستی تەصویتتان بۆ قانونی (رەسمی فەواکیهە و ئەسمار) هەڵبڕی ئەبوایە بتانزانیایە کە فەرمانی ئیفلاسی و مەحوبونەوەی میللەتێک ئیمزا ئەکەن.

"لازم ئەکات حەزەراتی ئێوەش: عمومی مەندوبەکانی کورد لە زەمانی عوتلەدا گەشتوگوزاری عمومی ئەرازی لیوا، قەزا، ناحیە، حەتا دێهاتەکانی مەنتیقەکەتان و مەنتیقەی یەکتری بفەرمون و لە رۆح، ئیحتیاجاتی میللەتەکە تێ بگەن و هەموتان دائیمەن موتەفیق عەینی وەکو رۆحێک، جسمێک حەرەکەت بکەن. ئەم نەواقیصاتانە و ئیحتیاجاتی میللەتە کە ئەیبینن ئیرشادو تەوصیەی حکومەتی بکەن و، ئەگەر وا بەو نەوعە ئیتیفاق و شارەزایی مەناتیقی یەکتری بێن ئەتوانن دائیمەن لە مەجلیسا کیتلە و پارتێکی موهیم و بەقوەت تەشکیل و ئیحتیاجاتی میللەتەکە بە ئەکسەریەت بە حکومەتی ئیکمال بکەن. وە میللەتەکە لە زەرەر و زیان محافەزە و ویقایە بفەرمون ئەوسا میللەت بە کەماڵی جیددییەتەوە فەخرتان پێوە ئەکات و بە موقەدەستان ئەزانێ.

"ئیتر رجا ئەکەین کارێکی وا بکەن کە بۆ ئینتیخاباتێکی کە بە شەرەفەوە ئومێدی تەوکیل کردنتان لە میللەتەکە بکەن.

"ئیتر ئینتیزاری فەعالییەت و مەساعی مەشکورەتان ئەکەین!" (ژیان، ژ 87، 25 ی 10 ی 1927)

### 1. 4. 10. ئیجتیماعی مەجلیسی مەبعوسان و ئەعیان

"لـە 1 ی مانگـا مەجلیسـی مەبعوسـان و ئـەعیان ئیجتیماعیـان کـردوە، لـە نەتیجـەی ئینتیخاباتـا بـە ئەکسەریەت فەخامەتی عەبدولموحسین بەگ ئەلسەعدون ئینتیخاب فەرموراوە بە رەئیسی مەجلیسی مەبعوسـان و لە نەتیجەی ئینتیخاباتی مەجلیسی ئەعیانا مەعالی یوسف ئەفەندی سویدی ئینتیخاب فەرموراوە بە رەئیسـی مەجلیسی ئەعیان.

"تەئجیلی مەجلیسی مەبعوسان و ئەعیان: لەسەر ئیرادەی مەلەکییە مەجلیسی مەبعوسان و ئەعیان چل و پێنج رۆژ تەئجیل کراوە." (ژیان، ژ 89، 8 ی 11 ی 1927)

### 1. 4. 11. وەزارەتی عیراق

"غەزەتەی بەغداد تایمس نوسیوێتی کە مەوقیعی وزەرای عیراق باش نیە، عومری دریژیـان شـەش حـەوت رۆژی ترە. فەقەت غەزەتەکانی تری بەغداد ئەم خەبەرە تەکزیب ئەکەن، چونکە ئەڵێن لـە عیراقـا وەزعییـەتێکی وا روی نەداوە کە بیێ بە سەبەبی سقوتی هەیئەتی وەزارەت." (ژیان، ژ 89، 8 ی 11 ی 1927)

### 1. 4. 12. مەجلیسی مەبعوسان

"موافیقی مادەی 23 ی قانونی ئەساسی چونکە لازمە ئەگەر غەیبوبەتی جەلالەتی مـەلیک لـە چـوار مانـگ تەجاوزی کرد مەجلیسی مەبعوسان کۆ بیێتەوە و لەو خسوسەوە موزاکەرە و قەرارێک بدەن و جەلالەتی مـەلیکیش چونکە سەفەرەکەی لە 4 مانگ تەجاوزی کرد ئیرادەی ملوکانە صادر بوە کە بۆ موزاکەرەی ئەم خسوسە لـە 7 ی مانگ دا مەجلیسی مەبعوسان کۆ بیێتەوە و ئیجتیماع بکا." (ژیان، ژ 94، 13 ی 12 ی 1927)

### 1. 4. 13. طەلەبی عەفو

"سقوت و تەشکیلی قابینە

"لەبەر ئەوەی فەخامەتی رەئیسەل وزەرا جەعفەر پاشا لە ریاسەتی قابینە ئیستیعفای کرد، ئیستیعفاکەیشـی لە تەرەف جەلالەتی مەلیکەوە قوبوڵ فەرموراوە، ئیرادەی ملوکانە صادر بـو کـە فەخامـەتی سـێر عەبدولموحسـین بەگ ئەلسەعدون رەئیسەل وزارەتی دەرعوهدە و قابینە تەشکیل بفـەرموێت، لـە تـەرەف فەخامەتیـەوە قابینـە لـەم زاتانە کە لە خوارەوە ئیسمیان دەرج کراوە تەشکیل و کورسی وەزارەتیان ئیشغال فەرموە:

| | |
|---|---|
| رەئیسەل وزەراو وەزیری خاریجییە و وەکیلی دیفاع | |
| | سێر عەبدولموحسین بەگ ئەلسەعدون. |
| وەزیری داخلییە | عەبدولعەزیز ئەلقەصاب. |
| وەزیری عەدلییە | حیکمەت سولەیمان بەگ. |
| وەزیری مالییە | یوسف غنیمە. |
| وەزیری مەعاریف | تۆفیق بەگ ئەلسویدی |
| وەزارەتی زەراعەت و ڕەی | سلێمان ئەلبەرراک |
| وەزارەتی ئیشغال | عەبدول موحسین ئەلشەلال |
| وەزیری ئەوقاف | ئەلشێخ ئەحمەد داود. |

(ژیان، ژ 98، 17 ی 1 ی 1928)

### 1. 4. 14. بە موناسەبەتی ئینتخاباتی تازەی مەبعوثانەوە

چەند قصەیکی رەق ئەمما ناخۆش:
لە سێر هەمفریس (F. H. Humphreys) ەوە
"بۆ لۆرد پاسفیلد
12 ی 12 ی 1930

4. بۆ رۆژی دوایی عیسمەت پاشا و شوکری کەیا وەڵامـی تەلەفۆنـەکانیان دامـەوە، لەسـەر پەیوەنـدی تورکی– عیراقی دواین، بەتایبەتی سەبارەت بە کوردستان. من رونم کردەوە کە سیاسـەتی حکومـەتی خـاوەن شکۆ، وەکو هێزی ئینتیداب لە عیراق دا، ئەوە بو کە عەرەب هان بدا کە بە تـەعاتوف و عەدالەتـەوە رەفتـار لە گەڵ کورد بکەن وە کورد هان بدا کە وەکو هاوڵاتی دڵسۆزی دەوڵەتی تازە دامـەزراوی عیـراق بـژین. بیـری کوردستانێکی سەربەخۆ گەوجانە و لە جـێ بـەجێ کـردن نـەهاتوە. هـەر واتـەواتێک دەربـارەی ئـەوەی کـە حکومەتی خاوەن شکۆ هانی دابن درۆ بوە.

"لە وەڵامی ئەوەدا کە حکومەتی عیراق چ هەنگاوێ ئەنێ بـۆ ئـەوەی ئـەو کوردانـە داڵـدە نـەدا کـە لـە بەردەم سوپای تورکـدا هەڵدێن بۆ عیراق؟ وتم، حکومەتی عیـراق هـەرچی‌یـەکی لـە توانـادا بـێ ئـەیکات بـۆ چەککردنی پەنابەرانی کورد، رێگەیان نادا ئەرزی عیراق وەکو بنکە بـەکاربهێنن بـۆ چـالاکی عەسـکەری دژی تورک و، دڵنیام کردن کە هەر سەرنەکەوتنێ لە دانانی رێوشوێنی کاریگەر و گونجاودا ئەگەرێتەوە بۆ نەبونی توانا نەک بۆ نیازی باش.

"هەروەها وتم کە لیژنەی هەمیشەیی سنور بەتەنیا ئەتوانێ بەشداری بکا لە جێگیـر کردنـی ئاسایشـی سنوردا ئەگەر بایەخی زۆرتر بە جێبەجێ کردنی بڕیارەکانی بدرێ. ئەگینا باشـتر وایـە هەرلایـەک بەرێگـەی خۆی درێژە بە ئیجرائات بدا.

"هەردو وەزیرەکە زۆر روخۆش بون دڵنیایان کردم کە رازین لە بۆچونی دۆستانەی حکومەتی عیـراق. بەڵێنیان دا هاوئاهەنگی بکەن بۆ رێگرتن لە پەلاماردانی سنور کە لەم دواییانەدا زەرەری بەرچاویان گەیاندوە بە خواروی کوردستان، رەنگە بگەرێتەوە بۆ کێشانەوەی مەخفەرەکانی تورک لەناوچەکانی سەر سنور.

5. عیسمەت پاشا لە میوانداری‌یەکەی نیوەرۆدا کە سێر جـۆرج کـلارک کـردی... پـێی وتـم کـە هـیچ گلەیی‌یەکی راستەقینەی لە عیراق نیە. بەڵام هیواداره بە زویی هـەوڵ بـدرێ شـێخی بـارزان بهێنرێتـەوە ژێـر کۆنترۆڵ کە هاودەردی‌یەکی کاریگەری نیشان داوە لەگەڵ یاخیانی کورد لە تورکیا." (بەڵگەی ژمارە F0371 ی 14521)

**تێبینی** لەسەر ئەو گفتوگۆیانەی لە ئەنقەرە کراون لە نێوان نوری پاشـا سـەعید و سـەرۆک وەزیرانـی تورکیا و وەزیری کاروباری دەرەوە

گفتوگۆکانی لە گەڵ عیسمەت پاشا و دکتۆر تۆفیق روشدی بەگ لەسـەر سـێ مەسـەلە بـون، ئەشـێ وا کورت بکرێنەوە:

1. مەسەلەی ئاسایشی سنورەکانی نێوان تورکیا و عیراق کە لە دوای پەیماننامە سێ قۆڵی‌یەکەی ساڵی 1926 هاتە ئاراوە: بەرئەنجامی ئەو گفتوگۆیانە وا کەوتەوە کە حوکمەتی تورکی زۆر سەغڵەتە بەوەی کە نابێ چیتر رێگە بدرێ چالاکی زیاتر لە لایەن هەندێ لایەنی شەرخواز لە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی شێخی بارزاندا ئەنجام بدرێ. من سەرسامی‌ی خۆم دەربڕی کە بۆ دەبێ سەبارەت بـەو مەسـەلەیە ئەوەنـدە خۆیـان سـەغڵەت کردبێ، چونکە ئەوەندەی من ئاگادار بوبم بۆ ماوەیەکی ئەوەندە کورت خایەن یش نەبوە کە زانیومانە شێخی

بارزان جۆرێک لە یارمەتی و چەکی لەو ناوچانە وەرگرتوە کە کەوتونەتە ناو سنوری تورکیا. عیسمەت پاشا پرسیاری لێ کردین بۆ بەخشینی پتر زانیاری لەمەڕ ئەو مەسەلەیە و ئاخۆ بڵێی ئێمە وا زەن بکەین کە حوکمەتی تورکی هانی شێخی بارزان بدا یان چەکی بۆ دابین بکا؟ من وا وەڵامم دایەوە کە من لەو بارەیەوە تەواو دڵنیا نیم. بەڵام ئێمە هۆکاری خۆمان بەدەستەوەیە کە ئەو یارمەتیە بەو چەشنە لە سنورەکانی تورکیاوە پەڕیوەتەوە، لەوانەشە لە لایەن هەندێ لە سەرۆک خێڵەکانی کوردەکانی ناو تورکیاوە هاتبێ.

"دەسەڵاتدارانی ئەنقەرە ئامادەیی خۆیان دەرخست بەوەی کە هێزە تورکییەکان لەسەر سنور مۆڵگە داکوتن. دەبێ حوکمەتی عیراقی هەندێ هەڵمەتی سزا دان دژ بە شێخی بارزان ئەنجام بدا. لەو حاڵەتەدا هێزەکانی پاراستنی سنوری تورکیا دەتوانن هەر یەکێک بگرن کە بەو سنورەدا دزە بکا و بیەوێ بپەڕێتەوە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی تورکیا. پاش گرتن، تەسلیم بە دەسەڵاتدارانی عیراقی دەکاتەوە.

"من بۆ ئەو مەسەلەیە سوپاسم کردن و پێم وتن لە حاڵەتێکدا عیراق بیەوێ هەندێ کاری سزادەرانە ئەنجام بدا، باشترین وەرز بۆ ئەم مەبەستە بەهارە نەک پایز. چونکە پایز وەرزێکە لێ ناگەرێ ئۆپەراسیۆنی سەربازی درێژخایەن ئەنجام بدرێ. لەبەر زۆر هۆ کە یەکێک لەوانە دەست پێکردنی بارانە، جگە لە ناخۆشی رێگاو بان، لە گەڵ زانینی ئەو حەقیقەتەی کە ئەم ناوچانە بە بونی حکومەتێکی شارستانی رانەهاتون، ئەو هەمو فاکتەرانە وا دەکەن ئۆپەراسیۆنی سەربازی نوشوستی بێنێ، بە دیوی ئەودیودا وا دەکات کە بوارێکی فراوان بڕەخسێ بۆ گرتنەبەری هەندێ هەنگاوی بەرگری کردن کە لەلایەن هەڵگەراوەکانەوە دەگیرێتەبەر، وا دەکات ئەو هەڵمەت و پاکسازیە سەر نەگرێ و تەنگ و چەڵەمەی بێتە رێ.

"لە 18 ی 9 ی 1930 چاوم کەوت بە بەرپرسی کاروباری تورکیا لە بەغداد. پێی راگەیاندم ئەو ئۆپەراسیۆنەی سوپای تورکیا لە ناوچەکانی ئارارات بەرێوەی برد کۆتایی هاتوە. سەربازەکانی تورک روەو ناوچەیەکی دیکە ملیان ناوە کە دەکەوێتە رۆژئاوای دەریاچەی وان. ئاوات یشی خواست هەر هەمو ئۆپەراسیۆنەکان لە ماوەیەکی کورتدا کۆتاییان بێ. پاش ئەوە... بەرپرسی کاروباری تورکی گەرایەوە سەر هەندێ مەسەلە کە من لە ئەنقەرە یش گوێم لێ بوبو، لەمەڕ دڵنیاکردنەوە لەوەی کە سوپای تورکی لەسەر سنورەکانی نێوان عیراق و تورکیا جێگیر دەبێ و لەوێ چاوەڕێ و چاودێر دەبێ، لەو کاتەی حوکمەتی عیراق هەندێ پەلامارو هەڵمەتی سزادەرانە دژ بە شێخی بارزان بەرێوە دەبا. من سوپاسم کردو دڵنیام کرد لەم کاتەدا حکومەتی عیراقی لە بیری ئەنجامدانی ئۆپەراسیۆنێکی لەو بابەتەدا نیە. لە بەر ئەو هۆکارانەی پێشتر ئاماژەمان بۆ کرد. بەڵام گەر بریاریدا کارێکی وا ئەنجام بدا، لەو بڕوایەدایین لە مانگی 4 دا بێ کە دیارە گونجاوترین وەرزە بۆ ئەم هەڵمەتە تۆڵە سێنە." (بەڵگەی ژمارە Fo371 ی 14521). کاک شێرزاد حەسەن وەری گێراوە

13 ی10 ی 1930 — رۆژهەڵاتی عیراق نهێنی

ئەم بەڵگەنامەیە موڵکی خاوەن شکۆ حکومەتی بریتانی یە ژمارەی 8 ئەرشیف

2. لە سێر جەی کلارک بۆ مستەر ئەی هاندرسن

لە 13 ی ئۆکتۆبەر وەرگیراوە.

6. لە کۆبونەوە هەرە رەسمییەکانا لە گەڵ دەسەڵاتدارانی تورکدا، مەسەلەی کورد بەو رادەیەی کە کاریگەری لەسەر تورکیاو عیراق هەیە، زۆر راشکاوانە قسەو باسی لەسەر کرا. بەڵام هەر بە هەمان رۆحی دۆستانە، هیچ سکاڵایەکی راستەوخۆ لەمەڕ لاوازی حوکمەتی عیراق بەرز نەکرایەوە. لە سۆنگەی ئەوەی کە

شێخی بارزانییەکان توانیبوی پشتگیری کوردە هەڵگەڕاوەکانی نـاو تورکیـا بکـات. لـە ڕاسـتیدا پارەیـەکی موستەحەق کە دەبو بدرێ، ئەویش چونکە زانراوە حوکمـەتی عیراقـی تائێسـتا نـەیتوانیوە ناوچـەکانی ژێـر دەسەڵاتی شێخی بارزان کۆنترۆڵ بکا، بەڵام مەندوبی سامی داوای لـێ کرابـو فشـار بخاتـە سـەر حوکمـەتی عیراقی بەوەی کە زۆر پێویستە هەندێ ڕێورەسمی کاریگەر بخەنەکار کە لە بەرژەوەندی هەردو وڵاتەکەدا بـێ. بەڵام من هەست دەکەم سێر ئێف. هامفریز توانیبوی تورکیا ڕازی بکا کە ئەمـەیان ئەوەنـدە نیازپاکانـە نیـە، چونکە لەمەڕ بونی هێزێکی وا بۆ جێبەجێ کردنی ئەم کارە لە عۆدەو توانای بەغدا دا نیە. هـەوڵ یـش ئـەدا ئەم ڕوانینە دەستبەجێ بە حوکمەتی بەغداد ڕابگەیەنێ. بۆ ئەوەش دڵنیایی و ڕەزامەندی خۆی دەربڕی." کاک شێرزاد حەسەن وەری گێڕاوە

## 1. 4. 15. قسەی حەق وەلەو ڕەقیش بێ نابێ کەس پێی ناخۆش بێ..

"وەکو تەماشا ئەکەم و ئەبینم لە سـلێمانی و لـە خـارج، زۆر کـەس و ئـەنواعی ئینسـان خـۆی حـازر کردوە و تەشەبوسات ئەکەن بۆ ئەوەی کە ببن بە مەبعوس.

"ئەم زەواتانەش قسمێکیان بەبێ مەسئولیەت موقابل بـە میللـەت خـوا کردونـی بـە مـەبعوس و بەقـەد مەبعوسێ کە بۆ میللەتی خۆی صەرفی صیمت و غیرەتی کردبێ. حورمەت و شەرەف و ئەملاک و سـەروەتیان هەیە و لە نەزەر عمومدا زۆر بە ئیعتبار و نفوزن. لاکن مع التأسف چونکێ لەمـەوپێش تەحسـیلی مەکتـەب لـەم محیطەدا مهم و مطلب نەبوە باخسوس بۆ پیاوێک کە ساحێبی سەروەت و ملاک بو بێ دڵـی نـەهاتوە ئـەولاد لەخۆی دور بخاتەوە و بینێرێتەوە مەکتەب و زیـاتر مغـرور بـە ثـروەت و ئـەملاک و ئیعتیبـاری ئـەولادی لـە تەحسیلی مەکتەب و مەکاتب عالی محروم کردوە هەر تەنها بـە حجرەکـانی محلـە اکتفـای کـردوە و بەسـایەی شەرەف و ئەملاکیانەوە بە حورمەت ژیاون و ئێستایش لە نەزەر ئەهـالی دا ئـەو شـەرەف و حورمەتـە باقیـە فەقەت چونکە لە مەکاتب عالی دا تحصیلیات نیە ئەم وەزیفە مهمەیان پێ نـاکرێ و هـەر تیـا مـەحجوب ئـەبن. چونکە ئەمرۆ وەزیفە نیە کە لە وەزیفەی مەبعوسی مهمتر بێ وەکو وەزیفەی تر نیە هەر مقابل بـە شەخصـێک مەحجوب بێ. مەحجوبی مەبعوسی مقابل بە میللەتێکە، مەبعوسی مقتدرو زبان زان و عالم و صاحب وجـدان و بە هیمت بێ میللەتێک بەرز ئەکاتەوە و وڵاتێک معمورو ئاوەدان ئەکات، خوانەکردە عەکسی ئەمە بێ میللەتێک دوا ئەخات و وڵاتێک وێران ئەکات و خۆشی ڕەزیل و بێ حورمەت ئەبێ.

"کەوابو یەکێ لە هەمو خسوسێکەوە خۆی بەلایق نـەبینێ و نـەزانێ لـەم وەزیفەیـەدا مـەحجوب نـابێ، نابێ‌و حەیفە تەشەبث بەم وەزیفەیە بکات و ئۆباڵی میللەتێک بخاتـە ئەسـتۆی خـۆی و ئیعتیبـاری خـۆی لای میللەتەکە مەحو بکاتەوە، بەعزێکی تر هەن کە خۆیشیان ئەیزانن ئەم وەزیفەیەیان پـێ ئیفـا نـاکرێ و ناشـبن بە مەبعوس، کەچی منفعتی زاتـی سـوقیان ئـەکات تشـبث بـۆ ئـەم بـارە قورسـە ئەکـەن، ئەمانـەش دو کلمـە خوێندنی ابتدائی، وەیاخود چەند لە مأموریتدا مستخدم بون، چوار کلمە فێربون سـوقی ئـەم تشـبثی کـردون، مەبعوسی هەر بەتەنیا بە خوێندن و خوێندەواریش تەواو نابێ، نـابێ لـە بـەر بـێ مأموریـەتی و یـاخود بـۆ ترقی مأموریت ئەم تشبیە بکات، مەبعوس ئەبێ میللەت پەروەر بێ، صـاحبی ئـەخلاق و وجـدان و ڕەحـم بـێ، عالم و زبان زان بێ، موقعی ئیجتیماعی لای میللەتەکەی ببێ، منفعت پەرست نەبێ، لـە احتیاجـات میللـەت چـاو نەپۆشێ، بە ثبات بێ، ڕۆحی خۆی فیدای منفعتی میللەت بکـات و بتـوانێ مجادلـە لەگەڵ ئـەو پیـاوە تحصـیل دیدانە بکات کە لەو مەجلیسـەدا مجادلـە و سـەعی بـۆ وەتـەنی خۆیـان ئەکـەن، چونکـە هـەمو ئـەیزانین لـەو مەجلیسەدا حەیات و مەمات بەش ئەکرێ، هەر میللەتە مەبعوسی چاکی ببـێ بەرحـەیات نـەبێ، عەکسـی چـاک بێ مردن بەشیەتی.

"ئەمجا کەوابو حەیفە گەوهەر دۆراندن، رجا ئەکەم لەسەر ئێوە فـەرزە بـەم نفـوزو حورمەتـەوە سـەعی بکەن و تەنویری ئێمەمانان بکەن تا بە عموم پیاوی لایق، تەجربە دیدە و ئەربابی خۆی بدۆزینـەوە، کـە ئـەم بارە گرانە بدەین بە سەریانا. ئەم قسانەم بە بێ ئەدەبی عەد مەکەن، وەڵڵا کەسم نیە چاوی لە مەبعوسی بێ و خۆیشم لە ئێوە نالایقتر.حەق بێژی قسە رەق" (ژیان، ژمارە 101، 9 ی 2 ی 1928)

**1. 4. 16. وەزارەتی تازە**

"ئەمساڵ بە نەزەر تاریخی سیاسی عیراقەوە، ساڵێکی موستەسنا و موهیم بـو، لەلایەکـەوە ئـەعزای وەزارەتی سابیقە بە کەمالی گەرمی و جدیەت خەریکی مفاوەزە بون لە لەنـدەن، لـەم لایەشـەوە بـە عـەینی گەرمی و حەرارەت رۆحی موعارەزە لە زیادبونا بو، لە سەرێکەوە فەعالیەت و موجاهەداتی وەفـدی عیراقـی تەقدیر ئەکرا، خولاصە لەم بوحرانەدا روئەسای سیاسـەت رێگـای خۆیـان ون کـرد سیاسـەتی داخلیـەیان کامیلەن وەیا تەقریبەن لە بیر چوەوە، ئەخیرەن لە هەوایـەکی وا پـڕ فەرتەنـەدا قابینـەی تـازە تەشـەکولی کرد.

"ئـەبینم هـەر وەکـو مـن هـەمو فـەردێکی کـورد کـە خبـری زانـی جنـابی فخامـت مئـاب حـەزرەت عەبدولموحسین بک السەعدون تشکیلی وزارەت ئەکات زۆر کەیف خۆش بو، چونکە اول داخلکەری وەزیـری کورد بە قابینەی عیراق حەزرەتی عەبدولموحسین بەگ بو، لە بەر ئەوە ئێمە لە هەمو خسوسێک و حقوقێکەوە ئەمەلی گەورەمان بەو زاتە محترمە هەیە، غەیری ئەمەیش هەمو کەس ئەیزانی کە فخامتی لە هەمو کەسێ زیـاتر لەسەر ئامەدان و ئەشرافی عیراقەو انجبی نجبای میللەتی نجیبەی عەرەبـە، تـەبیعی زاتێکـی وا نجیـب و داهـی هەمو وەقتێک کرم و سنمای ئەبێ تأملێک لـە لیسـتەی وزارەت تـازە بکـرێ معلـوم ئـەبێ کـە اقلیـاتی عیـراق هەریەکە لە صورتی شخصی وەیا دو شخصا تجسمی کردوە و بەکەمالی هیبەت و وقار لەسەر کورسـی وزارەت دانیشتوە، کەچی قومی بەدبەختی کورد بە نەزەر ئەم اقلیاتەوە ئەکسەریەتێکی عەزیمە تشکیل ئەکـەن و ئەگـەر موافقی عدل و مساوات و بەپێی نفوسی موجودە حرکەت بکرایە حقی اشغالی 3 کورسیان نەبو، مـع الاسـف سماحتی بەخشینی کورسیەکەیشمان لەگەڵ نەکرا.

"ئێمە قەومی کـورد، هـیچ وەقتێـک نەمانویسـتوە و نامانـەوێ حەرەکـەتێک کـە زەرە بـۆنی تەفرەقـەو (جیایەتی) تیابێ بیکەین. فەقەت ئەبینین ئێمە موقابیل بە خلوص و ئیعتیمادمان لە تەنها کورسـیەکی وەزارەت مەحروم ئەبین. لەگەڵ ئەمیش دا کە ئەم مەحرومیەتەو ئەم تەجاوزی حەقە بە ئینتیـزار و عەدالەتـەوە موقابەلـە ئەکەین، کەچی یەکێ لە غەزەتەکانی بەغداد بە صورەتی ئیستیهزا ئەنوسـێ کـە کورسـیەکی وەزارەت بـۆ بـرا کوردەکانمان هەڵگیراوە فەقەت فەخامتی عەبدولموحسین بک نشئوم لە أیت (تسعە فقط یفسدون فـي الارض) کردوە و، نایەوێ وزارەتی نۆیەم بدا بەکەس وەیا بە تەعبیری اصمەکی بیدا بە کورد. نەکو ئیفسـادی ئـەرزی عیراق بکەن. سوبحانەڵا. ئەوەلەن، زاتێکی نەجیب و قەدرزان و تێگەشتوی وەکـو فەخامـەتی موحسـین بـەگ هیچ وەقتێک فکرێکی وای نەکردوە و نایکات.

"سانیەن: طفل مشروطین عراق هەتا ئێستا پێنج باوک وەیا پێـنج وزارەتـی دی، لەمانـە تـەنها دوانـی ئەخیر کورسییەکی کوردی تیابو، نازانم کامە یەک لەم پێنجە بە صەمیمیەت و جدیـەتێکی وەتەنپەروەرانـە بـۆ مەنافیعی موڵک و میللەت تێ هەڵچون و، چەنـد خدمـەتێکی موهیمیـان بـۆ ئومەتەکـەیان کـردو چ ئەسـەرێکی تەرەقی سیاسی، ئیجتیماعی، ئیقتیصادییان پیشان دا.

"مقسد توهم لێ تێک دان، یاخود نەبێ رشی شخصێک بەرامبەر بە رشی و ناقـدومی هەشـت کـەس چ تأثیرێکی ببێ کە افسادی ئەرز بکات.

ئێمە بەناوی سەلامەتی وەتەنەوە ئارەزومان وابو کە هەمو عەناصیری موختەلیفەی عیراق دەست بدەنە یەک و موتەفیق بن و رێگای نەشر و دەرکەوتنی بەعزێ قسە و نوسین نەدرێ کە ئەبێ بە سەبەبی تەفرەقە و برودەتی بەینی کوردو عەرەب.

"وەدیسان بەناوی عەدل و مساواتەوە ئارەزومان ئەکرد کە رەئیس وزەرای تازە لە تەشکیلی قابینەکەی دا قەومی کوردی بە ئەکسەریەتی موهیمەیەوە لە بیر نەچوایەوە، بە سەخاو کەرەمێکی سەعدونییەوە ئەویشی وەکو ئەقەلیاتەکانی تر نائیلی دو کورسییەک بکردایە." (ژیان، ژمارە (102)، 16ی 2 ی 1928)

### 1. 4. 17. **صورەتی تەرجومەی تەلغرافی ژمارە** 1067 **رۆژ** 19 **ی** 1 **ی** 1928

"وەزارەتی داخلیە

"بۆ موتەسەرِیفی سلێمانی

"لەبەر ئەوەی کە ئەساسی مەشروتییەت ئیجاب بە موازەنەتێکی قەوی ئەکات لە بەینی قیوای ئیجرائیە و قیوای تەشریعیەدا و ئەم موازنەتەیش مەنوتە بە مەوجودیەتی شوعباتی پارلەمانت و کە صاحب مقاصد معینە و غایەی معلومە بن و لبراوەی کە ئەوزاع ئیسپاتی کردوە مجلس امت لە وەزعیەتی حازریدا ئەو فەرقانەی تیا نیە تەئمینی مەوجودیەتی ئەم موازنەتە بکا و لە بەر ئەوەی حکومەت مەسائیلی زۆر موهیمی بە دەستەوەیە کە مەنافیعی ئەهەمی میلەتی تیایە وەکو موعاهەدەی ئینگلیز و عیراق و ئیتیفاقنامەی مالی و عەسکەری و مەسئەلەی دیفاعی وەتەنی کە ئیجاب ئەکات لە هەمویان میلەت خەبەردار بکرێت کە حسیاتی خۆیان نیشان بدەن و فرصەتیان بدرێتێ کە لەم خسوساتەوە بە واسیتەی مومەسیلینیانەوە خواهیشی خۆیان بەیان بکەن، و فەسخی مەجلیسی نومەت و موباشەرەت بە ئینتیخابات بۆ مەجلیسی تازە موافیقی مادە 26 ی قانونی ئەساسی ئیرادەی مەلەکی صادر بوە، ئەمرۆ مەجلیس فەسخ بوەوە، بۆ مەعلومات بۆ ئەوەی فەورەن موافیقی قانون دەست بە ئینتیخابات بکرێ نێررا." (ژیان، ژمارە (99)، 24 ی 1 ی 1928)

### 1. 4. 18. **خیطابێک مقابل بە هەمو میللەتی کورد..!**

"ئێوە هەمو ئەیزانن بەپێی قراری عصبە الامم، ئەمرۆ ئێمە لەگەڵ حکومەتی عیراق ئەژین و هەمو مقدراتێکمان لەگەڵ ئەوانایە، لە هەمو شتێک زیاتر سەبەب و التی (ئالیەتی)! ترقی و تعالی میللەتێک قوانین و نظاماتی حکومەتەکەیە، یەعنی ترقی میللەتێک لەگەڵ قوانین حکومەتەکەیان مبسوطا متناسبە، باش بێ ئەبێ بە واسیتەی ترقی میللەتەکە، خراپ بێ میللەتەکە دوا ئەخات و محوی ئەکاتەوە، هەمویش ئەیزانین ئەم قوانین و نظاماتە هەموی بۆ تدقیق و اصلاح و تصدیقی تودیعی مجلس مەبعوسان ئەکرێ، تەبیعی ئەوسا هەمو مەبعوسێک لەگەڵ قابلیەت ملیەی و سیعەتی ئەرزی لیواکە موفید بو، تصدیق والا بە ئیعتیرازێکی معقول هەتا ئەبێ بە سەبەبی ترقی لواکەی بۆ اصلاحی هەول ادا، ئینجا کەوابو بۆ ئەم جێگایە پیاوی فعال و مقتدر، وەتەن پەروەرو میللەت خۆشەویست بەعەمەل دێ، ئەمرۆ لیواکانی کورد دواکەوتوی هەمو عیراقە، ئەمیش بە واسیتەی مەبعوسەکانمانەوە بو، چونکە ئەو مەبعوسانەی کە لە اوەل دورەدا انتخابمان کردن هەموی نا فەقەت بە ئەکسەریەت، هیچ اوصافێکی مەبعوسیان تیا نەبو، پیاوی ئەو مجلسە نەبون و هەریەکەیان بۆ منفعتی خسوسی خۆیان منفعتی عمومی میللەتەکەیان واز لێ هێنابو، بۆ خاتری خۆیان گەورەبن هەریەکە ئینتسابی کردبو بە یەکێ لە وەزیرەکان و پیاو بە دەستەکانی ترەوە، عادتا وەکو مادۆنێکی ئەوان تابعی هەمو ئەفکارو ئەوامریان بون، هەتا نتیجە وا دوایان خستین و لە هەمو اساسێکی ترقی محرومیان کردین.

"ئینجا میللەت خۆ ئەمانەمان زانی، لەوانەیە تجربەیەکی باشمان دی، لازمە عەقڵمان بێتەوە سەر، هەمو اهالی لیوایەک بە جدی تێ بکۆشین کە بۆ ئەم جێگایە پیاوی باش و فعال و مقتدر، میللەت پەروەرو وەتەن

خۆشەویست انتخاب بکەین، چونکە ئیتر ئەمە بۆ حیات و ئیستقبالێکی چوار ساڵیە، خودانەخواستە ئیتر ئەگەر لەم ساڵیش زیاتر دوابکەوین (جبرما فاتی)! قابل نابێ و پەشیمانی فائیدە ناکات، ئیتر خۆتان و غیرەتتان، (حب الوطن من الایمان) ئەبێ بەدڵ و بەگیان بۆ وەتەنەکەمان هەوڵ بدەین." (ژیان، ژمارە (103)، 23 ی 2 ی 1928)

**1. 4. 19. بە موناسەبەتی ئینتیخاباتی تازەی مەبعوسانەوە چەند قسەیەکی ڕەق ئەمما خۆش..**

"لەم بەینەدا بە موناسەبەتی ئینتیخاباتی تازەی مەبعوسانەوە شاری سلێمانی وەزعیەتێکی عەجایبی بەسەرا هاتوە، لە هەمو کۆڵانێک، لە هەمو چایخانەیەک و دیوەخانێک قسە و بەحسی مەبعوسی تیکرار ئەبێتەوە، حەتا دەوائیری حکومەت، ستونی غەزەتە، بەم مەوزوعە ئەشغال کراوە، هەر کەسە بە نەوعێ تەشویقات بۆ خۆی و یا بۆ خزمێک و دۆستێکی ئەکات، ئەوانەی کە ئیقتیداری کاتبێکی دائرەیەکیان نییە هەوای مەبعوسی کەللەیانی پڕ کردوە، ئەوانەی تا ئەمڕۆ کوردییەت و میللیەتیان پێ عار بوە ئەمڕۆ بە لایەنی فیداکاری و وەتەن پەروەری گوێی عالەمیان کەڕ کردوە، هەر کلەیک، هەر ئانێک نەوعێک نەقەرات تیکرار ئەکاتەوە، وەکو بەرخەکە ئێستا – دایکی من ڕەش بو – هەریەکە ڕۆژی نەوعێ ئەلبیسە لەبەر ئەکات و لە نەوعە شکلێکی موختەلیفدا خۆی نیشانی میللەت ئەدات، خۆ موخابەرات و کاغەزی ئیلتیماس ئەوەندە زۆر بوە پۆستەی ئەوەندە گران کردوە کە موتەعیهد بە ئوتومبێل پێی هەڵناگیرێ، اشتیاق و فیداکاری بەعزێک ئەوەندە لە غلیانە کە تحملی جوابی کاغەزەکانیان ناتوانن بکەن، خۆیان بالزات بە شوێن کاغەزەکانیانا دێنە سلێمانی. زائرین ئەوەندە زۆر بوە دیوەخانانی پڕ کردوە، (ئێمە بیستومانە کە لە کوردستانا هەر گەزۆ ئەبارێت، نەمانزانیوە کە ئەمساڵ پەڵەی مەبعوسی داوە). فەقەت ئەی میللەت، ئەی برادەرینە قسەی ڕاستتان عەرز بکەم، ئەم هەمو فیداکاریە، ئەم کوسرەتی ئیشتیاقە، ئەم کۆمەڵە لاف و گەزافە، موحەققەق بزانن هەر بۆ معاشە مبن و لەکەیە! هەر بۆ پڕکردنی گیرفانە لە مسکوکات متنوعە. خۆزگە حکومەت ئەم خزمەتی وەتەنەی مجانا تکلیف بکردایە و یا معاشی مەبعوسی بکردایە بە صەد روپیە، ئەو حەلە فیداکار، وەتەنپەروەر بوار دەری ئەخست، بە ئیعتیبار بە ئەکسەریەت کە زاهیرەن بە زمان ئەم وەعدانە بە ئێوە ئەدەن، ئەم فیداکاری کە پیشانی ئەدەن، کەچی لە دڵدا لەگەڵ شتێکی تر خەریکن، ئەوان پلانی خۆیانیان دەمێکە ڕێکخستوە، لەم ئەدواری ئیجتیماعەدا چەند معاش وەرئەگرن، چەند سەرف ئەکەن، چەندی پاشەکەوت ئەکەن هەمویان حساب کردوە، لەسەر چ جادەیەک، لە چ مەملەکتێک کلاوی چ قوڕ بەسەرێک بە هەرزان ئەکرن و لەو کلاوەدا چ نەوعە بینایەک دروست ئەکەن و یا چ دێیەک ئەکرن. هەموی بە ڕێکوپێکی پرۆغرامەکەی کە بە خەیاڵ تەرتیبیان کردوە لە گیرفانیانایە، (مزگەوت روخاوە میحرابی ماوە) ئەی میللەت موحەققەق بزانە کە ئەبێ خۆت بەزەبیت بەخۆتا بێتەوە.

"فەقەت ها ئەم قسانە بە ئەوە نیە کە ئێوە مأویس بن زاتەن لە سەرەوە وتم ئەم قسەیەم بە ئیعتیباری عمومی نیە، لە ناوخۆدا ئینسانی فیداکار، وەتەنپەروەر، موستەعید هەیە، زۆر چاک چاو بگێڕە، زەریف وردبەرەوە، لە ڕوا دامەمێنە، خزم و ئاشنا تەماشا مەکە، ئەوەی بە کەڵکت دێت، ئەوی دەرمانی دەردت ئەکات، ئەوی ئیعتیمادت بە عیلم و سەویەی هەیە، ئەوی قیمەتی لای تۆ مەعلوم و موجەرەبە، حاصلی ئاوی حەیات و مەماتی ئەوی، سەعادەت و فەلاکەتی لەگەڵ تۆدا موشتەرەکە ئەوە هەڵبژێرە و پرۆغرامی داوا لێ بکە، پشت بە یەکێک مەبەستە کە ئاگرت تێ بەر بداو خۆی لە دورەوە سەیرت بکات ئیتر من:

انچه شرط بلاغ است با تو میگویم

تو خواهی از سخنم پند گیرو خواهی ملال." (ژیان، ژمارە 104، 1 ی 3 1928)

## 2. کوردو پەیماننامەی 1930

### 2. 1. وەزارەتی نوری سعید

عیراق بۆ ئەوەی زەمینەی پەیمانێکی نوێ لە گەڵ بریتانیا خۆش بکا، ئەو یش زەمینەی سەربەخۆیی عیراق و ئامادەکردنی بۆ ئەندامەتی لە کۆمەڵەی گەلاندا خۆش بکا، ئەبو هەڵبژاردنێکی نوێ بۆ مەجلیسێکی نوێ ساز بکا. دانانی رێوشوێنی هەڵبژاردنی نوێ بە وەزارەتەکەی عەبدولموحسین سەعدون سپێردرا، بەڵام سەعدون لە ئێوارەی 13 ی 11 ی 1929 دا خۆی کوشت.

رۆژی 18 ی 11 ی 1929 وەزارەتی نوێ بە سەرۆکایەتی ناجی سویدی دامەزرا. وەزارەتەکەی سویدی لە 4 مانگ کەمتر دەوامی کرد. رۆژی 11 ی 3 ی 1930 دەستی لە کار کێشایەوە. مەلیک فەیسەڵ داوای لە نوری سەعید کرد وەزارەت دروست بکا. نوری سەعید 23 ی 3 ی 1930 وەزارەتێکی نوێی پێکهێنا. سەرەرای ئەوەی خۆی سەروەزیران بو، بە وەکالەت هەردو وەزارەتی کاروباری دەرەوە و کاروباری ناوخۆ یشی بۆ خۆی دانا. وەزارەتی کاروباری دەرەوە بۆ ئەوەی خۆی سەرۆکایەتی نوێنەرایەتی عیراق بکا لە گفتوگۆدا لە گەڵ لایەنی ئینگلیزی، بۆ بەستنی پەیمانێکی نوێ کە هەمو رێککەوتنە کۆنەکانی عیراق–بریتانیای هەڵئەوەشانەوە. وەزارەتی کاروباری ناوخۆ یش بۆ ئەوەی ئەنجامی هەڵبژاردنەکە بەجۆرێ مسۆگەر بکا کە پەیمانەکە هەرچۆنێ بێ، ئیمزای بکەن.

بابەتی گفتوگۆکانی عیراق و ئینگلیز لە رۆژنامەکاندا بڵاو ئەبونەوە. یەکێ لەو مەسەلانەی سەرانی کوردی ئە وروژان، ئەوە بو: پێشنوسی ئەم رێککەوتننامە تازەیە هیچ مادەیەکی دەربارەی پاراستنی مافەکانی کورد تێدا نەبو. تەنانەت کە مەعروف جیاوک (نائیبی هەولێر) لەو بارەیەوە لە مەجلیسی نوابدا پرسیاری لە سەروەزیران کرد، بە تورەبونەوە وتی: "ئەمە رێککەوتننامەیەکی ناودەوڵەتیە، پێویست ناکا مەسەلە ناوخۆییەکانی تێدا بێ".

وەزارەتی نوێ بڕیاریدا دوەمین مەجلیسی نواب (1ی 10ی 1928– 24ی 3ی 1930) هەڵبوەشێنرێتەوە و لە 10 ی 7 ی 1930 دا دەس بکرێ بە هەڵبژاردن بۆ سێیەمین مەجلیسی نواب و تا 10 ی 9 ی 1930 تەواو بکرێ.

### 2. 1. 1. سیاسەتی عیراقیی نوری سە عید

نوری سەعید بۆ ئەوەی ئەنجامی هەڵبژاردن بە قازانجی پەسندکردنی پەیمانەکە دەستەبەر بکا، چەند ڕێوشوێنێکی دانا:

بە بیانوی ئەوەی ڕۆژنامەکان دژی سیاسەتی ناوەوە و دەرەوە ئەنوسن، ڕۆژنامەکانی: الرافدان، صدی الاستقلال، الشعب، البلاد... ی داخست و، سەرنوسەرەکانی خستە ژێر چاودێری پۆلیسەوە.

هەوڵێکی زۆریدا ریزی حزبە موعاریزەکان تێک بدا و کەسانێکیان لێ بگرێ، خۆ یشی بۆ پشتگیری لە ڕێکەوتنەکە، حزب العهدی لە کەسانی سەر بە خۆی دروست کرد.

لەناو دەزگای بەڕێوەبەرایەتیدا، بەبیانوی کارامەیی‌یەوە ئاڵوگۆڕێکی زۆری لەناو فەرمانبەراندا کرد. دەسەڵاتی دا بە وەزیرەکان یش، بە بیانوی زۆری فەرمانبەرانەوە کێیان بوێ دەری بکەن.

دەرەبەگەکانی بە ئەرازی ئەمیری‌یەوە خەریک کرد. بەوە ترساندنی حکومەت ئەتوانێ ئەرزەکانیان لێ بسێنێتەوە، ئەگەر لە گەڵی نەبن.

سەرۆکی ئەرکانی جەیش فەرمانی دەرکرد کە هیچ عەسکەری‌یەک بە چەکەوە نەگەرێ، بۆ هیچ کۆڕێکی ئاینی نەچن و هەمو ئیجازاتێک کەم کرایەوە و لەغو کرا.

موفەتیشە ئیداری‌یەکانی ئینگلیز، لە گەڵ دەزگای بەڕێوەبەرایەتی حکومەت کەوتنە هاوکاری بۆ هەڵسەنگاندنی هەڵوێستی یەک بە یەکی پاڵێوراوەکانی هەڵبژاردن بەرامبەر ڕێکەوتنەکە.

### 2. 1. 2. سیاسەتی کوردیی نوری سە عید

نوری سەعید، بۆ ئەوەی کورد ئارام بکاتەوە و پشتیوانی‌یان بەدەس بهێنێ، بە پێی ڕاسپێری‌یەکانی موستەشاری بریتانی وەزارەتی ناوخۆی عیراق، هەندێ هەنگاوی بە قازانجی کورد نا. لە بواری ناسینی ڕەسمیی زمانی کوردیدا لە بەیانێکدا وتی:"پاش ئەوەی کە وەزارەت کاروباری گرتە دەست، بڕیاری دا گرنگی بدات بەو شتانەی دڵی میللەت خۆش ئەکەن و هیوا و ئارەزوەکانی بەشێک لە دانیشتوانی وڵاتمان ئەهێننەدی. لەبەرئەوە بڕیاری دا لائیحەیەکی قانونی ئامادە بکات بۆ کردنی زمانی کوردی بە ڕەسمی لەو شوێنانەی کوردی لێیە بە پێی مادەی 17 ی قانونی ئەساسی. ئەم هەنگاوەی حکومەت لەسەر ڕێبازی ئەو گفتانەیە کە کۆن دراون بە کوردەکانی عیراق". ئەم بڕیارە بە چاکە دەنگی دایەوە، سەرانی کورد بروسکەی سپاسیان بۆ نارد.

لە کەرکوک حکومەت حەفتەنامەیەکی بە تورکی لەژێر ناوی (کەرکوک)دا دەرئەکرد. تا ئەو کاتە هیچ ڕۆژنامەیەکی حکومەتی یا ئەهلی لە کەرکوک دەرنەچو بو، وەکو بەشێ لە سیاسەتی ڕازیکردنی کورد، 4 لاپەڕەی کەرکوک بۆ نوسینی کوردی تەرخان کرا.

لە بواری مەعاریف (خوێندن و پەروەردە)دا: مەعاریفی لیوای هەولێر لە مەعاریفی لیوای موسڵ و، مەعاریفی لیوای سلێمانی لە مەعاریفی لیوای بەغداد جیا کرایەوە. مەعاریفێکی تایبەتی بۆ ناوچە کوردی‌یەکان لە مەرکەزی کەرکوک دامەزرا. نوری بەرزنجیی بەڕێوەبەری قوتابخانەی سەرەتایی فەزل لە بەغداد کە مامۆستایەکی کورد بو، کرا بە پشکنەری ئەم دەزگایە. وەزارەتی مەعاریف، بۆ دەرسی قوتابخانە سەرەتاییەکان هەندێ کتێبی وەکو (دین، علوم، جغرافیە، تاریخ، هندسە)ی تەرجومە کرد بە کوردی.

لە بواری بەڕێوەبەرایەتیدا: هەندێ کەسایەتی ناسراوی کوردی هێنایە پێشەوە و کاری بەڕێوەبەرایەتی گرنگی پێ سپاردن، لەوانە: تۆفیق وەهبی کرا بە موتەسەڕیفی سلێمانی، عەبدولحەمید عەبدولمەجید کرا بە موتەسەڕیفی هەولێر و ساڵح زەکی بەگ کرا بە معاون مدیر عامی داخلیە. ماجید مستەفا کرا بە قایمقامی

قەزای ئامێدی، خەلەف شەوقی بە پشکنەری دارایی. هەندێ لەمانە بە کەسانی کوردپەروەر ناسرا بون، هەندێکیان لە هاوکارانی پێشوی شێخ مەحمود بون.

وەزارەتی عەدل، شیعاری دەوڵەتی عیراقی دانا. لەناو ئەم شیعارەدا دو ئەستێرەی وەکو نیشانەی هەردو گەلی کورد و عەرەب چەسپاند.

ئەم هەنگاوانەی نوری سەعید، بایی ئەوە نە بون پشتیوانی نیشتمانپەروەرانی کورد بەدەس بهێنێ. ئەوان چاوەروانی دەسکەوتی سیاسی بون. لە یەکێ لەو بڵاوکراوانەی بێ ئیمزا لەسەر ئەم وەزارەتە دەرچوە، نوسراوە: "کورد لە ئەقوال زیاتر چاوەروانی ئەفعالە".

### 2. 1. 3. دانانی تۆفیق وەهبی

تۆفیق وەهبی یەکێ لە پیاوە تێگەیشتوەکانی ئەو سەردەمەی سلێمانی بوە. لە سلێمانی و بەغداد و ئەستەموڵ خوێندویەتی و، لە ئۆردوی عوسمانیدا بوەتە ئەفسەری روکن. لە سەرەتای بیستەکاندا گەرایەوە عیراق و لە بەغداد دامەزرا. کاتێ شێخ مەحمود لە دیلی ئازاد کرا و گەرایەوە کوردستان و بو بە حوکمدار و دواتر مەلیکی کوردستان، تۆفیق وەهبی گەرایەوە سلێمانی و بو بە یاوەری. لە داگیرکردنی دوەمی سلێمانیدا (1922 ز) کوردستانی بەجێ هێشت و گەرایەوە بەغداد. لە جەیشی عیراقدا ئەفسەر و ماوەیەک فەرماندەی قوتابخانەی جەنگی پێگەیاندنی ئەفسەرانی عیراق بو.

تۆفیق وەهبی بە کوردپەروەر و رۆشنبیر ناسراوە. چەندین زمانی زانیوە و خەریکی لێکۆڵینەوەی زمانەوانی بوە. دەستوری زمانی کوردی داناوە، کە بە یەکەمین هەوڵی زانستیی دارشتنی رێزمانی کوردی دائەنرێ.

لە مانگی 4 ی 1930 دا کرا بە موتەسەریفی سلێمانی. ئەم هەواڵە بە خۆشییەکی زۆرەوە وەرگیرا. ژیان بە ستایشێکی زۆرەوە لەسەری نوسی. ژمارەیەکی زۆر لە خەڵکی سلێمانی چون بۆ پێشوازی و، هەندێکیان هەتا کەرکوک رۆیشتن. ئەو ماوەیەی کە ئەو موتەسەریف بو، جوڵانەوەی رۆشنبیری و سیاسیی بۆ داواکردنی مافی نەتەوەیی کورد لە سلێمانی گەیشتە پۆپەی. حکومەتی بەغداد ئەم چالاکیانەی بە هاندانی ئەو ئەزانی. لەسەر ئەوە لەسەرەتای 9 ی 1930 دا، پاش چوار مانگێ، کێشرایەوە بۆ بەغداد و لەسەرکار لابرا. دانانی چ خۆشییەکی لە سلێمانی خولقاند، لابردنی زۆر لەوە زیاتر نارەزایی وروژاند. بە بروسکەو مەزبەتە نارەزاییيان دەربڕی، بەڵام لە پایتەخت هیچ کەس گوێی نەدانێ.

### 2. 1. 4. دەنگدانەوەی پەیمانەکە

لە 1 ی 4 ی 1930 دا دەس کرا بە گفتوگۆ بۆ پەیمانی 30 ی 6 ی 1930، کە بەپێی ئەم پەیمانە ئەبو عیراق سەربەخۆ بێ. نوری سەعید رایگەیاند رۆژ بە رۆژ خەڵک لە رەوتی وتووێژ ئاگادار ئەکات. نوری سەعید ئەو ماوەیە لە لەندەن خەریکی گفتوگۆ بو، جەعفەر عەسکەریی وەکیلی سەروەزیران بو.

لە 18 ی 7 ی 1930 دا بەندەکانی پەیمانەکە بە رەسمی لەلایەن (ملاحظیة المطبوعات)ەوە درا بە رۆژنامەکان کە بەبێ لێدوان بڵاوی بکەنەوە. لە دور و نزیکەوە باسی مافەکانی کورد لەم پەیمانەدا نەبو.

لە زۆر شوێنی عیراق، لە خوارو و ناوەراست و سەرو، دژی بەندەکانی ئەم پەیمانە راوەستان. بەڵام بارودۆخی سلێمانی لە هەمو شوێنەکانی تر ئاڵۆز تر بو. هۆی دژایەتی کردنی ئەم پەیمانە لەلایەن کوردەوە جیاواز بو لە دژایەتی عەرەب. عەرەب پێیانوابو ئەمە نەک سەربەخۆیی بۆ عیراق دابین ناکا، بەڵکو جۆرێکە لە بەندایەتی. هەرچی کورد بو، پێیانوابو ئەم پەیمانە چونکە ناوی کوردی نەهێناوە، لەناو عیراقی عەرەبی دوارۆژدا مافەکانی کورد پایەماڵ ئەبێ. بریاری گشتی لە سلێمانی ئەوەبو کە هاوبەشی هەڵبژاردن نەکەن.

## 2.2. هەیئەتی وەطەنیە

لەم ماوەیەدا جوڵانەوەی کورد، لەو شکستەی کە بە هۆی شکانی جەنگی شێخ مەحمودەوە توشی هات بو، هەستا بوەوە. گیانی نەتەوەیی سەرلەنوێ بوژا بوەوە. سەرانی کورد کەوت بونەوە جموجۆڵ. ماوەی ئینتیدابی بەریتانی بەرەو تەواو بون ئەچو. عیراق یش خۆ ئامادە ئەکرد بۆ بەستنی ڕێککەوتننامەیەکی نوێ لە گەڵ بریتانیا و بەدەسهێنانی سەربەخۆییو چونە ناو کۆمەڵی گەلانەوە. ئەمانە نیشتمانپەروەرانی کوردیان پاڵ پێوە ئەنا، ئەوان یش داوای مافی نەتەوەیی کورد بکەن. بەتایبەتی چونکە هیوایان بە "دۆستایەتی" بریتانیا و "عەدالەت" ی کۆمەڵەی گەلان هەبو.

سەرانی کورد بە هیوا بون پێوەندیەکانی عەرەب و کورد لە عیراقدا، وەکو پێوەندیەکانی ئینگلیز و سکۆت لە بریتانیا ڕێکبخرێ. ئینگلیزەکان یش خۆیان ئیشارەتیان بەمە داوە. تەنانەت خۆشباوەڕیی هەندێ لە کوردەکانی ئەوسا گەیشتۆتە ئەورادەیە کە کورد لە تورکیا قەتڵوعام ئەکرێ، یەکێ لە شاعیرە کوردەکان لەژێر سەرناوی:"شین: تازیەی کوردان"دا لە شیعرێکی درێژدا نوسیویێتی:

گەردون کەوا کۆمە، زبانیشی کەلاڵە
بۆ کوردی ستەمدیدەی خنکاوی شیماڵە
ئەم چەرخە لەگەڵ چەرخ بە دایم کە لە شەڕدا
شینێکی شەهیدانە، لە پیر و لە مناڵە
ئەم کوردە چ مەزڵومە، خوێنی چەنە ئاڵە
ئایا ئەبێ لەم حاڵە نەگەن ئەهلی بریتان
هەم گەورەو سەرداری گەلی میللەت و قەومان؟
(ژیان، ژ58، 17ی 3 ی 927)

پیاوە ناسراوەکانی سلێمانی کە بە زاراوەی ئەوسا پێیان وتون (ئەشراف و وجەها) ئەکەونە خۆیان و چەند جارێ لە ماڵی حەمەی ئەوڕەحمان ئاغا و چەند جارێ لە ماڵی عەزمی بەگی بابان دا ئە نیشن، لەسەر پاشەڕۆژی کورد، بە تایبەتی دوای تەواو بونی ئینتیداب و سەربەخۆ بونی عیراق، لە گەڵ یەک راوێژ ئەکەن. ئەمانە لەناو خۆیاندا جۆرە کۆمیتەیەک بەناوی: (هەیئەتی وەطەنیە)وە پێک ئەهێنن. عەزمی بەگی بابان کە لە هەمویان بە ساڵداچو تر بوە، سەرۆکایەتی کردون. ئەم هەیئەتە باوەڕی بە بەکارهێنانی توندوتیژی نەبوە، وەکو عیزەت بەگی جاف وتویەتی: "ئەم جارە سیلاح و تفەنگمان قەڵەم و موراجەعاتە". پێوەندیەکی فراوانی لە گەڵ کەسایەتیە ناسراوەکانی کورد و سەرانی عەشیرەتەکاندا دروست کرد.*

---

* مەعروف جیاوک لەوبارەوە نوسیویەتی: (جەمعییەتێک لە سلێمانی پێک هات بۆ داواکردنی سەربەستیی و سەربەخۆیی. دامەزرێنەرەکانی وەکو لەبیرم بێ: حەمەئاغای ئەوڕەحمان ئاغا، شێخ قادری حەفید، موحەمەد صالح بەگ، تۆفیق قەزاز، ڕەمزی فەتاح، عیززەت مەدفەعی، عەزمی بەگی بابان، عیززەت بەگی عوسمان پاشا، ئەوڕەحمانی ئەحمەد پاشا، فایەق بەگی بابان، شێخ محەمەدی گوڵانی و سکرتێری ئەم هەیئەتەش ڕەشید نەجیب بو، کە بو بە موتەصەڕریفی کەرکووک، ئەوسا کاتب بو لای موفەتیشی حاکیمی سیاسی).
(معروف جیاوک: مأساة بارزان المظلومة، بغداد، 1954، ص83-84. وەکو ئەڵێن مەعروف جیاوک باوەڕپێکراوی ئەم هەیئەتە بوە لە هەولێر. بەڵام لەدوای ڕوداوەکەی 6 ی ئەیلولی سلێمانی کە بوەتە حاکم، ئەم لیکۆڵینەوەی لەگەڵ هەندێ لە گیراوەکانی هەیئەت کردوە).

شێخ مەحمود لەو کاتەدا لە پیران دانیشت بو. ئەم تاقمە کە دەس ئەکەن بە کار لەناو خۆیانـا گفتوگـۆ لەسەر ئەوە ئەکەن: ئاخۆ شێخ مەحمود لەم کارە ئاگادار بکرێ و بەشدار بکرێ یا نەء؟ ئەگەرچی لەسـەر ئـەم کێشەیە ناکۆک ئەبن و هەندێ مشتومڕیان ئەبێ، بەڵام سـەرەنجام هـەمویان لەسـەر ئـەوە ڕێکـدێن کـە شـێخ مەحمود ئاگادار نەکەن و خۆیانی لێ بەدور بگرن، چونکە لایان وا ئەبێ کە شێخ مـەحمود توشـی شـەڕ بـوە، لەلای ئینگلیز شکاوە. لە گفتوگۆکانی سلێمانیدا، لەم ڕوەوە ڕەمزی فەتاح وتویەتی: "ئەم حەقە بە میللەتی کورد دراوە. ئەگەر شێخ مەحمود خەطای کردبێ دیسـانەوە میللـەت قەباحـەتی نیـە. مـەعلومی فەخامەتتانـە خـەطای کەسێک حقوقی میللەتێکی وا مەحو ناکاتەوە...".

ئــەم ڕوداوە گــۆڕانێکی چۆنایــەتی بــو لــە جوڵانــەوەی نەتەوایــەتی کــوردا، ئــەوە یەکــەمین جار بو:

1. لەباتی ئاریستۆکراتی لادێ (شێخی تەریقەت و سەرۆکی عەشیرەت)، هەڵبژاردەی شاری (ئەشـراف، تیجار، ڕۆشنبیر) سەرکردایەتی بگرنە دەس.

2. لەباتی ئەوەی پەنا بۆ شۆڕشـی چەکـدار ببـەن، ڕێگـەی کـاری سیاسـی (خۆپیشـاندان، مـانگرتن، نوسینی بەیان و مەزبەتە، گفتوگۆ) بگرن.

3. لەباتی ئەوەی ناوچەی شـاخاوی عاسـی بکـەن بـە مەڵبەنـدی جموجـۆڵ، شـار (قوتابخانـە، بـازاڕ، دائیرەکان) بکەن بە مەیدانی چالاکی.

لەو سەردەمەدا سیاسییەکانی عەرەب لە عیراقدا ئـەیان تـوانی حزبـی سیاسـی دابمـەزرێنن، چەنـدین ڕۆژنامەی سیاسی بە عەرەبی دەرئەچون، بەڵام سیاسییەکانی کورد لەم مافە بـێ بـەش بـون، ڕێگـە نەئـەدران حیزبی سیاسی دابمەزرێنن و ڕۆژنامەی سیاسی دەربکەن.

### 2. 2. 1. ئەمیر غازی لە کوردستان

بۆ هێمنکردنەوەی خەڵک و دڵنیا کردنیان لەوەی کە مافەکانیان پارێزراوە، پـەیمانی نـوێی بریتـانی– عیراقی قازانجی گەلی عیراق، لە ناو ئـەو دا هـی گـەلی کـوردی یشـی تیایـە، غـازی کـوڕی مـەلیک فەیسـەڵ، وەلیعەهدی عەرشی عیراق، لە تەموزی 1930 دا سەردانی کوردستانی کرد.

بەر لەوەی ئەمیر غازی لە گەشتەکەیدا بگاتە سلێمانی، هەیئەتی وەطەنیە بـەیانێکی حەماسـی دەرکـرد. لەم بەیانەدا خواستەکانی کوردی ڕون کردەوە و داوای لە خەڵک کرد بـۆ پشـتیوانی لـەم خواسـتانە، خۆیـان ئامادە بکەن بۆ خۆپیشاندانێکی هێمنانە.

ئەمیر غازی لە گەشتەکەدا گەیشتە سلێمانی، لەلایەن حکومەتەوە پێشوازی ڕەسمیی کرا. خەڵک یش بۆ خۆپیشاندانێکی گەورە و هێمن لەبەردەمی سەرادا کۆبونەوە و پشـتیوانیان لـە خواسـتەکانی کـورد کـرد. بـە نوێنەرایەتی خەڵک، ڕەمزی فەتاح و تۆفیق قـەزاز قسـەیان کـرد. داوایـان لـە ئـەمیر غـازی کـرد داواکانیـان بگەیەنێ بە دەسەڵاتدارانی بەرز.

بێگومان غازی بەتەمای ئەمە نەبو، ڕۆژنامەکانی بەغداد بە نارەزاییەوە هـەواڵی ئـەم پێشـوازییـەیان بڵاوکردەوە.

### 2. 2. 2. وەفدی وەزاری لە کوردستان

ئەنجومەنی وەزیران لە کۆبونەوەی 5 ی 8 ی 1930 دا بڕیاریدا وەفدێکی وەزاری، هـاوڕێ لـە گـەڵ کاپتن هۆلتی وەکیلی مەندوبی سامی، بـۆ گەشـتێکی سیاسـی ڕەوانـەی کوردسـتان بکـا، بـەو هیوایـەی ئـەو

ئاڵۆزییەی بەهۆی بەستنی پەیمانی بریتانی– عیراقی‌و فەرامۆشکردنی مافەکانی کوردەوە دروست بوبو، برەوێنێتەوە و، زەمینەی هەڵبژاردنی داهاتو خۆش بکەن.

وەفدە وەزاریەکە پێک هات بو لە: وەکیلی سەرۆکی وەزیران، جەعفەر عەسکەری وەزیری عەدل، جەمال بابان وەزیری کاروباری ناوخۆ، جەمیل مەدفەعی وەکیلی مەندوبی سامی. لەو کاتەدا هێشتا نوری سەعید، سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیرانی عیراق، لە بریتانیا نەگەڕابوەوە.

هەیئەتی وەطەنیە بەم بۆنەیەوە بەیانێکی حەماسی دەرکرد، بۆ پشتیوانی لە خواستەکانیان داوایان لە خەڵک کرد، لە ڕۆژی گەیشتنی وەفدەکەدا، بۆ خۆپیشاندانێکی هێمنانە خۆیان ساز بدەن.

لە سەرەتای ئابی 1930 دا وەفدەکە چوە کەرکوک و هەولێر، ئینجا سلێمانی. لە هەر 3 شار لە گەڵ پیاوە ناسراوەکانی کورد کۆبونەوە. وەکیلی سەرۆکی وەزیران و وەکیلی مەندوبی سامی، هەر یەکەیان وتارێکی ئامادە کردبو، کە هەڵوێستی حکومەتەکانیانی دەرئەبڕی، لەم کۆبونەوانەدا خوێندیاننەوە.

جەعفەر عەسکەری لە وتارەکەی‌دا وتی:

"من بۆتان تەصریح دەکەم کە حکومەتی عیراق بە صورەتێکی ئەکیدە قەراری داوە کە بە نەزەری ئیعتیبار تەماشای ئەو وەعدانە بکات کە بۆ تەئمینی ئارەزوی برا کوردەکانمانی دابو لەوەش نەک تەنها هەتا ساڵی 1923 مەرعییەلئیجرای ئەبێ، بەڵام هەتا مابەعدی ئەو تاریخەش دەوام دەکات...

"لە عەینی زەمانا بە هەمو شیدەتێک بۆ مەحوکردنی هەمو جۆرە نەعرەیەکی کە ببێتە سەبەبی تەفرەقەو ئیخلالی وەحدەتی وەتەنیەی عیراق، یاخود ببێتە سەبەبی ئیخلال کردنی حقوقی دراوسێیەتی لە گەڵ هەر دو حکومەتی دۆستمان: ئێران و تورک..."

وەکیلی مەندوبی سامی یش لە وتارەکەی‌دا وتی:

"... قەت شتێکی وا نیە لە هیچ نوقتەیەکی عیراق کە بڵێن حکومەتی عیراق یان حکومەتی بریتانیا هەر یەکە بۆ خۆی تەعقیبی سیاسەتێک بکا، تازە ئەوا موعاهەدەیەک ئیمزا کراوە کە ئەم دو مەملەکەتە بۆ 25 ساڵی تر لە گەڵ یەکتری بە تەحالوفێکی صەمیمی رەبط دەکات...

"... غایەی یەکەمینیان ئەوەیە کە تەئمینی تەئسیسی دەوڵەتێکی عیراق بکات کە ئازاد و سەربەخۆ بێت... هەرچی حەرەکەتێک لە گەڵ ئەم سیاسەتە تەوافوق نەکات حکومەت بەباشی سەیری ناکات، وەکو جیابونەوەی کوردان".

"... سەیر دەکەم بەعزێ جیهاتی نامەسئول وای دەهێننە پێشەوە کە تەشجیع کردنی حەرەکەتی قەومیەی کوردی سیاسەتێکی قەطعیەی حکومەتی جەلالەتی مەلیکی بریتانیایە، ئەمە نەک تەنها بۆ عیراق، بەڵکو بۆ دراوسێ و دۆستەکانی تری کە حکومەتی ئێران و تورکیایە موجیبی ئیرتیباک دەبێت. هیچ شتێک نیە کە لەمە زیاتر لە حەقیقەت دور بێت...

"ئەوەی کە هەردو حکومەت: بریتانیا و عیراق، حەز ئەکەن ببینن پێشکەوتنی سولحپەروەرانەی عیراقێکی یەکگرتوە، کە لەوێ هەمو ئەو عونصورە موختەلیفانەی ئەهالی تەشکیل دەکەن، غەرەضی زۆر موهیمیان ئەوە بێ کە ببن بە عیراقێکی چاک".

بەو پێیە هەڵوێستی بریتانیای لە کێشەی کورد رون کردەوە کە: پشتیوانی لە خواستە نەتەوەیی‌یەکانی کورد بۆ دامەزراندنی دەوڵەتی کوردی ناکەن، بەڵکو ئەیانەوێ کورد ببێ بە "عیراقیەکی چاک".

لە هەر 3 شار گفتوگۆی گەرم و توندوتیژ لە نێوان نوێنەرانی کورد و وەفدی حکومەتدا کرا. نوێنەرانی کورد بە راشکاوی ئەیان وت: نایانەوێ لە گەڵ عەرەب پێکەوە بژین، بەڵکو ئەمان یش ئەیانەوێ: حکومەتێکی کوردی سەربەخۆ، لەژێر ئینتیدابی دەوڵەتێکدا کە کۆمەڵەی گەلان دیاری بکا، دابمەزرێنرێ. بۆ ئەمە یش ئەو بەڵێنانەیان ئەکرد بە بیانو کە کۆمەڵەی گەلان کاتی خۆی بە کوردی دابون.

داواکەیان پێچەوانەی بۆچونی کاربەدەستانی عیراق و لە گەڵ سیاسەتی بریتانیدا نە ئەگونجا، لەبەرئەوە ئومێدی جێبەجێ کردنیان لێ نەئەکرا. وەفدی وەزاری گەرایەوە بەغداد بێ ئەوەی لە گەڵ سەرانی کورد، گەیشتبێتە هیچ جۆرە لە یەک گەیشتنێ.

## 2. 2. 3. ناردنی بروسکە و یادداشت

هەیئەتی وەطەنیە کەوتە جموجۆڵێکی سیاسی فراوان: هاندانی سەرانی کورد بۆ ناردنی بروسکە، یادداشت، نامە.. بۆ کاربەدەستانی عیراق، بریتانیا، کۆمەڵەی گەلان و سازدانی خۆپیشاندانی جەماوەری فراوان و هێمنانە. سەرانی کورد ئومێدێکی زۆریان بە "عەدالەتی عەسبەتول ئومەم" هەبو. تەنانەت ئەو لافیتانەی لە کاتی خۆپیشاندانەکانی پێشوازی ئەمیر غازی و، وەفدی وەزاری و، رۆژی 6 ی 9 دا بەرزیان کرد بونەوە، بریتی بون لە دو دروشمی سەرەکی: (رەوابێ مەتالیبی میللەتی کورد) و (بەرقەرار بێ عەدالەتی عیصبەتول ئومەم).

لەناو ئەوانەدا کە بروسکەو یادداشتیان ناردوە بۆ کۆمەڵەی گەلان: ئەشرافی سلێمانی، سەرانی عەشیرەتەکانی پشدەر، هەورامان، هەمەوەند، جاف، تەنانەت ژنانی سلێمانی یش لەم هەوڵە نیشتمانیە دوانەکەوتن. حەپسە خانی نەقیب و دەستە خوشکەکانی داوای مافەکانی کوردیان کرد.

لەو کاتەدا بریتانیا گەورەترین هێزی دنیا و بە دەسەڵاتترین هێزی ناو کۆمەڵەی گەلان بو. لە هەمان کاتدا ماندانتۆری عیراق یش بو. نامە و یادداشتەکانی سەرانی کورد لە رێگەی ئەوانەوە ئەنێردرا بۆ کۆمەڵەی گەلان. بریتانیا بڕیاری دابو کە عیراق بە یەککگرتویی بمێنێتەوە و بکرێتە ئەندامی کۆمەڵەی گەلان. لە بەر ئەوە نەک هەر گوێی نەدایە خواستەکانی کورد، بەڵکو لە راپۆرتەکانیدا لەسەر پێشکەوتنی عیراق کە پێشکەشی کۆمەڵەی گەلانی ئەکرد، پاکانەی بۆ عیراق ئەکرد سەبارەت بەو شکاتانەی لێی ئەکران و گەواهی درۆی بۆ ئەدا کە خواستەکانی کوردی بەجێ هێناوە. کۆمەڵەی گەلان یش شایەتیەکانی دەوڵەتی ماندانتۆری لە بەرچاو ئەگرت، لە بەر ئەوە گوێی نەدایە خواستەکانی کورد.

ئەحمەد موختار جاف کە چەند جارێ لە مەجلیسی نوابدا نائیبی هەڵەبجە بوە، دیارە لە کەینوبەینی ژێر بەژێری کۆمەڵەی گەلان ئاگادار بوە، بۆیە بێ مەڵامەت نیە کە لە شیعرە بەناوبانگەکەیدا بە راشکاوی ئەڵێ:

> ئەم قەراری عیسبەیە وا خەڵق ئەڵێن بۆ کورد ئەبێ،
> هەر قسەی روتە و، قسەیش ناچێتە ناو گیرفانەوە!
> سەرەنجام پێشبینیەکەی ئەم هاتە دی.

## 2. 2. 4. بادینان و خواستەکانی کورد

لەم جوڵانەوە سیاسیە فراوانەدا، بادینان بە هۆی هەڵوێستی سەلبی: شێخ رەفیقی سورچی، فارس ئاغای زێباری، رەشید بەگی بەرواری، شێخ نوری بریفکانی و چەند کەسێکی ترەوە.. دابرابو. ئەمانە بە ئاشکرا پشتیوانییان لە حکومەتی عیراق کرد. دژی خواستەکانی کورد راوەستان و، نەریتێکی خائینانەیان

بەرامبەر جوڵانەوەی نەتەوەیی کورد، بۆ کوڕ و نەوەکانیان داهێنا، تا ساڵانێکی درێژ لەسەری ڕۆشیتن، هەر لە سۆنگەی ئەمانەوە:

**یەکەم:** ئەگەرچی حکومەتی عیراق لە ناوچە کوردنشینەکاندا زمانی کوردی بە زمانی رەسمی خوێندن و دادگا و دائیرەکانی ناسی، لە بادینان ئەمە جێبەجێ نەکرا.

**دوەم:** ئەو پرۆژەیە یش کە کاربەدەستانی ئینگلیزی چەند جارێ بۆ کاربەدەستانی عیراقیان پێشنیار کرد، دەربارەی ئەوەی قەزا کوردییەکانی موسڵ، دهۆک، زاخۆ، ئامێدی و ئاکرێ، بکرێن بە لیوایەکی سەربەخۆ، بە رەزامەندی ئەمان و بە هۆی دەسەڵاتدارەکانی موسڵەوە، سەری نەگرت.

## 2. 3. هەڵبژاردنی 1930

وەزارەتەکەی نوری سەعید گوێی نەدایە نارەزایی کورد و نارەزایی عەرەب. سور بو لەسەر ئەنجامدانی هەڵبژاردن و ئیمزا کردنی پەیمانی بریتانی– عیراقی. وەزارەتی داخلیە بۆ هەمو لیواکانی نوسی کە تا ئەتوانن بە پەلە دەس بکرێ بە هەڵبژاردنی هەیئەتی تەفتیش بۆ هەڵبژاردنی نائیبەکان.

### 2. 3. 1. شەڕی بەر دەرکی سەرا

تۆفیق وەهبی کە موتەسەڕیفی سلێمانی بو، لە سەرەتای مانگی 9 دا کێشرایەوە بۆ بەغداد و لێخرا. ئەمە نارەزایییەکی زۆری لە ناو دانیشتوانی سلێمانی و سەرانی ئێڵەکاندا خوڵقاند. حکومەت لای وابو وەهبی بەگ یەکێکە لە هاندەرانی جموجوڵی سیاسیی سلێمانی. لەو سەردەمەدا موفەتیشی ئیداری کە ئینگلیز بو، لە هەمو لیواکانی عیراقدا خاوەن دەسەڵات بون. موفەتیشی ئیداری سلێمانی، کابرایەک بو بە ناوی گاون، بەڵام ئەمیش بە ئیجازەی 6 مانگ سەفەری کرد بو. سلێمانی موتەسەڕیفی نەبو، موفەتیشی ئیداریەکەی یشی لە ئیجازە بو، کەسی یەکەمی خاوەن دەسەڵات، وەکیلەکەی گاون، کابرایەکی ئینگلیز بو بەناوی ئالبن. داوودەزگای بەرێوەبەرایەتی سلێمانی رێنوێنی و فەرمانیان لە میستەر ئالبن وەرگرت.

شەوی 4 ی 9 هەیئەتی وەطەنیە لە ماڵی عەزمی بەگی بابان دانیشتن، بڕیاریان دا: لە هەڵبژاردندا بەشداری نەکەن.

ڕۆژی پێنج شەمە 4 ی 9 فایق بێکەس قوتابیەکانی زانستی لە گەڕەکی سابونکەران هێنایە خوارەوە. بە دەوری سەرادا دانیشتن، سرودی نیشتمانییان ئەخوێند و هوتافیان ئەکێشا. لە پڕ ئۆتۆمۆبیلەکەی موفەتیشی ئیداری دەرکەوت، دایانە بەر بەرد.

ڕۆژی شەمە 6 ی 9 دانرا بو کە هەیئەتی تەفتیش، بۆ سەرپەرشتی هەڵبژاردنی (منتخبە سانەویەکان) لە سەرای سلێمانی ئامادەبن. نزیکەی 30 کەسێک لە سەرادا کۆبونەوە بۆ هەڵبژاردنی نائیبەکان.

سەرانی هەیئەتی وەطەنیە لایەنگری توندوتیژی نە بون، هەر لە بەر ئەوە لەم خۆپیشاندانەدا بەشدار نە بون. ئەوەی هاندەری سەرەکی بوە و سەرکردایەتی کردوە، فایق بێکەس بوە. فایق بێکەس و قوتابیەکانی زانستی لە بازاڕ کەوتنە داخستنی دوکان بە خەڵک. بەشی زۆری خەڵک دوکانیان داخست و بەرەو بەردەرکی سەرا ڕۆیشتن.

لە چایخانەکاندا بە گرامەفۆن سرودی نیشتمانی لێ ئەدرا. خەڵک زۆر کۆبونەوە. هوتاف و شیعارات بە دەنگی بەرز لە دژی هەڵبژاردن ئەدرا. وەکو بەیانەکەی حکومەت یش ئەڵێ ژمارەی خۆپیشاندەران زیادی کرد، گەیشتە 2 تا 3 هەزار کەس. خۆپیشاندەران بەردەرکی سەرایان گرت بو، رێگەیان لە هاتوچۆی ناو

سەرا و دەرەوەی ئەگرت. پۆلیس نەی توانی بڵاوەیان پێ بکا و ڕێگای هاتوچۆ بکاتەوە. لە نێوان پۆلیس و خەڵک دا بو بە شەڕە دار و بەردە فڕکێ، ئەم روداوە لە سەعات 11 ی پێش نیوەڕۆ روی دا.

دەسەڵاتداری یەکەمی حکومەت لە سلێمانی، وەکیلی موفەتیشی ئیداری ئالبن، بو. داوا لە فەرماندەی جەیش کرا سریەیەک سەرباز بنێرێ. ئەو یش بەشی نەکرد، داوای فەوجێکیان کرد. سەربازەکان لە حەوشی سەرا و سەربان دامەزران، بە مەترەلۆز کەوتنە تەقە لە خۆپیشاندەران. چەند کەسێ کوژران (بە پێی بەیانی رەسمیی حکومەت...و، بە قسەی خەڵک نزیکەی 60 کەس کوژراوە) و چەند کەسێ بریندار بون، ئەوانی تر بڵاوەیان لێ کرد.

هێزە چەکدارەکانی عیراق دەستیان گرتەوە بەسەر جادەکاندا. کوژراوەکان لە حەوشی سەرادا کەڵەکە کران، برینداەکان یش لەناو قاوشێکدا ریزکران و کەوتنە راونان و گرتنی هاندەر و ڕێکخەر و بەشدارانی خۆپیشاندانەکە. تا دو سێ رۆژ هەر خەڵک ئەگیران و پۆلیس و سەرباز شایەتییان لێ ئەدان. ژمارەی گیراوەکان لە 100 کەس تێپەڕی.*[1]

### 2. 3. 2. ئەنجامدانی هەڵبژاردن لە سلێمانی

کارەساتی بەردەرکی سەرا، ئەگەرچی لە رۆژنامەکانی عیراق و، لە رۆژنامەکانی بریتانیادا دەنگی دایەوە، بەڵام کاربەدەستانی عیراق گوێیان نەدایە و بڕیاریاندا هەڵبژاردنەکە بە ئەنجام بگەیەنن.

وەزارەتی کاروباری ناوخۆ لە رۆژی 9 ی 9 ی 1930 بە بروسکەیەکی نهێنی داوای لە موتەسەریفی سلێمانی کرد، بەهۆی ئەو روداوەوە هەڵبژاردن هەفتەیەک دوا بخرێ. موتەسەریفیەتی سلێمانی کە ئالبن حوکمرانی بو، لە 11 ی 9 ی 1930 دا لە وەڵامدا پێیان داگرت کە ئەنجامدانی هەڵبژاردن گرنگیەکی زلی هەیە، لە بەر ئەوە نابێ دوا بخرێ. وەزیری کاروباری ناوخۆ یش لە 14 ی 9 ی 1930 بە نوسراوێکی نهێنی و پەلە، پشتیوانی بڕیارەکەی موتەسەریفەتی سلێمانی کرد.

رۆژی 15 ی 9 ی 1930 لە (مەقامی موتەسەریفیدا عمومی ئەشراف و توجار و سائیر طەبەقەی ئەهالی بۆ ئینتیخاباتی هەیئەتی تەفتیشیە کۆبونەوە) یان راستر، کۆکرانەوە و هەڵبژاردنیان پێ کردن. کاتێ کۆبونەوەی مەجلیسی نواب لە رۆژی 1 ی 10 ی 1930 دا لە بەغداد کرایەوە، بە نوێنەرایەتی سلێمانی ئەم نائیبانە: ئەحمەد ساڵح، ئەحمەد موختار، محەممەد ساڵح و سەیفوڵڵا خەندان، ئامادە بون.

### 2. 3. 3. دانانی ئەحمەد بەگی تۆفیق بەگ

شوێنی موتەسەریف چۆڵ بو. لەناو رۆژنامەکانی بەغدادا ناوی چەند کەسایەتی کوردی لەوانە: محەممەد ئەمین زەکی، جەمال بابان و ئەحمەد بەگ هێنرایە ناو تا بکرێنە موتەسەریفی سلێمانی. سەرەنجام ئەحمەد بەگی تۆفیق بەگ دانرایەوە بە موتەسەریفی سلێمانی.

ئەحمەد بەگ لە بنەماڵە ناسراوەکانی سلێمانی و، خۆ یشی پیاوێکی تێگەیشتو و بەرێزی ناو خەڵک بوە. ئەگەرچی ئەم یەکێ بو لەوانەی چون بە پیر شێخ مەحمودەوە کاتێ لە دیلی گەڕایەوە، ماوەیەک یش هەر لە سلێمانی بو، بەڵام لە سەردەمی حوکمرانی شێخ مەحمودا هیچ کارێکی پێ نەسپێردراوە. لە داگیرکردنی دوەمی سلێمانیدا، ئەم رۆیشتە بەغداد و بو بە ئەندامی مەجلیسی تەئسیسیی عیراق. تا هێزەکانی عیراق و بریتانیا بۆ جاری سێیەم سلێمانییان بە یەکجاری داگیرکرد و، وەکو لیوایەک بەستیان بە عیراقەوە، ئەم کرا

---

1 دەسخەتەکانی مامۆستا مستەفا دەلۆیی، ئەو یش لە خوالێخۆشبوان رەمزی فەتاح، مامۆستا جەلال ئەمجەد، مامۆستا عومەر عەبدورەحیم، مەلا محەمەدی کوردی، مامۆستا ئەخولی شاعیر وەری گرتون.

بە موتەسەڕیفی سلێمانی (1924- 1927). ئەو ماوەیەی موتەسەڕیف بو، بایەخێکی زۆری دا بـە کاروبـاری خوێندەواری، ئاوەدانی، ڕۆشنبیری و، یەکەمین سەرۆکی جەمعییەتی زانستی کوردان بو. لـە 1927 دا دەسـی لە کار هەڵگرت. لە جێگەی ئەم ئەحمەد عوسمان کرا بـە موتەسـەڕیفی سـلێمانی. لـەکاتی گفتوگـۆی عیراقـی- بریتانی‌دا بۆ بەستنی پەیمانی 1930، ئەم یش لە بروسکەیەکـدا کە بۆ مەندوبی سامی و سەرۆکی وەزیرانی عیراقی نارد، پشتیوانی لە خواستەکانی گەلەکەی کرد.

دوای شکانی شۆڕشەکەی شێخ مەحمود کە مەلیک فەیسەڵ هاتـە سـلێمانی، نیشـانی (الرافـدین) ی بـە خەڵات کرد بە بەرۆکی ئەحمەد بەگ دا.

## 2. 3. 4. وەفدی کوردستان

کوشتارەکەی بەردەرکی سەرا، ویژدانی شاعیرە گەورە و ناسراوەکانی ئەودەمی سلێمانی‌یان هەژاندوە. پیرەمێرد، حەمدی، بێکەس، گۆران، ئەخۆڵ، شیعری بەسۆزیان لەسەر داناوە. لـە ویژدانـی خـەڵکیش دا ڕۆژی ڕەشی شەشی ئەیلول بوە بە مێژویەکی ناسراو، لە دایک بون و مردن و، ژنهێنـان و شـوکردنیان پـێ دیـاری کردوە.

لەکاتی کوشتارەکەی شەشی ئەیلول‌دا، مەلیک فەیسەڵ بۆ تیماری نەخۆشی، لە لەندەن بوە. دوای ئەوەی گەڕاوەتەوە بەغداد، بۆ نوێ کردنەوەی دڵسۆزی و دەربڕینـی گوێڕایـەڵی، وەفـدی شـارەکانی کوردسـتان کـە زۆربەی نائیبە کوردەکانی تێ‌دا بو، چون بۆ دیدەنی مەلیک. ڕۆژنامەکانی بەغداد ئەم هەواڵەیان بە خۆشـیەوە بڵاوکردەوە. پیرەمێرد بەم بۆنەیەوە شیعرە بەناوبانگەکەی (وەفدی کوردستان) ی بەسەردا هەڵداون کە پێیـان ئەڵێ: "میللەت فرۆشان" و، نائیبە کوردەکان بە "هـەرزە وەکیلـی شـاری خامۆشـان" نـاو ئـەبا. بێکـەس یـش کردویەتی بە پێنج خشتەکی و ئیشارەت ئەکا بۆ بازرگانـەکان و ئـەڵێ: "حـاجی توتنەکـەت مـادەم فرۆشـرا، قیروسیا لە صەد کوشتن و هەرا".

## 2. 4. بەڵگەکانی: کورد و پەیماننامەی 1930

### 2. 4. 1. نامەی هەمفریس، مەندوبی سامی بریتانی لە عیراق

**بۆ لۆرد پاسفیلد، سکرتێری دەوڵەت بۆ کاروباری کۆلۆنی‌یەکان**

بارەگا، بەغداد

23 ی 4 ی 1930

گەورەم،

1. ئەز شەرەفی ئـەوەم هەیـە کـە گـەورەیی‌تـان ئاگـادار بکـەم، لـەوەتی مـن گەیشـتومەتە عیـراق بـە ئاگایی‌یـەوە شـکاتی بـەردەوامی کوردەکـانی عیـراق، سـەبارەت بـەو بەڵێنانـەی لـە بابـەت ئـەو ئیمتیازاتـە تایبەتی‌یانەوە کە پێیان دراوە و بە تەواوی جیبەجێ نەکراون، لەبەر چاو گرتوە.

2. سەرەتای ئەمساڵ مەلیک فەیسەڵ پێی وتم حەز ئەکا هەمو پرسی کوردم بە تایبەتی لە گـەڵ بـاس بکا. لەسەر ئەوە ڕێکەوتین هەرچی زوتر کات بدۆزمـەوە بـۆ ئـەوەی خـۆم ئاگـادار کـەم لـە فاکـت و بیـر و بۆچونی ئەوانەی لەم بارەیەوە ئاگاداری‌ی تایبەتی‌یان هەیە، ئەوسا پێکەوە دای ئەنێین حکومەتی عیراق چ بکا بۆ ڕازی کردنی کوردەکان.

دوای ئـەوە بـە ماوەیـەکی کـورت، لەسـەر داوای مـن، سـێر کیناهـان کۆرنـوالیس ( Sir Kinahan Cornwallis) مستەشاری وەزارەتی کاروباری ناوخۆ، کەوتە هەڵسەنگاندنی ئـەو بەڵێنانـەی بـە کوردەکـان

دراون و رادەی جێبەجێ کردنیان. هەروەها لە گەڵ موفەتیشە ئیدارییەکانی ناوچە کوردییەکان و لە گەڵ موفەتیشی بریتانی پەروەردەی گشتی، گازاندەی کوردەکانی بە تێروپڕی باس کرد. ئەم گفتوگۆیانە وایان لێ کردوە بتوانێ لەسەر هەمو مەسەلەکە تێبینییەکی گشتلایەنی ئامادە بکا و، راسپێری دیاریکراو بخاتە بەردەم حکومەتی عیراق.

3. لە گەڵ ئەم نامەیەدا کۆپییەکی ئینگلیزی ئەو تێبینییەی سێر کیناهان کۆرنوالیس بۆ وەزیری ناوخۆی نوسیوە، بۆ ئاگاداری گەورەییتان ئەنێرم. بە رەئی من زۆر بە رونی هۆیەکانی شکاتەکانی کورد و رێگەی چارەسەرکردنی باس کردون.

سێر کیناهانم ئاگادار کردەوە کە من راسپاردەکانی پەسند ئەکەم. نفوزی خۆیشم لە گەڵ مەلیک و سەرۆکی وەزیران بەکار ئەهێنم بۆ پشتیوانی لە تەقەللاکانی بۆ قانیعکردنی حکومەتی عیراق کە پێڕەویان بکا.

4. یەکەم بەری تێبینییەکانی سێر کیناهان بۆ وەزیرەکەی بەیانێکە، کۆپییەکی پاشکۆی دوەمی ئەم نامەیەیە، کە لە 9 ی 4 دا لەلایەن حکومەتی نوری پاشاوە بە رێگەی هۆکانی راگەیاندنەوە بڵاوی کردۆتەوە. راگەیاندنی ئەم سیاسەتە بە جۆرێ کوردەکانی رازی کردوە کە لە ژمارەیەک تەلەگرافی پێخۆشحاڵی و سوپاس دا دەریان بڕیوە کە تازە لە زۆر شوێنی کوردستانەوە بە من و سەرۆکی وەزیران گەیشتوە.

لەم ماوەیەدا لە گەڵ موفەتیشە ئیدارییەکانی لیواکانی سەرو خەریکی توێژینەوەی هەلومەرجی کوردەکان بوم، بە فەرمانی خاوەن شکۆ مەلیک لەوەم کۆڵییەوە کە ئاخۆ هیچ راستیەک لە قسەی ئەو کوردانەدا هەیە کە ئەڵێن ئەو بەڵێنانەی دراویانەتێ، بە باشی جێبەجێ نەکرد. (بەڵگەی ژمارە FO371ی 14521).

**بەڵێنەکان ئەمانە بون:**

1. بەیانی سێر پێرسی کۆکس لە لایەن راوێژکارانی بریتانییەوە لە لیواکانی موسڵ، کەرکوک، سلێمانیدا لە 6 ی مەی 1921 بڵاوکرایەوە.

2. بەیانی 24 ی دێسەمبەری 1922:

"حکومەتی خاوەن شکۆی بریتانیاو حکومەتی عیراق دان ئەنێن بە مافی ئەو کوردانە کە لەناو سنوری عیراق دا ئەژین بۆ ئەوەی حکومەتێکی کوردی لەو سنورانەدا دابمەزرێن، هیوادارن کە تاقمە کوردییە جیاوازەکان، بە زوترین کات لەناو خۆیان دا بگەنە رێککەوتنێک لەسەر شێوەی ئەو حکومەتەی خۆیان ئارەزوی ئەکەن، لەو سنورەدا کە ئەیانەوێ درێژ ببێتەوە و دەستەیەکی نوێنەرایەتی بەرپرس بنێرن بۆ بەغداد بۆ باسی پێوەندیە سیاسیو ئابورریەکانیان لەگەڵ حکومەتی خاوەن شکۆی بریتانیاو حکومەتی عیراق".

3. بڕیاری ئەنجومەنی وەزیران لە 11 ی جولای 1923 دا:

1. حکومەتی عیراق بەتەما نیە هیچ فەرمانبەرێکی عەرەب لە ناوچە کوردییەکان دا دابمەزرێنێ، جگە لە فەرمانبەرانی تەکنیکی.

2. هەروەها بەتەما نیە دانیشتوانی ناوچە کوردییەکان ناچار بکا زمانی عەرەبی لە مراسلاتی رەسمیی دا بەکار بهێنن.

3. مافەکانی دانیشتوان و تاقمە دینیی و شارستانیەکان لە ناوچەی ناوبراودا بە تەواوی پارێزراون.

(4) تەلەگرافی سەرۆکی وەزیران بۆ موتەسەڕیفی کەرکوک:
(أ) تکایە ئەنجومەنی بەڕێوەبەرایەتی ئاگادار بکە کە پێشنیارەکانیان پەسند کراوە، حکومەت موافیقە دامەزراندنەکان تەنیا لە خەڵکی ناوچەکە بێ و زمانی ناوچەیی بە ڕەسمیی بناسرێ.
(ب)... ئەشێ ئەنجومەنی بەڕێوەبەرایەتی ئاگادار بکەی، بەڵێنی جێبەجێ کردنی ئەم مەرجانەیان بە شێوەیەکی ڕەسمیی بدەیتێ.

(5) وتاری سەرۆکی وەزیران لە 21 ی جەنیوەری 1926 دا:
"...ئێمە ئەبێ مافی کوردەکان بدەین. فەرمانبەرەکانیان لە خۆیان بن، زمانەکەیان ئەبێ زمانی ڕەسمییان بێ و منداڵەکانیان ئەبێ لە قوتابخانەکانیان دا زمانی خۆیان فێر ببن، ئەوە ئیلتیزامە لەسەر ئێمە کە مافەکانی خۆیان بدەینێ".
سەرۆکی وەزیران ڕێنمایی دا بە هەمو وەزارەتەکانی:
"پایەبەرزتان بیگومان ئەو وتارەی دیوە کە سەرۆکی وەزیران لە مەجلیسی نواب دا داویتی، ڕۆژی دوایی لە ڕۆژنامەکان دا بڵاوکرایەوە. ئەم وتارە ئەو سیاسەتە دەرئەبڕێ کە حکومەت ئەیگرێ و لە بەڕێوەبەرایەتی ناوچە کوردییەکان دا پێڕەوی ئەکرێ، بە دیاریکراوی کە فەرمانبەران ئەبێ کورد و زمانی ڕەسمی ئەبێ کوردی بێ.
پایەبەرزی ئاگاداری کردم داوا لە پایەبەرزتان بکەم هەوڵی جێبەجێ کردنی ئەم سیاسەتە بدەن، لە هەمو دامەزراوەکانی ناوچەی باسکراودا جێبەجێی بکەن".

6. ڕاسپاردەی کۆمەڵەی نەتەوەکان:
"ئەبێ گوێ بدرێتە ئەو ئارەزوانەی لەلایەن کوردەکانەوە دەربڕراوە کە فەرمانبەرانی بە ڕەگەز کورد دابمەزرێنرێن بۆ بەڕێوەبەرایەتی ناوچەکەیان، ڕەوتی دادگا و فێرکردن لە قوتابخانەکان دا، کوردی ئەبێ ببێ بە زمانی ڕەسمی هەمو ئەم خزمەتانە".
3. بەرەئی شەخسیی من، ئەو بەڵێنانەی کە گەورەترین گرنگییان هەیە، بەڵێنەکانی ژمارە 3، 4، 5، 6 ن کە پێوەندیان هەیە لەگەڵ:
أ- فەرمانبەران.
ب- زمان.
ت- گفتوگۆی ناو دادگا.
پ- پەروەردە.
ئەو بەڵێنەی بە ئەنجومەنی بەڕێوەبەرایەتی کەرکوک دراوە نالەبارە، چونکە زۆرایەتی دانیشتوانی ئەو ناوچانە کوردن، چونکە دوای ئەوەی بەڵێنەکە دراوە هەمو قەزا کوردییەکانی چەمچەماڵ و گل لە لیوای سلێمانی کراونەتەوە. لەبەر ئەوە ئەو بەڵێنەی بە کورد دراوە تا ڕادەیەک ناکۆکە.
من پیشنیار ئەکەم کە هەر چوار بەڵێنەکە جێبەجێ بکرێن، بەڵام حەز ئەکەم لە پێشەوە ڕەئی خۆم ڕون بکەمەوە، حکومەتی عیراق بە چ گیانێکەوە لە پاشەڕۆژدا کار لەگەڵ کورد ئەکا، زۆر گرنگترە لە جێبەجێ کردنی حەرفیی هەر بەڵێنێکیان.
ڕاست بێ یان درۆ، کوردەکان وا هەست ئەکەن مافەکانی خۆیان وەرنەگرتوە، بۆیە یەکێ لە گرنگترین ئەرکەکانی ئەمرۆی حکومەت ئەوەیە ئەم هەستە نەهێڵێ و، هەستی متمانە و باوەڕیان تێدا بچێنێ. وەکو من

هەوڵ ئەدەم پیشانی بدەم، ئەبێ لە چەند مەسەلەیەک دا گلەیی لە حکومـەت بکـرێ. نـە لـە پرسـە گـەورەکانی سیاسەتدا ئەوەندەی لە مەسەلەی کەمتر گرنگدا وەکو دامەزرانـدنی خـراپ و ڕێکخسـتنی نالـەبار. ئەگـەرچی، سکاڵای بچوک هی گەورەتر لە مێشکی خەڵکدا دروست ئەکا و زۆر جاریش ئەبێتە هۆی تورەیی و نارەزایی.

یەکەمین ئەرکی حکومەت ئەوەیە لەم سکاڵایانە بکۆڵێتەوە و بە گیانی بەزەییەوە چارەسەریان بکا.

**فەرمانبەران**

5. ئەم ژمارانەی خوارەوە پیشانی ئەدەن چ فەرمانبەرێ دامەزرێنراون:

ک: کورد، ت: تورکومان، ع: عەرەب، م: مسیحی، ج: جو

| نوسراو | | | | | نەنوسراو | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ڕەچەڵەک | ک. | ت. | ع. | م و ج | ک. | ت. | ع. م. و ج |
| سلیمانی | 19 | 8 | 1 | 2 | 90 | 14 | 11 |
| ئەربیل | 18 | 5 | 4 | 1 | 95 | 23 | 34 |
| کەرکوک | 16 | 11 | 18 | 2 | 29 | 107 | 40 |
| موسڵ (قەزا کوردیەکان) | 11 | 3 | 14 | 4 | 46 | 8 | 43 |

6. بە راشکاوی بڵێین، دامەزراندنی ئەو هەمو نەکوردە شکاندنێکی ئاشکرای بەڵێنەکەیە. لە سـلێمانی، بۆ نمونە، 99% دانیشتوانی کوردن، کەچی 30% فەرمانبەرەکانی نە کوردن. لە ناوچـە کوردییـەکانی تـردا ژمارەکان بۆ خۆیان قسە ئەکەن.

هەروەکو ئەبینرێ 324 فەرمانبەری کورد هەیە، 165 عەرەب، 180 تورکومان و 62 مسـیحی و جـو هەیە. ژمارەی فەرمانبەرانی نەکوردن، 93 کەسی لە فەرمانبەرانی کورد زۆرترە.

ئەمەش نمونەیەکی رونی پشت گوێ خرانی ڕێنماییـەکانی حکومەتـە، چونکـە هـیچ کەسـێ بەتایبـەتی بەرپرسی ئەوە نیە بزانێ بەڵێنەکە بە حەرفیی جیبەجێ کراوە. ئەم پشت گـوێ خرانـە هـەل ئەرەخسـێنێ بـۆ رەخنەگرتن لەلایەن هەر یەکێکەوە کە بیەوێ بە خراپ لێکی بداتەوە. من پێم باشترە سەیری گیانەکەی بکـرێ نەک زۆر بە جدی روکەشی شتەکە وەربگیرێ، چونکە لە زۆر حاڵەت دا نەکوردەکان یان کەرکوکین لـە لیـوای کەرکوک دا خزمەت ئەکەن یان دانیشتوی کۆنی لیواکەن خزمەت ئەکەن وایـان لـێ هـاتوە لـە کوردەکـان جیـا نەکرێنەوە. دائیرەکانی (بە تایبەتی تاپۆ، گومرگ وکشتوکاڵ)، زۆر کەم هـەولیان داوە گـوێ بدەنـە بەڵێنەکـە. کوردەکان بیگومان هۆیەکی راستەقینەیان هەیە بۆ سکاڵا لەمە، بە تایبەتی لە بواری وەزیفە نەتەکنیەکان دا. وا ئەزانم مەسەلەکە تا ئێستا بە ڕێگەیەکی راست رەفتاری لەگەڵ نـەکراوە. کوردەکـان بـە تونـدی پـێ دائـەگرن لەسەر ئەو بەڵێنانەی پێیان دراوە. عەرەبەکان بێزارن لەوە کە لیوا کوردییەکان بۆ کورد بهێڵرێنەوە (بە ناویش بێ، بەکردەوە وا نیە وەکو ژمارەکان دەری ئەخەن)، بەڵام ڕێگەیان لێ ناگرن لەوەی خزمەت لە بەشەکانی تـری وڵات دا بکەن. زۆر باشتر ئەبێ ئەگەر زانینی زمان بکرێ بە پێوانە و ڕێگە بـدرێ بـە دامەزرانـدنی عـەرەبی کوردیزان لە لیوا کوردییەکاندا، بە کوردی عەرەبیزان لە لیوا نەکوردییەکان دا. ئەمەش ناکرێ تا ئەو زەمانـەی کورد گومان لە سیاسەتی حکومەتی ناوەندی ئەکات. لام وایە ئەگونجێ جێبەجێ بکرێ، ئەگەر یاسای زمان کە لە پەرەگرافی 2 دا باس کراوە، تێپەرێ و پەلەپەل نەکرێ و بە هوشیاری دابمەزرێنرێن.

7. دامەزراندنی فەرمانبەری کارامە گرنگیەکی گەورەی هەیە. ڕەنگە کوردەکانی لیوای هەولێر حاڵی حازر لە کوردی لیواکانی کە زیاتر بیزار بن. بە داخەوەم ئەوە بڵێم کە بەو ئەنجامە گەیشتوم ئەمە بە زۆری ئەگەڕێتەوە بۆ ئەو سیاسەتەی مەجید بەگی موتەصەڕیف، پێڕەوی کردوە. ئەم فەرمانبەرە بەتوانایە بەڵام تورکومانە و خۆی وا پیشان داوە حەز لە چارەی کورد ناکا. نمونەیەکی بەدی داوە بە فەرمانبەرەکانی ترو بونی وەکو بۆچونێکی دژی کورد لە بەرێوەبەرایەتیدا زیانبەخشە. ئەم لە ماوەی ئاسایی خۆی زیاتر لە خزمەت دا لە هەولێر ماوەتەوە، لام وایە گوێزانەوەی دەسبەجێی لە ناوچە کوردییەکان دا شتێکی پێویستە. ئەبێ فەرمانبەرێکی کورد لە جێگەی ئەم دابنرێ کە حکومەت و هاوڵاتیەکانی متمانەی پێ بکەن.

8. ئەو کەماسییەی پێویستی بە چاککردنەوە هەیە، لە هێزی پۆلیس دا ئەبینرێ کە کەمیی ئەفسەری پۆلیسی کارامەو پشکنەری کوردە. لە ئەنجامدا دامەزراندنی فەرمانبەری عەرەبە کە لە هەندێ حالەتدا کوردی نازانن و لە ڕێگەی تەرجومانەوە کار ئەکەن. ئەمە بە ئاشکرا هەڵەیەو ئەبێ کارئاسانی زۆرتر بکرێ بۆ مەشق پێ کردنی پۆلیس– کورد بن یا عەرەبی کوردیزان– بۆ ئەوەی ببن بە پشکنەرو ئەفسەری نوسراو.

9. لام وایە هەر بە تەنیا بۆ وەزارەتی ناوخۆ یارمەتیدەر نیە، بەڵکو بۆ کوردەکانیش مایەی شادمانی ئەبێ، ئەگەر یارمەتیدەرێکی کورد بۆ بەرێوەبەری گشتی بەرێوەبەرایەتی لە وەزارەت دا دابنرێ. ئەم فەرمانبەرە لە پلەی یەکەمدا خەریکی ئەو نامەکارییانە ئەبێ لە لیوا کوردییەکانەوە دێن لە ژێر فەرمانی کارگێری گشتی بەرێوەبەرایەتیدا. ئەم دامەزراندنە خەرجێکی زیادەی ئەبێ، بەڵام دڵنیام کە ئەمە تبریر ئەکرێ بە هەستی ڕەزامەندی کە کەسێکی بە ئاگاداریەکی زۆرەوە لەسەر لیوا کوردییەکان لە وەزارەت دا هەیە.

10. کوردەکان هەستیان کردوە بەوەی کە بە ئەندازەی کافی لە دەزگا بەرزەکانی پایتەخت دا نوێنەرایەتی ناکرێن. دیارە ئەم هەستە لەناو کەنار و شوێنەکانی تریش دا هەیە، بەڵام من لام وایە کە ئەبێ سەرنجی تایبەت بدرێ بە ژمارە و گرنگی سیاسی کوردەکان، هەوڵ بدرێ رازی بکرێن، ئەگەر کەسانی کارامە هەبون، شوێنە بۆشەکانیان پێ پڕ بکرێتەوە.

11. مەسەلەی زمان شتێکە کوردەکان لە بارەیەوە زۆر بە پەژارەن. بەڵێنەکان بە تەواوی رونن و من لام وایە نابێ کات بە فیرۆ بدرێ بۆ تێپەراندنی قانونێک کە کوردی بکا بە زمانی ڕەسمیی لە بەرێوەبەرایەتی سلێمانی و هەولێر و لەو قەزایانەی لیوای موسڵدا کە زۆرایەتی دانیشتوانی کوردن، داننان بە کوردیدا وەکو یەکێ لە زمانە ڕەسمییەکانی لیوای کەرکوک. دوای تێپەراندنی قانونەکە، زانینی زمانەکە نەک ڕەگەز، وەکو لەسەرەوە پیشنیارم کردوە، بکرێ بە مەرجی دامەزراندنی فەرمانبەران لە ناوچە کوردییەکان دا.

12. تا ئێستا هەندێ لە دائیرەکان فەرامۆشکار بون لە جێبەجێکردنی بەڵێنەکانی زمان دا، زەمینەی راستەقینەی سکاڵاکان ئەو راستیەیە میکانیزمێکی کافی نیە بۆ تەرجومەی قانونەکانی وڵات و زۆر لە نیزامەکانی– دارایی و هی تر– کە بەردەوام دەرئەچن. قانونە بنەرەتیەکان وەکو قانونی سزادانی بەغدادی هێشتا تەرجومە نەکراون، لە هەولێر بۆ نمونە نەک هەر زمانی دادگا عەرەبییە، بەڵکو ئیجرائات و حوکمدانیش بە عەرەبی تۆمار ئەکرێن. قانون، نیزام و نامەکاری بەرێوەبەرایەتیە گشتیەکان بۆ لیوا کوردییەکان بە عەرەبییەو ئەبێ مدیری تەحریرات وەربگیرێ. ئەمەش شتێکی ئابوری نیە، چونکە

فەرمانبەرانی چوار لیوا ئەبێ خەریکی تەرجومەی هەمان شت بن. ئەمەش بۆ هەموان شتێکی نارەوایە چونکە تەرجومەکان وەک یەک نابن. تەرجومەی دروستی بەڵگەی قانونی پێویستی بە وریایی و شارەزایی هەیە. بەڵگەی لەو بابەتە ناتوانرێ بە باشی تەرجومە بکرێ لەلایەن کەسانی لێنەهاتووەوە کە لە هەمان کات دا بە کاری بەڕێوەبەرایەتیەوە سەرقاڵە و، زۆر جار لەوانەیە بە تەرجومە نەکراوی بمێنێتەوە. ئەنجامەکەیشی ئەوەیە فەرمانبەرانی عەرەبی نەزان ناتوانن کارەکانیان بە دروستی ئەنجام بدەن و خەڵکەکەیش بێ بەش ئەکرێن لەو مافە بنچینەییەی کە ئەبێ باج بدەن و حوکم بکرێن بەپێی قانونگەلی کە بە زمانی خۆیان نوسرابێ. لام وایە کە ئەبێ مەکتەبێکی تەرجومەی لێهاتو دابنرێ، باشترە لەم وەزارەتەدا بێ، بۆ تەرجومەکردنی قانونەکان و، ئەو بەڵگانەی کە وەزارەت بە پێویستیان ئەزانێ بە کوردی و بڵاوکردنەوەیان لە جەریدەی رەسمیی‌دا. هەروەها لام وایە ئەبێ رەوتی دادگاکان و حوکمدان لە دادگاکان دا، بە کوردی تۆمار بکرێن.

**پەروەردە**

13. سکاڵاکانی کورد لە سیاسەتی پەروەردەیی حکومەت زۆرن. هەندێکیان رەوان و ئەوانی تریان، من لام وایە زل کراون. کارێکی زەحمەتە بۆ حکومەتێک کە پارەی نەبێ، هەمو شتێ بە جارێک بکا، لەم مەسەلەیەدا کێشەکە ئاڵۆزە سەبارەت بەو راستیەی کە تازە کوردی بوەتە زمانی نوسین، لەبەرئەوە مامۆستای لێهاتو کەمن.

بە رەئی من دو کەمایەسیی سەرەکی هەن. یەکەمیان ئەوەیە، ئێستا ناتوانرێ منداڵانی کورد لە لیوا کوردییەکان دا بە باشی پەروەردە بکرێن، چونکە هیچ فێرگەیەکی ناوەندی تەواوی لێ نیە، دوەمیشیان ئەوەیە، ناوچەیەکی پەروەردەی کوردی نیە. هەولێر لەسەر ناوچەی موسڵ و سلێمانی و کەرکوکیش لەلایەن کاربەدەستانی ناوچەی پەروەردەی بەغدادەوە بەڕێوە ئەبرێن. سکاڵا بیستوە کە سیاسەتی پەروەردەیی کە لەلایەن فەرمانبەرانی ناوچەی بەرپرسەوە پێڕەوی کراوە بەپێی بەڵێنەکان نیە. ئەمە ئەگەر وابێ یا نە، من لام وایە ناوچەیەکی پەروەردەیی لە هەولێر و کەرکوک و سلێمانی، بەبێ دواخستن لە ژێر سەرپەرشتی کوردێکی لێهاتودا، دابمەزرێنرێ. هەروەها لام وایە کە کۆرسی تەواوی فێرگە ئامادەییەکان لە قوتابخانە ناوەندییەکانی هەولێر و سلێمانی‌دا بوترێتەوە، ئەگەر پارە پەیدا کرا زۆرتر فێرگەی سەرەتایی بکرێتەوە. ئەگەر ناوچەی پەروەردەیی کوردی دامەزرێنرا، ئەوسا فەرمانبەرانی کوردی کاربەدەست روبەروی رەخنەی کوردەکان ئەبنەوە، کەمتر بیانویان بە دەستەوە ئەبێ بۆ ئەوەی، کەمتەرخەمی بەڕێوەبەرایەتی کە وەکو لەسەرەوە من رونم کردەوە، بەزۆری ئەگەڕێتەوە بۆ نەبونی پارە، بە هەوڵی ئەنقەستی حکومەت بۆ پشت گوێ خستنی بەڵێنەکان، لێک بدرێتەوە.

14. لام وایە گرنگیەکی زیاد لە پێویست دراوە بە هۆیەکانی فێرکردن لە قوتابخانە کوردییەکان دا. ئەوە ئاشکرایە کە کوردەکان مافی ئەوەیان هەیە فێرکردنی سەرەتایی بە کوردی بێ، بەڵام من باوەرم وایە کە ئەگەر قانونی زمان دەربچێ و، کوردەکان باوەر بێنن بەوەی کە بیری نەهێشتنی ناسنامەی نەتەوەیی لە کایەدا نیە، ئەوسا خۆیان داوا ئەکەن هۆکانی فێرکردن لە هەندێ بابەتی گرانتردا، لە ئاستی بەرزتری خوێندن دا، بە زمانی عەرەبی بێ. لەگەڵ کرانەوەی پێوەندی‌دا، لیوا کوردییەکان چیتر دانابڕێن، لاوانی کورد لەوە تێ ئەگەن کە بێ زانینی عەرەبی، ناتوانن لە ژیانی نیشتمانی‌دا بەشداری بکەن. ئەمە مەسەلەیەکە لەم رەوتەدا خۆی لە خۆی‌دا بەلادا ئەکەوێ، شتێکی چەوتە ئەگەر تێکەڵ بکرێ بە کێشەی نەتەوایەتی.

15. کورتەی راسپێرییەکانم ئەمانەن:

**فەرمانبەران.**

1. هەر کە قانونی زمان دەرچو، زانینی زمانی کوردی، نەک ڕەگەز، بکرێ بە پێوانەی دامەزراندن.

2. لە هەمان کات دا ئـەبێ داوا لـە هـەمو دائیرەکـان بکـرێ، بایـەخی زۆرتـر بـدەن بـە دامەزرانـدنی موچەخۆری کورد.

3. موتەصەڕیفی هەولێر بگوێزرێتەوە و کوردێکی کارامە لە جێگەی ئەو دابنرێ.

4. ئەبێ کارئاسانی زۆرتر بۆ پۆلیس بکرێ کە مەشق بە ژمارەیەکی زۆرتـری فەرمانبـەرو پشـکنەری کوردیزان بکا.

5. یارمەتیدەرێکی کورد بۆ کارگێری گشتی بەڕێوەبەرایەتی لە وەزارەت دا دابنرێ.

6. توانای دۆزینەوەی کوردی گونجاو بـۆ هەنـدێ لـە وەزیفـە بـەرزەکانی دائیرەکـانی بەغـداد، تـاقی بکرێتەوە.

**زمان و کاروباری دادگا**

7. ئەو قانونەی کە ئەبێ دەربچێ کوردی ئەکا بە زمانی ڕەسمیی لە سلێمانی، هەولێر و قەزاکانی لیوای موسڵ کە زۆرایەتی دانیشتوانیان کوردن، دان ئەنێ بە کوردیدا وەکو یەکێ لە زمانە ڕەسمیەکانی کەرکوک.

8. مەکتەبێکی تەرجومە لە بەغداد دابمەزرێنرێ.

9. ڕێوشوێنی بەڕێوەچون و دادگایی لە دادگاکان دا بە کوردی تۆمار بکرێ.

**پەروەردە**

10. بۆ مەبەستی پەروەردە لیواکانی هـەولێر، کـەرکوک و سـلێمانی لـە "مەنتیقەیـەک" دا ڕێکئـەخرێن لە ژێر بەڕێوەبەرایەتی کوردێکی کارامەدا.

11- فێرگەی ناوەندی تەواو لە هەولێر و سلێمانی هەبن. ژمارەی فێرگەی سەرەتایی، ئەوەندەی بودجـە ڕێگە ئەدا، زۆرتر بکرێن.

**ڕاسپێری دی**

12. دانانی ڕەمزی کوردی لەناو بەیداخی عیراق دا، بە ڕاکێشانی عاتیفی کوردەکان دائەنرێ.

13. پایەبەرزتان ئەبینن من لە ڕاسپێریەکانمدا خواستەکانی کوردە نەتەوەییەکانم فـەرامۆش کـردوە بۆ درێژکردنەوەی ناوچـە کوردییـەکان بـۆ لیواکـانی دیالـە و کـوت، بـۆ هـەر گۆڕینێـک کـە ببـێ بـە هـۆی جیابونەوەی لیوا کوردییەکان لە مەملەکەتی عیراق. من ئەو جۆرە خواستانە بە باشترین قازانجی کورد خۆیان یا بە هی عیراق دانانێم. ڕاسپێریەکانی من، نەتەوەییـە خـوێن گەرمـەکان تێـر ناکـا کـە لایـەنی هـەرە کـەمی داواکانیان فراوانکردنی ناوچەی پەروەردەیی کوردی و دروستکردنی لیوای دهۆکە. دەرگا بـا کـراوە بـێ بـۆ فراوانکردنی ژیرانەی لەم بابەتە، بەڵام من لام وایە ئەبێ داخراو بـێ لـە ڕوی هەرشـتیک دا کـە دژی یـەکێتی عیراق بێ.

ئەوەی من بە شێوەیەکی سەرەکی داوای ئەکەم، هاودەردیە لەگـەڵ سـکاڵا ڕەواکـانی کـوردا. بیسـتومە وتویانە مەسەلەی کـورد نیـە، لام وایـە ئەمـە لـە ڕاسـتیەوە دورە. کوردەکـان نارەحـەتن و گومانیـان هەیـە و لێشاوێکی زۆری پروپاگەنـدەی زیانبـەخش هەیـە بەتایبـەتی لـە بەغـدادەوە، ئەگـەر ڕێگـە بەمـە بـدرێ بـەبێ لێپرسینەوە بەردەوام بێ، ئەگەر هیچ نەکرێ بۆ چارەسەرکردنی گازاندە ڕاستەکان و چاندنی هەسـتی متمانـە،

دڵنیام لەوێ کیشە پەیدا ئەبێ. نەک هەر بە تەنیا کێشە پەیدا ئـەبێ، بـەڵکو خواسـتی کوردەکـانیش لەگەڵیـدا زیاد ئەکا، هەتا ئەگاتە ئەوەی حکومەت ناچار بێ بە هێز روبەروی راوەستێ یان خواستەکانیان قوبـوڵ بکـا، کە هیچ هیوایەکی تێدا نابینرێ بۆ ئارامیی پاشەڕۆژی.

هەڵەیەکی گەورە ئەبێ ئەگەر حکومەت بە تەنیا بـە تـەمای جێبـەجێ کردنـی حـەرفیی بەڵێنـەکان بـێ. ئامانجی ئەوان ئەوەیە کورد تێکەڵی میللەتی عیراق بکەن، لەبەرئەوە گیانەکـەی لـە جێبـەجێ کردنـی حـەرفییا گرنگترە. باوەرم وایە ئەگەر حکومەت بە بیرێکی فـراوان و بـە هاودەردیـەوە رەفتـار لەگـەڵ مەسـەلەکە بکـا، ئەتوانێ بناغەی هەندێ شتی هەمیشەیی لە ماوەی دو ساڵی داهاتودا دابنێ.

گیروگرفتەکە یەکێکە لە گرنگترین و بە پەلەترینی ئەو گیروگرفتانەی ئەبێ حکومەت روبەروی ببێتەوە، هیوادارم پایەبەرزتان بەمزوانە بیخاتە بەردەم وەزارەت.

موستەشار (FO371 -14521ی)

**پاشکۆکان**

1. بەیانێک دانیشتوانی قەزا کوردییەکانی موسڵ و لیواکانی هەولێر، کەرکوک و سلێمانی پیشان ئەدا.
2. سەرژمێری فەرمانبەران بەپێی رەگەز. (FO371 - 14521)

RACIAL STATISTICS FOR KURDISH AREAS ACCORDING TO LATEST FIGURES (FEBRUARY 1930).

| Liwa | Kurds | Arabs | Turcomans | Jews | Christians | Persians | Assyrians | Total |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| Arbil Liwa | 83,430 | 4,492 | 9,921 | 3,225 | 2,689 | 287 | 2,090 | 106,134 |
| Kirkuk Liwa | 67,703 | 26,561 | 28,741 | 8,472 | 1,228 | - | - | 136,705 |

Mosul Liwa:

(Kurdish Qadhas):

| Name of Qadha | Arabs | Kurds | Yezidi | Assyrians | Xtians of all creeds | Jews | Total | Remarks |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| Zakho | 198 | 18,731 | 500 | 340 | 5,614 | 1,471 | 26,854 | - |
| Amadiya | - | 20,914 | - | 3,416 | 5,882 | 732 | 27,944 | - |
| Zibar | - | 9,900 | - | 800 | 150 | 100 | 10,950 | - |
| Aqra | - | 12,675 | - | 400 | 737 | 1,000 | 14,812 | - |
| Dhok | 5,645 | 16,645 | 1,692 | 4,536 | 2,388 | 843 | 31,753 | - |
| | 5,847 | 78,865 | 2,192 | 9,492 | 11,771 | 4,146 | 112,313 | |

Sulaimani Liwa:

| | Kurds | Arabs | Turcomans | Jews | Christians | Persians | Assyrians | Total |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| Sulaimani Liwa | 91,426 | 37 | - | 1,327 | 184 | - | - | 92,938 |

Percentage of kurds:
Arbil Liwa________________: 78,6
Kirkuk Liwa________________: 49,5
Mosul Liwa(Kurdish Qadhas)__: 70
Sulaimani Liwa_____________: 99

OFFICIALS EMPLOYED IN ARBIL, KIKUK & SULAIMANI LIWAS
AND IN THE KURDISH AREAS OF THE MOSUL LIWA.
(i) showing kurds and others by departments

| e d nt e | e t | c | z a | c | a | c | Remarks |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | Kurds | Others | Kurds | Others | Kurds | X others | X Arabs are shown in brackets after the out of a total fiqure. |
| Administ ration (Genral) | 43 | 25 | 61 | 49 | 104 | 74 (24) | From these final lists it will be seen that out of a total number of |
| Agricultu re | – | 3 | 4 | 18 | 4 | 21 (17) | 731 officials employed in the |
| Awcaf | 4 | 2 | 3 | 2 | 7 | 4 (1) | Northern Liwas (in the case of |
| Census | – | 1 | 2 | 3 | 2 | 4 (2) | Mosul, statistics have only been |
| Customs | 2 | 7 | 5 | 20 | 7 | 27 (11) | given for the Kudish areas), |
| Educatio n | 1 | 2 | 79 | 101 | 80 | 103 (31) | there are 324 Kurds and 407 |
| Finance | 1 | 2 | 52 | 39 | 53 | 41 (9) | Officials who are not Kurdis. Even |
| Health | – | 8 | 6 | 15 | 6 | 23 (9) | Allowing for the kirkuk promise |
| Jails | – | 1 | – | 1 | – | 2 (1) | there are still 165 Arabs |
| Law courts | 9 | 7 | 16 | 9 | 25 | 16 (6) | Employed in the north. If again |
| Police | 3 | 9 | 11 | 36 | 14 | 45 (27) | the statistics for the kirkuk Liwa |
| Posts and tells | 1 | – | 7 | 11 | 8 | 11 (6) | are excluded , it will be found that out of a total number of 502 |
| Public works | – | 1 | 4 | 17 | 4 | 18 (9) | Officials employed in the other Kurdish areas, there are 279 |
| Surevys | – | – | – | – | – | – | Kurds, 107 Arabs, 62 Turcomans |
| Tapu | – | 5 | 7 | 7 | 7 | 12 (8) | and 54 Christians, Jew, etc. |
| Veterinar y | – | 1 | 3 | 5 | 3 | 6 (4) | From the department statistics it |
| Total | 64 | 74 | 260 | 333 | 324 | 407 (165) | will also be seen that following departments have paid least regards to the literal fulfillment of the pledge. |
| | 138 | | 593 | 731 | | (165) | |

**2. 4. 2. نامەی هەمفریس، مەندوبی سامی بریتانی لە عیراق**

**بۆ نوری سەعیدی سەرۆکی وەزیرانی عیراق**

بۆ نوری سەعید، سەرۆکی وەزیرانی عیراق

بارەگا

بەغداد، 7 ی 3 ی 1931

نیشانە بـە نامـەی پایەبـەرزتان ژمـارە 646 ی رۆژی 16 ی شـوبات و ژمـارە 811 ی 4/ 5 ی 3، دەربارەی سیاسەتی کوردیی حکومەتی عیراق.

1. پایەبەرزتان لە بیرێتی، دەربارەی نامەی رۆژی 16 ی شوبات، من وتم کە پێشنیاری ناکەم هیچ کارێ لەسەر نامەی یەکەم بکرێ کە نیشانەی پـێ دراوە، تـا کێشـەی قـانونی زمانـە ناوچەییـەکان بـەلادا ئەخرێ. ئێستا حەز ئەکەم بە درێژی وەڵامی نامەی یەکەمی پایەبەرزتان و خاڵەکانی نامەی 5/4 ی 3 تان بدەمەوە. پایەبەرزتان ئەڵێن حەپەساون لە داوای بێ برانەوەی موستەشاری وەزارەتـی نـاوخۆ کـە پـەیتا پەیتا ئەیخاتە بەردەمتان و لە ئەنجامی ئەوەدا گومانتان پەیدا کردوە لە بزوێنەرو هـۆی راسـتەقینەی ئـەم داوایانە. پایەبەرزتان درێژەی ئەدەنێ کە ئەگەر هیچ مەبەستێکی سیاسی لە دواوە نەبێ، ئەبو ئەم داوایانە لە ناوچەی کوردییەکان دا قەتیس بکرێن بێ ئـەوەی تـوخنی رێکخسـتنی حکومـەت بکـەوێ، بـۆ نمونـە، دروستکردنی هەندێ وەزیفەی دیاری کراو لە پایتەخت دا. پایەبەرزتان داوا ئەکەن سنورێ دابنرێ بۆ ئەو داوایانەی کە موستەشار بەناوی (رازی کردنی کوردەکان) هوە ئەیخاتە بەردەم وەزیری نـاوخۆ، یـان ئـەم داوایانە سنوردار بن و قەتیس بکرێن لە ناوچە کوردییەکان دا بـێ ئـەوەی تـوخنی رێکخسـتنی دەوڵـەت بکەوێ.

حەز ئەکەم ئەوە بەتەواوی رون بکەمەوە بۆ پایەبەرزتان کە من نیازم نیـە دەس بخەمـە ئـازادی کـاری موستەشاری وەزارەتی ناوخۆوە، سەبارەت بەو پێشنیارانەی کە ئەو پێی وایە گونجاون یـا هـەرچ بابـەتێکی تر. پایەبەرزتان ئەزانن، هەروەکو منیش لە ئامۆژگاری کـردن دا ئەیکـەم، ئـەوە ئیشـی خۆیـەتی بیکـا وەکـو خزمەتکاری حکومەتی عیراق، ئەوەی پاڵی بە موستەشارەوە ناوە تەنیا ئارەزوی یارمەتیدانی حکومەتی عیراقە لە کارگێڕی گشتی بەرێوەبەرایەتی‌دا و، بە دەست هێنانی پایەی دەوڵـەتێکی بـە تـەواوی خـۆ حـوکم کـردوی ئەندامی کۆمەڵەی نەتەوەکانە.

لە بابەت ئەو ئامۆژگاریانەی ناو بەناو لەلایەن سێر کیناهان کۆرنوالیسەوە دراون بە وەزیـری نـاوخۆ، پێویستە من دڵنیاتان بکەم کە بە گەرمی پشتیوانییان ئەکەم، چونکە باوەڕم وایە ئەو لە یەک نەگەیشـتنەی لـە نێوان کوردەکان و حاکمەکانیان دا دروست بوە ناهێڵێ، چـەرخی بەرێوەبەرایـەتی چـەور ئـەکا و گەشـەیەکی برایەتی نیازپاکی ئەخولقێنێ کە پێویستن بۆ ئاشتی و حکومەتی باش لە وڵات دا.

باوەڕم وایە ئەو ئامۆژگاریـەی هەمیشـە بـە پایەبـەرزتان ئـەگا، بـە شـایانی بایـەخ پێـدانێکی جـدی وەرئەگرێ، نارەزایی و پەشێوی لە ناوچە کوردییەکان دا کە لە چەند مانگی رابـوردودا پەژارەیـەکی ناخۆشـی بۆ من دروست کردوە، بە جێبەجێ کردنی ئەو پێشنیارانە نامێنێ.

پێویست ناکا پایەبەرزتان هیچ ترسێکی هەبێ لەوەی کە ئەم پێشنیارانە هـیچ مەبەسـتێکی تـری هـەبێ جگە لە بەهێزکردنی ماکینەی دەوڵەت و، دەنگێکی بە بەزەییتر لە بەرێوەبەرایەتی کوردستان دا.

من هەست ئەکەم دڵنیام لە هەڵسەنگاندنەوەکەتانـدا، پایەبـەرزتان ئـەوە ئەسـەلمێنن کـە پێشـنیارەکانی موستەشار بۆ وەزارەتی ناوخۆ، یان هی هەر موستەشارێکی تر، کە بزوێنەری سیاسی هەبێ، بێ بناغەیە.

2. من بە تەلەگرام ئاگاداری حکومەتی خاوەن شکۆی بریتانیام کرد لەو وەڵامەی لەلایەن وەزیری دەرەوە نێردراوە بۆ تەلەگرامی وەزیری عیراقی لە ئەنقەرە، تێیدا ڕاپۆرتی دابو کە حکومەتەکانی تورکیا و ئێران پێشنیاریان کردوە پرۆتێستێکی هاوبەش بدەن لە کۆمەڵەی نەتەوەکان دژی ڕاسپێرییەکانی لیژنەی ئینتیداب. منیان ڕاسپاردوە کە بۆ پایەبەرزتانی ڕون بکەمەوە، ئەگەر هەر کارێ بە ئاشکرا لەگەڵ پرۆتێستی پێشنیارکراوی ئێران و تورکیا بکا، بەمە حکومەتی عیراق ڕاستەوخۆ سوکایەتی بە دەسەڵاتی کۆمەڵەی نەتەوەکان ئەکا. کارێکی وەها لە هەمو حاڵەتێک دا، هەر ئەبێتە هۆی شێواندنێکی لە چاککردن نەهاتوی وێنەی داهاتوی عیراق، بڵاوبونەوەی ڕاپۆرتەکە لە دەرەوەی کۆڕەکانی کۆمەڵەدا، کەوا حکومەتی عیراق پشتیوانی یا تەنانەت تعاطفی لەگەڵ ئەم پرۆتێستەدا دەربڕیوە کاردانەوەیەکی زۆر بەهێزی ئەبێ. حکومەتی خاوەن شکۆی بریتانیا ئەوسا بە مەحاڵی ئەزانێ داکۆکی لە سیاسەتی کوردیی عیراق بکا کە دائەنرێ بە نادڵسۆز، دائەنرێ بەوەی لەژێر گوشاری وڵاتانی بێگانەدا داڕێژراوە. بە ڕەئی حکومەتی خاوەن شکۆ، لەو حاڵەتەدا هیوای چونی عیراق بۆ ناو کۆمەڵەی نەتەوەکان بە تەواوی نامێنێ.

پایەبەرزتان ئەبینێ کە حکومەتی خاوەن شکۆ هاوبیر نیە لەگەڵ ئەو وەڵامەی بەپێی ڕێنوێنییەکانی پایەبەرزتان نێردراوە بۆ وەزیری عیراقی لە ئەنقەرە کە هیچی تازەی تێدا نیە، بەڵام وا ئەگەیەنێ کە حکومەتی عیراق ئەیەوێ بەشدار بێ لەگەڵ حکومەتەکانی تورکیا و ئێران لە پرۆتێستی پێشنیارکراودا. پێشنیار ئەکەم بۆ پایەبەرزتان ئێستا ئەوە بۆ وەزیری عیراق لە ئەنقەرە ڕون بکەنەوە کە حکومەتی عیراق نیازی شتی وای نەبوە. (FO371 - 15311ی)

## 2. 4. 3. دانیشتنی ژمارە 526 ی مەجلیسی نواب

دانیشتنی ژمارە 526 ی ڕۆژی پێنجشەمە، 13 ی 2 ی 1930، کۆبونەوەی ئاسایی ساڵانی 1929– 1930، بە سەرۆکایەتی توفیق السویدی.

سەرۆک: مادەی دوەمی بەرنامەکە بە وەزیری لێپرسراو ڕائەگەیەنرێ.

پرسیاری مەعروف جیاوک (هەولێر) ئاراستەی سەرۆکی وەزیران کراوە، دەربارەی ئەو بنچینانەی حکومەتی عیراق دایناون بۆ ئەو گفتوگۆیەی ئەویستری بکرێ بۆ بەستنی پەیمانە تازەکە و، ئەو مەرجانە کۆمەڵەی گەلان دانی پێدا نابون دەربارەی ناوچەکانی سەرو. پرسیارەکە خوێندرایەوە، ئەمیش دەقەکەیەتی: تکام وایە ئەم پرسیارانە لە سەرۆکی وەزیران بکرێ، بۆ ئەوەی بە دەم لە بەردەمی مەجلیسی بەرزدا وەڵامیان بداتەوە. ئەو بنچینەو ڕێوشوێنانە چین کە حکومەت دایناون بۆ گفتوگۆی ویستراو بۆ بەستنی پەیمانە تازەکە؟ ئایا هیچ ئیعتیرازێ لەسەر ئەو مەرجانە هەیە کە کۆمەڵەی گەلان لە بابەت ناوچەکانی سەرو سەلماندویەتی؟ ئایا حکومەت بە تەمایە لە ناواخنی پەیماننامەکەدا جێگیری بکا، هەروەکو خوا لێخۆشبو عەبدولموحسین سەعدون بەگ ساڵی 1926 لەبەردەمی مەجلیسی بەرزدا پشتیوانی لێ کرد؟

ناجی السویدی (سەرۆکی وەزیران و وەزیری ناوخۆ): هێشتا گفتوگۆ نەکراوە. ئەو بنچینەو ڕێوشوێنانەی حکومەت لە کاتی گفتوگۆدا پێڕەویان ئەکا، هەمان بنچینەن کە حکومەت لە کارنامەکەی خۆیدا لەبەردەم ئێوەی بەرێزدا خوێندویەتیەوە.

هیچ ئیعتیرازێ لەسەر هیچ مەرجێک کە ئەوترێ کۆمەڵەی گەلان سەلماندویەتی نیە.

حکومەت بیر لەوە ناکاتەوە یا لای وا نیە شتێ لە پەیماننامەیەکی ناودەوڵەتیدا باس بکا کە لەسەر بنچینەیەکی سیاسی دەولی گشتی، لە نێوان دو دەوڵەتی بە تەواوی سەربەخۆدا ئەبەسترێ.

مەعروف جیاوک (هەولێر): وەڵامی پایەبەرز سەرۆکی وەزیران ناتوانێ نە من و نە مەجلیسی بەرز قانیع بکا. لێرەدا رونی ئەکەمەوە کە هەندێ ماف هەن کۆمەڵەی گەلان سەلماندونی و حکومەتی عیـراقیش سورە لەسەر پشتیوانی و چەسپاندنی، لەو مافانە کە خوێندن لە هەمو ناوچەکانی سەرودا بە زمانی کوردی بێ، فەرمانبەرەکان لەو کوردانە بن کە بە باشی زمانی کوردی ئەزانن بۆ ئەوەی خـەڵک و فەرمانبـەران لـە یەکتری تێ بگەن. باوەڕم وایە ئەو بڕیارانە خراونەتە ناو قانونی ئەساسیەوە کە سوێندمان بۆ پشتیوانی خواردوە، هەروەها خراوەتە ناو پەیماننامەی 1922 دوە. ئەم مافانە یەکگرتویی عیراق دابین ئـەکا، حـەز ئەکەم پایەبەرز سەرۆکی وەزیـران رونـی بکاتـەوە کـە حکومـەت گرنگـی بـەم مافانـە ئـەدا و ئەیانخاتـە پەیمانەکەوە.

ناجی السویدی: (سەرۆکی وەزیران و وەزیری نـاوخۆ): نـازانم ئـەو نوقتانـەی نـائیبی بـەرێز... بـۆ دڵنیاکردنی بیری نائیبی بەرێز ئەڵێم، ئەو بنچینانـەی حکومـەت لەسـەری رۆیشـتوە بـۆ بـاش بـەرێوەبردنی کاروباری دەوڵەت لە هەمو عیراق دا و لـەو ناوچـەیش دا کـە نـائیبی بـەرێز باسـی کـرد، جێگـەی ستایشـی کۆمەڵەی گەلان و دەوڵەتی هاوپەیمانیش بوە. ئەو بەڵێن و پەیمانانەی حکومەتی عیراق داونی ناتوانێ لێیـان پەشیمان ببێتەوە. نازانم چ هۆیەک هەیە بۆ گومان کـردن لـە نیـازی باشـی حکومـەتی عیـراق سـەبارەت بـە جێبەجێ کردنی بەڵێنەکانی و، بەردەوام نەبونی ئەم بارودۆخە لـە پاشـەڕۆژدا، لـە کاتێـکدا ئـەو بەڵێنانـە لـە قانونی ئەساسیدا دراون. باوەڕ ناکەم هیچ هۆیەک هەبێ بۆ دودڵی و گومـان لـەو بنچینانـەی کـە تـا ئێسـتا حکومەت لەسەریان رۆیشتوە و لە پاشەڕۆژدا لەسەریان ئەڕوا.

مەعروف جیـاوک (هـەولێر): پایـەبـەرز سـەرۆکی وەزیـران و، مەجلیسـی بـەرزو میللـەت ئـەزانن کـە نارەزاییەکی بەهێز بەرامبەر سیاسەتی گشتی حکومەت هەیە و، ئەو وتارە من بڵاوم کردۆتەوە هـەموی راسـتە. (محازر مجلس النواب، جلسە 26 في 13 ی 2 ی 1930، ص 356).

## 2. 4. 4. مولاحەزاتمان دەرحەق بەیاناتی وەزارەتی حازرە (سەعیدیە)

لە پاش تەدقیق و تەحقیقی ئەو بەیاناتە رەسمیەی وەزارەتی حـازرە کـە لـە 10 ی 4 ی 1930 دا لـە جەرائیدی بەغادا نەشر کرابو، لە نەزەری میللەتی کوردا وا دیارە: کە سیاسەتی وەزارەتی حازرە، سیاسـەتێکی تەفرەدان و وەقت بەسەر بردنە، چونکە مەضمونی ئەم بەیاناتە شتێکی تازە نیە، ئەم وەعدە بیلفیعـل بـە حلـی قەراری عصبە الامم و بە سـێهەمین مـادەی معاهـدەی سـاڵی 1922 و مـادەی 17 مینـی دەسـتووری عیراقـی موئەییەدە و لە تەرەف مەرحوم عەبدولموحسین بـەگ سەعدونیشـەوە، چەنـد جارێـک لـە مەجلیسـی نیـابیدا رەسمەن وە بە کەماڵی صەراحەت بەیان و ئیعتیراف کرا بو. ئەساسەن قیسمێک لە مەوادی ئەم موقەڕەرانە لـە قیسمێکی کوردستان دا بە تەواوی تەتبیق کـراوە، بینائـەن عەلـەیهی میللـەتی کـورد وای لا خـۆش ئـەبو کـە وەزارەتی حازرە دەرحاڵ ئیکمالی بەقییەی بکردایە. ئیتر میللەتی کورد نایـەوێ ئـەوقاتی خـۆی بـە تـەفرەدان ضایع، وە بە وەعدی ئیمڕۆ سبەی خۆی ئیغفال بکا. بینا لەسەر ئەمە بەرامبەر ئەم وەعدەی وەزارەتە کە لە حاڵ زیاتر بۆ ئیستیقباڵە میللەتی کوردیش تەشەکوراتی خۆی بۆ ئیستیقبال هەڵدەگرێ.

لە مەسائیلی ئیداری حازرەدا هەرچەندە لە تەعیین بونی (تۆفیق وەهبی بەگ) بۆ موتەسەڕیفی سـلێمانی نامەمنون نین، چونکە ئومێد و ئینتیظاری چاکەی لێ دەکرێ، لە عەینی وەقت دا وامان ئەویست بـۆ لیواکـانی تریش پیاوانی دڵسۆز و حاڵ شوناس و کوردخواە و کوردنەژاد تـەعیین بکرایـە و بکـرێ. لەبـەر ئەمـە بـۆ جەلبی ئیعتیمادی میللەتی کـورد دەبوایـە... کـوردی موتەسـەڕیفی کەرکوکـدا ئـەم جیهەتـە بـەرچاو... ئـەمجا ئێستاش بۆ ئەوەی ئیمان بە حوسنی نییەتی وەزارەت بهێنن، کوردان ئارەزو ئەکەن بۆ موتەسـەڕیفی هـەولێر

زاتێکی وا تەعیین بکرێ کە حائیزی ئەو صیفاتە بێ کە لە سەرەوە بەیانمان کرد.. وە هەروەکو لە مەجلیس دا لە تەرەف مەندوبە کوردەکانەوە تەلەب کرا بو، حالەن لیوای (دهۆک و باجەڵان) تەشکیل بکرێ.

ئیتر لە ئەقوال زیاتر ئینتیزاری ئەفعال ئەکرێ، کوردیش قسەی خۆی بۆ دوایی هەڵگرتوە..!

## 2. 4. 5. هەمو شەوێک ڕۆژێکی لە دوایە

شەڕی گەورە بە هەمو ئەوضاعی جانسۆزانەوە کە خەریتەی سەرزەمینی تێک دا و لەلایەکی تـرەوە کـە چەند خانمانی قەراڵێتی تارومار کرد، کـەچی لـە سـەرێکی تـرەوە زۆر میللـەتی تـری بـەختیار کـردو چەنـد حکوماتی وەکو لیتوانیا، ئۆقرانیا، پۆڵۆنیا...ی هێنایە وجود. وە دیسانەوە وەکو عائیلەی ئالی عوثمانی سەفیل و سەرگەردان و دەربەدەر کرد، کەچی جمهوریەتی تورکیای بە هەمو تازەگی و فەعالیەتەوە هێنایە وجود.

بینائەن عەلەیهی ئێمەیش ئەتوانین بەپێی ئەوضاعی خۆمانەوە موقابیل بەم هـەمو فەلاکـەت، بۆمبـاران، موهاجەرەت و سەفالەتەوە کە میللەتی کورد بیلخاصە لیوای سلێمانی چـاوی پـێ کـەوت و، بـە ئیعتیبـاری ئـەو ئینتیظاری لوتف و شەفەقەتەی کە لە حکومەتی ئەکرد و کە بەرامبەر بەم هەمو فەلاکەتە بە عەزمێکی تـەواوەوە بە ئومێدی پاداشی چاکە ئەباتی کرد نەتیجە بە موکافاتی خۆی گەیشت، ئـەوا شـەوی لـێ ڕۆژ بـوەوە، ئـەوا ئەمڕۆ دەرگای بەختیاری بۆ کرایەوە یەعنی بە کوردی بیڵێن بەرامبەر بەم هەمو تەحەمولی فەلاتە، بەرامبەر بەم هەمو چاوەڕوانیە، دەرگای لوتفی حکومەتی لێ کرایەوە: لە تێگەیشتووترین و چاکترینی میللەتەکەمان و لەسەر ئەفرازانی عیلم و مەعریفەت کە ئەم وەتەنە پێی گەیاندوەو کە هـەمو میللـەت بـە دڵێکـی ڕون و بـێ غەشـەوە خۆشی ئەوێ، یەگانە هەر ئومێدی بـە عـیلم و عیرفـانی بـوە سـەعادەتی تۆفیـق وەهبـی تـەعین کـرا بـو بـە موتەسەڕیفی لیواکەمان. بەجدی ئەڵێین ئەم لوتف و شەفەقەتەی کە حکومـەت ئـەمجارە لەگـەڵیا کـردین و کـە ئومێد و تەمەنای میللەتەکەی هێنایە جێ، هەمو فەلاکەتێکی لەبیر بردینەوە، ماندوی حەسانینەوە، تاریکی لەسەر لابردین، نائیلی ڕۆژێکی ڕوناکی دائیمی کردین و ئیستقبالێکی زۆر باشی بۆ حاضر کردین.

ئێمە بە هەمو مەوجودیەتمانەوە بەرامبەر بەم جوڵانەوە و حوسنی نیەتی ئەم قابینە عالیەی حکومەتە لـە بەجێ هێنانی شوکران زبان و قەڵەممان عاجز ئەبینین. هەر ئـەتوانین بـەدڵ و بـەگیان تەمـەنای سـەرکەوتنی قابینەی حازرە بکەین. وە بۆ مۆفەقیەت و سەرکەوتنی ئەم موتەسەڕیفە خۆشەویستەمان کە سـەعادەتی تۆفیـق وەهبی بەگە، هەمو لایەک دەست بدەینە یەکتری و بۆ بەرزی و بڵندی موشار ئیلەیهی لە خـوا بپارێینـەوە، بـۆ سەرکەوتن و پێشکەوتنی وەتەنەکەمان هەوڵ بدەین و لە هەمو خسوسێکەوە یاریەی بدەین.

پشت بە خوا لە غەزەتەی دواییمانـا تەرجومـەی حـاڵی موشـار ئیلـەیهی عـەرزی خوێنـدەوارانی ژیـان ئەکەین. (ژیان، ژ239، 19 ی 4 ی 1930)

## 2. 4. 6. تەشریف بردنەوەی موتەسەڕیفی پێشو سەعادەتی ئەحمەد بەگ

سەعادەتی موتەسەڕیفی ئەکرەمی پێشومان ڕۆژی جومعـە کـە تەصـادەفی نـۆی مـانگی کـرد، بـە ڕێی کەرکوک دا تەشریفی بردەوە هەولێر، بە صورەتێکی حورمەتکارانە لە تەرەف عمومی ئەشرافی شار، ڕەئیسی بەلەدیە، ڕوئەسای دەوائیر و مەئمورینی لیواوە بە ئۆتۆمۆبیل لە تەرەف قیسمێکەوە هەتا تەیناڵ و لـە تـەرەف قیسمێکی ترەوە هەتا کەرکوک ڕەوانە و عەرزی خواحافیظی لێ کرا.

ژیان: سەعادەتی ئەحمەد بەگ لە مودەی ئەم سێ سـاڵەدا کـە لـەم لیوایـەدا مایـەوە، حەقیقەتـەن وەکـو ئەمنیەت و ئاسایشی لیواکەی تەئمین کرد، بۆ ئاوەدانی شارەکەیش گەلێ هەوڵی دا و بەرامبەر بە ئەهالی لوتف و شەفەقەتێکی تەواوی هەبو، گەورەو بچوکی لیواکە لێی مەمنون بـو. دائیمـەن بەرامبـەر بـەم شەخصـە عالیـە

حورمەتکار بون. ئومێد ئەکەین لەهەر کوێیەکا بیێ، هەر موەفەق و بە بەختیاری بـژی و ئـەم مەحەبەتـەی کـە دەرحەق بە ئەهالی ئەم لیوایە هەیەتی هەر باقی بمێنێتەوە. (ژیان، ژ239، 19 ی 4 ی 1930)

## 2. 4. 7. تەشریف هێنانی سەعادەتی موتەسەڕیفی ئەکرەمی مان

موتەسەڕیفی تازەمان جەنابی تۆفیق وەهبی بـەگ لەگـەڵ رەفیقـەی فاضـیلەی موحتەرەمـەی‌دا، شـەوی دەی مانگ لە بەغدادەوە بە رێگای ئاسن حەرەکەتیان فەرمو. لە بەیانی‌دا گەیشتنە ئیستاسیۆنی کەرکوک و لـە تـەرەف لاوە پێگەیشتوەکانی کوردەوە لە ئیستاسیۆنەکە ئیستیقبال و بە چەپڵەلێدان عەرزی بە خێرهـاتنی کـرا و لـەوێوە لەگەڵ موستەقبیلین دا بۆ ئیستراحەتێکی چەند دەقیقەیی تەشریفیان بردە نادی مەلەکی کەرکوک و لە دوای مانـدو حەسانەوەیان، بە ئۆتۆمۆبیل رو بە سلێمانی حەرەکەتیان فەرمو. لە تەرەف رەئیسی شار و عومـومی ئەشـراف و روئەسای دەوائیرو ئەکسەری ئەهالی سلێمانی‌و هەمو مەئمورینـەوە، قیسـمێکی هـەتا چەمچـەماڵ و قیسـمێکی لـە مەرکەزی تـەیناڵ‌دا ئیسـتیقبالیان فـەرمو، وە عـەرزی بـەخێرهاتن و بەرامبـەر بـەم تەشـریف هێنانـەی دەرەجـەی دڵخۆشی و شادمانی ئەهالیەکەیان عەرز کرد. موشار ئیلەیهی لە مەرکەزی تەیناڵ دا لە ئۆتۆمۆبیلەکـەی تەشـریفیان هێنایە دەرێ، یەکە یەکە دەستی موستەقبیلینی گوشی و لە دوای خیتاب بە حازرون ئەم نوتقە جوانـە کـە بـو بـوە سەبەبی مەسروریەتی هەمو لایەک ئەیفەرمو. وە فەرموی موقبیل بـەم تەعینـەم زۆر مەسـرورم، خـۆم بـە بـەختیار ئەزانم چونکە یەگانە ئارەزوی من هەر ئەوە بوە کە فرصەتێکم چنگ کەوێ خدمەتی وەتەن و میللەتەکەم بکـەم. وا شوکر مۆفەق بوم و تەمەناکەم هاتە جـێ و بـۆ خدمـەت کردنـی وەتـەن و میللەتەکـەم، خـوا ئـەم فرصـەتەی پـێ بەخشیم، ئیتر ئومێد ئەکەم هەمو فەردێکی میللەتەکە بە دڵێکی پاک و جدیـەوە معاوەنـەتم بکـەن، دەسـت بدەینـە دەست یەکتری و بۆ پێشکەوتن و بەرزبونەوەی قەومەکەمان لەژێر بەیـداغی عیراقـی خۆشەویسـت دا تێکۆشـین، ببینە کارکەرێکی بەسود لەناو ئەم وەتەنە شیرینەدا. نەمەتی موتەسەڕیفی پێشـو ئەحمـەد بـەگ شـایانی تەقـدیرە، چونکە بناغەی پێشکەوتنی قەومێک ئاسایشیەتی و ئەویش بە راستی لەلایەنی ئەو زاتە موحتەرەمەوە زۆر چـاک دامەزراوە، منیش بۆ ئاسایش هەر لەسەر ئەو رێگایـە ئـەڕۆم و بـۆ زانسـت، صـیحەت، دەوڵەمـەنی، صـنعەت، وە تەعمیر و زەراعەتی مەملەکەتەکە لە داخڵی هێزی بەشەریەت دا تێئەکۆشم.

لە دوای تەواو بونی فەرمودەکەی، لەگەڵ ئەو هەمو قەڵەباڵغە زۆرەدا تەشریفیان هێنایە سلێمانی و هـەتا ناو شار تاقم تاقم ئەهالی لە رێدا صەفبەستەی ئیستیقبال و ئیحتیرام بون.

ژیان: ئێمەش دیسانەوە بە ناوی عومومی میللەتی کورد و ئـەهالی لیواکەمانـەوە، عـەرزی بـەخێرهاتنی ئەکەین و تەمەنا ئەکەین خوای گەورە و مـەزن هـەمو فرصـەتێکی پـێ ببەخشـێ و بـۆ خدمـەتکردنی وڵات و میللەتەکەی موەفەقی بکات.

(ژیان، ژ 239، 19 ی 4 ی 1930)

## 2. 4. 8. داخلی

موفەتیشی ئیداری خۆشەویستمان سەعادەتی کاپتان گاون، بە مەئذونیەتی شەش مانگ رۆژی شەممەی 3 ی ئـەم مانگـە تەشـریفی بـردەوە بـەریطانیا، لـە تـەرەف سـەعادەتی موتەسـەڕیفی ئـەکرەمی و روئەسـای دەوائیرەوە تەشیع و خواحافیظی لێ کرا.

لە جێی موشار ئیلەیهی هەتا عەودەت ئەفەرموێتەوە، سەعادەتی کاپتان "الىن" موفەتیشی ئیداری عـەمارە تەشریفی هێنایە سلێمانی و موباشەرەتی بە ئیش فەرمو، عەرزی خواحافیظی سەعادەتی کاپتن گاون و بـەخێر هاتنی موفەتیشی ئیداری تازەمان ئەکەین. (ژیان، ژ 238، 8 ی 4 ی 1930)

**2. 4. 9. موفەتیشی ئیداری تازەمان سەعادەتی کاپتان گاون**

بە موناسەبەتی مەئزونیەت و تەشریف بردنی موفەتیش سەعادەتی کاپتن لاینەوە، هەرچەند مودەتێک سەعادەتی مێجەر لوئێدی موفەتیشی ئیداری کەرکوک بە وەکالەت تەماشای ئەم لیوایەشی ئەکرد، بەلام ئەمجارە سەعادەتی کاپیتان گاون کە خاترە و مەوقیعێکی عالی هەیە لەم لیوایەدا، بۆ ئەم وەزیفەیە تەعین کرا. ڕۆژی پێنجشەممەی 13 ی مانگ تەشریفی هێنایە سلێمانی.

وەقتێک کە حکومەت ئەم لیوایەی ئیشغال کردەوە، موشار ئیلەیهی بە صیفەتی قوماندانێتی لەگەڵ جەیشی عیراقیدا تەشریفی هێنایە ئێرە، مودەتێکی زۆر کە قوماندانی عومومی عەسکەری بوە وە کە سلێمانی لە ئینقیلاب و فەلاکەتێکی گەورەدا بو زۆر خدمەتی کردین، بە هەمو قوەتیەوە بۆ محافظەی حەیات و ماڵمان و بۆ ئیصلاحی ئەو حاڵەمان سەعی و هیمەتی فەرمو، لە دوایش دا بە سەبەبی شارەزایی و خەدەماتی پێشویەوە، بو بە موفەتیشی ئیداری لیواکەمان و مودەتێکی زۆریش لەم وەزیفەیەدا بۆ تەرەقی و تەعلیمان هەوڵیدا نەتیجە ئیدارەیەکی باشی لەم لیوایەدا تەنظیم و تەئسیس کرد، بە نەوعێک کە ئێستاش ئەهالی مەدیونی شوکرانێتین، تەعینی ئەمجارەیش بو بە سەبەبی مەسروریەتی هەمو ئەهالی و فەرەح و خۆشیەکی خستە دڵی هەمو لایەکەوە.

بەناوی عومومەوە عەرزی بەخێرهاتن و قدومی موبارەکی ئەکەین، تەمەنای سەعادەت و مۆفەقێتی ئەکەین. (ژیان، ژ 180، 20 ی 6 ی 1929)

**2. 4. 10. بەیانی ڕەسمی لە بابەت موعاهەدەی تازەوە**

موفاویزەکانی عیراق و بەریتانیا ئیتیفاقیان کرد لەسەر ئیمزای موعاهەدەیەکی تەعاروف و سەداقەت، کە لەگەڵ عیراق داخڵ بە عەسبەتول ئومەم بو پەلە ئەکرێ لە تەنفیزیدا، وە کە هەردولا ئیتیفاقیان لەسەر کرد لە عەینی وەقت و میعاددا لە بەغداو لۆندەرە نەشر ئەکرێ، ئەساساتی موعاهەدەکە ئەمەیە:

1. ئیعتیراف بە ئیستیقلالی تەواوی عیراق، وە دەرعوهدە کردنی مەسئولیەتی ئیدارەی هەمو شئونی بە تەنها. وە دەرعوهدە کردنی مەسئولیەتی داخلیە، وە بە پێی تەحالوف بەرامبەر بە ئیعتیدایەکی خاریجی مودافەعەی.

2. لەغوی موعاهەدات و ئیتیفاقاتی کە لە بەینی عیراق و بەریتانیای گەورە کراوە.

3. کە موعاهەدەکە هاتە حەییزی تەنفیزەوە ئیعتیرافی ساحێبی جەلالەتی مەلیکی بەریتانیا، بەتەواو بونی مەسئولیاتی ئینتیدابیە کە ساحێبی جەلالەتی مەلیکی بەریتانیا دائیر بە عیراق قوبوڵی کرد بو، لە خۆیەوە تەواو ئەبێ.

4. کێشانەوەی هەمو قوای بەریتانیا لە هنێدی و موسڵ لە مودەتێک دا کە لە ئیعتیباری تەئریخی تەنفیزی موعاهەدەکەوە، لە پێنج ساڵ تەجاوز نەکات، وە بە ئیجاردانی 3 قاعیدەی هەوائی لە غەربی فورات و شەتتول عەرەب دا لەلایەنی حکومەتی عیراقییەوە بە ساحێبی جەلالەتی بەریتانیا بە شەرتی موحافەزەی ئەم قاعیدانە لەلایەنی حەرەسی خاسی ساحێبی جەلالەتی مەلیکی عیراقەوە ئیجرا بکرێ، بە مەسرەفی خاسی ساحێبی جەلالەتی بەریتانیا.

5. مودەتی موعاهەدە لە ئیعتیباری دەستکردن بە تەنفیزیەوە، بیست و پێنج ساڵە بینا لەسەر تەڵەبی یەکێ لە فەریقەینی موتەعاقیدین دەست ئەکرێ بە موفاوەزە لە بابەت موعاهەدەیەکی تازەوە بۆ تەئمینی مواسەلاتی ئەساسیەی جەوییەی ئیمپراتۆر، ئەگەر لەم مەسئەلەیەدا ئیختیلاف حاسیل بو، حەواڵەی مەجلیسی عەسبەتول ئومەم ئەکرێ.

6. هەر تەرەفە لە موتەعاقیدەین لە وڵاتی ئەوی تریانا، لە تەرەف مومەسـیلێکی دیپلۆماسـیەوە تەمسـیل ئەکرێ. بە پـێی ئوسـوڵی مومەسـیلینی دوەلـی مەسـتەقیلە ئیعتیمـادی ئـەدرێتێ. (ژیـان، ژ 249، 7 ی 7 ی 1930)

## 2. 4. 11. بە واسیطەی موتەصەرریفەوە بۆ ئەهالی سلێمانی

برقیتکم س141 في 9 الجاری نرجو تبلیغ الجواب الاتی الی حفید زادە عبـدالقادر و رفقائـه المـوقعین علی البرقیة الموجهة الی رئاسة الوزراء

ان المعاهدة تشمل جمیع سکان العراق علی اختلاف طبقاتهم وتعود منافعها وواجباتها لهم وعلـیهم جمیعـا وبالطبع ان اخواننا الاکراد هم منهم والیهم اما الحقوق الممنوحه للاکراد فمحفوظة تماما بحکم القانون الاساسـي الذي في واجب الجمیع تاییده ورعایة احکامه.

س2233 الداخلیة

جواب

15 ی 7 ی 1930

بەغدا: وەزیری داخلیە

تەلغرافی مەعالیتان بە واسیتەی موتەسەرڕیفەوە تەبلیغمان کرا، ئێمە تەتبیقی قەراری عیصبەتول ئومەممان ئەوێ کە ئەمەیش بە تەواوی تەوافوق ئەکات بە مادەکانی 109 و 110 لە قانونی ئەساسی.

عومومی ئەعیان و ئەشرافی سلێمانی. (ژیان، ژ 254، 28 ی 7 ی 1930)

## 2. 4. 12. عمومی ئەشراف و قیسمێک عەشایەر چونە تەلغرافخانە

رۆژی 22 ی 7 ی 1930 عومـومی ئەشـراف و قیسـمێک عەشـایەر چونـە تەلغرافخانـە، رەئیسـەل وزەرایان بانگ کردە سەر تەلەفۆن، لە وەکالەتی عومومەوە حەمە ئاغای عەبدوڕەحمان ئاغا ئەم قسـانەی لەگـەڵ کرد:

فەخامەتمەئاب!

لەو موعاهەدە تازەیەی کە کراوە ئەو حقوقـەی عیصـبەتول ئومـەم خسـتویەتە قـەرارەوە و بـە کـوردی بەخشیوە تیا دەرج نەکراوە، بۆ ئەم خسوسە موتەعەدید دەفعە لە تەرەف عومومی عەشائیر، ئەشـراف، توجـار خولاصە هەمو کوردەکانەوە تەلغراف بۆ زاتی دەوڵەتیتان نوسراوە، مەعەلئەسـف هـەتاوەکو ئێسـتا جـوابێکی شافیمان و عادلمان وەرنەگرتۆتەوە، ئینتیظار ئەکەین.

**جوابی رەئیسەل وزەرا بە تەلەفۆن**

منیش وەکو ئێوە کـوردم و ئـارەزوی سـەعادەتی ئەکـەم و بـۆ ئـەم خسوسـە سـەعی ئەکـەم و لەگـەڵ مەندوبی سامیدا لە موناکەرەداین، هەتا چوار رۆژی تر بۆ ئەم خسوسە دێینـە سـلێمانی و گفتوگۆتـان لەگـەڵ ئەکەین. رەئیسەل وزەرا. (ژیان، ژ 254، 28 ی 7 ی 1930)

## 2. 4. 13. تەلەغرافی ئەشرافی هەولێر بۆ ئەشرافی سلێمانی

سلێمانی: میرزا تۆفیق قەزاز

لە موتاڵەباتی حقوقمـان سـەبات باعیسـی نەجاتـە، میللـەت پشـتیوان خـواش لەگەڵمانـە. 20 ی 7 ی 1930. عوسمان ئەفەندی زادە: ئەحمەد. مەعروف جیاوک

جوابی سلێمانی

هەولێر: ئەعیان ئەحمەد بەگ و جیاوک

سەبات ئەبەدیە پشتیوانی وەتەنپەروەران کەفیلی موفەقیەتە. بەناوی سلێمانیەوە تۆفیق قەزاز. (ژیـان، ژ 255، 31 ی 7 ی 1930)

**2. 4. 14. لە چەمچەماڵەوە:**

سلێمانی گەورەکانی موتەزاهیرینی کوردان

بۆ بەرزی میللەتمان خۆمان و عەشیرەتمان فیداکارین بۆ سەرکەوتن پشتیوانین.

لاوانی کوردی چەمچەماڵ: ڕەئیسی بەگزادە، محەمەد ئەمین، ڕەئیسی هەمەوەند، ئەمین.

جوابی سلێمانی

چەمچەماڵ ئەمین ئاغا، ئەمینی ڕەشید ئاغا

حسیاتی بەرز، پشتیوانیتان هەزار قات قوەتی داینێ. بژی کورد، هەمەوەند.

بەناوی موتاظاهیرینەوە عەبدولقادر. (ژیان، ژ 254، 28ی 7 ی 1930)

**2. 4. 15. لە ئەشرافی سلێمانیەوە بۆ مەندوبی سامی و ڕەئیسەلوزەرا**

23 ی 7 ی 1930

بەغداد فەخامەتی مەندوبی سامی عیراق

بەغداد فەخامەتی ڕەئیسەل وزەرای عیراق

بۆ مەعلومات بۆ سەعادەتی موتەسەڕیفی ئەکرەمی سلێمانی

بۆ مەعلومات بۆ سەعادەتی موفەتیشی ئیداری سلێمانی

مەوثوقەن خەبەر وەرگیراوە بە موناسەبەتی هاتنی فەخامەتتان بۆ کوردستان، مەئمورینی ئەلویەی کوردییـە کوردەکان تەضییق و تەهدید ئەکەن بۆ دەست هەڵگرتن لـە حقوقیـان ئەگـەر مەقسـەد لـە ئیسـتیفتایە لـەژێر ئـەم شەرائیطەدا نە مەعقول و نە مومکینە تا کوردستان لەژێر تەئثیری نفـوذی مـەئمورینی ئیـدارەی عـەرەب دا بێـت، ئیستیفتایەکی عادلە و وەتەنپەروەرانـە موسـتەحیلە. وە لـە تـاریخی بەشـەردا نـەبینراوە بـۆ ئیسـتیفتا ئـەفکاری حوڕڕەی میللەتێک تەضییق بکرێت بۆ قبوڵی تەرجیحی ئەسارەتی خۆی بەسەر حوڕڕیەت دا. موقابیـل بـەم حاڵـە بەشیدەتەوە پرۆتیستۆ ئەکەین. ئەشرافی سلێمانی. (ژیان، ژ 254، 28 ی 7 ی 1930)

**2. 4. 16. لە تۆفیق قەزازەوە بۆ نیەر ئیَست**

24 ی 7 ی 1930

لەندەن- نیەر ئیست، تەلغراف

ئەو مەقالەیەی ئێوە کە لە خسوس موعاهەدەی ئینگلتەرە و عیراقەوە نوسـی بوتـان و ئیهمـالی حقـوقی کوردتان دەرخست بو و جەهدی غەیر ئەندێشانەتان بۆ حیمایەی..لە تەرەف کوردانەوە بە تەقدیرێکی عـەظیم و تەشەکوراتی قەلبیەوە قبوڵ کرا، ئەم معامەلەی بەشـەر پەرسـتانەیەی ئێـوە موزاهـەرەتێکی جـوانی قەضـیەی موحیقەی کوردانە.

کوردەکان موتەئەسیفن لە موعاهەدەکە، چونکە هیچ باسی ئەو حقوقەیان نەکراوە تیـا، کـە بـە مـوجیبی ئەوە حکومەتێکی کورد لەژێر ئینتیدابی عیصبەتول ئومەم دا تەشکیل بکرێ.

مەئمورینی حکومەتی عەرەبیە تەهدیـدات و تەضـیقاتی ئێمـە ئەکـەن کـە دەس لـە حقـوقی خۆمـان هەڵگرین، لوتفەن دائیمەن ئەم حەقیقەتە لە لاپەڕەکانتانا نەشر بکەن. تۆفیق قەزاز. (ژیان، ژ 254، 28 ی 7 ی 1930)

### 2. 5. 17. پرۆغرامی فیرقەی موتەزاهیرینی کوردان

کە لە رۆژی 16 ی 7 ی 1930 ئیجرا ئەکرێ

1. ئامال و مەقسەد لەم موزاهەراتە، صرف لە رێیەکی مەشروعەوە تەلەبی حقوقی مەعلومەی کوردانە کە وەختی خۆی عصبە الامم پێی بەخشیوە و قەراری لەسەر داوە.

2. فیرقەی موتەزاهیرین بە عمومی مەجبورە تەبەعیەتی هەمو قەوانین و نیظاماتی حکومەتیی بکات و حەددەلئیمکان مەیدان بە حەرەکەتێک نەدات کە ببێ بە سەبەبی ئیخلالی ئەمنیەت و ئاسایش.

3. مەحەللی ئیجتیماع لەبەردەمی سەرای حکومەتی و لەباغی بەلەدییەدا ئەبێ.

4. عمومی ئەشرافی مەملەکـەت و رونەسـای عەشـائیر و ئـەهالی ئـەمرۆ کـە موصـادیفی 16 ی 7 ی 1930 ە، ساعەت لە نۆی عەرەبی لەناو باغی بەلەدیەدا ئیجتیماع ئەکات.

5. ساحەی جوڵانی فیرقەی موتەزاهیرین لە بـەردەمی سـەرای حکومەتیـەوە هـەتا بـەردەمی مزگـەوتی گەورە و لەم مەنتیقە مەحدودەدا ئەبێ.

6. لە ساعەت نۆ و نیوی عەرەبی دا، فیرقەی موتەزاهیرین لە حاڵی سکونەت و ئیعتیدال دا لە مەحـەللی ئیجتیماع دا حەرەکەت ئەکات و ئەچێتە بەردەمی مزگەوتی گەورە. لەوێدا بەناوی عمومەوە (لە تەرەف رەمزی ئەفەندی حاجی فەتاح) وە قۆنفرانسێک ئەدرێت.

7. لەدوای قۆنفرانسەکە لە ساعەت دەی عەرەبی دا، فیرقەی موتەزاهیرین بڵاو ئەبێتەوە.

8. هەیئەتی مومەسیلەی فیرقەی موتەزاهیرین، ئەم زاتانەی لای خوارەوەن:

عەبدولرەحمان ئاغای ئەحمەد پاشا. عیزەت بەگی عوسمان پاشا. حفیدزادە شێخ قـادر ئەفەنـدی. حەمـە ئاغای عەبدولرەحمان ئاغا. رەمزی ئەفەندی حاجی فەتاح. میرزا تۆفیق قەزاز. مەجید ئەفەندی حـاجی ڕەسـوڵ ئاغا. سلێمانی: 16 ی 7 ی 1930

### 2. 4. 18. تەشریف هێنانی وەلیعەهدی بڵند پایە

تەشریف هێنانی وەلیعەهدی بڵند پایە و موزاهەرەتێکی عمومی کورد

رۆژی 16 ی مانگ ئەمیر غازی وەلیعەهدی بولوندپایەی عیراق تەشریفی هێنایە سلێمانی، هەمو ئەهالی لیـوای سـلێمانی، عولـەما، سـادات، ئەشـراف، تیججـار، رونەسـای عەشـایەر، رونەسـای دەوائیـر، مـەئموریی حکومەت، شاگردانی مەکتەب لـە سـەعات دوی کوردییـەوە چـون بەپیریـەوە و لەسـەر جـادەی دەباخانـە لـەو چادرانەدا کە لەلایەن بەلەدیەوە هەڵدرابو حازیرو مونتەزیری تەشریف هێنانی بولوندپایەیان بون. لـە سـەعات دەوری 3 ی کوردیدا تەشریفیان گەیشت. کە گەیشتە نزیـک ئـەم عەشـاماتە لـە ئۆتۆمۆبیـل تەشـریفی هاتـە خوارەوە و تەفتیشی حەرەسی شەرەف و کەششافەی کـرد و لەگـەڵ هـەمو ئەشـراف و رونەسـای عەشـایەرو مەئمورین دا موسافەحەی فەرمو.

لەدوای ئەمە تەشریفی سواری ئۆتۆمۆبیلی خوسوسی خۆی بو، هاتنە ناو شـار و لـە مـاڵی سـەعادەتی موتەسەرِیفی خۆشەویستمان دابەزی.

ئەم میوانە گەورە و خۆشەویستە، بە هەمو ئیحتیرامێکەوە قبوڵ و ئیستیقبال کرا.

هەر عەینی ڕۆژ لەلایەنی ڕوئەسـای عەشـایەر، ئەشـراف، تیججـار و ئـەهالی سـلێمانیەوە نومایشـێکی غایەت موتەنتەن و بەدەبدەبە ئیجرا کرا.

بەڵێ ئەم نومایشە، ڕۆحێکی غایەت بەرز و بەقیمەت، بە حیسسێکی غایەت عیلوی و موقەدەسەوە ئیجرا کرا. نەک هەر عولەما، سادات، ئەشراف، تیججار و ڕوئەسای موحتەرەمەی عەشایەر بەڵکە هەمو میللەتی کورد، گەورە و پچوک، منداڵی مەعسوم لە باوەش دایکیانا لەگەڵ دایکە بـە ڕەئفـەت و شـەفەتەکەیان، بەڵکـە ڕۆحـی هەمو مردوانی کورد لە سەمای مەعنەویەت و ڕەحمەت دا ئیشتراکیان کرد.

بەڵێ ئەوەڵ جار ئەم ئیزدیحامە لە سەعات نۆی کوردیدا ڕوەو بازاڕ ڕۆیشتن و لەپاشا گەڕانـەوە نـاو باغچەی بەلەدییە- بەردەمی سەرای حکومەت. دو بەیداخ کە لەسەر شانی ئومێدی ئیستیقبالی میللـەت: تەلەبـەی مەکتەب، هەڵگیرابو ئەمانەی لێ نوسرا بو: *"ڕەوا بـێ مـەتالیبی کـورد"، "بەرقـەرار بـێ عەدالـەتی عەسـبەتول ئومەم". لە دەمی هەمو فەردێک بەبێ ئیختیار گۆرانی وەتەنی ئەهاتە دەرەوە. ئەم ئیزدیحامە ئەوەنـدە زۆر بـو ئەتوانین بڵێین بەحرێکی کەللە شەپۆلی ئەدایەوە. لەبەر زۆری قەڵـەبالغ لـە باغچـەی بەلەدیـەدا جێگـا نـەبوەوە ئینجا هەمو چونە سەر جادەی سـابونکەران و لەبـەردەمی چایخانـەی حەمـە ئاغـا و مەکتـەبی موتەوەسـیتەدا ڕاوەستان. لەوێدا جەنابی وەتەنی غەیور ڕەمزی ئەفەندی حاجی فەتاح لەسەر سەربانی چایخانەکەی حەمە ئاغا ڕاوەستا و نوتقێکی غایەت قیمەت دارو موهەییجی خوێندەوە کە هەر حەرفێکی شایستەیە بە قەڵەمی زەڕین لـە سەحیفەی تەئریخ و ئەعماقی... بنوسرێت و لە تەرەف میللەتەوە بە ئیحترامەوە چەپڵەڕێزان کرا، وا عەینەن لـە خوارەوە دەرجی ئەکەین.

لە دوای ئەمە جەنابی میرزا تۆفیق دیسان لەسەر عەینی سـەربان ئیرتیجـالی بەرامبـەر بـە میللـەت، چەند کەلیمەیەکی شیرینی ئەدا کرد. وە لە تەرەف هەمو میللەتەوە دەنگی چەپڵەڕێزان و بژی بژی گـوێی ئاسمانی کەڕ کرد. وە لەلایەنی هەمو میللەتەوە تەوکیل کرا مەتالیبی میللەت بە وەلیعەهـدی بڵندپایـە عـەرز بکات.

ئەم نومایشە بە نەوعێکی وا مەدەنی و سکونەت جەرەیانی کرد کە چـارەی هـیچ کەسـێک غـەیری سرور و تەبەسوم، هیچ عەلامەتی یەئس و تەئەسور وە یا تەهەور موشـاهەدە نەئـەکرا. لـە دوای ئەمـە لـە سەعات دە و نیوی کوردیدا عولەما، سادات، ئەشراف، تیججار، ڕوئەسای موحتەرەمەی عەشائیر، ڕوئەسای دەوائیر چونە دەوڵەتخانەی سـەعادەتی موتەسـەڕیفی خۆشەویسـت و لەوێـدا زیـارەتی میـوانی عـەزیز و بڵندپایە کرا.

لەوێدا لەسەر تەکلیفی میللەت وەکیلی موحتەرەم جەنابی میرزا تۆفیق هەڵسایە پێیان، لەپاش ئـەوەی کـە بەناوی هەمو میللەتەوە عەرزی بەخێرهاتنی وەلیعەهدی خۆشەویستی کرد، مەتالیبی میللەتی بـەم تەرحـە کـە لـە خوارەوە ئەینوسین بە عەرزی گەیاند، جوملە جوملە لە تەرەف مـودیری تـەحریرات جـەنابی جـەلال صـائیب ئەفەندییەوە بە عەرەبی تەرجومە و بە عەرز گەیەنرا. وەلیعەهدی خۆشەویست زۆر چاک لە هـەمو جوملەیـەکی گەیشت و بە دیققەت گوێی ڕاگرت.

لەدوای تەواو بون موتالەباتەکە کە عیبارەت بو لە مەزبەتەیەکی عمـومی لەلایـەن خـەتیبی موحتەرەمـەوە تەقدیمی سموی وەلیعەهد کرا. تەرجومە و جوابی سموی وەلیعەهـدیش بـە واسـیتەی ڕەئیسـی بەلەدیـەوە بـە میللەت گەیەنرا کە زاتی بڵندپایەیان وەعدی فەرمو ئەم مەتالیبی میللەتە بە عەرزی عەتەبەی ملوکانەی بگەیەنێ و بەم تەحدە موظاهەراتەکە هەتا ئێواری درەنگ دەوامی کرد، لە دوای ئێـواری خەڵقەکـە بڵاوبونـەوە. (ژیـان، ژ 252، 21 ی 7 ی 1930

**2. 4. 19. نوتقی موحتەرەم رەمزی ئەفەندی**

ئەی کوردینە!

هەر وەکو قەتعیەتی ریازییە سابیتە ئیتر هەمو قەومێک بەلیسان، ئەدەبیات، تەئریخ، عەنعەنات، عورف و عادەتی خۆی تەرەقی ئەکات و ئەم عەصری بیستەمینی مەدەنییتە عەصرێکی میللییەتە.

موحیت و حالاتی عومومیەی هیچ قەومێک نەبوە بە سائیقی تەرەقی و ئیعتیلا بۆ قەومێکی تر، بیلعەکس بوە بە سەبەبی فەلاکەت و ئیزمیحلالی.

لەپاش حەربی عومومی، تەئریخ و خەریتەی عالەم بۆ ئەم موددەعایە شاهیدێکی عادلە.

هەمو زەریفی ئەزانین قەومی کورد ئایا لە ئەثنای حەربی عومومی داو ئایا لە پاش دا گەلێ فرصەتی قیمەتداری دەست کەوت، مەعەلئەسەف لە هیچیان ئیستیفادەمان نەکرد، لە هەمو دەورێکدا ئەم فرصەتە باشانە یەکە یەکە بون بە سەبەبی فەلاکەت و ئیدبارمان، مەسئەلە ئەهمیەتی کەسب کرد، لازمە ئەسبابی تەحلیل و تەحەری بکەین و برینەکانی ئیجتیماعیمان دەرمان و سارێژ بکەین، لە نەتیجەی ئەم تەحەرییاتەدا دو عیللەت لە خۆمانا ئەبینین: یەکێکیان، لەناو ئەفرادا نیفاقی دائیمی و بێ مەحەببەتی. دوهەمیان، بۆ ئیحقاقی حەق و تەرویجی ئامال و مەتالیبی عومومییە، موراجەعەت بە عەقل و فیکر نەکردن.

بێو لاپەڕەکانی تاریخی ئەقوام هەڵبدەینەوە، لە هەمو ئەقوامی مونقەریضدا ئەم دو عیللەتە موشتەرەکە ئەبینین کە بوە بە سەبەبی فەلاکەت و ئینقراضیات، ئەی کوردینە! لەم حاڵەش دا نابێ ئێمە مەیئوس ببین. چونکە ئیسلامین. پێغەمبەر (ص) فەرمویەتی: "اليأس كفر" یەئس کوفرە، عەطالەت تەولید ئەکات و نەتیجەی عەتالەتیش کردنە فەلاکەتە، میللەتێک صاحێبی مەتانەتی ئەخلاقیە بێ بە عەقڵ و تەدبیری جوالیەوە لە فەلاکەت دەرسی عیبرەت و ئینتیباە وەرئەگرێ و، فەلاکەتەکە ئەکات بە سائیقی تەیەقوظ و ئیعتیلا بۆ خۆی.

کەوابو لازمە لە پێش هەمو شتێک دا لەناو خۆمانا نیفاقەکە هەڵگرین و، لە جێگای ئەم کەلیمە مەشئومە تۆوی مەحیبەت و ئیتیفاق بچێنین. زۆر شوکر ئەمرۆ ئەثەری خێری ئەم ئیتیفاقە لە میللەتەکەماندا ئەبینین، گەورە و بچوک، داخل و خاریج بۆ حقوقی موکتەسەبە و مەشروعەمان لە دائیرەی عەقڵ و قانون، مەنطیق و فیکردا موطالەبە و مودافەعە ئەکەن و هەوڵ ئەدەن. وە لازمە لەمەودواش لە هەمو ئیشێکمانا حەق و حەقیقەت بکەین بە پشتیوان و رەهبەرمان.

ئینجا بێینە سەر مەوزوعی ئەم ئیجتیماع و موظاهەرەیە:

مەعلومتانە، حکومەتی عیراق لەگەڵ حکومەتی بەریطانیا موعاهەدەیەکی تازەی کرد. حقوقی ئێمە لە مادە 3 و4 ی قەراری مەجلیسی عالی عصبە الامم و مادە 3 ی موعاهەدەی 1922 و مادە 109 و 110 ی قانونی ئەساسی حکومەتی عیراقیە تەثبیت کرابو، وە کە لە تەرەف حکومەتی فەخیمەی بەریتانیاوە و جەلالەتی مەلیک و رەئیسی حکومەتی عیراقیەوە رەسمەن تەئیدو ئیعتیرافی پێ کراوە. مەعەلئەسەف هێشتا ئەسیری دۆسیە و کاغەذە و لە شکڵی عەنقادا ماوەتەوە و حەتتا لەم موعاهەدە تازەیەش دا کە یەک دەفعە موناسەباتی ئینگلیز و عیراق قەطعیەتی کەسب کردوە و ئینتیداب نیهایەتی هاتوە دیسانەوە خراوەتە گۆشەی نسیانەوە، موعاهەدەکە وەکو فەلاکەتێکی تاکمەضهور ئومێدی ئیستیقبالی مەحو کردوینەتەوە.

لەبەر ئەمە غایەی موزاهەرەکە ئیحتیجاجێکە بۆ مەتالیب و حقوقی مەشروحە و مەشروعەمان. لازمە گەورە و بچوک هەمو کوردێک دەست بدەینە دەستی یەکتری و لەم رۆژە تاریخیە ئیستیفادە بکەن.

ئەمرۆ قەومی کورد بە وجودی مولاقاتی وەلیعەهدی عیراق مەسرور و شادانن بۆ عەرزی بەخێرهاتن و مەتالیبی حقوقیە، لە تەرەف عومومەوە کۆمەڵێک هەڵبژێراون. ئەم کۆمەڵە هەیئەتی عومیە تەمسیل ئەکەن بە

پشتیوانی ئێوەوە موەفەق ئەبن. لازمە لە تەرەف کۆمەڵەوە سەعی و لە تەرەف ئێـوەوە موزاهـەرەت و قـوەت. ئیتر حەق رەفیقمانە.

بژی قەراری مەجلیسی عصبە الامم
بژی مەتالیبی قەومی کوردو موختارییەتی ئیدارە
بژی مەلیکی عەرەب و کوردان کە مەلیک فەیسەڵی ئەوەلە
بژی حکومەتی فەخیمەی بەریتانیا. (ژیان، ژ 252، 21 ی 7 ی 1930)

## 2. 4. 20. **موتالەباتی میللەتی کورد بە واسیتەی میرزا تۆفیق قەزازەوە**

موتالەباتی عومومی میللەتی کورد کە بە واسیتەی میرزا تۆفیق قەزازەوە تقدیمی صاحب السمو وەلیعهدی خۆشەویستی عیراق کراوە

لە پێشەوە بەناوی هەمو کوردانەوە عەرزی بەخێرهاتنتان ئەکەین. وە خۆمان بە بـەختیار ئـەزانین کـە لەم فرصەتەدا تەشریفتان هێناوەتە لیواکەمان.

کوردەواری کە لە هەمو وەقتێک دا بە ئیرتباطێکی مەتین و صەمیمەوە مەربوطی عەرشی بەرزی عیراقە، خۆی بە شەرەف ئەزانێ کە مەعروضاتی ئاتییە بخاتە بەر نەزەری صاحێب سموتان:

مەعلومی صاحێب سموتانە کـە لـەم چەندانـەدا موناسـەباتی داخلیـە و خارجیـەی حکومـەتی صـاحێب جەلالەت مەلیک فەیسەڵی ئەوەل لەگەڵ حکومەتی بەریتانیادا رەبطـی موعاهەدەیـەک کـراوە کـە مـوافیقی ئـەم موعاهەدەیە ئینتیداب مولغا و تەنها حکومـەتی عیـراق مەسـئولی ئیـدارەی داخلیـە ئـەبێت. لـەم موناسـەبەتەدا ئەمانەوێ بیهێنینەوە خاتر کە وەقتێ لوجنەی ئیستفتای عصبە الامم و حەللی ولایەتی موصل هاتـە عیـراق، لـە تەقریرەکەیدا وەهای تەوصیە کردوە ئەگەر کوردستانی جنوبی رەبطی عیراق بکرێت، لازمـە بـۆ موحافـەزەی مەوجودیەتی میلیە، عەنعەنە، زمان و عصبە الامم و مادە: 109 و 110ی قانونی ئەساسـی عیـراق دا تەئیـدو تەثبیت کراوە.

حـاڵی حـازر، مـوافیقی موعاهـەدەی تـازە ئینتیـدابی بـەریتانیا رەفـع و لەسـەرێکی تریشـەوە لـە بنـودی موعاهەدەدا حقوقی مەشرعە و موئەیدەی کورد کە عیبارەتە لە موختاریەتی ئیـدارەکەی و ئیعتیرافـی پـێ نـەکراوە، کوردەواری بە عمومی ئەم موعاملەیە بە تەجاوزێکی صەریحی ئەزانن بـۆ حقـوقی موعتەرەفـەیان بـە یـەک دڵ و یەک ئاواز مەتالیبی خۆیان کە عیبارەتە لە موختاریەتی ئیـدارە بـۆ کوردسـتانی عیـراق، یـەعنی لیـوای کـەرکوک، هەولێر، سلێمانی، ئەقزییەی شیمالیی موصل و قیسمی سەروی لیوای سیروان ئیدیعا و عەرزی صـاحێب سـموتانی ئەکات کە بۆ تەتبیقێکی سەریعی حەواڵەی سولتاتی عولیای بفەرمون. (ژیان، ژ 252، 21 ی 7 ی 1930)

## 2. 4. 21. **روداوەکانی کورد**

زۆر بە داخەوە نامەکانی سلێمانیم بە وردی خوێندەوە، چەندم حەز ئـەکرد لـە وشـەکانی بەرێوەبـەری رۆژنامەکە تێنەپەرم. وەکو لێی تێگەیشتم ئەم نامانە ئازارم ئەدەن و هەمو عیراقیـەکی دڵسـۆز کـە سـور بـێ لەسەر قازانجی وڵاتەکەی و لە پێناوی یەکێتی و سـەربەخۆیی دا گیانبـازی بکـا، کـاتێ ببینـێ کوردەکـان لـەم هەلومەرجە سەختەدا کە وڵاتی پێدا ئەڕوا، بۆ ئەوەی مافەکانی بە خۆپیشاندان و ئاژاوە بسـێنێ، دور نیـە بـە هاندانی بێگانە یا کەسانی نەفس نزم بوبێ، بۆ قازانجی تایبەتی خۆیان زوڵم لە گـەلەکـەیان ئەکـەن. نمونـەی ئەمان زۆرن و رۆژگار کەسایەتیەکانیمان بۆ دەر ئەخا. لەوەتی ئەم نامانـە بـڵاو بونەتـەوە، چـاودێریم ئـەکرد بزانم کاریگەریان چۆنە، گەیشتمە چەند ئەنجامێکی تاڵ، لێرەدا هەندێکیان ئەنوسم:

1. کەرکوکیەکان ئینزاری کورد ئەکەن سەبارەت بەو شتانەی لە خواستەکانیان دا هاتوە کە خراونەتە بەرچاوی خاوەن شکۆی شاهانە ئەمیر غازی مەزن لەلایەن میرزا تۆفیقەوە کە کەرکوک لەناو ئەو کوردستانی عیراقەدایە کە ئینگلیز بۆی سەلماندون، بە ویستی خۆیان بەرێوەیبەرن یا ئیدارەی موختاریەت.

2. کەرکوکیەکان بە هیچ جۆرێ دان بە کوردا نانێن، چونکە رێچەڵەکیان بۆ دنیا ئاشکرایە، بەڵکو هەمو برِیاریان داوە لەگەڵ برا عەرەبەکانیان بژین و هیچ پێوەندی و پەیوەستیەکیان بە کوردەوە نیە.

3. کەرکوکیەکان داوا لە کورد ئەکەن ناوی کەرکوک و کەرکوکیەکان بەهیچ جۆرێ لەگەڵ داواکانی خۆیان دا باس نەکەن، چونکە هەرگیز لە پلەیەکدا نەبون دەستی بێگانە بتوانێ تۆوی ناکۆکی و نیفاقیان لەناودا بچێنێ.

4. کەرکوکیەکان ئامادەن سەر و ماڵ لەسەر یەکێتی عیراق دابنێن.

بژی عیراق و بژی ئەوەی لە پێناوی یەکێتی عیراق دا هەوڵ ئەدا.

بمرێ و بروخێ ئەوەی هەوڵی تەفرەقە و نیفاق ئەدا. کەرکوک حەسەن سوداد.

(الجهاد، ع 224، 16 ی 8 ی 1930)

## 2. 4. 22. کەرکوک

لەسەر موراجەعاتی موتەمادی کوردانی سلێمانی و کەرکوک و هەولێر، فەخامەتی وەکیلی مەندوبی سامی و وەکیلی رەئیس ئەلوزەرای عیراق رۆژی جومعە، 8 ی 8 ی 1930 لە بەغدادەوە تەشریفیان هێنایە کەرکوک، لە عەینی رۆژدا لە قشڵەدا عمومی ئەشراف و ئەعیانی کەرکوک و روئەسا گەورەکانی ئەو لیوایە کە هەمو کوردن کۆیان کردەوە. لە دوای بەستنی کۆمەڵەکە، رەئیس ئەلوزەرا هەڵسا ئەو بەیانەی کە هەمو کوردێک خوێندویەتیەوە و لە پێشا نەشر کرابو و کە گۆیا حکومەتی عیراق قەراری داوە بۆ کوردەکان موقەرِەراتی عیصبەتول ئومەم تەتبیق بکات، خوێندیەوە و لە عەقەبی ئەوەوە فەخامەتی مەندوبی سامیش هەڵسا و نوتقێکی خوێندەوە و تەئیدی بەیانەکەی حکومەتی عیراقی کرد، فەرموی ئێمەش لەگەڵ عیراقا موتەحدین بۆ تەتبیقی موقەرِەراتی عیصبەتول ئومەم.

لە دوای ئەمانە عەبدوڵڵا صافی ئەفەندی یەعقوبی هەڵسا و گوتی: لەم بەیاناتە زۆر موتەشەکیرین، زاتەن ئەم لیوایە عیبارەتە لە تورک و عەرەب، یەعنی نفوسەکەی صەد هەزاری لەم دو عونصورەیە و ئێمە عیراقین لە وەحدەتی عیراق جیا نابینەوە. مصطەفا ئەفەندی برایشی عەینەن تەئیدی قسەکەی کاکی کردەوە، بەڵام ئیتر لە حازرون و لەو هەمو قەڵەباڵغە غەیری فارس ئاغای بەیاتی نەبێ کە پیاوێکی عەرەبە و شێخ محەمەد حەبیب ئەفەندی طالەبانی نەبێ کە چونکە قاضی و مەئمورە و مەجبورە کەسێکی تر تەئیدی نەکردنەوە، حەتتا چونکە قسەکانی عەبدوڵڵا صافی ئەفەندی هەموی عیبارەت بو لە بەیاناتێکی غەیرە حەقیقی و بە ئاشکرا مەوجوبیەتێکی ئەکسەریەی کوردی پەنهان کرد، وەتەنپەروەر و جەوانمەردی غەیوری کورد محەممەد بەگی جاف مەندوبی پێشوی کەرکوک، هەڵسایە سەر پێ و بە هیمەتێکی مەردانە و بە دەنگێکی بەرز فەرموی: "لیوای کەرکوک ئەکسەریەتی عەظیمەی کوردن یەعنی لە 150 هەزار نفوس 120 هەزاری کوردێکی خالیصە. ئینجا ئەگەر بە زیادەوە حسابی بکەین، ئەوی تری ئینجا تورک و عەرەبن و ئەم قسەیەی منیش مەعلوم و ئاشکرایە و فەرموی بەندە کە لێرەدا تەمسیلی عەشیرەتێکی زۆر گەورەی وەکو جاف ئەکەم، غەیری ئەمیش روئەسای داودە، زەنگەنە، جەباری، شوان و سائیرە روئەسای کوردان کە لەم مەجلیسەدا حازرن، بەندەیان تەوکیل کردوە کە بەناوی عومومەوە عەرزتان بکەم کە ئەم کوردانە بەیەک وجود و یەک زبان، داوای تەتبیقی موقەرِەراتی عیصبەتول ئومەم ئەکەن. ئەمە حەقمانە و ئەم حەقەمان ئەوێ و هەتا ئاخری تەعقیبی ئەکەین".

لەدوای ئەمە عەبدوڵڵا صافی بەگ متەهەویرانە کە خیلافی ئاداب و ئیجتیماعیات بو هەڵسا، گوتی: "ئەم زاتە بەناوی کێوە قسە ئەکات؟ ئەم جافانە عائیدی سلێمانیەن، هەموی دو ساڵە ڕەبطی کەرکوک کراوە، با بچێتە سلێمانی داوای حەقی خۆی بکات!".

لەسەر ئەوە محەممەد جافیش هەڵسا و جوابی دایەوە: "من بە ناوی 150 هەزار جافەوە قسە ئەکەم. من کوردم، کورد ئەژیم و بە کوردی ئەمرم. ئەم مەملەکەتە کوردە، لەبەرئەوە هەمو کوردێک حەقی هەیە لە مەملەکەتی کوردان دا تەلەبی حقوقی میللەتی وەتەنەکەی بکات".

حەقیقەتەن خوێنی کوردایەتی بە ئاشکرا لە دەمارەکانیا جەوەلانی ئەکرد. لەو ئەثنایەدا جەعفەر پاشا هەڵسا و روی کردە محەممەد جاف، گوتی: "بە شەرەفی حکومەت و خۆم تەئمینت ئەکەم کە بە تەواوی موقەڕەراتی عیصبەتول ئومەمتان بۆ تەتبیق ئەکرێ، ئەم لیوایەش ئیستیفادەی لێ ئەکات".

محەممەد جافیش لە جوابا گوتی: "سا باشە تەشەکورتان ئەکەم!".

لەو ئەثنایەدا سەید ئەحمەد ئەفەندی خانەقا و سەید محەممەد ئەفەندی جەباری و سائیری رونەسا موحتەرەمەکانی کورد عەلەنەن هەڵسان تەئیدی محەممەد بەگی جاف و حقوقی کوردیان داوا کردەوە. بەم نەوعە موناقەشەکە دوایی هات و کۆمەڵەکە بڵاو بونەوە. (ژیان، ژ 257، 14 ی 8 ی 1930)

### 2. 4. 23. بە درۆ خستنەوە: بروسکەیەک لە توزخورماتوەوە

ڕۆژنامەکانی الجهاد، البلاد

ئەو بەیاناتەی لەلایەن فەخامەتی سەروەزیران و مەندوبی سامیەوە دەربارەی مەسەلەی کورد لە کەرکوک دراوە، ئەوەیە کە بە گشتی ئەمانەوێ، لەسەری موافیقین و پشتیوانی ئەکەین و دەس ئەگرین بە عەرشی مەلیکی خۆشەویستمانەوە.

رەئیسی عەشیرەتی بەیات، حارس. رەئیسی داودە، رەفعەت. (الجهاد، ع 266، 8 ی 8 ی 1930)

### 2. 4. 24. ملاحظية المطبوعات

وەفدی وەزاری ڕۆژی 8 ی 8 ی 1930 گەیشتە کەرکوک، لە فڕۆکەخانە پێشوازی کران، ئەشرافی لیوا و وجەها و زوعەما سەعات دەی بەیانی بانگ کران بۆ دیوانی موتەسەڕیفیەت. بەیانەکە خوێندرایەوە و رستە بە رستەی کرا بە کوردی. وەفدەکە رو ئەکاتە سلێمانی. ئەهالی بە ارتیاح و ابتهاجی تەواوەوە پێشوازیان کردن، زۆر بە گەرمی و دڵسۆزی بەسترانەوەی خۆیان بە عەرشی خاوەن شکۆوە دەربڕی.

(الجهاد، ع 227، 10 ی 8 ی 1930)

### 2. 4. 25. زیارەتی هەولێر

ڕۆژی شەممە 9 ی 8 ی 1930 لە کەرکوکەوە تەشریفیان بردە هەولێر، لەوێش لە سەعات دەی ئینگلیزی دا لەسەرا لە مەقامی موتەسەڕیفیدا ئەشراف و رونەسای عەشائیرەکان کۆبونەوە، لە دوای کۆبونەوە رەئیس ئەلوزەرا ئەو بەیاناتەی کە لە کەرکوکیش خوێندبویەوە بەیان و خوێندیەوە و فەخامەتی مەندوبی سامیش هەڵسا و نوتقێکی خوێندەوە و بەیاناتەکەی رەئیس ئەلوزەرای تەئید کردەوە.

لە دوی ئەمانە جەنابی ئەحمەد ئەفەندی ئەعیان و وەتەنپەروەری غەیوری کورد هەڵسا، فەرموی: لە پێش ئەمەدا قسە بکەین، ئیجاب ئەکات رونەسای عەشائیر فکری خۆیان بەیان بکەن، چونکە ئەوانیش مەضبەطەیان تەقدیم کردوە.

مەندوبی سامی فەرموی: باشە.

لەسەر ئەوە روئەساکان گوتیان بە عمومی جەنابی خضر بەگی ئەحمەد پاشا لە روئەسای دزەییمان کردوە بە وەکیل، موما ئیلەیهی هەڵسا گوتی: ئێمە هەمو عەشائیر موتەفیقەن تەئیدی مەتالیبی ئەهالی سلێمانی ئەکەین. ئێمە لەگەڵ سلێمانیدا ئەژین و ئەمرین!. یەکێکین. ئیستیرحام ئەکەین ئەم سێ لیوایە کەرکوک، سلێمانی، هەولێر نابێ لەیەک جیا بکرێنەوە، هەرچی بە سلێمانی بدرێ ئەبێ ئێمەش ئیستیفادەی لێ بکەین.

لە دوای ئەمە جەنابی ئەعیان ئەحمەد بەگ هەڵسا فەرموی: "ئێمە کوردین و حقوقی خۆمان ئەوێ، بەندە چەند ساڵە لە خدمەتی حکومەتام و تێگەیشتوم کە کورد بە عمومی لەسەر حقوقی خۆی ئیصرار ئەکات و ئەم حقە بە قەراری عیصبەتول ئومەم دامەزراوە پێویستە بماندرێتێ" وە لەسەر ئیعتیراض و تەئثیری جەعفەر پاشا خیتابەن بە جەعفەر پاشا گوتی: "پاشا تۆ بۆ عەرەبەکان دو پەنجەت دانا ئێمەش حەقی خۆمانە لە رێی ئەم حەقە میللیەمانا رۆحی خۆمان فیدا کەین. کەس حەقی عیتابی نیەو قەراری عیصبەتول ئومەم ئەوەیە: لوغەتی کوردی رەسمیی بێ. ئێمە بۆ ئەم حەقە موصیرڕین".

وە لە پاش ئەم گفتوگۆیانە ئیسماعیل بەگی رەواندوزی هەڵسا گوتی: "پاشا ئێمە لەم قسە بروپوچانە تێر بوین. بەحسی موستەقبەل ئەکەین. موستەقبەل هەم سبحەینێ هەم دە ساڵی تر وەتا ئاخری هەر موستەقبەلە ئێمە حالەن تەتبیقی قەراری عیصبەتول ئومەممان ئەوێ. وە فەورەن ئەبێ لیوای دهۆک تەشکیل بکرێ، میللەت بە ئارەزویەکی قەطعی ئەم تەلەبە ئەکات".

لە پاشا مەعروف بەگ جیاوک هەڵسا گوتی: "وا ئەزانی جەنابی فەخامەتمەئاب وەکیلی موعتەمیدی سامی موساعەدە ئەفەرموێ دو قسە بکەم. بەندە عەرزێک و سوئالێکم هەیە: ئەو بەیانەی جەعفەر پاشا خوێندیەوە دو شتی تێگەیشتم 1-تەلەبی وەحدەتی عیراقی– کوردو عەرەب. 2- عەدەم ئیمکانی تەئیدی حقوقی کوردان بە مادەیەکی خاص لە موعاهەدە. (لە پێش جوابدانما جەنابی مەندوبی سامی فەرموی: بەعزێ مەحافیل وا ظەن ئەکەن کە ئێمە تەشویقی بەعزێ کەس ئەکەین و ئەگەر کەسێکی وا ببێ و بێتە دارەل ئیعتیماد و لە دواییدا لە خۆیەوە قسەیەکی وای کرد بێ، رەدی ئەکەینەوە. ئێمە لەگەڵ حکومەتی عیراق یەکین). بەندە لەسەر ئەم فەرمودەیەی ئەڵێم ئەبێ فەخامەت پەناه و جەعفەر پاشا چاک بزانن بەندە کوردم، هەمو کوردێکیش وەکو من تابیعی هیچ تەئثیرێ نیە. میللەتی کورد بە سائیقی ویجدانی قسەو ئیددیعای حقوقی ئەکات. بەڵێ زۆر دەفعە بەعزێ کەس و بەعزێ لە گەورەکان کە ئێستا لە مەواقیعی گەورەدان، تەئەددوب ئەکەم لەم مەجلیسەدا ناویان بێنم روبەرو بە منیان ئەگوت ئێوە بە پەنجەی ئەجنەبی ئەم تەلەبە ئەکەن".

مەندوبی سامی پرسی: "ئەجنەبی کێیە؟".

"ئەجنەبی یەعنی ئێوە: ئینگلیز! وە دەلیلم ئەوەیە کە پار ساڵ ئەم جەمال بابانە کە دانیشتوە و کە وەزیرە بە مەضبەطە داوای حقوقی میللی کردبو دیسان بەم تەرحە ئیهتیمامیان ئەکرد. بێینەوە سەر حقوقمان. جەنابی فەخامەتمەئاب وەکیلی مەندوبی سامی چاک ئەیزانێ کە حکومەتی بەریطانیا بە شەرەفی خۆی تەعەهودی کرد بو کە موقەڕەراتی عیصبەتول ئومەم تەتبیق بکات ئێستا هەمو کوردێک مونتەظیرو ئەمینە کە حکومەتی بەریطانیا تەعەهودی خۆی دێنێتە جێ. زۆر ئارەزو ئەکرا کە جەعفەر پاشا لەباتی ئەو کاغەزەی لە جانتاکەی دەری ئەهێنێ، موقەڕەراتی عیصبەتول ئومەمی لەگەڵ خۆی بهێنایە و عەلەنەن بیخوێندایەوە کە هەمو کەس تێی بگەیشتایە. مەعە مافیهی بەندە بە نەزەرێکی حقوقی خوێندومەتەوە، جەمال بابان و جەعفەر پاشایش چاک ئەیزانن کە من حقوقیم (لەسەر ئەمە جەعفەر پاشا و مەندوبی سامی و موفەتیشی ئیداری دەستیان کرد بە سرکە سرک و موفەتیشی ئیداری چوە دەرەوە) موقەڕەراتی عیصبەتول ئومەم چیە؟

1. ئەبێ مەئمورەکانی کوردستان لە عونصوری کوردی بن.

2. لوغەتی کوردی ڕەسمی بێ".

لەم ئەثنایەدا موفەتیشی ئیداری گەرایەوە و لەنـاو فایلێکیـا موقـەڕەراتی عیصـبەتول ئومـەمی تەسـلیمی مەندوبی سامی کرد، ئەویش فەرموی ئەمە موقەڕەراتی عیصبەتول ئومەم.

مولاحەظە: لەپێش ئەمەدا جەعفەر پاشا موصیرڕەن ئـەیگوت نـاڵێ مـەئمورەکانی کـورد لـە عونصـوری کورد بن، ئەڵێ هەر کوردی بزانن.

مەندوبی سامی خوێندیەوە و تەرجومە کرا و مەعلوم بو کە مادەکـە ئـەڵێ مـەئمورەکان لـە عونصـوری کورد بن.

لەسەر ئەوە ئەحمەد ئەفەندی هەڵسا فەرموی: "ئەمە تەئویل و تەفسیر قوبوڵ ناکات، چونکە صـەریحەو مەعلومە".

لەو وەقتەدا جەعفەر پاشا نەختێک شڵەژا و مەوزوعیان گۆڕی، فەقەت جیـاوک دەوامـی کـرد گـوتی بـە مەندوبی سامی: "وا ئەزانم فەقەرەی ئەخیری قەراری عیصبەتول ئومەم ئەڵێ: [ئەگـەر تەبـدیلێک لـە حکومـەتی عیراقا بو بێ حوکمێکی زاتی بە گوێرەی رەغائیبیان بدرێ بە کوردەکان].

مەندوبی سامی فەرموی: "دوێنێ ئەم قسەیەم لە کەرکوکیش بیست. مادەیەکی وا نیە".

جیاوک جوابی دایەوە: "لە نیهایەتی لائیحەی هەیئەتی عیصبەتول ئومەم لە سەتری ئەخیریا ئەم مادەیـە مەوجودە. بەندە تەدقیقم کردوە و مەنزوری عالیشت بوە".

مەندوبی سامی: "بەڵێ! ئەم لائیحەیە لە تەرەف عیصبەتول ئومەمەوە تەصدیق کراوە و بڵاوکراوەتـەوە، شکڵی قەراری وەرگرتوە".

لە دوای ئەمانە جیاوک هاتەوە سەر ئەصڵی مەوزوع گوتی: "وەکو عەرزم کـردن بەیاناتەکـەی جەعفـەر پاشا دو شتی تیایە: 1- ئیتیحادی کورد و عەرەب. جەعفەر پاشا چاکی ئەزانێ ئێمە لەگەڵ عەرەبا مومکین نیە بە صورەتی تەوحید- جیـاوک پەنجـەکانی خسـتە نـاو یـەکتر و گـوتی بـەم صـورەتە - بـژین. فەقـەت بـە صورەتێکی- ئەمجارە پەنجەکانی جوت کرد گوتی- قابیلە بەم نەوعە وەکـو ئاوسـتریا و مەجەرسـتان بـژین. هەمو کەسێک ئەمەی ئیدراک کردوەو میللەت لە حاڵی ئینتیباه دایە. لـەپاش ئەمـە جەریـدەکانی بەغـداد هـاوار ئەکەن ئێمە عەرەبین و حکومەتمان عەرەبە، ئەبێ کوردەکان وەکو ئەرمەنیەکان لێ بکـەین. ئیتـر مـومکین نیـە پێکەوە بژین".

لەسەر ئەمە جەعفەر پاشا بە تەهەورەوە گوتی: "من قسەت نادەمێ و حەقت نیە نـاوی عـەرەب بێنـی!".

جیاوک: "پاشا من قسەم لە مەندوبی سامی سەندوە. بەندەیش بە قەدەر تۆ عەرەبەکان تەقدیس ئەکەم. فەقـەت کوردم و کورد حەقی خۆی ئەوێ. وا دیارە ئـەم جەرائیدانـە بـە رەزای حکومـەت ئەنوسـن وە ئـیللا ئەبوایـە تەعتیل بکرانایە. بێینەوە سەر مادەی دوەم، تەناقوزێکی زاهیریی لەو قسەیەی جەعفەر پاشادا هەیە، چونکە لـە جێهەتێکەوە ئەڵێ بۆ ئەم حقوقە موغایری ئوصـولە، مادەیـەک داخڵـی موعاهـەدەکـە بکـرێ. بەنـدە ئـەڵێم بـە نەزەرێکی حقوقی مومکینە مادەیەک داخڵی معاهەدەکە بکرێت کە ئـەو مادەیـە بـە قـانونێکی خـاص حقـوقی کوردەکان تەئمین بکات. لەمەدا مانیع چیە؟ خولاصە هەمو کوردێک مونتەزیری تەتبیقی موقەڕەراتی عیصبەتول ئومەمە".

بەم نەوعە خیتامی بەیاناتی جیاوک هات، حازرون بە عومـومی بـێ ئیستیسـنا، فـەرمودەی جیاوکیـان تەئید کردەوە و مەجلیسەکە دوایی هات و بڵاوبونەوە.

(ژیان، ژ 257، 14 ی 8 ی 1930)

### 2. 4. 26. زینەلعابدین مەحمود، خەڵکی هەولێر

هەندێ کەس لایان وایە ئەهالیی هەولێر داوای مەسەلەی کورد ئەکەن، بەڵام راستیەکەی ئەوەیە خۆیان بە بەشێ لە مەسەلەی کورد دانانێن، چونکە دڵنیان لە ئەنجامی ئەم جوڵانەوەیەی کارەساتی بەدوادا دێ و نمونەیەکە بۆ قسە بە ناوبانگەکەی: "فرق تسد". (الجهاد، ع 266، 8 ی 8 ی 1930)

### 2. 4. 27. تەشریف هێنانی فەخامەتی مەندوبی سامی و رەئیسەلوزەرای عیراق

موافیقی تەلغرافێ کە رەسمەن بۆ مەقامی موتەسەڕیفی هاتوە، رۆژی 9 ی 8 ی 1930 کە تەصادوفی ئەم شەممەیە ئەکات، فەخامەتی مەندوبی سامی و رەئیسەل وزەرای عیراق تەشریف ئەهێننە سلێمانی.
ژیان، ژ256، 7ی ئاغستۆسی 1930

### 2. 4. 28. بەیاننامە

ئەی میللەتی کورد!

بە دیققەتەوە گوێ بگرن، ویجدانی میللی، رۆحی پێشینان و پاشینان خیتابتان ئەگاتێ. داوای تێکۆشین و تێهەڵچونتان لێ ئەکات.

ئەی کورد!

لە عەصری میللەت و ئازادیەدا، لەم عەصری نورو سەربەستیەدا تەنها هەر کوردی بێ چارە نەلیل و بێ بەش ماوەتەوە، وەتەنی کورد وەک ماڵی مناڵی نابالق بەسەر بێگانەدا دابەش کراوە.

مەعلومی هاوخوێنە خۆشەویستەکانمانە لەم چەندانەدا موعاهەدەیەک لە بەینی حکومەتی بەریطانیا و عیراق دا بەستراوە، هەرچەندە موافیقی موقەرەراتی عیصبەتول ئومەم و سائیری وعودی بەینەلدوەلی ئەبوایە مەسئەلەی کوردستان بخرایەتە ئەوەل بەندی ئەم موعاهەدەیە، فەقەت بە کەماڵی تەئەسسوف و تەعەجوبیەوە ئەبینین کە ئەمە هاتوە کە لەو حاڵەدا لازمە عیصبەتول ئومەم لە خسوس کوردەکانەوە، حەرفییەن تەتبیق بکرێ.

بینائەن عەلەیهی ئێمە بە پشتیوانی ئێوە هەتا ئێستا بە وەسائیلی موختەلیفە بۆ موحافەزەی حقوقی کورد لە جوهد و موراجەعەت غافڵ نەبوین، هەتا ئاخر نەفەس دەوام ئەکەین. هەدەف و غایەی تەشکیلی حکومەتێکی کوردیە لەژێر نەظارەتی عیصبەتول ئومەم دا. بۆ مەشروعیەتی ئەم تەلەبە، دو دەلیلی غەیرە قابیلی رەدمان بە دەستەوەیە:

1. قەراری عیصبەتول ئومەم صەراحەتەن ئەڵێ: وەقتێ کە ئینتیداب نیهایەتی هات، ئەبێ بۆ کوردەکان موافیقی رەغائیبی خۆیان حکومەتێکیان بۆ تەشکیل بکرێ.

2. بەیانێکی رەسمیی موشتەرەک کە لە رۆژی 24 ی کانون ئەوەلی 1922 دا لە تەرەف حکومەتی بەریطانیا و عیراقەوە نەشر کراوە، ئەم بەیانە بەر وەجهی ئاتیە:

حکومەتی صاحێب جەلالەتی بەریطانیا و حکومەتی عیراق ئیعتیراف ئەکەن بە حقوقی ئەو کوردانەی لە داخلی حدودی عیراقا ساکنن، بۆ تەشکیلی حکومەتێکی کوردییە لە داخلی ئەو حدودەدا و حکومەتی بەریطانیا و عیراق ئومێدیان هەیە کە عەناصیری موختەلیفەی کورد لە بەینی خۆیاندا رێ ئەکەون بۆ خسوس حدود و شکڵی ئەو حکومەتە کوردییە، بۆ ناردنی موفاویضینی مەسئول بۆ بەغداد کە موزاکەرە بکەن لەبابەت موناسەباتی ئیقتیصادیە و سیاسیەیانەوە لەگەڵ حکومەتی ئینگلتەرەو عیراق دا.

ئەی میللەتی نەجیب!

پاش ئەم تەفصیلاتە ئیخبارتان ئەکەین کە ڕۆژی یەکشەممە 10 ی ئاغوستوسی 1930 مەندوبی سامی و ڕەئیسەل وزەرای عیراق، بۆ موزاکەرە کردنی ئەم مەسئەلەیە دێن بۆ سلێمانی. قەناعەتی تاممان هەیە کە هەمو کوردەواری یەک دڵو یەک زبان، لە تەلەب کردنی ئەم حەقە مەشروعەدا پشتیوانمانن.

ئەی کورد!

تاریخ لاپەڕەکانی کردۆتەوە حەرەکاتمان تەسجیل ئەکات، موحافەزەی شەرەفی رابوردو و ناموسی ئایندەمان بە دەست نەسلی حازرەیەوە. ئێوەش خۆتان و غیرەتتان.

عەزمی بابان. عەبدولقادر حەفیدزادە. حەمە ئاغا عەبدورەحمان ئاغا. عیززەت عوسمان پاشا. حەمە صالح محەممەد عەلی بەگ. شێخ محەممەد گوڵانی. عەبدورەحمان ئەحمەد پاشا. فائیق بابان. تۆفیق قەزاز. ڕەمزی حاجی فەتاح.

## 2. 4. 29. سەردانی وەفدی وەزاری بۆ سلێمانی

لە دوای تەواو بونی موناقەشە و موجاهەدەی هەولێر، فەخامەتی مەندوب و ڕەئیسەل وزەراو هەیئەتەکە ڕوەو سلێمانی تەشریفیان هێنا. 10 ی 8 ی 1930 لە سەعات 3 ی کوردیدا کە میعادی هاتنیان بو، عومومی ڕوئەسای دەوائیر و مەئموران و عولەما و سادات و ئەشراف و ڕوئەسای عەشائیر کە بیلعموم لە سلێمانیدا حازر بون. چون بە پیریەوە. لە جادەی دەباخانە لەو ڕەشماڵانەدا کە بەلەدیە هەڵیدابو دانیشتن، غەیری ئەمانیش تاقمێک عەسکەری جەیش دور لە ئەهالیەکەوە وەستا بون. کەششافەی مەکتەب، قوتابی مەکتەبەکان، بیلعموم ئەهالی شار هەمو طەبەقەیەکی حازر بو بو. دوکان و بازاڕ چۆڵ کرا و قیسمی ژنانیش لە دەباخانەوە هەتا قاپی سەرای حکومەت کۆمەڵ کۆمەڵ وەستا بون. فەخامەتی مەندوبی سامی و هەیئەتەکە لە سەعات دوی عەرەبیدا مواصەلەتی چەمچەماڵ ئەکەن و لەوێش هەمو ئەهالی و ڕوئەسای عەشیرەتی هەمەوەند لەسەر جادە وەستا بون. کە تەشریفیان گەیشتە ئەوێ، هەمو بە دەنگی بەرز هاواریان کرد و داوای حقوقی کوردایەتیان کرد بو. لە دوای 30 دەقیقە ئیسراحەت لە چەمچەماڵەوە حەرەکەتیان کرد، زاتەن سەعادەتی موتەسەڕیف و موفەتیشی پۆلیس و مودیری پۆلیس بە ئۆتۆمۆبیل لە بەیانیەوە بەرەو پیریان ڕۆیشت بون. لە سەعات چوارونیوی کوردیدا گەیشتنە سەرجادەی دەباخانە. لە دوای ئەوەی لەلایەنی عەسکەرەکەوە بە سەلام بەخێرهاتنیان کرا، هاتە بەردەمی ئەو عەشاماتە زۆرەوە کە بێ حەددو حساب راوەستا بون، کە لە ئۆتۆمۆبیلەکە دابەزین بە کەرەتی دەست کرا بە چەپڵەرێزان و هەر بژی کورد و کوردستان و بە کەرەتێک هاوار ئەکرا کە بە قەطعی تەشکیلی حکومەتی کوردیمان ئەوێ. لەو وەقتەدا قوتابیەکی مەکتەب بە جلی کەششافەوە هاتە بەردەمیان و خیتاب بە مەندوبی سامی نوتقێکی ئینگلیزی خوێندەوە کە لە خوارەوە دەرج کرا و نوقتەکە بە چەپڵە لێدان و هەر بژی حکومەتی بەریطانیاو کوردستان و هەر بژی فەخامەتی مەندوبی سامی موقابەلە کرا. لە دوای ئەمانە بە ئۆتۆمۆبیل هاتنە ناو شارەوە. لە ڕێگا لە هەمو نوقتەیەک دا، ژنەکان لە کۆڵان و سەربانەوە هاواریان ئەکرد: هەر بژی کورد و کوردستان و حکومەتی کوردیمان ئەوێ.

وەکیلی فەخامەتی مەندوبی سامی تەشریفی بردە ماڵی موفەتیشی ئیداری و وەکیلی ڕەئیسەل وزەرا و وەزیری داخلیە لە ماڵی موتەسەڕیف و، وەزیری عەدلیە لە ماڵی بابان عەزمی بەگ میوان بون.

ئەو قەڵەباڵغیە هەتاکو ئێوارێ لەبەر دەرکی سەرا و جادەکانا مایەوە و، موتەمادی هاواریان ئەکرد: حقوقی موقەددەسی خۆمان ئەوێ. ئەو ڕۆژە وا دەوامی کرد. هەر شەو تەرتیبات کرا بۆ موزاکەرە. تەذکەرە نوسرا بە شوێن ئەشراف و ڕوئەسای عەشائیردا. سبەینێ سەعات دوی کوردی هەمو لایەک لە مەقامی

موتەسەڕیف دا کۆبونەوە. دیسان بازاڕ داخرا و ئەهالی روی کردە بەردەمی سەرای حکومەتی. تەلەبەی مەکتەب و هەمو ئەهالی لە حاڵێکی مونتەظەم دا وەستا بون کە فەخامەتی مەندوبی سامی و هەیئەتەکە تەشریفیان هێنایە سەرا لە بەردەمی تەلخانەدا بە کەرەتێک چونە بەردەمی ئۆتۆمۆبیلەکەیەوە و بە کەرەتێ هاواریان ئەکرد: حقوقی میللیەمان ئەوێ و ئەبێ حکومەتی فەخیمەی بەریطانیا بۆمان تەئمین بکات.

حاصڵی بەم نەوعە داخڵی سەرا بون و چونە مەقامی موتەسەڕیفی و لەوێدا هەمو لایەک کۆبونەوە. ئەوەڵ جار لە تەرەف رەئیسەل وزەراوە ئەو بەیانەی کە لە پێشا لە جەریدەکانا نەشر کرابو خوێنرایەوە. لە دوای ئەو فەخامەتی مەندوبی سامییش هەڵسا ئەو بەیانەی کە لە کەرکوک و هەولێر دابویان، عەینەن خوێندیەوە.

لە خیتامی ئەمانەدا، جەنابی حەمە ئاغای عەبدورەحمان ئاغا هەڵسا و فەرموی: "جەماعەتی حازرە کە تەمسیلی هەمو ئەشراف، سادات، عولەما، عەشائیری لیوای سلێمانی و قسمێک لە لیوای کەرکوک ئەکات، بە عومومی رەمزی ئەفەندییان تەوکیل کردوە کە جوابی بەیاناتی فەخامەتی مەندوبی سامی و رەئیسەل وزەرا بداتەوە و تەلەبی حقوقی میللیەمان بکات".

لەدوای ئەمە رەمزی ئەفەندی هەڵسا و گوتی:

"فەخامەتمەئاب!

بەناوی عومومی روئەسای عەشائیر و ئەشرافی کوردەوە عەرزی بەخێرهاتنتان ئەکەم. میللەتی کورد تەشریف هێنانتان بۆ حەیاتی حورپیەت و موستەقبەلەی خۆیان بە فەئلێکی خێر عەدد ئەکات. بەیاناتی رەئسەل وزەرا و مەندوبی سامی کوللیەن موخالیفی موقەڕەراتی عیصبەتول ئومەم و ئیعترافاتی فەخیمەی بەریطانیا و عیراقە. لە پێش هەمو شتێک دا ئەبێ اطاعەی حقوقی موقەددەسە و ئیستیقلالی کوردان ببێ بە سەبەبی ئیتیحادی عونصوری کورد و عەرەب.

لای فەخامەتمەئابتان مەعلومە کە کوردەکانی کوردستانی جنوبی لە ئەثنای حەربی عومومیەوە تا ئەمڕۆ، بۆ تەئمینتی حورپیەت و ئیستیقلالی خۆیان لە سەعی دوانەکەوتون و بۆ ئەم غایە موقەددەسە دائیمەن ئیلتیجایان بە موعاوەنەتی موشفیقەی حکومەتی فەخیمەی ئینگلیز کردوە، مەعەل ئەسەف تا ئەمڕۆ نائیلی ئامالیان نەبون گەرچی لەم خسوسەوە گەلێ مەواعیدیشیان دراو، بە عیصبەتول ئومەمەمیش ئەم مەواعیدانە تەئید کرا، لاکین تا ئەمڕۆ هیچیان بۆ تەتبیق نەکرا.

مەعلەمی فەخامەتتانە ئەوەڵ موعاهەدەی حکومەتی عیراق و ئینگلیز لە تاریخی 10 ی تشرینی ئەوەلی 1922 دا تەصدیق کراوە، لەپاش 74 رۆژ لە تاریخی 24 ی کانونی ئەوەلی 1922 بۆ تەشکیلی حکومەتی کوردیە لە بەینی حکومەتی فەخیمەی بەریطانیا و عیراق دا، ئەم بەیانە نەشر و ئیعلان کرا بو. مادامێکە ئەصڵ عیصبەتول ئومەم ئینتیدابی عیراقی داوە بە ئینگلیز و لە قەراری ئەم ئینتیدابەدا گوتویەتی هەچ وەقتێک عیراق صالح بێ ئیستیقلالی ئەدرێتێ، لەهەمان کاتیش دا پێویستە حکومەتێکیش بۆ کوردەکان تەشکیل بکرێ. حقوقەن وا لازم بو کە لە پێش تەنظیمی موعاهەدەی تازەی ئینگلیز و عیراق دا کە تەئیدی قەراری عیصبەتول ئومەم و ئیستیقلالی حکومەتی عیراق ئەکات، حکومەتێکیش بۆ کورد بە صەراحەت بخرایە مەتنی ئەم موعاهەدە تازەیەوە. لەمەش دا ضەربە لە حکومەتی کوردەکان درا.

لای فەخامەتتان مەعلومە کە حکومەتی عیراق کوردەکانی بە قوەتی تۆپ و تفەنگ ئیستیلا نەکردوە، لە عەقەبی موتارەکەدا کوردەکان بەو شەرطە خۆیان خستە حەلقەی رابیطەی ئینگلیز کە حکومەتێکی کوردییەی موستەقیلمان بۆ تەشکیل بکرێ و لەسەر ئەمە ئیتیفاق واقیع بوە کەوا لازمە چۆن عەرەبەکان لە قەراری عیصبەتول ئومەم موستەفید کراون، کوردەکانیش موستەفید بکرێن کە تەلەبی هەمو کوردەکان: تەشکیلی حکومەتێکی کوردییە لەژێر ئینتیدابی حکومەتی فەخیمەدا".

ڕەئیسەل وزەرا: "من لەو بەیاناتە زیاتر کە لە پێشا بـۆم خوێندنـەوە، صـەلاحیەتم نیـە بـە صـورەتی ڕەسمیی گفتوگۆیەک بکەم. وا فەخامەتی مەندوب قسەتان لەگەڵ ئەکات".

لەسەر ئەمە فەخامەتی مەندوبی سامی هەڵسا و ئەم بەیانەی دا:

"لە خوتبەی ڕەمزی ئەفەندیدا دو نوقتەی موهیم هەیە:

1. بەیانی 1922 و،

2. موقەڕەراتی عیصبەتول ئومەم.

بەیانی 1922 هەروەک ڕەئیس وزەرا وتی وەختی خۆی لەلایەن حکومـەتی بـەریطانیا جـواب دراوە، لەم کاتەدا حەز ناکەم لەسەر ئەم مەوزوعە موناقەشە بکەم. دوەم، موقەڕەراتی عیصـبەتول ئومـەم. بـەلای منـەوە تەوصیاتی عیصبەتول ئومەم تەتبیق کراوە و من موتەئەسیفم ئەگەر ئەم تەوصیاتە شکێنرابێ، فەقەت تەقـدیری تەنفیذ و عەدەم تەنفیذی ئەم موقەڕەراتە بە دەست عیصبەتول ئومەم خۆیەتی. حکومـەتی بـەریطانیا و عیـراق هەردولا هەوڵ ئەدەن بۆ تەنفیذی موقەڕەراتی عیصبەتول ئومەم. عیصبەتول ئومەم ئەگەر بینـی موقەڕەراتەکـەی تەتبیق نەکراوە موداخەلە ئەکات". وە گـوتی: "بـەعزێ کـەس موراجەعـەتیان کـردوە بـە عیصـبەتول ئومـەم و جوابیان وەرگرتۆتەوە کە بە تەوەسوطی حکومەتی مونتەدەبـەوە ئـەبێ موراجەعـەت بکـرێ، ئێسـتاکە عـەینی موراجەعەت بە من کراوە. من لەم خسوسەوە موفەصەلەن لەگەڵ حکومەتی عیراق دا موزاکەرە ئەکەم. لەم قسانە کەس وا تێ نەگات کە مەقسەدی من مانیع هێنانە پێشە بۆ موراجـەعاتی خـەڵقی. هـەمو کـەس سەربەسـتە لـە موراجەعەت کردن. فەقەت لازمە مەتالیب و تەصریح بە تەفصـیل بـەیان بکـرێ. تەشـکیلی حکومـەتێک لێـرەدا موشیکلە... ئایا قابیلە کوردستان ئەم حکومەتە بتوانێ ڕابگـرێ؟ ئـەمـەوێ بـزانم ڕەمـزی ئەفەنـدی تەمسـیلی سائیری کوردستان ئەکات یا هەر سلێمانی؟".

ڕەمزی ئەفەندی: "مەزبەتەی هەولێر مەعلومتانە. زاتەن لەوێ بە خۆشتانیان وتـوە کـە ڕەئیمـان لەگەڵ خەڵقی سلێمانیە. قیسمێک لە عەشائیری کەرکوک وا لەم مەجلیسەدا حازرن. ئەوانیش هەر لەگەڵ ئێمەدان و مەضـبەطەی عومـومی عەشـائیری کـەرکوک تەقـدیم ئەکـەم و مومـەثیلی هـەولێریش لێـرەدا حازرە".

مەندوب: "چوینە هەولێر و کەرکوک. لەوێش مومەثیلی کوردان کۆبونەوە عەینی موناقەشە کـرا. فەقـەت کەس ئیظهاری جیابونەوەی نەکرد، تەنیا سلێمانی تەلەبی ئیفتیراق ئەکات".

ڕەمزی ئەفەندی جوابەکەی سەرەوەی تیکرار کردەوە و، وتی: "ئەم دو لیوایە لەژێر تەضییق و تـەئثیرا بون، لەبەرئەوە حسیاتی حەقیقیەی خۆیان ئیظهار نەکردوە، ئەمر بفەرمو بێنە ئێرە ئەوسا مەعلومتان ئەبێ کـە ئەمە تەئکید ئەکەنەوە و، کوردستان هەموی لەهەمان فیکردایە و یەک هەدەف تەعقیب ئەکات کـە سـەربەخۆیی کوردستانە".

مەندوبی سامی: "کەوا بو لازمە هەمو لایەک مەتالیبی خۆیان بە صەراحەت و بە تەفصیل بۆ عیصبەتول ئومەم بەیان بکەن. کوردەکان چ جۆرە حکومەتێکیان ئەوێ، مەلەکی یا جمهـوری؟ پارلـەمان، ڕەئیسـی وزەرا و مەجلیسی وزەرایان ئەبێ یا نە؟ ئایا فیکریان بەرامبەر بە مـەلیک فەیسـەڵ گۆڕیـوە یـان نـە؟ ئایـا ئەیانـەوێ هـەرجۆرە... حکومـەتی و گـومرگ و مـەکوس، ئیشـغالی عامـە، پـۆلیس، صـیحە و عەسـکەریان ببێـت؟ ئایـا موناسەبات و عەلائیقی حکومەتەکە وا تەشکیل ئەکرێت چی ئەبێ لەگەڵ بەریطانیا؟".

ڕەمزی ئەفەندی، خیتاب بە مەندوبی سامی گوتی: "فەخامەتتان فەرموتان کە بـەیانی 1922 ڕابـورد و کۆنە. حەق کۆن ئەبێ نامرێ. ئەم بەیانە کافیلی حقوقی موقوددەسـەی ئیسـتیقلالی قەومێکـە تەلـەبی تـەتبیقی ئەکەین". بەسە. بەسە. بەسە!

حەمە ئاغا: "ئێمە کوردین و، کوردستان عیبارەت نیە هەر لە سلێمانی. لە زاخۆوە هەتا خانەقین کوردەوارێتیە و نایانەوێ لەگەڵ عیراق دا بژین، حکومەتێکی موستەقیللەی کوردیمان ئەوێ لەژێر ئینتیداب دا. ئەگەر ئینگلیزیش نامانداتێ، موراجەعەت بە عیصبەتول ئومەم ئەکەین".

خیتاب بە رەئیس وزەرا: فەخامەتتان زۆر چاک ئەیزانن کە حیسسیاتی میللیە بە نەوعێک چۆتە مێشکی عونصوری عەرەب و کوردەوە کە هیچ هێزێک نیە مەحوی بکاتەوە، بینائەن عەلەیهی ئیمکانی ژیانێکی موتەحید نیە لە نێوان عەرەب و کوردا، هیچیان ئیستیفادە لە یەکتر ناکەن. بۆ هەردولا وا چاکە کوردستانێک لەژێر ئینتیدابی عیصبەتول ئومەم بێ، چونکە ئەم ئینتیدابە بە نەوعێ عەرەبەکان ئیستیفادەیان لێ کرد کە لە ماوەی 10 ساڵدا ئەوەتا ئیستیغنا لە حکومەتی ئینگلتەرە ئەکەن".

خیتاب بە مەندوبی سامی: "ئەم دەنگی کوردایەتیە تەنها، وەکو جەنابتان ئەفەرمون، مەخسوسی دۆڵی سلێمانی نیە. هەولێر و کەرکوک لەژێر تەضیقی مەئمورینی عەرەبدان. ئەگەر بانگ بکرێنە ئێرە مەعلوم ئەبێ کە هەمو غایە یەکێکە".

رەئیس وزەرا: "تەشەکوری بەیانەکەتان ئەکەم. زۆر مەسرورم کە لە قیطعەیەکی عیراق دا ئەهالی لەسەر غایەیەکی وا ئیتیحادی کردوە. لە خسوسی بەیانی 1922 ەوە ئەمەوێ بە صورەتی خسوسیەوە قسە بکەم، چونکە ئەوی صەلاحیەتدار بم بڵێم عیبارەتە لەو بەیانەی کە لە پێشەوە عەرزم کردن. وەکو رەمزی ئەفەندی ئەڵێ موعاهەدەی عیراق و ئینگلیز هەرچەندە لە 1922 دا عەقد کراوە، فەقەت لە 1924 دا لە تەرەف مەجلیسی تەئسیسیەوە تەصدیق و حەقی قانونیی کەسب کردوە و لەو مەجلیسەدا مومەثیلینی کوردیش هەبو. زۆر چاک لەبیرتانە لەژێر ریاسەتی و ئەمارەتی شێخ مەحمودا ئیدارەیەکتان بۆ دامەزرا بو، لە پاشا ئەهالی کەوتە تەظەلوم و شکایەت لە شێخ مەحمود کە ئێستاش دڵی پێتان ئەسوتێ کە حکومەت مەجبور بو بە ناردنی ئۆردو. لە پاش 3 ساڵ حەرەکاتی عەسکەریە ئەوسا وەضعیەتی بۆ چاک کرا. ئەم بەیاناتەم بە صورەتی خسوسیە بۆ تەنویری ئێوەیە".

شێخ قادر: "شێخ مەحمود فەردێکی ئەم میللەتەیە. میللەتی کورد ئەبەن عەن جەد حورمەتی شێخ مەحمود و ساداتیان گرتوە. زوڵمی شێخ مەحمود بەقەدەر زوڵمی عیراق تەئثیری نەکردۆتە سەر ئێمە. رەئیس وزەرا طورێز ئەکات. ئێمە میللەتێکی سەربەخۆین لەژێر ئینتیداب دا، حکومەتێکی کوردیمان ئەوێ وەگەر ناژین".

رەمزی: "ئەم حەقە بە میللەتی کورد دراوە. ئەگەر شێخ مەحمود خەطای کردبێ، دیسانەوە میللەت قەباحەتی نیە. مەعلومی فەخامەتتانە خەطای کەسێک حقوقی میللەتێکی وا مەحو ناکاتەوە. شێخ مەحمود لەلایەن دوژمنانی کوردەوە ئیغفال کرا بو. مەسئەلەی شێخ مەحمود تەئثیری نەبو بۆ ئیمحای میللەتمان، بەلام ئێوە ئەتانەوێ بە کەرەتێک بمانکەن بە عەرەب".

عیززەت بەگ: "میللەتی کورد تەنها عیبارەت نیە لە سلێمانی. لە زاخۆوە تا خانەقین هەمو داوای ئەم حەقە ئەکات و هیچ کوردێک کەرەتێکی تر لەگەڵ عیراقا ناژی. بۆ ئیحقاقی حەقمان موراجەعەت بە حکومەتی مونتەدەبە ئەکەین. ئەگەر ئەویش نەپیرسی، شکایەت ئەبەینە بەر عیصبەتول ئومەم. کورد حکومەتێکی موستەقیللەی ئەوێ لەژێر ئینتیدابدا. بە هەمو هێزمانەوە بۆ ئەم غایەیە سەعی ئەکەین، ئەمجارە سیلاح و تفەنگمان قەڵەم و موراجەعاتە".

رەئیس وزەرا: "لام وایە عونصوری کورد لە عیراق دا، لە عونصوری عەرەب مەحتەرەمتر و مورەفەهترە. هەرچی مەشەققەت و ئەذیەتە بەسەر عەرەبەکانەوەیە. حقوقی کورد مەحفوظە، یەکێ بڵێ مەئمورێکی عەرەب ظوڵمی لە کورد کردبێ؟".

مەجید ئەفەندی حاجی ڕەسول ئاغا: "بەڵێ کورد دائیمەن مەعروضی ظوڵمی عەرەبەکان بوە. پار کە لـە بەینی عەرەبەکانی فەلەستین و سەهیۆنیەکان دا شەڕ بو، عەرەبی عیراق بە یەکجار کەوتنە تەعزیەوە. ئـەنواعی موراجەعات و موظاهەراتیان کرد، کەچی ئێستا هاوخوێن و براکانمان لە کوردستانی شیمالی لەلایەن تورکـەوە سەر ئەبڕرێن، غەزەتەکانی بەغدا بە ئاشکرا تەقدیری تورکەکان ئەکات و بەیانی شادمانی دەرئەکا و بـە تـۆپ و تفەنگ و مەترەلۆز تەهدیدی ئێمە ئەکات کە ئەڵێ لەگەڵ تورکا ئەتانپلیشێنینەوە و عەرەب هیچـی لـە تـورک کەمتر نیە. عەلاوەی ئەمەش، لە ڕۆژی تەشەکولی حکومەتی عیراقەوە هەتاکو ئێستا موتەعەدیـد موعـەللیمتان لـە ئەوروپا، ئینگلتەرە، سوریە و جێگاکانی ترەوە تەرتیب کردوە و، هەمو ساڵێک کۆمەڵێکی زۆر قوتابی عـەرەب کە بە ئیستیعداد و زیرەکی لە کوردەکان دونترن داخڵی بەعثەی عیلمییـان ئەکـەن، کـەچی قوتابیـە کوردەکـان لەسەر مەصرەفی خۆیان ئەچن بۆ بەغداد و غوربەت ئەکێشـن بـۆ ئـەوەی داخڵـی بەعثـە بکـرێن. بـەخۆرایی نومرەیان ئەشکێنن و دوایان ئەخەن. ئەمساڵ 50 قوتابی کورد کە دائیمەن لـەپێش عەرەبەکانـەوە بـون هـەر لەبەر ئەم سەبەبە دوایان خستن".

ڕەئیس وزەرا: "بۆچی ئێوە نازانن کە غەزەتەکانی بەغداد بەیانی و ئێواریَ چەند جنێو بـە حکومـەتی عیراق ئەدەن و چۆنمان تەنفید ئەکەن. کێ ئەڵێ غەزەتەکان بە تەشـویقی حکومـەت عەلـەیهی کـوردن؟ بـۆچی مەعلوم نیە غەزەتە چۆن و بە چ واسیتەیەکەوە شت ئەنوسێ؟ قوتابی وەرەقەی ئیمتیحانیان مـەوجودە و کـەس ناتوانێ خیلافی ئەوە بکات. لام وایە قوتابیەک بێ ئیستیحقاق تەرفیع بکات، نە بۆ خۆی و نە بۆ موجتەمەعی موجیبی ئیستیفادە نابێ".

مەجید ئەفەندی:"بەڵێ غەزەتەکانی بەغداد کە لە عەلەیهی حکومەت مەقالەیەکیان نوسی، گورج دایئەخـەن، بەڵام کە تەهدیدی کوردەکان بکات و لە عەلەیهی ئێمە بنوسن، تەشویقیان ئەکەن و پارەیان ئەدەنێ".

حەمە ئاغا:"هەمو ئـەیزانین کـە فەخامـەتی ڕەئـیس وزەرا شەخصـێکی نیشـتمانپەروەرە و بـۆ غایـەی وەتەنیە زۆر سەعی کردوە، بینائەن عەلەیهی، ئـەبێ تەقـدیری ئێمـەش بکـات و حـەقمان بـداتێ بـۆ حـەقێکی مەشروعی وەتەنی و میللی خۆمان تێ ئەکۆشین".

ڕەئیس وزەرا: "بەڵێ هەمو نەوعە حیسسیاتێکی وەتەنیە بـە ئیحتیرامـەوە قوبـوڵ ئەکـەم، فەقـەت لـەم مەسائیلانەدا ئێمە لازمە مەنطیقی و عەمەلی تێ فکرین، عەجەبا کوردسـتان وەکـو ئـەڵێن لـە خانەقینـەوە هـەتا زاخۆ جیابێتەوە بەبێ عیراق ئەژی؟ واریداتی کیفایەت ئەکات؟ بەرامبەر بە دراوسێکانی حدودی پێ موحافـەزە ئەکرێ و، خاصەتەن لە نوقتەی تیجارەتەوە لە عیراق زیاتر بەندەرێکی هەیە؟ بۆ ئوموری نافیعـەی کوردسـتان هەتاکو ئێستا عیراق بە لەکها روپیەی صەرف کردوە".

ڕەمزی ئەفەندی: "یەک دەفعە عەرزمان کردن کورد و عەرەب قابیل نیە پێکـەوە بـژین. ئێمـە ئـارین و ئـەوان سـامین، ئێمـە شـاخین و ئـەوان دەشـتەکین،حەتتا خـاکی کوردسـتان بـەرین بـۆ عەرەبسـتان و هـی عەرەبستان بهێنین بۆ کوردستان، هەردوکیان هێزی ئینباتیەیان ون ئەکەن".

ڕەئیس وزەرا: "ئەی توتنەکەتان بۆ کوێ ئەبەن؟".

ڕەمزی ئەفەندی: "ئەیبەین بۆ ئەوروپا. غـەیری ئێمـەش مـەجبورن تـوتنی ئێمـە بکـڕن، چونکـە لەمـە هەرزانترتان دەست ناکەوێ و، لە ئێمەش زیاتر لە بازرگانیدا لەم توتنە ئیستیفادە ئەکەن".

ڕەئیس وزەرا: "نەء نایبەن بۆ ئەوروپا هـەموی لـە عیراقـا صـەرف ئـەکرێ. کوردەکـان ئەلحەمـدولیلا بازرگانی زۆر وریایان تیایە و زۆر چاک تەقدیری ئەکەن کە کوردستان بێ عیراق ناژی".

ڕەمزی ئەفەندی: "لە بیدایەتی حەربی عومومیدا کە ڕێگاو بەندەرەکانی عیراق گیرا بو کـە بەغـدادیش ئیستیلا کرا، ئێمە لەگەڵ شیمال و شەرق و غـەرب دا مونتەظەمـەن تیجارەتمـان ئـەکرد. ثەروەتـی عومومیـە و

وەضعی ئیقتیصادیەمان لە ئەمڕۆ گەلێ باشتر بو. جەعفەر پاشا ئەفەرموێ کە بە لەک پارەمان بۆ ئومـوری نافیعەی کوردستان صەرف کردوە. ئەو ئوموری نافیعەیەی ئەوان ئەڵێن قەڵا و ئیستیحکاماتە بۆ موحافـەزەی جەیشەکەی خۆتان لەباتی ئەمە مەکتەبتان بۆ بینا بکردینایە. ئەگەر حکومـەتی کوردیـە تەشـکول بکـات هـیچ لزومان پێی نابێ و ئیستیغنای لێ ئەکەین".

رەئیس وزەرا، بە تەئەثور و هەیەجانەوە: "براکانم بزانن کە لـەم دەمـارەدا خـوێنی کوردیشـم تیایـە، وەلاکین من عارەبم، بۆ کەڵکی ئێوە قسە ئەکەم. بە حیسسیات حەرەکەت مەکەن. مـەبن بـە ئالـەت بـە دەسـت خەڵکەوە. بەزەییتان بە میللەتەکەدا بێتەوە و توشی نارەحەتیان مەکەن. ئەوا لە سەرەوە کوردەکـان بـێ ئـەرزە ئەکەن و سەریان ئەبڕن. لە دنیاوە ئاشکرایە کە کورد میللەتێکی دینداره. لە بیرتان نەچێ کە دینتان عەرەبیـە. قورئان عەرەبیە. محەممەد عەرەبە. وە فەیسەڵ کوڕی محەممەدە. براکانم تکاتان لـێ ئەکـەم فاجیعـەی کەربـەلا دوبارە مەکەنەوە".

شێخ قادر: "جەعفەر پاشا بە بەیان کردنی فاجیعەی کەربەلا هەڕەشەمان لێ ئەکات. ئەبێ بزانـێ ئەگـەر ئینگلیز لەبەینا نەبێ عەرەب ناتوانێ بێتە خاکمانەوە".

جەعفەر پاشا: "رجا ئەکەم سوئی تەفاهوم پەیدا نەبێ. مەبەستم هەڕەشە نیە. رەمزی ئەفەندی زۆر جار داوای قسەکردنی کرد، مەیـدانی نـەدرا. نیهایـەت بـە حیدەتـەوە هاتـە پێشـەوە گـوتی: "پاشـا! دیـن، ئیمـان، مەفکورەی میللی، حکومەتێکی میللی کوردی ئەوێ. جەماعەت وانیە!".

هەمو بە جارێک: "بەڵێ وایە!".

رەمزی ئەفەندی دەوامی کرد: "پاشا! ئەم قسانەت ناچێتە جەواڵی کوردەوە. ئەمـە هـەموی ئیغفالاتـە و بیخەرەوە جەواڵەکەی خۆتەوە و دەرگای بەبەستەرەوە".

جەعفەر پاشا: "قسەکەت وەرگـرەوە. تـۆ پیـاوێکی دنیادیـدەیت، لـە کۆبونەوەیـەکی وادا نـابێ قسـەی ناشیرین بکرێ".

رەمزی ئەفەندی: "تۆ قسەم نادەیتێ. لە سوئالەکانم گوریز ئەکەی. بەڵێ تەسـلیم بـوم". میـرزا تۆفیـق: "ئێستاکە دیانەت بابەتی باس کردن نیە. مەسەلە میللەتە و دامەزراندنی حکومەتێکی کوردیە. ئەگەر بە دین بێ ئەبێ ئێرانیش واز لە میللەتی خۆی بهێنێ و داخڵی حکومەتی عیراق ببێ. داوای لێ بوردنت لێ ئەکەم باسـەکە مەگۆڕە!".

جەعفەر پاشا: "قیاس مەعەل فاریق کردن زۆر بێ مەنطیقیـە. ئێرانیـەکان دو هـەزار سـاڵ زیـاترە کـە دامەزراوە".

میرزا تۆفیق: "ئەگەر لەبەر دین لازمە ئێمە تابیعی ئێوە بین لـە هـەمو عالـەم ئاشـکرایە کـە کـورد زۆر دیندارە. بینائەن عەلەیهی، پێویستە عەرەب لەژێر ئیدارەی ئێمەدا بێ".

رەمزی ئەفەندی: "یەکەم قسەم هەیـە. خەلافـەتی عەبباسـیە لـە کۆتـایی سـەڵتەنەتیدا دەسـتی کـرد بـە بەکارهێنانی کاربەدەستانی تورک، فارس و کـورد. ئەمـە بـو بـە یـەکێ سـەبەبی ئیضـمحلالیان. حـەز ئەکـەم حکومەتی عیراق ئەم تاقی کردنەوەیە دوبارە نەکاتەوە و کاربەدەسـتانی کـورد لـەناو خۆیانـا بەکارنـەهێنێت، چونکە ئەبێ بە سەبەبی ئینحیطاطی. هەروەها بەکارهێنانی کاربەدەستی عەرەبیش لە کوردستانا ئەبێ بە هۆی لەناو چونەوەی کوردەکان".

رەئیس وزەرا: "سوپاسی پەند و ئامۆژگاریەکانت ئەکەم کە لە پێش رودانی ئاگادارتان کردین".

لە پاش ئەوە رەئیس وزەرا کە بینی باس کردن لەم باسەوە سودێک نابەخشێ، میللەت یەک ئـاواز بـۆ داواکاریەکانی خۆی دوپات ئەکاتەوە. پێویست نەبینرا بە درێژ کردنەوەی باس و کۆبونەوەکە بەتاڵ بوەوە.

لە ناوەراستی کۆبونەوەکەدا سالار مستەفا جەعفەر سوڵتان هەڵسا و بە ناوی سادات، عولەما، شێخان و بە ناوی ئەو هۆزانەی سنور کە لەناو عیراق دان، تەئیدی داواکارانی کوردی کرد بۆ تەشکیلی حکومەتێکی کوردی و لە هەمان بابەتەوە مەضبەطەیەکی مۆرکراوی پێشکەش بە نوێنەر کرد. لە کۆتایی کۆبونەوەکەشەوە لەلایەن فەتاح ئاغای حەمە رەضای سەرۆکی هەمەوەندەوە کە لە شاری کەرکوک دائەنیشن، لە هەمان مەئال مەضبەطەیەکی تری پێشکەش بە مەندوبی سامی کرد. هۆزی جاف کە ئێستاکە سەر بە کەرکوکن، لەم کۆبونەوەیەدا لەلایەن جەنابی کەریم بەگی فەتاح بەگەوە تەمسیل کرا بون. (ژیان، ژ 257، 14 ی 8 ی 1930)

**2. 4. 30. بەیاناتی فەخامەتی رەئیسەلوزەرا لە سلێمانی**

بەیاناتی فەخامەتی رەئیس وزەرا لە سلێمانی لە وەقتی ئیجتیماعەکە خوێنرایەوە

"موشەررەف ئەبم بەیانی ئیزاح کردنی ئەو سیاسەتی خۆشەویستیە کە حکومەتی عیراق خەریکە ئیتیباعی بکات، بە نەزەر ئەو وەعدانەی کە بە کوردەکانی هاوڵاتمان و براکانمان دراوە. ئەو کوردانە کە عضوێکی موهیمن لە جیسمی مەملەکەتی عیراق دا. ئاگاداری ئەو تەلغوراف ئیستیدعایانە بوم کە لەلایەن هەندێ ئەشخاص بە ئیحتیجاج لەبەر ناو نەبردنی مەسئەلەی کورد لە ناو موعاهەدەکەی ئاخریدا تەقدیم کرا بو. بە صەرفی نەزەر لە بەحس کردن لەو ئەسباب و عەوامیلە کە سەبەبیەتیدا بە تەقدیم کردنی ئەو ئیحتیجاجاتانە، من بۆتان تەصریح دەکەم کە حکومەتی عیراق بە صورەتێکی ئەکیدە قەراری داوە کە بە نەزەری ئیعتیبار تەماشای ئەو وەعدانە بکات کە بۆ تەئمینی ئارەزوی برا کوردەکان دابوی لەوەش نەک تەنها هەتا ساڵی 1932 مەرعیەل ئیجراء ئەبێ بەڵام هەتا ما بەعدی ئەو تاریخەش دەوام دەکات. هەروەکو حکومەتی صاحیب ئەلجەلالە ملک فیصل بە تەواوی وە بە هەمو مەعناوە حەریصە بۆ لزومی موحافەزەی و، تەتبیق کردنی ئەم پرۆگرامە کەوا لەسەرەوە بەیان کراوە. لە عەینی زەمانا بە هەمو شیددەتێک بۆ مەحو کردنی هەمو جۆرە نەعرەیەکی کە ببێتە سەبەبی تەفرەقە و ئیخلالی وەحدەتی وەتەنیەی عیراق، یاخود ببێتە سەبەبی ئیخلال کردنی حقوقی دراوسێتی لەگەڵ هەردو حکومەتی دۆستمان: ئێران و تورک. دیسان حکومەتی عیراق بە پێویستی ئەزانێ تەقدیم کردنی ئەبنای وەتەنی عیراق لەناو دائیرەی یەکێتی عیراق دا، بەبێ تەفریق لە مابەینی کوردو عەرەبدا مەمنون و مەسرور ئەبێ، هەر بەم رۆحەوە لە هەمو هەنگاوێکا چۆتە پێشەوە لەم خسوسەوە ئیستیعدادی نیشان داوە.

هەروەکو لاتان مەعلومە ئێمە کە ئەوسا مەسئولیەتی ئیدارەمان هاویشتە سەرشانی خۆمان، بەیاننامەیەکمان نەشر کرد بو، لەو بەیاننامەدا گوتمان کە ئێمە حازرین بۆ دانانی لائیحەیەکی قانونی بۆ زبانی کوردی لەو جێگایەنەدا کە ئەکسەریەنی ئەهالیەکەی کوردن وە ئەو لائیحەیەشمان بالفعل تەواو کردوە.. لە اجتماعی ئەوەلی پەرلەمانا بە هەمە حاڵ تەقدیمی مەجلیسی ئەکەین، هەتا ئەمەش ئەکرێ ئەمرمان داوە بۆ دائیرەی مختصە کە بە موافیقی رۆحی ئەو ئوصوڵی لە لائیحەکەدا دانراوە، حەرەکەت بکا لە خوصوص موعامەلاتی عەدلیەو ئیدارەی مەعاریفەوە. غەیری ئەمەش وا حکومەت موفەتیشێکی مەعاریفی تەعین کردوە و دائیرەی تەرجومەیەکی کوردی دامەزراند، ئیشی ئەم دائیرەیە هەر تەنها موعامەلاتی کوردەواریە، وە موعاونێکی کە مودیری ئیدارەی داخلیەی عامەی تەعیین کردوە کە خەبەرداره لە ئوموری ئەلویەی کوردیە، وە موفەتیشێکی مەعاریف تەعین کراوە بە صورەتی عام مەداریسی لیوای سلێمانی و مەداریسی کوردیەی لیوای هەولێرو کەرکوک تەفتیش بکا و حکومەت تەدابیری لازمەی ئیتیخاذ کردوە بۆ ئیحضاری قۆمیسەر و ظابیطان و مسجل پۆلیس کە ئاشنای زبانی کوردی بن، بۆ ئیستیخدام کردن لە مەناتیقی کوردیە.

من نامەوێ ئەم بەیاناتەم تەواو بکەم بەبێ تەقدیم کردنی تەشکوراتم بۆ جەنابی وەکیلی مەندوبی سامی کە لەم سەفەرەم دا مورافەقەتی کردین، ئومێد وایە کە موشار ئیلەیهی ئێستا بۆتان سیاسەتی حکومەتی

بەریطانیا لەم خسوسەوە بـەیان ئـەکات و بـە تـەواوی ئاگـاداری حەقیقـەتی حـاڵ ئـەبن. وە قسـەی بـەعزێ ئەشخاصی صاحێب غەرەض کە چاویان لە تەقدیر کردنـی رەفـاهی حـەقیقی کوردانـە وە رەعیـەتی صـاحێبی جەلالەت مەلیک فەیسەڵی موعەظەم و تەبەعەی دەوڵەتی عیراق کوێر بوە وە قسەیان ئیغفال نەبن.

بەم موناسەبەتەوە جەنابی وەکیلی فەخامەتمەئاب موعتەمیدی سـامی بـۆ قسـە کـردن دەعـوەت دەکـەم، بزانن ئێمە هەردولا بە تەواوی لەسەر تەعقیب کردنی ئەم پرۆگرامە موتەفیقین. ئێستا بۆتـان بـەیان ئـەکات". (ژیان، ژ 258، 28 ی 8 ی 1930)

### 2. 4. 31. بەیاناتی فەخامەتی وەکیلی مەندوبی سامی لە سلێمانی

بینا لەسەر تەلەبی حکومەتی عیراق، لەگەڵ فەخامەتی وەکیلی رەئیسە لوزەرا هاتوم، بۆ ئەوەی کـە هـەر کەسێک لە مەوزوعێک دا شک و شوبهەیەکی هەیە بە تەواوی بۆی ئاشکرا بکەم، قەت شتێکی وا نیـە لـە هـیچ نوقتەیەکی عیراق کە بڵێن حکومەتی عیراق یان حکومەتی بەریطانیا، هەریەکە بۆ خـۆی تـەعقیبی سیاسـەتێک بکا. تازە ئەوا موعاهەدەیەک ئیمزا کراوە کە ئەم دو مەملەکەتە بۆ 25 ساڵی تر لەگەڵ یەکتری بە تەحالوفێکی صەمیمی ڕەبط دەکات. ئەمە بە تەنها ئەبێ کافی بێت بـۆ ئـەوەی دەلالـەت بکـات کـە لـە بـەینی ئەمانـە هـیچ مەسئەلەیەکی موهیم و رێک نەکراو نەماوە. ئەبینم قیسمێکتان ئیحتیجاجی حکومەتی بـەریطانیا و عیصـبەتول ئومەم ئەکەن بۆ ئەوە کە لە موعاهەدەی تازە باسی کوردستان نەبوە.

وەکو فەخامەتی وەکیلی رەئیس وزەرا ئیزاحیان فەرمو، ئەسبابی ئـەوە عیبـارەت لەمـە بـو: هـەردو حکومەت، هیچ لزومی ئەوەیان نەکرد، چونکە حکومەتی عیراق قەراری داوە کە بۆ حاڵی حازرو موستەقبەل تەتبیقی ئەو سیاسەتە ئەکات کە تازە فەخامەتی وەکیلی رەئیس وزەرا بەیانی فەرمو. بە زەریفی تێ دەگەن کە حکومەتی عیراق بە صیفەتێکی منەوەر بە تەواوی ئەوەی تەقدیر دەکات کـە هـەتاکو چ حـەدێک خـۆی موجب بینی، ئیعتیراف بکات کە لە قسمێکی موهیمی عیراق دا زمانی کوردی، نـەک هـی عـەرەبی، زمـانی دایک و بابە. هیچ شتێکی وەها نیە کە بڵێ منداڵێکی کورد ئیجبار بکرێت کە تەحصیلی ئیبتدائی خۆی بە زمانی تر نەک هی باوک و دایکی بخوێنێت، یان بڵێ کوردێک ئیجبـار بکرێـت لـە مەحکەمـەدا خـۆی بـە زمانێکی تر دیفاع بکات، یان گوێ لە مەسئەلەیەکی خۆی بگرێ بە زمـانێکی کـە تـێی نـەگات مەحاکەمـە دەکرێت. هەروەها تەعینی مەئمورانی کە کوردی ئەزانن لەناو فروعی مەرکەزی ئیدارە دەلالەت لەوە دەکـات کە حکومەتی عیراق رازیە کە لە بەینی کورد و عەرەب و رەعیەتی جەلالەتی مـەلیک فەیسـەڵ، هـیچ نەوعـە جیاوازیەک نەکات.

هەتا ئەو حدودەی کە عائید بە حکومەتی بەریطانیایە، ئەوان قانیعن کە حکومەتی عیـراق بـە تـەواوی ریعایەتی ئەو وەعدانە ئەکات کە عائیدی کوردەکانـە، وە بـەناوی خـۆی لـە تـەرەف حکومـەتی بـەریطانیا لـە عیصبەتول ئومەم دراوە وە غایەی یەکەمینیان ئەوەیە کە تەئمینی تەئسیسی دەوڵەتێکی عیراق بکات کـە ئـازاد و سەربەخۆ بێت وە بە شوکرانە و حەق شوناسی مەربوطیان وە لە عیصبەتول ئومەم لەگەڵیان عضوێک بێـت. هەرچی حەرەکەتێک لەگەڵ ئەم سیاسەتە تەوافوق نەکات، حکومەت بە باشی سەیری ناکات، وەکو جیابونەوەی کوردان. سەیر دەکەم بەعزێ جیهاتی نامەسئول وای دەهێنێتە پێشەوە کە تەشجیع کردنی حەرەکەتی قەومیـەی کوردی سیاسەتێکی قەطعیەی حکومەتی جەلالەتی مەلیکی بەریطانیایە، ئەمە نەک تەنها بـۆ عیـراق بـەڵکو بـۆ دراوسێ و دۆستەکانی تری کە حکومەتی ئێران و تورکیایە، موجیبی ئیرتیبات دەبێت. هیچ شتێک نیە کە لەمە زیاتر لە حەقیقەت دور بێت. هەرکەس تەصەوری ئەوە ئەکات کە بە هاتنی بۆ لای فەخامـەتی مەنـدوبی سـامی یان بۆ لای من، بۆ سیاسەتێکی وەها تەشجیعی دەست ئەکەوێ خەطایەکی گەورە دەکات.

ئەوەی کە هەردو حکومەت: بەریطانیا و عیـراق، حـەز ئەکـەن بیبیـنن پێشـکەوتنی صـولحپەروەرانەی عیراقی یەکگرتوە کە لەویٚ هەمو ئەو عونصورە موختەلیفانەی ئەهالی تەشکیل دەکەن، غەرەضی زۆر موهیمیـان ئەوە بیٚ کە ببن بە: عیراقیەکی چاک". (ژیان، ژ 258، 28 ی 8 ی 1930)

**2. 4. 32. گیروگرفتی کورد لە عیراقدا**

دەربارەی ڕاگەیاندنە ڕەسمیەکەی حکومەت لە بابەت ڕوداوە کوردیەکانەوە لە ژورو.

ڕوداوە کوردیەکان لە سەروی عیراق دا، بە تایبەتی لـە سـلێمانی، خەریکـە ئەچێتـە قۆنـاغێکی نوێـوە. هەندیٚ درکاندن و داوا کە لەوپەڕی خطورەتان، بڵاوکراونەتەوە، چ ئەوانەی لەبـەردەم خـاوەن شـکۆی شـاهانە ئەمیر غازی دا خوێنرایەوە، چ ئەوانەی بە بروسکە و عەریزە نێردراون بۆ هەندیٚ جێگای ڕەسمیی لـە بەغـداد و لەندەن و جنێف.

ئـەم جوڵانەوەیـە دوای ئیمزاکردنـی پـەیمانی عیراقـی بـەریتانی چـالاک بـوە، هەنـدیٚ ڕۆژنامـەی ئیستیعماریی ئینگلیزی ئاگرەکەیان خۆشتر کردوە. ئەوەی سەیرە جوڵانەوەی کورد لـە عیـراق دا کەوتۆتـەوە چالاکی و توند بوە، لە کاتێک دا حکومەتی تورکی دوەمـین شۆڕشـی کـوردی لـە ئـارارات دامرکاندۆتـەوە و، حکومەتی فارسی بە سەر شۆڕشگێرانی کوردا زاڵ بوە و تەفروتونای کردون. لامـان وایـە حکومـەتی عیـراق هەستی کرد دوژمنانی وڵات خەریکی پیلانگێرانن، وەزارەتەکەی ئێستا بە ڕاگەیاندنی مەرسومی زمانی کوردی دەستی پیٚ کرد، وایزانی ئەم تەگبیرە ڕێگە تەخت ئەکا بـۆ سـەرکوتکردنی ئـەو بیروبۆچونانـەی لـە مێشـکی داواکارانی موختاریەتی کوردیدایە.

ئەگەر هەلومەرجی نائاسایی ناچاری کردبین مادەکانی 109 و 110 بخەینە قـانونی ئەساسـیەوە کـە ڕێگە بە هەندیٚ ڕەگەز ئەدا زمانەکەی بەکار بهێنیٚ، نابیٚ ئەمە وا بگەیـەنیٚ کـە ڕیٚ ئـەدەین بـە دەسـتی بـەدی بێگانە یەکێتی عیراق هەڵبوەشێنیٚ و نیشتمانی خۆشەویست بیٚ ئەرزە بکا.

پێش ئەمڕۆ ڕونمان کردەوە ئەوەی کورد لە عیراق کەڵکی لیٚ وەر ئەگریٚ، هی عەرەب لـەوە باشـتر نیە و ئاسودەییان بەستراوە بە مانەوەی حاڵەتی ئێستایانەوە. ئەگەر لەم نیعمەتە بیٚ بەش کران و توشـی نەگبەتی جیابونەوە یان سەربەخۆیی بون، ئەمان ئەبیٚ بە نسیبیان وەکو ئەوەی بـە دوای مردنـی خـۆیدا ئەگـەریٚ بـە گوللـەیەک، چونکـە نـە تورکیـا لـەلای ژوروی و نـە ئێـران لـەلای ڕۆژهەڵاتیـەوە ڕێگـە بـە دامەزراندنی ئەم کورەیە ئەدا کە پریشکی شۆڕش و پشێوی ئەهاوێژیٚ. لە ڕاستیدا ئەگەر ڕێمان دا کـورد ئەوەی پیٚی ئەڵێن (موختارییەت یان سەربەخۆیی ئیداری)یان بدرێتیٚ، بـەوە پـەیمانی دۆسـتایەتی لەگـەڵ هەردو دراوسێمان تورکیا و ئێران ئەدڕێنین. لە دوای ئەوەی حکومەت بە ڕونی سیاسەتی خۆی بەو بەیانە ڕاگەیاند کە فەخامەتی وەکیلی سەرۆکی وەزیران لە لیواکانی ژورو خوێندیەوە، دوای ئەوەی خەڵک گوێیان لەو بەیانە بو کە نوێنەری حکومەتی بریتانی خوێندیەوە کە وازهێنانی حکومەتەکەی لە سیاسەتی هاندانی نەتەوەی کورد ڕاگەیاند، پێویستە ئیتر حکومەت ڕێگەی توندی بگریٚ و بە زۆر سیاسەتەکەی خۆی درێژە پیٚ بدا.

هەروەها لەسەر حکومەت پێویستە وڵاتی کورد پاک بکاتەوە لە فەرمانبەرانی عیراقی یا بریتـانی، کـەوا لەمەوپێش ناسراون بە هاندانی ڕاپەڕین، لە ڕێگەی نەتەوەیی کوردەوە یان کارکردن بۆ حسابی بێگانـە لـەناو جەرگەی وڵاتەوە.

الجهاد، ع229، 12ی 8ی 1930

**2. 4. 33. کورد و یەکێتی عیراق**

تا ئێستاش بە سەرسورمانەوە ئەو هەواڵانە وەرئەگرین کـە لـە ناوچـەکانی ژورووەوە، بـە تایبـەتی لـە سلێمانی و هەولێرەوە دێن و ئەڵێن بـرا کوردەکانمـان لـەوێ کـە داوای مافـەکانیان ئەکـەن. لەبـەردەم سـەرای حکومەت دا لە سلێمانی خۆپیشاندانیان کردوە. لەوەیش زیـاتر ئەگێڕنـەوە کـە موراجەعـەتی دار الاعتمـاد لـە بەغداد و کۆمەڵەی گەلان ئەکەن.

لەم حاڵەتەدا دڵی هەمو عیراقیەک کە سور بـێ لەسـەر یـەکێتی و هەسـت بـە فرمـانی خـۆی بەرامبـەر نیشتمان بکا، ژان ئەکا. چونکە ئەم جۆرە جوڵانەوانە، ئەگەر راسـت بـێ بـوبێ، لـە سـەرچاوەی مـوغریزەوە دائەکەوێ کە خێری عیراقیان ناوێ، بە زۆری لەوانەوە دێ کە تەماع و مەبەستی تایبەتیان هەیە و زۆر دورە لـە بەتەنگەوە هاتنی قازانجی کورد و پاشەڕۆژ و چارەنوسیان. چونکـە ئەگـەر ئێمـە لـە بـارودۆخی کوردەکـانی عیراق لەم سەردەمەدا ورد ببینەوە، ئەبینین کەسایەتی رەگەزیی خۆیان هەیە، هیچ کاتێکی تری ئەو زەمانەی بە حکومەتە دوا براوەکانەوە بەسترا بون نەیان بوە. ئەوەندە بەسە بۆ کورد کە ئەمڕۆ حاڵی خۆی بـە ئـەقڵێکی پێگەیشتو و دڵێکی هۆشیارەوە، دور لە عاتیفە، رێک بخا، ئەبینێ کەسایەتی بە کۆمەڵی عیراقی و حکومەتەکەی دا ئاشکرا و رونە و هیچی کەم نیە. بە ئازادیەکی بێ سنور ئەژی و زمانەکەی بـە رەسـمی دانـی پیـا نـراوە، کەڵک لە هەمو ئەو ئیمتیازات و مافانە وەرئەگرێ کـە بـۆ هـەمو عیراقیەکانـە بـێ جیـاوازی عیراقـی عـەرەبی و نەعەرەبی. ئەو پارەیە گەنجینەی دەوڵەت لە ئاوەدانی و پرۆژەکانی لیوای ژوورودا سەرفی ئەکا.

ئەگەر ئاوڕێ لە بەشداری کوردا لە مەسئولیات و کاروبـاری حوکـوم دا بدەینـەوە، ئـەبینین ئەوانـە رێچەڵەکیان کوردە یا کوردەکانی ئێستا پایەو وەزیفەی دەوڵەتیان بە دەستە، لـە هـەمو پلـە جیاوازەکـانی ناوەنـدی حکومـەت و سەرانسـەری عیـراق دا هـەن. لـەم سـاڵانەی دوایـیدا حکومـەتی عیـراق هـەوڵیدا فەرمانبەرانی ناوچە کوردیەکان کورد بن. گەلێ کورد هەن لە سەرانسەری عیـراق دا پایـەو وەزیفـەیان بـە دەستە. مێژوی حوکمی نیشتمانی لە عیراق دا پڕە لەو ضماناتەی لەم وڵاتەدا کەسایەتی و ژیانێک بۆ کورد تۆمار ئەکەن کە لە هیچ جێگەیەکی تری رۆژهەڵات دا نایبینین. ئەوە کوردەکانی تورکیا بـە دەس قـەلاچۆ کرنەوە ئەناڵێنن و ژیانیان وەکو زەهر لێ تاڵ کردون، ئەوە کوردەکانی ئێران بەبێ بەرگری و توندوتیژی چاو لێک نانێن.

سلامەتی ژیان و بەختیاریان بەستراوە بە رادەی توندی خۆبەستنەوەیانەوە بە یەکێتی عیراقەوە.

ئەوەی زۆر ئەمانترسێنێ دەربارەی پاشەڕۆژی براکانمان ئەوەیە، ئەوان بەم جوڵانەوانە کە لامان وایـە کوردی عیراق بە گشتی ئیستینکاری ئەکەن. زوڵم لە خۆیان بکەن پشێوی بیانخوا و بین بە خۆراکی مەبەست و ئارەزوی بێگانە وەکو بەسەر ئەرمەن هات کە ئارەزوی جۆراوجۆر شروهوری کردن.

باوەڕمان زۆرە کە پیاوە ژیرەکانی ناو برا کوردە عیراقیـەکانمان، هەسـت بـەو مەترسـیانە ئەکـەن کـە لەسەریانە، پێش ئەوەی شەڕەکەی بتەنێتەوە چارەی ئەکەن، زۆر بەتوندی ئەوە ئەگرن کە شـانی عیـراق بـەرز ئەکاتەوە و قەوارەی وڵات بەهێز ئەکا.

(التقدم، بدلا من جریدە البلاد، ع 213، 23 ی 7 ی 1930)

**2. 4. 34. موفارەقەتی سەعادەتی تۆفیق وەهبی بەگ**

تۆفیق وەهبی بەگ بە تەواوی تەئثیری کردۆتە میللەتەکەمانەوە.

رۆیشتنی موتەسەڕیفی غەیورمان سەعادەتی تۆفیق وەهبی بەگ بـۆ بەغـداد و خەبـەری ئینفیصـالی لـە موتەسەڕیفیەتی، لێرە جدەن زۆر تەئثیری کردە ئەهالیەکەمان. بـە عومـومی کوردەکـانی عیـراق و بـە تایبـەتی

ئەهالی ئەم لیوایە بە گەورە و بچوک و ژن و پیاوەوە، موتەئثیر و بۆ ئیعادە کردنـەوەی حەسرەتکەشـن و بـۆ هاتنەوەی لە هەمو لایەکەوە، ئیستیرحامنامەیان تەقدیمی حکومەت کردوە.

ئەمیش حەقیقەتەن حەقە، چونکە ئەم لیوایە کـە لـە عیـراق لیوایـەکی مـوهیم و عادەتـەن بـە مەرکـەزی کوردستانی جنوبی ئەناسرێ، مودەتێکی زۆر لە هەمو تەرقیاتێک مەحروم و بێ بەش مایەوە. ئەم موحیطە کـە تەبیعەتەن و فیطرەتەن ئەهالیەکەی مایلی عیلم و عیرفانن و مەحەبەتی مەعاریفیان هەیە، پەردەیـەکی جـەهل بـە سەریا راکێشا بو، فەقەت بە هاتنی سەعادەتی تۆفیق وەهبی بەگ کە لە پێگەیشتوانی ئەم وەتەنەیـە و زاتێکـی داهی و موتەبحیرە، ئەهالیەکەمان لە تاریکی جەهل رزگاری بو و وڵاتەکەمان بە چرای مەعاریف روناک کرایەوە، حەقیقەتەن موشار ئیلەیهی لە پـێش هـەمو شـتێکا بـۆ ئینتیشـاری مـەعاریف و بـۆ تەئسـیس و دامەزرانـدنی موئەسەسەی عیلمیە و بۆ زیاد کردن و کردنەوەی مـەکاتیبی ئینتیـدابی لـە تەشـەبوس کـردن غافـڵ نـەبو، بـە عەزمێکی مەتینەوە بۆ تەرەقی و تەعالی وەتەنەکە هەوڵیدا و غـەیری ئـەمانیش بـە واسـیتەی تـەتبیقی قـوانین و نیظاماتی حکومەتەوە عەدالەت بە هەمو مەعنایەوە، لەنا و ئەم موجتەمەعەدا تەجەسومی پێ کـرا بـو. وە بـەم سەبەبەوە لە بەینی حکومەت و میللەتا، مەحەبەتێکی موتەقابیلە هاتبوە وجود.

بەڵێ هەرچەند لەو زەمانەدا وەکو ئێستا بە موناسەبەتی بەستنی موعاهەدەی تـازەوە، میللەتەکـەمان بـۆ تەلەبی حقوقی موقەڕەرەو موعتەرەفەیان کەوت بونـە موراجەعەتـەوە، فەقـەت ئـەم حەرەکەتـە وەنەبـێ هـەر لـە سلێمانیا بوبێ، بەڵکو لە هەمو لیوا کوردەکانی تر و لە هەمو مەنتیقەیەکی کوردستان دەستی پێکرا بو. وە ئەم حەرەکەتەیش هیچ وەقتێک نەبو بو بە سەبەبی تەفرەقە و نەفرەتێکی ئـەهالی بەرامبـەر بـە حکومـەت. ئـەهالی لەگەڵ ئەم هەمو موراجەعەتەیشیا، زیاتر مەربوط و چاکتر موطیعی ئەوامیر و قەوانینی حکومەت بو.

ئەگەر بە نەزەرێکی رەئفەت تەماشای موراجەعات و ئیستیرحامنامەی ئـەم ئەهالیـە بکـرێ، مـەعلوم ئەبێ کە ئەم تەشەبوساتە لە فکرێکی خراپەوە نەهاتۆتە دەرێ، بە واسیتەیەکی غەیرە مەعقولە پەیدا نەبوە، وەنیە ئەمە ئەوەڵ جار بێ کە ئەهالی تەلەبی حەقی خۆی ئەکات، هەتاکو ئێستا موتەعەدید دەفعە ئەهالی بۆ ئەم حەقە صەریحەیان تێکۆشاون و ئەمجارەیش ئەهالی رێیەکی مەدەنیانە و مەعقولانەی گرتوە و لە عورف و عادەت دەرنەچوە، شوکور حەرەکەتێکی وا نەکراوە کە ببێ بە سەبەبی ئیختیلالـی ئەمنیـەت و ئاسـایش و لە هەمو ئانێک دا سەطوەتی حکومەتی زیاتر مەوجود و ئەهالی زیاتر ئیطاعەتی کردوە ئەمیش هـەر بـە سەبەبی تەدابیری حەکیمانەی مەئموریني ئیدارە و سەعادەتی موتەسەڕیفی غـەیور تۆفیـق وەهبـی بەگـەوە هاتۆتە جێ، چونکە حەقیقەتەن حکومەت لەگەڵ ئەهالیدا بـە لوتـف و شـەفەقەتەوە جوڵایـەوە و ئـەهالیش بەرامبەر بەم لوتفە قەراری دا کە هەمو موراجەعاتەکـەی حەصـر بکاتـە سـەر تەشەبوسـات، سـەر نوسـین و ئیستیرحام کردن و غەیری ئەمە نەیویست و قەطعیەن نایـەوێ رێیـەکی تـۆ بگـرێ و غایەیـەکی خـراپ تەعقیب بکات.

ئینجا ئەگەر حکومەت بە نـەزەرێکی موشـفیقانە تەماشـای وەزعیـەت و تـەدقیقی مەسـائیل بکـات، بـە تەواوی بۆی مەعلوم ئەبێ کە بەقای سەطوەتی حکومەت و مەوجود بونی ئەمنیـەت و ئاسایشـی کامیلـەی ئـەم لیوایە و مـەربوطیەت و ئیطاعـەتی ئـەهالی بەرامبـەر بـە حکومـەت بـە سـەبەبی دەهـای خاریقـە و تـەدابیری حەکیمانەی مەئموریني ئیدارە و خسوسەن سەعادەتی تۆفیق وەهبی بەگەوە هاتۆتە وجود و محافەزە کراوە.

ئینجا ئەهالی بەرامبەر بەم شەفەقەتە ئومێدی قەوی هەیە بە حکومەت ئەو ئیسـتیرحام نامانـەی کـە بـۆ ئیعادەی سەعادەتی تۆفیق وەهبی بەگ لە هەمو لایەکەوە تەقدیم کراوە، قبوڵی ئەفەرموێ و بە ئیعادەکردنـەوەی موشار ئیلەیهی میللەتەکە مەسرور ئەکاتەوە. (ژیان، ژ 259، 4 ی 9 ی 1930)

**2. 4. 35. داواکردنەوەی تۆفیق وەهبی لە لایەن ئەهالی سلێمانییەوە**

ئەو رۆژە کە سەعادەتی موتەسەڕیفی ئەکرەمی تۆفیق وەهبی بەگ تەشریفی بردە بەغداد ئەهالی لە تەئەثوردا چونە تەلغورافخانە و ویستیان لەگەڵ فەخامەتی مەندوبی سامی و رەئیسەل وزەرادا بە تەلەفۆن گفتوگۆ بکەن. فەقەت لەبەرئەوەی فەخامەتی مەندوبی سامی لە کوردی نەئەگەیشتن و فەخامەتی رەئیسەل وزەرایش لە دائیرە مەوجود نەبو، مەجبورەن قەراریان دا ئەم تەلغورافەی کە لە ژێرەوە بە عەرەبی عەرز ئەکرێ کەشیدە و تەقدیمی بکەن و نەتیجە بەم ئیمضایانەوە تەقدیم کرا. (ژیان، ژ 259، 4 ی 9 ی 1930)

**2. 4. 35. 1. تەلغرافی ئەشرافی سلێمانی**

لە سلێمانیە 20 ی 8 ی 1930

بغداد: فخامة مندوب السامي

"رئيس الوزراء

بعد سفركم تاملنا بالمباشرة في تطبيق المقررات الامية بتبديل موظفين غير اكراد لكن خاب املنا بتحويل موظفين الاكراد الى الاماكن البعيدة في الجنوب وجلب المتصرف الى بغداد هذه الامور استوجب التوحش والاهياج ان طلب الحقوق التي اقرتها العصبة لا يستوجب التحامل قانونا بالنظر الى وجود الانتداب الفعلي في العراق. سعينا بكل ما لدينا من الطلاقة و الطاقة في تسكين الاهالي والعشائر منعا لحدوث امور لايرضى بها فخامتكم خارت قوانا. لهذا نتجرد عن مسئولية تتولى في المستقبل راجين الاهتمام بكف المعاملات التى من شئنها الاستياء.

حمة آغا عبدالرحمن آغا بابان: عزمي بک. عزت بک عثمان پاشا. حفيد زادة: شيخ قادر. ميرزا توفيق قزاز. عبدالرحمن آغا احمد پاشا. حمه صالح بک حاجى حمه علي بک. فايق بک بابان. مجيد افندي حاجيي رسول آغا. رمزي افندي حاجي فتاح.

وەقتێک کە سەعادەتی موتەسەڕیف تۆفیق وەهبی بەگ مواصەلەتی بەغدادی کرد و غەزەتەکان نوسییان ینفیصالی پێ کراوە، لە هەمو لایەکەوە ئەهالی و روئەسای عەشائیر بۆ ئیستیرحامی ئیعادە کردنەوەی موشار ئیلەیهی ئەم تەلغورافانەیان نوسیو تەقدیم کرد، وا قیسمێکی تەلغورافەکان بە ریزە نەشر ئەکەین. (ژیان، ژ 259، 4 ی 9 ی 1930)

**2. 4. 35. 2. تەلغرافی سەرۆک خێڵەکانی هەورامان**

24 ی 8 ی 1930

بەغداد: فەخامەتی مەندوبی سامی

صورەتی بۆ فەخامەتی رەئیسەل وزەرا

تەبدیلی موتەسەڕیف موغاویری ئەفکارمان و سەبەبی تەئەثوری عمومی کوردانە. ئیستیرحام ئەکەین ئیعادەی بفەرمونەوە.

هەورامان، ئەفراسیاب بەگی رۆستەم سوڵتان. هەورامان، مصطەفا بەگی جەعفەر سوڵتان. هەورامان، محەممەد ئەمین بەگی مەحمود خانی دزڵی. هەورامان، شێخ محەممەدی شێخ حیسامەدین. (ژیان، ژ 259، 4 ی 9 ی 1930)

**2. 4. 35. 3. تەلغرافی رەئیسی هەورامان جەعفەر سوڵتان**

26 ی 8 ی 1930

بغداد: فخامة مندوب السامي

"رئيس الوزراء

گۆڕینی موتەسەڕیف تۆفیق وەهبی بەگ ئەبێ بە سەبەبی تەئەثوری عومومی کوردان. رجا ئەکەین ئیعادەی بفەرمونەوە. رەئیسی هەورامان جەعفەر سوڵتان. (ژیان، ژ 259، 4 ی 9 ی 1930)

**2. 4. 35. 4. لە سلێمانیەوە لە عەینی مەئال**

بە ئەشراف و توجارو ئەهالی سائیرە سێ تەلغوراف نوسراوە.

لە پشدەریشەوە بە ئیمضای جەنابی عەباس ئاغای مەحمود ئاغا و قیسمێکی زۆر لە روئەساکانی تریان، سێ تەلغراف نوسراوە.

لەبەرئەوەی صورەتەکانمان لا نەبو، نەمانتوانی عەینەن دەرجیان بکەین. (ژیان، ژ 259، 4 ی 9 ی 1930)

**2. 4. 36. بەیانی رەسمی**

بە بۆنەی هەڵبژاردنی هەیئەتی تەفتیشەوە لە لیوای سلێمانی و کۆبونەوەی هەیئەتی هەڵبژێردراو، ئەمڕۆ لە مەرکەزی حکومەت، مقاطعینی انتخاب لە بەردەمی شوێنی کۆبونەوەکەدا مظاهرەیان کرد، بەو هۆیەوە پێکادان رویدا، هەندێ لە پۆلیس و سەرباز و خەڵک ئەنگێوراون. پاش چەند دەقیقەیەک ئاسایش گەرایەوە. ئەوانی بون بە هۆی ئەم روداوە گیراون و لێکۆڵینەوە بەردەوامە. (الزمان، ع 249، 7 ی 9 ی 1930)

**2. 4. 37. روداوەکەی سلێمانی**

لە سەرچاوەیەکی رەسمیی پەیوەندیدارمان پرسی کە ژمارە کوژراوەکانی روداوەکەی سلێمانی، بە بۆنەی دەسکردن لە هەڵبژاردنی نیابیەوە وەکو بەیانە رەسمییەکەی لە کاتی خۆیدا بڵاومان کردەوە، چەندە. نەمانتوانی ژمارەی ویستراوی لێ بەدەس بهێنین، بەڵام برینـدارەکانی پۆلیس و خەڵک بۆ چارەسەرکردن نێردراون بۆ نەخۆشخانە. (الزمان، ع 251، 9 ی 9 ی 1930)

**2. 4. 38. بەیان لە (ملاحظیة المطبوعات) ەوە**

روداوەکەی سلێمانی: لەبەر بڵاوبونەوەی زۆر واتەواتی درۆ دەربارەی ئەو روداوە ناخۆشەی لە 6 ی ئەم مانگەدا لە سلێمانی قەوماوە، لەلایەن کەسانێکەوە کە ئەیانەوێ ترس و نائومێدی بخەنە دڵەوە، حکومەت بە پێویستی زانی ئەم بەیانە دەربکا سەبارەت بەوەی روی داوە.

وەکو وەکیلی موتەسەڕیف ئاگادار کرا بو، ژمارەیەکی زۆر ئەشراف و تاجیرەکان ئەیانویست هەڵبژاردن بکرێ. لە 5 ی 9 دا رێوشوێنی هەڵبژاردنی هەیئەتی تەفتیشی بۆ رۆژی دوایی دانا. لەبەرئەوەی زانی کە ژمارەیەکی کەمی ئەشراف ئەیانەوێ موقاطەعە بکەن، ئاگاداری کردن کە هەڵبژاردن ئازادە، کەس ناتوانێ زۆریان لێ بکا هاوبەشی بکەن ئەگەر خۆیان نەیانەوێ، هەروەها کەسیش هەقی نیە رێ لەوانە بگرێ کە ئەیانەوێ ئازادی خۆیان بەکار بهێنن، ئیتر ئەوە بە زۆر بێ یان بە ترساندن و هەڕەشە. وەکیلی موتەسەڕیف تێی گەیاندن کە کاری وەها بە تاوانێکی گەورە دائەنرێ و، ئەرکی حکومەتە منتخبەکانیان لێ بپارێزێ.

بەیانی رۆژی 6 ی 9 دەعوەتنامە نێردرا بۆ نزیکەی 30 لە ئەشراف کە نوێنەرایەتی هەمو گەڕەکەکانی شارەکەیان ئەکرد، بۆ ئەوەی لە سەرای حکومەت بۆ هەڵبژاردن ئامادە بن. بەراستی ئامادەبون و لەگەڵ سەرۆکی شارەوانی کۆبونەوە. دوای ئەوە هەواڵ گەیشت کە نزیکەی 50 کەس لە قوتابی و هەرچی و پەرچی لە بازاڕ کۆبونەتەوە خەریکن بە زۆر دوکانیان پێ دائەخەن و خەڵک کۆ ئەکەنەوە، ئینجا رویان کردە سەرای حکومەت. ریزێک پۆلیس رێگەی لە کۆبونەوەکەیان گرت. قەڵەباڵغیەکە زۆر بو لە نیزام دەرچون، دەرکەوت کە هێزی فریاکەوتن پێویستە. داوا لە فەرماندەی حامیەی جەیشی عیراق کرا 100 سەربازی بێ چەک بۆ یارمەتی پۆلیسەکان بنێری. بارودۆخەکە تا ئەهات دژوارتر ئەبو. هەندێ لە قەڵەباڵغیەکە کورسی چایخانەکانیان وەکو چەک لە دژی پۆلیس بەکار ئەهێنا و هەندێکیان بریندار کردن. لەبەر ئەوە دەرکەوت هێز پێویستە، داواکە گۆڕا، داوای سریەیەکی چەکدار کرا. قەڵەباڵغیەکە پەلاماری پۆلیسەکانیان دا کە بە ژمارە کەم بون. کەوتنە بەردبارانی پۆلیسەکان و سەرای حکومەت. داوا لە فەرماندەی حامیە کرا فەوجێ بنێرێ بۆ پشتیوانی لەو سریەی بە رێگەوە بو بۆ سەرا. قەڵەباڵغییەکە بەردبارانی زیادکردو کەوتە بەکارهێنانی دارو تێڵا. کە سەریە پیادە چەکدارەکە گەیشتە سەرا بەردبارانیش راوەستا. لەگەڵ ئەوەی هەندێ لە قەڵەباڵغیەکە کشایەوە، بەڵام بەشێکیان لە شوێنی خۆیان دا مانەوە. فەرمان بە سەربازەکان درا بڵاوەیان پێ بکەن، بە بڵاوی بە جادەکەدا کەوتنە رۆیشتن. ئاژاوەچیەکان بە تێڵای گەورەو، بەو بەردانەی بۆ بەردرێژی جادەکان دانرابون و، بە کورسی و شتی تر تێیان بەر بون.

لەم کاتەدا گوللەیەک تەقی و سەربازێکی عیراقی کوژرا. بەدوای ئەوەدا چەند گوللەی دەمانچە تەقی، دو سەربازیش بریندار بون. سەربازەکان دەستیان کرد بە تەقە و قەڵەباڵغیەکە بڵاو بوەوە. لەو کاتەدا فەوجەکە گەیشت و چاودێری شاری گرتە ئەستۆ و ئاسایش گەڕایەوە.

ئەنگاوتە: لە پۆلیس تا گەیشتنی سەربازەکان 10 پۆلیس بریندار بون. نۆیان بە بەرد و تێڵا و یەکێکیان بە خەنجەر. 153 پەنجەرەی سەرا و 18 گڵۆپی جادەکە شکاوە. لە جەیشی عیراق: یەک سەرباز کوژراوە و دو سەرباز بریندار بوە، یەکێکیان بە بەرد. لە ئەهالی: 3 کوژراو و 23 بریندار.

گیراوەکان: ئەم کەسانەی ناویان لە خوارێ نوسراوە، دوای ئاژاوەکە گیراون:

1- شێخ قادری برای شێخ مەحمود.

2- میرزا تۆفیق.

3- رەمزی ئەفەندی.

4- حەمە ئاغا.

5- عەزمی بەگی بابان.

6- عیززەت بەگی عوسمان پاشا.

7- ئەورەحمان ئاغای ئەحمەد پاشا.

8- محەممەد صالح بەگ.

9- مەجید ئەفەندی کانێسکان.

10- فایەق بەگی بابان.

11- شێخ محەممەدی گوڵانی.

بەم راپۆرتەدا دەرئەکەوێ دەسەڵاتی حکومەت ناچار کراوە بۆ بەکارهێنانی هێز لە بڵاوەپێکردنی هەرچی و پەرچیە یاخیەکان دا کە ئەیانویست ئاسایش تێک بدەن. ئەم پشێویە لەوە دروست بوە هەندێ کەسی هەڵخەڵەتێنراو، ئەیانەوێ فەرمانبەرانی گوێرایەڵی قانون و ئەوانەی ئەیانەوێ لە هەڵبژاردن دا بەشدار بن، بتۆقێنن. ملاحظ المطبوعات. (الزمان، ع 261، 21 ی 9 ی 1930)

**2. 4. 39. لێدوانی ڕۆژنامەی بەغداد تایمس**

وا دەرئەکەوێ بارودۆخی ناو شاری سلێمانی و لیواکەش هێمن بێ و حکومەت کاروباری گرتۆتەوە دەست. ئەو هەواڵانەی بە شێوەیەکی تایبەتی بۆمان هاتون، ئەڵێن ئاژاوەکە تەواو بو بە کوشتنی 13 کەس کە یەکێکیان سەربازێکی عیراقیەو 35 بریندار کە 4 یان سەرباز و 9 یان پۆلیسن. ئەمانەش کە ناویان لە خوارەوە نوسراوە گیراون: عیززەت عوسمان پاشا، عەزمی بەگی بابان، فایەق ئەفەندی بابان، رەمزی حاجی فەتاح، شێخ قادر شێخ سەعید، محەممەد سالح، مەجید ئەفەندی، محەممەد عەبدورەحمان، تۆفیق قەزاز، ئەمانە نێردراون بۆ کەرکوک بۆئەوەی لێکۆڵینەوەیان لەگەڵ بکەن. خۆپیشاندەران دژی هەڵبژاردن لە سەرەتادا ژمارەیان زۆر نەبو تا گەیشتە 1000 تا 2300 کەس. هوتافیان ئەکێشا بروخێ هەڵبژاردن. لەناو خۆیاندا ئەیان وت هەڵبژاردنەکە ئازاد نیە. کۆمەڵانی خرۆشاو سەعات 11 ی بەیانی دەستیان کرد بە بەردبارانی پۆلیس و سەرا. زۆر لە خۆپیشاندەرەکان دەمانچەو خەنجەرو تێلایان پێ بو، لە بەردەرکی سەرا کۆبونەوە و چونە ژور و هاتنە دەرەوەیان خست بوە مەترسیەوە. دەسبەجێ فەرمان بە پۆلیس درا، کە تەنیا داریان پێ بو، بڵاوە بە حەشاماتەکە بکا. بەڵام هێزەکەیان بەس نەبو بۆ چارەسەرکردنی کێشەکە، کاربەدەستانی وا لێ کرد جەیش بانگ بکەن بۆ یارمەتی دانیان. لێرەدا پێکاهەڵپژان دەستی پێ کرد. جەیش ناچار بو تەقە لە خۆپیشاندەران بکا. تەئکیدمان کردوە کە پۆلیس و جەیش دەستپێشخەر نەبون لە دەستدرێژیدا. جەیش وەڵامی ئەو تەقانەی دایەوە کە خۆپیشاندەران لە جێگەیەکی نزیکەوە کردبویان. (الزمان، ع 253، 11 ی 9 ی 1930)

**2. 4. 40. ئینتیخابات لە سلێمانی**

رۆژی 15 ی 9 ی 1930 لە مەقامی موتەسەرپفی دا عمومی ئەشراف و توجار و سائیری طەبەقەی ئەهالی، بۆ ئینتیخاباتی هەیئەتی تەفتیشیە کۆبونەوە.

لە نەتیجەدا ئەواتی ئاتیە بە ئەکسەریەتی ئارا، بە ئەعضای هەیئەتی تەفتیشیە ئینتیخاب کران.

چەند رەئی بوە

34 حاجی ئیبراهیم ئاغا

22 مەجید بەگی حاجی رەسوڵ بەگ

22 غالی ئاغا

21 حاجی ئەحمەدی حاجی کەریم

20 عەبدولکەریم ئەفەندی عەلەکە

19 سەید ئەحمەدی توتونچی

17 کەریم بەگی محەممەد بەگ

16 حاجی کاکە حمە

15 حاجی مەلا محێدین

15 حاجی عەلی حاجی حەسەن ئەفەندی.

(ژیان، ژ 260، 22 ی 9 ی 1930)

**2. 4. 41. تەشریف هێنانی سەعادەتی موتەسەرپفی تازە**

رۆژی یەکشەمە موصادیفی 28 ی 9 ی 1930 سەعادەتی ئەحمەد بەگی تۆفیق بەگ، موتەسەرپفی تازە و خۆشەویستی سلێمانی تەشریفی لە کەرکوکەوە مواصەلەتی فەرموە سلێمانی، لە رۆژی لەوە پێشەوە

قیسمێکی زۆر لە ئەشراف و رووئەسای دەوائیر و مەئمورین و منەوەرانی سلێمانی، بۆ ئیستیقبالی موشار ئیلەیهی چو بون بۆ کەرکوک هەتا سەر محەطەی شەمەندەفەر و قیسمێکی تریش لە رووئەسای دەوائیر کە حەسەبەل وەزیفە ئیمکانی چونی کەرکوکیان نەبو، رۆژی موانەلەت هەتا دەربەندی بازیان و تەیناڵ و بێجگە لەمانەش هەمو ئەهلی مەملەکەت بە ئیختیلافی هەمو طەبەقاتیانەوە، لەگەڵ بلوکێک عەسکەری جەیش و تاقمێک پۆلیس بەناوی حەرەسی شەرەفەوە لە بەردەمی جادەی دەباخانە، بە دڵێکی پڕ فەرەح و سرور حازری ئیستیقبال و چاوەروانی تەشریف هێنانی سەعادەتی بون.

لەبەر ئەوەی لە رێگا و لە دەربەند تەئخیر بو بون، لە سەعات نزیک هەشتی عەرەبی مواصەلەتی فەرمو، ئەوەل جار زیارەتی حەرەسی شەرەفی جەیش و پۆلیس و لە پاشا لەگەڵ عولەما، سادات، ئەشراف، رووئەسای دەوائیر و مەئمورینی حکومەت دا بە لێوێکی پڕ تەبەسومەوە کە ئاوێنەی صەفوەتی قەلب و حوسنی نیەتی بو یەکە یەکە موصافەحە و بەیانی خۆشنودی و مەمنونیەتی لە موستەقبیلین فەرمو وە بە چەند کەلیمەیەکی شیرین و جوان و ئومێدبەخش ئەم ئیستیقبالەی لەسەر خۆی بە قەرضێک وەرگرت کە بە سەعی کردن بۆ تەئمینی ئەمن و ئاسایش و هەوڵ دان بۆ تەرەقی و تەعالی میللەت و مەملەکەت مەجبور بێ بە ئەدای ئەم قەرضە. ئیتر لەوێوە لەگەڵ ئامیر مەنتیقەی عەلی ڕەضا بەگ و حەمید بەگی شالچی ئامیری فەوج و سائیری موستەقبیلین دا بە ئۆتۆمۆبیل تەشریفیان هێنایەوە دەوڵەتخانە، لەوێ لەپاش ئیسراحەت کردن و قاوە خواردنەوە ئیتر ویداعی لێ کرا.

موشار ئیلەیهی کە یەکێکە لە منەوەران و ئەنجەبی خانەدان و ئەشرافی سلێمانی، تەعین فەرمونی بۆ ئەم وەزیفەیە بە راستی هەمو ئەهلی سلێمانی خاصەتەن و، هەمو میللەتی کوردی بە عومومی مەمنون و بەرامبەر لەم لوتفی حکومەتە مەدیونی شوکران کرد.

ژیان: لەگەڵ هەمو میللەتی کورد تەمەنای موەفەقیەت و سەعادەت و ئیلەل ئەبەد دەوام و بەقای ئەکات. (ژیان، ژ 261، 6 ی تشرینی یەکەمی 1930)

### 2. 4. 42. وەفدی سلێمانی

رۆژی 28 ی 9 ی 1930 وەفدی سلێمانی کە لە ریاسەتی رەئیسی بەلەدیە موحتەرەم مەحمود ئەفەندی دا تەشەکولی کردوە، عیبارەتن لە محامی نەجیب ئەفەندی، وە لە رووئەسای جاف جەنابی ئەحمەد بەگی محەممەد صالح بەگ، وە حاجی مەلا کوڕی حاجی عەباس ئاغا رەئیسی پشدەر، بۆ عەرزی تەعظیمات و ئیستیقبالی جەلالەتی مەلیک فەیسەڵ ئەوەل کە لە لەندەنەوە عەودەتی فەرمۆتەوە، تەشریفیان بردۆتە بەغداد. (ژیان، ژ 261، 6 ی تشرینی یەکەمی 1930)

### 2. 4. 43. وەفدی کوردستان

شەوی پێنجشەممە 18 ی 9 گەیشتە پایتەخت، وەفدێک لە لیوای کەرکوک و چەمچەماڵەوە کە پێکهاتوە لە 7 کەس کە ئەمانەن: سەید محەممەد ئەفەندی رەئیسی جەباری، عەبدولکەریم وادی رەئیسی زەنگەنە، رەئیسی عەشیرەتی بزەینی، سلێمان ئاغای هەمەوەند، رەشید ئاغا رەئیسی شوان، عەلی ئاغا رەئیسی سنجاوی. دیدەنی فەخامەتی رەئیسی وزەرایان کرد و دەسگرتنیان بە یەکێتی عیراق و خۆبەستنەوەیان بە عەرشی جەلالەتی مەلیکەوە دەربڕی. هەر ئەم وەفدە رۆژی دوێنێ سەردانی پایەبەرز وەزیری ناوخۆ جەمیل مەدفەعی و وەزیری دیفاع جەعفەر عەسکەریان کرد. ئەم وەفدە پێشوازی لە دو نوێنەر کرد: یەکێکیان هی بیلاط شێخ عەبدوڵڵا ئال مەضایفی، دوەمیان سەروەزیران و یاوەرەکەی جەمیل بەگی روحی. وەفدەکە لە ئوتێلی ماجستیک دابەزێنران. (الزمان، ع 261، 21 ی 9 ی 1930)

**2. 4. 44. وەفدی لیواکان بۆ بەخێر هاتنەوەی خاوەن شکۆ**

مـەلیک فەیسـەڵ لـە 1 ی 10 ی 1930 گەیشـتەوە عیـراق، ئـەم وەفدانـە چونـە بەغـداد بـۆ بـەخێر هاتنەوەی:

وەفدی سلێمانی: 1- مەحمود ئەفەندی سەرۆکی شارەوانی. 2- ئەحمەد بەگی حەمـە سـاڵح بـەگ. 3- حاجی مەلا ئاغا عەباس ئاغا. 4- عوسمان ئاغای عومەر ئاغا. 5- نەجیب ئەفەندی فەتاح ئەفەندی.

وەفدی هەولێر: 1- عەبدوڵڵا ئەفەندی ئەلموفتی. 2- ئیبراهیم بەگ ئەلیوسف.

وەفدی کەرکوک: 1- حاجی محەممەد عەلی قیردار. 2- موظەفەر بـەگ ئەلیـەعقوبی. 3- جـەمیل بـەگ بابان (کفری). 4- محەممەد رەشید ئاغای هەمەوەند (چەمچەماڵ). 5- دارا بەگ رەئیسی داودە (چەمچـەماڵ). 6- رەفعەت بەگ رەئیسی داودە (چەمچەماڵ). 7- فارس بەگ رەئیسی داودە (چەمچەماڵ). 8- نەجیب بـەگ رەئیسی تالەبانی (چەمچەماڵ). 9- نوری ئەفەندی (مەسیحی). 10- ئیسحاق ئەفرایم (موسەوی).

موصل: 1- حازم شەمدین ئاغا. 2- شێخ حەبیب سەعید (میری شێخان). 3- شێخ غیاپەدین. (الزمـان، ع 270، 1 ی 10 ی 1930)

**2. 4. 45. شیعری شاعیران بۆ وەفدی کوردستان:**

**بێ کەس**

"پێنج خشتەیەکی لەسەر شیعری پێرەمێرد"
قەدری میللەتتان بەجارێ شکان
نە حەیاتان ما نە ناوونیشان
باری تەعنەتان وا هاتە سەر شان
((وەفدی کوردستان، میللەت فرۆشان
هەرزە وەکیلی شاری خامۆشان))
حاجی توتنەکەت مادەم فرۆشرا
قیروسیا لە صەد کوشتن و هەرا
دەخیلە هەستە رێکەوە خێرا
((دەسکێ لەو گوڵەی باغەکەی سەرا
کەوا بە خوێنی لاوان ئاو درا))
تاقمێ رێکخەن زۆر بە پەرلاقی
بە بەزم و رەزم و ئاهەنگ و ساقی
بۆ ئەوەی بکەن دەفعی مەراقی
((بیبەنە بەردەم عەرشی عیراقی
بڵێن یار باقی و، هەم صوحبەت باقی))
نە بارانتان دی، نە با ئەی فەقیر
نە لاوان کوژران بە گوللە و شەستیر
نە پێی نازداران خرایە زنجیر
((پەردە و تارای سور بەرن بۆ ئەمیر

بڵێن دوای کوشتار هێشتا تۆی دڵگیر؟))
هاوار بەماڵم چیمان پێ کرا
لە چارەکێکا صەدمان لێ خرا
هێشتا خەڵاتیان ئەکەن بە بەرا
((دەک خەجاڵەت بن لە روی مەحشەرا
ئێمەش خاکی غەم ئەکەین بە سەرا))
قەت وا تێ نەگەن چاومان شکاوە
کوشتن و بڕین دائیم بۆ پیاوە
لەناو دۆشەکا کەی حەق سەنراوە؟
((خەیاڵتان خاوە، کورد نەفەوتاوە
بەراتی نەجات بە خوێن نوسراوە))
میللەت مەتینە عەزمی نانەوێ
لە غایەی بەرزی خۆی هەر ناکەوێ
لەت و پەت کرێ حوقوقی ئەوێ
((من رەنگی سورم بۆیە خۆش ئەوێ
مژدەی شەفەقی لێ دەر ئەکەوێ!))

سلێمانی 1931

**حەمدی**

بۆ هەوا ئاڵۆزە بۆچی لێڵ و سورە ئاسمان؟
گێژەڵوکەی نەگبەتە یا فیتنەیی ئاخر زەمان
هەوری قەهری مەوجی دەریایی غەضەب دێنێتە جۆش
یا فوغان و دوکەڵی ئاهی هەناسە سەردەکان
رەنگی گوڵ بۆچی پەڕی، بولبول دڵی بۆچی شکا؟
ناکرێ ئەوەڵ بەهاری شادمانی بێ خەزان
بەفرە باریوە لەسەر بەختی ڕەشی خاکی وەتەن
یا بەدەم شەصتیرەوە مێشکی هەزارانە پژان
بۆ وەتەن زەرد هەڵگەراوە بەرگی سورە شین ئەکا؟
رەنگە ئەشکالی شەهیدی بێ نەوامان دانیشان
وەک برێشکە قرچە قرچی جەرگی سک سوتاوە دێ
یا گوڕەی مەترە لۆزە قرمە قرمی طۆپەکان
ئەم هەمو لاوە نەمامن نێژران لەم باغچەیە
ریشەی کوردایەتی بو یەعنی بۆمان نێژران
جەژنی قوربانە سلێمانی بە مەزبەح دانرا
کورد مەڕن بۆیە بەجارێ هەر لەوێدا سەربران
یان کە ئیبلیسی (علیە اللعنە) قاورمە بکا

کۆمەڵی ئینسان بەجارێ وائەبێ بکرێن لە جان
بۆ شەریفی کورد خەڵاتە هاتوە سەر تا بەپێ
یا کەلەبچەی دەست و طه وقی گەردن و پێوەندیان
بۆچ مەغۆل هەڵساوە یاخو دەوری نەحسی جەنگیزە
قەتڵ و عامی ئەرمەنە یا حادیثەی ڕۆم و بەبان
ناوی خۆی نابو زەمانی میللەتی کورد خۆ ژیان
بۆچی بەستراوە زمانی وادەبێ ئاخر زەمان
بۆ نەبو قەط ئەهلی حاڵێ دەربارێ بۆ نیە
ئەم وقوعاتە چ بو بۆچی کرا بیکا بەیان
چا وەطەن فەرموی لە پەردەی سینەما وەک (سینەما)
صورەتی گیراوە فەرمو بۆت بکا یەکسەر عەیان
جارێ تەئریخی بنوسە جا بگۆڕە قافیە
تا بەیاناتم بنوسێ لێت نەبێ حەرفێ نیهان
بێ هەزار ناوی سلێمانی بە تەئریخ (مشهد) ە
ئەم حسابە عاقیبەت ڕۆژێ دەبێ بیکا زەمان
مەقسەدی ئەصلی و ئەساسی هەر دوعاکەی پێشوە
ئێستە تیکراری بکە بەڵکە بکا مەبحەث ڕەوان
ڕەبی موی لێ بێ زمانی و پەنجەکانی هەڵوەرێ
هەرکەسێ گوڵشەن بە دەردی گوڵخەنی دۆزەخ بەرێ

**گۆران**

"بە یادی شەشی ئەیلول، شەڕی بەر دەرکی سەراوە"
هەزارو نۆصەدو سی بو، شەشی ئەیلول کە ڕۆژ هەڵهات:
غریوی ویستنی حەق کەوتە ناو شاری سلێمانی؛
(هەڵۆ بەگ) ئەو جوانەی پڕ دڵی بو بۆ وەتەن ئاوات،
لە پێش جەمعێکەوە تا بەرسەرا ڕوی هەڵمەتی هانی.
لەگەڵ یارانی ئەیوت: "ئەی حوکوومەت! تا نەکەی تەثبیت
حوقووقی کوردەواری، نایەوێ کورد ئینتیخاباتت؛
ئەوانەی بانگ کراون و تۆ بە بەقووەت دەوریان ئەگرت:
دەنی‌و قانزاج پەرستن، هیچ نەبێ پێیان موبالاتت!
ئەوانە کەی لە میللەت بون هەتا تەمسیلی ڕەئی کەن؟
حوکوومەت! ئێمە کوردین، وا ئەڵێین: "نامانەوێ نوواب
کە داوێنی غەرەز بگرن بە هەردو دەست، وەتەن بەردەن!
نەکی، مەشرووع نییە.. دەرکە لەسەر سەودایی ئینتیخاب!.."
ئەمە جوملەی قسەو ئامالی یارانی هەڵۆ بەگ بو،
نە نامەشرووعی تیا بو، نە تەجاوز بو بە ئەمنییەت..

کەچی عەسکەر بە مەترالیۆزەوە بۆ قەتڵی عام دەرچو؛
درایە بەر شەقەی شەستیر رجاو ئامالی میللییەت!
شەقەی شەستیرو قرچەی دەستریژو هەڵمەتی سونگی
بە خوێنی وردی بێ تاوان شەپۆلی خستە سەر جادە:
ئەما جوانێ کە سونگی ئەیسمیێ صەد کەرەت سنگی،
ئەما پیرێ لە ریزی گوللە بوبێ قەلبی ئازادە!...
هەڵۆ بەگ گوللەیی ئەووەڵ لە رانی دا، دوەم دەستی:
کە خۆی و قەومەکەی وادی، بە چەشنی شێر نرکانی،
پەلاماری کە دا بۆ ضابطـــێ: یەک زللە خپ خستی..
دەمانچەی سەند لە دەستیو ئاگری دا تاوەکوو توانی...
بەڵام فیشەک نەما، هەر ضابط و یەک دو نەفەر کەوتن..
لە پاشا عەسکەریش دەستریژی لێ کردو بەلادا هات؛
لەسەر دەریای خوێن بو کەشتیی عومری بەرەو مردن
ئەچو، ئەیوت: خوا حافیظ، ئەوا ئەمرم وەتەن! هەیهات،
لە باوەشتا پشووی عومرم نەدی تاوێ بە سەربەستی،
هەتا مردن زرەی زنجیری دیلی بو لە گەردنما،
ژیانم عارو نیللەت بو لەژێر پێڵاوی دوشمنما،
بە خوێن بێ و، گڵ هەڵی لووشێ، کەوابێ، هەیکەلی هەستی!...
خواکەی بولبولی باغی سەرا!.. هەرچەندە پاییزە،
بەخوێنی خۆم گوڵت بۆ ئاو ئەدەم، سا بۆم بلاوێنە!
لەگەڵ ئەو جوانە پاکانەی لە دەورم مەیتیان ریزە
لە خوێنا وێنە شێواوین، بە دایکمان بناسێنە!...
بڵێ بەو بوکی تازەی یەک شەوەم گەر هاتە سەر نەعشم،
نەڵێ خۆی بۆ وەتەن کوشت و لەرێی عەشقی منا نەژیا..
وەزیفەم بو لە پێناوی وڵاتێکا سەرم بەخشم:
کە تۆی پەروەردە کرد بۆ من لە داوێنی چیا و کەژیا!...
ئەگەر خوای گەورە بەخشی پێت هەتیوێ، پێی بڵێ: رۆڵە
لە من فرمێسکی ویست باوکت، لە تۆش داوا ئەکا تۆڵە!

هەڵەبجە. ئەیلوولی 1932

**شێخ سلام: بۆ کۆمەڵی ئەقوام (عصبة الامم) تەرجیع بەند**

**-1-**

(عصبة الامم) کۆمەڵی گەورە
بە پێچ و پەنا، بە فێڵ و دەورە
لە دور بە دور بۆ حەقی کوردان
تەکانت ئەدا خۆت دائەشرنگان

به جۆش و کوڵ بوی بۆ کوردی هەژار
ئەتگوت ئەم قەومە ئەکەم رستگار
لوجنەی ئینتیداب مەرەخەسی هات
گەرا کەشفی کرد سەراسەر وڵات!
ئەگەر راست ئەکەی هەڵی سورێنە
بەس بۆ سیاسەت هەڵمان پەرێنە
تەریق نابێتۆ تۆ چیت پێ ئەکەن
(کوتەکی دەستی میستەر هەندرسن)

-2-

بۆ ئەقەلیات کەوتیتە سەما
خزمی نەستووریت لە کوێ بنیات نا؟
هەر بە هیچ و پووچ بەم دەنگو باسە
تۆ خوێنی کوردت بۆ کردە کاسە؟
هەر چوار دەورمان لێ بو بەدوژمن
ئێران و تورک و....
نفووسی ئێمە کەم ئەکەیتەوە!
وەها نەستووری رێک ئەخەیتەوە؟
لە عدالەتا کەی ئەمە دەبە؟
یاخو هەر شێوەو ئوصووڵی غەربە!
کۆمەڵی درۆ، جیگەی مەکرو فەن
(کوتەکی دەستی میستەر هەندرسەن)

-3-

خۆ تۆ وەصی بوی، ئەقوام بون هەتیو
دەمی کوردت کرد بە تەڵەی تەقیو
غایە ئاسوری ناوی کورد بردن
لایەق بە خۆتە پێچ و ناو ئاخن
تا تۆ نەگەرای بە ناومانا
دەستمان گرتبو بە کڵاومانا
بۆچ کوردت فەوتان بەم بەنوباوە
ئێستەش لە جێنوە خۆت مەڵاس داوە
مەنشەئی فیتنە کۆمەڵی تەزویر
وا ئەدەی حەقی ئەقوامی (صغیر)؟
کارخانەی فەساد کۆمەڵی میحەن
(کوتەکی دەستی میستەر هەندرسەن)

-4-

لە عەدالەتتان واقم وڕماوە
لە سیاسەتتان سەرم سووڕماوە
خوێنی ملیۆنێ کورد ئەڕژێنێ
بۆ ئەوەی تۆزی تورک بترسێنێ
خوێنی مەزڵومی کوردی روت و قووت
حەڵاڵە لەلای.....
لە سلێمانی جادەی بە ر سەرا
بە خوێناوی کورد ئاوڕشێن کرا
تۆ نەبی نایکا دوژمن بە دوژمن
حەق بۆ نەستووری ئێمە بۆ کوشتن
چۆن عاجز نابی لەم خوێن ڕشتنە
لەلای تۆ ئەڵبەت حقووق کوشتنە
ناترسی تەئریخ لەعنەت بکەن
(کوتەکی دەستی میستەر هەندرسەن)

**بێکەس: ئەی وەتەن**

ئەی وەتەن مەفتوونی تۆم و شێوەتم بیر کەوتەوە
وەختی بەندیی و ئەسارەت، پێ بە تەوق و کۆتەوە
من لە نیکرو فیکری تۆ غافڵ نەبوم وا تێ نەگەی
حەپس و تێهەڵدان و زیللەت تۆی لە بیر بردۆتەوە
بەو خودایەی بێ شەریک و لامەکان و واحیدە
عەشقی تۆ نەوعێ لە دڵما ئاگری کردۆتەوە
ئاگرێکی وا هەزارساڵ ئاوی بڕژێنیتە سەر
قەت. نەگرو گڵپەو بڵێسەی تا ئەبەد نەکوژێتەوە
باسی مەحزونیو کەساسیی خۆت نەکەیت توخوا وەتەن
چونکە بەو باسە برین و زامەکەم ئەکولێتەوە
ماتەمینی تا بەکەی، دەی پێ کەنەو سەر هەڵبڕە
موفتەخیر بە شوهرەتت وا عالەمی گرتۆتەوە
نەگبەتی لاچو سەعادەت بۆتە پشتیوانی تۆ
کەوکەبی بەخت و فریشتەت بەرزە ئەدرەوشێتەوە
گەرچی بەینێکە زەلیل و دیلی دەستی زاڵمی
نۆبەتی شادیتە ئەمجا ناحەزت بتلێتەوە
لافی میللی یەت بەدەم لەم عەسرەدا کەڵکی نییە
رۆژی هەوڵە هەر بەهیممەت گۆی هونەر ئەبرێتەوە
بێ قسورە چەند جەسورە صەد شوکر ئەولادەکەت

وا لە ڕێی تۆدا لە خوێنا سەیری چۆن ئەتلێتەوە
بەسیە طەعنەم لێ مەدە هەر ڕۆڵەکەی جارانتم
هێندە حیلمت بێ هەتاکو دەست و پێم ئەکرێتەوە
شەرتە شەرتی پیاوەتی بێ گەر خودا دەستم بدا
دوژمنت پەت بکەم وەکوو سەگ بیخەمە ژێر پێتەوە...

**ئەخۆل: ئەیلولی خوێناوی**

بەجارێ ماڵی وێرانم سلێمانی خرۆشاوە
بەسەر هیچ کەس نەیە خوایە ئەوەی لەم شارە قەوماوە
بەیانی بوو شەشی ئەیلوول لەناکاو گوللە وەک باران
ئەباری بۆ قڕی میللەت، ئەوی پیرو ئەوی لاوە
بەدەم شەستیرەوە لاشە وەکو زۆربەی گەڵاڕێزان
لە ڕێدا عەینی ئەتوت بەردەبازی جۆگەلەی ئاوە
لەبەر دەرکی سەرا دیارە لە هەر لایەک تەماشاکەی
سەراسەر پڕ لە لاشەی مردوە شێلراوە کوژراوە
لەهەر کووچەو پەنایەک دا تەڕیو سوریت ببینیایە
ئەوە خوێن و سروشکی دایک و جوانان بو کە ڕێژراوە
لەکام ماڵ گوێت ئەگرت هەر باوکە ڕۆ بو ڕۆڵە ڕۆو کاکە
لەکوێ سەیرت ئەکرت لاشەیە و تێکەڵ بە خوێناوە
ئەوەی دوێنێ جگەر گۆشەو عەزیزی باب و دایک بو
ئەوا ئەمڕۆ لەژێر خاکا شەهیدە بوو چاوی لێک ناوە
دەمەو ئێوارە ئەتروانی بە وێنە ی ڕێچکە ی مێرووله:
بەریز تابوتی کوژراوان بەرەو سەیوان ملی ناوە
چەقینێکە چە زولمێکە؟ چە کوشتارو برینێکە؟؟
ئەبێ قەت بیر نەچێ هەرگیز هەتا کورد زیندوەو ماوە

## 3. تێهەڵچونەوەی شێخ مەحمود

### 3. 1. هەوڵدانی ئینگلیزی-عیراقی بۆ بێلایەن کردنی

تا ئەو کاتە شێخ مەحمود لەسەر سنوری ئێران لە گونـدی پیـران بـە گۆشـەگیری دانیشـت بـو، شـێخ مەحمود دەستی لە روداوەکەی بەردەرکی سەرای سلێمانی‌دا نەبو. هەروەها لە چالاکی‌یەکانی هەیئەتی وەتەنیـەو جموجۆڵی ئەو رۆژانەدا بێ دەنگ و تەماشاکەر بو. مەیدانی بۆ ئەوان چۆڵ کرد بو بـە شـێوەی خۆیـان کـار بکەن و دەستی نەئەخستە کارەکانیانەوە.

دوای کوشتاری 6 ی ئەیلول، کەسوکاری هەندێ لە کوژراوەکان، جلی خوێناوی کوژراوەکانیان برد بـو بۆ شێخ مەحمود و داوایان لێ کرد بو تۆڵەی خوێنی بە ناهەق رژاوی کورەکانیان بسێنێتەوە. دیارە حکومەت بەم هاندانەی زانیوە، بۆیە وەزیری کاروباری ناوخۆی عیراق 4 رۆژ دوای روداوەکە، نوسـراوێکی ئاراسـتەی شێخ مەحمود کردوە. داوای لێ ئەکا کە بە درۆ و دەلەسەی ئەوانە فریو نـەخوا، کـارێ نـەکا پێچەوانـەی ئـەو بەڵێنانە بێ کە لە 1927 دا بە حکومەتی داون.

مەندوبی سامی و کاربەدەستانی عیراق داوایان لە شێخ مەحمود کرد دەسـبەجێ ئـەرزی عیـراق بـەجێ بهێڵێ و بگەرێتەوە ئەو گوندەی لە ئێران لێی دانیشت بو. لە هەمان کاتدا هەڕەشەیان لـێ کردبـو کـە ئەگـەر گوێرایـەڵی فەرمانـەکانی حکومـەت نـەبێ، (ئیجرائـات) ی بەرامبـەر وەر ئـەگیرێ. هـەروەهـا هەڕەشـەیان لـە دێهاتەکان کرد هەر دێیەک یارمەتی یا داڵدەی بدا، بۆردومان ئەکرێ.

شێخ مەحمود گوێی نەدایە ئەم هەڕەشانە، درێژەی دا بە جوڵانەوەکەی. پیرانی بەرەو شاربازێر بـەجێ هێشت و، کەوتە خۆپیشاندانی چەکدار و چالاکی سیاسی. دەستی کـردەوە بـە پێوەنـدیی فـراوان لە گـەڵ سەرانی ئێڵەکانی کورد و داوای لێ کردن بۆ سەندنی مـافی کـورد هاوکـاری بکـەن، بـەوەی پـاڵ بدەنـە پـاڵ جوڵانەوەکەیەوە، یان بەوەی مەزبەتە بنوسن بۆ کۆمەڵەی گەلان.

سێ ئەفسەری کورد: مەحمود جەودەت، حامید جەودەت، کامیل حەسەن، ریزی جەیشی عیراقی و، هەندێ لە قوتابی و گەنجـەکانی سـلێمانی شـاریان بـەجێ هێشـت و دایانـە پـاڵ جوڵانەوەکـەی شـێخ مەحمود.

### 3. 2. چالاکی‌یەکانی

شێخ مەحمود کەوتە خۆپیشاندانی چەکدار و کۆکردنەوەی هێز. لە هەمان کاتدا زنجیرەیەک نامەی نوسی بۆ موفەتیشی ئیداری سلێمانی، بۆ مەندوبی سامی بریتانی لە بەغداد و بۆ کۆمەڵەی گەلان.

لە نامەکانی‌دا باسی کوشتارەکەی سلێمانی و، گرتنی رۆشنبیر و ئەشرافی کورد و رەفتاری خراپی حکومەتی عەرەبی ئەکا. داوا ئەکا داوودەزگای مەدەنی و سپایی عەرەب لە زاخۆوە هەتا خانەقین بکێشرێتەوە، کاروباری ناوچەکە بدرێتە دەس حکومەتێکی کوردی لەژێر چاودێری بریتانیا یان هەر ئەندامێکی تری کۆمەڵەی گەلان. گرنگترینیان ئەو نامەیەیە کە بۆ کۆمەڵەی گەلانی ناردوە.

### 3. 3. لەشکرکێشی‌ی عیراق

### 3. 3. 1. هەڵوێستی بریتانی

ئەنجومەنی وەزیران بڕیاری‌دا بۆ سەرکوتکردنی شێخ مەحمود لەشکرکێشی بکات. داوا یشی لە بریتانیا کرد یارمەتی بدا. جەیشی عیراقی و پۆلیسی لیڤی لە شارباژێڕەوە دەستیان کرد بە پەلاماردانی و هێزی ئاسمانی بریتانیا یش کەوتە هێرشی ئاسمانی بۆ سەر ئەو دێیانەی کە هێزەکانی شێخی لێ بو. نائارامی ناوچەکانی پێنجوێن، چوارتا، هەڵەبجە، شارەزور، دۆڵی سورداش، دەربەندیخان، قەرەداخ... گرتەوە. بەم لەشکرکێشییانە نەیانتوانی شێخ مەحمود بگرن یا شکستی پێ بدەن، چالاکی‌یەکانی درێژەیان کێشا.

لە 12 ی کانونی دوەمی 1931 دا لە بارەگای مەندوبی سامی بریتانی لە بەغداد، بە ئامادەبونی نوری سەعید، کۆنفرەنسێک بەسترا کە مەندوبی سامی، مێجەر یۆنگ، کۆرنوالیس و هەندێ ئەفسەری بریتانی بەشداری بون. ئەگەرچی بیرورای نوری سەعید و مەندوبی سامی سەبارەت بە سەرکوتکردنی شێخ مەحمود یەک بو، بەڵام لەسەر جۆری رەفتار لە گەڵ کێشەکەدا جیاواز بو.

ئەندامێتی عیراق لە کۆمەڵەی گەلاندا، بوبو بە گرێیەکی دەرونی سیاسی‌یەکانی عەرەب لە عیراق دا. پێیان وابو بەمە دەرگای بەهەشتیان بۆ ئەکرێتەوە. لە بەر ئەوە لە هەمو گفتوگۆکانیاندا لە گەڵ ئینگلیز، هەمیشە ئەم باسەیان وەکو یەکێ لە باسە سەرەکی‌یەکانی خۆیان ئەهێنایە کایەوە. ئینگلیز خەریک بو رێگەی بۆ عیراق تەخت ئەکرد ببێتە ئەندامی کۆمەڵەی گەلان، بۆ ئەمە یش ئەبو ئەو گرەنتیانەی بە کورد درا بون، جێبەجێ بکرێن. کاربەدەستانی ئینگلیز بۆ ئەوەی ناوبانگی عیراق لای ئەندامانی کۆمەڵەی گەلان نەشێوێ و، پەلامار دانی شێخ مەحمود نەبێتە هۆی تاوانبار کردنی حکومەتی عیراق بە "سەرکوتکردنی هەستی نەتەوەیی کورد" و تەگەرە لێدانی ئەندامێتی‌یەکەی، ئەیان ویست حکومەتی عیراق لە پاڵ لەشکرکێشی‌دا بۆ سەر شێخ مەحمود، هەندێ هەنگاو یش لە بواری سەلماندنی مافەکانی کوردا بنێ، بەتایبەتی ناسینی رەسمی‌ی زمانی کوردی. نوری سەعید و هاوبیرەکانی پێیان وابو ئەمە هاندانی کوردە!

### 3. 3. 2. راستکردنەوەی رەئیەکی چەوت

(عبدالرزاق احمد النصيري: ل239) لە نامەی ماجستێرەکەی‌دا نوسیویتی: نوری سەعید داوای لە بریتانیا کرد هێزی ئاسمانی بەکار بهێنێ دژی شێخ مەحمود، بەڵام بریتانیا خۆی گنخاند تا لە 24 ی ئازاردا عیراق رێکەوتنی ئیمتیازی نەوتی مۆر کرد، ئینجا هێزی ئاسمانی بریتانیا لە 28 ی ئازاردا کەوتە پەلاماردانی شێخ مەحمود. ئەم بۆچونەی نوسەر راست نیە. چونکە:

1. هەر لەو کاتەوە کە شێخ مەحمود پیرانی بەجێ هێشت، کاربەدەستانی بریتانی چ موفەتیشی ئیداری سلێمانی و چ مەندوبی سامی لە بەغداد گەفیان لێ کرد. داوایان لێ ئە کرد پێ نەنێتە ئەرزی عیراقـەوە و دەس نەخاتە کاروباری حکومەتەوە. هەر لەسەر ئەوە یش ئامادە نەبون هیچ نامەکارییەکی لە گەڵ بکەن.

2. لەشکرکێشیی عیراق بە پێی راگەیاندنـە رەسـمییەکانی (ملاحظیـة المطبوعـات) لـە 8 ی تشـرینی دوەمی 1930 ەوە دەستی پێ کردوە، ئەگەرچی بەپێی راگەیاندنەکانی دواتر راونان بەردەوام بوە، بـەڵام بـە هۆی خراپی هەوای زستان و سەختی ناوچەکەوە پێشکەوتنێکی ئەوتۆیان بـە دەس نـەهێناوە. رەنگـە فرۆکـە یش هەر لە بەر ئەو هۆیە، یاخود لەبەر نەگونجاوی پلانە جەنگییەکانی جەیشی عیـراق، بەشـداری نـەکردبێ. ئەگینا لە مانگی یەکەمیساڵی 1931 ەوە هێزی ئاسـمانی بریتـانی چالاکانـە بەشـداری شـەڕەکانی کـردوە (بڕوانە بەڵگەی ژمارە 7 ی بەڵگەکانی ئەم بەشە)

3. نوری سەعید لەکاتی گفتوگۆکانیدا لـە تورکیـا لـە ئـەیلولی 1930 دا کـە گلـەیی دواکـەوتنی ئـەو رێکەوتنە نەوتییەی لێ ئەکەن، ئەڵێ 10 قاتی ئێوە ئێمـە پەلـەی بەسـتنیمانە. لـەو کاتـەدا شـێخ مـەحمود بـە گۆشەگیری دانیشت بو.

### 3. 3. 3. دەنگدانەوەی لە کابینەو پارلەماندا

کێشەی شێخ مەحمود بو بە گرنگترین پەژارەی حکومەتی عیراق. بەشی چاپەمەنی راگەیانـدنی لەسـەر جوڵانەوەکانی جەیش بڵاو ئەکردەوە. رۆژنامەکانی بەغداد لێی ئەدوان. ئەم باسە لە ئەنجومەنی وەزیران و لە مەجلیسی نواب و ئەعیان دا باس ئەکرا. هەردوکیان لەوە نائومێد بـون کـە کێشـەی شـێخ مـەحمود بـە شـەڕ کۆتـایی بـێ. ئەنجومـەنی وەزیـران لـە کۆبونـەوەی 24 ی 3 ی 1931 دا یـەکێ لـە بڕیارەکـانی کـە بـۆ چارەسەرکردنی ئەم کێشەیە دابوی، ئەوە بو: ئەو ناوچانە چۆڵ بکەن. مەلیک فەیسـەڵ ئـەم بڕیـارەی قوبـوڵ نەکرد، چونکە لای وابو بە نیشانەی لاوازی حکومەت لێک ئەدرێتەوە.

لە مەجلیسی ئەعیان یشدا کە داوای زیادکردنی بودجەی ئاسایش و سـازدانی چەنـد سـەد پۆلیسـێکی ئێسترسوار کرا، ئەگەرچی هەندێ لە عەینەکان لە هەڵوێسـت دا تونـدوتیژ بـون بـۆ دامرکاندنـەوەی هـەرچی خێراتری شۆڕشەکەی شێخ مەحمود، بەڵام هەندێکیان لایەنگری پیشاندانی نەرمی و چارەسەری کێشەکە بـون بە رێگای لە یەک گەیشتن. لەم بارەیەوە یەکێ لە عەینـەکـان وتویـەتی: "... یاخیبونەکـەی شـێخ مـەحمود لـە ناوچەکانی سلێمانیدا لەم پێـنج شـەش مانگـەدا روداوێـک نیـە ئـەمڕۆ قـەوما بـێ، بـەڵکو روداوێکـی کۆنـە و نەمانتوانیوە لەم کابرایە بسرەوێنین... من راستیی چۆنیەتی کێشەی ئەم کابرایە نازانم ئـاخۆ کێشـەیەکی شەخسییە یان سیاسی. ئەگەر کێشەکە سیاسییە تکا لە حکومەتی بەرێز ئەکەم لە گـەڵ ئـەم پیـاوە و لە گـەڵ ئەوانەی لەگەڵین لە یەک بگەن. ئەگەر کێشەی حقوقییە وەڵامی بدرێتەوە. تـا کـەی دەستەوسـان رابوەسـتین و ئەم پارەیە بە خۆرایی سەرف بکرێ. تکای خۆم لە حکومەت دوبارە ئەکەمـەوە ئـەم کێشـەیە تـاوتوێ بکـا، ئەگەر لە توانای حکومەتدا نیە بیکوژێنێتەوە با رای بگەیەنێ کە ناتوانێ".

عەین یَکی تر یش ئەڵێ: "... ناتوانم لە کێشەی شێخ مەحمود تێ بگەم. لە هەمو هەڵێکدا بەرگری ئەکا و هێمن ئەبێتەوە. پەیمانێ یا رێککەوتنی نەوت دێتە کایەوە، شێخ مەحمود رائەپەڕێ. بۆیە ئەبێ لە پێش هەمو شتێکدا شێخ مەحمود لە کۆڵ بکەینەوە، یا سەربەخۆیی بدەینێ یان راستەوخۆ یا ناراستەوخۆ لە گەڵی تێـک بگەین".

بەم پێیە ئەگەر شێخ مەحمود بیتوانیایە درێژە بە جوڵانەوەکەی بدا، لەوانە بو حکومەتی عیـراق ناچـار ببوایە نەرمی لە گەڵ بنوێنێ و، گفتوگۆی لە گەڵ بکا.

### 3. 4. گەلەکۆمەکێی سێ قۆڵی

ئێران لە 1929 دا بە ڕەسمی دانـی بـە دەوڵـەتی عیـراقدا نـا، پێوەنـدی دیپلۆماسـی‌یـان دامەزرانـد. بریتانیا نفوزی خۆی لـەلای ئێـران بـەکارهێنا بـۆ ئـەوەی هاوئاهـەنگی لە گـەڵ جەیشـی عیراقـی‌دا بکـا بـۆ سەرکوتکردنی جوڵانەوەکەی شێخ مەحمود. ئێران قایل بـو. بـۆ ئـەو مەبەسـتە موفەتیشـی ئیـداری هەیئـەتی ئەرکانی عیراق کە ئەفسەرێکی ئینگلیز بو، وە سـەرکردەی ناوچـەی رۆژهـەڵاتی جەیشـی عیراقـی، چـون بـۆ مەریوان. لە گەڵ فەرمانـدەکانی ئەرتەشـی ئێـران پێـک هـاتن کـە رۆژی 14 ی 4 ی 1931 لەشکرکێشـی‌ی هاوبەش دژی شێخ مەحمود دەس پێ بکەن.

ئەمە یەکەمین جار بو جەیشی عیراق و ئەرتەشی ئێـران هاوئاهـەنگی جـەنگی‌ی بکـەن. ئەمـە بـو بـە سەرەتایەک بۆ کاری لەوە دوایان. ساڵی دواتر کە ئەرتەشی ئێران چوە سەر جەعفەر سوڵتان، جەیشی عیـراق لەسەر داوای ئێران بۆ هاوئاهەنگی هێزی نارده سەر سنور بۆ ئەوەی رێگەی پەڕینەوەی لێ بگرێ.

### 3. 5. خۆبەدەستەوەدانی شێخ مەحمود: کۆتایی قۆناغێک

هەروەکو عیراق تەنگاو بوبو، شێخ مەحمود یـش گیروگرفتـی جـدی هـەبو. حیـزب یـا رێکخراوێکـی سیاسی نەبو پشتیوانی لێ بکا. دەوڵەتێکی دۆستی نەبو یارمەتی بدا یان لە سـەری هەڵبـداتێ. ئـەوەی هـەیبو هەر ناووناوبانگی خۆی و ئەو دەرامەتە داراییە کەمە بو کە هی موڵکەکانی خـۆی بـو. هێرشـی بـەردەوامی فڕۆکەکانی هێزی ئاسمانی بریتانی یش تەنگیان پێ هەڵچنی بو. ئەچو بۆ هەر کوێیەک لە کۆڵی نە ئەبونەوە. جوڵانەوەکەیشی لە ناوچەیەکی تەسکی سلێمانی‌دا قەتیس مابو. نەی تەنیەوە بۆ کـەرکوک، هـەولێر، بادینـان. تەنانەت شێخ ئەحمەدی بارزانی کە لەو کاتەدا حکومەتی عیـراق بـە یـاخی دا ئـەنا، خـەریک بـو رێوشـوێنی سـەرکوتکردنی دا ئـەنا، نـە هـیچ هاوکـاری یـان هاوئاهـەنگی‌یـەکی لە گـەڵی هـەبو، نـە ئامـانجی سیاسـی شۆڕشەکەیشی وەکو ئەو بو. ئەمانە سـەرەرای گیروگرفتـی لۆجسـتیکی، نـەبونی سـەرچاوەی چـەک و پـارە و خواردن.

شێخ مەحمود هێزەکانی گوێزایەوە گەرمیان. لەوەیش مەبەستی ئەوە بو گوشار بخاتە سەر کەرکوک و، ئەگەر بتوانێ کەرکوک بگرێ. هێزی ئاسمانی‌ی بریتانی بـێ پسـانەوە و، هێـزی زەمینـی‌ی جـەیش و هێـزی پۆلیسی سوارە و هێزی لیڤی بە دوایەوە بون. لە گوندی ئاوباریک فرسەتیان لێ هێنـاو پـەلاماریـان دا. شـێخ مەحمود لەم شەڕەدا نەک هەر شکا، بەڵکو لە مەسەلەی کاری چەکدار نائومێد بو.

هێزەکانی شێخ مەحمود لە گەڵ هێزەکانی عیراق و بریتانیا زۆر نابەرامبەر بون. جگە لەوە یش عەشایەری هاودەنگی شێخ وەکو بەڵێنیان پێدابو، بە دەنگیەوە نەئەهاتن. کەچی عەشایەری لایەنگری حکومەت کەوتنە چـەک هەڵگرتن دژی جوڵانەوەکە. شـێخ مـەحمود گەرایـەوە ناوچـەی سـنور، بـەڵام ئـەمجارە حکومـەتی ئێرانـی یـش هێزەکانی خۆی لە مەریوانەوە هێنا بوە سەر سنور، خۆیان ئامادە کرد بو بۆ لەشکرکێشی‌ی هاوبەش.

شێخ مەحمود کەوت بوە نێوان دو بەرداشەوە و بەرەنگاری بە بێهـودە ئـەزانی. بەتایبـەتی دوای ئـەوە لای وابو ئەو ئیتر ئەرکی نەتەوەیی خۆی بەجێ هێناوە، پەیامی گەلەکەی بە گەلانی جیهان گەیانـدوە، بڕیـاری خۆ بەدەستەوەدانی دا.

شێخ مەحمود کە لە مانگی ئەیلولەوە دەستی کرد بوەوە بە شۆڕشی چەکدار، لـە 13 ی 4 ی 1931 دا لـە پێنجوێن خۆی بە دەستەوە دا، هەر لەوێوە بە فڕۆکە گوێزایانەوە بۆ خواروی عیراق و لە سەماوە دایـان نیشـاند. بە خۆبەدەستەوەدانی شێخ مەحمود، ئیتر تۆماری خەباتی سیاسـی– چەکـداری کـورد لـەو قۆناغـەدا پێچرایـەوە. بانگی سەربەخۆیی کوردستان و داوای دامەزراندنی حکومەتی سەربەخۆی کوردی، بە یەکجاری خنکا.

**3. 6. بەڵگەکانی: تێهەڵچونەوەی شێخ مەحمود**

**3. 6. 1. بەشی نامەنوسیی نهێنی**

س ی 2980
ڕۆژی 10 ی ئەیلولی 1930
بەرێز جەنابی شێخ مەحمود
سڵاوو ڕێز

ئەبێ هەواڵی ئەوەتان پێ گەیشتبێ کە هەندێ نەزان لە شاری سلێمانی لە 6 ی ئەم مانگەدا بە بۆنەی هەڵبژاردنی هەیئەی تەفتیشیەوە ئەو دەستدرێژییەی لەلایەن ئەوانەوە کراوەتە سەر هێزەکانی پۆلیس و جەیش کە حکومەتی ناچار کردوە ڕێوشوێنی تەمێ کردنی ئەو ئاژاوەگێرانە دابنێ کە بەرپرسی ئەم کارە داخدارەن. هێشتا لێکۆڵینەوە لە گەڵ ئەوانی تریان بەردەوامە. ئاسایش لەپاش چەند دەقیقەیەک گەڕاوەتەوە شار و شتێ نەقاوماوە بیشێوێنێ.

پێیان ڕاگەیاندین هەندێ ئاژاوەگێڕ کە پیشەیان دروستکردنی گیروگرفتە، هەوڵ ئەدەن هەواڵ هەڵبیەستن و هانتان بدەن بۆ کردنی کاری پێچەوانەی ئارەزوی حکومەت و پێچەوانەی مەرجەکانی ئەو ڕێککەوتنەی لە 19 ی 1 ی 1927 دا لەگەڵتان کراوە. ئێمە باوەڕمان بە لێزانی و هەڵوێستی دروستتان هەیە. باوەڕ ناکەین شوێن هەوڵی هەندێ پیاوخراپ بکەون. بۆیە ئەم نامەیەمان بۆ ناردن داوای خۆ لادانتان لێ بکەین لە هەرشتێ کە هێمنیی و ئاسایشی گشتی تێک ئەدا و مەرجەکانی ڕێککەوتنی گۆرین هەڵئەوەشێنێ. بەمەش دڵسۆزی خۆتان بۆ حکومەت ئەسەلمێنن و بەڵێنەکانتان بەجێ ئەهێنن، لەگەڵ ئەوپەڕی ڕێزدا، وەزیری ناوخۆ جەمیل مەدفعی (عبدالرزاق الحسني: تاریخ الوزارات العراقیة، ص 74)

**3. 6. 2. وەزارەتی داخلیە**

ژمارە: س/ 2513
ڕۆژ: 20 ی 10 ی 1930
بۆ شێخ مەحمود ئەفەندی

بە پێی ئەو موقاوەلەیەی کە لە 1927 دا ئیمزاتان کردوە بۆ مەوادی خوارەوە تەعەهودتان کردوە:

1. خۆت و کوڕەکانت و ژنەکانت و فاتمە خانی خوشکت لە دێیەک دا دانیشن کە خاریجی حدودی عیراق بێت.

2. خۆت و ئەو کەسانەی لە فەقەرەی یەکەم دا زیکر کراوە، بێ ئیزن و موساعەدەی حکومەت داخلی مەملەکەتی عیراق نەبن.

3. نە خۆت و نە هیچ کەس لەو شەخصانەی لەسەرەوە زیکر کراون، بە هیچ نەوعێ نە لە لیوای سلێمانیو نە لە جێگایەکی تردا لە عیراق دا موداخەلەی ئیدارەی حکومەتی عیراق نەکەن. بۆ ئەم مەقسەدە خەڵقی تر تەشویق نەکەن و چە خۆت و چە ئەوان لە هەمو مەسائیلێکی سیاسیە کە عەلاقەی بە عیراقەوە ببێ، لە موداخەلە کردنی ئیجتیناب بکەن.

کەزالیکە موافەقەت کرا کە ئەگەر خۆت وە یا هەر کام لەو شەخصانەی کە بەحسیان کرا، لە هەر وەقتێک دا یەکێ لەم شەرتانەیان بەجێ نەهێنا، حکومەتی عیراق هیچ مەسئولییەتێکی بەسەرەوە نەمێنێ و هەر ئیجرائاتێ بە لازمی بزانێ بۆ ئیتیخاز کردنی سەربەست بێ.

ئەگەرچی لە 10 ی ئەیلول دا لە تەرەف فەخامەتمەئاب موعتەمیدی سامی و وەزیری داخلیەوە ئەو تەعەوهدانەی کە داوتانە بە حکومەتی عیراق هێنرایەوە بیرتان، ئەگەرچی تەوصیە کران لە کەمالی سکونەت دا لە دێی پیران دا بمێننەوە، ئێوە گوێتان نەدایە ئەو ئیختارانە و بێ ئیزن داخلی خاکی عیراق بون.

دیسانەوە وەکیلی موتەسەرپیفی سلێمانی لە کاغەزی 18 ی ئەیلول دا ئیخباری کردن کە ئێوە موغایری ئارەزوی فەخامەتمەئابان مەندوبی سامی و وەزیری داخلیە حەرەکەت ئەکەن و شەرایتی ئەو ئیتیفاقنامەیەی کە ئیمزاتان کردوە، شکاندوتانە و بۆی نوسین کە بۆ ئەو دێیە کە خاریجی حدودی عیراقە. فەورەن عەودەت بکەنەوە و ئەو 3 زابتە کوردە کە لە جەیشی عیراق رایان کردوە و زانرا بو کە لەلای ئێوەن، تەسلیمیان بکەنەوە.

ئەم ئەوامیرەی کە وەرتان گرت، دیسانەوە خستانە گۆشەی نسیانەوە و لەو وەختەوە بەو غایەی کە شۆرش بەرپا بکەن، لە مەناتیقی لیوای سلێمانیدا ئەسورێنەوە.

لە 2 ی تشرینی ئەوەل دا تەکلیفی موفەتیشی ئیداری سلێمانیتان کردوە کە لە شارباژێردا مولاقاتتان بکا و موفەتیشی موما ئیلەیهی جوابی دانەوە کە لەبەر ئەوەی بەبێ ئیزنی حکومەت داخلی خاکی عیراق بون و لەبەر ئەوەی ئیتاعەتی ئەو ئیختارات و ئەوامیرەیان نەکردوە کە تەوجیهتان کراوە مومکین نابێ کە مولاقاتتان بکات و دیسانەوە تەبلیغتان کرا کە بێلا تەئخیر بۆ پیران بگەرێنەوە.

وا ئێستا عەینی ئەوامیرتان بۆ تیکرار ئەکەمەوە کە بۆ پیران عەودەت بکەنەوە و ئیختارتان ئەکەم بە گەیشتنی ئەم کاغەزە ئەگەر دەستبەجێ ئیتاعەتی ئەوامیری سالیفولزیکر نەکەن لە حەق خۆتان و ئەتباعتان ئیجرائات ئیتیخاز ئەکرێ و هەر ئەملاکێکتان لەم مەملەکەتەدا بێ موستەحەقی موصادەرە ئەبێ. وەزیری داخلیە. (ژیان، ژ262، 6 ی تشرینی دوەمی 1930)

### 3. 6. 3. ئیدارەی موعتەمیدی سامی لە عیراق

تاریخ 20 تشرینی ئەوەلی 1930

بۆ شێخ مەحمود ئەفەندی

سەلەفی من چەند کاغەزێکی لە ئێوەوە وەرگرتوە بەڵام هەتا لە خاکی عیراق نەچنە دەرەوە و ئەو تەعەهودانەی کە کردوتانە و لە ئیتیفاقنامەی ساڵی 1927 دا ئیمزاتان کردوە بە جێ نەهێنن پێم ناکرێ موخابەرەتان لەگەڵ بکەم.

دیارە دەرخاتری ئەکەن کە یەکێ لە شەرایتی ئیتیفاقنامەی مەزکور ئەوە بو کە بێ ئیزنی حکومەت داخلی عیراق نەبن و بە هیچ کلۆجێ دەخلتان بەسەر ئیدارەوە نەبێ کە حکومەتی عیراق لە لیوای سلێمانی وە یا لە جێگایەکی تری عیراق تەعقیبی ئەکات و بۆ مەقسەدێکی وەها کەسی تر تەشویق نەکەن و لە مەسائیلی سیاسیەی عیراق خۆتان دور بگرن.

ئێوە بەو ئیختاراتە کە تەوجیهتان کراوە ئیتاعەتتان نەکردوە و گوێتان نەداوەتە ئەو نەصیحەتانە کە لە تەرەف فەخامەتمەئابان و وەکیلی مەندوبی سامی و وەزیری داخلیەوە لە کاغەزی رۆژی 10 ی ئەیلولی 1930بۆتان نوسراوە و دیسان موخالەفەتی ئەوامیری وەکیلی موتەسەرپیفی سلێمانیشتان کردوە کە بە تاریخی 18 ی ئەیلولی 1930بۆی ناردون و لەو کاغەزەدا ئەمری پێ کردبون کە ئەبێ دەرحاڵ لە ئەرازی عیراق بچنە دەرەوە وا ئێستا منیش ئەمەوێ ئیشراکی ئەو ئەمرانە بکەم کە لە تەرەف وەزیری داخلیەوە بە ئێوە دراوە بۆ ئەوەی کە فەورەن لە خاکی عیراق بچنە دەرەوە و ئیتر واز لە موداخەلە کردنی ئوموری حکومەتی عیراق بهێنن و بەم واسیتەیەوە ئیختاراتان ئەکەم کە عەدەم ئیتاعەت بەم ئەمرانە ئەبێتە موجیبی عاقیبەتێکی وەخیمە بۆ خۆتان و تەرەفدارانتان. مەندوبی سامی عیراق.

(ژیان، ژ262، 6 ی تشرینی دوەمی 1930)

### 3. 6. 4. بەیاننامە بۆ کوردەکانی لیوای سلێمانی

بە پێی ئیتیفاقنامەیەک کە لە ساڵی 1927 دا ئیمزای کردوە شێخ مەحمود تەعەهودی کرد بـو کـە لـە دێیەک دا لە خاریجی حدودی عیراق دا ئیقامەت بکاو بەبێ ئیذنی حکومەتی داخلی عیراق نەبێتەوە و بە هیچ وەسیلەیەک نە لە لیوای سلێمانی و نە لە هیچ جێگایەکی تری عیراق دا موداخەلەی ئیـدارەی حکومـەتی عیـراق نەکا.

شێخ مەحمود ئەم شەرطانەی هەمو شکاندەوە و هەرچەند ئەمری پێ کـراوە کـە خـاکی عیـراق بـەجێ بهێڵێ ئیتاعەتی ئەو ئەمرانـەی نـەکردوە کـە دراوێتـێ و لـەم چەنـد هەفتـەی رابـوردوەدا لـە مـەناتیقی لیـوای سلێمانیدا دەستی پێ کردوە کە لە ضیدی حکومەت شۆڕش بەرپا بکا.

لەبەر ئەوە ئەمری پێ کراوە فەورەن خاکی عیراق بەجێ بهێڵێ و ئەگەر ئیتاعـەتی ئـەم ئـەمرە نـەکا لـە حەقی خۆی و ئەتباعی ئیجرائاتی لازمە ئیتیخاذ ئەکرێ.

بینائەن عەلەیهی وا ئیخطارتان ئەکەین کە هـەر کـەس پـەنا بـدا بـە شـێخ مـەحمود و ئـەتباعی وە یـا موعاوەنەتیان بکا خـۆی توشـی جـەزای شـەدید ئـەکا. 20 ی 10 ی 1930. (ژیـان، ژ262، 6ی تشـرینی دوەمی 1930)

### 3. 6. 5. بەیان لە (ملاحظیة المطبوعات) ەوە 12 ی 11 ی 1930

حکومەتی عیراقی هێزێکی جەیشی لە سلێمانی سازدا. ئەم دو رەتڵەی لێ رەوانە کردون: رەتڵـی ئـەلف بۆ پێنجوێن و رەتڵی ب بۆ چوارتا.

چەتەکان پێش گەیشتنی رەتڵی ئـەلف پـەلاماری مەخفـەری پێنجوێنیـان دا، بـەڵام کـوردە موالیـەکانی حکومەتی عیراق دەریان کردن. پـاش ئـەوەی رەتڵـی ئـەلف چەنـد رۆژێ لـە نزیـک چوارتـا راوەسـتا بـەرە و شوێنێکی نزیکی بەیانان لەسەر روباری سیوەیل کشا.

شەوی 8/ 9 ی 11 ی 1930 چەتەکان هێرشیان کردە سەر رەبیەیەکی مەعسـکەرێکی چەپـەک، ئـەو رەبیەیە بەرگرییەکی ئازایانەی کرد لە 6 کەس 5 یان بریندار بون بەڵام لە چەتـەکان 2 کـەس کـوژران و 2 کەس یش بریندار بون.

هەر دو رەتڵ رۆژانە لە ئاواییەکانی دەوروپشتی بنکـەکانیان دا خۆیـان پیشـان ئـەدەن و کارەکانیـان باش ئەڕوا و لەو پەڕی هیمەت و چالاکی دان. بنکەی هێزی ئاسمانی هاوکاری لە گـەڵ هـەردو رەتـڵ کـردوە. (نداء الشعب، ژ328، 14 ی 11 ی 1930)

### 3. 6. 6. راگەیاندنی رەسمی لە (ملاحظیة المطبوعات) ەوە

لە 18 ی 12 ی 1930 دا رەتڵێکی جـەیش شـێخ مـەحمودی لـە کانیـەکی نزیـک گونـدی حـاجی ئـاوا دەرکرد لە کاتێکدا جەیش فریای مەخفەری پۆلیسی سورداش کەوت لە 36 میل لە سەروی رۆژئاوای سلێمانی.

چەتەکان لە 3 ی 1 ی 1931 دا لە دەوری گوندی سەراوی نزیک هەڵەبجە بە ماوەی 37 کم و، لـە 9 ی 1 ی 1931 دا دەسـتیان بەسـەر مەخفـەری پۆلیسـی خورمـاڵدا گـرت و، لـە 10 ی 1 ی 1931 دا هەڵیانکوتایە سەر مەخفەری شانەدەری لە 5 کم سەروی رۆژهەڵاتی سەراو لەسەر رێگەی پێنجـوێن و، لـە 12 ی 1 ی 1931 دا رەتڵێکی جەیش چوە سەریان.

شەوی 14/13 ی 1 ی 1931 تاقمێ لە چەتـەکان کـە پێکهـاتبو لـە 50 کـەس پـەلاماری 3 رەبیـەی مەعسکەری رەتڵەکەی سەراویان دا، رەبیەکان راویان نان. شەوی 16/15 و 17/16 ی 1 ی 1931 تەقـەیان

لە معەسکەرەکە کرد، یەک سەرباز شەهید بو، یەکێک یـش لـە شۆڕشـگێڕەکان کـوژرا و چەنـد کەسێکیشـیان بریندار بو.

(مجلة لغة العرب، ج2، ساڵی2، شوباتی 1931، ل158)

### 3. 6. 7. **ڕاگەیاندنی ڕەسمیی 17 ی 2 ی** 1931

هێزی ئاسمانی بریتانی 9 جار بۆ پەلامار و نۆرین دەرچوە و، لەسەر داوای وەزارەتی دیفـاع ڕەفێـک لە فڕۆکەکانی بریتانیا بەستراوە بە ڕەتڵی جەیشی ناسراو بە ڕەتڵـی ڕوشـدی. ئـەم ڕەتڵـە بـە هـۆی خراپـی ئاووهەواوە لە 17 ی 1 ی 1931 تـا 21 ی 1 ی 1931 لـە سـەراو مایـەوە. هـەواڵ هـات شـێخ مـەحمود ئەیەوێ هەڵەبجە بگرێ، لە 21 ی 1 ی 1931 دا ڕەتڵەکە بـەرەو هەڵەبجـە جـوڵا و چەنـد پێکـدادانێ لە گـەڵ چەتەکان ڕوی دا. هێزی ئاسمانی لە چەتەکانی دا، یەکێکی لێ کوشتن و یەکێکی یشی لێ بریندار کردن.

لە ڕۆژانی 24 ی 1 تا 26 ی 1 لە ناوچەی سلێمانیو پێنجوێن دا بەفرێکی زۆر باری و لە ڕۆژی 26 ی 1دا ڕەتڵەکە بەرەو خورماڵ جوڵا و دەستی گرتەوەو هەوا خۆش بو، هەل لـەبار بـو بـۆ لـەناوبردنی شـێخ مەحمودو چەتەکانیو، ڕێوشوێنی تر دانراو هێزی جەیش و پۆلیس زیادکراو ڕەفێکی تری فڕۆکـەی بـەریتانی خرایە سەر ئەم ڕەتڵەو سەربازەکان لە خورماڵ مانەوەو ئەوی تری گەڕایەوە سەراوو شاملو. ئینجا لـە 1 ی 2 ی 1931 جەیش چـو بـۆ گونـدەکانی هـەورامان، هێـزی ئاسـمانی بـەریتانی کـەڵکێکی گـەورەی هـەبو بـۆ پاراستنی ڕێگەی هاتوچۆ لە نێوان هەر پێنج ڕەتڵەکەدا. چەتەکان بە شەو توانیان ڕو بکەنە پێنجوێن. جەیشی ئێران لە خواروی مەریوانەوە بەرەو ناوچـەی هـەورامان جـوڵا بـۆ گـەمارۆدانی شـێخ مـەحمود لـە 2 ی 2 ی 1931 دا.

(الاستقلال، ع 1359، 18 ی 2 ی 1931)

### 3. 6. 8. **بەیان لە (ملاحظية المطبوعات) ەوە** 18 **ی** 3 **ی** 1931

پلانێـک دانـرا بـۆ پارێزگـاری مەخفـەرەکانی پۆلیسـی هەڵەبجـەو خورمـاڵ. لـە 4 ی 3 ی 1931 دا ئەندازیاری ئەشغال کەلوپەلی پارێزگاری لە گەڵ خۆی لە سلێمانی هەڵگرت و بەرە و خورمـاڵ و هەڵەبجـە چـو 4 سیارەی سریەی ڕەشاشات ئەیان پاراست. قافڵەکە چو بۆ ڕۆژهەڵاتی هوانە، چەتەکانی شێخ پـەلاماریان دا. شەڕ 7 سەعاتی خایاند 1 زابت سەف شەهیدو 1 سەرباز زامار بو. قوەی سیارە بەرگرییەکی توندیان کـرد ئینجا قافڵەکە لە 5 ی 3 ی 1931 دا گەڕایەوە بۆ سلێمانی و ڕۆژی 7 ی 3 ڕەتڵەکە ڕوی کردە هەڵەبجـە، لـە لای خواروی ڕۆژئاوای گوندی وێڵەکەوە، دیسان قافڵەکـە گەڕایـەوە بـۆ سـلێمانی، لـە 10 ی 3 ی 1931 دا هێزی ئاسمانیی بریتانی لە ناوچەکە و ڕێگەی سلێمانی- هەڵەبجەی ئەنۆڕی لەو ڕێگەیەدا لە چەتـەکانی دا، لـە نزیک موانەوە شەڕێک بو. فڕۆکـەکان چەتـەکانیان لـە 9 ی 3 ی 1931دا لـە نـەوتی لـە دۆڵـی قـەرەداخ دا بینییو لێیان دان. (الاستقلال، ع 1565، 18 ی 3 ی 1931)

### 3. 6. 9. **ڕاگەیاندنێ لە (ملاحظية المطبوعات) ەوە** 22 **ی** 4 **ی** 1931

چەند کەسێ لە تیرەی شەرەفبەیانی کە عوسمان بەگ سەرۆکیانە، تەقەیان لە حەسحەسی پۆلیس کـردوە لە ناحیەی هۆرێن و شێخان لە خواروی چەمی سیروان و 1 پۆلیسیان کوشـتوە. عوسـمان بـەگ هـاواری بـۆ شێخ مەحمود بردوە. تاقمێ لایەنگری شێخ مەحمود بە یارمەتی ئەوان و هەندێ کەسی ئێڵی جاف چونەتە ناو ناحیەی هۆرێن و شێخانەوە و مەخفەری پۆلیسی بێلولەیان ئابڵۆقـەدا، کەوتنـە کۆکردنـەوەی بـاج لـە خـەڵک.

هێزی ئاسمانی لە بەغدادەوە نێردرایە سەر یاخیەکان، بەڵام توانییان خۆیان لە فڕۆکەکان رزگار بکەن بەوەی پەنایان بردە بەر دێهاتەکانی دەوروپشت.

لە 24 ی 3 ی 1931 دا بەیانێک بەسەر دێهاتەکان دا بەر درایەوە کە فڕۆکەکان بۆردومانی ئەو دێیانە ئەکەن کە داڵدەی یاخیەکان بدەن. لە 28 ی 3 ی 1931 دا فڕۆکەکان یاخیەکانیان لە گوندەکانی شاوازی، کانی ماران و نارین بەدی کرد و، راپۆرتەکانی مەخفەری پۆلیس یش بونی لەو دێیانەدا تەئید کرد و، بۆ ورياکردنەوەیان بەیانیان بۆ بەردرانەوە. خەڵک گوندەکانیان چۆڵ کرد و داوا لە عوسمان بەگ کرا خۆی بدا بە دەست حکومەتەوە بەڵام رەفزی کرد، فڕۆکەکان کاریان کردە سەر ورەی یاخیەکان کە لە ئەشکەوتەکان دا خۆیان شاردبوەوە، گەمارۆی مەخفەری بێلولە شکێنرا و، یاخییەکان لە ئەنجامی بەکارهێنانی هێزی ئاسمانیدا، نەیانتوانی ناوەندی قورسایی خۆیان بگوێزنەوە خواروی چەمی سیروان. (الاستقلال، ع1578، 3 ی 4 ی 1931)

### 3. 6. 10. راگەیاندنی رەسمی لە (ملاحظية المطبوعات) ەوە

1. راگەیاندنی رەسمیی رۆژی 11 ی 3 ی 1931 کە شێخ مەحمود پەلاماری ئەفسەری ئەشغالی گشتی دا لە نزیک موان لەسەر رێگەی سلێمانی بۆ خورماڵ و هەڵەبجە، لەبەرئەوە لە تواناداا نەما لەشکرکێشی دوا بخرێ.

2. لە ناوچەی سلێمانیدا جەیش لە گەڵ پۆلیسی سوارە کۆبوەوە.

3. لە بەیانی 28 ی 3 ی 1931 دا لەشکرکێشی دەستی پێ کرد. رەتڵێکی گەڕۆکی پۆلیس لە قەرەداخەوە شۆڕ بوەوە بۆ دۆڵەکەی رۆژهەڵاتی شاخی قەرەداخ کە شێخی لێ بو، مەفرەزەکانی پیادە لای خوارویان ئەپاراست. شێخ لە پەیکوڵی شەڕی کرد و بە شەو لە رێگەی شاخی قەرەداخەوە توانی هەڵێ. لە 30 ی 3 ی 1931 دا هێزی ئاسمانیی بریتانی شوێنەکەیان لە بانی قەرت دۆزیەوە، زۆر بە توندی پەلاماریان دا، بەڵام لە دەس دەرچو چونکە رەتڵی گەڕۆک بە شاخەکەدا نەیتوانی بگاتە پەیکوڵی بەرەو بانی قەرت. شێخ مەحمود لە گەڵ سەید محەممەدە بچکۆل کشایەوە بۆ ناو زەنگنە لە دەوری خان زورو ئیبراهیم خانچی.

4. قۆناغی دوەمی لەشکرکێشی سەعات 4:20 ی رۆژی 5 ی 4 ی 1931 دەستی پێکرد. ئەم رەتڵە گۆپتەپەی بەجێ هێشت بەرەو ناو زەنگنە کە شێخ مەحمودی تێدا بینرا بو. هێزی ئاسمانی بریتانی دیسان توانی شوێنەکەی بدۆزێتەوە و گەمارۆی بدا. رەتڵی گەڕۆک پێشرەوی کرد بەر لە 1500 لە گەڵ چەتەکان دا لەکەریم باسام لێکیان داو سەعات 1700 پیادە و سوارە هێرشێکی پیرۆزیان کردە سەر شێخ مەحمود و چەتەکان لە گوندی ئاوباریک. سێیەکی سوارە توانی لە خوارەوی گوندا جێگیر ببێ و فڕۆکەکانی هێزی ئاسمانی بریتانیش بە درێژایی هێرشەکە لە ئاسمانەوە بە ئاگرباران پشتیوانی سوارە و پۆلیسی ئەکرد. کاتێ تاریک داهات رەتڵەکە گەڕۆکەکانی قەڵای گوندیان بۆ نەگیرا بو کشانەوە دۆڵێکی سەروی دێیەکە، رۆژی دوایی رەتڵەکە توانی گوندەکە و قەڵاکەی بگرێ. تا ئێستا زیانی چەتەکان نەزانراوە کە ئەڵێن زۆر بوە. زیانەکانی ئێمە لەم هێرشەدا 1 کوژراو و 18 بریندار کە دوانیان ئەفسەرن.

5. لە 6 ی 4 ی 1931 دا رەتڵەکەمان گوندی ئاوباریکی گرت، کەوتە راونانی چەتەکان کە لە تاریکایی شەودا بەرەو لای رۆژهەڵات هەڵاتون. (الاستقلال، ع 1590، 16 ی 4 ی 1931)

## 3. 6. 11. بڕیاری ئەنجومەنی وەزیران لە ڕۆژی 24 ی 3 ی 1931 دا لەسەر کێشەی شێخ مەحمود

1. لەبەرئەوەی ئەو سیاسەتەی تا ئێستا جێبەجێ کراوە، نەبۆتە هۆی چەسپاندنی ئاسایش لە لیوای سلێمانی و، دابینکردنی ئارەزووەکانیان لە هێمنی و ئارامی‌دا کە ئەبێ ئەوانیش وەکو لیواکانی تر کەڵکی لێ وەربگرن، لەبەرئەوەی درێژەدان بەم سیاسەتە ئەبێ بە هۆی زیاد بونی پشێوی و، لە سۆنگەی تەماعی هەندێ کەسەوە ئەبێ بە هۆی باری قورسی ماددی و مەعنەوی و بە پێویست زانرا لەو لیوایەدا، بەڕێوەبەرایەتی عورفی لەو لیوایەدا ڕابگەیەنرێ و، بەڕێوەبەرایەتی شارستانی و سپایی بدرێتە دەس سەرکردەیەکی کارامەی سپایی، تا بە تەواوی کاری جەردەیی نامێنێ و ئارام و ئاسایش ئەگەڕێتەوە جێگەی خۆی.

2. ئەگەر بەڕێوەبەرایەتی عورفی ڕانەگەیەنرا، سەرکردەی سپایی باسکراو هەمو ئەو دەسەڵاتە جەزائی و مەدەنیانەی بدرێتێ کە لە نیزامی دەعوی عەشائیری‌دا هەیە، بە هەمو ئەو هۆیانەوە کە یارمەتی ئەدەن ئەرکەکانی بەجێ بهێنێ.

3. ئەگەر هیچ کام لەم دو ڕێوشوێنە پەسند نەکرا، لەباتی ئەوەی سامان و سەر بێ هودە بە فیڕۆ بدرێ، ئەنجومەن بە باشی ئەزانێ ناوچەی سلێمانی چۆڵ بکرێ، بە شێوەیەکی کاتی هێزەکانی حکومەتی لێ بکێشرێتەوە، تا ئەو کاتەی ڕێوشوێن دائەنرێ بۆ گێڕانەوەی ئاسایش و ئارامی بۆ لیوای ناوبراو. (عبدالرزاق الحسني: تاريخ وزارات العراق، ط 59 ص 133- 134)

## 3. 6. 12. دانیشتنی 548 می مەجلیسی نواب، ڕۆژی 29 ی 3 ی 1931

عیزەدین ئەلنەقیب (دیالە): پێش چەند ڕۆژێ مەجلیس خەرجی 2 لەک و 75 هەزار ڕوپیەی پەسند کرد بۆ خەرجی ئاسایش لە سنورەکانی سەرودا.

سەرۆک: ڕوی دەمی لە عیزەدینە، باسی (فەصلی 57 أ) ئاسایشی سنورەکانی خوارو.

حاجی سەلیم (بەڕێوەبەری گشتی پۆلیس): بێگومان بارودۆخی سنورەکانی خوارو باش بوە، بەڵام ئەکرێ دەس لە بادیە هەڵبگرین، دیسان عەشایەر پەلاماری یەکتری بدەنەوە.

سەرۆک: (فەصلی 75 ب) ئەخوێنرێتەوە، ئەڵێ: بۆ خەرجی سنورەکانی سەرو 275 هەزار ڕوپیە.

تاقمێ لە نائیبەکان داوای قسە ئەکەن.

**عیزەدین ئەلنەقیب** (دیالە): وتم مەجلیس خەرجی سنورەکانی لای سەروی پەسند کرد (کە 2 لەک و 70 هەزار ڕوپیە بو). ئەم خەرجانە یش وەکو زانیمان بۆ کوژاندنەوەی شۆڕش یان یاخیبون یان شەقاوەت، چۆنتان ئەوێ ناوی بنێن، یاخیبونەکەی شێخ مەحمود لە ناوچەکانی سلێمانی‌دا لەم پێنج شەش مانگەدا روداوێک نیە ئەمڕۆ قەوما بێ، بەڵکو روداوێکی کۆنەو نەمانتوانیوە لەم کابرایە بسرەوێنین... من ڕاستیی چۆنیەتی کێشەی ئەم کابرایە نازانم ئاخۆ کێشەیەکی شەخسیە یان سیاسی. ئەگەر کێشەکە سیاسیە تکا لە حکومەتی بەڕێز ئەکەم لە گەڵ ئەم پیاوە و لە گەڵ ئەوانەی لە گەڵین لەیەک بگەن. ئەگەر کێشەی حقوقیە وەڵامی بدرێتەوە تا کەی دەستەوسان ڕابوەستین و ئەم پارەیە بە خۆرایی سەرف بکرێ. تکای خۆم لە حکومەت دوبارە ئەکەمەوە ئەم کێشەیە تاوتوێ بکا، ئەگەر لە توانای حکومەت دا نیە بیکوژێنێتەوە، با ڕای بگەیەنێ کە ناتوانێ.

**صالح جەبر** (مونتەفیک): گەورەکانم! چەند ڕۆژێ لەمەوبەر وتمان سەرفکردنی پارەیەکی زۆر لە جەیش دا بە خۆرایی ئەڕوا. پێیان وتین نەخێر ئەو پارەیە لە جەیش دا سەرف ئەکرێ زەرورییە، وتیان جەیش خزمەتەکانی بە باشی ئەکا. حکومەت ئێستا بەم فەصلەدا داوا ئەکا هێزێکی تازە دروست بکا لە 500 ئێستر

سوار، داوای لێ ئەکرێ ئاسایش لە سنورەکانی سەرودا دابین بکا. لە ژمارەی ئەو یاخییانەمان پرسی کە ئاسایشی سنورەکانی سەرویان تێک داوە، وتیان ژمارەیان لە نێوان 400 تا 500 کەس دایە. مەبەست لە دروستکردنی هێزی 500 ئێستر سوار لەناوبردنی ئەم عەسابەیەیە. منیش ئەڵێم ئەگەر جەیش کە ژمارەی 10 هەزار کەس و پۆلیس کە ژمارەی 8 هەزار کەسە نەتوانن ئەم تاقمە لاببەن، چۆن ئەتوانین خۆمان قانیع بکەین کە هێزێکی وا بچوک ئەتوانێ ئەم عصابەیە لەناو بەرێ؟ جەیشێک چەردەیەکی زۆر پارەی تێدا سەرف ئەکرێ، نەتوانێ ئاسایشی سەرو دابین بکا ئێستا بیگۆڕین بە هێزێک پێی ئەڵێین ئێستر سوار.

**سەعد صالح** (دیوانیە): نامەوێ ئەو قسانە دوبارە بکەمەوە کە لەسەر بودجەی وەزارەتی دیفاع کردمن، بەڵام ئەمەوێ لە کێشەی شێخ مەحمود تێ بگەم کە ئاسایشی عیراق تێک ئەدا. لەهەر فرسەتێکدا عیراق هەنگاوێ ئەنێ بۆ پێشەوە، لە هەمو چورتمێکی سیاسیدا کە چاوەڕێ ئەکرێ عیراقی تێ بکەوێ، استغفراللەشێخ مەحمود بەم شەڕزەمەیەوە دێتە پێشەوە تەگەرە لە تەقەللاکانی حکومەت ئەدا. لە لیژنەی داراییدا لەسەر ئەوەی بە شۆڕشگێڕ ناویان ببەین، وتیان ئەوانە ئەشقیان. باشە با پێیان بڵێین ئەشقیا، ژمارەیان چەندە؟ وەڵامی دایەوە 400 یا 500. ئاخۆ ئەوانە هێزێکی نهێنیان هەیە یان ئەمە هێزە نهێنیە رواڵەتیەکەیانە.

ئەگەر ناتوانرێ ئەم هێزە رواڵەتیە لەناو ببرێ، هەمویش لایان وایە شێخ مەحمود پشت ئەستورە بە هێزێکی کە، جگە لە هێزی ئەمانە، کەواتە بەر لەوەی 2 لەک و 75 هەزار روپیە تەرخان بکەین بۆ دروستکردنی هێزی ئێستر سوار بۆ لەناوبردنی شێخ مەحمود، ئەبێ بیر لەوە بکەینەوە بە رێگەی سیاسی هێزە نهێنیەکەی لەناو بەرین. یان وەزیری دیفاع ئەبێ پێ لەوە بنێ کە ئەم جەیشە کارامە نیەو، بڵێن هێزەکەی شێخ مەحمود لە 400- 500 کەس زۆرترە و دەرەقەتی نایەین و پێویستیمان بە چەندین ئەستوڵ و لەشکری زل هەیە.

ناتوانم لە کێشەی شێخ مەحمود تێ بگەم. لە هەمو هەلێکدا بەرگری ئەکا و هێمن ئەبێتەوە. پەیمانێ یا رێککەوتنی نەوت دێتە کایەوە، شێخ مەحمود رائەپەڕێ. بۆیە ئەبێ لەپێش هەمو شتێکا شێخ مەحمود لە کۆڵ بکەینەوە. یا سەربەخۆیی بدەینێ یان راستەوخۆ یا ناراستەوخۆ لە گەڵی پێک بگەین. ئایا شێخ مەحمود تا هەتایە ئاسایش تێک بدا و هەر رۆژێ عیراق ئەچێتە پێشەوە، شێخ مەحمود بە دو دەستی ئاسنین ئەیهێنێتەوە دواوە. ئەمە کێشەی 400 ئێستر سوار نیە، بەڵکو کێشەی ژیانی وڵاتێکە. ئەگەر ئەتوانین لە ناوی بەرین، یان مافەکانی خۆی بدەینێ.

**سەلمان ئەلبەرراک** (حیللە): من چی لە دڵم دایە دەری ئەبرم و ئەڵێم هەمو ساڵێ حکومەت دێت و داوای خەرجی تازە ئەکا بۆ سنورەکانی سەرو بۆ تەمێ کردنی ئەشقیا، نازانم شێخ مەحمود جەردەیە و رێ ئەگرێ، شێخ مەحمود پێی ئەوترێ شۆڕشکار دژی حکومەتی عیراق. دوێنێ گەمارۆی زرێپۆشەکانی داین، ئەوەی کرد کە کردی. هەروەکو وەزیری دیفاع وتی هێزەکەی لە 400– 500 کەس تێ ناپەڕێ. ئەی ئێمە جەیشێکمان نیە 10 هەزار سەربازو 8 هەزار پۆلیس بە ئەفسەر و بەرێوەبەرەکانیەوە؟ ئاخۆ 500 پۆلیسی مەشق پێ نەکراو لە باتی ئەو هەزارانە 500 پۆلیس مەشق پێ نەکراو ئەهێنن و ئەڵێن وەرن بین بە سەرباز بۆ شەڕی شێخ مەحمود.. فەوجێ لە جەیشەکەمان بە 4 ئۆتۆمۆبیل و شەمەندەفەر بنێرین بۆ کەرکوک. لەبەر ئەوە پێویست بە پێکهێنانی پۆلیسی ئێستر سوار ناکا، چونکە چەکەکانیان تەسلیمی شێخ مەحمود ئەکەن.

حکومەت ئەبێ جەیشی بنێرێتە سەرو، من خۆم ئەکەم بە قوربانی ئەم جەیشە بۆ ئەوەی... هەمو ساڵێ بە میزانیەیەکەوە بێن. بەر لە دو رۆژ 102 لەک روپیەمان بۆ وەزارەتی ناوخۆ تەرخان کرد. جەیش چی کردوە ئەگەر مەسەلەکە پێوەندی بە شێخ مەحمود و ئەو 300 کەسەوە هەیە، ئەوا من بە فویەک ئەتوانم دەریان بکەم.

**ئەحمەد ئەلجەلیل** (موسڵ): ئەمە دە ساڵە روداوەکان دوبارە ئەبنەوە و دوبارە ئەبنەوە. کاتێ لە حکومەت ئەپرسین، ئەڵێن ئەوانە ئەشقیای یاخین ئەیانەوێ خەڵک لە پارە و کەلوپەل روت بکەنەوە. باوەڕم وایە روداوەکانی سلێمانی روداوی شێخ مەحمود نین...... دەسکەلایەکی روخێنەرە کە بێ شەرەفی بۆ لێدانی عیراق بەکار ئەهێنرێ. شێخ مەحمود کێشەی شۆڕشێکی سادە نیە، بەڵکو مەسەلەیەکە لەسەر رەفە دانراوە، هەر کات پێویست بو پێی ئەڵێن هەڵسە حکومەت دژێخی کردوە......

ئێمە لەبەر دەرگای چونە ناو کۆمەڵەی گەلان داین، شێخ مەحمود بەکار ئەهێنرێ یان بەکاری ئەهێنن بۆ ئەوەی بڵێن: عیراق هێمن نیە و پرێتی لە شۆڕش. ئەگەر حکومەت بیەوێ لەناوی بەرێ، ئەبێ بە تەجنیدی ئیجباری بیفلیقێنێتەوە. هەر یەکە لە ئێمە دەس بداتە چەکەکەی و دە ساڵ شەڕی ئەم شۆڕشگێڕە چارەڕەشە بکا. حکومەت گرتی و هێنای بۆ بەغداد، کەچی پێی وت بە سەلامەت برۆ، رۆیشت و شۆڕشی بەرپا کرد.

مەجلیس گوێ ی لە 3 لەک روپیە یا بە ملیۆنی نیە بۆ سەلامەتی عیراق. حکومەت چۆن لە گەڵ ئەم شۆڕشگێڕەی کە 400 کەس زیاتر هێزی نیە، گفتوگۆ ئەکا. من داوا لە حکومەت ئەکەم ئەو ئەندامە ببرێ کە کلۆر بوە یان سیل رزاندویەتی.

**موزاحیم پاچەچی** (وەکیلی وەزیری ناوخۆ): حکومەت سیاسی مەجلیس ئەکا سەبارەت بە بایەخ دانی بەم کێشەیە. لە هەمو دەوڵەتێکدا، چەند پێشکەوتو یش بێ، ئەم جۆرە جوڵانەوانەی تیا ئەقەومێ، لەلای حکومەتی عیراق گرنگ نیە. لام وایە برا کوردەکانمان لە سیاسەتی شێخ مەحمود رازی نین و لێی مورتاح نین. جەیش و پۆلیس خەریکی کارەکانیانن، ئەبێ ئەوە بزانن شێخ مەحمود شۆڕشەکەی لە وەرزی زستاندا دەس پێ کرد. ئەم وەرزە بۆ جەیش سەختە و رێگە و بانی وڵاتەکە یش سەختە. شەڕی عەصابات لەم جۆرە ناوچانەدا ئاسان نیە. ئەوەی نائیبی موسڵ وتی کە شێخ دەسکەلایە بە دەس هەندێ لایەنەوە هەر کاتێ بیەوێ بەکاری ئەهێنێ، من باوەڕ بەمە ناکەم. شێخ لە رابوردودا دژی عوسمانیەکان و بریتانیەکان و دژی عیراق هەستاوە. حکومەت هەندێ رێوشوێنی کاریگەری داناوە، ئەوەی ویستم بیڵێم لە کاتێکدا حکومەت لە ناوچەی سلێمانیدا لەباری سیاسیەوە مەبەستێکی تایبەتی بۆ ئەوەی تێکەڵ و پێکەڵی سیاسی ناو دەوڵەتان، پاش سێ چوار رۆژی تر ئەنجامەکانی لەم بارەیەوە ئەبیستن. شێخ مەحمود خوی بە شۆڕش و یاخیبونەوە گرتوە.
(جلسە مجلس النواب في 29 ی 3 ی 1931، ص671- 677)

### 3. 6. 13. تەبلیغی رەسمی:

ئەو ئالای سواری لەگەڵ قوەتی پۆلیس کە لەژێر قوماندەی عەقید (قائممقام) ئیسماعیل نامیق بەگ دا بو، لە تاریخی 5 ی 4 ی 1931 رویان کرد بوە ئیستیقامەتی دێی ئاوباریک کە ئیستخبار کرا بو شێخ مەحمود خۆی و ئەتباعی لەوێن و قوەتی مەزکورە دێی ئاوباریک ئیحاطە ئەکەن و لە تەرەف طەیارەشەوە موتەمادیەن ئەشقیاکان و دەوروپشتی جێی مەزکور بۆمباردومان ئەکەن. وە لە پاش نیوەڕۆوە هەتا تاریکە شەو بە شیدەت موصادەمە دەوام ئەکات. قوەتی جەیش بە دەرەجەیەکی کە شایانی ئیفتیخار بێت، ئیبرازی شەجاعەت و بەسالەت ئەکەن و لەم موصادەمەیەدا 4 عەسکەر و 1 ظابط شەهید و 14 عەسکەر و 1 ظابط بریندار ئەبێت.

تەلەفیات و خەسارەتی شێخ مەحمود جیددەن زۆر و بە دەرەجەیەک ئەبێت کە تەنها دێی ئاوباریک لە ئەشقیاکان 10 کوژراو، مەیتی دو کەس لە روئەسا کە یەکێکیان شێخ عەلی کوڕی رەحیم کە خزمی شێخ مەحمودە لە بەینی ئەم کوژراوانەدا دیتراوە.

وە لە رێگای کە ئەشقیاکان فیراریان لێ کردوە خوێنێکی زۆر دیار بوە کە دەلالەت لەسەر ئەمە ئەکات کە شێخ مەحمود تەلەفیاتێکی زۆری داوە و برینداریێکی زۆری لەگەڵ خۆی نەقڵ کردوە.

ئەو عەشائیرەی کە موعاوەنەتی شێخ مەحمودیان ئەکرد هەمو بڵاوبونەوە. ئێستا شێخ مەحمود تەنها لـە نەجات دانی رۆحی خۆی زیاتر شتێکی تر تەفەککور ناکات.

ئەمڕۆ مەوثوقەن زانیومانە کە شێخ مەحمود تـەنها لەگـەڵ 5 و 10 سـواریدا لـە شـاخی قـەرەداغ تـێ پەڕیوە.

قوەتی جـەیش و پـۆلیس بـۆ مـەحوکردنی شـێخ مـەحمود و ئـەتباعی بـە شـیددەت لـە تـەعقیب دایـە و مەحوکردنیان قەوییەن مەئموله. (ژیان، ژ 279، 16 ی 4 ی 1931)

### 3. 6. 14. شەشەمین کۆبونەوەی ئاسایی مەجلیسی ئەعیان

مـەحزەری 38 ەمـین دانیشـتن، رۆژی پێنجشـەممە، 14 ی 5 ی 1931 بەرامبـەر 26 ی زیحەجـەی 1349 ه.

سەرۆکی وەزیران: ئەگەر مەجلیسی بەرێز رێگە بدا، وتارەکەم بدەم دەربارەی روداوێ کە پەیوەندی بە یاخی شێخ مەحمود و سەرئەنجامی کارەوە هەیە.

دەنگەکان: باشە!

**سەرۆکی وەزیران:** گەورەکانم! ئەو کارانەی جەیشی عیراقی بـە هاوکـاری پـۆلیس و هێـزی ئاسـمانی ئەنجامیدا سەرکەوتنی تەواوی بەدەس هێنا. دوێنێ شەو شێخ مەحمود خۆی تەسلیمی سـەرکردەی حامیەکـەی پێنجوێن کرد بە چەند مەرجێ کە حکومەت بەسەریدا سەپاند بو. ئەو مەرجانە یش ئەوەیانی ژیانی پارێزراو بێ و هیچی تر. حکومەت نیازی وایە شێخ لە گەڵ خێزان و منداڵـەکانی بگوێزێتـەوە بـۆ شـوێنێ دور بـێ لـە دیجلە. بە زۆری شوێنی دانیشـتنی لەسـەر فـورات دیـاری ئـەکرێ. حکومـەت لـە هـەمان کـاتدا بیـری لـەوە کردۆتەوە، بۆ ئەوەی جارێکی تر نەگەڕێتەوە ناوچەکەی خۆی، قانونێ دابنـێ ئـەم کابرایـە تـا هەتایـە لـەوێ دابنیشێنێ، بە شێوەیەکی قانونی بهێڵرێتەوە لەو شوێنەدا. ئێستا حکومەت هـیچ قـانونێکی لەبـەر دەسدا نیـە جگە لە قانونی عەشائیر کە ئەتوانرێ بۆ ئەم مەبەستە بەکار بهێنرێ، بەڵام ئەم قانونە لەوانەیە ئەگەر ئەمسـاڵ یش هەڵنەوەشێنرێتەوە، لە دوارۆژ دا هەڵبوەشێنرێتەوە. ئەوسا حکومەت هیچ دەسەڵاتێکی قانونی بە دەسـتەوە نامێنێ شێخ مەحمود ناچار یا وا لێ بکا لەوێ بمێنێتەوە، لەبەرئەوە بیر لە رێگەیەکی قانونی ئەکاتەوە تـا ئـەم پیاوە لە ژیاندایە، لەو جێیە بهێڵێتەوە کە بۆی دیاری ئەکا.

لە هەمان کاتدا ئەم هەلە بە دەرفەت ئەزانم، سپاسی حکومەتی عیراق بە مەجلیسی بـەرزتان رابگەیـەنم و، ئەتوانم لەوە یش تێپەڕم لەباتی حکومەتی عیراق سپاسی گەلی عیراق پێشکەش بە حکومەتی ئێرانی بکـەم کە ئەرکی خۆی بەجێ هێناو بە بەشداری ئەوان لە گەڵ هێزەکانی ئێمەدا هەوڵـەکانی ئـەم دواییـە سـەرکەوت. ئەگەر ئەو شەوە شێخ مەحمود تەسلیم نەبوایە بە دو هێز پەلامار ئـەدرا: هێـزی عیـراق لـە لایەکـەوە و هێـزی ئێرانی لە لایەکی کەوە. ئەمە یش گرنگترین هۆ بو پاڵی بە شێخ مەحمودەوە نا پەنا بێنێ و خـۆی بـەدەسـت هێزەکانی عیراقەوە بدا و، مەرجەکانی حکومەتی عیراق قبوڵ بکا، کە گوێتان لێ بو.

**ئاصەف ئەفەندی:** لام وایە مەجلیسی بەرز ئەم کارە سپاسکراوە ئەنرخێنێ و لە خوا ئەپارێتەوە شـتێ دوبارە نەبێتەوە ئاسایش تێک بدا و وڵات بۆ هەمیشە بحەسێتەوە.

**مەولود پاشا:** بە بۆنەی درکاندنەکانی فەخامەتی سەرۆکی وەزیران حەز ئەکەم داوا لە حکومـەت بکـەم، کە بە تەنیا هەر شێخ مەحمود نەگرێ، بەڵکو هەمو ئەوانە یش کـە یارمـەتی شـێخ مـەحمودیان داوە و هانیـان داوە. هەنێ کـەس هـەن حکومـەت لـەوان باشـتریان ئەناسـێ. بـەناوی مـەجلیس و گـەلی عیراقـەوە کـە بـەم جوڵانەوانە ئێشاوە پێویستە بدرێنە دەس قانون بۆ ئەوەی ئـەم روداوانـە دوبـارە نەبنـەوە. بـە تایبـەتی بـۆ

ئەوەی ناحەزیی و خوێنرژان و ئەم جـۆرە ڕوداوە دڵتەزێنانـە زۆر بـن نـە کـەم. لـە کاتێـکدا ئێمـە ئـەزانین چەندین پشتە لە نێوان ئێمە و برا کوردەکانماندا جگە لە دۆستایەتی و تەبایی شتێکی تر نـەبوە، هـیچ کـاتێ شتێ ڕوی نەداوە ببێتە هۆی حزازات بۆیە داوا لە حکومەت ئەکەم تەعقیبی ئەو خائینانـە بکـا کـە خۆیـان بـە جۆرێکی جیاواز لە ڕواڵەتی ڕاستەقینەی خۆیان پیشان ئەدەن.

**سەرۆکی وەزیران:** مەجلیسی بەرز دڵنیا ئەکەم کە حکومەت ئەم پێویسـتە جێبـەجێ ئـەکا لـەو کاتـەدا فەرمان دەرچوە. تەنانەت ئەم بەیانیە دوا فەرمان دەرچوە من هەیئەتێکم ناردوە بۆ لێکۆڵینەوە، هەمان مەبەست جێبەجێ ئەکا کە عەینی بەرێز فەرمویان ئەویش ئەوەیە هەر کەس لەم ڕوداوانەدا بەشداری شێخ مەحمود بوبێ یا هانی دابێ بداتە دەس عەدالەت و دادگا. مەجلیس ڕێگەم بدا کە ڕونی بکەمەوە مەبەسـتی حکومـەت ئـەوەی سزادان عادل بێ، لە هەمان کاتدا سەخت بێ.

**حاجی حسێن چەلەبی شەبوت:** (ولکم في القصاص حياة يـا اولـی الالبـاب). لـە ڕاسـتیدا شـێخ مـەحمود تاوانێکی گەورەی کردوە، بەڵام لە باری سەرنجی من و فەلسەفەوە، ئەوانەی هانیان داوە تاوانەکەیان لـە هـی ئـەو گەورە ترە. پشتیوانی قسەکەی هاوکارم مەولود پاشا ئەکەم کە ئەو نۆکەرانە بدرێن بە دادگا بۆ ئەوەی بیانکا بـە پەند بۆ خەڵکی تر، بۆ ئەوەی ئەم بیرە پیسە بمرێ و کەس هەڵی نەگرێ و، یەکێتی عەرەب و کورد و ئەوانی تـر لە هەمو جۆرە پەڵەیەک پاک بێ. دادگا بۆ سەندنی مـاف ئـەبێ بـەزەیی نـەزانێ. داوا لـە حکومـەت ئەکـەم ئـەم ڕێوشوێنانە بگرێ بۆ ئەوەی ڕزگارمان بکا لە ڕژانی خوێن و بەختکردنی پارە و خەریککردنی بیر.

(ملحق الوقائع، ع 992، 8 ی 6 ی 1931، ص473)

### 3. 6. 15. خۆبەدەستەوەدانی شێخ مەحمود،

ملاحظية المطبوعات، 16 ی 5 ی 1931

شێخ مەحمود بەو مەرجانەی حکومەت بەسەریدا سەپاند، خۆی بە دەستەوەدا. ئێستا یش بە ڕێگاوەیە بۆ شوێنی دانیشتنی کە حکومەت بۆی دائەنێ و ئـەم شـوێنە یـش بـە زۆری لەسـەر کـەناری فـورات ئـەبێ.

(عبدالرزاق الحسني: تاريخ الوزارات العراقية، ط 59، ص340)

### 3. 6. 16. لە هاڵ (J. H. Hall) ەوە بۆ کادۆگان (Cadogan)

داونینگ ستریت

20 ی 3 ی 1931

زۆر سپاس بۆ نامەی 18 ی 3 ت لە بابەت پێشنیارەکانی بەغدادەوە، بۆ لەشکرکێشـی چـاوەڕوانکراو لە کوردستانی عیراق لەم بەهارەدا.

ئەتوانم باش تێ بگەم لەو پەژارەیەی لە ترسی ئـەوەی لەشکرکێشـیەکـە کـە لـە سـەرەتادا مەبەسـتی سەرکوتکردنی شێخ مەحمودە، لەوانەیە ببـێ بـە ئیجرائـاتی عـەسـکەری و بتەنێتـەوە بـۆ سـنورێکی فـراوان، انطباعێکی وا بدا کە ئەمە محاوەلەیەکە بۆ سەپاندنی سیاسەتێکی ناشەعبی نەویستراو بە زۆر، بەسەر کوردا.

هەروەکو ئەبینی لە ئەنجامگیریەکانی کۆنفرەنسـی 13 ی جـەنیوەریدا کـە لـە بارەگـادا بەسـترا، بـە تحدید دانراوە کە نابێ هیچ لەشکرکێشییەک بکرێ دژی شێخ مەحمود، یان لە ناوچەکانی بارزان و پشدەردا، بەبێ موافەقەتی تەواوی حکومەتی خاوەن شکۆ و، پێڕەوی کردنی ئامۆژگاریەکانی مەندوبی سـامی سـەبارەت بە ڕەفتاری سیاسی لە گەڵ کورد لەلایەن حکومەتی عیراقەوە. ئەم مەرجانە ئەبێ زەماناتی کافی بن دژی کاری سپایی گەوجانەی حکومەتی عیراق.

لەبابەت ناوچەکانی بارزان و پشدەرەوە، من رونی ئەکەمەوە کە شێخی بارزان و خەڵکەکەی لە چەند ساڵی رابوردودا لە دۆخی یاخیبونێکی پچڕپچڕدا بون و، ناوچەی پشدەر یش هەرگیز نەهێنراوەتە ژێر کۆنترۆڵی بەڕێوەبەرایەتیەوە، بەڵکو وەکو پەناگا لەلایەن باندی عیراقی و ئێرانی و تورکیەوە بەکارهێنراوە، ئەمە یش بۆتە هۆی ئیحراجێکی ئاشکرا بۆ حکومەتی عیراق. هیچ گومانی تیا نیە کاتی ئەوە هاتوە کە هەردو ناوچە بهێنرێنە ژێر بەڕێوەبەرایەتیەکی کاریگەرەوە. ئێمە یش مایلین بە لای موافقەت دا لە گەڵ تۆ کە مەترسی ئەوە هەیە کە هەر کارێکی لەو بابەتەی حکومەتی عیراق، لەم کاتەدا، لەوانەیە لە جنێڤ بە خراپ پیشان بدرێ وەکو ئیجرائاتی سەرکوتانەوە دژی هەستی نەتەوەیی کورد. لەبەر ئەوە ئەبێ ئامادە بین کە مەندوبی سامی ئاگادار کرا کە ئێمە پشتیوانی لە ئەنجامگیریەکانی کۆنفرەنسی بارەگا ئەکەین، بۆ ئەو پێشنیارەی کە لە پێش پەسند کردنی هیچ فراوانکردنێکی ئیجرائات دژی شێخ مەحمود بۆ ئەوەی کاری عەسکەری دژی عەشایەری بارزان و پشدەر بگرێتەوە، ئەبێ ئەم مەترسیەی لەبیر بێ و، تەنیا کاتێ بچێتە ناو کارێکی وەهاوە و، هێزەکانی ئیمپراتۆری هاوبەش بکا، ئەگەر لەو باوەڕەدا بێ کە زۆر زەروریە.

بەشکو وابکەی کە من بزانم ئاخۆ ئەمانە لە گەڵ پێویستیەکانی حاڵەتەکە ئەگونجێن؟ (FO371 ی 15311).

### 3. 6. 17. لە وەزارەتی دەرەوە بۆ هال (J. H. Hall)

24 ی 3 ی 1931

کادۆگان لە پاریسە، لە بەر ئەوە نامەی ژمارە (88069) ی 20 ی 3 ی 1931 کە بۆ ئەوت نوسی بو، لە بابەت لەشکرکێشی چاوەڕوانکراوەوە دژی کوردەکان، من وەڵامی ئەدەمەوە.

ئەو بە چاکی پەی بەوە ئەبا کە "پاککردنەوە" ی ناوچەکانی بارزان و پشدەر زەروریە، رازیە رێنماییەکانی کە تۆ پێشنیارت کردون بنێردرێن بۆ هەمفریس (Humphrys)، بە شێوەیەکی کافی لە گەڵ پێویستیەکانی حاڵەتەکەدا ئەگونجێ. (FO371 ی 15311).

### 3. 6. 18. تەلەگرام لە مەندوبی سامی عیراقەوە بۆ سکرتێری دەوڵەت بۆ کاروباری کۆلۆنیەکان

رۆژی 9 ی 4 ی 1931. لە سەعات 1.52 ی دوای نیوەڕۆی 9 ی 4 دا گەیشتووە.

ژمارە 218 بە ناونیشانی سکرتێری دەوڵەت بۆ کاروباری کۆلۆنیەکان، دوبارە بۆ تاران ژمارە 29. تەلەگرامی ژمارە 195 ی من:

حکومەتی ئێران رازیە لەسەر هاوئاهەنگی سپایی کە لەلایەن حکومەتی عیراقەوە پێشنیار کرا بو. لە 5 ی 4 دا ئەفسەری عیراقی فەرماندەی ناوچەی رۆژهەڵات هاوڕێ لە گەڵ موفەتیشی بریتانی هەیئەتی ئەرکانی جەیشی عیراقی، پێکەوە فەرماندەی ئێرانییان لە مەریوان بینی و گەیشتنە رێککەوتنێک بۆ هاوئاهەنگی داهاتوی هێزەکانی ئێران و عیراق. یەکەمین لەشکرکێشی هاوبەش ئەبێ لە 14 ی 4 دا جێبەجێ بکرێ. لە هەمان کاتدا حکومەتی عیراق کە لە پێوەندی دایە لە گەڵ شێخ مەحمود دوا فرسەتیان داوەتێ بۆ خۆبەدەستەوەدان پێش ئەو کاتە. (FO317 ی 15311).

### 3. 6. 19. رێکەوتن لە گەڵ حکومەتی عیراقیدا

لە پەیامنێرمانەوە

بەغداد، 20 ی 4

ئەم وردەکاریانەی خوارەوە سەبارەت بە دەستگیرکردنی شێخ مەحمود، سەرکردەی یاخی کورد، لە چەند سەرچاوەیەکی نارەسمییەوە کۆکراوەتەوە:

هێزە سەربازییەکانی ئێران لە نزیک گوندی پیرانی سەر سنوری ئێران جێگیر بو بون کە شێخ مەحمود وەک پەناگە هەڵیبژارد بو. ڕۆژی 14 ی 4 ئێرانییەکان رایانگەیاند بە نیازن شێخ مەحمود لە خاکی ئێران دەرپەڕێنن. هێزەکانی عیراق پلان و نەخشەیان دانا بو هاوزەمان هێرش بکەنە سەر دیوی سنوری عیراق ئەگەر شێخ هەوڵی پەڕینەوەی دا.

ڕۆژی 12 ی 4 شێخ مەحمود کە داوای کردبو لە خاکی عیراق دا کۆنفرانسێک ساز بکرێت، ڕێگەی پەڕینەوەی پێدرا و بە سواری لە پیرانەوە گەیشتە پێنجوێن و لەوێ لەلایەن موتەسەڕیف، کاپتن هۆڵت و سکرتێری مەندوبی سامی لە خۆرهەڵات پێشوازی لێکرا. پێی ڕاگەیەنرا کە دەبێت بەبێ هیچ مەرجێک خۆی بەدەستەوە بدات بەڵام گرەنتی سەلامەتی خۆی و خێزانەکەی دەدرێتێ. شێخ وتی لەوانەیە پێشنیازەکە قبوڵ بکات بەڵام داوای کرد ڕێگەی بدرێت لە سنوری ئێرانەوە بگەڕێتەوە بۆ ئەوەی لە گەڵ لایەنگران و خێزانەکەیدا هەمو شتێک ڕێکبخات.

ڕۆژی 13 ی 4 هیچ شتێکی نوێ لەبارەی شێخەوە نەبیسترا، هێزەکانی عیراق و ئێران بەردەوام بون لە خۆ ئامادەکردن بۆ هێرشێکی هاوبەش لە ڕۆژی داهاتودا ئەنجامی بدەن. بەیانی ڕۆژی 14 ی 4 هێزەکان لە هەردو دیوی سنورەوە ئامادە بون بۆ جوڵان کاتێک پەیامێکی بە پەلە گەیشتە ئەو ئەفسەرەی فەرماندەیی هێزەکانی عیراقی دەکرد، کەوا لە نیوە شەوی ڕابردووەوە شێخ بە سواری بەرەو پێنجوێن ڕێکەوتوە و لە ماڵێکی بچوکی قوڕیندا نوستوە. پاش کۆنفرانسێک بێ هیچ مەرجێک بە تێکرای مەرجەکانی حکومەتی عیراقی قایل بو، بەڵام داوای کرد کە نابێت هیچ پاسەوانێکی سوپای عیراقی یاوەری بکات بۆ شاری سلێمانی. لەبەر تۆماری شێخ، هەر چۆنێک بوایە پاسەوان شتێکی زۆر پێویست بو. لە بەرامبەر شوێن خستنی سوارەی عیراقی، کە لە بەشێکی ڕێگادا بەرە و سلێمانی پاسەوانی کرد، شێخ مەحمود دەستی کرد بە گریانێکی قوڵ و لە پاسەوانەکە پارایەوە بیکوژێت، ئاشکرایە ئەوەی ڕەچاوکردوە ڕۆیشتن بەناو چیاکاندا و لە ژێر پاسەوانیی سوپای عیراقدا سوکایەتی کردنێکە بە کەرامەتی کە ناسرێتەوە.

بە درێژایی ڕێگا بەرەو سلێمانی دیلەکە (شێخ مەحمود) لە هەمو شوێنێک گەورەترین دڵنەوایی و شیوەنی لەلایەن هەموانەوە بۆ کرا، دانیشتوانی سلێمانی پیش هاتنە دەرەوە بۆ سڵاو لێکردن و ماچکردنی دەستەکانی. دەستبەجێ گوێزرایەوە بۆ ناو فڕۆکەکە، کاپتن گۆوان و موفەتیشی ئیداری سلێمانی یاوەرییان کردو فڕکەکە بەرەو بەغدادی بردو لەوێ پاش وەستانێکی زۆر کورت، فڕین بەرەو ئوڕی گالدمیل. هەمو گەشتە 600 میلییەکە لە پێنجوێنەوە بە یەک ڕۆژ ئەنجام درا.

لە وانەیە خۆ بە دەسەوەدانی شێخ مەحمود ئەنجامی گرنگ و سەرەکی لێ بکەوێتەوە سەبارەت بە هێمن کردنەوەی کوردستانی باشور. خۆبەدەسەوەدانی شێخ کۆتایی هاتنی، لەوانەیە بۆ ماوەی چەند ساڵێک، بەرەنگاری ڕێکخراو دژ بە حکومەتی عیراق دەگەیەنێت. گومانی تیا نیە، بە هەمو شێوەیەک بەدرێژایی تەمەنی ئەم نەوە و ئیدارەی ئێستا، هەرگیز حکومەتی عیراق لەناو کوردستاندا پشتگیری خەڵک بەدەست ناهێنێت، بەڵام ئەندامە وریاکانی ناو دانیشتوانی کورد درک بەوە دەکەن کە ناعەدالەتی بۆ عامەی خەڵک لەژێر دەسەڵاتی بەغدا کەمتر دەبێت لەوەی دەکرا چاوەڕوان بکرێت ئەگەر یاخی بونەکەی شێخ مەحمود سەربکەوتایە. * (ڕۆژنامەی تایمز، 21 ی 4 ی 1931)

### 3. 6. 20. نامەی شێخ مەحمود بۆ
### سەرۆکی ئەنجومەنی "کۆمەڵەی گەلان"

(عصبە الامم)

پاریس 21 ی مارس 1931

بەرێز جەنابی سەرۆک

شانازی ئەوەم هەیە ترس و شکاتی نەتەوەیەکتان پێ رابگەیەنم کە خـودی خۆتـان خسـتوتانەتە ژێـر ئینتیداب و پاراستنی خۆتانەوە، دەشگوترێ ئەوەی ئینتیدابت دەکات، پارێزەریشـتە. ئـەم نەتەوەیـە نەتـەوەی کوردە کە من زۆر شانازی بەوەوە دەکەم بە یەکێک لەوان دەژمێرێم و ئێستا ئەم نەتەوەیە لە بەشـی باشـوری وڵاتی گەورەی کوردان کە بە عیراقەوە لێکنراوە، نیشتەجێیە.

من بە ئەرکی خۆمی دەزانم سەرنجی بەرێزتان بـۆ ئـەو خاڵـە راکێشـم کـە خـاکی کوردسـتانی لێکنـراو بـە عیراقەوە، بە هیچ شێوەیەک وەک "بین النهرین" نەکەوتۆتە ژێر دەستی هیچ یەک لە هێزەکانی دەوڵەتـە یـەککگرتوەکان یان دەوڵەتە هاوپەیمانەکان. کوردەکان خۆیـان لـە 1918 دا چـەکیان هـەڵگرت و هێزەکـانی تورکیـان ناچـار کـرد خاکەکەیان چۆڵ بکەن، سەربەخۆییان راگەیاندو دەوڵەتێکیان دروستکرد کە بەرێوەبەرایەتی وڵاتی بـەناوی "دەوڵـەتی کوردستانی باشور" گرتە دەست. لەو سـەردەمەدا عیـراق پشـێوی تێکـەوتبو، هێشـتا هێزەکـانی یـەککگرتوو (متحـد) و هاوپەیمانی (متفقین) لە ناویدا جەنگیان دەکرد. پاشان بۆ بەدبەختی ئێمە خاکەکەمان بە عیراقەوە لکێنراو ئەوروپاش کە لافی ئەوەی لێدەدا بۆ بەرگریکردن لە ماف و دادپەروەری چـەکی هـەڵگرتوە، لـە بەرامبـەر ئـەم سـتەمە گەورەیـەدا بێدەنگ بو. ستەمێک کە چارەنوس و داهاتوی نەتەوەیەک کە ئەگەرچی نەک بە رەسمی بـەڵام بـە کـردەوە بـو بـوە خاوەن دەوڵەتی خۆی بەستەوە بە چارەنوسی نەتەوەیەکی دیەوە کە نەژاد و داب و نەریت و مێژو و زمان و سـیمایان لەیەک جیاوازە. گەرچی هێشتا جێی سوپاس بو کە باری ئەم ستەمە گەورەیە بەو بەڵێنـە کـەم بـۆوە کـە "کۆمەڵـەی گەلان" سەبارەت بە بەخشینی خودموختاریەکی تەواو بە کوردستانی باشوری دابو.

لەگەڵ ئەوەشدا کە چەندان ساڵ بەسەر ئەو بەڵێنەدا تێدەپـەرێ، کـەچی نـەک هـەر بەڵێنەکـە جێبـەجێ نەکراوە بەڵکو بە پێچەوانەوە ژیانی خۆمان و ژن و مناڵ و باوکمانمان لەژێر هەرەشەی ئاگری تۆپ و فرۆکـە بۆمبهاوێژەکان و رەشاش دایە، بەو تاوانەی ئامادەنین ببـین بـە عـەرەب و چـاو لـەرێی جێبـەجێکردنی ئـەو بەڵێنانەین کە پێمان دراوە.

دەوڵەتی عیراقی هیچ دو دڵ نەبوە لەوەی شاری سلێمانی– پایتەختی کوردسـتانی باشـور – بۆمبـاران بکات و کوردەکانی ئەم شارەی کوشتوە بە تاوانی ئەوەی ئامادە نەبون، بەشداری لە هەڵبژاردنێکدا بکـەن کـە ئەو دەیەوێت بۆ بەدەستهێنانی رەزامەندی سەبارەت بە بڕیارێـک ئـەنجامی بـدات کـە هـەمو مافـە رەواکـانی کوردان پێشێل دەکا و کۆشکی ئومێد و ئارەزویان بۆ ئایندە، دەرمێنێ.

ئێمە بڕوامان وایە ئەم تۆپ و گوللانەی بەسەر قوربانیـانی کـوردی دانیشـتوی کوردسـتانی باشـوردا دەبارێ، لە بنەرەتدا هێرشێکیشە دەکرێتە سەر حەیا و ئابڕوی "کۆمەڵەی گـەلان"، چونکـە کوردەکـان لـە ژێـر ئینتیدابی ئەو "کۆمەڵە"یەدان، واتە لەژێر پارێزگاری ئەودان.

ئەگەر هێزەکانی دەوڵەتی عەرەبی عیراقی پشتیان بە فرۆکەو سوپاکانی دەوڵەتی ئینگلیز نەدەبەست کە "کۆمەڵی گەلان" ئینتیدابی ئەم سەرزەمینەی بەوان سپاردوە تا بە ناوی "کۆمەڵەی گەلانـەوە" بـەرێوەی بـەرن، ئەوا مێژو دوبارە دەبۆوە و هێرشکردن بۆ بەغداو داگیرکردنی بۆ کوردەکان وەک کاری رۆژانە ئاسان دەبـو. ئێمە ئامادەین و هەمیشەش ئامادە دەبـین لـە بەرامبـەر عەرەبەکانـدا، بـەرگری لـە وڵاتەکـەمان بکـەین، بـەڵام لەبەرئەوەی نامانەوێت توشی روبەروبونەوەیەکی چەکداری بـین لەگـەڵ دەوڵـەتی ئینگلیـزدا کـە بـەناوی ئـەو

"کۆمەڵە" بەرێزەوە هەنگاو دەنێ، ئەوا وامان بەباش زانی بۆ شکاتکردن روبکەینــە "کۆمــەڵی گــەلان" و داوای جێبەجێکردنی ماف و دادپەروەری بین.

بێگومان بە داواکاری ئــەوەی وڵاتــی ئێمــە بــە عیراقــەوە بلکێنــرێ و هەوڵــدان بــۆ رازیکردنمــان بــۆ قبوڵکردنی ئەم لکاندنە بە زۆری چــەک، بــەهیچ شــێوەیەک ئــەو ئاشــتی و ئاسایشــەی کــە "کۆمــەڵی گــەلان" دەیەوێت لەم بەشەی دنیادا بەرپای بکات، نابێ ناکرێت. تا ئەو کاتەی چارەنوســی وڵاتــی کــورد بــە دەســتی رۆڵەکانی خۆی نەسپێرێ و تا ئەو دەمەی دەوڵەتێکی کوردی بەرێوەبەرایەتی بەشی کوردنشینی ئەم ناوچەیــە نەگرێتە دەست، ئومێدێک بە ئاشتی و ئاسایش لەم ناوچەیەدا نیە. کورد کە خاوەن مێژویــەکی هــەزار ســاڵەن و هەمیشە لە قۆناغە جیاوازەکانی مێژودا زانیویانە و توانیویانە بــەرگری لــە ژیــان و وڵات و مێــژو و دەزگــا نەتەوەییەکانی خۆیان بکەن، ئێستا بڕیاریان داوە بۆ بەرگریکردنی چەکدارانە لە خۆیان تا دواکەس بمــرن، بەڵام مل بۆ کۆیلەیەتی عەرەبەکانی عیراق، کەچ نەکەن. ئێمەی کورد دەمانەوێت لەگەڵ هەمو گەل و نەتەوەکاندا دۆست بین و بەرامبەر بە هیچ گەلێکیش رقمان لە دڵدا نیە، بەڵام لە کاتێکدا کە سەربەخۆیی تەنانەت بە هەندێ گەلی سەرەتایی ئەفەریقا وەک لیبریا دەدرێت و لە گەلی وەک ئێمە زەوت دەکرێت کە توانیــوێتی بــە شــەرەف و ئازایەتی و قارەمانێتی و غەریزەی پاڵەوانی و هۆش و زیرەکی خۆی پایەیەکی مەزن لە مێــژوی گەلانــدا بــە دەست بهێنێ، ئیدی ئەمە ستەمێکە کە ناتوانین لێی بێدەنگ بین. بــە تایبــەتی کــە پــێش ماوەیــەک دەوڵــەتی عیراق کە توشی نەخۆشی دەمارگیری توندرەوی نەژادی بوە، هەوڵ دەدا بە پشتیوانی دەوڵەتی ئینگلیــز و بــە هۆی خوێناویترین هەنگاوی جەنگیەوە، بەرگریکردنمان تێکبشکێنێ.

خوێن و ئاگر هەرگیز نەیانتوانیوە و ناتوانن راستیە مێژوییەکان بگۆڕن، سەدان هــەزار کــوردی وەک سەلاحەدین و کەریم خانی زەند بکەن بە عەرەب. نەتەوەی من و خودی خۆشم بە هیچ شــێوەیەک دەمــارگیری ئاینزایی (مذهبی)مان نیەو تینوی خوێنرێژی نین. ئەگەر چەکیشمان هەڵگرتوە تەنها لەبەر ئەوەیە کە ناچاریان کردوین و بەسەریاندا سەپاندوین.

ئێمە خواستی دەسەڵاتگرتن بەسەر هیچ نەتەوە و هیچ وڵاتێکماندا نیە، نامانەوێ ئاغاو ســەرداری هــیچ کەسێک بین، بەڵام ئەوەش قبوڵ ناکەین کە خەڵکانی دی بەسەرماندا زاڵ بــن یــان جگــە لــە خۆمــان ســەردار و ئاغایەکمان هەبێت. ئەمەش خۆی ئامانج و ئایدالێکە کە چەندان هەزار کەس لە کاتی ئەم جەنگی دوایــدا، لــە پێناویدا گیانی خۆیان فیدا کرد. ئەمە جگە لەوەی ئەمە مافێکە کە خودی "کۆمەڵی گــەلان" هــەر لــەم رۆژانــەی دوایدا، بۆی سەلماندوین.

رێگەم بدەن بە دڵنیاییەوە پێتان رابگەیەنم ئەم دۆخی شۆڕشگێڕیەی کــە هۆکارەکــەی دەگەرێتــەوە بــۆ بەدنیەتی دەسەڵاتدارانی عیراق، کۆتایی پێنایەت ئەو کاتە نەبێت کە هەمو مافــە رەواکــانی کــورد بــە رەســمی بناسرێ و لەبەرچاو بگیرێ.

ئەوەی ئێمە دەمانەوێت داننانە بە سەربەخۆیی وڵاتەکەماندا... واتە "دەوڵەتی ســەربەخۆی کوردســتانی باشور"دا و بڕین و لەناوچونی هەمو پەیوەندیەک بە دەوڵەتی عەرەبی عیراقەوە. جگە لەمەش پــەیمانی تــازەی نێوان ئینگلیز و عیراق کە کۆتایی بە ئینتیدابی ئینگلیزی بەسەر عیراقدا دێنێ، ئەو راستیە دەردەخات کە ئــەو رێگە چارەیەی پێشنیارمان کردوە، بە تەواوی لوژیکیە و هیچ رێگەیەکی دەربازبونی لێ نیە.

کۆمەڵی گەلان دەبێ گەر بە سەرنجدان لە کرۆکی روداوەکانیش بوە، بگەڕێتەوە بــۆ بڕیارەکــەی خــۆی کە لە 1925 دا داوێتی.*

لەگەڵ ئەوپەڕی رێزمدا
شێخ مەحمود بە نوێنەرایەتی
دانیشتوانی کوردستانی باشور

## 4. کوردو مەلیک فەیسەڵ

### 4. 1. فەیسەڵ و کێشەی کورد

فەیسەڵ (1883-1933) پیاوێکی ژیر و دنیادیدەی خاوەن تەجروبە بـو. لـە سـەردەمی عوسـمانی‌دا چەند ساڵێ لە ئەستەمبوڵ بو. زوڵموزۆری نەتەوەپەرستە ئیتیحادی‌یەکانی تورکی دی بـو. لـە کـاتی یەکـەمین جەنگی جیهانی‌دا، ئەم یەکێ بو لەوانەی شەریف حسەینی باوکی هان دا بۆ راگەیاندنی شۆڕش و هاوکاری لە گـەڵ ئینگلیـز دژی دەوڵـەتی عوسـمانی، بـەهیوای بەدەسـتهێنانی سـەربەخۆیی وڵاتـانی مەشـریقی عـەرەبی. شۆڕشەکەیان جەزرەبەیەکی کوشندەی لە بناغەی دەوڵەتی عوسمانی دا.

دوای تەواو بونی یەکەمین جەنگی جیهانی، حکومـەتێکی عـەرەبی لـە سـوریا دامەزرانـد و خـۆی بـوە مەلیکی. بەڵام هێزی فەرەنسی چوە سەری و حکومەتەکەیان تێک دا و خۆیان بە شکاوی راونا. بریتانیـا بـۆ ئەوەی پاداشتی ئەم بنەماڵەیە بداتەوە، سەبارەت بە هاوکارییان لە سەردەمی جەنگ دا، لە حیجازەوە فەیسـەڵی هێنا، بێ ئەوەی خۆی خەڵکی عیراق بێ یا ئاشنا بێ بە دانیشتوانی عیـراق. عەرشـی عیراقیـان پـێ بەخشـی و کردیان بە مەلیک.

رەنگە فەیسەڵ لە چاو زۆری سیاسی‌یەکانی ئەوسای عـەرەب دا، لـە هـەمویان زیـاتر گیـانی لێبـوردنی نەتەوەیی، دینیی و مەزهەبی تێدا بوبێ و هەوڵێکی زۆری داوە کە میللەتێکی یـەکگرتو لـە دانیشـتوانی عیـراق پێک بهێنێ. بەڵام عیراق کە وڵاتێکی تێکەڵاو بو لە ئێڵ، نەتەوە، دین و مەزەبی جیاواز، بەم یەک نەخرا. لەدوا ساڵی تەمەنی‌دا، بە نائومێدی‌یەکی قوڵەوە بەم جۆرە وەسفی میللەتی عیراق ئەکا:

عەرەبی‌یەکەی: "في اعتقادي لا يوجد شعب عراقي بعـد، بـل توجـد تكـتلات بشـرية خاليـة مـن فكـرة الوطنية، مشبعة بتقاليد و اباطيل مذهبية لا تجمع بينهم جامعة، سماعون للسؤ، ميالون للفوضى، مسـتعدون دائمـا للانقضاض على اية حكومة كانت".

کوردی‌یەکەی: "بە باوەڕی من هێشتا شتێک نیە پێی بـوترێ گـەلی عیـراق، بـەڵکو چەنـد تۆپـەڵێکی مرۆیی هەیە کە بیری نیشتمانپەروەری‌یان تیا نیە، پڕە لـە نـەریت و پروپـوچی مـەزەبی، شـتێک نیـە کۆیـان بکاتەوە. بۆ خراپە گوێ قوڵاغن، حەزیان لە ئاژاوەیە، هەمیشـە لەسـەر پـێن بـۆ پـەلاماردانی حکومـەت، ئیتـر هەرحکومەتێ بێ."

فەیسەڵ، تەجروبەی ئیتیحادییەکانی لەبەر چاو بو کە چۆن بو بە هۆی ڕەنجانـدنی گـەلانی نـەتورکی ناو دەوڵەتی عوسمانی. لەم بارەیەوە لەو میوانداریەیەدا کـە بـۆ مەنـدوبی سـامی کـرد، لـە وتارەکـەیدا وتـی: "ئیمپراتۆریەتی عوسمانی هەڵوەشا چونکە سیاسەتێکی نەتـەوەیی تونـدڕەوی گـرت بـو، لەبـەر ئـەوە عیـراق بەرامبەر بە کورد سیاسەتێکی وەکـو ئـەو نـاگرێ" هـەروەها وتـی: "بـاوەڕم وایـە کـە یـەکێ لـە گـەورەترین فرمانەکانی عەرەبێکی عیراقی ئەوەیە، هانی برای کوردی عیراقی بدا سور بێ لەسەر نەتەوەکەی خۆی و، بێتـە ژێر ئاڵای عیراقەوە".

لێکۆڵەرەوەیەکی عیراقی نوسیویێتی: "هەڵوێستی مەلیک فەیسەڵ لە کێشەی کورد، لەوەدا کـورت ئەکرێتـەوە پێ دابگرێ لەسەر مانەوەی ناوچەی کورد بە بەشێکی لەجیابونەوە نەهاتوی عیراق لە چوارچێوەی (الحكم الـذاتي) دا. قەناعەتی تەواوی هەبو کە کورد ئەبێ هەمو مافە نیشتمانی و نەتەوەییەکانی خۆی هەبێ". لـە سـەرچاوەیەکی ئینگلیزی یشەوە ئەگێرێتەوە کە مەلیک فەیسەڵ لە ئابی 1923 دا بە شێخ مەحمودی وتوە لە گەڵ ئەوەیە کورد لـە چوارچێوەی دەوڵەتی عیراقدا، حوکمی زاتی بدرێتێ. لەو کاتەدا کە ئەم باسی ئەکا، شـێخ مـەحمود لـە شـۆڕش دا بوە. هیچ سـەرچاوەیەکی تـری بەردەسـت پشـتیوانی ئـەم ئاگاداریـە ناکـا. یـان ئەگـەر ئـەو کاتـەیش فەیسـەڵ بیروڕایەکی وەهای هەبوبێ دوایی گۆڕیویێتی. فەیسەڵ لە مافی یەکسانی هاوڵاتێتی و، بەکارهێنانی زمانی کـوردی زیاتر تێ نەپەڕیوە بۆ سەلماندنی مافی سیاسی و بەڕێوەبەرایەتی، چ جای ئۆتۆنۆمی. ئەمە یـش لـەو گفتوگۆیـەدا باشتر ڕون ئەبێتەوە کە لە گەڵ مەندوبی سامیدا کردویەتی، بەراشکاوی مەترسیی خـۆی لـەوە پیشـان ئـەدا کـە مەسەلەی کورد لە عیراقدا ببێتە هۆی تێکدانی نێوانی عیراق لە گەڵ دراوسـێکانی: تورکیـا و ئێـران و سـەرەنجام عیراق لە شەڕەوە بگلێنێ. لە پەراوێزی ناسینی رەسمیی زمانی کوردیدا، لای وابوە کە دانی هەر ئیمتیازێـک بـە کورد، ئەبێ بەهۆی ئەوەی داوای ئیمتیازی زۆرتر بکەن، تا ئەگا بە داوای سەربەخۆیی.

### 4. 2. **قانون اللغات المحلية**

یەکێ لەو کارانەی نوری سەعید بە ڕەزامەندی مـەلیک فەیسـەڵ، لەسـەر داوای کاربەدەسـتانی ئینگلیـز، ئەنجامیدا، دانانی قانونێ بو بۆ ناسینی زمانی کوردی بە رەسمی کە بە ناوی (قـانون اللغـات المحليـة) وە لـە 23 ی 4 ی 1931 دا دەری کرد. پێش ئەو یش سـەرۆکوەزیرانی پێشـو، عەبدولموحسـین سـەعدون لەبـەردەم مەجلیسی نوابـدا ئەم مافانەی بۆ کورد سەلماند بو، ڕێنوێنی جێبەجێکردنی نارد بو بۆ وەزارەتەکانی.

مەبەست لە دەرکردنی قانونەکە، دەمکوتکرنی داواکارانی مافی نەتەوەیی کورد و خۆشکردنی زەمینـەی لەشکرکێشی بو بۆ دامرکاندنەوەی شۆڕشەکەی شێخ مەحمود و هەر جوڵانەوەیـەکی چەکـداریی تـری کـورد. حکومەتی بریتانی ئەیویست مـافی سیاسـی کـورد بـۆ دامەزرانـدنی حکومـەتی تایبـەتی خـۆی، بگـۆرێ بـۆ کاروباری دامەزراندنی فەرمانبەرانی کورد و بەکارهێنانی زمـانی کـوردی لـە قوتابخانـە، دادگـا و دائیرەکـانی هەندێ ناوچەی کوردستاندا، بەتایبەتی لەو شـوێنانەدا کـە جوڵانـەوەی نەتـەوەیی کـوردی تێـدا بـەهێز بـو. بێگومان ئەم کارانە بەشـێ بـون لـە مافـەکانی کـورد، بـەڵام نەیئـەتوانی نیشـتمانپەروەرانی کـورد تێـر بکـا و نەیئەتوانی کێشەی نەتەوەیی کورد چارەسەر بکا.

لە گەڵ هەمو ئەوانە یشدا (قانون اللغات المحلية) کە لەسەر پێشنیاری ئینگلیز و بـە پـرس و رای ئـەو دەرچو، چەندین کەموکوڕی تێدابو:

1. قانونەکە لـەباتی ئـەوەی دان بـە زمـانی کـوردی دا بنـێ وەکـو زمـانێکی نەتـەوەیی (لغـة قوميـة)، بە زمانێکی ناوچەیی (لغة محلية) لە قەڵەمی داوە. هەر بۆ ئەم مەبەستە یش ئازادی داوە بەکوردەکانی بادینـان، لەباتی زمانی باوی نوسینی کوردی عیراق، لەهجەی تایبەتی خۆیان بەکار بهێنن.

2. ناوچەی بەکارهێنانی تەسک کردۆتەوە.

لە گەرمیان، هیچ کام لەو ناوچانەی نەگرتۆتەوە کە ئەو زەمانە چالاکەکانی کورد داوایان کردوە بەناوی لیوای باجەلانەوە دروست بکرێ لە قەزاو ناحیە کورد نشینەکانی لیواکانی دیالەو کوت: خانەقین، کفری، مەندەلی، بەدرە...

لە بادینان: قەزای سنجار و...

3. هیچ کۆرێکی زمانەوانی بۆ گەشەپێدانی زمانی کوردی دروست نەکرد، وەکو بۆ زمانی عەرەبی دامەزراند.

تۆفیق وەهبی کە زمانەوانێکی شارەزا بو، لە یادداشتەکەیدا بۆ کۆمەڵەی گەلان ئەڵێ ئەم قانونە ئاژاوەی زمان دروست ئەکا.

دواتر، ئەم قانونە بەکردەوە تەنیا لە لیوای سلێمانی و چەند جێیەکی کەمی هەولێردا جێبەجێ کرا. ناوچە کوردنشینەکانی لیواکانی کەرکوک، موسڵ، دیالە و کوت بێبەش کران، بەڵکو لەو ساوە ئیتر حکومەتی عیراق کەوتە دانانی ڕێوشوێنی دەرکردنی کورد و نیشتەجێ کردنی عەرەب لە هەندێ شوێنی گرنگی کوردستاندا.

ڕەوتی سەلماندنی زمانی کوردی، لەلایەن حکومەتی عیراقەوە، وەکو زمانێکی ڕەسمی و، هەوڵەکانی کورد خۆی و هەڵوێستی جیاوازی کاربەدەست و سیاسی و ڕۆژنامەوانەکانی عەرەب و گفتوگۆکانی ناو هەردو مەجلیسی نواب و ئەعیان و، لێدوانی ڕۆژنامەوانەکانی بەغداد و، بیروبۆچونی کاربەدەستانی بریتانی و هەڵوێستیان لەم کێشەیەدا، خۆی باسێکی تایبەتیە ئەهێنێ لێکۆڵینەوەیەکی سەربەخۆی بۆ تەرخان بکرێ.

### 4. 3. جەیشی عیراق

لە کۆنفرەنسی قاهیرەدا، بریتانیا بۆ ئەوەی ئەرکی سوک و مەسرەفی کەم بێتەوە، بڕیاریدا لە عیراق جەیشێک پێک بهێنرێ. ئەم هەواڵە نەتەوەپەرستەکانی عەرەبی خۆشحاڵ کرد. دوای دامەزراندنی حکومەتی عیراق و تەتویجی فەیسەڵ بە مەلیکی عیراق، یەکێ لە هەوڵەکانی نەتەوەپەرستەکانی عەرەب و فەیسەڵ بۆ دامەزراندنی جەیشێکی بەهێز، لەڕێگەی تەجنیدی ئیجباریەوە، تەرخان کرا. قانونی تەجنیدی ئیجباری مشتومڕێکی زۆری دروست کرد. عەشایەری جنوب بە توندی دژی بون. زۆری نائیبەکانی کورد یش دژی ڕاوەستان، بە ڕواڵەت لەبەرخاتری عەشایەری کورد و، لە ڕاستیدا لەبەر خاتری ئینگلیز. چونکە لەو کاتەدا ئینگلیز تەجنیدی ئیجباری پێ باش نەبو. بەڵام سەرەنجام کرا بە قانون و سەپێنرا.

هەر لە سەرەتاوە بریتانیا ئەرکی پاراستنی عیراقی بەرامبەر هەڵگەڕانەوەی ناوخۆ و، دەستدرێژی دەرەکی گرتبوە ئەستۆ. ڕاستیەکەیشی عیراق هیچ مەترسیەکی ڕاستەقینەی هێرشی دەرەکی: تورکیا لەلای سەرویەوە و، وڵاتانی خەلیج لەلای خوارویەوە و، ئێران لەلای ڕۆژهەڵات و، سوریا لەلای ڕۆژئاوایەوە لەسەر نەبو.

لێکۆڵەرەوەیەکی عیراقی نوسیویەتی: "مەلیک پێی باش نەبو پەنا بۆ هێزی بریتانی بەرێ تەنانەت ئەگەر عیراق بە تەنگوچەڵەمەیەکی ناوخۆیشدا بڕۆیشتایە. لای وابو ئەگەر عیراق نەتوانێ ئاسایشی ناوخۆی بپارێزێ، شایستەی سەربەخۆیی نیە". نوسەر لەسەری ئەڕوا و ئەڵێ: "فەیسەڵ سەیری لێ هات بریتانیا بە تەما بێ حکومەتی عیراق داوای یارمەتی جەنگی لێ بکا بۆ سەرکوتکردنی عیراقیەکان".

بێگومان ئەم بۆچونە ڕاست نیە، چونکە:

1. فەیسەڵ نەک هەر پەنای بۆ بریتانیا بردوە یارمەتی جەنگی بدا بۆ پاراستنی ئاسایشی ناوخۆی عیراق و سەرکوتکردنی هەمو پشێوییەک، بەڵکو بۆ دامرکاندنەوەی شۆڕشەکەی (1931) ی شێخ مەحمود پەنای بردۆتە بەر ئێران و، بۆ دامرکاندنەوەی شۆڕشەکەی (1932) ی شێخ ئەحمەدی بارزانی پەنای بردۆتە بەر تورکیا.

2. مەلیک فەیسەڵ لەو یادداشتەدا کە پێش مردنی بـۆ هەنـدێ لـە سیاسـیەکانی عیراقـی نوسـیوە، بـە داخەوە باسی لاوازیی جەیش ئەکا، ئەڵێ ئەبێ جەیشێکمان هەبێ ئەگەر لە یەک کاتدا لە دو شـوێنی دور لـە یەکتری عیراقدا ئاژاوە هەڵگیرسا، بتوانێ هەردوکیان بەیەکەوە بکوژێنێتەوە.

ئەرکی سەرەکی ئەم جەیشە هەر لە سەرەتاوە، وەکو مەلیک فەیسەڵ ویستی، پاراستنی دەوڵەتی عیـراق بـو لە مەترسی ناوەکی کە یەکێ لە هەرە گرنگەکانیان مەترسـی کـورد بـو. لـە دوای داگیرکرنـی سـلێمانی، جەیشـی عیراق خۆشترین دەشتی سلێمانی کە کانی ئاسکان بو، کردی بـە سـەربازگەیەکی هەمیشـەیی. هێزێکـی گـەورەی تێدا کۆکردەوە، فەرماندەیی ناوچەی رۆژهەڵات (امريـة المنطقـة الشـرقية) ی لـێ دانـا. بـەڵام ئـەو جەیشـەی کـە فەیسەڵ بە یارمەتی ئینگلیز بۆ پارێزگاری رژێمی پاشایەتی و سـەرکوتکردنی هەڵگەرانـەوەی نـاوخۆ، بەتایبـەتی هی کورد، دروستی کرد، ئەگەر چی لە دامرکاندنەوەی دڕندانەی شۆڕشەکانی کـوردا، لـەو رۆژەوە (فـەوجی ئیمـام موسای کازم) یان دامەزراند تا سەر، هیچ درێخی‌یەکی نەکرد، بـەڵام هـەمان جـەیش لـە 1958 دا تـۆوی مـەلیک و نەوە و وەچەکانی بڕیەوە. ئەو دڕندەیەی ئەو بەخێوی کرد، پێش هەرکەس سەری منداڵەکانی خۆی خوارد!

### 4. 4. فەیسەڵ، مەلیکی سلێمانی

سلێمانی گرێیەکی خڕ بو لەسەر دڵی فەیسەڵ. لەو پرسە گورگانەیەدا کە ئینگلیز لە سلێمانی کردی بـۆ ئەوەی بخرێتە سەر عیراق، خەڵکی سلێمانی بە (لام باش نیە) وەڵامیان دایـەوە. لـە 20 ی جـولای 1921 دا کە حاکمی بریتانی ئەشرافی سلێمانی بانگ کرد، لێیان پرسێ: "...ئایا کوردی لیوای سلێمانی بـۆ مەلەکیـەتی ئەمیر فەیسەڵ رەئی ئەدەن یان نا؟ لە لایەنی کۆمەڵەکەوە جواب درایەوە: چونکە لیوای سـلێمانی جیـاوازە لـە حکومەتی عیراق، پێویست نیە رەئی بـدەن بـۆ دانـانی مـەلیک. لەبـەر دوری لـە ئێمـەوە کـردەوە و چـۆنێتی (حەزرەتی ئەمیر فەیسەڵ) یش نەناسراوە، جا لەبەر ئەوە بۆمان نیە لەو روەوە بدوێین!"

ساڵی 1924 فەیسەڵ کە هاتە کەرکوک، بۆ یەکەم جار ئاڵای عیراقی لێ هـەڵکرد. بـەڵام لەبـەر بـونی شێخ مەحمود لە ناوچەکەدا نەیتوانی سەردانی سلێمانی بکا. ئەمجارە ئیتر ڕێگەی بۆ تەخت بوبو، بە (خەیاڵی رەحەت) هاتە سلێمانی و پێشوازی شاهانەی لێ کرا. بەم بۆنەیەوە شیعر و سرود خوێنرانەوە. ئەو یش یەکێ لە بەناوبانگترین وتارەکانی لەم بۆنەیەدا دا، وتی: "دین بۆ خوایـە و نیشـتمان بـۆ هـەموان". ئـەم سـەفەرەی فەیسەڵ بۆ ئەوە بو کە نیشانی بدا ئیتر سـلێمانی یـش وەکـو هـەمو لیواکـانی تـر، بەشـێکی لـە جیابونـەوە نەهاتوی مەملەکەتی عیراقە. لە وتارەکەیدا بەم بۆنەیـەوە وتـی: "هـیچ شـوبهەی نیـە کـە هـەر یـەک لـە ئێـوە دەیزانێت کە حکومەتی عیراق قبوڵی تەجزیئە و تەفریق ناکا، وە بە ئیعتیباری عوموم حکومـەتی عیـراق بۆتـە جوزئێکی لایەتەجەزەئی، لەبەر ئەمە مەحاڵە کە سـەکەنەی ئەلویـەی جنوبیـە بتـوانن، بـێ ئـەوەی ئـەم لیوایـە جوزئێک لە وەتەنەکەیان و بەدەستیانەوە بێت لە ئەمنیەتدا بژین و کەزا موستەحیلە بۆ ئـەهالی ئـەم لیوایـە کـە یەک رۆژ بتوانن، بە هەر شکڵ و وەزعیەتێک بێت، بە جیا لەوەتەنی عیراقـی و لـە بـرا عیراقیـەکانیان بـژین. ئەمە حەقیقەتێکی ئەوەندە ئاشکرایە کە هەمو عیراقیەک دەیزانێت و ئەقوامی سائیرە یش ئیشـتیراکیان ئـەکا. لەسەر ئەم ئەساسە حکومەتی عیراقیە تەئەسوسی کردەوە و لە ئیستیقبالێکی نزیکا لەناو ئومەمی سائیرەدا بـە ئیستیقلال و وەحدەتەوە ئەخذی مەوقیع ئەکات ".

هەر لەم سەفەرەی دا سەردانی هەڵەبجە یشی کرد. ئینجا گەڕایەوە بۆ پایتەخت.

### 4. 5. نە ئەو بەهارە و نە ئەو هەوارە

دوای خۆبەدەستەوەدانی شێخ مەحمود، موزاحیم پاچەچی، وەزیری ناوخۆی عیراق، لە نیسـانی 1931 دا چو بۆ سەردانی سلێمانی. لە وتارەکەی دا بۆ خەڵکی سلێمانی وتی:

"له بەعزێکم بیست – و تەرەفداری باوەڕ پێ کردن نیم - بەعزێ له برا کوردەکانمـان مەزبەتـەیان بـۆ بەعزێ جێگا تەقدیم کردوە، لەو مەزبەتانەدا بەیانیان کردوە کە حکومەتی عیراقیـە لـە خسـوس کوردەکانـەوە موخالەفەتی تەوصیاتی عیصبەتول ئومەمی کردوە، لەبەر ئەوە تەلەبی تەئلیفی حکومەتێکی کوردییەیان کردوە له ژێر حیمایە و ئینتیدابی بریتانیادا".

"رجا ئەکەم ئەوەی کە بیستومە راست نەبێ، چونکە بە راسـت دەرچـونی زۆر موتەئـەثیرم ئـەکات بـە صیفەتی ئەوەی کە دۆست و برایەکی ئوممەتی کوردم، بەوەی کە شوهرەت و شەرەفی لەکەدار بکات".

"تەوصیاتی عیصبەتول ئومەم مەعلوم وا زانراوە ئەگەر موقارەنەی بکەن لەگەڵ ئـەوەی کـە لـەم وڵاتـەدا جاریە و تەتبیق کراوە، بۆتان مەعلوم ئەبێ کە حکومەتی عیراقیە هەرچی لەسەری بە فـەرض گیـراوە، هـەموی ئیجرا کردوە و لە حوسنی نیەت و ئیخلاصیدا لێی زیاد کردوە".

پاش پاچەچی مەلیک فەیسەڵ چوە سـلێمانی. بـەراوردی ئـەم سـەردانەی پاچـەچی و مـەلیک لـە گـەڵ سەردانی ئەمیر غازی لە تەمموزی 1930 دا و، دوای ئەو سەردانی وەفدی وەزاری لـە ئـابی 1930 دا، دەری ئەخەن کە چ گۆرانێکی بنەرەتی بەسەر کەشی سیاسی ئەم ناوچەیەدا هاتوە، جوڵانەوەی کورد لە چ قۆنـاغێکی تێکشکان و نائومێدیدا بوە.

سەرانی کورد لە سلێمانی، بۆ پێشوازی لە غازی و دوای ئـەو لـە وەکیلـی سـەرۆکی وەزیرانـی عیـراق و وەکیلی مەندوبی سامی، پێشتر بەیانی سیاسییان دەرکرد بو، خواستە نەتەوەییەکانی کوردیـان تێـدا رون کردبوەوە، بە خۆپیشاندانی سیاسی پێشـوازییان کـردن، لـە گفتوگۆکـاندا داوای سـەلماندنی مـافی کوردیـان ئەکرد بۆ دروستکردنی حکومەتێکی کوردی لە ژێر چاودێری کۆمەڵەی گەلاندا.

بەڵام ئەمجارەیان منداڵانی مەکتەبەکان و، موچەخۆرەکانی حکومـەت بـۆ پێشـوازی رۆتینـی و گـۆرانی وتن بە باڵای مەلیک دا برابون، خواستەکان یش بریتی بـون لـە: تکـای لێبـوردنی گیراوەکـان و، کردنـەوەی هەندێ رێگا لە نێوان سلێمانی و قەزاکانیدا...

ئەم قۆناغەی ژیانی سیاسی کورد لە عیراقدا قۆناغێکی سەختە.

کاری پارلەمانتارانی کورد لە مەجلیسی نوابی عیراقیدا بە هەڕەشە بێدەنگ کرا بو. خەباتی سیاسـی ناوشاری خەڵک لە 6 ئـەیلولدا لـە خـوێن و زینـداندا نقـوم کـرا بـو. خـەباتی چەکـداری شـێخ مـەحمود و هاوکارەکانی بە تێشکان و خۆ بەدەستەوەدان تەواو بوبو. عەریزەی گەورەکانی کورد بۆ کۆمەڵەی گەلان بە رەت کردنەوە وەڵامی درا بوەوە... ئەمانە نائومێدییەکی قوڵیان لـە دەرونـی چالاکـەکانی کـوردا روانـد بـو. زۆری ئەوانەی بەشداری جوڵانەوەی سیاسیی کورد بون تەکینـەوە. هەنـدێکیان لـە دەزگـای بەرێوەبەرایـەتی عیراقدا بە فەرمانبەر دامەزران. هەندێکیان خەریکی بازرگانی و کارو کاسپی بون. بەکورتی، لە ژیانی گشـتی کشانەوە و خەریکی دابینکردنی ژیانی تایبەتی خۆیان بون.

### 4. 6. بەڵگەکانی: کورد و مەلیک فەیسەڵ

### 4. 6. 1. چاوپێکەوتنی مەندوبی سامی و مەلیک فەیسەڵ

تێبینی لەسەر چاوپێکەوتنی مەندوبی سامی لە عیراق لە گەڵ مەلیک فەیسەڵ لە 20 ی مەی 1930 دا.

**کوردەکانی عیراق**

مەندوبی سامی بە بیر خاوەن شکۆی هێنایەوە ماوەیەک لە مەوبەر موافەقـەتی کـرد بـو دواتـر پرسـی کوردەکانی عیراق باس بکەن. لەو کاتەوە، هەلی بۆ رەخسا لێکۆڵینەوە لە پرسەکە بکا، وەکـو پێشـنیاری کـرد بو بە زویی بچێ بۆ گەشتێ لە ناوچە کوردییەکان دا. لای وایە باش ئەبێ ئەگەر خاوەن شـکۆ موافیـق بـێ،

مەسەلەکە باس بکەن. درێژەی بە قسەکانی دا، حکومەت کارێکی باشی کردوە بەیانی دەرکـردوە نیـازی هەیـە قانونێک دەربکا کوردی بکا بە زمانی رەسمی لە ناوچە کوردییەکان دا، بـەڵام لای وایـە درکاندنـەکانی تـری سەرۆکی وەزیران دەربارەی دامەزراندنی فەرمانبەران لە ناوچە کوردییەکان دا... کە مەرج بێ بە رەگەز کـورد بن بەڵکو تەنیا کوردی بزانن، بۆ نمونە پێویست ناکـا، ئەبوایـە دوابخـرێ بـۆ دوای جێبـەجێکردنی قـانونی پەیماندراو.

مەلیک وتی بە تەواوی موافیقە کە حکومەتی عیراق رێگـە بـدا بـە بـەکارهێنانی زمـانی کـوردی وەکـو زمانێکی رەسمی، بەڵام ترساوە لە چالاکییەکانی ژمارەیەک لە کۆمەڵە سیاسییە کوردییـەکان کـە بونیـان لـە عیراق دا ئەترسێ زەرەر بدا لە پێوەندییـەکانی عیـراق لـە گـەڵ ئێـران و تورکیـا. گـەورەترین جیـاوازی لـە بۆچونەکانی حکومەتی عیراق و بارەگادا، ئەوە بو حکومەتی عیراق قەناعەتی وایە ئەو ئازارشـکێنانەی ئێسـتا پێشنیار کراون، بۆ ماوەیەکی درێژ کورد رازی ناکەن، دوای هەمو (تنازول)ـێک داواکانی ئەوان زیاد ئەکا، تـا لە دواییدا دەس ئەکەن بە تێکۆشان بۆ یەکگرتنەوە و سەربەخۆیی کـە لەوانەیـە عیـراق لـە شـەڕەوە بگلێنـێ لە گەڵ ئێران و تورکیا. لەلایەکی ترەوە بارەگا لای وایە کە ئەشێ کورد وەکو سکۆت لـە بریتانیـای گـەورەدا رەفتاری لە گەڵ بکرێ، بەڵام جیاوازی لە پایەی ئەم دو گەلەدا ئەوەندە گەورەیە کە بەراورد کردنێکـی نەشـیاو بێ بۆ ئەوەی ببێتە رێ پێشاندەری سیاسی.

مەندوبی سامی رونی کردەوە کە بە تەواوی بە سنورداری هەر بەراوردێک ئەکا لـە نێـوان هەڵوێسـتی سکۆت لە مەملەکەتی یەکگرتو و کورد لە عیراق دا، بەڵام مۆراڵی پێوەندی بریتانی لە گەڵ سکۆت ئەو رەفتـارە هەڵسەنگێنراوە، لە گەڵ سەلماندنی مافی پاراستنی کەسایەتی نەتەوەیی و نەریتەکانی خۆیان هـەمویانی یـەک خستوە بە نزیکی لە گەڵ ئینگلیز، ئەو لای وایە کە سیاسەتێکی وەها بەرامبەر بە کورد، هەمان ئەنجامی ئـەبێ بۆ عیراق.

ئەگەرچی خاڵی سەرەکی ئەو ئەوە بو کە شتێکی بنچینەییـە حکومـەتی عیـراق ئـەو بەڵێنانـە بـەجێ بهێنێ کە بە کوردی داون. ئەو سیاسەتەی کە راگەیەنراو بو سیاسەتێکی دروسـت بـو، بـەڵام ماوەتـەوە سـەر ئەوەی ببینرێ کە جێبەجێ ئەکرێ.

خـاوەن شـکۆ وتـی بـە تـەواوی موافیقـە لـە گـەڵ مەنـدوبی سـامی، بـەڵام هێشـتا وا هەسـت ئـەکا چالاکییەکانی کۆمەڵە سیاسییە کوردییەکان سـەرکوت بکـرێن چونکـە زەرەر لـە عیـراق و زەرەر لـە کـورد خۆیشیان ئەدەن.

مەندوبی سامی بیری خاوەن شکۆی خستەوە کە کارێکی خێرا بکـرێ لـە لایـەن بارەگـا و حکومـەتی عیراقەوە، بۆ ئەوەی رێ بگرن لەوەی عیراق بەکار بهێنرێ وەکو پەنجەی پیلانـی پـان - کـوردی دژی دۆسـتە دراوسێکانی، بەڵام رونی کردەوە لە کاتێکدا کە موافیقە لەسەر ئـەوەی هانـدانی دوژمنانـە دژی دراوسـێکانی سەرکوت بکرێن، لای وایە پێویستە جیـاوازی بکـرێ لـە نێـوان ئـەو کۆمەڵـە سیاسـییانەدا کـە ئـەو جـۆرە چالاکییانە ئەکەن لە گەڵ ئەوانەی کە ئامانجەکەیان داکۆکی رەوایـە لـە بەرژەوەنـدی کـورد لـەناو عیـراق دا. لەهەمان کاتدا خاڵی گرنگی راستەقینە بە کردەوە ئەوەیە کورد نائومێد نەبن لەو بەڵێنانەی عیراق پێی داون. ئـەو بەڵێنانـە ئـەبێ ئەوەنـدەی بکـرێ بـە زویـی، بـەجێ بهێنـرێن: لـە روی سـەرەتاییەوە قـانونی زمـان و دروستکردنی ناوچەی پەروەردەیی کوردی.

مەلیک موافیق بو، وتی هیوادارە کە مەندوبی سامی ئاگاداری بکا، ئەگـەر لای وابـو حکومـەتی عیـراق دوا کەوتوە لە بەجێهێنانی پەیمانەکانیدا بەرامبەر بە کورد. (FO371 ی 14521).

### 4. 6. 2. بەیانی رەسمی

زمانی کوردی زمانێکی رەسمی‌یە: وەزارەت پاش ئەوەی کاروباری گرتە دەس، ئەیەوێ بایەخ بدا بەو شتانەی گرنگ و دڵنیاکەری ئارەزو و ئاواتەکانی گەلن. لەوانە هەندێ مەسەلە کە پێوەندی‌یان بە بەشێ لە دانیشتوانی لیواکانی سەرەوە هەیە، لەبەرئەوە بڕیاریدا کە لائیحەیەکی قانونی حازر بکا و بیخاتە بەردەم کۆبونەوەی هاتوی مەجلیسی ئوممە تا زمانی کوردی بکا بە زمانێکی رەسمیی لە شوێنە کوردی‌یەکاندا بەپێی مادەی 17 ی قانونی ئەساسی. حکومەت گەرەکێتی پێرەوی بەرنامەیەک بکا لە گەڵ گیانی ئەو بەڵێنانەدا بگونجێ کە پێشتر دابوی بە کوردەکان لە عیراق دا. (البلاد، ع 128، 10 ی 4 ی 1930)

### 4. 6. 3. هەنگاوێکی ئومێدبەخش و مژدەیەکی خۆش بۆ کوردەکان

لەناکاوا غەزەتەکانی بەغداد، مژدەیەکی بە هەمو مەناتیقی کوردەواریدا بڵاو کردەوە و هەمو میللەتی کورد لە خۆشی ئەم خەبەرە و ئەم مژدەیە وەکو گوڵ گەشانەوە و عومومی کەوتنە شایی و کەیفخۆشیەوە.

ئەم مژدەیە ئەمەندە موهیم و خۆش بو کە ئەوەڵەمین ئارەزویەک کە کوردەکان مودەتێکی زۆر ئینتیظاری ئەکەن، هێنایە جێ.

وا ئاشکرا حکومەت رەسمەن ئیعتیرافی کرد بە رەسمیەتی زمانی کوردی و بۆ ئەو قیسمە کوردەواریەی کە لەگەڵ عیراقا ئەژین. وە ئەم ئیعتیرافە و ئەم قەرارە صفەتێکی مەشروعیەتی پێ ئەدرێ، ئەکرێ بە قانون و لە ئەوەڵەمین ئیجتیماعی مەجلیسی ئوممەت دا تەصدیق ئەکرێ و بەم سەبەبەوە کوردەواری نائیلی حەقێکی مەشروعی خۆی ئەبێ.

عومومی کوردەواری بەرامبەر بەم قەرارە و بەم خەبەرە بەجان و دڵ تەشەکوری حکومەت وە بیلخاصە قابینەی عالی و عادلەی نوری پاشا ئەلسەعید ئەکات. حەقیقەتەن لە هەمو کوردێکەوە مەعلوم بو کە ئەم قابینەیە فکرێکی عالی هەیە و ئەیەوێ بۆ بەرز و بڵندی عیراق ئەو ئەسبابانە مەحو بکاتەوە کە هەتاکو ئێستا ئەم دو میللەتەی لەیەک دڵگیر کرد بو، وە لێی مەعلوم بو کە ئیتیحاد و یەک فکری و یەک وجودی ئەم دو میللەتە بەوەوە ئەبێ کە محافەزەی حقوقی میللی و عەنعەناتی کوردەکان بکرێ. وا شوکر ئەم قابینە تازەیەمان بۆ ئەم غایەیە ئەوەڵەمین خەطوەی هاویشت و بەرامبەر بە حکومەتی عیراق مەحەبەتێکی تەواوی خستە دڵی کوردەکانەوە.

هەرچەند لەپێشەوە پێویست بو موافیقی قەراری عیصبەتول ئومەم و ئیعترافاتی عیراق ئەم حقوقە بە کوردەکان بدرێ، بەڵام هەتاکو ئێستا فیعلەن لە بەعزێ مەناتیقی کوردییەدا موهمەل مابوەوە و عەمەلی پێ نەئەکرا و ئارەزوی کوردەکان نەهێنرا بوە جێ، عەلاوەتەن ئەم مەسئەلەیە کەسبی قانونیەتی نەکرد بو، بەم سەبەبەوە ئیتیحادێکی تەواو لە بەینی ئەم دو میللەتەدا پەیدا نەبو بو.

ئێستا کە قابینەی عالی و عادلەی نوری پاشا ئەلسەعید، لە پێش هەمو شتێکا دەرکی بەمە کرد و، ئەسبابی ئەم عەدەمی مەحەبەتەی بەینەی دۆزیەوە، حەقیقەتەن وەکو بۆ عیراق بە خەطوەیەکی گەورە عەد ئەکرێت، ئیلەل ئەبەد کوردەکانیشی مەمنون کرد و بەم سەبەبەوە ئیتیحادێکی تەواوی خستە بەینی ئەم دو میللەتەوە.

کوردەواری هەمو وەقتێک بە دڵ و بە گیان ویستویانە کە لەگەڵ عەرەبا ئیتیحاد و تەوحیدی مەساعی بکەن و بەم سایەیەوە حکومەتێکی چاک و مونتەظەم بە ناوی عیراق وە بێننە وجود و دائیمەن هەمو فەردێکی کورد ئەهمیەت و لزومی ئیتیحادی کورد و عەرەبی دەرک کردوە.

لەم عەصری میللیەتەدا کوردیش هەمو وەقتێک شعورێکی پاک و بڵندی میللی تیا مەوجودە، هەروەکو ئارەزومەندن بۆ ئیدامەی یەکێتی لەگەڵ عیراقا – عەرەب دا لە عەینی زەمان دا بە ئیشتیاق و پەرۆشێکەوە ئەیشیانەوێ محافەزەی هەمو عەنعەناتی میللیە و شەرافەتی قەومیەی خۆیان بکەن.

بینائەن عەلەیهی وەکو ئەم قابینە تازەیە ئەم نوقتــەی ئیتیصــال و ئیتیحــادەی دۆزیــەوە لازمیشــە ئیتــر لەمەودوا بە دائیمی سەعی بکرێ بۆ ئیتیحادی ئەم دو جەرەیانە و بە دانی حقوقێکی مەشروعەی میللەتی کــورد ئیتیحادێکی تەواو لە بەینی ئەم دو میللەتەدا تەئمین بکرێ کە نەتیجە لەم ئیتیحاد و مــەزجی ئــەم دو میللەتــەدا کیتلەیەکی موتەفیقە و یەک غایە بهێنرێتە وجود. ئەمەیش هەر بــەم جــوزئی ئیهتیمامــەوە دێتــە وجــود. فائیــدە و مەنفەعەتی ئەم ئیتیحادە بۆ تەرەفەینە. بۆ هەردولا ئەبێ بە مــوجیبی بــەرز بونــەوە. باخســوس بــۆ تــەرەقی و تەعالی ئەم حکومەتە گەنجەی عیراقە ئەهمیەتێکی حەیاتیەی هەیە.

چونکە بە واسیتەی دۆستایەتی قەومێکی جەسورو جەنگاوەری وەکو کوردەوە دائیمەن حدودی شەرقی و شیمالی عیراق بەرامبەر بە هەمو خەطەرێک مەحفوظ و موئتەمەن ئەبێ. جگە لەمەیش لە جامیعەی عیراق دا لــە جیاتی بونی عونصورێکی نامەمنون برایەکی پڕ مەحەبەت و پڕ جدیەت دێتە وجود.

زاتەن ئەهمیەتی ئەم مەسئەلەیە وەنەبێ هەر لە ئێســتاوە دەرک کرابــێ بــەڵکو لــە زەمــانی ئیحتیلالــەوە حکومەتی فەخیمەی بریتانیا و هەمو ریجالی سیاسیەی ئەم حکومەتە دەرکی چــاکی ئــەم مەســئەلەیەیان کــردوە و بۆ ئەم غایەیە تێ کۆشاون. هەمو وەقتێک ویستویانە: بە تەوحیــدی ئیــدارەی ئــەم دو میللەتــە حکومــەتێکی بەرز و بڵند و مونتەظەمی وەکو عیراق بهێننە مەیدانەوە.

بەڵام بۆ ئەوەی ئەم دو میللەتە لە یەک دڵگیر نەبن. هەرا و هوریا نەکەوێتــە بەینیانــەوە و. ئیتیحادەکــەیان زیاتر دەوام بکات و. بە ئەبەدی و بە جددی بژین محافەزەی حقوقی میللیەی کوردەکانیان بە شەرط گرتوە و. لــەم ئیتیحادەدا دانی هەمو حقوقێکی مەشروعەی کوردەوارییان بە پێویست زانیوە. لەگەڵ ئەمەیشا کــە هــەتاکو ئێســتا ئەم حقوقە لە حکومەتی عیراقا نەکراوە بە قــانون و کەســبی قــەطعیەتی نــەکردوە. بــەڵام صــاحێب مەنصــەبەکانی حکومەتی فەخیمەی بریتانیا. دائیمەن لە کوردستانا ریعایەتی ئــەم مەســئەلە و لــە هــەمو خسوســێکەوە محافــەزەی حەیثیەتی میللی کوردەکانیان کە لە مەکاتیب دا تەدریسات و لەمەخابەراتی رەسمیەدا نوسین بە زبــانی مــادەرزادی خۆیان بێ و. بەم سەبەبەوە هەمو کوردەکانیان مەدیونی شوکرانی خۆیان کردوە.

غەیری ئەمیش وەقتێک کە کۆمەڵی عالی عیصبەتول ئومەم بۆ حەلی ولایەتی موصل تەشــریفیان هێنایــە ئەم موحیطانە. دیسانەوە حکومەتی فەخیمەی بریتانیا ئەم قەرارەی کە لــە پێشــا دابــوی و کــە بــۆ محافــەزەی حقوقی میللی کوردەکان بو لەوانیشی حاڵی کرد و. بە هەمو نەوعێک بەوانیشی ســەلمان کــە ئــەم میللەتــە بــەم شەرائیطانە قابلە لەگەڵ عیراقا بــژی و حەقیقەتــەن ئــەوانیش لــە دوای تــەحقیقات بۆیــان مــەعلوم بــو کــە لــەم ئیتیحادەدا نابێ عەنعەناتی میللی کوردەکان مەحو بکرێتەوە و نەتیجە لە عەلاوەی ولایەتی موصلی دا بە عیراق ئەم شەرائیطانەیان بۆ کوردەکان هێنایە وجود و ئەم حقوقەیان پێ بەخشین و حکومەتی عیراقیش ئیعتیرافــی پێ کرد و. بۆ تەتبیقی وەعدی دا.

ئەم هەنگاوەی کە قابینەی سەعیدیە هاویشتی و کە لە سینەی کوردەواریدا بە شوکران و مەمنونیەتەوە قەید کرا کە ئەم خەطوە موبارەکە بو بە حەلقەی ئەولای سیلسیلەی سیاسەتێکی موتەفیقانە و برایانە بەرامبــەر بە عونصوری کورد. هەروا ئەم حقوقانەی کە بــە کوردەکــان ئــەدرێ و کــە ئــەم قابینەیــە بــە هــەمو عەزمیــەوە کردویــەتی بــە غایــە و بــە پرۆغرامێــک بــۆ خــۆی کــە ئیفــا و تــەثبیتی بکــات ئــەبێ بــە ســەبەبی شــوکران و مەسروریەت و مەمنونیەتێکی ئەبەدی ئەم میللەتە و لە نەتیجەیش دا ئەم ئیتیحادە حکومــەتێکی عــالی گــەورە و صاحێب حقوق بە ناوی (عیراق) هوە ئەهێنێتە وجود و ئیلەل ئەبەد مەحفوظ و بێ غایە ئەمێنێتەوە.

ئیتر دیسانەوە بەرامبەر بەم لوتفە گەورەیە تەشەکوری حکومــەتی عەلیــەی عیــراق و قابینــەی ســەعیدیە ئەکەین و ئومێدمان وایە بە مودەتێکی کەم هەمو حقــوقێکی تریشــمان پــێ ئیعطــا و لــە قــەوانینی عیراقــا بــۆ تەثبیت بکرێ. (ژیان. ژ 235. 17 ی 4 ی 1930)

**4. 6. 4. تەلغوراف بە موناسەبەتی قانونی (اللغات المحلیة) وە:**

صورەتی ئەو تەلغورافانەیە کە بە موناسەبەتی ئەم خەبەرە خۆشەوە لـە تـەرەف ئەشـراف و رەئیسـی بەلدەی سلێمانیە وە بۆ بەیانی تەشەکور و منەتداری بۆ مەقاماتی عالیە نوسراوە:

**تەلغورافی ئەشرافی سلێمانی**

فەخامەتی رەئیسەل وزەرای قەهرەمانی عیراق نوری سەعید پاشا

صورەتی بۆ فەخامەتی مەندوبی سامی

صورەتی بۆ مەعالی موستەشاری داخلیە

موقابیل بە قەراری حکومەت بۆ ئیصداری زمـانی کـوردی لـە مـەناتیقی کوردیـەدا و ئیعطـای حقـوقی سائیرەی کوردان، تەشەکوراتی خالیصانەمان تەقدیم و ئینتیظاری لوتفی زیاتر ئەکەین.

عەبدولڕەحمان ئاغا زادە، محەممەد. حەفید زادە، عەبـدولقادر. بابـان زادە، عـەزمی. ئەحمـەد پاشـا زادە، عەبدولڕەحمان. عوثمان پاشا زادە، عیززەت. حاجی ڕەسوڵ ئاغا زادە، مەجید. مەعروف ئاغا زادە، حاجی مـەلا محێدین. خەففاف زادە، حاجی ئیبراهیم. حەفیـد زادە، سـەید عەبـدوڵڵا. شـێخ مـەعروف زادە، شـێخ محەممـەد غەریب. حسێن ئاغا زادە، حاجی حەمە ئاغا. قەزاز زادە، تۆفیق. (ژیان، ژ 235، 17 ی 4 ی 1930)

**تەلغورافی رەئیسی بەلەدیەی سلێمانی**

بۆ فەخامەتی رەئیسەل وزەرا، زەعیمی عیراق نوری سەعید پاشا

صورەت بۆ فەخامەتی مەندوبی سامی

صورەت بۆ مەعالی موستەشاری داخلیە

بەرامبەر بە لوتفکاری حکومەت بۆ ئیصداری قانونی زمانی کوردی لە مەناتیقی کوردییەدا و بەخشـینی حقوقی سائیرەی کوردان بە ناوی ئەهالی سـلێمانیەوە تەشـەکوراتی خالیصـانە تەقـدیم و تەمـەنای مۆفـەقیتان ئەکەین. رەئیسی بەلەدیە. (ژیانژ 235، 17 ی 4 ی 1930)

**تەلغورافی رەئیسی بەلەدیەی سلێمانی بۆ رەئیسی بەلەدیەی کەرکوک**

بۆ رەئیسی موحتەرەمی بەلەدیەی کەرکوک

موقابیل بە لوتفی حکومەت بـۆ ئیصـداری قـانونی زمـانی کـوردی لـە مـەناتیقی کوردیـەدا، بـە نـاوی سلێمانیەوە تەبریک و ئیشتیراکی سرورتان ئەکەین. رەئیسی بەلەدیەی سلێمانی. (ژیان، ژ 235، 17 ی 4 ی 1930)

**تەلغورافی رەئیسی بەلەدیەی سلێمانی بۆ رەئیسی بەلەدیەی هەولێر**

بۆ رەئیسی موحتەرەمی بەلەدیەی هەولێر

موقابیل بە لوتفی حکومەت بـۆ ئیصـداری قـانونی زمـانی کـوردی لـە مـەناتیقی کوردیـەدا، بـە نـاوی سلێمانیەوە تەبریک و ئیشتیراکی سرورتان ئەکەین. رەئیسی بەلەدیەی سلێمانی. (ژیان، ژ 235، 17 ی 4 ی 1930)

**جوابی رەئیسی بەلەدیەی کەرکوک**

بۆ موحتەرەم رەئیسی بەلەدیەی سلێمانی

بۆ محافەزەی حقوقی کوردان ئێمەیش تەشەکوری لوتفی حکومەت و ئیشتیراکی سروری هەمو کـوردان ئەکەین. رەئیسی بەلەدیەی کەرکوک. (ژیان، ژ 235، 17 ی 4 ی 1930)

**جوابی رەئیسی بەلەدیەی هەولێر**

بۆ موحتەرەم رەئیسی بەلەدیەی سلێمانی

بەناوی هەولێرەوە تەبریکاتی بەرامبـەریمان تەقـدیم، زیـاتر بڵنـدی وڵاتمـان دوعـا ئەکـەین. رەئیسـی بەلەدیەی هەولێر. (ژیان، ژ 235، 17 ی 4 ی 1930)

**وەکو مەوثوقەن**

بیستومانە جگە لەم تەلەغرافانەیش روئەسای موحتەرەمـەی عەشائیرەکانیشـمان بەرامبـەر بـەم قـەرارە خۆشە بە تەلغوراف عەرزی منەتداری و تەشەکوراتیان تەقدیمی مەقامات کردوە. (ژیـان، ژ 250، 10 ی 7 ی 1930)

**4. 6. 5. ژیان برایەکی خۆشەویست و پشتیوانێکی بەقوەتی چنگ کەوت**

چەند رۆژێک لەمەوپێش بە سرورەوە بیستمان غەزەتەی کەرکوک کە رەفیقێکی خۆشەویستی ژیانە بـە سەبەبی ئەوەوە لە کوردستان و لـەناو میللەتـی کـوردا ئینتیشـار ئـەکات بـۆ ئـەوەی ببـێ بـە ئاوێنـەی حـاڵ و تەرجومانی حەقیقەتی میللەتەکە، ئیتر لەمەودوا قیسمێکی زۆری بە کوردی ئەنوسرێ و ئینتیشار ئەکات. ئـەم خەبەرە بە جددی سرور و خۆشیەکی تەواوی خسـتە دڵـی میللەتەکەمانـەوە و هـەمو کوردێـک بـە پەرۆشـەوە چاوەروانی راستی ئەم خەبەرە خۆشە و بە عەجەلە ئینتیظاری چاوپێکـەوتنی ئـەو غەزەتـە کوردیـەی ئـەکرد. شوکر دوێنێ لەناکاودا خەبەرەکە تەحەقوقی کرد و غەزەتەکە کە دو صـەحیفەی بـە کـوردی نوسـرا بـو هاتـە سلێمانی، بە داخڵ بونی حەیاتێکی تازەی خستە وجودی میللەتەکەمانەوە و بەم سەبەبەوە (ژیان)یش برایـەکی عەزیز و پشتیوانێکی بە قوەتی بۆ پەیدا بو.

خوێندەوارەکانمان تاقم تاقم بۆ چاوپێکەوتن و خوێندنەوەی ئەم غەزەتە بـە قیمەتـە موحتەرەمەیـە شەتابیان ئەکرد و، حەقیقەتەن ئەم مەسئەلەیە ئەمەندە خـۆش بـو کـە لـە موقابیلیـا نـاتوانین بـە تـەواوی دەرەجەی سروری میللەتەکەمان بەیان و تەعریف بکەین چونکـە ئـەم دو لیوایـە کـە دراوسـێی یـەکترین و ئەهالیەکەی هاوخوێن، هەم جـنس، هاوزبـان و هـەمو غایەیـەکیان یەکـە بـە سـەبەبی ئـەوەوە غەزەتـەی کەرکوک هەتا ئێستا بـە لیسـانی محـەلی و مـادەرزادی خـۆی ئینتیشـاری نەئـەکرد لـە هـاواری یـەکتری نەئەگەیشتن و بە فریادی یەکتری نەئەکەوتن بەڵام وا شوکور بە سـەبەبی لـوتفی حکومـەت و مەئمورینـە ئیداریە بە قیمەتەکانمانەوە ئەم مانیعە هەڵگیرا و ئەم پەردەیەی بەسەرمانا راکێشرا بو لابرا و لە یـەکتری ئاشکرا و مەعلوم بوین.

بەرامبەر بەم حەرەکەتە مەعقولە، ئەم مژدە خۆشە و ئەم لوتفە گەورەیە، علەنەن بە نـاوی میللەتەکەمانـەوە تەشەکوری حکومەتی موشفیقە و حەقپەرستمان ئەکەین. ئومێد ئەکـەین ئیتـر ئـەم 3 بـرا عـەزیزە کـە: زاری کرمانجی، کەرکوک و ژیانە دەست بدەنە دەست و پشتیوانی یەکتری بن و بە هـەمو قوەتیانـەوە بـۆ تـەرەقی و تەعالی موڵک و میللەتەکە هەوڵ بدەن و تێ کۆشن. (ژیان، ژ 238، 8 ی 4 ی 1930)

**4. 6. 6. غەزەتەی کوردی کەرکوک**

دیسانەوە بە خۆشیەوە خوێندمانەوە غەزەتـەی کـەرکوک کـە هـەتا ئێسـتا دو سـەحیفەی بـە کـوردی دەرئەچو قەرار دراوە هەمو رۆژێکی دوشەممە دەرچێ و چوار سەحیفەی بە کـوردی بـێ. بەرامبـەر بـەم مـژدە خۆشە میللەتەکەمان پێخۆشحاڵ بو ئومێد ئەکەین ئەم برا خۆشەویستەمان هـەتا سـەر بـە موەفـەقی خدمـەتی وەتەن و میللەتەکە بکات. (ژیانژ 240، 22 ی 4 ی 1930)

**4. 6. 7. پەیوەندیمان بە برا کوردەکانمانەوە**

ویستی ئەزەلی لە چارەی نوسیون- مەبەستی عەرەب و کوردە. نم- کە هاوکار و یەککگرتو بن بەرامبـەر مەترسیەک کە ئەکەوێتە سەر یەکێتی عیراق. ئێمـە و کـورد یـەک ئوممـەین، مێـژو تێکـەڵاوی خـوێن و دیـن و قازانجی هاوبەش یـەکی خسـتوین. ئـەم پێوەندیانـە کاریگـەرن لـە ژیانمـان دا. نکـوڵی لـەوە نـاکرێ کـە ئیستیعمار هەوڵی لاواز کردنـی ئـەم پێوەندیانـەی داوە، بـەڵام بـاوەڕی کـوردو عـەرەب بـە یـەکتری تیـاری ئیستیعماری راگرت.

صیربەکان بیری جیابونەوەیان لە تورکیا لەلای ئالبانیەکان خۆش کرد چارەنوسیان چی بو؟ بـون بـە دەسکەلا سیاسەتی نەمسایی و یۆگۆسلاڤی گەمەیان پێ ئەکەن. ئەرمـەنیش، بـە یارمـەتی هاوپەیمانـەکان دژی دەوڵەتەکەیان، شوێن پێی ئالبانیەکان کەوتن، وا ئـەمڕۆ توشـی دەربـەدەری بـون وڵاتێـک پـەنای بـۆ بـەرن و دەسەڵاتێکیان نیە.

ئێمەش ئەمڕۆ، بە داخەوە، هەست بەو تێکدانە ئەکەین کە بـە رۆژی رونـاک روبـەروی ئـەو مەترسـیە ئەبینەوە، ئەوەی داخەکەش زیاد ئەکا، ئەو بەیانەی سـەرۆکی وەزیرانـە کـە ئەیـەوێ زمـانی کـوردی بکـا بـە زمانێکی رەسمیی لە وڵات دا بەپێی مادەی 17 ی قانونی ئەساسیی عیراق.

ئێمە لەلایەنی برا کوردەکانمانەوە لەمە ئەدوێین. سەرەرای ئـەو ئاژاوەیـەی لـە وڵات دا دروسـت ئـەبێ بەوەی دو زمان بکرێ بە رەسمی، ئەبێ زمانی رەسمی هەر یەکێک بێ بـۆ رایـی کردنـی قـازانجی وڵات. بـرا کوردەکانمان لەوە تێ ئەگەن کە ئەگەر کوردیان بە زمانی رەسمی قوبوڵ کرد... چۆن ئەتوانن لەگـەڵ عـەرەبی عیراق بەشدار بن لە بەرێوەبردنی دەوڵەت دا و لە راییکردنی کارەکانیان دا لە قوتابخانە بـەرزەکان و جـەیش و دیـوانی وەزارەتـەکان داو، نائیبـەکانی کـورد چـۆن ئـەتوانن داکـۆکی لـە ئاواتـەکانی هـەڵبژێردەرەکانیان بکەن؟.ئێمە ئەو بەیان وەزاریەی باسمان کرد بە سەرەتایەکی خراپ ئەزانین. هیواداریین وڵات لە ئەنجامـەکانی رزگاری بێ و بیر لە هیچ نەکەینەوە جگە لە رزگاری نیشتمانی هاوبەش لە شەڕی دەسـەڵاتی بێگانـە. محـامی، علی محمود معتمدی حیزبی وطنی. (البلاد، ع 130، 13 ی 4 ی 1930)

**4. 6. 8. قسەی سەرۆکی وەزیران بۆ رۆژنامەکان**

قسەی من دەربارەی مەسەلەی کورد کە لەو کۆبونەوەیـەدا بـاس کـراوە ئەوەیـە: ئێمـە ئـەوەمان لـەبیر نەچۆتەوە کە لە سەردەمی عوسمانیدا چیمان هەست پێ ئەکرد کە داوامان ئەکرد زمانی عەرەبی بکرێتە زمانی رەسمی لە وڵاتانی عـەرەبیدا. جـەنابی خـەطیب... پـاش نـابوت بـونی سیاسـەتی تورکانـدن لـە مەملەکـەتی عوسمانیدا، ئەو سیاسەتە ئەو وڵاتەی وێران کرد و، گەلەکانی هەڵوەشاند. ئێمـە ئەمانـەوێ بـرا کوردەکانمـان عیراقی راستگۆ بن وەکو عەرەب بە دڵ داکۆکی لە وڵات بکەن نەک بە قسە و روپامایی. (البلاد، ع 132، 15 ی 4 ی 1930)

### 4. 6. 9. زمانی کوردی لە کەرکوک رەسمی نیە

لـە سـکرتێری وەزارەتـی مەعاریفـەوە بۆمـان هـاتوە کـە وەزارەتـی مـەعاریف، هـەرگیز بیـری لـەوە نەکردۆتەوە زمانی کوردی بکاتە زمانی رەسمیی خوێندن لە قوتابخانەکانی نـاو کـەرکوک دا، هەرچیـەک لـەم روەوە بڵاوکراوەتەوە دورە لە راستیەوە.

(البلاد، ع 201، 9 ی 7 ی 1930)

### 4. 6. 10. بۆ جەنابی مودیری موحتەرەمی ژیان

تکا ئەکەم ئەم چەند قسەیەم لە غەزەتەی موحتەرەمتانا دەرج بفەرمون بۆ بەیانی حەقیقەت:

لە ژمارە 196 ی 3 ی 7 ی 1930غەزەتەی البلاد دا لە ژێر ئیمزای نـەزیل بغـداد دا چەنـد قسـەیەک گوترا بو کە تەئیدی قسەی موخبیری غەزەتەی مەزکوری ئەکرد کە لە کەرکوکەوە بۆی نوسیوە.

ئەویش ئەفەرموێت تکا لە وەزارەتی مەعاریف ئەکەم ئەو سـوئی تەفاهومـە کـە لـە بـەینـی تەلەبـەکانی کەرکوک دا واقیع بوە هەڵی گرن، بە سەبەب بـونی لیسـانی کـوردی بـە لیسـانێکی رەسـمی لـەو مەنتیقەیـەدا چونکی لە مەنتیقەی کەرکوک چەند کەسێک نەبێ هیچیان کوردی نازانن.

ئینجا من کە کەرکوکیم لەم قسـەیە سـەرم سـوڕما و بـە موناسـیبم زانـی لـەم خسوسـەوە بـۆ بـەیانی حەقیقەت چەند کەلیمەیەک عەرزی خوێندەواران بکەم.

ئێمە نامانەوێ موناقەشەی ئەم زاتە موحتەرەمە بکەین لە خسوس کوردی زانینی ئەهالی کەرکوکەوە یـا نەزانینیانەوە، چونکی ئەمە شتێکی ئاشکرایە و وەکو رۆژ مەعلومە کە نەفسی مەرکەزی لیواکە بە ئەکسـەریەت کورد تەشکیل ئەکات و بۆ خاریجی لیوا هیچ حاجەت بە نوسین نیە چونکی هەمو کەس ئەیزانێ هەمو کوردن و لەژێر هەوا و لەبەر کانی و بەفراوی کوردستانا ئەژین و زۆر لە کۆنەوە بە کوردایەتی خۆیـان ئیفتیخاریـان کردوە. بەڵام لام وایە جەنابی موحەرڕیر غەریبەو تازە هاتۆتە کەرکوک، لەبەرئەوە شارەزای ئەحواڵی ئیجتیماعیە و لیسانی مەملەکەتەکە نەبوە. ئەگەر ئاشنا بوایە هیچ وەختێک لەم جۆرە خیلافی حەقیقەتانەی نەدەنوسی. فەقەت موخبیر و نەزیلی بەغداد لێیان مەعلوم بێت بە ئیجاد کردنی ئەم نەوعە قسـە ناحەقانـەی ئـەوان هـیچ وەختـێ قەراری عەسبەتول ئومەم ناگۆڕێ لە خسوس بەخشینی ئەو حەقە کە بە کوردەکانی شیمالی عیراق دراوە و ئەم قەرارە لە تەرەف حکومەتی بەریتانیای گەورە و حکومەتی عیراقەوە فیعلەن تەسدیق و قوبوڵ کراوە و غـەیری ئەمەیش فەخامەتی رەئیسی وزەرای عیراقیش نوری پاشا سـەعید تەئیـدی ئـەم قـەرارەی کـرد و ئـەمریدا لـە مەناتیقی شیمالیەدا تەتبیق بکرێ بەڵام مەعەل ئەسەف جەنابی موخبیر تازە لە کلکەوە دەستی پێ ئـەکات. زۆر چاک لایان مەعلوم بێـت تـەنها بـۆ چەنـد تورکمانێـک ئیسـتیقبالی کوردەکـانی کـەرکوک و ئـەترافی مـەحو و حقوقیان زەوت ناکرێ. کەرکوکی: عەبدولوەهاب. (ژیان، ژ 250، 10ی 7 ی 1930)

### 4. 6. 11. قانونی زمانە ناوچەییەکان ژمارە 74 ی ساڵی 1931

ئێمە مەلیکی عیراق

بە موافەقەتی ئەعیان و نواب فەرمانمان دا بە دانانی قانونی لای خوارو:

مادەی 1:

ئەحکامی ئەم قانونە لەو قەزایانەدا جێبەجێ ئەکرێ کە لە مادەکانی دوهەم و سێهەم ناو براون.

مادەی 2:

ئەلف.

زمانی دادگا لەم قەزایانەدا کوردی ئەبێ: ئامێدی، زاخۆ، زێبار، ئاکرێ، کۆیە، رانیە، رەواندز، گل، چەمچەماڵ، سلێمانی، هەڵەبجە، شارباژێر.

مادەی 3:

زمانی دادگا، لەم قەزایانەدا، ئەگونجێ عەرەبی یا کوردی یا تورکی بێ: دهۆک، شێخان، هەولێر، مەخمور، کەرکوک، کفری. دادگا لە هەر حاڵەتێک دا خۆی بڕیار ئەدا چ زمانێ بەکار بهێنرێ.

مادەی 4:

تاوان بە پاڵ دراو لە هەمو حاڵەتێک دا و لە هەمو ئەو قەزایانەی لە سەرەوەدا ناوبران، مافی هەیە:

ئەلف.

بە زمانی عەرەبی دادگایی بکرێ و ئاگادار بکرێ، ئەگەر زمانی ناوماڵی بێ.

باء.

هەمو مرافعاتی بە دەم بۆ تەرجومە بکرێ بۆ عەرەبی یا کوردی یا تورکی، نسخەیەک لە حوکمەکەی بە تەرجومەکراوی بۆ یەکێ لەو زمانانە داوا بکا، هەمو کەسێ بۆی هەیە عەریزە بە یەکێ لە زمانەکانی عەرەبی یا کوردی یا تورکی بدا بە هەر یەکێ لە دادگای ئەو قەزایانەی ناوبران یا دادگەیەکی بەرزتر.

مادەی 5:

زمانی کوردی لەو قەزایانەدا رەسمیی ئەبێ، جگە لە دائیرە فنیەکان و نامەکاری نێوان ناوەندی لیواکان و وەزارەتەکان و نێوان ناوەندی لیوای موسڵ و قەزاکانی کە بە عەرەبی ئەبێ: ئامێدی، ئاکرێ، دهۆک، زاخۆ، زێبار، هەولێر، مەخمور، کفری، رانیە، رەواندز، چەمچەماڵ، گل، سلێمانی، هەڵەبجە، شارباژێر.

بەڵام لە قەزاکانی کەرکوک و کفری کوردی یا تورکی بەکار ئەهێنرێ.

مادەی 6:

لە هەمو قوتابخانە سەرەتاییەکانی قەزاکانی ناوبراون زمانی فێرکردن زمانی ناوماڵی زۆرایەتی قوتابیەکانی ئەو قوتابخانەیە ئەبێ، ئیتر عەرەبی یا کوردی یا تورکی بێ.

مادەی 7:

هەمو کەسێ بۆی هەیە بە زمانی عەرەبی موراجەعەتی سوڵتانی رەسمی بکا، بە هەمان زمان وەڵام ئەدرێتەوە، بەڵام هەر نامەکارییەکی بە زمانێک کرا کە بە پێی مادەی پێنجەمی ئەم قانونە رێ درابێ وەرئەگیرێ، بەهەمان زمانی پێی نوسراوە وەڵام ئەدرێتەوە.

مادەی 8:

لە قەزاکانی لیواکانی سلێمانیو کەرکوک و هەولێردا کە لەم قانونەدا ناوبراون، شێوەی زمانی کوردی ئەوە ئەبێ کە ئێستا بەکاری ئەهێنن. لە قەزاکانی لیوای موسڵدا کە لەم قانونەدا ناوبراون، خەڵک خۆیان، لە ماوەی ساڵێک دا لە کاتی جێبەجێ کردنی ئەم قانونەوە، ئەو شێوە زمانە کوردیە هەڵئەبژێرن کە خۆیان ئەیانەوێ.

مادەی 9:

لەسەر وەزیرەکان پێویستە ئەوی پێوەندی پێیانەوە بێ، جێبەجێی بکەن.

لە بەغداد، لە 23 ی ئاباری 1931 دا بەرامبەری 6 ی موحەرەمی 1350 نوسرا. فەیسەڵ، مەلیک. نوری سەعید، سەرۆکی وەزیران و وەکیلی وەزیری ئابوری و هاتوچۆ. موزاحیم پاچەچی، وەزیری ناوخۆ. جەمال بابان، وەزیری عەدل. عەبدوڵڵا دەمەلوجی، وەزیری دەرەوە. جەمیل راوی، وەزیری دیفاع. رۆستەم حەیدەر، وەزیری دارایی، عەبدولحوسەین، وەزیری مەعاریف.

الوقائع العراقية، ع989، 1 ی 6 ی 1931 هەروەها (FO371 ی 15318)

### 4. 6. 12. تەشریف هێنانی وەزیری داخلیە موزاحیم بەگ بۆ سلێمانی

ڕۆژی شـەممە موصـادیفی 16 ی 4 ی 1931 فەخامـەتی وەزیـری داخلیـە جـەنابی مـوزاحیم بـەگ تەشریفیان هێنا بۆ سلێمانی، لە پێش مواصەلەتیانا لە تەرەف رەئیسی بەلەدیە جەنابی مەحمود ئەفەندیەوە بـۆ ئینتیظاری موستەقبیلین ئیحزاراتی لازمـە ئیجـرا کـرا. هـەمو ئـەرکان و موسـتەخدیمین مـەئمورینی موڵکیـە و ریجالی عەسکەریە و عولەما و سادات و ئەشـراف و موتەحـەیزانی مەملەکـەت لـە قـەراغ شـار لـە زوهـرەوە ئینتیظاری تەشریفیان کرد سەعات لە پێنج مواصەلەتیان فـەرمو موتەسـەڕیفی کـەرکوک سـەعادەتی تەحسـین بەگ لە رەفاقەتیان مەوجود بو. سریەیەک عەسکەری و میقدارێک پۆلیس لە رەسمی سەلاما صەفبەستەی سەلام بون لەگەڵ مواصەلەتیان موقابیل بە تەرحیب و خۆشئامەدی موستەقبیلین وەزیری موشار ئیلەیهیش موقابەلەتەن ئیزهاری ئیلتیفاتیان فەرمو. وەزیری موشار ئیلەیهی لەگەڵ رەفیقی موحتەرەمی سـەعادەتی تەحسـین بـەگ لـە ماڵی سەعادەتی موتەسەڕیفی لیوا جەنابی ئەحمەد بەگ میوان بـون. هـەر عـەینی ئێـوارێ ڕۆژ و شـەو لەگـەڵ سادات و عولەما و ئەشرافی بەلدە مولاقاتیان فەرمو.

دوەم ڕۆژ کە یەکشەمە بو لە تەرەف رەئیسی بەلەدیە جەنابی مەحمود ئەفەندیەوە بە شەرەفی فەخامەتی وەزیری موشار ئیلەیهیەوە دەعوەتێکی چایی و شەربەت لە باغچەی بەلەدیەدا کرا بۆ ئەم دەعوەتە هەمو سـادات و عولەما و ئەشراف و موتەحەیزانی مەملەکەت بە تەذکەرەی مەخسوسە دەعوەت کـران و لـە سـەعاتی پێنجـی الافرانغەدا ئیجتیماع لە مەوقیعی مەزکورا کرا لە پاش قەهوە و چـا و شـەربەت لـە تـەرەف جـەنابی رەئیسـی بەلەدیەوە بە ناوی بەلدەوە نوتقـێکی بەلیغی خۆشئامەدی فەخامەتی وەزیر ئیراد کرا. لە پـاش ئـەو بـە نـاوی عولەماکانەوە لە خسـوس تـەکایا و مەسـاجیدەوە نوتقـێک لـە تـەرەف شـێخ محەممـەد ئەفەنـدی گولانیـەوە خوێنرایەوە. لە پاش ئەو قەس هورمز ئەفەندی بەناوی قیسمی مەسیحیەوە نوتقـێکی خۆشئامەدی خوێنرایەوە و لە عەقەب ئەوەوە حاخامی میللەتی یەهودیش بە ناوی میللەتەکەیەوە نوتقـێکی خۆشـئامەدی ئیـراد کـرا. لـە دوای ئەو رەشید نەکی ئەفەندی مـودیری مەکتـەبی متەوەسـیطە بـە نـاوی مەعاریفـەوە عـەرزی خۆشـئامەدی و تەمەنای معاوەنەتی مەعاریف نوتقـێکی سەلیس خوێنرایەوە.

وە لە تەرەف تەلەبەکانی مەکتەب نەشیدێکی خۆشئەلحان بێژرا و لـە تـەرەف تەلەبەیـەکی کەششـافەش نوتقـێکی موئەثیر بە شێوەیەکی مەعصومانە وتـرا و لـە تـەرەف تەلەبەیەکیشـەوە بـەعزێ ئەشـعاری لـەطیف خوێنرایەوە. وە لە عەقەبی هەر نوتقـێک زۆر بە حەرارەت چەپڵەرێزان و ئیزهاری شادمانی و مەمنونی کرا لـە پاش ئەمانە ئینجا فەخامەتی وەزیر ئیرادی نوتقـێکی لەطیف و دڵنەوازانەی فەرمو و لەم نوتقە هەمو حـازرون موستەغریقی نەشاط و مەمنونی بون. ئەم نوتقانە بـە تەسەلسـولی خـۆی لـە ژێـرەوە عەینـەن دەرج ئـەکرێن. (ژیان، ژ 283، 25 ی 4 ی 1931)

### 4. 6. 13. نوتقی فەخامەتی وەزیری داخلیە، موزاحیم بەگ

برادەرینە!

زۆر تەشەکورتان ئەکەم بەرامبەر بەم ئیعزازو ئیکرامە کە موقابیلم ریعایەتتان کرد و تەشـەکوری ئەوضـاع ئەکەم کە مۆفەقی کردم بە ئیجرای مەرام کە دەمێک بو رێک نەئەکەوت و ئەویش عیبارەت بو لە زیارەتی ئەم لیـوا کەریمە و گفتوگۆ کردن لەگەڵ روئەساو صاحێب رەئیەکان دا. چونکە نازانم ئایە ئێوە ئەزانن کە من بەرامبەر برا کوردەکانم نیات و حسیاتی زۆر چاکم هەیە و دەمێکە لە لای زۆر کەس ئیزهار و بەیانم کردوە.

من هەروەکو لەمەوپێش بوم، ئێسـتاش موعتەقیـدم بـە سیاسـەتی حوبیـەی تـەعاون لـە بـەینی هـەردو عونصوردا چونکە یەگانە رێگا ئەوەیە بۆ تەکەفولی تەرەقی و تەعالی عیراق و گەیشتنی بـە مـەوقعێکی دوەلـی

کە لایەق بێ بە میللەلی موتەرەقیە. بە سرورەوە بەیانی ئەکەم کە لە گفتوگۆدا کـە لەگـەڵ زۆر نەواتـی ئێـوەدا کردم صیحەتی ئیعتیقادم بۆ سابیت بو وە بۆم مەعلوم بو کە من و ئێوە لە یـەک فکـرداین و ئیختیلافمـان لـە بەینا نیە ئەو چەند نوقتە جوزئییانەی کە بەعزێ کەس ئیشارەتیان کرد ئەوانە زادەی سـوئی تـەفاهومن و لـە حەقیقەت و لە ئەصڵی واقیع دا هیچ شتێ نیە تەئیدی بکات.

بۆم مەعلوم بو – بە خۆشحاڵیەوە – کە عوموەمن موخلیصـن بـە وەحـدەتی عیراقیـە و لـەرێگای بڵنـد کردنەوە و تەقویەیدا فیداکارن ئەمە بە رەغمی ئیشاعەی بەدخواهان و رەغمی دوشـمنانی عیـراق رجـا ئەکـەم تەعەجوب مەکەن لەم تەعریفە چونکە مەعـەل ئەسـەف لـە عیـراق دا دوشـمنی عیـراق هەیـە کـە بـە واسـیتەی معامەلەیانەوە خەلەلیان داوە بەشەئن و شوهرەتی ئەو عونصورە کە ئینتیسابیان پێی هەیە.

لە جوملەی ئەو عەوامیلە کە منی هێنایە سەر هەوەس و ئارەز و کە داخڵی وەزارەتـی فەخامـەتی نـوری سەعید پاشا ببم، یەکێک ئەوەیە کە ئەکیدەن ئەزانم وەزارەتی موشـار ئیلـەیهی بەرامبـەر بـە کوردەکانمـان بـە عاطیفەتێکی زۆر لە سیاسەتیدا معامەلە ئەکات و لەوەدا مەرامی خۆم دەست کەوت و ئێستا خۆشحاڵم بەوە کـە ئیعلانی بکەم بۆ ئێوە کە سیاسەتی حکومەت کە من تەشەرۆف ئەکەم بـە وەزارەتـی داخلیـەی لـەم کەلیماتـەدا خولاصە ئەکرێ.

تا حەدی مونتەهای ئیمکان- سیاسەتی عەطوفەت و ئیخلاص بۆ ئیحیای حسـی تـەعاون لـە بـەینی هەردو عونصوردا بۆ بڵند کردنەوەی شەئنی ئوممەتی عیراقیە و دەستکەوتنی ئیستیقلالی تـام و گەیانـدنی سەفینەکەی بە ساحیلی سەلامەت ئینشـائەڵڵا. وە ئێـوە چاوتـان لێیـە کـە ئـەم سیاسـەتەمان سیاسـەتێکی بابەتیە، سیاسەتی ئاغا و خزمەتکاری نیە، جا چەند موتەئەللیم ئەبوم کە ئەمبیستەوە بەعزێ لە کوردەکـان عونصوری کوردی ئەکەن بە ئەقەلیەت چونکە ئەی برا گەورانم لەمـەدا ئیهانـەتێک ئـەبینم بـۆ عونصـوری موبارەکتان ئـەو عونصـورە کـە لەمـەوپێش ویسـتومانە و ئێسـتایش هـەر ئەمانـەوێ لـەم دەوڵەتـە تـازە پێگەیشتوەدا شەریکی برای عەرەبی ببینین. ئەگەر دەست بدەینە تـاریخی بـەعزێ فامیلیـا و شەخصـیاتی بارزە لەم عیراقە خۆشەویستەدا قیسمێکی زۆریان لەوانە ئەدۆزرێنەوە کە لـە میللەتـی موحتەرەمـەی کـورد دەرکەوتوە. جا لەبەر ئەمە سیاسەتی تەعاون لەژێر سایەی وەحدەتی عیراقیەدا لە ماضی و حـازردا ئێمـەی کردوە بە شەریک لە حوکم و لە هەمو معامەلاتی حکومـەتی و ئیجتیمـاعی داو لام وایـە موافەقـەتم ئەکـەن ئەگەر بڵێم بۆ تەعالی و تەرەقی کوردەکان یەگانە ضامن وەحدەت و ئیستیقلالی عیراقە و تەماشـاکردنێکی بەسیط بە ئەحواڵیان لێرە و لە مەمالیکی سائیرەدا موستەغنیان ناکات لـە ئیـرادی بـەراهین و تەفصـیلات. زەمان گۆرا، ئـەحواڵ زۆر تەبـەدولی کـرد و تـەطەوراتی دەولیـە و عالەمیـە هاتـە پێشـەوە کـە هەڵئـەگرێ حەقائیقی بدۆزینەوە و لە سیاسەت و فکـر کردنـەوەدا ئوصـوڵ و ئوسـلوبی بـێ فائیـدە و کـۆن تەبـدیل بکەین و عەجەلە بکەین بۆ لابردنی ئەو حەسرەت و ئالامە کە لـە ئێمـەدا دروسـتی کـردوە و بـۆ ئێمـە وا شیرینە سلوک بکەینە سەر رێگایەکی تـازە کـە لەگـەڵ واقیـع دا ئیئتـیلاف بکـات و لەگـەڵ مومکینـات دا موعاریض نەبێ و نەفسی خۆمـان فیـدا ئەکـەین بـە هـەوا و هـەوەس و مـەطامیع کـە ئـەحواڵی مەعلومـە نیهایەتی پێ داوە هەروەکو نیهایەتیدا بە موعاهەدەی سیڤەر و نصوصە خاصەی کە موتەضەمینی بو.

جا ئـەی برادەرینـە لەسـەرمان لازمـە لـە ئـەوهام دور بکەوینـەوە و تەصـەروفاتی سیاسـیەمان لەسـەر ئەساسەتێکی وا دابنێین کە قابیلی پێ گەیشتن بێ. وە باوەڕ بکەن کە لە شەخصیەتم دا دۆستی هەیە بۆ ئێوە کە بە ئەهمیەت معاوەنەت و سەعی ئەکات کە دڵتان خۆش بکات و ئامـالی مەشـروعەتان بـەجێ بهێنـێ لـەژێر سایەی واسیعی وەحدەتی عیراقیەدا، ئەو ئامالە کە نابێ لە هیچ وەقتێک دا لە ئەوقات موعاریض و موباین بـێ لەگەڵ مەصڵەحەت و ئیستیقلالی تەواوی دەوڵەتی عیراقیەدا.

سیاسەتی بریتانیا بەرامبەر بە عیراق تەوەضوحی کرد و بە شکڵێ تەبیینی کرد کە شک و تەئویل قبوڵ ناکات. وە وزەرای مەسئولینی بریتانیا لەمەوپێش لە مەحافیلی سیاسیەدا ئیعلانیان کرد و ئەم سیاسەتە خولاصە ئەکرێ بە ئیلغای عمومی عەلاقاتی خاصە لەگەڵ بریتانیادا و تەحقیقی ئیستیقلالی تەواو بۆ عیراق بە تەسهیل کردنی داخڵ بونی بە عیصبەتول ئومەم.

ئیعتیقادم وایە کە بریتانیای عوظما تەمامەن موخلیصە لە تەنفیذی ئەم سیاسەتەدا بەوەدا ئەزانم کە خۆم بیلزات پار لە لەندەن بوم لە ریجالی مەسئولی حکومەت تەحقیقم کرد و لەبەر ئەوە لازمە بریتانیا بە بەری ئیعتیبار بکرێ لە معامەلە و تەصەروفاتێ کە موخالیفی ئەم سیاسەتەیە و صەمیمیەتی بریندار ئەکات. لەم خسوسەوە حەظ ئەکەم فکرتان بخەمەوە کە ئەوەی لێرە و لە بەغداد ئیستیماعی ئەکەن بەعزێ ئەفرادی بەریطانی لە وەقتی بەیانی رەئی شەخصی خۆیان وە ئەو رەئیانە کە نیسبەتی بەوانەوە ئەدەن نابێ بە موعبیری سیاسەتی بریتانیای ئیعتیبار بکەن و زۆر تەحذیرات ئەکەم لە ئیشتیراکی ئەم نەوعە خەطایانە.

عیراق: برادەرانم! ئەیەوێ نائیلی ئیستیقلالی تامی ببێ بەبێ نوقصان و لە ڕێی بەختیاریەوە کە سیاسەتی بریتانیا سەولەتدار بوە بۆ گەیشتن بەم ئەمەلە گەورەیە لەبەر ئەوە ئەگەر لە ڕێگایدا موشکیلات و سەکتە بهێنرێتە پێشەوە و صعوبەت و مەوانیع خەڵق بکرێ مومکین نیە پێی موتەئەللیم و موتەئەسیف نەبێ و موافیقی ویجدان و ئینصاف نیە ئەگەر حکومەتی عیراقیە لەوم بکرێ بەرامبەر بە ئیستیهجانی ئەحواڵ و معامەلاتێ کە بۆ تەئمینی ئەرکانی ئینتیداب ئیجرا بکرێ هەروەکو لە موصل بەیانم کرد و ئەمە هێشتا ڕەمزێکە بۆ نفوذو سەیطەرەی ئەجنەبی.

لە بەعزێکم بیست – و تەرەفداری باوەڕ پێ کردنی نیم – کە بەعزێ لە برا کوردەکانمان مەضبەطەیان بۆ بەعزێ جێگا تەقدیم کردوە لەو مەضبەطانەدا بەیانیان کردوە کە حکومەتی عیراقیە لە خسوس کوردەکانەوە موخالەفەتی تەوصیاتی عیصبەتول ئومەمی کردوە و لەبەر ئەوە تەلەبی تەئلیفی حکومەتێکی کوردییەیان کردوە لەژێر حیمایە و ئینتیدابی بریتانیادا. رجا ئەکەم ئەوەی کە بیستومە ڕاست نەبێ چونکە بەراست دەرچونی زۆر موتەئەثیرم ئەکات بە صیفەتی ئەوەی کە دۆست و برایەکی ئوممەتی کوردم بەوەی کە شوهرەت و شەرەفی لەکەدار بکات.

تەوصیاتی عیصبەتول ئومەم مەعلوم و زانراوە ئەگەر موقارەنەی بکەن لەگەڵ ئەوەی کە لەم وڵاتەدا جاریە و تەتبیق کراوە بۆتان مەعلوم ئەبێ کە حکومەتی عیراقیە هەرچی لەسەری بە فەرز گیراوە هەموی ئیجرا کردوە و لە حوسنی نیەت و ئیخلاصیدا لێی زیادکردوە.

بێینەوە سەر تەلەبی دوەم، ئەوە بە تەواوی موعاریزە لەگەڵ تەوصیەکانی عیصبەتول ئومەم دا وە مەعنای وایە ئەگەر زەعمی ئەوانە ڕاست بێ کە ئەڵێن حکومەتی عیراقیە بە موجیبی ئەو تەوصیانە معامەلەی نەکردوە لیجنەی عیصبەتول ئومەم لە تەقریری ساڵی 1925 دا ئیزاحی کردوە. من لام موحەققەقە کە ئەصحابی مەضبەطەکان دەرکی ئەوەیان نەکردوە کە ئەم تەلەبەیان ئەکاتە ئەم ئیستینتاجە خەطیرە کە خۆیان رقیان لێیەتی و ئەزانن بۆ کەسیان موافیق نیە. ئەمە لەلایەکەوە، لەلایەکی تریشەوە نازانم چۆن مومکینە تەئلیف و تەوفیق بخاتە بەینی ئەو فکر و مەیلەوە کە بەعزێ بۆ ئیستیقلالی ئیزهار ئەکەن و وەزعیەتی بیلاد...لەژێر حیمایەی ئەجنەبیدا. من یەقینی تەواوم هەیە کە ئوممەتی کوردییەی عیراقیەی نەجیبە قبوڵی ئەوە ناکات کە مەتالیبی وا بهێننە پێشەوە کە شوهرەت و شەرەفی لەکەدار بکات و لە موغریضان مەعذەرەت و بەهانە بگرن بە دەستەوە بۆ سەکتەدان بە مەساعی عیراق و بریتانیا بۆ ئەوەی کە سیاسەتی تەعاونی هەردوکیان بە ئیکلیلی موەفەقیەت و فەوز برازێتەوە. وە بزانن و بە تەئکید حاڵی بن کە بریتانیا کە حوسنی نیەتی موقابیل بە عیراق بە دەلائیل ئیسپات کرد لە سەعیدا بۆ ئیسقاطی ئینتیدابێ لەسەری قبوڵی ئەوە ناکات کە ئینتیداب و حیمایەی ببێ بەسەر

جوزئێکیدا و ظەن ناکەم پێی خۆش بێ کە سەکتەی بخرێتە پێش و پـێش حەلیفەکـەی کـە عیراقـە لـە مەسـاعی دەولیەدا کە هەردوکیان لە زەرفی ئەم دە ساڵی رابوردودا صەرفیان کردوە.

لام وەقتی ئەوە هات کە ئیتر ئێمە هەمومان رابورد و ئالامی و غەڵەتـەکانی و ئـەو سـوئی تەفاهومـەی کەلە بەینمان دا پەیدای کردوە لە فکرمان بچێتەوە و تـەباعودی لـێ بکـەین و پەردەیـەکی ئەسـتوری بەسـەردا رابکێشین و بە ئەبەدی بەجێی بهێڵین بـە دەمـی بـە پێکەنینـەوە رو بکەینـە عەهـدێکی تـازە کـە سیاسـەتی صاحێبی جەلالەتی مەلیکی موفەدا هێناوێتیە پێشەوە کە پڕە لە ئومێد و ئەمان بە عـەزم و ئیرادەیـەکی سـابیت و ئیخلاصێک کە مەملەکەت پێی خۆشحاڵ و موتمەئین بێ.

بە زیـارەتی لیـوا موحتەرەمەکـەتان تەشـەڕوفم کـە دائیـر بـە حوسـنی نیـەتی حکومـەت و سیاسـەتی دڵسۆزانەی بەرامبەر بە ئێوە تەئمینتان بکەم و دەلیلی ئەوەش ئەوا بە ئیسمی صاحێبی جەلالـەت و تەفویضـی فەخامەتی رەئیسی وزەرا ئەو موتەهەمانەی کە لە حـەرەکاتی ئـەخیرەدا ئیشـتیراکیان کـرد بـو عـەفوم کـردن و بیلفعل مەوقوفەکانم بەرەڵلا کرد و ئەو ئەموالەی کە حکومەت لێی موصادەرە کردبون وەکو مەڕو ماڵات بـۆم ئیعادە کردنەوە و لەمانە کەسم ئیستیثنا نەکرد ئیللا عەدەدێکی کەم نەبێ کە ئەمانە ئیرتیکابی بەعزێ جورمیان کردوە کە لێ خۆش بونی مومکین نیە و حکومەتی محەلیە بەم نزیکانە ناوەکانیان نەشر ئەکا.

ئێستا دەعوەتتان ئەکەم کە لەگەڵ من پێکەوە نیدا بکەن بۆ ژیانی صاحێبی جەلالەتی ئاهیلی عیراق کـە صاحێب مەرحەمەتـە و بـۆ دەوڵـەتی موسـتەقیللەی سـەعیدەی عیـراق. (ژیـان، ژ 283، 25 ی 4 ی 931، ژ 284، 1 ی 6 ی 931 ژیان، ژ 285، 11 ی 6 ی 931) بۆ فەخامەتی وەزیری داخلیەی عیراق تەقدیم

## 4. 6. 14. تەشریف هێنانی فەخامەتی مەندوبی سامی بۆ سلێمانی

وەکو لە نوسخەی پێشومانا عەرز کرا بو فەخامەتی مەندوبی سامی رۆژی 20 ی 5 ی 931 تەشـریفیان بـە طەیارە هێنا بۆ سلێمانی. رۆژێ لە پێش تەشریف هێنانیان خەبەر زانرابو عەینی رۆژ سەر لە بەیانی هەمو رونەسـای دەوائیر و موفەتیشی ئیداری لەگەڵ نەواتی ئینگلیزی و سادات و ئەشراف و موتەحـەیزانی مەملەکـەت بـۆ مەراسـیمی ئیستیقبالیە لەمەوقیعی طەیارە راوەستا بون. قیطعەیەکی عەسکەری لیوی لە حەرەس شەرەف راوەسـتا بـون. سـەعات نۆ و نیوی الافانغە فەخامەتی موصەلەتیان فـەرمو عەلەلئوصـول مەراسـیمی خۆشـئامەدی ئیجـرا کـرا و موقابیـل بـەم شەعشەعەی ئیستیقباڵە دەرحەق بە موستەقبیلین فەخامەتی مەندوب ئیزهاری لوتف و ئیلتیفاتی فەرمو.

لەپاش خیتامی ئەم ئیستیقبالە فەخامەتی موشـار ئیلـەیهی لەگـەڵ جـەنابی موفەتیشـی ئیـداری سـواری ئۆتۆمێل بون تەشریفیان بردە مـاڵی جـەنابی موفەتیشـی ئیـداری و لـەوێ موسـافیر بـون. لـە پـاش چەنـد دەقیقەیەک ئیستراحەت فەخامـەتی مەنـدوب تەشـریفیان بـردە مـەقامی حکومـەتی لـەوێ زیـازەتی رونەسـای مەئمورین و سادات و عولـەما و ئەشـرافی محەلـەیان قوبـوڵ فـەرمو. هـەر ئـەو رۆژە بـە شـەرەفی فەخامـەتی مەندوبی سامی لە تەرەفی سەعادەتی موتەصـەڕیف ئەحمـەد بەگـەوە دەعـوەتێکی پـەنجا کەسـی درا. جـەنابی موفەتیشی ئیداری و بەعزێ نەواتیحکومەتی فەخیمەی بریتانیا و رونەسای مـەئمورین و سـادات و ئەشـرافی محەلی مەدعو بون. زۆر بە شەوق و شەطارەت ئەکلی تەعام کرا.

رۆژی دوایی فەخامەتی مەندوب بـە طەیـارە تەشـریفیان بـرد بـۆ پێنجـوێن و هەڵەبجـە، بـۆ ئێـوارێ عەودەتیان فەرموەوە.

بەیانی رۆژی 22 ی 5 ی 1931 بەتەشیعێکی موتەنـتەن سواری تەیارە بون عەودەتیان فەرموەوە بۆ بەغداد. مەملەکەت بە تەشریف هێنان و معامەلاتی نازکەی فەخامەتی موشار ئیلەیهی زۆر مەمنون و موتەهەیجی سرور بون. (ژیان، ژ 284، 1 ی 6 ی 1931)

### 4. 6. 15. تەشریف هێنانی جەلالەتی مەلیک فەیسەڵی ئەوەڵ بۆ سلێمانی

خەبەری تەشریف فەرموی حەزرەتی مـەلیکی موعـەزەم کـە هـات بـۆ سـلێمانی وەکـو ئـاوازەی سـەعد و سەعادەتی هەمو ئـەهالی مەملەکـەت موبەشـیر و کـەیف خـۆش بـون بـەم لوتـف و مەرحەمـەتی ملوکانەیـە. بەلەدیە بۆ کەمالی ئیحتیشام و ئیستیقبال دەستوبردی کرد بە ئیحزارات و تەداروکاتی لازمە. لـە سـێ نوقـاتی موختەلیفە تاقی زەفەر ئیصعاد کرا و ئەم تاقی زەفەرانە لە مەزمونی تـەرحیب و تـەعزیم و وەحـدەتی عیراقیـە بە ئەلواحی گونـاگون دامـەزرا و بـە وەرەقـی ئەشـجار و گـوڵو رەیحـان موزەیـەن کـرا، لەسـەر هـەمو تـاق و مـەقاماتی رەسـمیە و خسوسـیەت بـە هـەزاران بەیـداغی عیراقـی رازایـەوە، سـورەیا مەسـیل هـەمو تـاق و گوزەرگاە تەنویر کرا.

ڕۆژی 10 ی مانگی جاری کە چوارشەمە بو وە موعەیەن بو بە شـەرەفی قـدومی حـەزرەتی جەلالـەت، سەعادەتی موتەسەڕیف و موفەتیشی ئیداری و ئەمیری مەنتیقەی شـەرقیە و زوبـات و مەنسـوبینی حکومـەتی فەخیمەی بریتانیا لەگەڵ سادات و ڕوئەسای دەوائیر و عەشائیر و ئەشرافی محەلیە تـا دەربەنـد کـە نیهایـەتی حدودی لیوایە چون بۆ ئیستیقبال. صاحێبی جەلالەت سەعات هەشت و نیوی قەبلـەل زوهـر بـە حـدودی لیـوا مواصەلەتیان فەرمو. وفوری جەماعەتی موستەقبیلین هەمو نائیلی دامەنبوسی حەزرەتی مەلـەکی بـون. مـەوکیبی ملوکانەلە دەربەند بۆ تەیناڵ کە مەرکەزی ناحیەی بازیانە حەرەکەتی فەرمو. لەوێ خێوەت و بارەگا هەڵدرا بـو بۆ ئیستیراحەتی جەلالەتی و حاشیەو تەوابیعی. گەلێ لە سوارەی مەشهورەی هەمەوەنـد و عەشـائیری سـائیرە هات بون کـە نائیـل بـن بـە شـەرەفی ئیسـتیقبالی تاجداریـەوە. وە زاتـی جەلالـەتی کـە گەیشـتە تـەیناڵ لـە ئۆتۆمۆبیلەکەی دابەزی و موصافەحەی لەگەڵا فەرمون. لە پاشا مەوکیبی عـالی دەسـتی کـرد بـە حەرەکـەت بـۆ سلێمانی لەوێش جمهورێکی عەزیم لە ئەهالی هاتبونە دەرەوە سـاحەی ئیسـتیقبال لـە پـێش مەوعیـدی وصـولی جەلالەتی بە سەعاتێ وە لیجنەی تەشریفات مەشغوڵی صفوفی موستەقبیلین بو حەسەبی تەرتیباتی موقەرەرە و، لە پێش وصولی مەوکیبی مەلەکی سریەیەک حەرەس شەرەف حازر بون و لە پێشیانەوە تاقمی مۆسـقا کـە بـۆ ئەم خسوسە ئیستیحضار کرا بون کەششافەی مەداریس و مۆسیقایان لە چەپەوە لەسەر وەزعیـەتێکی شـیرین و تیپێ لە سوارەی پشدەری و یەکێ لە هی جاف لە پـێش مـەوکیبی مەلەکیـەوە لـە نزیـک مـەوقیعی قیلیاسـان و لەوێشەوە بۆ سلێمانی.

لە سەعات دەو چل دەقیقە مەوکیبی مەلەکی گەیشت، فیل حال 21 تۆپ ئەنداخت کرا. مۆزیقەی رەسـمی سەلامی لێدا زاتی حەزرەتی تاجداری کە گەیشتە حەرەس شەرەف لە ئۆتۆمۆبیلەکەی دابـەزی. صـەف صـەف عەسکەری تەفتیش و تەلطیف فەرمو. کەششافەی مەداریس بـە شـەرقـی و نەشـیدەوە زەمزەمـە و ئاهـەنگێکی خۆش ئەلحانی تەهیج و تەسریری قلوبی عومومیـەی ئـەکرد. زاتـی شـاهانە کـە تەشـریفی بـردە چـادرێ کـە مەخسوس بۆیان حازر کرا بو لەوێ قوبوڵی موصافەحەو خۆشئامەدی عەلەما و ڕوئەسای موڵکیە و عەشائیری فەرمو. لە پاش چەنـد دەقیقەیـەک سـریەیەک پۆلیسـی سـوارە و سـوارەی عەشـائیر پێشـدار بـون مـەوکیبی همایون لە عەقەبی ئەوانەوە ئاهیستە ئاهیستە رو بە شار حەرەکـەتیان فـەرمو. ئۆتۆمـۆبیلی تاجـداری زاتـی جەلالەتی و سەعادەتی موتەسەڕیفی تێ دا بو لە عەقەبی ئەوانەوە حاشیەی ملوکانە و لە پاش ئەوانیشـەوە چـل پەنجا ئۆتۆمۆبیلی موستەقبلین قافڵە و ریزێکی پڕ ئیحتیشامی تەشکیل کرد بو.

لەمەوقیعی ئیستیقبالەوە هەتا ماڵی موتەسەڕیف ڕاست و چـەپی جـادە بـە صـفوفی ئـەهالی گیـرا بـو. قافڵەی موحتەشەمە لە تەرەف ئەم صفوفی ئەهالیەوە بە وصولی جەلالەتەوە بە ئاوازی تەعزیم و چەپڵە کنکرەی ئاسمانی تەهذیذ ئەکرد. وەقتێ کە لە ماڵی سەعادەتی موتەسەڕیف دابەزین لـە پـاش مودەتێـک زاتـی پـەناهی

و حاشیەی موحتەرەمەی لە ماڵی سەعادەتی موتەسەڕیف تەنئەوەلی تەعامیان فەرمو. لە پاش ئیکمالی تەعام زاتی پادشاهی لەگەڵ 20 کەس لە روئەسای دەوائیری موڵکیە و ئومەرای عەسکەریە تەشریفیان برد بۆ مزگەوتی گەورە و زیارەتی مەرقەدی حەزرەتی کاک ئەحمەدیان فەرمو. لە پاشان دو روکعەت نوێژی سونەتی لەلای مەرقەدی کاک ئەحمەد کرد و ئەمری فەرمو 200 روپیە تەوزیع بکرێ بەسەر حافظەکانی مزگەوتی گەورەدا و جبەیەکی فاخیری خەڵاتی شێخ عەبدوڵڵای خەطیب فەرمو.

لەدوایی دا موافیقی پرۆغرام کە لە ماڵی موفەتیشی ئیداری حەفلەی چاپی ئیحضار کرا بو لە سەعات پێنجا حەزرەتی جەلالەتی تەشریفی فەرمو بۆ ئەوێ. لە وەقتی گەرانەوەی‌دا تەشریفی بردە خەستەخانەی مەلەکی و لەوێ دەرحەق بە ئەهالی عاطیفەی ئەبەویەی ئیزهار فەرمو بە مژدەی بینایەکی تازە کە صالح بێ بۆ خەستەخانەیەکی عەسکەری.

بۆ ئێوارێ زاتی جەلالەتی لە ماڵی موتەسەڕیف لەگەڵ زوبات و مۆزەفینی بەریتانیا و نائیبی قۆنسوڵی ئیمپراتۆریەتی ئێرانی تەنئەوەلی تەعامی عیشای فەرمو.

قەرار وابو رۆژی دوەم 11 ی 6 ی 1931 کە حەزرەتیجەلالەتی سەرای حکومەتی بە قدومی موشەرەف بکا. موافیقی ئەم قەرارە سەعات لە هەشت و نیوی قەبلەل زوهر بۆ رەسمی سەلام سریەیەک لە جەیشی عیراقی و تاقمی مۆسیقا لەبەردەمی سەرا صەفبەستەی ئیحتیرام بون. زاتی حەزرەتی تاجداری بە حیشمەت تەشریفیان برد بۆ سەرا. جەلالەتی لە سەرای مەکثی فەرمو هەتا سەعات دە و نیوی قەبلەل زوهر لە زەرفی ئەم مودەیەدا روئەسای عەشائیر و دەوائیر و ریجالی دین و ئەشراف و توجار و جەماعەتی مولحەقات بە شەرەفی زیارەتی پادشاهی نائیل بون. وەقتێک کە زاتی جەلالەتی سەرای بەجێ‌هێشت ئارەزوی دیدەنی مەداریسی کوران و کچانی کردو لەوێ ئیزهاری لوتف و شەفەقەتی دەرحەق بە ئەبنای وەتەن فەرمو. لە مەدرەسەی متەوەصیطە تەلەبەیەک قەصیدەیەکی خۆشئامەدی خوێندەوە و هەروەها لە مەدرەسەی ئولای سانی کچان دا. لە پاشا زیارەتی مەکتەبی زانستی و تەشمیلی لوتفی عالی فەرمو صەد روپیەی تەبەروع کرد بۆ تەعلیمی نەخوێندەوارەکان.

ئینجا جەلالەتی گەرایەوە بۆ ماڵی موتەسەڕیفی لیوا و تەعامی قاوەڵتی فەرمو لەسەر سوفرەکەی جەماعەتێ لە نجومی بەلدەی روئەسای عەشائیر مەوجود بو. وە بەلەدیە ئیقامەی حەفلەیەکی ضای کرد لە باخچەکەی لە عەینی رۆژدا بە موناسەبەتی تەشریفی جەلالەتیەوە بۆ لیوای سلێمانی کە وجوهو ئەشراف و قەوم و وفود و مولحەقات دەعوەتی ئەم حەفلەیەک کرا. سەعات پێنج کەششافەی مەداریس، مۆسیقا و جەیش حازر بون و، لە حینی تەقەروبی مەوکیبی مەلەکی مۆزیقەی سەلامی مەلەکی لێداو کەششافە تەرەنومی نەشائیدی خۆشئامەدی کردو، جەلالەتی داخڵی بینای باغچەکە بو لە بەینی چەپڵەی حازرونا لە پاش تەقدیمی چای و جگەرە لە تەرەف بەلەدیەوە، سەید عەبدوڵڵا ئەفەندی خەطیب خوتبەیەکی دوعای خوێندەوە بە ئیسمی عولەمای کیرام و سادات و مەشایەخی عیظام. لە عەقەبی رەئیسی بەلەدیە خوتبەیەکی خۆشئامەدی خوێندەوە بە ناوی ئەهالی بەلدە خسوسەن و ئەهالی لیوا عوممەن. لە دوای ئەو مدیری متەوەسیطە هەستاو ئیلقای خیتابێکی بە وەکالەتی هەیئەتی تەعلیمیەی لیواوە و، لە پاش ئەو قوسطەنطین ئەفەندی عەلەکە خوتبەیەکی بەناوی جەماعەتی مەسیحیەوە خوێندنەوە و لە دوای ئەو موعەللیم ڕەحیم ئەفەندی هەستاو ئیلقای خوتبەیەکی کرد بە وەکالەتی میللەتی موسەویەوە. لەم وەقتەدا صاحێبی جەلالەت مەلیکی موعەزەم هەڵسا و حازرون ئیجلالەن وە ئیحتیرامەن هەمو هەڵسان و مقابەلەیان کرد بە چەپڵەیەکی بە شیدەت و ئیلقای خوتبەیەکی ئیرتیجالی فەرمو کە مدیری تەحریراتی لیوا تەرجومەی کرد بە کوردی. حازرون چەند دەفعە چەپڵەیان لێدا.

وە لە پاش ئەو کە جەلالەتی خوتبەکەی تەواو کرد دوبارە هەستا و بەدەستی موبارەکی خۆی نیشانی رافیدەینی لەسەر سنگی موتەصەڕیفی لیوا سەعادەتی ئەحمەد تۆفیق بەگ تەعلیق کردو فەرموی: لەبەر تەقدیری خەدەماتی مەتەصەڕیفی سابیقە و لاحیقە ئەوا من ئیعطای پێ ئەکەم نیشانی رافیدەین لە دەرەجەی رابیع نەوعی مەدەنی. حازرون چەپڵەیان لێ دا. موتەصەڕیف لە پاش وەرگرتن و ماچکردنی نیشانەکە چەند کەلیمەیەکی ئیرتیجالیەی خوێندەوە. (ئەوەی کە قیامی پێ کردەوە لە خدەماتی ئەدای واجیباتی بوە موقابیل بە صاحێبی تاج و میللەت و لەمەودوا سەعی و جەهد ئەکا بۆ خزمەتی عەرشی عیراق بەهەمو حوب و ئیخلاص و بۆ خزمەتی برایانی لە سێبەری تەختی جەلالەتی مەلیکی موعەزەم دا) حازرون قسەکەیان بە چەپڵەرێزان موقابەلە کرد و، لە پاشان جەلالەتی تەرکی باخچەکەی کردو سەعات شەش و نیو جەلالەتی بە ئۆتۆمۆبیل تەشریفی برد بۆ سەرچنار و لە رەفاقەتیا موتەصەڕیفی لیوا و موفەتیشی ئیداری مەوجود بون و لەپاش گەرانی ئەترافی دارستانی سەرچنار گەرایەوە بۆ سلێمانی و تەعامی عیشای تەناول فەرمو.. وە لە خزمەتیا بەعزێ لە زوعەمای خاریج و وجوهی بەلدە مەوجود بون.

رۆژی سێهەم 12 ی 6 ی 1931 مەوکیبی عالی مەلەکی لە سەعات پێنجی قەبلەل زوهر دا حەرەکەتی کرد بۆ هەڵەبجە بە رەفاقەتی موتەصەریفی لیوا و موفەتیشی ئیداری و ئامیری مەنتیقەی شەرقیە. وەقتی وصولی جەلالەتی مەلیک بە خورماڵ جەمعیەتێکی غەفیر ئیستیقبالیان کرد لە روئەسای عەشایەر و ئەو مەحاڵە. وە لە خورماڵەوە حەرەکەتیان کرد بۆ هەڵەبجە، بەلەدیەی هەڵەبجە تاقێکی زەفەری ئیقامە کرد بو لە مەدخەلی شارا و نەصبی خیامی کرد بو بۆ موستەقبیلین و جمهورێکی عەزیم لەوێ مەوجود بون لە ئیستیقبالی جەلالەتیا و، لە پێشیانەوە بەگلەری جاف و روئەسای عەشیرەتی هەورامان و نەورۆلی و شێخانی تەریقەتی نەقشبەندیە ئیستیقبالیان کرد بە حەماسەتێکی شەدیدە و موبالەغەیەکی زائیدەوە و، لەپاش موصافەحەی جەلالەتی لەگەڵ موستقبیلین حەرەکەتیان فەرمو بۆ ماڵی قائیمقام لەگەڵ روئەسای عەشائیر و وجوهی بەلدە و لەدوای ئیستراحەتێکی کەم جەلالەتی تەفەقودی مەدرەسەی ئیبتیدائیەی فەرمو لەوێ تەلەبەکان صەفبەستە... کەشافە و تەحییەتی جەلالەتیان کرد. جەلالی حامید بەگ... تەلەبە هاتە پێشەوە کە عومری هەشت ساڵ بو شیعریەی شیرینی خوێندەوە و، لە دوای ئەو... خوتبەیەکی خۆشئامەدی لەتیفی کرد... لە خوتبەکان دا جەلالەتی مەلیک بینای مەکتەبەکەی تەرک کرد عەودەتی فەرموەوە بۆ سلێمانی لە سەعات شەشی بەعدەل زوهر لە عەینی رۆژدا تەنئەوەلی تەعامی عیشای لە ماڵی موتەصەڕیف دا کردو لەسەر سفرەکەی جەماعەتی ئەشراف و وجوە هەمو مەوجود بون.

رۆژی چوارەم 13 ی 6 ی 1931 بەلەدیە ئیستیحصاری خەیمە و کورسی زۆری کرد لە ساحەی موخەصەصە بۆ ویداعی جەلالەتی و لە پاش تلوعی شەمس مەوەدیعین و حەرەس شەرەف و کەششافەی مەداریس ئەخزی مەواقیعیان کرد. سەعات لە حەوتی قەبلەل زوهر مەوکیبی مەلەکی واصل بو بەو مەکانە، مۆزیقە سەلامی مەلەکی لێداو جەلالەتی دابەزی و یەک یەک موصافەحەی لەگەڵا کردن و لە دواییدا سواری سەیارەی مەلەکیە بو، لە پاشیەوە حاشیەی کەریمە و بۆ تەشیعی جەلالەتی تا حدودی لیوا موتەصەڕیف و موفەتیشی ئیداری و ئامێری مەنتیقەی شەرقیە لەگەڵ ئۆتۆمۆبیلەکان وجوە و ئەعیان رو بە کەرکوک حەرەکەتیان فەرمو. (ژیان، ژ 286، 18 ی 6 ی 1931)

### 4. 6. 16. تەرجومەی خیتابی جەلالەتی مەلیکی موعەزەم

تەشەکوری خەتیبەکان ئەکەم بۆ ئەو حسسییاتە نەبیلانە لە بابەت ئیخلاص و تەعەلوقی میللەتەوە ئیزهارتان کرد.

ئارەزوم ئەكرد بمتوانیایە بە عەینی زمان جوابیان بدەمەوە فەقەت ئومێدی عەزیمم هەیە لە ئیستیقبالدا بەبێ زەحمەت موەفەق ببم بەوە، چونكە ئێستا بێ تەرجومان هەرچیەک بە كوردی وترا تێی گەیشتم.

من خۆم حازر نەكرد بۆ قسەكردن، فەقەت بینا لەسەر ئارەزوی زەواتی حازرون كە تەمسیلی تەبەقات و جەماعاتی موختەلیفەی ئەم لیوا مەحبوبە ئەكەن چەند كەلیمەیەک ئەڵێم:

لێتان شاراوە نیە كە دین بۆ خوایە و وەتەن بۆ هەمو لایەكە. لە نەزەری من دا لە بەینی سوككانی مەملەكەتە مەحبوبەكەم دا هیچ فەرق و تەمییزێک نیە. وەتەن بۆ هەمومانە. ئەم شاخانە و ئەم دۆڵە جوانانە مڵكی باقی سوككانی لیواكانی تری عیراقن، هەر وەكو ئەهلی ئەم لیوایە حەقیان لە هەمو بستێكی لیواكانی تردا هەیە. لەمەش زیاتر ئەڵێم، ئەڵێم هەمو دڵۆپێک لە خوێنی سەكەنەی ئەم لیوایە لە خوێنی هەمو عیراقیەكانە. عیراقیەكان لەم وەتەنەدا هەمو بران و هیچ شتێک نیە كە لە خدمەت كردن دوایان بخات.

دێینە سەر مەسئەلەی دین و مەزهەب، ئەمانە عائیدن بە خوا و لازمە لە بەینی عەبدو مەعبودا، لەناو دیواری مزگەوت و كڵێسادا بمێنێتەوە.

هیچ شوبهەی نیە كە هەر یەک لە ئێوە ئەیزانێت كە حكومەتی عیراق قبوڵی تەجزیئە و تەفریق ناكات، وە بە ئیعتیباری عوموم حكومەتی عیراق بۆتە جوزئێكی لایەتەجەزەئی و لەبەر ئەمە مەحاڵە كە سەكەنەی ئەلویەی جنوبیە بتوانن، بێ ئەوەی ئەم لیوایە جوزئێک لە وەتەنەكەیان و بە دەستیانەوە بێت لە ئەمنیەتا بژین و كەزا موستەحیلە بۆ ئەهالی ئەم لیوایە كە یەک رۆژ بتوانن، بەهەر شكڵ و وەزعیەتێک بێت، بەجیا لە وەتەنی عیراقی و لە برا عیراقیەكانیان بژین. ئەمە حەقیقەتێكی ئەوەندە ئاشكرایە كە هەمو عیراقیەک ئەیزانێت و ئەقوامی سائیرەش ئیشتیراكیان ئەكات. لەسەر ئەم ئەساسە حكومەتی عیراقیە تەئەسوسی كردوە و لە ئیستیقباڵێكی نزیكا لەناو ئومەمی سائیرەدا بە ئیستیقلال و وەحدەتەوە ئەخذی مەوقیع ئەكات.

بە ئیعتیباری فەرد و حكومەت لەسەر هەمومان لازمە كە واجیباتی خۆمان بەرامبەر بە وەتەنی موقەدەس ئەدا بكەین، وە لە هەمو ئێشێک دا كە خدمەتی بەرزكردنەوەی وەتەن و تەحەققوق پێ كردنی ئامالی وەتەنیەی تێدا بێت تەشریكی مەساعی بكەین و یارمەتی یەكتری بدەین.

لە رۆژی تەئسیسەوە، وە ئەمڕۆ، وە ئیلەل ئەبەد پرۆغرامی حكومەتی وەتەنیە ئەمەیە كە لەناو ئەفرادی میللەت دا عەدالەت بڵاو بكاتەوە و تەطمینی رەغائیبیان بكات بە خدمەتگوزاری مەنافیعی وەتەن.

لە جوملەی ئەمانە حكومەت قانونێكی دانا كە بە موافیقی ئەو قانونە حورڕیەتی تەعلیم و موحاكەمات تەئمین كراوە. كوردێک بە زمانی خۆی فێری خوێندن بێت و، كەئا عەرەب و توركیش بە زبانی خۆیان فێری خوێندن ئەبن. وە بۆ ئەوەی تەئمینی عەدالەت بكرێت حوككامی مەحكەمەی ئەلویەی عیراقیە لازمە شارەزای زبانی ئەو كەسانە بن كە محاكەمەیان ئەكەن. عەلاوەتەن حورڕیەت بەخش كراوە كە موكاتەبەی بەینی دەوائیر و ئەشخاص بەو زبانە بێت كە ئەكسەریەتی ئەو لیوایە تەكەللومی پێ ئەكەن. هەروەكو لە ماضیدا بوە لەمەودواش عادات، عەنعەنە، ئەدیان و مەذاهیب ئیحتیرامی تەواویان ئەگیرێت.

خولاصە حكومەتم عەزمی كردوە لەسەر ئەساسی حورڕیەت، عەدالەت و عەتف و ئیفای وەجائیبی وەتەنیە بە ئیخلاصەوە تەمشیەتی ئومور بكات و، ئەگەر لەمانەدا قصوری كرد من خۆم موراقەبەی ئەكەم.

وەزعیەتی سیاسی مەملەكەتەكەم تەقەرور و تەعیین كردوە مەجالی ئەوە نەماوە كە تەبدیل و تەغییر بكرێت.

بینائەن عەلەیهی لازمە لەسەر میللەت كە هەمو معاوەنەتی حكومەت بكەن بۆ ئەدای واجیباتی عومومیەی، وە ئەگەر یەكێک لەم رێگایە لابدات شازێک تەشكیل ئەكات وەكو كورەكەی نوح پێغەمبەر كە وەختێ باوكی بانگی كرد.

بۆ تەئمینی میللەتەکەم لە بابەت ئەو مەرکەزە سیاسیەی ئەم وڵاتـە نـائیلی بـوە هـەرچی لازم بـو وتـم. ئێستا ئەوەی بۆ ئێوە مابێتەوە ئەوەیە کە جەهد و سەعی تەواو بنوێنن بۆ ژیانەنـەوەی ئیقتیصـادیات، وەکـو تیجارەت و زەراعەت، تاکو نەهضەی ئیجتیماعیەی عیراق بکات لەگەڵ ئەو هەنگاوە گەورانەی کە لە سیاسەت دا هاویشتویەتی. (ژیان، ژ 287، 25 ی 6 ی 1931)

**پەلەیە**

کۆپی خولاو لە خاوەن شکۆوە – سەرۆک وەزیران – بۆ هەر هەمو وەزیرەکان – جگە لـە وەزیرانـی دەرەوە، بەرگری و بەڕێوەبەریەتی گشتی.A.W.Q.A.F

**4. 6. 17. بابەت: سیاسەتی کوردی**

1. لێرەدا من لیستێک دەنێرم بە زانیاری ورد لەسەر فەرمانبەرانی وەزارەتەکەت کە کوردی نـازانن کـە لەلایەن دیوانی شارەکانی ئەربیل، کەرکوک، سلێمانیەوە نێراون. لەگەڵ کۆپیەک لەسەر کۆبونەوەی ڕۆژی 7 ی 10 ی 1931 کە لە ئۆفیسی وەزارەتی ناوخۆیی ئەنجام دراوە.

2. تکایە دەتوانی ئاگادارم کەیتەوە:

ئەلف: کە ئاخۆ ئەو لیستەیە ڕاستە، گەر هەڵەی تیایە، وا بکە کە لیستەیەکی ڕاستم پـێ بگـات زۆر بە پەلە.

بێ: چ ڕێورەسمێک دەگرنە بەر بۆ ئەوەی ئەو فەرمانبەرانە بگۆڕن کە کوردی نازانن، چەندە وەختیـان دەوێ بۆ فێربونی زمان.

جیم: لە حاڵەتێکدا گەر ئەوە نەکرا بەم زوانە، وا بکەن کە بایی ئەوەندە کوردی فێر بن کـە کارەکـانی خۆیانی پێ ئەنجام بدەن. دەکرێ واش دەست نیشان بکرێن کە بتوانن لە تاقیکردنەوەدا دەرچن سەبارەت بە فێربونی زمان، گەر سەرنەکەوتن دوای چەند مانگێک لە ناوچە کـوردیـیـەکان دور بخرێنـەوە. سـەرەرای ئـەم ڕاپۆرتە ناوخۆییە، من ڕاپۆرتێکی دیکەم گەرەکە لە کۆتایی دو مانگدا کە چی پێشکەوتنێک بەڕێوە چوە لەو ماوەیەدا بۆمی بەیان بکەن.

4. لە داهاتودا گەر ناچار بون کە فەرمانبەری وا دابمەزرێنن لە ناوچـە کـوردیـیـەکان کـە کـوردی نازانن، تکایە لەو حاڵەتەدا ڕاپۆرتێکم بۆ بنوسە کە بە ورد و درشتی هـۆی ئـەو جـۆرە دامەزراندنـەم بـۆ بەیان بکەی.

5. تاقیکردنەوەکانی زمان: من دەخوازم کە جۆرە سیستمێکی تاقیکردنەوە بۆ زمـانی کـوردی بـەڕێوە بچێ بۆ هەمو ئەو فەرمانبەرانەی کە لە خزمەتدان یان لەوانەیە لە داهاتودا لە ناوچـە کـوردیـیـەکانی سـەر بـە عیراق خزمەت بکەن، هەروەها بۆ ئەو فەرمانبەرانەی کە ئێستا لەو ناوچانـەدا کـار دەکـەن و کـوردی نـازانن، پێویستە وەختێکی دیاریکراویان بدرێتێ، بڵێ سێ مانـگ، (هەرچەنـدە وەختـی پێویسـت و مـاقوڵ لـە لایـەن پسپۆرانەوە بڕیاری لەسەر دەدرێ) کە تیایدا بایی ئەوەندە کـوردی فێـر بـن کـە بگەنـە ئاسـتێک کاروبـاری خۆیان بە کارامەیی بەڕێوە ببەن. بۆ نمونە کاتبێک کە لە بەشێکی تەکنیکی دەست بەکارە مـەرج نیـە بـە قـەد کارگێڕێک یان دادوەرێک کوردی بزانێ. ئەو فەرمانبەرانەی کە لەو ناوچانەدا خزمـەت دەکـەن یـان لـە دەزگـا حکومەتیەکان کارگێڕن کە تیایدا دو تا سێ زمان بـەکاردێت وەکـو عـەرەبی و کـوردی و تـورکی بـە پـێی دەرکردنی "یاسای بەکارهێنانی زمان لە ناوخۆدا" دەبێ بایی ئەوەندە لەم زمانانە بزانن کە بتوانن بەکارامەیی کارەکانی خۆیان ئەنجام بدەن. ئەم خاڵەیان جێی بایەخێکی گرنگە چونکە زانراوە کە نەک فەرمانبەر بە بـێ

ئەو زانینی زمانانە کارامە و لێهاتو نابێ، بەڵکو ڕێی تێ دەچێ کـە ببێتـە مایـەی هەسـتی نـاجۆر و بەریـەک کەوتن لە نێوان فەرمانبەران و خەڵکی ئەو ناوچانەی کە ئەوان کاری تێدا دەکەن. لەمەڕ مەسەلەی تاقیکردنـەوە لە زمانی کوردیدا، وا پێشنیار دەکرێ کە پاداشت و خەڵات لەلایەن حکومەتەوە بدرێ بەو فەرمانبەرانـەی کـە سەردەکەون. چونکە ئەوە پتر هانیان دەدا خۆ ماندو بکەن. دەکرێ خەڵاتەکان بەم شێوەیە بڕوا بەڕێوە: (50) روپیە بۆ تاقیکردنەوەی سەرەتایی، هەشتا روپیە بۆ قۆناغێکی باڵاتر و (120) روپیە بۆ ئاستێک کە توانـای وەرگێران لە خۆدا بەدی دەکەن.

6. لە میانەی گەرانەکانمدا بە ناوچە کوردییەکاندا لەم ساڵەدا بۆم دەرکـەوت کـە مامۆسـتایانی ژن لـە قوتابخانەکاندا زۆر کەمن. هەر بۆیە سەرنجی وەزارەتی پەروەردە بۆ ئەم حەقیقەتە رادەکێشم، داواشم ئەوەیـە کە هەرچی دەکرێ بیکەن بۆ ئەوەی خانمانی کورد رابهێنرێن تا ببن بە مامۆستا.

7. داوا لە وەزارەتی ناوخۆیی دەکرێ کە هەندێ رێنمایی دەربکات بۆ بەڕێوەبەری گشتی پـۆلیس کـە هەندێ هەنگاو هەڵنێن کە زۆر پێویستە تا بایەخ بەو مەسەلەیە بدا کە هەندێ لـە ئەفسـەرانی پـۆلیس کـوردی نازانن و کەچی لە ناوچە کوردنشینەکان دامەزراون.

8. من سەرنجم بۆ خاڵێکی تر دەچێ لەمەڕ ئـەو حەقیقەتـەی کـە راسـتە لـە بەنـدی پێنجەمـدا هـاتوە سەبارەت بە (یاسای زمانە ناوخۆییەکان) کە دەکرێ کوردی و تـورکی لـە ناوچـەکانی کـەرکوک و کفـریدا وەک زمانی رەسمی بەکار بێن، بەڵام لـە راسـتیدا بـە تـەنها تـورکی بـەکار دێ. پـەیرەوکردنی ئـەو یاسـایە سەبارەت بەم مەسەلەیە دەبێ فەراهەم بکرێ.

{کۆپیەک لەگەڵ ئەو کۆپییەی مەحزەری کۆبونەوەکە بۆ سەرۆکی دیوانی پاشایەتی}

### 4. 6. 18. نامەی ئێچ دۆبز بۆ عەبدولموحسین بەگ سەعدون

**"نهێنی"**

ژمارە پۆست (439) شوێنی نیشتەجێ بون

N.P.O.439 بەغداد-27 ی 11 ی 1928

بەڕێزم سەرۆک وەزیران...

ئایا دەکرێ بەڕێزت بە میهرەوە بگەڕێتەوە بۆ نامـە بـاوەڕ پـێ کراوەکـەم ژمـارە: P.O.426 کـە لـە بەرواری 22 ی 11 ی 1928 دا دەرچوە لەمەڕ مەسەلەی ئەو پەیمانانەی نێوان حکومـەتی بریتانیـای مـەزن و عیراق سەبارەت بە بەڕێوەبردنی ناوچە کوردییەکان، هەروەها مەسەلەی مانەوەی (عەبدولمەجیـد بـەگ ئـال یەعقوبی) لە پۆستی خۆیدا وەک موتەصەڕیفی ئەربیل (هەولێر).

من وابزانم بیرم چوە لەو نامەیەدا کە سـەرنجی جـەنابتان بـۆ ئـەو موزەکەرەیـە رابکێشـم لەمـەڕ مەسەلەی ئەو بەڵێنانەی کە بریتانیا لەسەر ئاستی جیهانی داونی سەبارەت بە عیراق کە تیایدا کـۆپییـەک بـە شـێوەیەکی رەسـمی گەیشـتە دەسـت نوێنـەرە کۆنەکـەی تـۆ (جەعفـەر پاشـا ئـەل عەسـکەری) لـە کۆبونەوەکەی وەفدەکان کە هاتبون گفتوگۆ لەسەر پەیماننامـەی ئـەنگلۆ ی عیـراق بکـەن کـە لـە ئۆفیسـی کۆلۆنیال بەسترا لە بەرواری 1 ی 11 ی 1927 دا. لەو موزەکەرەیەدا هاتوە وەک جـەنابت دەیبینـی کـە رونکردنەوەیەک لەلایەن حکومەتی بریتانیەوە هـاتوە بـەو ئاکامـەی کـە کۆمەڵـەی نەتـەوە یـەکگرتوەکان سەنگێک بۆ ئەو پەیمانەی حکومەتی بریتانیا دادەنێ بەوەی کە رێوڕەسـمێک بگرنەبـەر تـا زامنـی ئـەوە بکەن کوردەکانی عیراق ئیدارەیەکی ناوخۆییان هەبێ کە دیارە ئەنجومەنی کۆمەڵەی نەتەوەکان مـەرجی

داناوە حوکمی خۆیان بەیان بکەن لەمەڕ مەسەلەی سنوری موسڵ. من دڵنیام کە جەنابت بایەخێکی گـەورە بەم مەسەلەیە دەدەی. من لە خزمەتدام

سد. ئێچ. دۆبز
خاوەن شکۆ بەڕێز عەبدولموحسین بەگ ئەلسەعدون.
سەرۆک وەزیران – بەغداد
(کاک شێزاد حەسەن لە ئینگلیزیەوە کردویەتی بە کوردی)

# 5. کورد و کۆمەڵەی گەلان

## 5. 1. ڕاسپێرییەکانی کۆمەڵەی گەلان دەربارەی کورد

لە ڕێککەوتنی نهێنی سایکس– بیکۆدا، موسڵ بەر فەرەنسا و شام بەر بریتانیا کەوت بو. بەڵام دوای جەنگ لوید جۆرجی سەروەزیرانی بریتانیا لە سەودایەکی زیرەکانەدا لە گەڵ کلیمانسۆی سەروەزیرانی فەرەنسا، شامی دا بە وان و موسڵی بۆ خۆیان وەرگرت، بە تایبەتی کە هێزی بریتانیا لەو کاتەدا ویلایەتی موسڵی لە ژێر دەس دا بو.

هێزەکانی بریتانیا، بە شەڕ موسڵیان نەگرت بو، بەڵکو لە دوای ئیمزاکردنی ڕێککەوتنی ئاگربڕی مۆدروس چوبونە ناویەوە، لەبەرئەوە تورکیا موسڵی بە بەشێک لە سەرزەمینی خۆی دائەنا نەک بە داگیرکراوی جەنگ. تورک داوایان لە بریتانیا ئەکرد موسڵ چۆڵ بکا، بریتانیا یش کە مرخی لە نەوتی کەرکوک خۆش کرد بو، بەهانەی دائەتاشی موسڵ لەدەس خۆیدا بمێنێتەوە. ئەم کێشەیە بە گفتوگۆی دو قۆڵی تورک و ئینگلیز چارەسەر نەکرا. لە کۆنفرانسی لۆزان یشدا نەیانتوانی بگەنە ڕێکەوتن. کێشەکە بە ڕەزامەندی هەردولایان، بۆ بەلاداخستنی، بەرەو روی کۆمەڵەی گەلان کرایەوە.

کۆمەڵەی گەلان کۆمیتەیەکی 3 کەسی پێکهێنا بۆ لێکۆڵینەوەی "کێشەی موسڵ" و وەرگرتنی بیرورای دانیشتوانی ناوچەکە کە بدرێتەوە بە تورکیا یان بخرێتە سەر عیراق.

کۆمیتەکە هاتە موسڵ و سەردانی هەولێر و کەرکوک و سلێمانی کرد. تاقمێ نوێنەری تورکیان لە گەڵ هات بۆ پرۆپاگەندە. یەکێ لەوانە ژنبرایەکی شێخ مەحمود بو. ئەم کۆمیتەیە لە گەڵ زۆر کەس و تاقم وتوێژیان کرد. لە ئەنجامی ئەم گەشتەدا راپۆرتێکی درێژیان ئامادە کرد و دایان بە کۆمەڵەی گەلان. لە راپۆرتەکەیاندا رایان سپارد بو کە موسڵ بخرێتە سەر عیراق، بەو مەرجەی دەوڵەتێکی پێشکەوتو ماوەی 25 ساڵ یارمەتی بداو ئارەزوەکانی کورد یش لە بەرچاو بگرێ.

ئەم لیژنەیە لە لێکۆڵینەوەکەیدا نوسی بوی:

"لە کاتێکدا ئەگەر چاودێری کۆمەڵەی گەلان تەواو بو، دوای برانەوەی ئەو چوار ساڵەی کە پەیمانی عیراقی- بریتانی تێدا بەستراوە و، بەڵێنی بەرێوەبەرایەتی ناوچەیی بەکورد نەدرێ، زۆر خەڵک تورکیان پێ باشتر دەبێ لە عەرەب." (السيد عبدالرزاق الحسني، العراق في ضل المعاهدات، ط 3، لبنان، 1958. ص 133)

راسپێرییەکانی لیژنەی سنور دەربارەی کورد:

"پێویستە ئارەزوەکانی کورد لەبەر چاو بگیرێ دەربـارەی دانـانی فەرمانبـەرانی بـە رەگـەز کـورد بـۆ بەرێوەبردنی وڵاتەکەیان و، پێویستی دابەشکردنی عەدالەت و بڵاوکردنـەوەی خوێنـدن لـە قوتابخانـەکاندا و، کردنی زمانی کوردی بە زمانی رەسمی لە هەمو ئەم وەزیفانەدا."

برگەی 3 هەمی بریاری ئەنجومەنی کۆمەڵەی گەلان ئەڵێ: "داوا بکـرێ لـە حکومـەتی بریتـانی، وەکـو هێزی مانداتۆر، ئەو تەدابیرە ئیدارییانە بخاتە بەردەم ئەنجومەن کە دائـەنرێن بـۆ دڵنیـاکردنی دانیشـتوانی کورد لەو شتانەی لە راپـۆرتی لیژنـەی لێکۆڵینـەوەدا نـاوبراون، گـەرەنتییـەکانی دەربـارەی بەرێوەبەرایـەتی ناوچەیی، کە لیژنەکە لە ئەنجامگیرییەکانی دا رای سپاردون."(الحسني: ل 129)

کۆمەڵەی گەلان کێشەکەی بە قازانجی بریتانیا و عیراق بە لادا خست. موسـڵی دا بـە عیـراق. تورکیـا یش ئیتر وازی لەم داوایە هێنا. بەڵام سەودایەکی تری بەدودا هات. بۆ ئـەوەی تورکیـا و ئێـران لـە روسـیای سۆڤیەتی دور بکەونەوە و لە ئینگلیز نەوروژێن، ئینگلیز بۆ رازی کردنی ئەوان، نەیهێشت کوردی عیراق هـیچ جۆرە قەوارەیەکی تایبەتی هەبێ، تەنانەت لەناو چوارچێوەی دەوڵەتی عیراق یشدا.

### 5. 2. هیوای کورد بە کۆمەڵەی گەلان

چالاکەکانی کورد ئومێدێکی زۆریان بە راسپێرییەکانی کۆمەڵەی گەلان و، بە عەدالەت و دڵسۆزیی بۆ گەلانی بچوک هەبو. ئەمە یش لەو وتارانەدا دەرئەکـەوێ کـە نوسـراون و، لـەو یادداشـتانەی داویانـە و، لـەو گفتوگۆیانەدا کە لە گەڵ وەفدی وەزاری عیراق کردویانە.

عیزەت بەگی عوسمان پاشا ئەڵێ:

"میللەتی کورد تەنها عیبارەت نیە لە سلێمانی. لە زاخـۆوە تـا خانـەقین هـەمو داوای ئـەم حەقـە ئـەکات و هیچ کوردێک کەرەتێکی تر لە گەڵ عیراقا ناژی. بۆ ئیحقاقی حەقمان موراجەعەت بـە حکومـەتی مونتەدەبـە ئەکەین. ئەگەر ئەو یش نەیپرسی، شکایەت ئەبەینە بەر عیصـبەتول ئومـەم. کـورد حکومـەتێکی موسـتەقیللەی ئەوێ لەژێر ئینتیدابدا. بە هەمو هێزمانەوە بۆ ئەم غایەیە سەعی دەکەین، ئـەمجارە سـیلاح و تفـەنگمان قەڵـەم و موراجەعاتە"

هەر لەم بوارەدا حەمەی ئەورەحمان ئاغا ئەڵێ:

"ئێمە کوردین و، کوردستان عیبارەت نیە هەر لە سلێمانی. لە زاخۆوە هـەتا خانـەقین کوردەوارێتیـە و، نایانەوێ لەگەڵ عیراق بژین. حکومەتێکی موستەقیللەی کوردیمان ئەوێ لەژێر ئینتیدابدا. ئەگەر ئینگلیـز یـش نامانداتێ موراجەعەت بە عیصبەتول ئومەم دەکەین".

بەم دڵنیایی و هیوا گەورەیەوە کە نائومێد بون لە کاربەدەستانی بریتانی، رویان کردە کۆمەڵەی گـەلان و، چەند مەزبەتەیان بۆ نارد.

#### 5. 2. 1. مەزبەتەکانی هەیئەتی وەطەنیە

دانیشتوانی سلێمانی بە ناوی خۆیانەوە چەنـدین مەزبەتـەیان داوە بـە کۆمەڵـەی گـەلان. مەزبەتـەکان لە رێگای مەندوبی سامی بریتانییەوە لە بەغداد ئەنێردران. وێنەیان لێ ئەدرا بە سەرۆکی وەزیرانی عیـراق و، رۆژنامەکانی بەغداد.

هەر بە هاندانی هەیئەت دەیان مەزبەتەی تر لەلایـەن ژنـانی سـلێمانی، کەسـایەتی ناسـراو و، سـەرانی ئێڵەکانی جاف، هەمەوەند، پشدەر، هەورامان... بۆ هەمان مەبەست نێردرا بۆ کۆمەڵەی گەلان.

لە هەمو ئـەو مەزبەتانـەدا داوای جێبـەجێ کردنـی بڕیارەکـانی کۆمەڵـەی گـەلانیان ئـەکرد دەربـارەی پێکهێنانی حکومەتێکی سەربەخۆ بۆ کورد لە ژێـر ئینتیـدابی بریتـانی یـان هـەر ئەنـدامێکی تـری کۆمەڵـەی گەلاندا. هـەر لـەو ماوەیـەدا مەزبەتەیـەکیش بـەناوی سـەرانی ئێڵـەکانی بادینانـەوە نوسـراوە، بـەڵام ئـەوان دەسبەجێ بە درۆیان خستۆتەوە، دژی ئەم جوڵانەوەیە هەڵوێستیان گرت و دەربڕی.

یەکێ لە گرنگترینی ئەو مەزبەتانە، یادداشتێکە کە بەناوی هەیئەتی وەتەنیەی کوردستانی جنوبیەوە، بە ئیمزای ئەندامەکانی لە 31 ی 8 ی 1930 دا دراوە بە کۆمەڵەی گەلان و، هەوڵ ئەدەن بە ئەندامانی کۆمەڵەی بسەلمێنن، کورد هەروەکو مافی دامەزراندنی حکومەتێکی سەربەخۆی هەیە، توانا و لێوەشـاوەیی خـۆ ژیانـدن و خۆ بەڕێوەبردن یشی هەیە.

حکومەتی عیراق روداوەکەی 6 ی 9 ی کرد بە بەهانە. هەمو چالاکەکانی هەیئەتیان گرت. هەنـدێکیان ناردن بۆ زیندانی کەرکوک و هەندێکیان دورخستنەوە. بە گیرانی ئەمان هەیئەت لە چـالاکی کـەوت و تـەواو بو. هەندێکیان بەیەکجاری لە ژیانی سیاسی کشانەوە. لە کاتی لێکۆڵینـەوە و دادگـایی کردنـدا دەرکـەوت کـە هۆی سەرەکی گیرانەکەیان، ناردنی ئەو مەزبەتانە بوە بۆ کۆمەڵەی گەلان.

### 5. 2. 2. مەزبەتەکانی شێخ مەحمود

شێخ مەحمود کە هاتەوە مەیدان، چالاکەکانی هەیئەت گیرابون. ئەو چالاکی‌یەی ئەوان دەسـتیان پێکـرد بو تەواو بوبو. شێخ مەحمود چەندین نامەی بۆ موفەتیشی ئیداری لـە سـلێمانی، مەنـدوبی سـامی لـە بەغـداد نوسی و داوای لێکردن کە کاربەدەستانی عەرەبی، دامودەزگای مەدەنی و سوپایی لـە زاخـۆوە هـەتا خانـەقین چۆڵ بکەن، حکومەتێکی کوردی لـە ژێـر ئینتیـدابی بریتـانی یـان هـەر ئەنـدامێکی تـری کۆمەڵـەی گـەلاندا دابمەزرێنن. بەڵام ئەمان بە بیانوی ئەوەی شـێخ مـەحمود رێککەوتنەکـەی 1927 ی شـکاندوە، بـە هەڕەشـە لێکردن وەڵامیان دایەوە.

بە رێگای ئەوان بو بێ یان هەر رێگایەکی تر، لە باتی دانیشتوانی کوردستانی جنـوبی، لـە رۆژی 21 ی 3 ی 1931 دا یادداشتێکی ناردوە بۆ کۆمەڵەی گەلان. لەو یادداشتەدا گازندە لە حکومـەتی عیراقـی ئـەکا لەسەر ئەوەی لە سلێمانی کوشتاری کردوە و رۆشنبیرەکانی گرتوە، داوا ئەکا حکومەتێکی کوردی سەربەخۆ لە ژێر سایەی ئینتیدابی بریتانی یا هەر ئەندامێکی تری کۆمەڵەی گەلاندا، دروست بکرێ ((یادداشـتەکەی شـێخ بۆ سەرۆکی ئەنجومەنی کۆمەڵەی گەلان لە کۆتایی ئەم ناونیشانەی (3. 5. خۆ بەدەستەوەدانی شێخ مەحمود: کۆتایی قۆناغێک) ئەم کتێبەدا بخوێنەرەوە))

### 5. 2. 3. مەزبەتەکانی تۆفیق وەهبی

ئەو کاتەی تۆفیق وەهبی موتەسـەڕیفی سـلێمانی بـو، هەیئـەت لەوپـەڕی جموجـۆڵ و چـالاکی دا بـو. حکومەتی بەغداد پێی وابو ئەو چالاکیانە بەهاندانی تۆفیـق وەهبـی یـن، لـە بـەر ئـەوە کێشـایانەوە بەغـداد و دەستیان لە کار کێشایەوە.

لە ئازاری 1931 دا کۆمەڵێ لە پیاوە ناسراوەکانی کوردوستانی عیراق، وەکالەت نامەیەکیان بۆ تۆفیق وەهبی کردۆتەوە. دەسەڵاتیان داوەتێ بە ناوی ئەوان و، بە نوێنەرایەتی دانیشتوانی کوردستانی جنـوبی، بـۆ جێبەجێ کردنی خواستەکانی گەلی کورد، لە گەڵ کۆمەڵەی گەلان و دەزگاکـانی و، لە گـەڵ وەزارەتـی دەرەوەی بریتانیا، یان هەر دەوڵەت و دەزگایەکی پێوەندیدار گفتوگۆ بکا. جەلادەت بـەدرخان یـش، بـەناوی کۆمەڵـەی خۆیبون ەوە نامەی پشتیوانی بۆ نوسیوە.

تۆفیق وەهبی لـە نیسـانی 1931 دا، دوای ئـەوەی مەزبەتـەکانی سـاڵی 1930 ڕەفـز کـراون، چۆتـە بێروت و دەستی کردوە بەکار. لەو کاتەدا هەیئەتی وەتەنیە لە چالاکی کەوت بـو. شـێخ مـەحمود یـش لـە دوا ڕۆژانی شۆڕشەکەی‌دا بوە. لەو کاتەدا زنجیرەیـەک نامـەو یادداشـتی، بەنوێنەرایـەتی (800) هـەزار کـوردی کوردوستانی جنوبی نوسیوە، بۆ: مەنـدوبی سـامی بریتـانی لـە عیـراق و، وەزیـری دەوڵـەت بـۆ کاروبـاری دەرەوەی بریتانیا و، سکرتێری کۆمەڵەی گەلان و سەرۆکی لیژنەی هەمیشەیی ئینتیداب.

تۆفیق وەهبی لە یادداشتەکانی‌دا حکومەتی عیـراق بـە حکومـەتی عـەرەبی و کوردوسـتانی عیـراق بـە کوردستانی جنوبی ناو ئەبا. ئەڵێ کابرایەکی ئایریش چەندە ئینگلیزە، کورد یش ئەوەندە عەرەب یا عیراقیە.

تۆفیق وەهبی لە یادداشتەکەی‌دا داوا ئەکا لە ژێر سایەی عەرشی عیراق‌دا مافی (خۆحوکم کردن) بـدرێ بە کوردستان. هەوڵ ئەدا باشیی ئەم کارە بۆ سەر ئاسایشـی عیـراق و، ڕۆژهـەڵاتی ناوەڕاسـت و، پێوەنـدی کورد و عەرەب و کلدانی و ئاسوری، بسەلمێنێ.

خواستی ئەم لە گەڵ خواستی هەیئەتی وەتەنیە و شێخ مەحمود جیاواز بوە. ئەوان داوای حکومـەتێکی کوردی‌ی سەربەخۆیان کردوە لەژێر ئینتیدابی بریتانی‌دا. بەڵام ئەم داوای خۆ حوکوم کردنی کـردوە لـە ژێـر سایەی عەرشی عیراق دا. دیارە ئەوە یش ئەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە ئەم شارەزای سیاسەتی ناودەوڵەتان بـوە. دڵنیا بوە لەوەی لە بەر خاتری کورد دەوڵەتی عیراق هەڵناوەشێنرێتەوە و کوردستان لە عیراق جیا ناکرێتەوە. شتێکی داوا کردوە بە پێی بۆچونی خۆی، هەلی جێبەجێ کردنی زۆرتر بێ لەوانـەی پێشـو. بـۆ سـەلماندنی خواستەکانی، پشت بە ژمارە و بەڵگە و شـایەت و لێکۆڵینـەوەی زانسـتی و مـەنتیقی ئەبەسـتێ. وەک بەشـێ لەمەزبەتەکەی، دو مەسەلەی گرنگی تری باس کردوە:

**یەکەمیان**: هەوڵی داوە قسەکانی نوێنەری بریتانیا لە لای لیژنەی هەمیشەیی ئینتیداب کە بـە قـازانجی حکومەتی عیراق و بەزەرەری کورد بون، پوچ بکاتەوە.

**دوەمیان**: پێی لەسەر دۆستایەتی کورد و ئاسوری و کلدانی داگرتوە. ناکۆکی ئەم دو گەلـەی خسـتۆتە ئەستۆی حکومەتی عیراق کە هێزی لیوی لێ دروست کردون و ئەیانێنێ بۆ شەڕی کورد. نوێنەرانی ئاسوری پشتیوانی‌یان لە خواستەکانی تۆفیق وەهبی کردوە.

دوای ئەوەی تۆفیق وەهبی گەراوەتەوە بەغداد، پێ ئەچێ لەسـەر ئـەم مەزبەتەیـە، گیرابـێ. بـەڵام دوای ئەوەی هاوسەرەکەی سکاڵایەکی داوە بە مەندوبی سامی، بەردراوە. تۆفیق وەهبی جـارێکی تـر یـش چۆتـەوە بەیروت. لە وەڵامی ئەو تۆمەتانەی لـە ڕۆژنامـە عـەرەبی‌یـەکانا بـە پـاڵ جوڵانـەوەی کـورد دراون، وتـارێکی نوسیوە. لەباری سەرنجی کوردەوە داکۆکی لە مافەکانی ئەکا.

### 5. 3. ڕاپۆرتەکانی هێزی مانداتۆر

حکومەتی بریتانی کە هێزی مانداتۆر بو لـە عیـراق، هـەمو سـاڵێ ڕاپـۆرتێکی درێـژی لەسـەر جـۆری بەڕێوەبردنی عیراق و، پلەی پێشکەوتن و گەشـەکردنی بـۆ کۆمەڵـەی گـەلان ئەنوسـی. لـە هـەمو ڕاپـۆرتێکی ساڵانەدا بەشێکی بۆ کورد تەرخان ئەکرد. لەم بەشەدا هەمیشە دو شتی ڕون ئەکردەوە:

**یەکەمیان**: شایەتی‌یەکی ناڕاستی بۆ حکومەتی عیراق ئەدا، کەوا هەمو بەڵێنەکانی خـۆی سـەبارەت بـە ڕاسپێری‌یەکانی کۆمەڵەی گەلان بەرامبەر بە کـورد جێبـەجێ کـردوە. قسـە و ڕاگەیاندنـەکانی کاربەدەسـتانی عیراق و ژمارەی فەرمانبەرانی کورد و ناسینی ڕەسمیی زمانی کوردی ئەکرد بە بەڵگە.

**دوەمیان**، سکاڵاو گازندەکانی کوردی بە درۆ ئەخسـتەوە. بـە تێبینـی‌یـەکانی کـە لەسـەر مەزبەتـەکانی سەرانی کوردی ئەنوسی، هەمیشە شکات و داواکانی پوچ ئەکردنەوە.

ئەو زەمانە بریتانیا گەورەترین زلهێزی دنیا و خاوەن دەسەڵاتی گەورە بو لـە نـاو کۆمەڵـەی گـەلاندا. شتێک ئەم رازی لەسەر نەبوایە سەری نەئەگرت. بریتانیا سەربەخۆیی کوردستانی بە شـتێکی گەوجانـە و لـە جێبەجێکردن نەهاتو دائەنا. لای وابو دامەزراندنی هەر جۆرە قەوارەیەکی کوردی لـە عیـراقدا، ئـەبێ بـەهۆی وروژاندنی تورکیاو ئێران. ئینگلیز و تورکیا و ئێران عیراقیان بەلاوە گرنگتر بو لە کـورد. بـۆ ئـەوەی ئـەو تۆمەتە لە خۆیـان دور بخەنـەوە کـە ئـەوان لـە پشـت خواسـتە نەتەوەیی ـەکانی کـوردەوەن، بـە پێچەوانـەی بەڵێنەکانی خۆیان و راسپێرییەکانی کۆمەڵەی گەلانەوە، دژی هەمو جۆرە قەوارەیـەکی کـوردی رائـەوەسـتان. نەیانهێشت کورد هیچ دەسکەوتێکی سیاسی یا بەرێوەبەرایەتی لە عیراقدا بە دەس بهێنێ.

بریتانیا لە سیاسەتی عیراقییدا بەرامبەر بە کورد وەکو کابرای عەرەبی دەکرد: (ترید غزال اخذ ارنـب، ترید ارنب اخذ ارنب). لە هەمو حاڵەتێکدا ئەبو بە لای دەوڵەتی عیراق دا بکەوێ.

## 5. 4. رەتکردنەوەی خواستەکانی کورد

لیژنەی هەمیشەیی ئینتیداب، بێ پێچ و پەنا، خواسـتی کـوردی بـۆ دامەزرانـدنی حکومـەتێکی کـوردی سەربەخۆ لە ژێر ئینتیداب و، خواستی خۆ حکوم کردنی کوردستانی لـەژێر سـایەی عەرشـی عیـراق دا، رەت کردەوە.

بیانو یشیان ئەوە بو کە لەناو بڕیارەکانی کۆمەڵەی گەلاندا راسپێری و بەڵێنی لەو بابەتـەی تیـا نیـە، کورد بە هەڵە لە بڕیارو راسپێرییەکانی کۆمەڵەی گەلان گەیشتون و بە هەڵە لێکیان داوەتەوە.

شکانی شێخ مەحمود یش ئینگلیزی گەرمتر کردەوە. بۆ پوچکردنەوەی مەزبەتەکانی کورد، بۆ نمونە لە یەکێ لەو تێبینـی یانـەی لەسـەر مەزبەتـەی تـاقمێ کەسـایەتی کـورد نوسـیوێتی، جگـە لـەوەی عیراقـی بـونی نوسەرەکانی و خوێندنەوەی ئیمزاکانی و لێوەشاوەییان کە بە ناوی کوردەوە بدوێن، ئەخاتـە گومانـەوە، بـە راشکاویی ئەڵێ ئەو مەزبەتەیە بە فیتی شێخ مەحمود نوسـراوە. شـێخ مـەحمود یـش خـۆی بەدەسـتەوە داوە، لەبەر ئەوە ناهێنێ بایەخی پێ بدرێ.

کۆمەڵەی گەلان، لەباتی ئەوەی خواستە نەتەوەیی یەکانی کـورد دابـین بکـا، لـە راسـپێرییـەکانیدا بـۆ ئەوەی مافەکانی رێز لێ گیراو بێ، کردویەتی بە مەرج بەسەر کوردەوە کە ئەبێ "بە دڵسۆزیەوە بەشداری بکـا لە ئاسایش و گەشانەوەی دەوڵەتی عیراق دا"

ئەو هیوایەی چالاکەکانی کورد بە کۆمەڵەی گەلان و عەدالەتەکەی هـەیان بـو، نـەما. شـێخ سـەلام بـەو بۆنەیەوە شیعرێکی داناوە، کە ئەو سەردەمە لە گۆڤاری هـاواری دیمەشـقیدا بڵاوکراوەتـەوە. لـە شـیعرەکەیدا ئەڵێ:

عیصبەتول ئومەم، کۆمەڵی گەورە
بە پێچ و پەنا، بە فێڵ و دەورە
تەریق نابێتۆ تۆ چیت پێ ئەکەن؟
کوتەکی دەستی میستەر هەندەرسەن.

## 5. 4. 1. کۆمەڵەی گەلان.... کۆمەڵەی دزان

لە راستیدا کۆمەڵەی گەلان "کۆمەڵەی دزان" ی ئەو ئیسـتیعمارییانە بـو کـە هـیچ خـەم و خولیایـەکیان نەبو، جگە لەوەی لەرێی دزیو جەردەییو تاڵان و بڕۆکردنی سەروەت و سامانی گەلانی رۆژهەڵات و ئـەفریقا و سـەرکوتکردنیانەوە، بەرژەوەنـدییـەکانی ئیمپریـالیزم بپـارێزن و لـە نێـوان دەوڵەتـە سـەرکەوتوەکاندا

دەسکەوتی بە تاڵانبراو بەش بکەن. هەر لەبەر ئەوە یش بو مافەکانی گەلی کورد و چارەنوسیان بـەلاوە هـیچ نەبو. بەڵام باروذۆخی نێودەوڵەتی و ڕوداوەکانی ڕۆژهەلات، کۆمەڵەی گەلانی ناچار کرد کـە هەنـدێ بڕیـاری بەنج ئاسا دەربکەن. ئەمەش دوای ئەوەی کە کوردیان لە مافی چـارەی خۆنوسـین بێبـەش کـرد. ئـەو کاتـەی کۆمەڵەی گەلان بڕیاریدا لیژنەیەک لە ئەندامانی خۆی بنێرێ بۆ عیـراق، سـەبارەت بـەوەی لـەو نـاکۆکیيانـە بکۆڵنەوە کە کەوتبونە نێوان بریتانیا و تورکیاوە لەسەر کێشەی موسڵ. لیژنەکە لە ساڵی 1925 دا سـەردانی عیراقی کرد و لە راپۆرتەکەی خۆیاندا دەربـارەی کـورد نوسـی بویـان: "پێویسـتە داواکـانی کـورد لـەبارەی دامەزراندنی کارمەندە کوردەکانـەوە بـۆ بـەڕێوەبردنی کاروبـاری وڵات و کاروبـاری داد و قـەزا و فێرکـردن پشتگوێ نەخرێن. لەم ڕووەوە زمانی کوردی وەک زمانێکی ڕەسمی کاری پێ بکرێ". وەختێک یـش کۆمەڵـەی گەلان لەو ناکۆکیيانەی کۆڵیيەوە بڕیاریدا: "بەو سیفەتەی حکومەتی بریتانی دەوڵەتی مونتەدیبـە لـەعیراقدا: داوای لێ دەکرێ ئەو تەگبیرانە بخاتە بەردەم ئەنجومەن کـە پێویسـتە ئـەنجام بـدرێن. تـا ئـەو بەڵێنانـە بـۆ کوردەکانی عیـراق بـەجێ بهێنـرێن کـە پێوەنـدیيـان بـە بـەڕێوەبردنی کاروبـاری نـاوخۆوە هەیـە، لیژنـەی لێکۆڵینەوە لە سنورەکان لە دوا ئەنجامگیرییـەکانیدا بڕیـاری لەسـەر دان" هـەروەک چـۆن کۆمەڵـەی گـەلان هەندێ بڕیاری تری دەرکرد کە پێشتر خستمانە ڕو. کاتێ دەربارەی گرنگیی نێودەوڵەتیی ڕاپەڕینی 6 ی 9 ی 1930 دواین. بەڕێوەبەری هۆبەی ئینتیداب یش لە گەڵ عەریزەکەی بەڕێز حەپسە خانی نەقیب دا، وێنـەی بڕیارەکەی بۆ کۆمەڵی گەلان نارد. وا لێرەدا بڵاوی ئەکەینەوە:

وێنەی ئەو بڕیارەی کە لە گەڵ عەریزەکەی بـەڕێز حەپسـە خـانی نـەقیب دا بـو، کـاتێ لـە 7 ی 9 ی 1930 دا پێشکەشی کۆمەڵەی گەلانی کرد:

کۆمەڵەی گەلان

جنێوە (5)ی ئۆکتۆبەری 1931

ژمارە 6          28 ی 22413 ی 655

**خانمی بەڕێز**

ئەنجومەنی کۆمەڵەی گـەلان لـە بڕیارەکـانی ڕۆژی 4 ی سـێپتەمبەری 1930 دا و لـە بـەر ڕۆشـنایی پێشنیازەکانی لیژنەی هەمیشەیی ئینتیدابـدا، منـی راسـپارد کـە پێتـان رابگەیـەنم: ئـەو عەریزەیـەی لـە 7 ی سێپتەمبەری 1930 دا پێشکەشتان کرد بو، تەماشا کرا و تا هەنوکەش کۆمەڵەی گەلان بـە عـەتفێکی زۆرەوە لایەنگیری ئەوەیە کە مافەکانتان بەچاوی ڕێزەوە تەماشا دەکرێ: ئەگـەر دڵنیـا بـین لـەوەی کـورد بەتـەواوی خزمەتی خۆیان بەجێ دێنن لە پێناوی پاراستنی ئاسایشی مەملەکەت و سەرکەوتنی حکومەتی عیراقیدا، جا بۆ ئەوەی ئێوەش ئاگاداربن وا لەگەڵ عەریزەکەتاندا وێنەی ئەو بڕیارەش دەنێرم کـە مسـتەر رابـاد بـۆ لێژنـەی هەمیشەیی ئینتیداب بەرزی کردبۆوە و نێردرابو بۆ کۆبونەوەی بیستەمی لیژنەکە.

خانمی بەڕێز، مایەی شەرەفمەندیشە بۆ من کە خزمەتکاری گوێرایەڵتان بم.

بەڕێوەبەری هۆبەی ئینتیداب

پوختەی بڕیارو کاروبارەکـانی کۆبونـەوەی بیسـتەمی لیژنـەی هەمیشـەیی ئینتیـداب ژمـارە 422 cم 167 و 1931 شەشەم 1198 cp 222-pp220.

عیراق

عەرزوحاڵێک (1) لەلایەن کوردەکانی عیراقەوە بەرزکراوەتەوە و لەلایەن حکومەتی بریتانیـاوە لـە 20 ی 2 ی 1931 دا بۆ لیژنەی ئینتیداب گوازراوەتەوە. (2) عەرزو حاڵێکی دیکە لەلایەن تۆفیق وەهبی بەگـەوە مێژوی 19 ی 4 ی 1931 ی پێوەیە.

### 5. 4. 2. راپۆرتی مستەر راباد

لەسەر بناغەی ئارەزوی سەرۆکی لیژنە، شەرەفی ئەوەم بەرکەوت کە ئەم سەرنجانە بخەمە پـێش چـاوی هاوکارانمەوە کە، پاش خوێندنەوەی چەندین عەرز و حاڵی کوردەکان لام دروسـت بـون، پـاش ئـەوەی داوام لێکرا لەو عەرز و حاڵانە و لە پەراوێزی دەوڵەتە ئینتیداب کراوەکان لەسەریان ورد ببمەوە.

ئەگـەرچی قـەبارەی ئـەو بابەتانـەی خرانـە پـێش چـاوم لـە دو تـوێی چەنـد بەرگێکـدا بـون، بـەڵام سەرەنجەکانم لەبارەیانەوە زۆر کورت دەبن. بۆیـە بـە پێویسـتی نـازانم لـەم سـەرنجنامەیەدا سـەرجەمی ئـەو شتانەی لەو عەرز و حاڵانەدا هاتون یان لـە پـەراوێزی دەوڵەتـە ئینتیـداب کراوەکانـدا، چونکـە ئـەوە بـەرەو دوبارەکردنەوەیەک دەمبا کە هیچ سـودێکی نیـە و لەبـەر ئـەوەی هاوکـارانم دەتـوانن سـەرجەمی ئـەو عـەرز و حاڵانە ببینن. بۆیە تەنها لەم خاڵانە دەدوێم:

1. لیستێک بەو عەرز وحاڵانە و مێژو و سەرچاوەیان.
2. باس کردنی گرنگترین سکاڵاکانی خاوەن عەرز و حاڵەکان.
3. کورتەی تێبینی دەوڵەتە ئینتیداب کراوەکان.
4. دەربڕینی هێندێ ئەنجامگیری کورت.

### 5. 4. 2. 1. لیستی عەرزوحاڵەکان

| نامە | مێژو ا. 24 ی 8 ی 1930 سەرۆکەکانی عەشیرەتی داودە | سەرچاوە |
|---|---|---|
| سی. پی. ئێم | ا. 24 ی 8 ی 1930 | سەرۆکەکانی عەشیرەتی داودە |
| 1140، 1151 | ب. 31 ی 8 ی 1930 | کۆمەڵەی نیشتمانیی مەرکەزیی دانیشتوانی کوردستانی باشور. |
| | ج. 7 ی 9 ی 1930 | نەقیب زادە حەپسە (حەپسە خانی نەقیب). |
| | د.9 ی تشرینی یەکەمی 1930 | سەرۆکەکانی عەشیرەتی مەریوان و عەشیرەتی فەتاح عەلی بەگ. |
| | هێ. 9 ی تشرینی یەکەمی 1930 | رێبەرانی کورد |
| | و. 9 ی تشرینی یەکەمی 1930 | شێخ مـەحمود و 30 سـەرۆکی عەشـیرەتی پشدەر |
| سی. پی. ئێم | ی-19ی 4 ی 1931 | جەعفـەر سـوڵتان و نـۆزدە گـەورە پیـاوی کورد. |
| | ز. 14 ی تشرینی یەکەمی 1930 | تۆفیق وەهبی بەگ 1192 |

### 5. 4. 2. 2. سکاڵای خاوەن عەرزوحاڵەکان

ئەو عەرزوحاڵانەی لێیان وردبومەوە لە روی درێژی و شێوەزمان و ناوەڕۆکـەوە لێـک جیـاوازن، بـەڵام سەرجەمیان تورەیی گەلی کورد دەردەبڕن کە لە عیراقـدا نیشـتەجێن. خـاوەنی عـەرز و حاڵـەکان و ئەوانـەی بەناویانەوە قسە ئەکەن، تێکرا بە چەند پلەیـەکی جیـاواز ئـەو سیاسـەتە مـەحکوم ئەکـەن کـە بـە سیاسـەتی حکومەتی عیراق و دەوڵەتی ئینتیداب کراوی دەزانن. بە مەبەستی ئەوەی بیاندەنە پاڵ سەرجەمی دانیشـتوانی ئەو وڵاتەی ئینتیـداب کـراوە. لەبـەر ئـەوەی کوردەکـان لـە روی رەگـەز و زمـان و ئـەدەب و شـێوازی ژیـان و خواسـتی سیاسـییانەوە لـە دەشـت نشـینان جیـاوازن و، لەبـەر ئـەوەی پێیانـەوە دیـارە کـە هەسـت بـە هاوبەرژەوەندی بونی تایفەگەرانە دەکەن لەگەڵ سەرجەمی ئەو کوردانەی لـە دەرەوەی عیراقـدا نیشـتەجێن، وا هەست دەکەم کە ئێمە لەبەردەم کێشەیەکی تایفەگەری و رەگەزیی ئەوتۆ داین کە خاسیەتەکانی ئـەو کێشـەیەی هەیە کە بە "کەمە نەتەوەیی‌یەکان" ناو دەبرێ.

هێنـدێ لـە سـکاڵاکانی خـاوەن عەرزوحاڵـەکان زۆر ئـاڵۆزن، سـکاڵا لـە دڵڕەقـی و تونـدوتیژیی دەسەڵاتدارانی عیراق دەکەن. بەڵام هێندێکیان رونترن و تێیاندا هەیە سکاڵا دەکەن لەوەی ژمارەی فەرمانبـەری ناکوردی بەرپرس لە بەڕێوەبردنی ناوچەکەیان زیاترە، سەرەرای ئـەوەی حکومـەت پێچەوانـەی ئەمـە دوپـات دەکاتـەوە. هێنـدێکیان سـکاڵایان لەوەیـە کـە بـاجی زیـاتر دەخرێتـە سـەر مێگـەل و مـاڵات و بـەروبومیان. زۆربەشیان سکاڵا دەکەن لەو پەیمانەی دوایی هاوپەیمانیی نێوانی عیراق و بریتانیا کە هیچ بەندێکی ئـەوتۆی تێدا نیە مافی تایبەت بۆ کورد مسۆگەر بکات، ژمارەیـەکیان نارەزامەنـدی دەنـوێنێ دژی ئـەو تونـد و تیـژی و دڵڕەقییەی کە روبەروی جەماوەری کورد و بەڵکو سەرۆکەکانی کوردەکان بـوەوە لـەکاتی هەڵبژاردنـەکان لـە سلێمانیدا. لەکۆتایی یشدا دو عەرزوحاڵم بینی کە شێوەی نوسینیان دەڵێی هەریەکە سکاڵا دەکەن لـە دەسـتی وەڵام نەدانەوەی ئەو عەرزو حاڵانەی بۆ باوەڕپێکراوی بەریتانی لە عیراقدا، نێردراون.

### 5. 4. 2. 3. داخوازییەکانی خاوەن عەرزوحاڵەکان

ئەم عەرزوحاڵانە، جگە لەو هۆکارانەی تورەیی کە لەسەرەوە کورتم کردنەوە، چەند داخوازییەکی دیاری کراویشی لەخۆ گرتوە کە ئاماژە دەکەن بۆ پێکهاتە ئیداری و سیاسی‌یەکان لەو بەشەی عیراقدا کە کوردی تێدا نیشتەجێ‌یە، ئەو داخوازیانە زۆر لێک جیاوازن و جۆربـەجۆرن، هێنـدێکیان داوای دامەزرانـدنی حکومـەتێکی سەربەخۆی کورد دەکات لـە ژێـر پارێزگـاریی ئینتیـدابی بریتـانی یـان هـەر دەوڵـەتێکی دیکـە کـە کۆمەڵـە هەڵیبژێرێ، هی دیکەش داوا دەکەن کە ئەو ناوچەیە دەبێ مەملەکەتێکی سەربەخۆ بێت و شێخ مەحمود حوکمی بکات لە ژێر پارێزگاریی دەوڵەتی بریتانیا. تۆفیق وەهبی بەگ لەلایەکی دیکەوە، لە چەند نامەو عەرزوحاڵێکدا تەنها داوای بەڕێوەبەرایەتی‌یەکی زۆر باش و بەرزی ناوچەی کوردنشین دەکات.

ئەم عەرزوحاڵانە دو داخوازییان تیایە:

یەکەم:

بەردانی ئەو کەسانەی لە رۆژانی نائارامی لە سلێمانیدا گیران یان دور خرانەوە. دوەم:

گواستنەوەی فەرمانبەرە کوردەکان لە ناوچە عەرەبی‌یەکانەوە بۆ ناوچەی کوردنشین.

### 5. 4. 2. 4. کورتەی تێبینی‌یەکانی دەوڵەتی ئینتیداب کراو

ئەو دەوڵەتە ئینتیـداب کـراوەی ئـەم عـەریزە جـۆر بەجۆرانـەی بـۆ لیژنـە بـەرزکردەوە، بـە تـەواوی پشکنیونی و لێیان ورد بۆتەوە، هەڵوێستی خۆی سەبارەت بەم عەرزوحاڵانە لـەو سـەرنجانەدا دەربڕیـوە کـە

کردونی بە پاشکۆی چەندین بەندی ئەو راپۆرتەی سەبارەت بە گەشەکردن و پێشکەوتنی عیراقە لەم بارەیەوە. بێ ئەوەی بە قوڵی بچینە نـاخی خاڵـە زۆرو جـۆر بـەجۆرە جیاوازەکـانی‌یەوە، دەبـێ بزانـرێ کـە دەوڵـەتی ئینتیداب کراو ئەوە رەت دەکاتەوە کە ئـەو مافـەی خـاوەن عەرزوحاڵـەکان داوای دەکـەن، دەربـڕی بۆچـونی زۆربەی گەلی کورد بێت. ئەوەش رەت دەکاتەوە کە ئەو پەیمانانەی مۆرکراون، بەڵێنی ئـەوتۆی تێـدا بـێ کـە ئاماژە بۆ سەربەخۆیی کورد بکات یان بەڕێوەبەرایەتی‌یەکی زۆر باشیان پـێ بـدرێ، ئـەم جـۆرە بەڵێنانـە لـە کاتی دامەزراندنی سیستەمی ئینتیداب لە عیراقدا نەبوە. دەوڵـەتی ئینتیـداب کـراو دان بـەوەدا دەنـێ کـە بـە نیسبەت کوردەکانەوە مافی بەکارهێنانی زمانی خۆیان و دامەزراندنی فەرمانبەری کوردی دابین کـردوە، بـەڵام پێی وایە کە حکومەتی عیراق کاری کردوە، یان بەم نزیکانە کار دەکات بۆ جێبەجێ کردنـی ئەوانـە لـەکاتی گونجا و بونی سیاسەتی گشتی‌دا، بەڵام ئەوە رەت دەکاتەوە هەمو کوردی عیراق نارازی بـو بـن و، سوپاسـی میانڕەوی و ژیری زۆربەی گەلی عیراقی کرد، چونکە ئێمە دڵنیاین بە تـەواوی لـە مـاف و شـوێنی کەمایـەتی کورد هەمیشە رێزی لێ دەگیرێ، تەنانەت پاش ئـەوەش کـە عیـراق دەچێتـە ریـزی نێونەتـەوەیی‌یـەوە وەکـو دەوڵەتێکی سەربەخۆ، ئەمەش بە توندی پێی لەسەر دادەگرێ و دەیکاتە راسپاردەی خۆی.

### 5. 4. 2. 5. دەربڕینی هێندێ ئەنجامگیریی پێویست

لەبەر ئەوەی رژێمی حکومەتی عیراق پتر لە پلەی "باشترین چاک بـون" دایـە، ئـەوا بـێ هـودە هـەوڵ دەدەین رێسایەک دابنێن بۆ ئەوەی ببێتە بناغەی چەند بڕیارێک لەبارەی هەریـەک لـە داخوازیـەکانی خـاوەن عەرزوحاڵەکان، چونکە زۆرترین ژمارەی ئەو داخوازیانە و گرنگترینیان زیاتر بریتی‌یە لـە دامەزرانـدنی ئـەو مەملەکەتەی لە وزەی رێکەوتن و پەیمانە عیراقیە بریتانی‌یەکان‌کە لە بری ئینتیداب پێویستیەکان دابین بکـات. کەواتە ئەم عەرزوحاڵانە بە شێوەی راستەقینەیان پەسـند نـین، شـایانی هـیچ جـۆرە لێـدوانێک نـین لەلایـەن لیژنەوە، بەڵام سەبارەت بەو عەرزوحاڵانـەی ئامـاژە بـۆ ئـازادیی بـەکارهێنانی زمـانی کـوردی دەکـەن، ئـەوا دەوڵەتی ئینتیداب کراو دەڵێ کە خەریکن بگەنە ئاستێکی رەزامەندی بەخش لەبـەر ئـەوەی سیاسـەتی گشـتی رێگا بە لێکۆڵینەوەی دەدات. بەلای هاوکارانمـەوە گرنگـە بـزانن کـە دەوڵـەتی ئینتیـداب کـراو، بڕیارەکـانی حکومەتی عیراقی سەبارەت بە هەڵوێستی لە کێشەی کورد، پەسند کردوە.

هەروەها بریکاری سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران لە 19 ی 8 ی 1930 دا گوتی کە حکومەتی عیـراق بڕیاری داوە لە پاشەڕۆژدا بایەخ بـە داخـوازیـیـەکانی کوردەکـان بـدات بـەوەی کـە سـوربێ لەسـەر ئـەوەی فەرمانبەرانی حکومەت، لـە هـەر نەتەوەیـەک بـن دەبـێ زمـانی کـوردی بـزانن، ئەمـەش زۆر باشـترە لـەوەی بەڕێوەبەرایەتی ناوچەی کوردنشین بدرێتە دەستی فەرمانبەرانی کورد.

لیژنەکە ناچارە بەمە قایل بێت، چونکە ئەم بڕیـارە ئـارەزوی ئـەوە دەردەبـڕێ کـە پەیوەنـدیی نێـوان دانیشتوانی کورد و بەڕێوەبەرایەتی ئاسان بکاتەوە، بوار بۆ فەرمانبەرە کوردەکان لە ناوچە نـاکوردی‌یـەکانی وڵاتدا دەرەخسێنێ.

لەلایەکی دیکەشەوە هەرگیز ناکرێ لیژنەکە ئەم بیرۆکەیە بە باشتر بزانێ، بێ ئەوەی ئاوڕ لە مەبەسـتی بداتەوە، ئەگەر ببێتە مایەی دامالینی کوردان لەو فەرمانبەرانەی خەمی خواستە رەواکانیان دەخۆن.

دەوڵەتی ئینتیداب کراو لە روی دیکەوە ئەوە دوپات دەکاتەوە کە ئەو سـتەمکاری و توندوتیژییـەی روبەروی خاوەن عەرزوحاڵەکان کراونەتەوە، یـان ئـەو کەسـانەی لافـی ئـەوە لـێ دەدەن کـە داکـۆکی لـە ناوچەکانیان دەکـەن یـان خـەیاڵین، یـان هۆکـەیان دەگەڕێتـەوە بـۆ رەفتـاری تەعـەدا لێکـراوە ئینتیـداب کراوەکان.

ئەم ژمارە زۆرەی عەرزوحاڵ کە لەلایەن بەشێکی زۆری خەڵکەوە بەرز کراونەتەوە کە مەحاڵە بتـوانرێ لە ڕێوشوێنیان بکۆڵرێتەوە، ئەو ڕون کردنەوە دور و درێژ و قەناعـەت هێنـەرانـەی دەوڵـەتی ئینتیـداب کـراو دەری بڕیون، لیژنەکە دەخەنە ژمێریاری هەڵوێستێکی سـەختەوە. هـەرگیز هەسـتم بـە قـوڵیی لاوازی لیژنـەی ئینتیداب لە ڕەوتیدا لەناو کێشەی عەرزوحاڵەکاندا نەکردوە، پتـر لـەم گیرۆدەیی‌یـەی لـە نێـوان ئـەم مەبەسـتە چنراوانەی لێدوان و ڕەتکردنەوە و ڕون کردنەوەکاندا، ئەگەر بواری ئیمکانیەتی بەکارهێنانی پێداویستییەکان لە لێکۆڵینەوەدا نەڕەخسێنرێ، ئەوا لیژنەکە ناچار دەبێ بە لێدوانی ئەو دەوڵەتە ئینتیداب کراوانە قایل بێت کە سەرنجیان بۆ لای کێشەکە ڕاکێشاوین. لەم حاڵەتـەدا دەتـوانین بـەبێ بـونی کـەمترین دودڵـی ئەرکـەکانمان جێبەجێ بکەین. لەبەرئەوەی سکالای خاوەن عەرزوحاڵەکان بە وردی لێیان کۆڵراوەتـەوە، لەبـەر ئـەوەی ئـەو سکالایانە پەیوەندییان بە عیراقەوە هەیە پتر لە پەیوەندیان بە حکومەتی بریتانیای مەزنـەوە، ئـەو سـکالایانە لەلایەن دەسەڵاتێکی بەرپرس لەو خراپ بەکارهێنانی خاوەن عەرزوحاڵەکان باسیان لێوە دەکرد، لێکۆڵراوەتەوە بەوردی و پێدەچێ ئەو دەسەڵاتە بەدەست وەردانی لـەکاروبارە ئیداریەکانـدا ئـەو خـراپ بەکارهێنانـەی کـەم کردۆتەوە.

ئایـا پێویسـتە لیژنـەی پیاچونـەوەی سـکالای خـاوەن عەرزوحاڵـەکان، سـکالاکانیان بەتـەواوی پوچـەڵ بکاتەوە؟ و ڕایبگەیەنێ کە بە تەواوی قەناعـەتی بـە دەوڵەتـە ئینتیـداب کراوەکـە هێنـاوە؟!. پـێم وایـە نـەخێر... سەرەڕای ئەوەی ئەم عەرزوحاڵە زۆرانە جێی ڕەخنەن بەراستی بەهۆی نەزانینی نرخ و پایـەی خاوەنەکانیانـەوە، لەلایەکەوە و نەزانینی ناوەڕۆکی باوەڕ پێ نەکراویان لە پلـەی دوەمدا بـەڵام نـاکرێ چـاوپۆشیێکی بـێ لایـەن لـەو بیرۆکەیە خۆی بپارێزێ، بەڵکو دەبێ بڵێ: کێشەی کورد لە عیراقـدا کێشـەیەکی راسـتەقینەیە، ئەگـەرچی تـوڕەیی کوردان زۆر یان کەم جێگیر بو بێ، یان پتر لەوەش بڵاوبوبێتەوە، وەکـو خـاوەن عەرزوحاڵـەکان باسـی دەکـەن، پێدەچێ ئەو توڕەیی‌یە هەبو بێ و دەوڵەتی ئینتیداب کراویش ئەوەی ڕەت نەکردۆتەوە.

ئەگەر ئەم توڕەیی‌یە لەم هەمو ماوەیەدا بە بەردەوامی هەست پێکراو بـو بـێ کـە حکومـەتی بریتانیـا، وێرای لێهاتویی، دەسەڵاتی ڕاستەقینەشی لە ڕێگـای دابپەروەرییـەوە بـەکارهێناوە، ئـەوا ناترسـێ لـەوەی ئـەم جۆرە توڕەیی‌یە هەمو لایەک بگرێتەوە ئەگەر حکومەت سەر پشک بکرێ بۆ بەرێوەبردنی خـۆی و، دوچـاری ئەوەش دەبێ کە وروژاندنی ئەم توڕەیی‌یە، دەشێ هەمو کاتێک روبـدات و ببێتـە مایـەی بڵاوبونـەوەی گیـانی دوژمنایەتی نیشتمانی لە نێو هاوڵاتیانی عەرەبدا.

ئەگەر هاوکارانم هاوبۆچونم بن لەوەی لە ئـەنجامی لێکۆڵینـەوەی ئـەو بەڵگەنامانـەی سـەرەوەدا پـێی گەیشتوە- کە بە کورتی لێیان دوام- دەتوانن ئەم ڕاستیە تۆمار بکەن کە ئەم بڕیـارە هـەڵبژێرن، بـۆ ئـەوەی بدرێتە ئەنجومەن.

لیژنەی ئینتیداب پاش پشکنینی ئەو عەرزوحاڵە زۆرانەی لەلایەن چەندین گروپ و کەسایەتی‌ی کوردی عیراقەوە بەرزکراونەتەوە، لەگەڵ ئەو تێبینی‌یانەدا کە دەوڵەتی ئینتیـداب کـراو تۆمـاری کـردون، شـەرەفمەندە بەوەی ئەنجومەن بەم خاڵانە ڕابسپێرێ:

1. سوپاسی دەوڵەتی ئینتیداب کراو بکات، بۆ ئەو بایـەخ و وردەکاریـەی نواندویـەتی لـە لێکۆڵینـەوە و ئامادەکردنی ئەو تێبینی‌یانەی لەو عەرزوحاڵە زۆرانەوە هەڵێنجنراون.

2. داوا لە دەوڵەتە ئینتیداب کراوەکە بکات کە پێداگرێ لەسەر ئەوەی دەبێ حکومەتی عیراق لە مامەڵـە کردنی لەگەڵ هاوڵاتیانی کورددا، پابەند بێ بە گیانی ئەو پەڕی سنگ فراوانی بەرانبـەر بـە کەمایەتییـەک کـە شایانی ڕێزە، دڵسۆزیی بۆ حکومەتەکەی بەو ڕێژەیە گەشە دەسێنێ تا لە هەمو هێڵێکی ئەوتۆ ڕزگار بکرێ کە خیانەت لەو مافە بناغەییانەی بکات کە دەوڵەتی ئینتیداب کراو و کۆمەڵەی نەتەوەکان دانیان پێدا ناون.

3. خاوەن عەرزوحاڵەکان ئاگادار بکرێنەوە کە کۆمەڵەی نەتەوەکان هەمیشە کار دەکات بۆ ئەوەی ڕێـز لە مافەکانیان بگرێت، ئەمەش بەسۆز و ئارەزوویەکی زیاترەوە دەکرێ ئەگەر لیژنەکە پێی وابـو کوردەکـان بـە ئەوپەڕی دڵسۆزیەوە کار بۆ دابین کردنی ئاسایش و سەرکەوتنی دەوڵەتی عیراق بکەن.

4. بایەخی تەواو بداتە ئەو دوودڵیەی دەستی بەسەر دانیشتوانی کورددا کێشـاوە، چونکـە لـە ئـاڵۆزی ئەو چارەنوسەوە هەڵقوڵاوە کە لە سایەی پارێزگاری کردنیان لەلایەن حکومەتی بریتانیاوە بە هێزی مەعنەویی خۆی چاوەروانیانە، پتر لە دە ساڵ سودیان لێ وەردەگرت و ئێستاش دەبێ بکشێتەوە.

(*کاک عەبدوڵڵا قەرەداغی لە عەرەبی‌یەوە وەری گێڕاون).

## 5. 5. بەڵگەکانی: کورد و کۆمەڵەی گەلان

### 5. 5. 1. صورەتی تەلغرافەکان:

لە خوارەوە صورەتی ئەو تەلغرافانەیە کە لە تەرەف ئەشراف، رؤەسای عەشـایەر و سـائیری تەبەقـەی ئەهالی سلێمانیەوە بۆ مەراجیعی عالیە لێ دراون:

**جینوە: رەئیسی عیصبەتول ئومەم**

لە موعاهەدەی تازەی بەینی حکومەتی ئینگلتەرە و عیراق بحثـی حقـوقی کوردەکـان نەکـراوە، بەنەظەر ئەم موعاهەدەیەوە ئینتیداب مەرفوعە تکا ئەکەین حمایەمان بکەن، مەتالیبی میلیەمان کە عیبارەتە لە مختاریەتێک ئیسترحام ئەکەین بۆمان تەئمین بفەرمون،

عمومی ئەشراف و ئەهالی سلێمانی. (ژیان، ژ 253، 24 ی 7 ی 1930)

**لەندەن: وەزارەتی موستەعمەرات**

موعاهەدەی تازەی حکومەتی فەخیمەی ئینگلـتەرە و عیـراق ئیعتـراف بە حقـوقی پەخشـکراوی کـورد ناکات لەم خصوصەوە بە مضبەطە مەتالیبی میلیەمان لە میان و بۆ تەطبیقی رجامـان لە مەنـدوبی سـامی عیـراق کردوە تکا ئەکەین حمایەمان بکەن ئەو حقوقە پێمان بەخشراوە بۆمـان تەئکیـد بکەیـن و مەتـالیبی میلیەمـان تەضمین بفەرمون.

حمە آغا عبدالرحمن آغا، حفید زادە عبدالقادر، عزمی بابان، توفیق قزاز، عبدالرحمن احمـد پاشـا، فـایق بابان، شفیق بگ رشید پاشا، حمدی بگ رشید پاشا،

(ژیان، ژ 253، 24 ی 7 ی 1930)

<u>جوابدار</u> <u>30 تموز 930</u>

تەلغراف: بۆ رەئیسی عیصبەتول ئومەم لە جنێوە
وەزیری موستەعمەرات لە لەندەن
رەئیسەل وزەرای عیراق
بە پۆستە صورەتێ بۆ مەندوبی سامی عیراق
بۆ بەغداد تایمس

لە موعاهەدەی تازەی عیراق و ئینگلتەرەدا حقوقی کورد ئیعترافی پێ نەکـراوە، بەپێـی ئەم موعـاهەدەیە ئینتیداب نهایەتی هاتوە، مەتالیبی کـورد عیبـارەتە لە موختـارییەتی ئیـدارە، لوطفـا حمایەمـان بـکەن. عمـومی عەشائیری لیوای سلێمانی، 8 تەموزی 930. (ژیان، ژ 253، 24 ی 7 ی 1930)

**بەغداد: فەخامەتی ڕەئیسەل وزەرای عیراق**

لە موعاهەدەی تازەی عیراق و ئینگلتەرادا کە لە جەریدە چاومان پێ کەوت، حقوقی پەخشکراوی کورد تەئید ناکاتەوە، لەم ڕوەوە میلەتی کورد جدا موتاثیرە ڕجا ئەکەین حقوقی پەخشکراومان لەم موعاهەدەیەدا ئیدخال و تەصریح بفەرمون.

ئیمضا: عمومی ئەعیان، ئەشراف و سائیری ئەهالی سلێمانی. 16 تەموز 930

(ژیان، ژ 253، 24 ی 7 ی 1930)

**بەغداد: ریاسەتی وەزاراء**

مەتالیبی کوردان موافیقی قەراری عیصبەتول ئومەم و مادە 109 و 110 ی قانونی ئەساسی عیبارەتە لە موختاریەتی ئیدارە، ئیعلان و ئیعطا و تەطبیقی تکا ئەکەین.

ڕوئەسای پشدەر، ڕوئەسای جاف، ڕوئەسای هەورامان. (ژیان، ژ 253، 24 ی 7 ی 1930)

**بەغداد فەخامەتی مەندوبی سامی**

صورەتی: تەلغرافیەن بۆ بەغداد تایمس

مەتالیبمان موختاریەتێکی ئیداری، ئەمە تەوافوقی قەراری عیصبەتول ئومەم ئەکا بۆ ئیعلان و تەتبیقی ئەم خسوسە موتەعەدید دەفعە موراجەعەتمان بە حکومەتی عیراق کرد هێشتا جوابێکی شافیمان وەرنەگرتوە بەصیفەتی ئەوە کە فەخامەتتان لێرەدا عیصبەتول ئومەم تەمسیل ئەکەن پێویستە موتالەباتمان جێبەجێ بفەرمون.

8 ی 7 ی 1930 عمومی ئەشرافی سلێمانی. بەگزادە و ڕوئەسای جاف. هەمو بەگزادەی هەورامی. هەمو ڕوئەسای پشدەر. هەمو ڕوئەسای هەمەوەند.

(ژیان، ژ 254، 28 ی 7 ی 1930)

**بغداد فەخامەتی مەندوبی سامی عیراق**

ڕەئیسەل وزەرای عیراق

بۆ بەغداد تایمس

بۆ العالم العربی

عمومی عەشائیری پشدەر لەگەڵ هەمو کوردان دا موتەفیقەن تەلەبی موختاریەتی ئیدارە و ئینجازی قەراری عیصبەتول ئومەم ئەکەین. هەمو عەشائیری پشدەرو جاف. 20 ی 7 ی 1930. (ژیان، ژ 254، 28 ی 7 ی 1930)

**بەغداد فەخامەتی موعتەمیدی سامی عیراق**

صورەتی بۆ فەخامەتی ڕەئیسەل وزەرا

بە پێی قەراری عیصبەتول ئومەم لەم موعاهەدەیەدا تەئمینی ڕەغائیبی میللەتەکەم ئەکەم، ئیستیرحام و تەئیدی مەتالیبیان ئەکەم. 18 ی 7 ی 1930. ئەحمەد، تۆفیق بەگ زادە. (ژیان، ژ 254، 28 ی 7 ی 1930)

**بەغداد فەخامەتی مەندوبی سامی عیراق**

رەئیسەل وزەرای عیراق

صورەتی بەغداد تایمس

العالم العربی

العراق

البلاد

ئێمە ژنانی کورد، بە هەمو مەوجودیەتمانەوە تەلەبی حقوقی مەشروعەی کوردستان ئەکەین کە عیصبەتول ئومەم پێی بەخشیوین و ئیعتیرافی لەسەر کراوە ئیستیرحام ئەکەین حیمایەمان بفەرمون. 24 ی 7 ی 1930. حەلاوە رەمزی ئەفەندی. ئامینە غەفور ئاغا. حەفصە نەقیب. ناهیە صاڵح ئەفەندی. حەفصە قادر ئاغا. (ژیان، ژ 254، 28 ی تەمووزی 1930)

**بە پۆستە:**

بۆ سکرتێری عیصبەتول ئومەم لە جنێوە

وەزیری موستەعمەرات لە لەندەن

صورەتێکی بۆ غەزەتەی نییەرئیست

بۆ فەخامەتی مەندوبی سامی عیراق

رەئیسەل وزەرای عیراق

غەزەتەی بەغداد تایمس

لەو ساوە میللەتی کورد لەگەڵ عیراقا ئەژی بۆ ئەوەی برایەتی کورد و عەرەب بە جدیەت ئەبەدی بمێنێتەوە کوردەکان لە هەمو حالێک دا طەلەبیان کردوە حقوقی میللیەیان کە عیصبەتول ئومەمیش ئیعتیرافی پێ کردوە بۆیان تەتبیق بکرێ، کەچی ئەم مەقسەدو غایەمان بە هیچ نەوعێک تەرویج نەکراوە. ئەمجارەش بە موناسەبەتی موعاهەدەی تازەوە داوای ئیدارەیەکی موختارەمان کرد لە حکومەتی عەرەب. مەعەلئەسەف بۆمان مەعلوم بو موقابیل بەمە مەئمورینی ئیداریە و ئینزیباتیەی مەناتیقی کوردییە کە ئەکثەریان عەرەبن دەستیان کرد بە تەهدیدات و تەزییقاتی میللەتی کورد بۆ داوا نەکردنی حقوقی مەشروعیان. ئینجا لە حالێک دا کە ئینتیدابی حکومەتی ئینگلیز مەوجودە ئەمە رەوشتی مەئمورینی حکومەتی عەرەب بێ لە پاش رەفعی ئینتیداب ئەم ئیدارەی حازرەیە لە ئیدارەی تورک خراپتر ئەبێ بۆمان. ئەم حەرەکەتەی مەئمورینی عەرەبە هیچ کەمتر نیە لە حەرەکەتی تورکەکان کە لە حەق میللەتی کورد ئیجرایان کردوە و ئەیکەن کە بو بە سەبەبی نەفرەت و جوێ بونەوەیەکی ئەبەدیمان.

لەبەر ئەم ئەسبابە کە عەرز کراوە قەراری قەتعی و نیهائی عمومی کوردانی عیراق داواکردنی تەشکیلی حکومەتێکی کوردییەیە لە ژێر نەزارەتی عیصبەتول ئومەم دا، ئیستیرحامی معاوەنەت و تەئمینی غایەی مەشروعەمان ئەکەین!

هەمو ئەشرافی سلێمانی. 117

**جوابی تەلەغرافی رۆژی 8 ی 7 ی 1930 کە لە سلێمانیەوە نێرراوە بۆ عیصبەتول ئومەم**

بۆ عەزمی بەگی بابان و سائیری صاحێب ئیمزایان

بە شەرەفەوە وصولی تەلغرافی رۆژی 8 ی 7 ی 1930 بەیان ئەکەم و ئەمەوێ ئیخبارتان بکەم کە موافیقی ئوصولی موتەخەذەی جەمعیەتی ئەقوام هەمو ئیستیدعایەکی سوکانی مەناتیقی مونتەدەبە لازمە بە ویساتەتی قوەی مونتەدەبەوە بنێرێت بۆ سکرتاریەت. بینائەن عەلەیهی ئیستیدعاکەتان بە پێچراوەیی ئیعادە کرایەوە و بۆ مەعلوماتیش صورەتی مەخطەرەیەک کە طەریق و ئوصوڵی تەقدیمی ئیستیدعا لە مەناتیقی مونتەدەبەوە پیشان ئەدا بۆتان نێررا.

به خدمەتکاریتان کەسبی شەرەف ئەکەم

21 ی 7 ی 1930 مودیری شوعبەی ئینتیدابات. (ژیان، ژ 254، 28 ی 7 ی 1930)

**صورەتێکی تری ئەو تەلەغرافانەی کە درا بو بە عیصبەتول ئومەم**

لە غەزەتەی پێشومانا جوابێکی مەجلیسی عالی عیصبەتول ئومەمان نەشر کرد بو کە بە موناسەبەتی ناردنی تەلغرافی مەتالیبی کوردانەوە بۆ ئەشرافی سلێمانی نوسراوە.

لەسەر ئەوە دیسانەوە لە تەرەف صاحێب ئیمزاکانەوە صورەتێکی تری تەلەغرافەکان تەنزیم کرایەوە و موافیقی نیظامنامەی عیصبەتول ئومەم بە واسیتەی فەخامەتی مەندوبی سامی عیراقەوە تەقدیم مەجلیسی عالی عیصبەتول ئومەم کرایەوە. (ژیان، ژ 255، 31 ی 7 ی 1930)

مەزبەتەیەکی تر بۆ تەئیدی تەلەبی حقوقی کوردان

**لەم رۆژانەیش دا لە بنـاری هـەورامان لـە تـەرەف حـەزرەتی شـێخ عـەلادین ئەفەنـدی نەقشـبەندی** و خزمەکانی و مەشایخ و عولەمای ئەو ناوەوە بۆ تەئیدی تەلەبی حقوقی مەشروعەی کوردان مەزبەتەیەکی تر تەنزیم و تەقدیمی فەخامەتی مەندوبی سامی عیراق کراوە.

لەبەر ئەوەی لە غەزەتەکەمانا جێگا موساعید نەبو مومکین نەبو بە تەواوی ئەصڵی مەضبەطەکە دەرج بکەین. (ژیان، ژ 256، 7 ی 8 ی 1930)

**دهۆک 9 ی 8 ی 1930**

صورەتی بە پۆستە بۆ عیصبەتول ئومەم

بۆ دارەل ئیعتیماد لە بغداد

رەئیسەل وزەرای عەرەب

پارلەمانی ئینگلیز

لیوای سلێمانی

لە وەکیلانی کوردی ئەقزیەی شیمالیەوە

بۆ هەمو کوردان

خەبەرداربن، چاوی خۆتان بکەنەوە سەیری ئەترافی خۆتان بکەن وا ئینگلیز لەگەڵ عیراق موعاهەدەیەکی کرد و لەم موعاهەدەیەدا بەحس لە حقوقی کوردان نەکراوە، لەپاش دو ساڵی تر ئینتیدابی ئینگلیز لە عیراقا نامێنێ، حکومەتی عیراق سەربەست و داخڵی عیصبەتول ئومەم دەبێ، ئەوسا کورد لەژێر دەستی عەرەبا زەلیل ئەبێ، لەبەر ئەوە عەیبە ئەگەر ئێمەیش وەکو ئەهلی سلێمانی داوای حقوقی خۆمان نەکەین و ئەو برایانەمان بە پیاو و ژن و مناڵەوە جەهد ئەکەن و بە جارێک هاواریان بردۆتە بەر عیصبەتول ئومەم و دارەل ئیعتیماد و داوای حقوقی کورد ئەکەن. ئەگەر ئێمەش ئیتیحادیان لەگەڵ نەکەین وەکو ئەوان داوای

حقوق نەکەین، حاڵمان خراپ ئەبێ و حقوقمان ئەفەوتێ ئێمە کە ناومان لەژێرەوە نوسراوە و عەشائیری سندی، گولی، بەرواری، دۆسکی و هەمو ئەقزیەی شیمالی تەوکیلیان کردوین کە بەناوی کوردی...ئەم بەیاننامەیە عەرزی ئەنزاری عالەم بکەین و داوای حقوقی کورد بکەین‌فکری ئێمە فکری سلێمانیە و موخالەفەتێک لە بەینا نیە و موافیقی قەراری عیصبەتول ئومەم وەکو لیوای سلێمانی تەلەبی تەشکیلی حکومەتێکی موستەقیلەی کوردییە ئەکەین.

شێخ رەقیبی سورچی. شێخ غیاسەدین. شێخ نوری بریفکانی. ئەدیب ئەفەندی رەئیسی بەلەدیەی عەمادیە. حەمە ئاغای براش. شێخ شەهابی زێبار. تەرخان حاجی رەشید بەگی بەرواری. (ژیان، ژ257، 14 ی 8 ی 1930)

## 5. 5. 2. بە درۆخستنەوەکانی بادینان

**بە درۆخستنەوە**

شێخ محەممەد ئەفەندی رەقیب (لە مەشایخی سورچی)

وەکو زانیومە مەزبەتەیەکتان بۆ هاتوە خواستەکانی میللەتی کوردی تێ دایە و، لە ناو ئیمزاکانیش دا ئیمزای منی تێ دایە لە کاتێک دا من ئاگام لە شتی وا نیە و ئەو مەزبەتەیەم ئیمزا نەکردوە و ئیمزایشی ناکەم چونکە باوەڕم وایە ئەم کارانە ئەبێتە هۆی پارچە پارچەکردنی نیشتمان لەبەر ئەوە تکا ئەکەم ئەم بە درۆخستنەوەیە لە یەکەم ژمارەی رۆژنامەکەتان دا بڵاوبکەنەوە بەتایبەتی لەم رۆژانەدا کە پێویستە لەسەر هەر یەکێکمان دەس بە یەکێتی عیراقەوە بگرێ و لەوپێناوەدا ئەبێ لەگەڵ برا عەرەبەکانمان شان بدەین بەشانی یەکەوە. (الشعب، ع 242، 27 ی 8 ی 1930)

**بە درۆخستنەوە**

رۆژنامەی ژیانی کوردی کە لە سلێمانی دەرئەچێ، لە ژمارەی 257 ی رۆژی 14 ی 8 ی 1930 دا مەزبەتەیەکی بڵاوکردۆتەوە بە هەندێ ئیمزاوە کە دراوەتە پاڵ ئێمە بێ ئاگاداری خۆمان. ئەو ئیمزایانە ساختەن و ئەسڵیان نیە. رەفتاری هەندێ کەس لەم بارەیەوە جێگەی داخ و سەرسوڕمانە. بەڵێ ئێمە کوردبونی خۆمان ئینکار ناکەین و شانازی بە نەتەوەی کوردەوە ئەکەین بەڵام شتێکی‌کەمان بەبیردا نەهاتوە جگە لە پاراستنی یەکێتی عیراق کە ئاواتی هەمو پیاوە ژیرەکانی عیراقە. بۆ هەڵماڵینی پەردە لە روی راستیەکان رای ئەگەیەنین کە ئێمە ئەوەمان ئیمزا نەکردوە و ئامادە نین دەستی بێگانە یاریمان پێ بکات.

محەممەد ئال حسێن ئاغا بەرواری، ئال حاجی رەشید بەگ، ئەدیب غیاسەدین نەقشبەندی، سەرۆکی شارەوانی ئامێدی. (الزمان، ژ 245، 2 ی 9 ی 1930)

**بەدرۆ خستنەوە**

رۆژنامەی ژین مەزبەتەیەکی بڵاوکردۆتەوە ئەو ئیمزایانەی خراوەتە سەری ئەسڵیان نیە و هەندێ کەس لە خۆیانەوە کردویانە.

ئەحمەد ئال حسێن ئاغا، ئال حاجی رەشید بەگ، سەرۆکی شارەوانی ئامێدی.

(الزمان، ژ 246، 3 ی 9 ی 1930)

**تەکزیب**

لە غەزەتەی ژمارە 257 ی 14 ی 8 ی 1930 دا لەسەر مەزبەتەیەک کە لە زەرفێکا لە موصلەوە بەناوی ئیدارەخانەکەمانەوە هات بو دائیر بە مەتالیبی کورد نەشریاتێکمان کرد بو کە ئیمزای چەند روئەسایەکی کوردی تیا بو وەیەکێ لەمانە شێخ رەقیب رەئیسی سورچی بو، ئیستانەوە ئەمجارە وە لە شەخصی خۆیەوە کاغەزێکمان بۆ هات کە مومـا ئیلەیهی وا بەیانی کردوە کە لەو مەزبەتەیە بێ خەبەرە و قەتعیەن ئیمزای نەکردوە لەبەر ئەوە وا ئێمەیش بۆ تەکزیبی مەزبەتەکەی پێشو ئەم بەیانەمان نەشر کرد. (ژیان، ژ 259، 4 ی 9 ی 1930)

**رەئیسی عەشیرەتی زێبار**

فارس ئاغا ئال محەممەد ئیستینکاری ئەوە ئەکا کە لە رۆژنامەی (ژیان-سلێمانی) ژمارەی 257 لە 14 ی 8 ی 1930 دا دەربارەی پشتیوانی سەرۆکەکانی کورد لە موستەعمیرین و بانگدانی تەفرەقە لەنێوان هەردو رەگەزی عەرەب و کوردا مەزبەتە بە ناوی ئەوەوە بڵاوکراوەتەوە. ئەو مەزبەتەیە ساختەیە و زێبار کەسێکی لێ نیە ناوی شێخ شەهابی زێباری بێ. (الزمان، ژ 261، 21 ی 9 ی 1930)

**بەدرۆخستنەوە**

هەولێر، هەرگیز بیرمان لەجیابونەوە نەکردۆتەوە و نامانەوێ ببینە دەسکەلای بێگانەو ئەو مونافیقانەیش ئەزانن "ای منقلب ینقلبون" هەر بژی مەلیک فەیسەڵ مەلیکی عەرەب و کورد! هەربژی یەکێتی عیراق! هەربژین عەرەب و کورد بە برایەتی!

ئەحمەدکەمال. عەبدولجەبار یونس ئاغا. سەعید صوبحی. شێخ مستەفا حەقی. نادر سلێمانی. لەطیف عیززەت. (الجهاد، ژ 235، 16 ی 8 ی 1930)

### 5. 5. 3. صورەتی ژمارەیەک تەلغرافی دوبارەی سلێمانی و وەڵامیان

**بەغداد**

فەخامەتی مەندوبی سامی

رەئیسەل وزەرا

هەتاکو ئێستا موتەعەدید دەفعە موراجەعاتمان کرد کە لەسەر رەغائیبی میللەتی کورد تەوەسوت بفەرمون لە عیصبەتول ئومەم دا موافیقی موقەڕەراتی خۆیان تەشکیلی حکومەتێکی کوردیان بۆ بکرێ و لەم خسوسەوە بە موفەصەلی مەعروزاتی خۆمان تەقدیمی کرد بو هەتاکو ئێستا جوابێکمان وەرنەگرتۆتەوە وا ئەمجارەیش ئەم ئیستیرحام نامەیەمان تەقدیم کرد رجا ئەکەین تەوەسوتمان بۆ بفەرمون کە ئامالمان بێتە جێ.

1 ی 9 ی 1930، حەمە ئاغای ئەورەحمان ئاغا. بابان: عەزمی بەگ. عیززەت عوسمان پاشا. حەفید زادە: شێخ قادر. میرزا تۆفیق قەزاز. عەبدورەحمان ئاغای ئەحمەد پاشا. حەمە صاڵح بەگی حاجی حەمە عەلی بەگ. فایەق بەگی بابان. مەجید ئەفەندی حاجی ڕەسوڵ ئاغا. رەمزی ئەفەندی حاجی فەتاح. شێخ محەممەدی گولانی. (ژیان، ژ 259، 4 ی 9 ی 1930)

**جواب**

سلیمانی: عزمی بک بابان و رفقائه

اجاب فخامة وكيل معتمد السامي الى برقيتكم في حينه. كنت اؤمل ان جوابه كان كافيا. مع هذا ارجو تماشوا على الهدوء والسكينة عندما ياتى الجواب من عصبة الامم. جعفر العسكرى وكيل رئيس الوزراء. (ژیان، ژ 259، 4 ی 9 ی 1930)

**یادداشتی کۆمیتەی ناوەندی نیشتمانی کوردستانی باشور "مێزۆپۆتامیا"**

بۆ سکرتێری کۆمیسیۆنی هەمیشەیی ئینتیدابەکانی کۆمەڵەی نەتەوەکان (عصبة الامم) لە جنێف.

دوا بەدوای ئەو راگەیاندن و ئاگادارییانەی لەلایەن ئێمەوە (کەوا لە خوارەوە ئیمزای دەکەین) کە بۆ ئێوەمان رەوانە کردوە. شایانی ئەوەیە کە هەستی کۆمیسیۆن بجولێنێ و ئاگاداری بکەینەوە دەربارەی.

ئەو کاتەی ئەنجومەنی کۆمەڵەی نەتەوەکان کە بڕیاری دا کوردستانی باشور بە هەرێمی عەرەبی دیجلە و فوراتەوە بلکێنێت لەژێر ئینتیدابی بەریتانی، کوردەکان وایان دەزانی کە دەتوانن لەژێر ئەو ئینتیدابەدا پێش بکەون و پەرە بەخۆیان بدەن و بەرەو بارودۆخێکی خۆشتر هەنگاو بنێن، بۆیە بە هیچ جۆرێک بەرهەڵستی و دژایەتی ئەم کۆمەڵەیان نەکردوە. کەچی بەداخەوە دەبێت ئەوە بڵێین و پێتان رابگەیەنین کە بڕیارەکانی ئەم کۆمەڵەیە بەشێوەیەکی زۆر ناتەواو و لابەلا لەلایەن حکومەتی عیراقەوە جێبەجێ کراوە، بۆیە ئەگەر پێتان خۆشە بزانن کە کوردەکان داوایان لە حکومەتی بەریتانی و عیراقی کردوە کە ئەم بڕیارانە جێبەجێ بکەن ئەوا پێتان دەڵێین، کە کوردەکان چەندین جار داوایان لە حکومەتی بەریتانی و عیراقی کردوە جا چ لە رێگەی تاکە کەسیەوە بێت یان بە رێگەی رەسمی کە دەبێت بڕیارەکانی جێبەجێ بکەن. بەڵام حکومەتی عیراق تەنانەت رۆژنامەکانی بەغدادیشی ئاگادار کردۆتەوە کە نابێت بەهیچ جۆرێک دەنگوباس لەسەر داواکاری کوردەکان بڵاو بکرێتەوە، بۆیە ئێمە جارجارە داواکاریەکانی خۆمان لەسەر لاپەرەی رۆژنامە عەرەبییەکان بڵاو کردۆتەوە جا چ لە رێگەی نامەوە بۆ سەرنوسەری رۆژنامەکان یان بە شێوەی تر. هەروەها ئەوەشتان پێ رادەگەیەنین کە حکومەتی عیراق هەمو جارێک نەک هەر گرنگی بە داواکاریەکانمان نادا و پشت گوێی دەخات بەڵکو بە تاوانیشی دەداتە قەڵەم.

ئێستاش بەشێک لەو داواکاریە گرنگانەی کە لە حکومەتمان داوا کردوە پێشکەشتانی دەکەین:

**أ.** لەساڵی 1929 دا نوێنەرانی کورد لە پەرلەمانی بەغدا بەرەسمی داوایان کردوە کە دەبێت بەندی 3 لە بڕیارەکانی کۆمەڵەی نەتەوەکان لەسەر کورد جێبەجێ بکرێت.

**ب.** لە 2 ی 1930 دا زۆر لە نوێنەرانی کورد لە پەرلەمان بۆ هەمان مەبەست داواکاریەکیان بۆ مەندوبی سامی بەریتانی رەوانە کردوە، هەروەها لە ئازاری هەمان ساڵ دا یادداشتێک دەربارەی مافەکانی کورد کە لەلایەن زۆربەی نوێنەرانی کوردەوە بوە پێشکەش بە حکومەتی عیراق کراوە، بەڵام بە داخەوە ئەم یادداشتە بەهەمان شێوە رەت کرایەوە.

**ت.** دیسان لەساڵی 1930 دا ئەندام پەرلەمانێکی کورد، داوای لە سەرۆکی وەزیرانی عیراق کردوە کە برگەیەک لەو پەیمانەی نێوان عیراق و بریتانیا دەرخان بکرێت بۆ مسۆگەر کردنی مافەکانی کورد، کەچی سەرۆکی وەزیران زۆر بە لە خۆبایی بونەوە وەرامی دەداتەوە و وتویەتی: من ئیعتیراف بە بڕیارەکانی کۆمەڵەی نەتەوەکان ناکەم، بۆیە مومکین نیە کە هیچ شتێک دەربارەی مەسەلەی کورد بخرێتە نێو بەندەکانی ئەو پەیمانە.

بەکورتی ئەو داواکاریانە کە دەربارەی مافی کورد بۆ حکومەتی عیراق نێردراون، هەموی بەیەکەوە چەند نوسراوێک دەبێت، کەچی هەمو ئەو یادداشت و داواکارییانە هیچ ئەنجامێکیان بەدەست نەهێناوە.

هەروەها بە گەیشتنی نوری سەعید پاشا بۆ حوکم، گوللەیەکی کوشندە دڵی میللەتی کوردی پێکا و هیواو ئاواتەکانی بە با دا، مافەکانی کورد رویان لە لاوازی کرد. بەڵێ پاش بڵاوبونەوەی دەقی رێککەوتننامەکە، گەلی کورد بە تەواوی هەستی بەوە کرد کە مافەکانی پێشێل دەکرێن و داواکاریەکانی پشت گوێ دەخرێن، بەبێ هیچ مەرج و مەرجکاریەکیش بونەتە کاڵای دەستی عەرەب.

بۆیە پاش دڵنیا بون لەو کارەساتە دڵتەزێنە، کوردەکان بە کۆمەڵ هەر لە زاخۆوە تاوەکو خانەقین بە یەک دەست و بە یەک دەنگ داوای مافەکانی خۆیان دەکرد، تێکرا بە یەکەوە نارەزایی خۆیان دەردەبڕی دژی ئەم رێکەوتننامەیە کە بە یەکجاری مافەکانی کوردی دەسڕییەوە.

حکومەتی نوری پاشا لە بەرامبەر ئەو خۆپیشاندان و نارەزاییە دەستی کرد بە راگوێزانی فەرمانبەرە کوردەکان، هەرچەندە لەلایەنی یاساوە دەست نیشانی ئەوە کراوە کە دەبێت فەرمانبەرانی ناوچە کوردنشینەکان کورد بن. ئەمەش بێگومان بوە هۆی نارەزایی پیشاندانی میللەتەکەمان.

ئێمە ناتوانین دەست نیشانی ئەنجامە زیانبەخشەکانی ئەم گۆرانکاریانە بکەین، نە دەشتوانین پێشبینی ئەوە بکەین کە لە داهاتودا چی رو دەدات بەرامبەر شاڵاوی میللەتێک کە هەڵساوەتە سەر پێ بۆ بەرگری لە ماف و ئازادیەکانی خۆی.

مەندوبی سامی لەم بێزاری و نارەزاییە ئاگادار کراوەتەوە، بۆ ئەم مەبەستەش سەردانێکی ناوچە کوردنشینەکانی کرد لەگەڵ سەرۆک وەزارەت و هەندێ لە ئەندامانی وەزارەتی نوری پاشا رۆژانی (11،10،9،8 ی 8). ئەوەی لە هەموی سەرسورهێنترو جێگەی مەترسییە لە جیاتی ئەوەی دڵی کوردەکان بدەنەوە و گوێ لە رازو داواکاریەکانیان بگرن، مەندوبی سامی و سەرۆکی حکومەتی عیراق بە هەر جێگەیەکدا تێپەڕ دەبون بە کوردەکانیان دەگوت کە حکومەتی بریتانیا و عیراق، بە هاوبەشی بڕیاریان داوە مەسەلەکان لە کورتی ببڕنەوە و داواکاریەکانی کورد فەرامۆش بکەن، چونکە جێبەجێ کردنیان مەحاڵە. بۆیە میللەتەکەمان بەرامبەر ئەو هەڵوێستە بە یەک دەست نارەزایی گەرمی دەربڕی و داوای کرد کە بڕیارەکانی کۆمەڵەی نەتەوەکان بێ قەیدو شەرت جێبەجێ بکرێن. وەڵامی حکومەتیش بۆ ئەم داواکاریانە، بریتیی بو لە دو تێبینی بچوک کە لەلایەن سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران و مەندوبی سامی لە پەرلەمان خوێنرایەوە:

1. لێکدانەوە و هەڵسەنگاندنێکی یەک لایەنە، بەپێی بۆچونەکانی خۆیان بۆ بڕیارەکانی کۆمەڵەی نەتەوەکان.

2. هەڕەشەیەکی ئاشکرا دژی هەرکەسێ قسە لەسەر مەسەلەی کورد بکا.

سەرەرای هەمو ئەو رەتکردنەوە و هەڕەشەیەش، گەلی کوردمان هەر سور بوە لەسەر جێبەجێکردنی تەواوی بڕیارەکانی کۆمەڵەی نەتەوەکان و دروستکردنی دەوڵەتێکی سەربەخۆ لە ژێر ئینتیدابی راستەوخۆی کۆمەڵەی نەتەوەکان.

زۆر دڵگرانین بەوەی کە لەوەتەی رێککەوتن لە نێوان عیراق و بریتانیا مۆرکراوە، زۆر لە گۆرانکاری گەورە لە سیاسەتی بریتانیا روی داوە کە بۆتە هۆی گرنگی پێدانێکی زۆر بە عەرەب، ئەوەش لەسەر حسابی زیان گەیاندن بە میللەتی کورد بوە.

ئێمە داوا لە ئێوە دەکەین کە خەمێکمان لێبخۆن و رەچاوی ئەو بارودۆخەی ئیمرۆی میللەتی کورد بکەن، چونکە ئەگەر ئیمرۆ کە لە ژێر ئینتیدابین، ئاوا مامەڵەمان لەگەڵ بکرێ، ئاخۆ دەبێ دوای کۆتایی هاتنی ئینتیداب، چارەنوسی میللەتی کورد چی لێ بێ؟

هەروەها ئێمەی کورد لەو بڕوایەداین کە ماف و توانای ئەوەمان هەیە دەوڵەتێکی سەربەخۆ دروست بکەین، ئەویش لەبەر ئەم هۆیانەی خوارەوە:

**أ**. بە تەنها ژمارەی کوردەکانی کوردستانی باشور زیاتر لە ملیۆنێک دەبێت، ئەم ژمارەیەش بەسە بۆ دروستکردنی دەوڵەتێک. ئەمە جگە لەوەش ئەم ژمارەیە زیاترە لەو عەرەبە سونیانەی کە ئیمڕۆ دەسەڵاتی حوکمیان گرتۆتە دەست.

ئێمە دەتوانین ئەوەش بسەلمێنین کە کوردەکان ژمارەیان بە شێوەیەکی گشتی زیاترە لە هەمو عەرەبەکان، بە مەرجێک کەمە نەتەوایەتیەکان بە جیا بدرێنە قەڵەم

لەلایەکی تریشەوە پێویستە ئەوە لەبەرچاو بگیرێ کە عەرەبەکان کیانێکی هاوبەشیان نیە، ناتوانن یەکێتیەکی بابەتی دروست بکەن، چونکە عەرەبە شیعەکان ناتوانن لەگەڵ سونیەکان، بەڵکو خۆیان بە نەتەوەیەکی تەواو سەربەخۆ دادەنێن، ئەم دو مەزهەبەی ئیسلام بە شێوەیەکی ئەوتۆ دژ بەیەکن کە تەنانەت ناتوانن بە یەکەوە لەسەر یەک مێز دابنیشن، لەلایەکی تریشەوە پەیوەندی ژن و ژنخوازیشیان بە یەکەوە نیەو بە گوناهێکی گەورەی دەزانن.

**ب**. کەچی ئێمە شایانی دروستکردنی دەوڵەتێکی سەربەخۆین، چونکە کیانێکی یەکگرتو و یەکگەرد دروست دەکەین. لە هەمو لایەنێکەوە، لە روی گیانی، زمان، ئایین، کولتور، داب و نەریت و هەروەها لە روی ئاووهەواشەوە.

**ت**. نیشتمانی ئێمە بەو هەمو خێرو خێراتەی کە هەیەتی، دەتوانێ ژیانی میللەتی کورد مسۆگەر بکات و هەندێکیش لەو خێرو خێراتە بنێرێتە دەرەوەی وڵات. ئەو خێراتانەش لە دانەوێڵە و نەوت بە رادەیەکی لەبن نەهاتو، دار، کاربۆن، میوەجات بە هەمو جۆرەکانی، مەروماڵات و بەرهەمەکانی وەکو خوری و ماست و پەنیر و پێستەو...هتد.

بە کورتی وڵاتی ئێمە لەلایەن شارەزایان بە یەکێک لە دەوڵەمەنترین وڵاتانی سەر روی زەوی دەژمێردرێ.

**پ**. بونی ژمارەیەکی زۆر لە روباری گەورە لە وڵاتەکەمان دا وەکو زێی گەورە، خاپور، زێی بچوک، دیالە و چەندین روباری تری بچوک و کانیاوی بێ ئەژمار. ئەمانە هەمو بەڵگە نەویستن بۆ ئەوەی ئەگەر وڵاتی ئێمە خزمەت بکرێ دەتوانێ ببێتە سویسرایەکی نوێ یان بەچکە سویسرایەک.

**ج**. ئێمە شایستەی دروستکردنی دەوڵەتێکی سەربەخۆین، چونکە میللەتەکەمان بە تەواوی وشیار بۆتەوە و ئاگادارە لە هێز و چارەنوسی خۆی. هەستی نەتەوەییش بە جۆرێکی ئەوتۆ گەشەی کردوە لەناو میللەتەکەمان دا کە لە پێناوی بون و ئازادی خۆی دا، هەمیشە روبەروی چەندین شەڕی خوێناوی و دڵتەزین بوە و قوربانی بێ ژمارەی بۆ ئەو مەبەستە داوە، بەجۆرێک کە هەزاران لە رۆڵەکانی خۆی لەبەرچاوی کوژراون. ئەم هەمو فیداکاری و قوربانیەش نەک هەر ورەیان پێ بەر نەداوە، بەڵکو بە پێچەوانەوە هەست و نەستیان هەمیشە بەرز کردۆتەوە، بە جۆرێک میللەتەکەمان سوێندی خواردوە بۆ سور بون لەسەر بەدیهێنانی سەربەخۆیی خۆی جا بە هەر نرخێک بێ.

رێگەی ئەوەشمان پێ دەدەن بۆ ئەوەی بڵێین، میللەتێک بەم شێوەیە وشیار و هەست بە مافەکانی خۆی بکات، شایانی ئەوەیە بژی و شوێنێکی دیار و لە بەرچاویشی هەبێت لەم جیهانەدا.

ئێمە باوەڕیشمان وایە کە میللەتی ئێمە دەتوانێت پشتی خۆی بە یارمەتی و کۆمەکی کۆمەڵەی نەتەوەکان ببەستێ، هیچ هێزێک ناتوانێت بێ هیوامان بکات لە بەزەیی و دڵپاکی ئەم کۆمەڵە بەرێزە کە بە دایکی ساوایان و پارێزگاری چەوساوەکان و کۆمەکی بێ هێزەکان ناسراوە. لە کۆتایی دا کوردەکان پێشنیاری دروستکردنی دەوڵەتێکی سەربەخۆ دەکەن، وە مەبەستیان دروستکردنی دەوڵەتێکە کە لەسەر بناغەیەکی دیموکراسی رەها دابمەزرێ.

دەربارەی ئەو ئینتیدابەی کە دەبێ چاودێری ئەو دەوڵەتە ساوایەی کورد بکات، ئێمە داواکارین کە بـۆ سود و قازانجی ئێمە ئەو ئینتیدابە زو پێک بێت. وە دەربارەی ئەو وڵاتـەی کـە ئینتیـداب دەگرێتـە ئەسـتۆی خۆی جا چ بریتانیا بێت یان هەر وڵاتێکی تر بۆ ئێمە جیاوازی نیە، بەڵکو ئێمە رادەگەیەنین کە بـە تـەواوی ملکەچی بڕیارەکانی کۆمەڵەی نەتەوەکانین، بۆیە داواکارین بـە زوتـرین کـات دەسـت نیشـانی ئـەو دەوڵەتـە بکرێت کە ئینتیدابەکە قوبوڵ دەکات.

سلێمانی 31 ی 8 ی 1930

ئیمزا کراوە لە لایەن: محەمەد صالح بەگی مەحەمەد عـەلی بـەگ. عـەزمی بـەگی بابـان. عەبـدوڕەحمان ئاغای ئەحمەد پاشا. شێخ قادری حەفید. حەمە ئاغای ئەوڕەحمان ئاغا. نەجیب ئەفەندی حاجی ڕەسـول ئاغـا. شەفیق بەگی رەشید پاشا. فایق بەگی بابان. میرزا بەگی قەزاز. شـێخ مەحەمـەدی گـوڵانی. رەمـزی ئەفەنـدی حاجی فەتاح. عیزەت بەگی عوسمان پاشا کۆمیتەی ناوەندی نەتەوەیی.

**عەریزەیەکی تری نارەزایی بۆ موعتەمیدی سامی بریتانی**

لە وەتەی پارلەمان هەڵوەشێنراوەتەوە و، دەقی پەیمانی تازەی ئینگلیزی- عیراقی لە لایەن ئـەم وەزارەتـەی ئێستاوە بڵاو کراوەتەوە، کوردەکان دیان مافەکانیان لەم پەیمانەدا بە تـەواوی پشـت گـوێ خـراوە و بـە ئاشـکرا ئەبینن دوای بەستن و پەسند کردنی پەیمانی گۆرین بێ قەید و شەرت ئەکەونە ژێر دەستی عەرەبەوە. لەبەرئـەوە کورد لە زاخۆوە تا خانەقین خرۆشاون و، هەمو بەیەک زمان، بە دەم و بە نوسین، داوای مافـەکانیان کـرد، بـەڵام عەرەب وەڵامـی ئـەم خواسـتانەی بـە قـەتڵوعامی سـلێمانی دایـەوە و بـێ پونگانـەوە مـەترەلۆز و چـەکی تریـان بەکارهێناوە. تەنانەت سەرۆکی وەزیرانی عەرەب روداوەکەی شوبهاندوە بـە روداوی مێژویـی کەربـەلا. سـەرەرای ئەم دەسدرێژیە یش رۆشنبیران و ئەشرافەکانی کوردیان لە زیندان توند کردوە و هەندێکیان نەفی کـردون. دوای ئەوەی کورد مافەکانی بەم جۆرە غەمناکە پێشێل کراوە، رون بۆتەوە کـە کـورد ئیتـر نـاتوانێ لەگـەڵ عـەرەب بـە یەکگرتویی بمێنێتەوە. لەبەر ئەوە کورد بڕیاریان داوە بە تەواوی لە عەرەب جیا ببنەوە. حکومەتی بریتانی کـە لـە سۆنگەی نیازی شەریفانەی مرۆڤایەتیەوە ئینتیدابی بەسـەر عیراقـەوە قوبـوڵ کـرد، بێگومـان گـوێ لـە خواسـتە رەواکانی ئێمە ئەگرێ و عەرەب بە رەوایی ئەم خواستانەی خوارەوەمان قانع ئەکا:

1. پێکهێنانی دەوڵەتێکی کوردی لەناو سنورە سروشتیەکەدا لە زاخۆوە تا ئەولای خانەقین ئەگرێتـەوە و، چۆڵ کردنی لە داوودەزگای سپایی و مەدەنی عەرەب و تەسلیم کردنی بە حکومەتە کوردیەکە.

2. هێشتنەوەی ناوچەی ناوبراو لە ژێر ئینتیدابی بریتانی دا، وەکو حکومەتێکی کوردی تـا کۆمەڵـەی گەلان لەم بارەیەوە بڕیار ئەدا.

3. بەردانی دەست بەجێی گیراو و دورخراوەکانی روداوەکەی سلێمانی.

4. گوێزانەوەی هەمو ئەفسەرو فەرمانبەرانی کورد لە ناوچە عەرەبیەکانەوە بۆ ناوچە کوردیەکان.

هیوامان بە پایەبەرزتان هەیە بە بەزەییەوە سەیری خواستەکانمان بکەن و رێزی دڵسـۆزانەمان قبـوڵ بفەرمون. 10 ی تشرینی یەکەمی 1930.*

**سەفارەتی بریتانی، ئەنقەرە**

16 ی مئەرزی 1931

تەلـەگرامی ژمـارە 108 ی رۆژی 8 ی فێبریـوەری لـە مەنـدوبی سـامیەوە لـە بەغـداد بـۆ وەزارەتـی موستەعمەرات، ئیشارەت ئەدا بە بڕیاری تازەی ئەنجومەنی کۆمەڵەی گەلان لەسەر عەریزەی کوردەکان.

ئێستا نامەی ژمارە 148 رۆژی 9 ی مئەرزی (1104 ی 31 ی E 93)، وەڵامی پەراوێزی وەزارەتی موستەعمەرات بە ئێمە گەیشت بەڵام نە کۆپی عەریزەکەنمان لەلایە و نە کۆپی بڕیارەکە. لەبەر ئەوە ئەتوانی وا بکەی کۆپیەکانیمان هەبێ، تکایە. (FO371 ی 15311).

**وەزارەتی دەرەوە**

لە بەشی رۆژهەڵاتەوە

بۆ چانسەری (راوێژگا)، سەفارەتی بریتانی

ئەستەموڵ

نامەتان No.82 ی 6 ی 31 ی 16 ی مئەرز دەربارەی عەریزەی کوردەکان.

وا ئەم کۆپییانەتان بۆئەنێرین:

1. هەردو عەریزەی کوردەکان کە لە تەلەگرامی بەغداد ژمارە 108 ی رۆژی 18 ی فێبریوەری ئیشارەتی پێ درا بو.

2. بڕیارەکەی لیژنەی هەمیشەیی ئینتیداب لەسەر عەریزەکانکە لە 22 ی جەنیوەریدا لەلایەن ئەنجومەنەوە پەسند کراوە.

عیراق: عەریزەکانی رۆژی 26 ی 7 و 3 ی 8 ی 1930، لەلایەن هەندێ کوردەوە لە عیراق.

**عەریزەکان**

1. عەریزەی رۆژی 26 ی جولای 1930

بۆ ئەوەی برایەتی عەرەب و کورد بەپتەوی و هەمیشەیی بمێنێ، کورد لە هەمو موناسەبەتێکدا، وە لەوەتەی قوبوڵیان کردوە لەگەڵ عیراق بژین، داوای جێبەجێکردنی مافە نەتەوەیی‌یەکانیان کردوە، کە لەلایەن کۆمەڵەی گەلانەوە دانی پیا نراوە، بەڵام هیچ کاتێ پێیان نەدراوە.

لە پێوەندی لەگەڵ پەیمانە تازەکەدا داوای ڕیژێمێکی ئۆتۆنۆممان لە عەرەب کرد. بەڵام بە داخەوە کاربەدەستانی بەرێوەبەرایەتی و کارگێریی ناوچە کوردییەکان کە زۆرایەتییان عەرەبن، دەستیان کرد بە گوشار و ترساندنی کوردەکان کە دەس لە مافە رەواکانیان هەڵبگرن. رەفتاری کاربەدەستانی حکومەتی عەرەبی لە کاتێک دا کە هێشتا لە ژێر ئینتیداب دان ئاوایە، جا ئەگەر ئینتیداب کۆتایی هات ئەبێ چۆن بێ؟ رەفتاری کاربەدەستانی عەرەب بە هیچ جۆرێ باشتر نیە لەو کارانەی تورک دژی کورد کردویانە، لە رابردو و لە ئێستادا کە بو بە هۆی دوژمنایەتی و جیابونەوەی هەتاهەتایی کورد لەوان.

لەسەر بنچینەی ئەو راستییانەی باسکران، دوا بڕیاری ئاشکرای کورد ئەوەیە داوای دروستکردنی حکومەتێکی کوردی ئەکا لەژێر سەرپەرشتی کۆمەڵەی نەتەوەکان دا.

تکای یارمەتی و جێبەجێکردنی ئامانجە رەواکانمان ئەکەین.

عەزمی بەگ بابان. حەمە ئاغا ئەورەحمان ئاغا. شێخ قادر حەفید. عیزەت بەگ عوسمان پاشا. حەمە سالەح بەگ. فایەق بەگ بابان. عەبدورەحمان ئاغا ئەحمەد پاشا. مەجید ئەفەندی حاجی ڕەسوڵ ئاغا. رەمزی ئەفەندی. میرزا تۆفیق قەزاز.

2. عەریزەی 3 ی ئۆگۆستی 1930

ئێمە شەرەفی ئەوەمان هەیە پایەبەرزتان ئاگادار بکەین چەندین عەریزە لەلایەن کوردەوە دراوە بە کۆمەڵەی نەتەوەکان، بە پۆست و تەلەگراف، لە وەڵامدا دوێنێ نامەیەکمان پێ گەیشتوە لە بەرێوەبەری بەشی

ئینتیدابەوە ئەڵێ، بەپێی ئەو ڕێوشوێنانەی کە ئەنجومەنی کۆمەڵەی گەلان دایان ناوە، هـەمو ئـەو عەریزانـەی دانیشتوانی ناوچەکانی ژێر دەستی ئینتیداب ئەیـدەن، ئـەبێ لـە ڕێگـەی هێـزی ئینتیدابـەوە بخرێنـە بـەردەم سکرتاریەت. لەبـەر ئـەوە تکامـان وایـە کۆپییـەکی تـازەی عـەریزەکان کـە پێشـتر راسـتەوخۆ درا بـون بـە سکرتاریەت، بە ڕێگای خۆتان بنێرن بۆ ناونیشانەکان.

عەزمی بەگ بابان. حەمە ئاغا ئەورەحمان ئاغا. شێخ قادر حەفید. حەمـە سـاڵح بـەگ. عیـززەت بـەگ عوسمان پاشا. تۆفیق قەزاز. عەبدوڕەحمان ئاغا ئەحمەد پاشا. مەجید ئەفەندی حـاجی ڕەسـوڵ ئاغـا. ڕەمـزی ئەفەندی. فایەق بەگ بابان. (FO371 ی 15311).

**پێشنوسی بڕیار**

لەبـەر ئـەوەی هـیچ بڕیـارێکی کۆمەڵـەی نەتـەوەکان نیـە بیێتـە بەهانـەی داوای عـەریزەدەرەکان بـۆ دامەزراندنی حکومەتێکی کوردی لەژێر سەرپەرشتی کۆمەڵەی نەتەوەکان.

وەلەبەر ئەوەی ئەو داوایە هیچ بناغەیەکی نیە لە پەیمانی ئەنجومـەنی کۆمەڵـەی نەتەوەکانـدا، ئـەوەیش تەنیا بە لێکدانەوەیەکی تەواو چەوتی ئەو بڕیارەی کە ئەنجومەن لە 16 ی دێسەمبەری 1925 دا داوێتی، ئەو کاتەی ناوچەی ژیانی عەریزەدەرەکان خراوەتە سەر عیراق.

لەبەر ئەوەی ئەو بڕیارانە دراون بۆ ڕەفتار کردنی تایبەتی لەگەڵ کورد، ئەو ڕەفتارەی، بـەپێی دوایـین ئاگاداری کە لەبەر دەستی دەسەڵاتی ئینتداب دایە، بـە تـەواوی دابـین نـەکراوە و، بـۆ گـەرەنتی دیـاریکراوی بەڕێوبەرایەتی ناوچەیی، کە پێ ئەچێ هێشتا دانەمەزرێنرا بێ:

لیژنەی هەمیشەیی ئینتیداب بڕیاریدا ئەنجومەن رابسپێرێ:

1. بۆ ڕەفزکردنی عەریزەی ئەشرافەکانی کـورد کـە داوای دامەزرانـدنی حکومـەتێکی کـوردی ئەکـەن لەژێر سەرپەرشتی کۆمەڵەی نەتەوەکان دا.

2. داوا بکرێ لە هێزی ئینتیداب بزانێ ئەو ڕێوشوێنە تەشـریعی و ئیداریيانـەی دانـراون، بـە باشـی خراونەتە کارو بە ڕێکوپێکی جێبەجێ کراون، بۆ ئەوەی ئەو هەڵوێستەی بـە کوردەکـان ڕەوا بینـراوە دابـین بکا.

3. هەڵسەنگاندنی دابینکردنی ئەو ڕێوشوێنانەی بۆ کورد بۆ ئەوەی گەرەنتی مانەوەی ئەو هەڵویسـتە بکا، دوای ئەوەی کە عیراق لەژێر ویصایەتی بەریتانیای گەورەدا دەرچو (FO371 ی 1531).

### 5. 5. 4. نامەکانی تۆفیق وەهبی بۆ کۆمەڵەی گەلان

**بەیروت**

19 ی 4 ی 1931

پایەبەرز

سکرتێری دەوڵەت بۆ کاروباری دەرەوە

وەزارەتی دەرەوە

داونینگ ستریت، لەندەن

بە پێی ئەو ڕێوشوێنانەی کەدانراون بۆ پێشکەش کردنی عەریزە بـە کۆمەڵـەی نەتـەوەکان لـە لایـەن دانیشتوانی ناوچەی مانداتەوە، ئەز شەرەفی ئەوەم هەیە ئەم دۆکۆمێنتانە بخەمە بەردەمتان، بۆ ئاگاداریتـان و، بۆ ناردنی بۆ سەرۆکی لیژنەی هەمیشەیی ماندات، بۆ سەیرکردنی لە کۆبونەوەی مانگی 6 دا.

هەروەکو لە دۆکۆمێنتەکانی لە پاشکۆ خراوی دا ئەبینن، من نوێنەری دەسەڵات پێ دراوی گەلی کوردم لە خواروی کوردستان دا کە ئێستە بەشێکە لە عیراق و پێکهاتوە لە زیاتر لە 800.000 کەس.

کۆپیەکی ئەم دۆکۆمێنتانە، لەلایەن منەوە، راستەوخۆ نێردراوە بۆ سەرۆکی لیژنەی هەمیشەیی مانـدات وبۆ پایەبەرز مەندوبی سامی عیراق.

تۆفیق وەهبی

لیۆتنانت کۆلۆنێل موتەصەریفی پێشوی سلێمانی

نوێنەری دەسەڵاتداری گەلی کورد لە عیراق دا

ناونیشانی هەمیشەیی:

تۆفیق وەهبی بەگ

مەحەللەی سنەک بەغداد. (FO371 ی 15311)

لیستەی ئەو دۆکۆمێنتانەی خراوەتە بەردەم سکرتێری دەوڵەت بۆ کاروبـاری دەرەوەی خـاوەن شکۆ، وەکو دەسەڵاتی ماندات بەسەر عیراقەوە، بۆ ناردنی بۆ لقی جنێڤی لیژنەی هەمیشـەیی مانـداتی کۆمەڵەی گەلان:

1. نامەی رۆژی 19 ی 4 ی 1931 بۆ سکرتێری گشتی، کۆمەڵەی گەلان.
2. نامەی رۆژی 19 ی 4 ی 1931 بۆ سەرۆکی لیژنەی ماندات.
3. کۆپی نامە بۆ پایەبەرز مەندوبی سامی لە عیراق.
4. دەسەڵاتدان بە لیۆتێنانت کۆلۆنێل تۆفیق وەهبی بەگ بۆ نوێنەرایەتی گەلی کورد.
5. عەریزەی گەلی کورد لە کوردستانی خوارودا بۆ کۆمەڵەی گەلان لەگەڵ چەند پاشکۆیەک.
6. پوچکردنەوە و رەخنە گرتن لە درکاندنەکانی مێجەر یۆنگ لە جنێڤ.
7. نامەی پشتیوانیی لە کۆمیتەی خۆیبونەوە. (FO371 ی 15311).

**بەیروت**

19 ی 4 ی 1931

بۆ سکرتێری گشتی، کۆمەڵەی گەلان، جنێڤ

گەورەم

ئەز شەرەفی ئەوەم هەیە، داوای ئەوەت لێ بکەم لوتف بفەرموی ئەم نامە و دۆکۆمێنتانە بخەیتە بـەردەم پایەبەرز سەرۆکی لیژنەی هەمیشەیی ئینتیداب. ئەسڵی دۆکۆمێنتەکان، بـەپێی رێوشـوێنی گونجـاو خراوەتـە بەردەم دەسەڵاتی ئینتیداب لەگەڵ داوای ناردنی بۆ کۆمەڵەی گەلان لە کەناڵی گونجاوەوە.

تۆفیق وەهبی

لیۆتێنانت کۆلۆنێل موتەصەرپفی پێشوی سلێمانی

نوێنەری دەسەڵاتداری گەلی کورد لە عیراق دا

ناونیشانی هەمیشەیی:

تۆفیق وەهبی بەگ

مەحللەی سنەک بەغداد. (FO371 ی 15311)

**داونینگ ستریت**

بۆ وەکیلی وەزیری دەرەوە

8 ی مەی 1931

1. نیشانە بە نوسراوی ڕۆژی 1 ی مەی ئەم وەزارەتە، لۆرد پاسفیلد داوای لێ کردم بۆ ئاگاداری بەرێز وەزیر هەندەرسەن، کۆپی ئەو نامەیەی تۆفیق وەهبی بۆ بنێرم، کە بە ناونیشانی سکرتێری دەوڵەت بۆ کاروباری دەرەوەی نوسیوە بۆ ئەوەی عەریزەیەک کە لەلایەن ئەوەوە نوسراوە بۆ سەرۆکی لیژنەی هەمیشەیی ئینتیداب لە بابەت کوردەوە لە عیراق، بخرێتە بەردەمی.

2. کۆپیەکی تەلەگرامێ بە ناونیشانی مەندوبی سامی لە بەغداد لە وەڵامی تەلەگرامی ژ201 ی ڕ. 30 ی ئەپرێل، کە کۆپی نامەی نیشانە پێ دراوی لەگەڵە. (FO371 ی 15311).

**بەیروت**

19ی ئەپریلی 1931

بۆ سەرۆکی لیژنەی هەمیشەیی ئینتیداب،

کۆمەڵەی گەلان،جنێڤ

پایەبەرز

نیشانە بە ڕاپۆرتی لیژنەی هەمیشەیی ئینتیدابی کۆمەڵەی گەلان

ئەز شەرەفی ئەوەم هەیە، کۆپیەکی تێبینیەکانی خۆم بخەمە بەردەمتان دەربارەی درکاندنەکانی مێجەر یۆنگ، نوێنەری دەسەڵات پێ دراوی هێزیماندات، لە 19هەمین کۆبونەوەی لیژنەی هەمیشەیی ئینتیداب لە جنێڤ لە نۆڤەمبەری 1930دا.

ئەسڵی دۆکۆمێنتەکان، بەپێی ئەو ڕێوشوێنانەی لەلایەن کۆمەڵەی گەلانەوە دانراوە، خراوەتە بەردەم سکرتێری دەوڵەتی کاروباری دەرەوەی خاوەن شکۆ لە لەندەن لەگەڵ کۆپیەک بۆ پایەبەرز مەندوبی سامی لە عیراق بەغداد. بۆ ئاگاداری پایەبەرزتان کۆپیەکی ئەو باوەڕنامەیەتان بۆ ئەنێرم کە دەسەڵاتیان بە من داوە نوێنەرایەتی نەتەوەی کورد بکەم کە بەرەوژوری 000،800 کەسە.

متمانەم بە پایەبەرزتان هەیە تێبینییەکانی من ئەخەنە بەردەم کۆبونەوەی لیژنەی هەمیشەیی ئینتیداب کە ئەبێ لە جونی ئەمساڵدا ببەسترێ. نەتەوەکەم، کە من شەرەفی نوێنەرایەتییانم هەیە، داوایان لێ کردوم کە ئاگادارتان بکەم چەند بەرێزەوە ئەو هاودەردیە هەڵئەسەنگێنن کە ئەندامە جیاوازەکانی لیژنەی هەمیشەیی ئینتیداب بەرامبەر گەلە چەوساوەکەم پیشانیان داوە.

ئەگەر کۆمەڵەی گەلان داوای ئامادەبونی من خۆم یان دەستەیەکی نوێنەرایەتی لە هەر کۆبونەوەیەکی دواتری کۆمەڵەی گەلان دا کرد، من ئامادەم بۆ هاتن و وەڵامدانەوەی هەر پرسیارێکی هەیان بێ.

تۆفیق وەهبی

لیۆتێنانت کۆلۆنێل موتەصەڕیفی پێشوی سلێمانی

نوێنەری دەسەڵاتداری گەلی کورد لە عیراق دا

ناونیشانی هەمیشەیی:

تۆفیق وەهبی بەگ

مەحەللەی سنەک بەغداد (FO371 ی 15311).

**بەیروت**

19ی ئەپریلی 1931

پایەبەرز مەندوبی سامی لە عیراق، بەغداد

پایەبەرز

نیشانە بە راپۆرتی لیژنەی هەمیشەیی ئینتیدابی کۆمەڵەی گەلان

ئەز شەرەفی ئەوەم هەیە بۆ ئاگاداریتان کۆپی ئـەم دۆکۆمێنتـە پێچراوانـەتان بخەمـە بـەردەم. ئەسڵی دۆکۆمێنتەکانم، بەپێی ئەو رێوشوێنانەی کۆمەڵەی گەلان دای ناون،ناردوە بۆ سکرتێری دەوڵەت بۆ کاروباری دەرەوەی خاوەن شکۆ، بۆ ئەوەی ئەویش بینێرێ بۆ سەرۆکی لیژنەی هەمیشەیی ئینتیداب.

لە رێگەی پایەبەرزتانەوە دڵسۆزی تایبەتی خۆم و ئەوانەی من نوێنەرایەتییان ئەکەم بۆ خـاوەن شـکۆ مەلیک فەیسەڵ دەرئەبڕم و، ئارەزوی خۆم و گەلەکەم بۆ خزمەتی خاوەن شکۆ بە دڵسۆزی و، هیـوای تایبـەتی کە ماف و خواستە رەواکانمان پێ ئەبەخشـرێ وئـەو بەڵێنانـەی حکومـەتی خـاوەن شـکۆ داویانـە، بـەپێی راسپێرییەکانی کۆمیتەی لێکۆڵینەوە و ئەوانەی کۆمەڵەی گەلان، جێبەجێ ئەکرێ.

تۆفیق وەهبی

لیۆتێنانت کۆلۆنێل موتەصەڕیفی پێشوی سلێمانی

نوێنەری دەسەڵاتداری گەلی کورد لە عێرق دا (FO371) ی (15311)

**وەکالەتنامەی گەلی کورد بۆ تۆفیق وەهبی بەگ**

ئەمەی خوارەوە تەرجومەی وەکالەتێکە کە لەلایەن گەلی کوردەوە لـە عیـراق، ئیمـزا کـراوە. دەسـەڵاتی داوە بە تۆفیق وەهبی نوێنەرایەتی بکا:

ئێمە، ئەوانەی لە خوارەوە ئیمزامان کردوە، تۆفیق وەهبی بەگ، موتەصەڕیفی پێشوی لیـوای سـلێمانی، لە دایکبوی سلێمانی (ئێستا دانیشتوی بەغداد)مان داناوە، تا نوێنەرایەتی ئێمە و هـەر یـەکێ لـە ئێمـە و، ئـەو کۆمەڵانەی کە ئێمە و هەر یەکێ لە ئێمە نوێنەرایەتی ئەکەن بکا، لە پێوەندی دا هەمو ئەو شـتانەی کـە لـە هـەر بارێکەوە پێوەندی هەبێ یا لە بابەت عەریزەیەکەوە بێ، کە لێرە بە دواوە پێشکەشی کۆمەڵەی گەلانی ئەکا یان هەچ دەسەڵاتدارێکی سەرۆکی لیژنەی هەمیشەیی ئینتیدابی کۆمەڵەی گەلان بەناوی دانیشتوانی ناو مەملەکـەتی عیراقەوە.

ئێمە بە تایبەتی تۆفیق وەهبی بەگمان داناوە کە وەکیلی ئێمە و، کوردەکانی دانیشتوی عیراق بێ کـە ئێمـە نوێنەرایەتی ئەکەین. بۆ ئەوەی بەناوی ئێمەوە و بە نوێنەرایەتی ئێمە لە بەردەم ئەنجومەنی کۆمەڵەی گەلان یـا لـە بەردەم لیژنەی هەمیشەیی ئینتیـدابی ئـەو کۆمەڵەیـەدا، یـان لەبـەردەم هـەر کۆمیتـە و ئەنـدامێک لـە ئەندامـەکانی کۆمەڵەی گەلان یا لیژنەی هەمیشەیی ئینتیداب بۆ رەفتار لەگەڵ عەریزەی باسکراو یـان هـەر مەسـەلەیەکی لێـرەدا باسی هاتوە و، تۆفیق وەهبی دەسەڵاتی هەبێ هـەر کەسـێک یـا کەسـانێکی تـر دابنـێ کـە خـۆی بـە لێوەشـاوە و گونجاوی بزانێ، تا بەناوی ئەو و بەناوی ئێمەوە کاربکات و داخڵی دانوسەندن بێ لەگەڵ وەزارەتی کاروبـاری دەرەوەی بریتانیا لە لەندەن یان لەگەڵ هەر دائیرەیەکی تری کاربەدەست، یا کاربەدەستانی حکومەتی بـەریتانی لـە پێوەندیدا لەگەڵ ئەو شتانەدا کە لە عەریزەی باسکراودا هاتوە، لەگەڵ ئەوان یان لەگەڵ هەر حکومـەت و کەسـێکی تر و لەهەر کوێیەک کە بایەخ بدا بە عەریزەی باسکراو یان بابەتەکانی لێرەدا باس کراون.

بۆ ئێمە خۆمان و بـەناوی ئـەو کۆمەڵانـەوە کـە ئێمـە نوێنەرایـەتییان ئەکـەین، بڕیارمـان داوە تاکیـد و تەصدیقی هەمو بڕیار و بیانویەک بکەین کە لەلایەن تۆفیق وەهبی بەگەوە بەناوی ئێمەوە لەگـەڵ وەزارەتـی

دەرەوەی بەریتانیا یان هەر دائیرەیەکی تری حکومەت و کەس و کەسانێ، وەکو لەسەرەوە وترا، لە پێوەنـدیدا لەگەڵ ئەم عەریزانە، بیکا، لە ڕۆژی 14 ی 3 ی 1931 نوسرا.

مستەفا شەوقی، ئەفسەری تەقاویت، پێشەوایەکی کوردی سلێمانی، بەرێوەبـەری گۆڤـاری پـەیژە. فـەتحوڵڵا ئەسعەد، لە عەشیرەتی ئاکۆی کۆیە، وەرگێڕ لە وەزارەتی عەدل. محەمەد ئەمین، لـە عەشـیرەتی بـارزان، دانیشـتوی ڕەواندز. ئیسماعیل ڕەوانـدزی، لـە ئەشـرافی ڕەوانـدز و نـەوەی پاشـا کـۆرە، نـائیبی پێشـو. سـەید حوسـەین، سەرنوسەری زاری کرمانجی لە ڕەواندز. ڕەئوف، ئەفسەری تەقاویت و لە ئەشرافی کەرکوک. عوسـمان فایـەق، لـە ئەشرافی سلێمانی قازی زادە. عەزیز عەبدولقادر، لە بنەماڵەی قادر ئەفەنـدی ئەلکـەبیر، لـە سـەرانی جـاف، نـائیبی پێشو. صدیق ئەلقادری، مێجەر جەنەراڵی پێشو، خەڵکی سلێمانی لە عەشیرەتی هەمەوەنـد. عـەلی عیرفـان، کـوڕی عەبدوڵڵا عیرفان، خەڵکی سلێمانی، بەرێوەبەری ڕۆژنامەی ژیـان. عەبـدولقادر، لـە سـاداتی سـلێمانی حەفیـد زادە. عەبدولقادر، موهەندیس لە ئەشرافی سلێمانی. تەیب، لە ساداتی بەرزنجە. غالیب، لە سـاداتی سـۆڵە. ئیسـماعیل، لـە ساداتی قەرەداغ. حیکمەت ئەمین، موهەندیس. شوکری سەگبان، پرۆفیسۆر، دوکتۆر. (FO371 ی 15311).

## 5. 5. 5. عەریزەی تۆفیق وەهبی بۆ کۆمەڵەی گەلان بە ناوی کوردەوە

گەلی کوردی کوردستانی خوارو، ئێستا دانیشتوی عیراق

بۆ ئەوەی (خۆحوکمکردنی ناوچەیی)یان پێ ببەخشرێ لـەژێر سـەروەری عیـراق دا، بـۆ دابیینکردنـی ئازادی تەواوی:

زمان، پەروەردە، ڕزگاری و پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی و ئابوری، ئازادی لە چەوسانەوە و زۆرداری.

هۆیە بنەڕەتیەکانی پێویستیی خۆحوکمکردنی ناوچەیی بۆ کوردەکانی کوردستانی خوارو:

**أ**. بۆ هەلومەرجی هێمنانە لە عیراق دا.

**ب**. بۆ هەلومەرجی هێمنانە لەسەرانسەری ڕۆژهەڵاتی ناوەراست دا.

**ت**. بۆ پێوەندی هێمنانە لە نێوان کورد و دۆست و دراوسێکانی عەرەب، کلدانی و ئاسوری.

**پ**. بۆ ئاسودەیی و خۆشی دانیشتوانی کوردستانی خوارو.*

1. کورد عەرەب نیە. ئەمە ڕاستیەکی سەلمێنراوە. کورد موسوڵمانن، بەڵام لەگەڵ موسوڵمانانی عـەرەب لەوەدا جیاوازن کە "تەعەسوبی دینیی"ان نیە، لە کاتێک دا عەرەبەکانی عیراق بەتایبـەتی عـەرەبی شـیعە وەکـو موتەعەسیبترینی ئیسلام ناسراون.

بۆچونی کورد نزیکە لە ئازادی ئەوروپاییەکانەوە.

سەلماندن:

**أ**. کورد ئازادی تەواو بە ژنەکانیان دەدەن.

**ب**. ئافرەتی کورد حیجاب دانانێ و ئەتوانێ بە ڕوی کراوەوە لەگەڵ پیاوانی تر تێکەڵاو بێ.

**ت**. ئافرەتی کورد تەنانەت ئەتوانێ لەگەڵ پیاو هەڵپەرێ.

**پ**. لە مەجلیسی تایبەتیدا ئەتوانێ لەلای سەروی پیاوەوە دابنیشێ، نمونە هاوسەرەکەی شێخ قادر.

**ج**. ئافرەتی کورد کە مێردی لەوێ نەبێ، ئەتوانێ میوانداری پیاو بکا.

2. کوردستانی خوارو، نیشتمانی نەتەوەییو مێژویی گەلی کوردە.

کوردسـتانی خـوار و هـەرگیز تەنانـەت لـە سـەردەمی خەلیفـەکانیش دا، وڵاتێکـی عـەرەبی نـەبوە و لەپێشیشدا هەرگیز ژێر دەستەی دەسەڵاتدار و زۆرداری عەرەب نەبوە. کوردستانی خوارو ئەمڕۆ بە کـردەوە دانیشتوانی عەرەبی تێدا نیە، تەنها چەند هۆزێکی بچوک نەبێ لە نزیک سنورەکانی هەولێر و کەرکوک.

لە مێژوی خۆیان دا هەرگیز کوردی عیراق لەلایەن عەرەبەوە، داگیر نەکراون.

لکاندنی کوردستانی عیراق نە راستەو نە رەوایە، بەڵام لەبەرئـەوەی ئێسـتا تـازە چـارە نـاکرێ بـەبێ هەڵوەشاندنەوەی عیراقی سەروەر، داوای مافی ئەوە ئەکەن بە ئازادی وەکـو رەگـەزێکی جیـاواز لـە وڵاتەکـەی خۆیان دا بژین، بە دڵسۆزی بۆ عەرشی عیراق.

**زمان**

کورد ئەمرۆ بە زمانی کوردی ئەدوێن کە زمانێکی ئارییە، هیچ پێوەندیـەکی لەگـەڵ عـەرەبیدا نیـە کـە زمانێکی سامییە.

لە کاتێک دا لە سوریا، میصر و هەرکوێیـەکی تـر عـەرەب بـە زۆر زمـانی عـەرەبی سـەپاندوە بەسـەر خەڵکدا، لە کوردستان نەیانتوانیوە ئەمە بسەپێنن و نە بەسەر ئاسـوری و کلدانیـەکان دا کـە لـە کوردسـتاندا لەگەڵ کورد بە کلدانی ئەدوێن کە لە ئارامی کۆن کەوتۆتەوە. ئەگەر خۆحوکمکردن بە گەلی کـورد نـەدرێ، بـۆ یەکەم جار لە مێژودا، بە شێنەیی بە دزەکردنێکی هێمنانە یان بـە رێگـەی تـر کـورد ناچـار ئـەکرێ زمـانێکی بێگانە وەربگرێ.

سەلماندن: ئەتوانرێ بگوترێ زمانی کوردیی رەسمی تەنیا لە سلێمانیدا قەتیس کراوە. زمانی رەسمی لـە لیوای موسڵدا عەرەبییە، لەو لیوایەدا کە زۆرایەتی دانیشتوانی نەعەرەبن. لە کەرکوک دا، عەرەبی و تـورکی بـەکار ئەهێنرێن. لە هەولێردا، زۆر کەم کوردی بەکار ئەهێنرێ. لە قەزا کوردییـەکانی دیالـە و کـوت دا، زمانەکـە عـەرەبی روتە. سەرنج راکێشراوە بۆ (لائیحەی قانونی لغات)، ئیشارەتی بۆ کراوە لەلایەن مێجەر یۆنگەوە لـە کۆبونـەوەی نۆڤەمبەری لیژنەی هەمیشەیی ئینتیداب دا. مەبەستی ئەم قانونە بە ئاشکرا دروستکردنی ئاژاوەی زمانە.

**نواندنی کورد لە بەڕێوەبەرایەتیو پارلەمان دا**

لە سەردەمی حوکمی تورکدا، کورد ژمارەیەکی بەرچاوی وەزیفە گرنگەکانی، بەتایبەتی لە 3 ولایەتەکەی بەصرا، بەغداد و موسڵدا، بە دەس بو. ئێستا ژمارەیەکی زۆر گەورەی فەرمانبەرانی کوردی سەردەمی حکومی کۆنی تورک کە بە تەواوی لێوەشاوە و کارامەن بۆ ئـەوەی وەزیفـەی گرنگـی حکومـەت وەربگـرن، بـەردەوام داوایان لە حکومەتی عەرەب کردوە، بەڵام هەمو داواکانیان لەژێر پەردەدا ماوەتـەوە. ئەمـەیش لـە تۆمارەکـانی وەزارەتی ناوخۆدا دەرئەکەوێ. سیاسەتی حکومەتی عەرەب ئەوەیە بە شێنەیی کورد لە وەزیفـەی حکومـەت دا نەهێڵێ. ئەو کوردانەی لێوەشاوە و کارامەن وەزیفەی گرنگ وەربگرن، بـە تێپـەڕینی زەمـان ئەفـەوتێن، هـەلی پەروەردەیان نیە. ژیانی فەرمانبەرانی کورد لە خۆیەوە تەواو ئەبێ، ئەوسا رێگـە تـەخت ئـەبێ بـۆ حکومـەتی عـەرەب و دوای ماوەیـەکی کـورت یـەک فەرمانبـەری کـورد لـە خزمـەتی حکومـەتی عـەرەب دا نـامێنێ، هـیچ رۆشنبیرێکی کوردیش نـامێنێ چونکـە دەرگـای پـەروەردەیان لـە رودا داخـراوە. ئەمـە ئـەو سیاسـەتەیە کـە حکومەتی عەرەب پێڕەوی ئەکا کە ئەیەوێ رەگەزی کورد لەریشە دەربهێنێ.

لائیحەی قانونی زمان بە نمونە وەربگرە، ئەمە رێ ئەدا کەسانی کوردی زمان (نەک لە رەگەزی کـورد)، لە کوردستان دابمەزرێنرێ. وەکو بەیانیان کردوە گوایە کورد هەن لە ناوچە عەرەبییەکان دا دامـەزراون، ئەمـە موبالەغەیەکی زلە، گریمـان چەنـد فەرمانبـەرێ هـەبون، ئەمانـەیش بـە ئەنقەسـت و لەبـەر هـۆی سیاسـی دور خراونەتەوە بۆ ناوچە عەرەبییەکان.

لە 20 بەڕێوەبەری گشتی کە لە حکومەتی عەرەبیدا دامەزرێنراون، تەنیا یەک دانە کوردیان تێدا نیـە. هیچ کاربەدەستێکی (گەزێتد) کوردی لە دائیرەکانی حکومەتی ناوەندیدا یا لە دائیرەی وەقف دا نیە، جگـە لـە

2 یا 3 کەس. هیچ فەرمانبەرێکی دیپلۆماسی کورد لە دەرەوە نیە. نواندنی کـورد لـە پارلـەمان دا بـە تـەواوی نادادپەروەرانە و ناتەواوە. لە 88 نائیب، کورد تەنیا 11 نائیبیان هەیە کە ئـەمیش ژمارەیـەکی زۆر کەمـە لـە چاو ژمارەیان دا.

### دانیشتوانی کورد

کورد دان بەوەدا نانێن کەمایەتی بن، لایانوایە ئەو ژمارەیەی دانیشتوان کـە بڵاوکراونەتـەوە، ژمـارەی عـەرەبی سـوننی بەشـێک کـوردی تێدایـە کـە لەبـەر هـۆی سیاسـی خراونەتـە نـاو دانیشـتوانی عەرەبـەوە. سەرژمێرێکی راست هەمو ئەو کوردانە بگرێتەوە کە لـەناو عـەرەب دا نیشـتەجێن، دەری ئەخـەن دانیشـتوانی کورد و عەرەب بە کردەوە بەقەدەر یەک ئەبن. بۆ نمونـە، زۆرایـەتـی دانیشـتوانی لیـوای دیالـە و ژمارەیـەکی باشی دانیشتوانی لیوای کوت، کوردن و هـەمو ئەوانـەی لـە رۆژهـەڵاتی ئـەم لیوایانـەدا نیشـتەجێن بـە لیـوا کوردییەکانەوە نوساون.

### قانون و نیزام

قانون نە لە بەڕێوەبەرایەتی دا و نە لە دادگادا لەلایەن حکومەتی عەرەبـەوە لـە ناوچـە کوردییـەکان دا، وەکو پێویست جێبەجێ نەکراوە. لە بەر ئـەوەی رەوتـی دادگـا بـە کـوردی نیـە، ئەگـەر لایـەکیان کـورد بـێ، کێشەکەی ئەدۆڕێنێ. نمونەی خوارەوە ئەشێ بەس بێ.

لە موتەسەڕیف بۆ خوارێ بۆ مودیر لە لیـوای سـلێمانیدا، فەرمانبـەرەکان لێوەشـاوە نـین و پـەروەردە کراو نین، زۆریان رۆشنبیر نین و هەندێکیان بـە تـەواوی نەخوێنـدەوارن. لـە قـەزای پشـدەردا تـەنیا یـەک فەرمانبەری حکومەتی تێدا نیە، دادگا و قوتابخانەی لێ نیە. ئەگەر چی ئەمە یەکێکە لە دەوڵەمەنترین قـەزاکانی وڵات تا ئێستا باجی تێدا کۆنەکراوەتەوە. لەلایەکی ترەوە، حکومەتی عەرەب موچەیەکی زۆر ئەدا بـە سـەرانی عەشایەر بۆ راگرتنی قانون و نیزام. هەر تاوانکـارێ تاوانێـک ئـەکا ئـەتوانێ لـەم قەزایـەدا پـەنا بدۆزێتـەوە و سەلامەت بێ، بەڵام ئەمە تەنیا نمونەیەکە لە بەد بەڕێوەبردنی حکومەتی عەرەب.

لە کاتێکدا گەلی کورد وەکو خۆی بـە دواکـەوتویی ئەمێنێتەوەکـەچی دراوسـێکانیان پـێش ئەکـەون. ئەگەر نەتەوەی کورد لەناو مەملەکەتی عیراقدا خۆحومکردنیان نـەدرێتێ، کـورد ئـەبن بـە نۆکـەری ئاغایـانی عەرەب.

### پەروەردە

لە کوردستانی خواروودا 79 قوتابخانە هەیە. لە 27 یان دا رێگە بە زمانی کوردی دراوە. لـەوانی تـردا عەرەبی ئیجبارییە، جگە لە چەند قوتابخانەیەکی کەم، کە تورکی تێدا ئەوترێتەوە.

لەو 27 قوتابخانەیەی باسکران 16 یان تەنیا 1 پۆلی تێدایە. ئەوانی تری سەرەتایی و ئامادەیین. لـە ناوچە کوردییەکاندا قوتابخانەی ناوەندی نیە، جگە لە 2 متەوەسیتە لە سـلێمانی و هـەولێر، ئـەوانیش تـەواو نین.

لە سەرانسـەری کوردسـتانی خـواروودا 8 قوتابخانـەی کچـان هەیـە، تـەنیا لـە 1 قوتابخانـەیان دا.... دانیشتوانی کوردستانی خـوارو بـەرەوژوری (800.000) کەسـە، بـەراوردی بکـە لەگـەڵ 528 قوتابخانـەی ئالبانیا و 432 قوتابخانە لە فەلەستین، لەگەڵ کوردستانی خـوارو و ژمـارەی زۆری دانیشـتوانی و تـەنیا 79 قوتابخانە.

بۆ بەراوردی سیاسەتی حکومەتی عەرەب لە بواری پەروەردەدا لە پێوەندیدا لەگەڵ کورد، ئەم نمونەیەی خوارەوە بەسە بۆ نیشاندانی سیاسەتی بە ئەنقەستی حکومەتی عەرەب بۆ لەناوبردنی شێنەیی رەگەزی کورد. لە دەسکەوتی لیوای بەغداد (38%) ساڵانە تەرخان ئەکرێ بۆ پەروەردەی عەرەب لە لیوای بەغـداد، کـەچی لـە سلێمانی تەنیا (1%) ی داهاتی لیوا تەرخان کراوە بۆ پەروەردە لەو لیوا کوردییەدا.

بۆ پیشاندانی ئەقڵی بچوک و زۆردارانە تەنانەت لە مەسەلە بچوکەکانیش دا، حکومەتی عەرەب کەلوپەلە کۆن و بێکەڵکەکانی خۆی ئەدا بە قوتابخانە نەعەرەبییەکان و کەلوپەلـە نوێکـانی بـۆ خـۆی ئـەبا. ئـەم کـارە مناڵانەیە بەناوی حکومەتێکەوە کە بۆ سەربەخۆیی ئەگری بە بێ... جێگەی پێکەنینە ئەگەر جێگەی داخ نەبێ. پەروەردە بە گرنگترین بەشی ژیانی نەتەوەیی دانراوە، لەوەی سەرەوەدا بە ئاشکرا دیارە کـە تـەنیا مەسـەلەی کاتە، ئەگەر کورد لە ژێر زاڵێتی عەرەب دا بەجێبهێڵرێ، کاتێ سەربەخۆیی تـەواوی خۆیـان بـە دەس بهێـنن، زمان و فەرهەنگی کوردی لەمان ئەکەوێ.

**سەلماندن: فایل و دۆکۆمێنتە رەسمیەکان.**

بەرنامەی پەروەردە کە لە کوردستان جێبەجێ ئەکرێ هەمان بەرنامەیـە کـە بـۆ قوتابخانـەکانی عـەرەب دانراوە لە سەرانسەری عیراقدا. ئەمەیش پێچەوانەی راسپێرییەکانی لیژنـەی هەمیشـەیی ئینتیدابـە و لیژنـەی لیکۆڵینەوەی تێلکی پاولسەن. لەوەش زیاتر پێچەوانەی سایکۆلۆجی و کاراکتەری مناڵانی کوردە کە لـە رەگـەز و کاراکتەردا لەگەڵ مناڵانی عەرەب دا جیاوازن. هـەروەها ئەمـە بـە ئاشـکرا پلانێکـی رێکخـراوی حکومـەتی عەرەبە بۆ سەپاندنی نەتەوایەتی عەرەب بەسەر هاوڵاتیانی نەعەرەب دا.

جێگەی سەرنجدان ئەبێ کە تێبینی بکرێ لە سەرانسـەری کوردسـتان دا هـیچ کـۆلێجێکی راهێنـان یـا فێرگەیەکی تەکنیکی نیە. لەبەر ئەوە دیمەنی پاشەرۆژی مناڵانی کورد سەقەت و بـە ئەنقەسـت نـەوەی داهـاتو لێوەشاوە نابن بۆ وەرگرتنی پلەو پایەی رەسمیی و بەرێوەبەرایەتی. لە ماوەی 10 ساڵی رابـردودا حکومـەتی عەرەب 120 قوتابی ناردوە بۆ ئەوروپا بۆ ئەوەی لە بابەتی جیاوازدا خوێندن تەواو بکـەن، لەمانـە تـەنیا 2 کەسیان کوردن.

**کاری گشتی**

لە کاتێک دا ئێمە لە قەرنێک داین هەر نەتەوەیەک بۆ پێشەوە بەرە و شارسـتانی و گەشـەکردن ئـەڕوانێ، ئەبینین شارو گوندەکانی کوردستان لە ئەنجامی فەرامۆش کردنی ئەنقەست دا وێـران ئـەبن. حکومـەتی عـەرەب تەنیا یەک قوتابخانەی بۆ کچان لە سلێمانی کردۆتەوە ئەویش 2 پۆلە. قوتابیەکانی ئـەم دو پۆلـە لـە یـەک ژوردا ئەخوێنن، چونکە ژوری تریان نیە هەر پۆلە لە ژوری خۆیدا بخوێنێ. لەلایەکی ترەوە حکومەتی عەرەب ملیۆنـەها روپیەی سەرف کردوە لە دروستکردنی مەخفەری پۆلیس و...هتد. بۆ بەهێزکردنی دەسەڵاتی.

**ئاودان و کشتوکاڵ**

لە سەرانسەری کوردستان دا دائیرەیەکی ئاوەدانی لێ نیە، کەچی حکومەتی عەرەب لەو لاوە هەرچی لە توانـادا بوە کردویەتی بۆ دامەزراندنی دائیرەی ئـاودان و کشـتوکاڵ لـە ناوچـە عەرەبییـەکان دا. نـاو بـە نـاویش، یارمـەتی فەلاحەکانی عەرەبی داوە بە دانی قەرز...هتد، بەڵام جوتیارانی کوردی فەرامۆش کردوە. سەرەرای داوای یـەک لەسـەر یەک، حکومەتی عەرەب فەرمانبەرانی تەکنیکی لێوەشاوەی دانەمەزراندوە بۆ باشکردنی تـوتنی کـوردی. ئـاژەڵـدارانی کورد لە هەژاری دان، ئەبێ باجی زۆر بدەن کە لە گەشەپێدانی وڵاتەکەی خۆیان دا خەرج ناکرێتەوە.

### تەندروستی

کوردستان بێبەشە لە دامەزراوی تەندروستی، بە پێچەوانەی ناوچە عەرەبییەکانەوە کە بارودۆخی ئـەوێ بە تەواوی جیاوازە. بە ئەندازەی تەواو دکتۆر لە کوردستان دا نیە. حکومەتی عەرەب گوێ ناداتە تەندروسـتی خەڵک. بەسە بۆ ڕونکردنەوە کە حکومەتی عەرەبی هیچ بایەخێکی نەداوە بۆ بەرگری لە نەخۆشی ئاوڵە.

من خۆم کاتێ موتەسەرڕیفی سلێمانی بوم داوام کـرد نەخۆشـخانەیەک لـە سـلێمانی بکەنـەوە، وەڵامـی وەزیری عەرەب ئەوە بو کە لە بودجەدا پارە نیە. هەر لەم کاتەدا موتەسەرڕیفی عەرەبی موسڵ داوای پارەی کرد بۆ دروستکردنی زیندانێکی نوێ، کەچی حکومەت بە بایەخێکی زۆرەوە مەسەلەی دابینکردنی پارەی پێویستی بۆ ئەم مەبەستە وەرگرت.

بەراوردکردنی فەرمانبەرانی گەزێت لە کوردستان، لە پێش لیژنەی تێلکی‌دا و لە ساڵی (1930) دا.

**ژمارەی فەرمانبەرانی کورد لە پێش لیژنەی تێلکی‌دا:**

| دائیرەکانی حکومەت | کورد | نەکورد | هەموی |
|---|---|---|---|
| دارایی و ناوخۆ | 43 | 14 | 57 |
| داد | 10 | 3 | 13 |
| دائیرەکانی تر | 38 | 17 | 55 |

**ژمارەی فەرمانبەرانی کورد لە 1930دا:**

| دائیرەکانی حکومەت | کورد | نەکورد | هەموی |
|---|---|---|---|
| دارایی و ناوخۆ | 44 | 27 | 71 |
| داد | 9 | 7 | 16 |
| دائیرەکانی تر | 11 | 40 | 51 |

تێبینی: سەرژمێری سەرەوە لیواکانی دیالە و کوتی تێدا نیە، چونکە هەمو فەرمانبەرەکانیان عەرەبن.

### پێوەندیەکانی کوردو کلدۆ – ئاسوری

کـورد هاودەردیـەکی بـەهێزی لەگـەڵ کەمایەتیـە نەعەرەبـەکانی ولایـەتی موسـڵ هەیـە، سـەبارەت بـە خواستەکانیان بۆ داننان بە بونی نەتەوایەتیان دا و بۆ پاراستنیان لـە زاڵێتـی عـەرەب. فروفێڵـی بـەردەوامی فەرمانبەرانی عەرەب بۆ ورووژاندنی هەستی ناحەزانەی کورد و ئاسوری دژی یـەکتری، هەرچەنـدە حکومـەتی ناوەندی ئینکاری ئەکا، بە ڕونی بۆ هەردو گەل دەرکەوتوە. عەریزەدەر لە وەزیفەکـەی‌دا وەکـو موتـەسـەرڕیفی سلێمانی، لە باشترین هەڵوێسـت دایـە بـۆ ئـەوەی بەڵگـەی هـەبێ بـۆ ئەمـەو یارمەتیـدەرێکی بـاش بـێ بـۆ ورياكردنەوەی کورد لەم پروپاگەندە فێڵبازانەیە.

بە دامەزراندنی خۆحوکمکردنی ناوچەیی، هەر کۆسپێ لـەم ڕێیـەدا هـەبێ تـەخت ئـەبێ. دۆسـتایەتی و هاودەردی کە ئێستا لە نێوان کوردو دراوسێ نەعەرەبەکانی‌دا هەیە، قوڵتر ئەبێ.

خواستەکانی ئێمە خواستەکانی ئەوانە، گازاندەکانیشمان گازاندەکانی ئەوانە. هەردو گـەل یەککـەوتون لە ئارەزوی شێوەی ئەوروپاییو پێشکەوتن دا، یەککەوتن لەگەڵ شارستانێتی رۆژئاوایی و، رقیـان لـە گـەلانی رۆژئاوا نیە.

ئێمە نارازین لـەوەی حکومـەتی عـەرەب رقـی لـە داهێنـان و پێشـکەوتنە... عـەریزەدەرەکانتان لەگـەڵ نوێنەرانی تری گەلی کـورد ئامـادەن بـۆ کۆبونـەوە لـە جنێـڤ یـان هـەر جێگایـەکی تـر لەگـەڵ نوێنـەرانی کەمایەتیەکانی عیراق، لەژێر سەرپەرشتی کۆمەڵەی گەلان دا هەر نوقتەیـەک رونکردنـەوە یـان پێکهـاتنی هـەر دولای بویَ، بە خۆشیەوە باس بکەن و بریار بدەن. لە ئەنجام دا ئامادەین لەگەڵ کەمایەتیە نەعەرەبەکانی تردا پێکەوە لە جنێڤ لەژێر سەرپەرشتی کۆمەڵەی گەلان لەگەڵ نوێنەرانی حکومەتی ناوەنـدی لـە بەغـداد و هێـزی ئینتیداب کۆببینەوە، بۆ لابەلاکردنی هێمنانەی مەرجەکانی بە دەسهێنانی ماف و ئاواتەکانمان.

تۆفیق وەهبی (FO371 ی 15311).

**راسپێرییەکانی**

لیژنەی هەمیشەیی ئینتیداب بۆ ئەنجومەن لە 19 هەمین کۆبونـەوەی لیژنـەی هەمیشـەیی ئینتیـداب لـە جنێڤ لە نۆڤەمبەری 1930 دا کراوە: راسپێرییەکان

2. داوا لە دەسەڵاتی ئینتیداب بکریَ تا بزانیَ ئیجرائاتی تەشریعی و ئیداری دانراوە بـۆ دابینکردنـی ئەو هەڵوێستەی کوردەکان پێیان رەوا بینراوە، بە باشی خراوەتە کارو بە باشی جێبەجیَ کراوە.

عەریزەدەرەکانتان بەرێزەوە رونی ئەکەنەوە تا ئەمڕۆیش، هیچ رێوشوێنیَ دانەنراوە لەلایەن حکومـەتی عەرەبی عیراقەوە بۆ جێبەجێکردنی راسپێرییەکان...هتد. عەریزەدەرەکانتان هەنـدیَ دۆکۆمێنـت لەگـەڵ ئەمـەدا دەخەنە بـەردەمتان، پیشـانی ئـەدەن ژمـارەی فەرمانبـەرانی کـورد ئێسـتا کـەمتر کراوەتـەوە لـەچاو ژمـارەی فەرمانبەرانی کورد لە کاتی هاتنی لیژنەکەی تێلکی پاولسەن دا.

**پێوەندییەکانی نێوان نەتەوەی کوردو نەتەوەی کلدی ئاسوری**

عەریزەدەرەکانتان بەرێزەوە رونی ئەکەنەوە بۆ لیژنەی هەمیشەیی ئینتیـداب کـە بـەردەوام هەنـدیَ بەیانات کراوە دژی دانی ماف و خواستە رەواکانی کورد، هەمان شت بەرامبـەر نەتـەوەی کلـدی ئاسـوری گوایا یەکیَ لە هۆیەکانی ئەوەی خۆحوکمکردنی ناوچەییان نادریَتیَ، ئەوەیە دژمنایەتیەکی دێرینە لـەنێوان ئەم دو گەلەدایە. ئەمە بە تەواوی ناراستە. گەلەکەم و کلدی ئاسوری ئەتوانن بە ئاشتی و تـەبایی پێکـەوە بژین، بۆ نمونە گوندی بادی. تەنیا هۆ بـۆ ئـەوەی هەنـدیَ جـار ناخۆشـی رو ئـەدا لـە نێـوان جوتیـارە نەخوێندەوارەکانی کورد و جوتیارانی ئاسوریدا، سیاسەتی بە ئەنقەستی حکومـەتی عـەرەبی عیراقـە بـۆ دروستکردنی دوژمنایەتی لە نێوان ئەم دو گەلـەدا کـە خزمایـەتی خوێنیـان پێکـەوە زۆرتـرە وەک لەگـەڵ عەرەبی عیراق. هەردوکمان، گەلەکەی من و کلدی ئاسوری شتی ناوخۆیی زۆریان هەیە، بەڵام گەلەکـەم زۆر لەو سیاسەتە تورە ئەبن، کاتیَ پشێویەکی بچوک دروست ئەبیَ، دەسبەجیَ هێزە ئاسـوریەکان ئـەنێردرێن دژی گەلەکەم. چۆن ئەتوانیَ پێوەنـدی دۆسـتانە بمێنـیَ کـاتیَ حکومـەتی عـەرەب ئاسـوریە چەکـدارەکان بەکارئەهێنیَ روی تفەنگەکانیان بکەنە سنگی ئێمە و، بە پروپاگەندە و رێگەی تـریش هـەوڵ ئـەدا بیـری دراوسیَ ئاسوریەکانمان ژەهراوی بکا.

تۆفیق وەهبی (FO371 ی 15311).

**تەلەگرافی وەزیری موستەعمەرات**

بۆ مەندوبی سامی لە عیراق

ژ. 166

تەلەگرافتان ژ. 201

پێشنیارەکانتان ئەسەلمێنم. عەریزەکەی تۆفیق وەهبی گەیشتە ئێرە. ئەسڵەکانیت بە پۆستی ئاسمانی ئەخرێتە بەردەم. (FO371 ی 15311)

ڕونکردنەوەیەک بۆ پوچکردنەوەی درکاندنەکانی مێجەر یۆنگ نوێنەری دەسەڵات پێدراوی هێزی ئینتیداب لە عیراق دا

لاپەڕەی 79 ی مەحزەری چاپکراوی 19هەمین کۆبونەوەی لیژنەی هەمیشەیی ئینتیداب.

نوێنەری دەسەڵات پێدراوی هێزی ئینتیداب، درکاندویەتی لە پەرەگرافی 1 دا لە ژێر سەردێری "هەڵوێستی کورد و مەسیحی و کەمایەتیە نەموسڵمانەکان" دوای دێباچەیەک کە تیایدا مێجەر یۆنگ وتویەتی کە مەسەلەی کورد و هی مەسیحیەکان لە جەوهەردا یەک گیروگرفتە. ئەڵێ عەریزەی کوردەکان و مەسیحیەکان پێشکەش کراوە بە کۆمەڵەی گەلان، چونکە لەو پەیمانەدا کە تازە لە نێوان حکومەتی خاوەن شکۆی بریتانیا و حکومەتی عیراق دا بەستراوە هیچ مادەیەکی تایبەتی تێدا نیە نە بۆ پاشەڕۆژی کوردو نە بۆ هی کەمایەتیە نەموسوڵمانەکان.

لە پەرەگرافی 2 دا مێجەر یۆنگ ئەڵێ لەبەر ئەوەی ئەم ئیشارەتە نەکراوە هەندێ کەسانی ناو ئەوان لایان پێویست بوە کە مەسەلەکەیان بخرێتە بەردەم ئەنجومەنی کۆمەڵە.

عەریزەدەرەکان عەریزەکانیان پێشکەش کردوە بە کۆمەڵەی گەلان، نە بە تەنیا لەبەر ئەوەی باسی کورد لە پەیمانەکەدا نەهاتوە، بەڵکو لەبەر چەوساندنەوەی ڕێکخراو و ئینکارکردنی ماف و خواستە ڕەواکانی کورد.

**تێبینی:**

هەرچەندە گەل عەریزەدەرە پێشنیار بۆ کۆمەڵەی گەلان بکا لەگەڵ هەمو ریزێک دا بە خۆیدا ڕائەپەرموێ کە بۆ کۆمەڵەی گەلان کە ڕێوشوێنی گونجاو ئەبوایە لەلایەن هێزی ئینتیدابەوە دابنرایە بۆ پاراستنی کوردو کەمایەتیەکانی تر، پێش ئیمزا کردنی پەیمانەکە. نیشانە بە لائیحەی قانونی زمان، عەریزەدەرەکە زانیویەتی کە حکومەتی عەرەبی عیراق نیازی وایە زانینی زمانی کوردی بکا بە پێوانەیەکی بەس بۆ دامەزراندنی فەرمانبەران لە ناوچە کوردییەکان دا، بێ ئەوەی گوێ بدرێتە ئەوەی لە نەتەوەی کورد بن.

مێجەر یۆنگ زیاتر ئەدرکێنێ کەوا ئێستا باوەڕێکی فراوان بڵاوبۆتەوە کە ئەنجومەنی کۆمەڵەی گەلان ڕاسپێری کردوە، دەوڵەتێکی کوردی سەربەخۆ لە کوردستانی خواروودا دابمەزرێ، ئەو نازانێ ئەوانە باسی چی دەکەن. عەریزەدەرەکەتان ڕونی ئەکاتەوە ئەبێ زۆر بە زەحمەت چاوەڕوانی ئەوە بن کورد خەیاڵە تەکنیەکانی قانونی دەولی تێبگەن، بیری ئۆتۆنۆمی نەتەوەیی و سەربەخۆیی ئازاد تێکەڵاو ئەکەن. تێکۆشانیان بۆ داوای ئۆتۆنۆمی ناوچەیی لەسەر ئەرزی خۆیان لەناو مەملەکەتی عیراق دا، لەسەر بنچینەی ئەو بەڵێنە دیاریکراوانەیە کە لەلایەن حکومەتی خاوەن شکۆی بریتانیا و حکومەتی عیراقەوە دراوە. کۆپییەکی لە پاشکۆدایە.

**گیرانی کورد لە سلێمانی**

نوێنەری دەسەڵات پێدراوی هێزی ئینتیداب مێجەر یۆنگ، لای لیژنەی هەمیشەیی ئینتیداب درکاندویەتی (بڕوانە ل79 ی ڕاپۆرتەکە) کە ئەوە بە تەواوی ناڕاستە کە هەندێ کەسی کورد لەسەر ئەوە

گیرابن کە عەریزەیان بۆ کۆمەڵەی گـەلان ئیمـزا کـردوە. (مێجـەر یۆنـگ ئـەڵێ: بێگومـان ئەمانـە بەتـەواوی ناراستن) ئەڵێ گیرانەکان لە ئەنجامی پشێویەکی بچوک دا بوە لە کاتی هـەڵبژاردن دا لـە سـلێمانی. تـەنیا دو کەس لەوانەی عەریزەی جۆراوجۆریان ئیمزا کردوە، هێشتا لە زینداندان تۆمەتـەکانیشـیان بـەپێی مادەکـانی 54؛ 55؛ 85؛ 86؛ 214 ی قانونی سزاانی بەغدادە. هەر قسەیەک لەبارەی ئەوەوە کـە کـەس لەسـەر ئـەوە خرابێتە زیندانەوە کە عەریزەی دابێ بە کۆمەڵەی گەلان، بێگومان هیچ و پوچە.

عەریزەدەرەکەتان ئەتوانێ زەن بکا کە مێجەر یۆنگ ئـەم شـتانەی درکانـدوە بـە هـۆی فەرامۆشـکردن و نەبونی شارەزایی تـەواو لـە کاراکتـەری حکومـەتی عـەرەب و کردەوەکـانی. عـەریـزەدەر ئـەتوانێ لیژنـەی هەمیشەیی ئینتیداب دڵنیا بکات لەوەی هەر لێکۆڵینەوەیەکی هەر ئەوروپاییەک لەم وڵاتەدا ژیابێ، پشتیوانی لـە بۆچونەکەی من ئەکا کە ئەو قسەیە هیچ و پوچ نیە، بەڵکو سـابیقەی پێشـوی هەیـە. ئیفـادەی ئیمزاکـراوی 2 کورد لەوانەی لەم مەسەلەیەدا بون، لە پاشکۆی ئەم نامەیە خراوە.

عەریزەدەرەکەتان پێ لەسەر مەترسی دوبارەبونەوەی ئـەم کردەوەیـە لەلایـەن فەرمانبـەرانی حکومـەتی عەرەب و پۆلیسەوە، نەک هەر بەرامبەر بەو کوردانەی ئەم عەریزانەیان بە ئێوە داوە، بـەڵکو هـەروەها زۆر بـە توندتر بەرامبەر بەو مەسیحیانەی کـە ئـەوانیش عـەریزەکانی خۆیانیـان پێشـکەش کـردون، مەگـەر رێنمـایی دیاریکراو لەلایەن هێزی ئینتیدابەوە بدرێ بە موتەسەریفەکان، کە ئەوان بە شەخسی بەرپرسن لەهەر سزایەک و، موتەسەریفیش لە قایمقام، مودیر، پۆلیس...هتد بەرپرس بکا لە هـەچ کـارێ دژی ئیمزاکـەر و عـەریزەدەر چ کورد و چ کەمایەتی تر نەکرێ، تەنیا مافی خۆیان بەکارهێناوە وەکو کۆمەڵـەی گـەلان ئاگـاداری کـردون، بـۆ پێشاندانی خواست و شکاتەکانیان بە کەناڵی گونجاو و بە پێی رێوشوێنی دروسـت. ئێسـتا تۆڵـە لەوانـەی پێشتر ئیمزایان کردوە ئەسەنن، بە ئەوەی بە زۆر کەفالەتیان لێ بستێنن کە دەس وەر نەدەنە کـاری سیاسـی و کاروباری گەلەکەیانەوە ئەگینا ئەگیرێن.

عەریزەدەرەکەتان خۆی کە نوێنەری دەسەڵات پێدراوی کوردە و لە دایکبوی سـلێمانیە، دور خراوەتـەوە بۆ بەغداد، هەرچەندە خۆی حەز ئەکا بگەرێتەوە ماڵەکەی لە سلێمانی.

**نەتەوایەتی**

مێجەر یۆنگ درکاندویەتی (بروانە ل80 ی راپۆرتەکە): "راسـتیەکەی ئەوەیـە، بـۆ کـورد و ئاسـوری، تەنیا چارە لەوەدایە کە خۆیان بە عیراقی دابنێن و لەلایەن حکومەتی عیراقیشەوە وەها سەیر بکرێن".

عەریزەدەرەکەتان سەرنجی لیژنەی هەمیشەیی ئینتیداب رائەکێشێ، کورد حەز ئەکەن ببن بـە رەعیـەتی دڵسۆزی خاوەن شـکۆ مـەلیک فەیسـەڵ، ئەگـەر نەتەوایـەتی خۆیـان وەکـو ناسـنامەیەکی جیـاواز بهێڵنـەوە. عەریزدەرتان پێشنیار ئەکا کە چیتر هەق نیە کورد بە عەرەب یان بە عیراقی بانگ بکرێن، چونکە ئەمە وەکـو ئەوە وایە بە کابرایەکی ئایریش بڵێن ئینگلیز.

**پەیمانی ئەنگلۆ - عیراقی کە لە 30 ی جونی 1930 دا لە بەغداد ئیمزا کراوە.**

عەریزەدەرەکان بەرێزەوە ئاگاداری لیژنەی هەمیشەیی ئینتیداب ئەکا کە لە پەیمانی باسکراودا کە تـازە لە بەغداد ئیمزا کراوە، هیچی تێدا نیە بۆ ئەوەی رێ نەدرێ بە بەکارهێنانی هێزی ئاسـمانی بریتـانی لەلایـەن حکومەتی عەرەبەوە بۆ سەرکوتکردنی پشێوی ناوخۆ کە لە ئەنجامی حوکمی خراپ و فەرمانرەوایی خـراپ دا دروست ئەبێ، تا ئەو کاتەی حکومەتی عەرەب لای وابێ هێـزی ئاسـمانیی بریتـانی لـە پشـتە، کـار نـەکا بـۆ نەهێشتنی حکومەتی خراپ، حوکمی خراپ و چەوساندنەوە. (FO371 ی 15311).

**بەیانی مەندوبی سامی بەریتانی لە عیراق**
**لە 24 ی دیسەمبەری 1922 دا.**

حکومەتی خاوەن شکۆی بریتانیا و حکومەتی عیراق، دان ئـەنێن بـە مـافی ئـەو کوردانـەدا کـە لـەناو سنوری عیراق دا ئەژین، بۆ ئەوەی حکومەتێکی کـوردی لـەو سـنورانەدا دابمـەزرێنن و هیـوادارن کـە تاقمـە کوردییە جیاوازەکان، بە زوترین کات لەناو خۆیان دا بگەنـە ڕێککـەوتنێک لەسـەر شـێوەی ئـەو حکومەتـەی خۆیان ئارەزوی ئەکەن، لەو سنورەدا کە ئەیانەوێ درێژ ببێتەوە. دەستەیەکی نوێنەرایەتی بەرپرس بنێـرن بـۆ بەغداد، بۆ باسی پێوەندیە سیاسی و ئابوریەکانیان لەگەڵ حکومـەتی خـاوەن شـکۆی بـەریتانیا و حکومـەتی عیراق. (FO371 ی 15311).

## 5. 5. 6. ئیفادەی 2 کەسایەتیی گیراوی کورد بۆ کۆمەڵەی گەلان

ئیفادای تۆفیق قەزاز:

من میرزا تۆفیق کوڕی حاجی ئەحمەدی قەزاز خەڵکی سلێمانی، سوێند ئـەخۆم بـە خـوای گـەورە کـە ئیفادەکەم لە خوارەوە دەربارەی گیرانم لە 6 ی 9 ی 1930 دا بە تەواوی ڕاستە.

1. لە 6 ی 9 ی 1930 دا لە دەوری سەعات 3 ی پاش نیوەڕۆدا، لە کاتێک دا لەگەڵ خێزانەکەم دا لـە ماڵی خۆم دانیشت بوم، هێـزی عـەرەب و پۆلیسـی عـەرەب دەوری ماڵەکـەیان دام و هەڵیانکوتایـە سـەر مـاڵ و خێزانەکـەم. چەکـدار بـون بـە تفـەنگ و چـەکی لیـوایی. بـێ ئـەوەی هۆیـەکانم پـێ بڵـێن، منیـان گـرت. کردەوەکەیان پێچەوانـەی قـانونی عیراقـی بـو، هاوسـەرەکەم خـۆی تـێ هـەڵقورتان، هۆیـەکانی لـێ پرسـین و نارەزایی دەربڕی، چونکە هەیئەتی ئیختیارییەیان بەپێی قانون لەگەڵ نەبو... هـەروەها نـارەزایی دەربـڕی لەسەر ئەوەی پێشتر ئینزاری ئاسایی نەکرابوین. لەبەر ئەوە هێزەکە و پۆلیسەکان توڕە بـون و تفـەنگیان لـە هاوسەرەکەم ڕاکێشا، بە زۆری چەک منیان لە ماڵەکەم دەرهێنا و بە پاسەوانیی هێزەکە و پۆلیسەکان بردمیـان بۆ زیندان. لە ڕێگە سوکایەتییان پێ کردم و بە درێژایـی ڕێگـای زینـدان، زمـانێکی زۆر نزمیـان بـەکارهێنا، لەوێش 10 کەسی تر لە هاوڕێ کوردەکانم بە هەمان شێوە گوێزرابونەوە بۆ ئەوێ. تا سەعات 11 ی شەو لـە زیندان ماینەوە. لەم ماوەیەدا زۆر بە خراپی ڕەفتاریان لەگەڵ کردین، دوای ئەوە بـە دەسـتی کەلەپچـەکراوەوە ئێمەیان گوێزایەوە بۆ کەرکوک. دو دو پێکەوە دەستمان کەلەپچە کرا بو، من 78 ڕۆژ لە زیندانی کەرکوک دا مامەوە.

2. لە ئەنجامی لێکۆڵینەوەدا بۆمان دەرکەوت ئەو تۆمەتەی لەلایەن پۆلیسەوە بۆ گرتنمان بە پـاڵ ئێمـە درابو ئەوە بو، چونکە ئێمە تەلەگرام و مەزبەتەمان ئیمزا کرد بو بۆ کۆمەڵـەی گـەلان و دەسـەڵاتی ئینتیـداب، بێگومان ئەوەندەی ئێمە ئەمانزانی کارێکی قانونی بو، بەڵام بۆ ئەوەی ئۆباڵەکەی لـە خۆیـان لابـەن، هەنـدێ پرسیاریان دەربارەی ڕوداوەکەی 6 ی 9 ی 1930 ئـەکرد، لـە کاتێـک دا ئـەیانزانی ئێمـە بـە هـیچ جـۆرێ پێوەندیمان بەو ڕوداوانەوە نەبوە.

3. بە ئەنقەست ئێمەیان بۆ ماوەیەک لە زیندان دا هێشتەوە، بێ ئەوەی بماندەن بە دادگـا. مـدعی عـام هەڕەشەی هەڵواسینی لێ ئەکردین، چونکە ئەیانوت داوای مافی خۆمان لە کۆمەڵەی گەلان کردوە. لە ئەنجام دا ئێمە توانیمان بۆ مەحکەمەی ئیسپات بکەین کە ئێمە هیچ پێوەندیەکمان نەبوە لەگەڵ ئەو پشـێوییەی لەسـەرەوە باس کرا. ئەو کاتە بۆمان دەرکەوت هۆی ئەسڵی گرتنەکەمان ئەوەبوە کە داوامان ناردوە بۆ کۆمەڵـەی گـەلان، ئەوسا مەحکەمە بەری داین. یەکەمین پرسیار کە مەحکەمە لێی کردین ئەوە بو: "بـۆچی عـەریزەتان داوە بـە کۆمەڵەی گەلان؟". ئەو شایەتانەی هێنرانە بەردەمی دادگا لە لایەن پۆلیسـەوە، سـوێندیان خـوارد بـە ئاشـکرا

وتیان ئێمە لەو تۆمەتانە بێبەرین، وتیان کەوا لەلایەن پۆلیسەوە هەڕەشەی مردنیان لێ کراوە تا شایەتی درۆمان لێ بدەن. بەڵام شایەتەکان راستیان وت چونکە سوێندیان خواردبو، ئەیانزانی دادگا حوکمێکی بێ لایەن ئەدا. ئەمە ئەوە نیشان ئەدا شایەتەکان راستییان وتوە، هەرچەندە لەلایەن پۆلیسەوە هەڕەشەیان لێ کرابو.

4. کاتێ مەحکەمە بەری دام و گەرامەوە بۆ سلێمانی، دائیرەی پۆلیس ناردی بە دوم داو داوایان لێ کردم کەفالەتیان بدەمێ، پێیان وتم لەبەرئەوەی عەریزەم داوە بە کۆمەڵەی گەلان، ناتوانن باوەڕ بە من بکەن. لەوەیش زیاتر لێرە بە دواوە نابێ کاری سیاسی بکەم، نابێ ئیتر مەزبەتە و شکاتنامە بنێرم بۆ کۆمەڵەی گەلان. وەکو تێگەیشتم ئەیانەوێ گێچەڵم بۆ دروست بکەن، بەڵام من رەفزم کرد کەفالەتیان بدەمێ. لەو کاتەوە پۆلیس چەند جارێ داوایان کردوم و داوایان لێ کردوم کەفالەتیان بدەمێ، بردمیان بۆ بەشی جینائی بۆ دانی زەمانەتی پێویست ئەگینا ئەمنێرن بۆ زیندان.

5. من خاوەن زەویم و تاجیرم لە سلێمانی، لە ماوەی ئەم گیرانەم دا نزیکەی (10.000) روپیە زەرەرم لێ کەوتوە، لەبەرئەوەی بەردەوام پۆلیس بانگم ئەکەن و بە بیانوی جۆراوجۆر زۆرم بۆ ئەهێنن، نەمتوانیوە دەس بکەمەوە بە ئیشەکەم، زەرەرەکانم تا دێ زیاد ئەبێ. بەغداد، 23 ی مەرزی 1931.

ئیمزا حاجی ئەحمەد قەزاز زادە (تاجیر تۆفیق قەزاز) (FO371 ی 15311).

**ئیفادای شێخ قادری حەفید:**

من، شێخ قادری کوڕی شێخ سەعید خەڵکی سلێمانی و برای گەنجتری شێخ مەحمود، سوێند ئەخۆم بە خوای گەورە کە ئیفادەی لای خواروم دەربارەی گرتنم لە رۆژی 6 ی 9 ی 1930 دا راستە.

1. لە کاتێک دا من لەماڵی خۆم دا لەگەڵ خێزانەکەم دانیشت بوم، دەوروبەری سەعات 3 ی پاش نیوەڕۆ، ماڵەکەم کتوپڕ لەلایەن هێزی عەرەب و پۆلیسەوە داگیر کرا. بەبێ هیچ ئاگادارکردنێکی پێشەکی خێزانەکەم و بەبێ موختار و هەیئەتی ئیختاریە، هەڵیانکوتایە سەر ماڵەکەم بە تفەنگ و چەکی لیوایەوە. منیان گرت و گوێزایانمەوە بۆ زیندان، لەگەڵ 10 کەسی تری ناسیاوم حەبسیان کردین. لەم ماوەیەدا تا سەعات 1 ی نیوە شەو بە خراپی رەفتاریان لەگەڵ کردین. دوای ئەوە دو دو کەلەپچەیان کردین و بە پاسەوانیی هێزی عەرەب و پۆلیس کە چەکدار بون بە تفەنگ و چەکی لیوایش رەوانەی کەرکوکیان کردین. لەوێ لە زیندان گلیان داینەوە، من 70 رۆژی لێ بوم.

2. ئەو تۆمەتەی پۆلیسی سلێمانی بە پاڵیان دابوم بە کورتی ئەوە بو: "بۆچی ئێمە مەزبەتە و تەلەگرامەمان ناردوە بۆ کۆمەڵەی گەلان و وەزارەتی دەرەوەی بریتانیا؟". ئەگەرچی ئیتیهامیان کردین بەوەی ئێمە دەستمان هەبوە لە پشێوی 6 ی 9 ی 1930 دا. بەڵام ئیسپات بو ئێمە هیچ پێوەندیەکمان بەو روداوەوە نەبو. گیرانەکەمان بە تەنیا بەو هۆیەوە بو، چونکە مەزبەتەمان ناردبو بۆ کۆمەڵەی گەلان. ئەمەیش ئەتوانرێ بەوە ئیسپات بکرێ کە پۆلیس پرسیاری لێ کردین: "بۆچی لە لای کۆمەڵەی گەلان شکات ئەکەین؟".

3. دوای 70 رۆژ گیران لە کەرکوک و دوای ئەو هەمو رەفتارە خراپەی لەگەڵیان کردم، بە پاسکراوی بردمیان بۆ لیوای ناصریە و لەوێ بەریان دام بەو مەرجەی ناصریە بەجێ نەهێڵم و نەگەرێمەوە بۆ سلێمانی. زەمانەتی (5.000) روپیەیان لێ وەرگرتم. دوای مانەوەی 39 رۆژ لە ناصریە، گوێزامیانەوە بۆ بەغداد، ئەمجارەش بە پاسەوانەوە. لە بەغداد زەمانەتی (5.000) روپیەیان لێ وەرگرتم و بەریان دام بەو مەرجەی نەگەرێمەوە ماڵی خۆم. حاڵی حازر لە بەغدادم و رێگەم نادەن بگەرێمەوە ماڵی خۆم. دوای گیرانم لە سلێمانی، هێزی عەرەب و پۆلیس ماڵەکەیان پشکنی بوم. ئەفسەری بەرپرسی پشکنین ناوی لازم محەمەد بوە، دوای

پشکنین: زۆر شتی بە نرخ وەکو زێڕ و خشڵی خێزانەکەمیان بـردوە. هەنـدێکیان داوەتـەوە، هێشـتا هەنـدێ پارچەیان گل داوەتەوە. ماڵەکەم لەو کاتەوە لەژێر چاودێری پۆلیس و هێزی عەرەبدایە. لەبەر ئەوە ناچـار بـوم خێزانەکەم بگوێزمەوە بۆ بەغداد، هەمو کەلوپەلی نـەگوێزراوە و موڵکـەکانم بەجێهێشـتوەو کەسـم نیـە چـاوی لێیان بێ.

4. ئەو ئیتیهامەی ئێمەی پێ گیراین، هیچ پێوەندیەکی لەگەڵ هـەڵبژاردن و پشـێوی 6 ی 9 ی 1930 نەبو، بەڵکو وەکو لە پێشەوە وتـم بـە تـەنیا ئەگەرایـەوە بـۆ ئـەوەی مەزبەتـەمان نـارد بـۆ کۆمەڵـەی گـەلان و حکومەتی بریتانی. یەکەم پرسیاری پـۆلیس دەربـارەی شـکات و مەزبەتـەکانمان بـو. لـە مەحکەمـەدا ئـەوە ئیسپات بو کە ئێمە هیچ پێوەندیەکمان لەگەڵ پشێویەکە نەبوە، بەڵکو ئەگەرایەوە بۆ ئـەو هۆیانـەی لەسـەرەوە رونم کردنەوە.

5. من خاوەن زەویم لە سلێمانی و بە داهاتەکانی ئەژیم کە ئێستا لێی بێ بەش کراوم. بەهۆی گیرانم و دورخستنەوەم موڵکەکانم وێران و توشی زەرەر بون، جگە لەوانەی وەکو لەسەرەوە باسم کرد لێم سەنراوە.

من هێشتا لەو بارو دۆخەدام کە باسم کرد. بەغداد (23 ی مئەرزی 1931)

ئیمزا: حەفید زادە شێخ قادر خەڵکی سلێمانی. (FO371 ی 15311).

### 5. 5. 7. مەزبەتەی خۆیبون بۆ کۆمەڵەی گەلان

کۆمەڵەی نەتەوەیی کورد

کۆمیتەی ناوەندی

دیمەشق

رۆژی 17 ی ئەپریلی 1931

بۆ سکرتێری گشتی کۆمەڵەی گەلان، جنێڤ

گەورەم

کۆمیتەی ناوەندی کۆمەڵەی نەتەوەی کـورد (خۆیبـون)، شـەرەفی ئـەوەی هەیـە سـەرنجی پـڕ بـەزەیی کۆمەڵەی گەلان رابکێشێ بۆ مەسەلەی لە ژێرەوە باسکراو:

نەتەوەی کورد کە داوای مافە پیرۆزەکانی ئەکا، خواستەکانی ئێستایش وەکو جـاران لەسـەر بنچینـەی سەرەتای رێزگرتنی مافی نەتەوەکانی تر هەروەکو ئێمەیش ئارەزو ئەکەین رێزی مافەکانمان بگیرێ، هـەروەها هی نەتەوەی خوشکمان کلدی ئاسوری.

بە لەبەرچاو گرتنی ئەم سەرەتایە، کۆمیتەی ناوەندی بە هاودەردیەوە ئـەڕوانـێ بـۆ ئـەو رێککەوتنـەی کوردەکانی کوردستانی خوارو لەگەڵ نەتەوەی خوشک کلـدی ئاسـوری پێـی گەیشـتون. بـە ئـەرکی خۆمـانی دائەنێین جارێکی کەیش پێ لەسەر ئەوە دابگرین کە نەتـەوەی کـوردو هـی کلـدی ئاسـوری، لـە زۆر کۆنـەوە پێکەوە وەکو برا ژیاون.

لە کۆتاییدا، کۆمیتەی ناوەندیمان پشتیوانی ئەکا لە داواکـانی لیوتێنانـت کۆلۆنێـل تۆفیـق وەهبـی بـەگ، موتەسەڕیفی پێشوی سلێمانی کە لە عەریزەی 19 ی ئەپریلی 1931 دا داوێتی، وەکو نوێنەری دەسـەڵات پێـدراو بەپێی وەکالەت نامەی رۆژی 14 ی مئەرزی 1931 کە لەلایەن کوردەکانی کوردستانی خوارەوە ئیمزا کراوە.

ج. ا. بەدرخان

لەباتی کۆمیتەی ناوەندی خۆیبون

(جەلادەت عالی بەدرخان گەڕەکی کوردەکان دیمەشق) (FO371 ی 15311).

### 5. 5. 8. ژمارەیەک راپۆرت و نامەی لیژنەی هەمیشەیی ئینتیداب و کۆمەڵەی گەلان:

**عیراق: راپۆرتی راپارد (M. Rappard)**

عەریزەی رۆژی 16 ی مەی 1931 ی مادام ئاسیا تۆفیق

لە عەریزەی رۆژی 16 ی مەی 1931 ی مادام ئاسیا تۆفیق کە داوێتی بە لیژنەی هەمیشەیی ئینتیداب، پرۆتێست ئەکا دژی گیرانی تۆفیق وەهبی بەگی مێردی، کوردی عیراق لەلایەن حکومەتی عیراقەوە، داوا ئەکا مەسەلەکە لەگەڵ حکومەتی عیراق باس بکرێ. عەریزەدەر ئەڵێ تۆفیق وەهبی بەگ، لە ئەپریلی 1931 دا، عەریزەیەکی داوە بە لیژنەی هەمیشەیی ئینتیداب دەربارەی رەفتاری نارەوای حکومەتی عیراق لەگەڵ کورد.

حکومەتی بریتانی، لە تێبینیەکانی رۆژی 30 ی ئۆکتۆبەری 1931 دا، دەرکاندی ئەو هۆیانەی بون بە هۆی گرتنی تۆفیق وەهبی بەگ لەلایەن نوێنەری دەسەڵات پێدراوی هێزی ئینتیداب لە دەرکاندنەکانی کردنەوەی کۆبونەوەی لیژنەی ئینتیداب دا لە جونی 1931 دا، بە درێژی باسکراوە، لەبەرئەوە حکومەتی خاوەن شکۆ شتێکی زیادی نیە بیخاتە سەری. بەم دەرکاندنە دەرئەکەوێ، کە تۆفیق بێ هیچ مەرجێ دو حەفتە دوای پێشکەشکردنی عەریزەکەی مەدام تۆفیق بەردراوە.

هاوکارەکانم لەبیریانە عەریزەکەی ئەپریلی 1931 ی تۆفیق وەهبی لە دوای کۆبونەوەی لیژنەی هەمیشەیی ئینتیداب دا باس کرا. دەربارەی شکاتەکەی عەریزەدەر لە بابەت گیرانی مێردەکەیەوە، لام وایە لیژنەیش موافیقە هیچ کارێ پێویست نیە مادەم وەکو بە تێبینیەکانی حکومەتی بەریتانیدا دەرئەکەوێ، تۆفیق وەهبی بەگ شەش مانگ لەمەوپێش بەردراوە. (FO371 ی 10638).

**تێبینی لەسەر عەریزەکان**

لە 18 مین کۆبونەوەی خۆیدا، لیژنە ئەم عەریزانەی خوارەوەی هەڵسەنگاند، لەگەڵ تێبینییەکانی هێزی ئینتیداب لەو بابەتەوە دایرشتبون. هەر یەکێ لەم عەریزانە لەلایەن ئەندامێکی لیژنەکەوە بە نوسین راپۆرتی لەسەر دراوە. دوای گفتوگۆ، لیژنە ئەم ئەنجامگیرییانەی خوارەوەی کردوە، تێکستی راپۆرتەکانی دران بە لیژنەکە، خراونەتە پاشکۆی مەحزەری کۆبونەوەکە.

**عیراق**

أ. عەریزەکانی رۆژی 23 ی سێپتەمبەر و 9 ی دیسەمبەری 1931 ی هورمز رەسام .[C.P.M. 1108(a) and 1156]

تێبینیەکانی حکومەتی بەریتانی، رۆژی 6 ی مەی 1931 (C. P. M. 1156).

راپۆرت (بروانە پاشکۆی مەحزەر)

**ئەنجامگیرییەکان**

لیژنە پێشنیار ئەکا، ئەنجومەن سەرنجی هێزی ئینتیداب رابکێشێ:

1. بۆ پێویستی خاو نەکردنەوەی چاودێری کردنی بارو دۆخی کەمایەتیەکان لە عیراق دا.

2. بۆ پێویستیی وەرگرتنی بەڵێن لە حکومەتی عیراقی کە گەرەنتی رەفتاری بکات لەگەڵ کەمایەتیە رەگەزی و دینیەکان، بەپێی دەرکاندنەکانی هێزی ئینتیداب کە لە 19 هەمین کۆبونەوەی لیژنەدا باسکراوە، حکومەتی عیراق ئامادەیە بیدات.

3. ئاگاداركردنی عەریزەدەرەكان لەوەی عەریزەكانیان سەیر كراوە، كۆمەڵەی گەلان بەردەوام ئـەبێ لـە بینینی ئەوەی مافەكانی كەمایەتیەكان ڕێزیان گیراوە، ئەمەیش بە هاودەردیەكی زیـاترەوە ئـەكا ئەگـەر بـاوەڕ بهێنێ بە نیازی باشی كەمایەتیەكان بۆ پتەوكردنی سەلامەتی و گەشانەوەی دەوڵەتی عیراق.

لیژنە لای وایە پێویست ناكا ئەنجومەن ڕابسپێرێ، هیچ كارێكی تایبەتی لەسەر ئەم عەریزەیە بكا.

**ب.** عەریزەی یوسف مەلەک، ڕۆژی 20 ی ئەپریلی 1931 (C. P. M. 1179)

تێبینیەكانی حكومەتی بەریتانی، ڕۆژی 2 ی جونی 1931 (C. P. M. 1179)

ڕاپۆرت (بڕوانە پاشكۆی مەحزەر)

**ئەنجامگیرییەكان**

لیژنەی هەمیشەی ئینتیداب لەو بڕوایەدایە، گرنگی ئەم عەریزەیە بـەس نیـە بـۆ ئـەوەی ببێتـە بابـەتی ڕاسپێریەک بۆ ئەنجومەن.

**ج.** عەریزەكانی كـورد لـە عیـراق دا، لەلایـەن حكومـەتی بریتانیـەوە نێـردراوە لـە 20 ی فێبریـوەری 1931 (C. C. P. M. 1140) و هی تۆفیق وەهبی بەگ، ڕۆژی 19 ی ئەپریلی 1931 (a 1192 and C. P. M. 1192) (تێبینیەكانی حكومەتی بەریتانی، ڕۆژی 20 ی فێبریـوەری، 27 ی ئـەپریـل، 8، 13 ی جونی 1931) (C. C. P. M. 1140, 1151, 1184 and C. P. M. 1192)

ڕاپۆرت (بڕوانە پاشكۆی مەحزەر)

لیژنـەی ئینتیـداب 8 عـەریزەی كەسـایەتی و تـاقمی جیـاوازی كـوردی لـە عیـراق دا، لەگـەڵ تێبینیەكانی هێزی ئینتیداب دا لەسەر ئەم بابەتە، تاووتوێ كردەوە، شەرەفی ئـەوەی هەیـە ئەنجومـەن ڕابسپێرێ بۆ ئەوەی:

1. سپاسی هێزی ئینتیداب بكرێ لەسەر ئەوەی بە ئاگاییەوە لێكۆڵینەوەكانی لە شوێنی خۆیدا كردوە، تێبینیەكانی خۆی لەسەر ئەم عەریزە جیا جیایانە ئامادەكردوە.

2. داوا لە هێزی ئینتیداب بكرێ زۆر بۆ حكومەتی عیراق بیات كـە ئـەبێ لـە مامەڵـە كردنـی ڕەعیەتـە كوردەكانیدا، بەگیانی لێبوردنێكی فراوانـەوە بجوڵێتـەوە، بەرامبـەر كەمایەتیـەک شـایانی ڕێـز لـێ گرتنـە و، دڵسۆزیشی بە ئەندازەی ئەوە زیاد ئەكا كە چەند بێ ترس بێ لە مەترسـیی مافـە سروشـتیەكانی كـە هێـزی ئینتیداب و كۆمەڵەی گەلان بە ئاشكرا سەلماندویانە.

3. عەریزەدەرەكان ئاگادار بكرێن، كۆمەڵەی گەلان بە هەمو گەرمیـەک و بـە هاودەردیـەكی زۆرتـرەوە، بەردەوام ئەبێ لە دڵنیاكردنیان لەوەی مافەكانیان ڕێز لێ گیراو ئەبێ، ئەگەر باوەڕی هێنا كورد بە دڵسـۆزیەوە بەشداری ئەكا لە ئاسایش و گەشانەوەی دەوڵەتی عیراق دا.

4. بایەخێكی نزیكتر بدرێ بەو دڵەراوكەیەی بێگومان لەناو دانیشتوانی كوردا تەشـەنەی كـردوە، بـە هۆی نادیاریی ئەو ڕوداوانەی چاوەڕێیان ئەكا، ئەگـەر پارێزگـاری مەعنـەوی بریتانیـای گـەورە كـە دە سـاڵ زیاترە هەیانە، بێت و بكێشرێتەوە. (FO371 ی 15318).

**بۆ سكرتێری دەوڵەت بۆ كۆلۆنیەكان**

بەغداد، 3 ی دیسەمبەری 1931

ئەز شەرەفی ئەوەم هەیە ئیشارەت بدەم بە نامەی نهێنی ڕۆژی 19 ی نۆڤەمبەرتان، كـۆپی وەڵامـەكانی بەشی ئینتیدابی كۆمەڵەی گەلانیشی بۆ هەندێ لە عەریزەی كوردەكانی لەگەڵە.

1. دو لەم عەریزانە هی جەعفەر سوڵتان بون، من شەرەفی ئەوەم هەبو، لە نامەی تایبەتی رۆژی 7 ی نۆڤەمبەری 1931 دا سەرنجی لۆرد پاسفێڵد رابکێشم بۆ هەڵوێستی ئەو کە رەعیەتی ئێرانە، هەروەها لە لێدوانێکی ترم دا لەگەڵ نامەی نهێنی رۆژی 27 ی فێبریوەری 1931م دا. سەرەرای ئەمانە، بڕیاردرا عەریزەکانی جەعفەر سوڵتان بخرێنە بەردەم کۆمەڵە و لیژنەی هەمیشەیی ئینتیداب، رون کردنەوەکانی درا بون دەربارەی هەڵوێستی تایبەتی ئەو وەکو رەعیەتێکی ئێرانی، بە ئاشکرا پشت گوێ خراون و وەڵامەکانی بەناوی شەخسی ئەوەوە هاتۆتەوە، لەگەڵ ئەوانەی بۆ عەریزەدەرە عیراقیەکان نوسراوەتەوە.

2. ئەنجامەکەی لەم کاتەدا ئەو لەبەرچاوی حکومەتەکەی خۆی، یاخی چەک هەڵگر جەعفەر سوڵتان دو نامەی رەسمیی لە کۆمەڵەی گەلانەوە پێ گەیشتوە، راستی ئەترسم بیری خۆ بە زلزانی زۆر لەلا زیاتر بێ، سەرنج رائەکێشرێ بۆ پێوەندی لەگەڵ عیراق، کە حکومەتی عیراق پێی خۆش نیە ئینکاری بکا. (FO371 ی 10638).

**لە ڤیتۆ کاتاستینی (Vito Catastini)، بەرێوەبەری بەشی ئینتیداب،**

بۆ ئەورەحمان ئاغای پشدەری و کوردەکانی تر

جنێڤ، 19 ی فێبریوەری 1932

بەپێی ئەو بڕیارەی ئەنجومەنی کۆمەڵەی گەلان لە کۆبونەوەی 25 ی جەنیوەری 1932 دا داویتی، ئەز شەرەفی ئەوەم هەیە ئاگادارت بکەم، لیژنەی هەمیشەیی ئینتیداب لە کۆبونەوەی 21 هەمی رۆژی 28 ی مئەرزی 1931 دا گەیشتۆتە ئەم ئەنجامگیرییانە:

"لیژنە، عەریزەی 28 ی مئەرزی 1931 ی، بە ئیمزای چەند کەسێ گوایە کوردی عیراقن، تاوتوێ کرد.

سەرنجیدا لە تێبینیەکانی رۆژی 20 ی جولای حکومەتی بەریتانی لەسەر عەریزەکە خرابونە بەردەمی:

1. تێبینیەکانی هێزی ئینتیداب لێوەشاوەیی عەریزەدەرەکان پوچ ئەکاتەوە، تا بەناوی کوردی عیراقەوە بدوێن و بنچینە مێژوییەکانی شکاتەکانیشیان هەڵئەتەکێنێ.

2. ئەو تێبینیانەی عەریزەدەرەکان، لەسەر بناغەی تێکستی قانونی سکاڵاکانی خۆیان دەربڕیوە، بەڵام مەعناکانیان بە ئاشکرا شێواندوە.

3. سەبارەت بە دەربڕینی ئەم بێزاریە تازەیە لە عیراق دا، راستیی نرخی هەر چەنێک بێ ناتوانێ سەرنجێکی زۆرتر لەوەی پار، لە پێوەندیدا لەگەڵ هەندێ عەریزەی لەم بابەتەدا کە دارێژران، بەدەست بهێنێ.

4. لەبەر ئەوە بڕیاری دا بە بەردەوامی گەورەترین بایەخ بدا بەو نائارامیەی لەناو کوردا بەردەوامە، سەرنجی ئەنجومەن رابکێشێ بۆ ئەو چارەنوسە نادیارەی کە چاوەڕێیان ئەکا، ئەگەر پارێزگاری مەعنەوی بریتانیای گەورە کە 10 ساڵ زیاترە هەیانە، بکێشرێتەوە، مەگەر ئەوانیش گەرەنتی هاوتایان بدرێتێ".

ئەنجومەن ئەم ئەنجامگیرییانەی پەسند کرد.

لەگەڵ ئەمەدا بۆ ئاگاداریت، کۆپی راپۆرتێک لەسەر عەریزەکەت دراوە بە لیژنەی هەمیشەیی ئینتیداب لەلایەن بەرێز راپاردەوە، ئەینێرم. راپۆرتەکە خراوەتە پاشکۆی مەحزەری 21 هەمین کۆبونەوەی لیژنەکە. (FO371 ی 10638).

**هەڵبژاردە لە مەحزەری 21 مین کۆبونەوەی لیژنەی هەمیشەیی ئینتیداب:**

عیراق

عــەریزەی، رۆژی 28 ی مئــەرزی 1931، لەلایــەن هەنــدێ کەســەوە کــە گوایــە کــوردی عیــراقن بەرزکراوەتەوە، حکومەتی بریتانی لە 20 ی جولای 1931 دا ناردویەتی.

راپۆرتی بەرێز راپارد

لە 2 ی 3 ی 1931 دا، ئەورەحمان ئاغـای پشـدەری و ژمارەیـەکی زۆر ئیمزاکـەری تـر، لـە رێگـەی مەندوبی سامی عیراقەوە عەریزەیەکیان داوە بـە سـکرتێری گشـتی کۆمەڵـەی گـەلان، شـکات ئەکـەن لـە بـەد رەفتاریی حکومەتی عیراق و حکومەتی بریتانی بەرامبـەر بـە کـورد. تێبینـی لەسـەر ئـەم عەریزەیـە لەلایـەن حکومەتی بریتانیەوە لە لەندەنەوە لە 20 ی جولای 1931 دا نێردراوە.

عەریزەدەرەکان کە ئیمزاکانیان بە زۆری ناخوێنرێتەوە، دەسەڵاتیشیان لەلایەن هێزی ئینتیدابـەوە پـوچ کراوەتەوە، لە پێش هەمو شتێک دا ئەڵێین لە 1925 دا کۆمەڵەی گەلان کوردستانی بە دو مەرج خسـتە سـەر عیراق، لە پلەی یەکەم دا بەرێوەبەرایەتیەکی کوردی لە کوردستان‌دا دابمەزرێنرێ و نەتەوایەتی کورد بپارێزرێ، لـە پلـەی دوەم دا لـە حاڵـەتێک دا کـە عیـراق سـەربەخۆ بـێ و بچێتـە نـاو کۆمەڵـەی گەلانـەوە، ئـەبێ بەرێوەبەرایەتیەکی تایبەتی بۆ کورد بەپێی ئارەزوی خۆیان دابمەزرێنرێ.

لەسەر بنچینەی ئەم ئیدیعایانە، ئەوەندەی لیژنە لەبیرێتی لەگەڵ راسـتیەکانی مێـژودا جـوت نـابن. شکاتی عەریزەدەرەکان گوایە ئەو گەرەنتییانەی پێیان درا بون بە تـەواوی لەلایـەن حکومـەتی عیراقیـەوە پشت گوێ خراون، حکومەتی بریتانیایش سەرکەوتو نەبوە لە بـەجێهێنانی ئـەرکی خـۆی‌دا لـە پاراسـتنی بەرژەوەندیەکان دا. لە ئەنجام دا داوا ئەکەن دان بنرێ بە کۆمیتەیەکی نەتـەوەیی‌دا کـە هـەڵبژێردرێ بـۆ نوێنەرایەتی کورد و، دەست تێخستنێکی کاریگەری هێزی ئینتیداب بۆ پاراستنیان لەو چەوسـاندنەوەیەی، گوایە بە دەستیەوە ئەناڵێنن.

حکومەتی بریتانی، لە بەرپەرچدانەوەکەی‌دا، ئەم عەریزەیـە ئەداتـە پـاڵ جموجـوڵی شـێخ مـەحمود، بـە توندی ئینکاری راستیی شکاتی عـەریزەدەرەکان ئـەکا. لـە ئـەنجام دا هێـزی ئینتیـداب ئـەو راسـتیە دوبـارە ئەکاتەوە کە شێخ مەحمود لە 13 ی مەی 1931 دا خـۆی داوە بـە دەس حکومـەتی عیراقـەوە، بـە لەبـەرچاو گرتنی ئەوەی ئەم یاخیبونە چەکدارە کۆتایی هاتوە، هێزی ئینتیداب داوا لە کۆمەڵە ئەکا ئەم عەریزەیـە دابنـێ بەوەی شایانی بایەخ پێ دانی راستەقینە نیە.

سەبارەت بە ناراستیی، بێگومان ئەو پێشەکیەی ئەم عەریزەیەی لەسـەر دانـراوە، نادڵنیـایی تـەواوی ئێمـە لـە لێوەشاوەیی عەریزەدەرەکان، بەتایبەتی نەبونی هیچ جـۆرە گازاندەیـەکی تـازە، لام وایـە لیژنـە نـاتوانێ ئـەم عەریزەیە قوبوڵ بکا، جگە لەوەی رەنگە بە نیشانەیەکی ئەو نائارامیە دابنرێ کە هێشتا لەناو کوردی عیراق دا هەیە. ئەگەر لیژنە لەگەڵ ئەم رایە موافیق بێ، ئەشێ بە پەسند کردنی بەرنوسی بڕیاری خوارەوە دەری ببڕێ:

"لیژنەی ئینتیداب، عەریزەی 28 ی 3 ی 1931 ی هەندێ کەس کە گوایـە کـوردی عیـراقن، تـاوتوێ کرد؛

"هەروەها سەرنجی‌دا لە تێبینییەکانی 20 ی جولای 1931 ی حکومەتی بریتانی لەسەر ئەم عەریزەیە:

"1. تێبینیەکانی هێزی ئینتیداب لێوەشاوەیی عەریزەدەرەکان پوچ ئەکاتەوە، تا بەناوی کوردی عیراقەوە بدوێن، وە بنچینە مێژوییەکانی شکاتەکانیشیان هەڵئەتەکێنێ.

2. ئەو تێبینیانەی عەریزەدەرەکان لەسەر بناغەی تێکستی قانونی سکاڵاکانی خۆیان دەربڕیـوە، بـەڵام مەعناکانیان بە ئاشکرا شێواندوە.

3. سەبارەت بە دەربڕینی ئەم بێزاریە تازەیە لە عیراق دا، ڕاستییو نرخی هەر چەنێک بێ، ناتوانێ سەرنجێکی زۆرتر لەوەی پار، لە پێوەندیدا لەگەڵ هەندێ عەریزەی لەم بابەتەدا کە داڕێژران، بە دەست بهێنێ.

4. لەبەرئەوە بڕیاریدا بە بەردەوامی گەورەترین بایەخ بدا بەو نائارامییەی لە ناو کوردا ماوە، سەرنجی ئەنجومەن رابکێشێ بۆ ئەو چارەنوسە نادیارەی چاوەڕێیان ئەکات کە ئەگەر پارێزگاری مەعنەوی بەریتانیای گەورە لە 10 ساڵ زیاتر هەیانە، بکێشرێتەوە" (FO371 ی 10638)

بەیانێ لە پێشەوای کوردەکان کۆلۆنێل تۆفیق وەهبی بەگەوە، دابەزیوی بەیروت، بۆ رۆژنامەی (الراصد):

### کێشەی کورد لە کۆمەڵەی گەلان دا

لە رۆژنامەی (الاحرار) ی 16 ی 8 ی 1932 دا وتارێکم بە قەڵەمی یوسف ملک نوسەری (فواجع الانتداب) خوێندەوە، گوایە ئینگلیز لە ساڵی 1930 ەوە دەرگای باسی کەمایەتیەکانی کردۆتەوە، هانی داون موراجەعەتی کۆمەڵەی گەلان بکەن.

لە بەر ئەوەی کوردەکانی ناو سنوری دەوڵەتی عیراقیش موراجەعەتی کۆمەڵەی گەلانیان کردوە، دوای ئەوەی دڵنیا بون لەوەی مافەکانیان فەرامۆش کراوە لە پەیمانی عیراقی- ئینگلیزیدا کە لە 30 ی 6 ی 1930 دا بەستراوە. بۆ رەواندنەوەی هەر گومانێکی ئەم وتارە لە بیروڕای گشتیدا دروستی ئەکا، کوردیش دەستپێشکەری کردوە بۆ بەر دەرگای ناوبراو، نوسەری کتێب ئەڵێ گوایە ئینگلیز کردویانەتەوە، بە پێویستمان زانی ئەم راستییانەی خوارەوە رون بکەینەوە:

1. کورد لە عیراق دا هەرگیز ئەوەیان نەسەلماندوە کە وشەی کەمایەتی ئەوانیش ئەگرێتەوە، هەرگیز نایشی سەلمێنن، وەکو لە خوارێ رون کراوەتەوە:

**أ**. کورد لەو کوردستانەی خۆیان دا لە ساڵی 1918 ەوە جۆرێ لە ئۆتۆنۆمییان هەبو، بەر لە وەی بیر لە دامەزراندنی دەوڵەتی عیراق بکرێتەوە.

**ب**. هەردو حکومەتی ئینگلیزی و عیراقی، (1922) لە بەیانێک دا بەڵێنی دامەزراندنی حکومەتێکی کوردییان دا لەناو سنوری عیراق دا بە زوترین کات، بەومەرجەی کوردەکان خۆیان شێوەکەی دیاری بکەن.

**ج**. مەرج و بنچینەی نوساندنی ئەم بەشەی کوردستان بە عیراقەوە، ئەوە بو کە ئەبێ بەڕێوەبەرایەتییەکی کوردی بە پێی ئارەزوی کوردەکان خۆیان دابمەزرێ.

2. موراجەعەتی کۆمەڵەی گەلان لەلایەن کوردەوە، هیچ پێوەندیەکی بە مەسەلەی ئەو کەمایەتیانەوە نیە کە نوسەر باسی کردون، لەبەر ئەم هۆیانە:

**أ**. سەرەتای ساڵی 1919 کوردەکانی ئۆتۆنۆمییان هەبو، بەر لە دامەزراندنی حکومەتی عیراق، لەسەر مافەکانی خۆیان بە قوڵی لەگەڵ ئینگلیز تێکچون، هەروەکو لەگەڵ عیراقیش رویدا. ناکۆکییەکە ئەو کاتە بو بە شەڕێکی قورس و، دوای ئەوەی ئینگلیز لەشکرێکی گەورەی هێنایە سەر کوردستان، ئینجا توانی داگیری بکا.

**ب**. ساڵی 1922 لە کاتێک دا حکومەتی عیراق هەبو، کورد لە روی ئینگلیزدا شۆرشی کرد، داوای مافەکانی ئەکرد. هێزەکانی ئینگلیزیان کە لە دەربەندی بازیان بون، ناچار کرد بکشێنەوە. لە سەرەتای مانگی 9 دا حاکمی سیاسی و فەرمانبەرەکانیان بە فرۆکە سلێمانییان بە جێ هێشت، لە ئەنجامی ئەوەدا موختاریەتێکی کوردی لە سلێمانیدا دامەزرا.

**ج**. ساڵی 1923 جارێکی تریش پێوەندی کوردی- ئینگلیزی گرژبوەوە، لە سەرەتای ساڵی 1923 ەوە شۆرش لە پێناوی ئەو مافانەدا تا سەرەتای ساڵی 1927 درێژەی کێشا. ئینگلیز بۆ ئەوەی مل بە کورد

کەچ بکا لەو شەڕانەدا کە لەو ماوەیەدا قەومان، بە فراوانی هێـزی ئاسـمانی و سـەربازیی هینـدی و جەیشـی عیراقی و هێزەکانی تری بەردەستی بەکارهێنا.

**د.** ساڵی 1930 کوردەکان نارەزاییان لـە لای کۆمەڵـەی گـەلان دەربـڕی، سـەبارەت بـەوەی پـەیمانی سەربەخۆیی عیراق و چونی بۆ ناو کۆمەڵەی گەلان، بەتەواوی مافـەکانی پشـت گـوێ خسـت بـون. وەکـو لـە مادەی یەکەمی ئەم بەیانەدا باس کرا. ئەم نارەزاییـیە هێمنانەیە لای کۆمەڵـەی گـەلان، ئـەرکانی وەزارەتەکـەی عیراقی بە جۆرێ وروژاند، کەوتنە دانانی رێوشوێنی توندوتیژی ناژیرانە کە بو بـە هـۆی شۆڕشـەکەی شـێخ مەحمود. ئەویش هەمدیسان بە هۆی هێز و سیاسەتی ئینگلیزەوە دامرکێنرایەوە.

**هـــ.** هەرکەســـێ چـــاودێریی شۆڕشـــەکەی ســـاڵی 1931-1932 ی شـــێخ ئەحمـــەدی بـــارزان و سەرەنجامەکەی کرد بێ، پێویستی بە بیرکردنەوەیەکی زۆر نیە بۆ ئـەوەی تـێ بگـا کـە ئینگلیـز ئەیانـەوێ بەرلەوەی عیراق بچێتە ناو کۆمەڵەی گەلانەوە، مەیدانەکەی بۆ چۆڵ بکەن.

بەوانەی سەرەوەدا دەر ئەکەوێ نەتەوەی کورد لە کاتی پێویست دا لە قوربانیـدان دواناکـەوێ، ئیتـر چ پێویستییەکی بە هاندانی ئەم و ئەوە بۆ ئەوەی کـارێکی هێمنانـە بکـا بـۆ پێشـکەش کردنـی نـارەزایی بـە کۆمەڵەی گەلان.

ئەمە پوختەی گیروگرفتی کوردە لـە عیـراق دا، وابـزانم رون کردنەوەکـەم بـەس بـێ بـۆ دەرخسـتنی راستیی و، رونکردنەوەی باری سەرنجی کورد بۆ رای گشتی.

بەم بۆنەیەوە بە ئەرکی خۆمی ئەزانم وتارەکەم بەم چەند وشەیە کۆتایی پێ بهێنم:

هیچ کەسێکی نەکورد مافی ئەوەی نیـە بـە نـاوی کـوردەوە دەس بخاتـە کاروبـاری کـوردەوە، لەگـەڵ ئەمەیش دا گەلی کورد بە خۆشییەوە پێشوازی ئەکا و دان ئەنێ بە چاکەی هەر کەسێک دا، لە هەر رەگەزێ بێ کە هاودەردی لەگەڵ مەسەلەی کورد بنوێنێ.

## 1. هەندێ وشەی رۆژنامەوانی

راگەیاندن، کە بە زمانی عەرەبی (اعلام) و بە زمانی فارسی (رسانە) و بە زمـانی ئینگلیـزی (media) ی پێ ئەڵێن، بەو هۆ سەرەکی‌یانە ئەوترێ کە پێوەندی لە گەڵ ژمارەیەکی زۆری خەڵک ئەکەن بە تایبـەتی بـە هۆی تەلەفزیۆن و رادیۆ و رۆژنامەوە.

(راگەیاندن) لە زمانی کوردی‌دا وشەیەکی داتاشراو و تازە کورە نیە، بەڵکو وشەیەکی کۆن و رەسـەنە. لە هەمو فەرهەنگە کوردی‌یەکان دا هەیە و لێک دراوەتەوە.

شێخ محەمەدی خاڵ لە (فەرهەنگی خاڵ) دا نوسیوێتی، (راگەیاندن: گەیاندنی قسـەیەک یـا شـتێک بـە یەکێک).

گیوی موکریانی، کە خۆی یەکێ بوە لەوانەی لە بواری راگەیانـدن و رۆژنامـەوانی‌دا کـاری کـردوە، لـە (فەرهەنگی کوردستان) دا نوسیوێتی: (راگەیاندن: ئاگادارکردن. وەڵامدان).

هەرچەندە راگەیاندن مەعنا کۆنـەکانی خـۆی لـە دەس نـەداوە و، ئیسـتایش وەکـو جـاران لـە زمـانی گفتوگۆی رۆژانەی خەڵکدا بە زیندویەتی بە کار ئەهێنرێ، بەڵام پێشکەوتنی ژیان لە مەیدانی رۆژنامـەوانی‌دا، مەعنایەکی تازەی پێ بەخشیوە، کە ئەویش دەربڕینە لەو دەزگا و هۆیانەی کە بە کار ئەهێنرێن بۆ پێوەندی لە گەڵ ژمارەیەکی زۆری خەڵک (بە نوسین لە رۆژنامەدا و، بە بیستن لە رادیۆدا و، بە بینین لە تەلەفزیۆن‌دا) بـۆ گەیاندنی هەواڵ و باس و بابەت، بە هەمو جۆرەکانیەوە، بە خوێنەر و بیستەر و بینەر.

بـەڵام وشـەی (رۆژنامـەوانی)، کـە هەنـدێ کـەس وشـەی (رۆژنامەنوسـی) و هەنـدێکی کـە وشـەی (رۆژنامەگەری) لە باتی بە کار ئەهێنن، کە بە زمانی عـەرەبی (الصـحافة) و بـە فارسـی (روزنامـەنگاری) و بـە ئینگلیزی (Journalism) ی پێ ئەڵێن، وشەیەکی تازەیە. تازە دروست کراوە و تازەیش بە کار ئەهێنرێ.

لێرەدا من باس تەنیا لە دەزگاکانی نوسین ئەکەم.

ئەگەرچی چینی‌یەکان لە دروستکردنی کاغەز و نوسینەوەی هەواڵی رۆژانە و داهێنـانی چـاپ دا پـێش گەلانی تر کەوتون، بەڵام هونەری چاپ و هونەری رۆژنامەوانی لە ئەوروپاوە گەیشتۆتە رۆژهەڵات. هەر لە بەر ئەوە ئەو زاراوانەیش کە پێوەنـدی‌یان بـە پیشـەی نوسـینەوەی دەنگوبـاس و هەواڵـەوە هـەبێ هـەر لـەوێوە داکەوتون و، گەیشتونەتە ناو رۆشنبیرانی رۆژهەڵات.

لە زمانە ئەوروپاییەکان دا بەم بڵاوکراوانەی کە ڕۆژانە و هەفتانە و مانگانە هەواڵ و دەنگوباسیان بڵاو کردۆتــەوە وتــراوە: گازێــت (Gazette)، جۆرنــاڵ (journal)، نیوزپەیپــەر (Newspaper) و نیوزلێتــەر (Newsletter). دواتر کە هونەری ڕۆژنامەوانی گەیشتە ڕۆژهەڵات هەندێ لەم وشانەیان بــە دەســکاریەوە وەرگرتوە و هەندێکیشیان وەرگێڕاوەتە سەر زمانەکانی خۆیان.

یەکەمین ڕۆژنامە بە زمانی عەرەبی لە ســەردەمی لەشکرکێشــیەکەی نــاپلیۆن دا (1798- 1801) لــە قاهیرە بە ناوی (التنبیه) دەرچوە. لە بەر ئەوە میسرییەکان لە چاو گــەلانی دراوســێیان دا ئاشــنایەتییان لــە گەڵ ڕۆژنامەوانی دا زوتر پەیدا کردوە. محەمــەد عــەلی پاشــا چاپخانــە کۆنەکــەی نــاپلیۆنی تــازە کــردەوە و، یەکەمین ڕۆژنامــەی ڕەســمیی بــە زمــانی عــەرەبی ســاڵی 1828 لــە ژێــر نــاوی (الوقــائع المصــریة) دا واتــە (ڕوداوەکانی میسر) دا دەرکرد. لە تورکیایش ساڵی 1831 بابی عالی یەکەمین ڕۆژنامەی ڕەسمیی بە زمــانی تورکی لە ژێر ناوی (تقویم وقائع) واتــە (ڕۆژژمێــری ڕوداوەکــان) دا دەرکــرد. لــە ئێــران یــش ســاڵی 1850 دەرباری قاجار یەکەمین ڕۆژنامەی ڕەسمیی بە زمــانی فارســی لــە ژێــر نــاوی (وقــائع اتفاقیــە) واتــە (ڕوداوە قەوماوەکان) دا دەرکرد. هەر 3 ناو (الوقائع المصریە) ی عەرەبی و (تقویم وقائع) ی تورکی و (وقــائع اتفاقیــە) ی فارسی وشەی (وقائع) یان تێ‌دا دوبارە بۆتەوە کــە تەرجومــەی وشــەی (نیــوز) ی ئینگلیــزی و (نۆڤێــل) ی فەرەنسییە. بەڵام ئەم وشەیە نەیتوانی هەتا سەر بە زیندویی لەم زمانانەدا بمێنێتەوە. بــەڵکو هەنــدێ وشــەی تر جێگەیان پێ لێژ کرد، لەوانە غەزەتە، جەریدە، روزنامە، ئەخبار، صحیفە، مەجەلە...

ڕۆژنامەوانی بە زمانی فارسی، پێش ئەوەی لە ئێران پەیدا بێ لە هندستان دەستی پێ کردوە. یەکەمین بڵاوکراوەی چاپکراو بە زمانی فارسی کە (مرات الاحــوال) ە ســاڵی 1820 لــە هندســتان دەرچــوە نــەک لــە ئێــران. هندســتان ئەوســا لــە ژێردەســتی بریتانیــای گــەورەدا بــوە. کۆمپانیــای هنــدی شــەرقی دەســەڵاتدار و حوکمڕانی بوە. ساڵی 1780 یەکەمین بڵاوکراوەی چاپکراو بە زمانی ئینگلیزی لە بەنگال دەرچــو. دواتــر یش بە زمانە ناوچەیی‌یەکانی بەنگالی، گەجەراتی، مەهاراتی، ئوردو، پەنجابی. لەو سەردەمەدا زمانی فارسی لــە هندستان هێشتا زمانی باوی نوسین و خوێندنەوە بوە. لە بــەر ئــەوە هەنــدێ لــە ڕۆژنامــەکانیان بــە فارســی و هەندێکی بە تێکەڵ لە ئینگلیزی و فارسی و زمانی ناوچــەیی وەکــو بــەنگالی دەرکــردوە. ئــەوان ئــەو کاتــە وشەی (News) ی ئینگلیزییان وەرگێڕاوە بە (الاخبار) ی عەرەبی کە کــۆی (خبــر) ە و، بــۆ نــاو لــێ نــانی ڕۆژنامەکانیان هەندێ وشەی تریان خستۆتە سەری وەکو: (کاغذ الاخبار، مرات الاخبار، شمس الاخبــار، ســید الاخبار).

ساڵی 1855 یەکەمین ڕۆژنامە بە زمانی عەرەبی بە ناوی (مرات الاحوال) لە ئەستەمۆڵ دەرچو. پــاش 3 ساڵ واتە ساڵی 1858 (خلیل الخوری) لوبنانی (حدیقە الاخبار) ی لە بێروت دەرکرد و، هەر لە ئەســتەمۆڵ لوبنانی‌یەکی تر (احمد فارس الشدیاق)، کە لــە بنــەڕەت دا مەســیحی، بــەڵام موســوڵمان بوبــو، ســاڵی 1860 ڕۆژنامەی (الجوائب) ی دەرکرد کە 23 ساڵ بێ پسان دەرچو. لە سەردەمی خۆیدا لە پاڵ (الوقــائع المصــریة) ی قاهیرە و (حدیقة الاخبار) ی بێروتی‌دا گرنگترین ڕۆژنامەی عــەرەبی بــوە. ڕۆژنامەیــەکی بــڵاو و کاریگــەر و ناسراو بوە. ئەم ڕۆژنامەیە دەیان وشەی نوێی هێناوەتە ناو زمانی ڕۆژنامەوانی عەرەبی‌یەوە لەوانە وشــەی (الجریدة).

کۆنترین وشەی کە بۆ ڕۆژنامە بە کار هێنرا بێ وشەی (گازێــت) ە. (گازێــت) بــەو دراوە وتــراوە کــە ڤینیسی‌یەکان کڕین و فرۆشتنیان پێ کردوە. ساڵی 1566 لە شاری ڤینیسیای ئیتــالی چــاپکراوێکی ڕۆژانــە دەرچوە، هەواڵەکانی جەنگی نێوان کۆماری ڤینیسیا و دەوڵەتی عوسمانی بڵاو کردۆتەوە. نرخی دانەیەکی ئەم بڵاوکراوەیە یەک گازێت بوە، بۆیە بەو ڕۆژنامەیە، کە یەکەمین ڕۆژنامەی چاپکراو بوە وتراوە (گازێت). ئیتــر

بە دوای ئەودا لە ئیتالیا و هەندێ وڵاتی تری ئەوروپادا هەر ڕۆژنامەیەک دەرچوبێ پێیان وتوە گازێت.

تورک وشەی (گازێت) ی لە زمانە ئەوروپاییەکانەوە وەرگرتوە و تورکاندویەتی و کردویەتی بە (غەزەتە) و، بە هەمو ڕۆژنامەیەکیان وتوە غەزەتە. عەرەب و کورد لە تورکیان وەر گرتوە و بە کاریان هێناوە. بۆ نمونە ڕۆژنامەی (الزوراء) کە ساڵی 1869 لە بەغداد دەرچوە نوسیوێتی: (الغزتة تطبع في الاسبوع مرة يوم الثلاثاء وهي حاوية لكل نوع من الاخبار والحوادث الداخلية والخارجية).

لەمێژوی ڕۆژنامەوانیی کوردیدا، بۆ هەمو ئەو بڵاوکراوە دەورییانەی کە ڕۆژانە یان حەفتانە یان مانگانە دەرچون، چەند زاراوەی جۆراو جۆر بە کار هێنراون، وەکو: غەزەتە، جەریدە، مەجەلە، ڕۆژنامە، گۆوار، گۆڤار... هەندێ لەم زاراوانە لە زمانەکانی ترەوە وەرگیراون و، هەندێکیان کوردێنراون و، هەندێکیشیان داتاشراون.

وشەی (ڕۆژنامە) ی کوردی لە (روزنامە) ی فارسی وەرگیراوە. لە کۆنەوە وشەی روزنامە لە زمانی فارسیدا بە کار هاتوە. بەڵام ئەوسا، پێش ئەوەی ڕۆژنامەوانی دابێ، بەو دەفتەرانەیان وتوە روزنامە کە، داهات و خەرجی ڕۆژانەیان تێدا تۆمار کراوە. هەر ئەم وشەیە لە کۆنەوە لە زمانی فارسییەوە چۆتە زمانی عەرەبییەوە، بەڵام لە عەرەبیدا بە مەعنای ڕۆژژمێر (تقويم: Calendar) بە کار هێنراوە.

وشەی (جەریدە) یش، ئەگەرچی لە زمانی تورکی و فارسی و کوردیدا بە کار هێنراوە، ئەویش وشەیەکی عەرەبییە. لە کاتی خۆیدا بەو دەفتەرەیان وتوە جەریدە کە، لە دیوان و دەزگای کاربەدەستانی وڵات دا ڕوداوی ڕۆژانەیان تێ دا تۆمار کراوە.

ڕەنگە یەکەمین کەسی کورد کە وشەی روزنامە و جەریدەی لە شیعرەکانی دا بە کار هێنا بێ حاجی قادری کۆیی (1816- 1897) بێ. ئەو کاتەی حاجی ئەم وشانەی بە کارهێناوە هێشتا ڕۆژنامە و جەریدەی کوردی لە دایک نەبوبون. حاجی قادر لە شیعرێکیدا ئەڵێ:

صەد قائیمە و قەصیدە، کەس نایکڕێ بە پولێ،
ڕۆزنامە وو جەریدە، کەوتۆتە قیمەت و شان(دیوان، ل 88)

لە شیعرێکی تریدا ئەڵێ:

کوڕێکی وا نەبو هەستێتە سەر پێ
بزانێ خەڵقی چۆن کەوتونە سەر ڕێ
بکا سەیری جەریدە و حاڵی میللەت
کتێبی تازە و تەئریخی دەوڵەت
بزانێ تا چ قەوماوە لە ئەتراف
سەراپا ئاگرە ئەتراف و ئەکناف(دیوان، ل 231)

وەفایی یش لە شیعرێکیدا ئەڵێ:

حیکایاتی غەریبەی پێیە بولبول، جوملە خۆکردی،
دەڵێی چاپاری ئێران ڕۆژنامەی أختری هێنا

**کوردستان** (قاهیرە، جنێڤ، فۆلکستن، 1898- 1902) یەکەمین ڕۆژنامەی کوردی، بۆ ناساندنی خۆی لە وتارە تورکییەکانیدا وشەی غەزەتەی بەکار هێناوە. بەڵام لە وتارە کوردییەکانیدا وشەی (جەریدە) ی بە کار هێناوە. لە لای چەپی یەکەمین ژمارەی ڕۆژنامەکەدا بە تورکی نوسیوێتی: (عنوان: مصردە "کردستان" غزتەسی) بەڵام لە لای ڕاستیدا بە کرمانجی نوسراوە: (هەر جار دو هەزار جەریدەیا بێ پارە ئەزێ ڕێ کەم کوردستانێ دا بدەن خەڵکی). هەروەها لە سەروتاری هەمان ژمارەدا نوسیوێتی: (... دنیایێدا

چقاس موسولمان هەبن، گوند و باژێڕێن حـەمیادە مەکتـەب و مەدرەسـە و جەریـدە هـەنن. چ دەبـیَ چ نـابیَ جەریدە دنڤیسن...) لە هەمان وتاردا چەندین جار وشەی (جەریدە) ی دوبارە کردۆتەوە. هەر لەو ژمارەیش دا شیعرێکی حاجی قادری کۆیی بڵاو کردۆتەوە کە تیَیدا ئەڵیَ:

زەمانە رەسمی جارانی نەماوە
چراغی نازم و مونشی کوژاوە
لە دەوری ئێمە رۆمان و جەریدە
ئەگەرچی مەقصەدە، زانینی باوە

**کورد تەعاون و تەرەقی غەزەتەسی** (ئەستەموڵ، 1908)، دوەمین رۆژنامەی کوردی، ئەویش وەکـو لـە ناوەکەیدا دەرئەکەویَ بە تورکی وشەی غەزەتەی بە کار هێناوە. بەڵام لـە ژ 6 ی دا لـە شـیعرێکی کرمـانجی محەمەد تاهیر جزری نوسیوێتی: (بڤان هستری شادی کو دچاڤیَ من دباری/ ئەگەر قەلەم بکـارە نـەقش کـەت، حەساندنا دلیَ من/ بۆ پیرۆزییا تفاق و جەریدا ولایەتیَ من/ دیَ صەدهەزار کیتابا بنویسم و بکەم دیاری)

**رۆژی کورد** (ئەسـتەموڵ، 1913) بـە تـورکی وشـەی (مەجموعـە) ی عـەرەبیی بـە کـار هێنـاوە کـە وەرگێڕانی (کۆلێکشن) ی ئینگلیزی و (کۆلێکسیۆن) ی فەرەنسییە. بەڵام لە دوەمین ژمارەیدا ساڵح بـەدرخان بە ناوی م. س. ئازیزییەوە لە وتارێکی کرمانجیدا لە ژێر ناوی (هشیار بن) چەند جـاریَ وشـەی جەریـدەی بۆ رۆژنامە بە کارهێناوە. لەم وتارەدا نوسیوێتی:

"ئیرۆ تاریخەکی کوردا تونینە. کوردا نزانن بەری نهۆ خۆیی چە بین. ژ نەوعیَ خۆڕا، ژ ئیسـلامەتیڕا چ خدمەت کرنە.

"ئیرۆ غەزەتەک کوردی نینە. نکارن خـۆ ژ تەعەدایـە، ژ حیلـە و دەسیسـەی سیاسـەت خـۆ ماحەفـەزە بکەن. خۆندن و نویساندنی کرمانجی نینە، حەتا نهۆ کەسەک کتێبەکی صەرف و نەحوی تەدوین نەکریە.

"ئیرۆ تو قەوم نەمایە کۆ هەر یەک نە خۆیی پازدە بیست جەریدا بە. بڤان جەریدا حالیَ خۆ بەیان دکەن، دەردیَ خۆ تەشریح دکەن، مەتلەبەک وان هەبە دخوازن. جەریـدە ژ هـەر قەومـەکیڕا دبـە شـۆنا عـەزمانیَ. حـەچ قەومیَ بیَ جەریدەیە ئەو مرۆڤەک لالە، نە دکاریَ دەردیَ خۆ بێژیَ و نەژی سەح دکە حال و مەوقیعی خۆ چیە."

هەر لە دوەمین ژمارەیدا خەلیل خەیالی بە ناوی (مودانی خ.) ەوە لە وتارێکی کرمانجیدا لە ژێر نـاوی (پیرۆزناوە) دا نوسیوێتی: "هەژمارە ئەوەلی رۆژناوەی وە من خۆند گەلەک پیَ چاونور و دڵخۆش بوم...". لە شوێنێکی تریش دا دیسان نوسیوێتی: "رۆژناوەی وە پیرۆز بیَ". هەردوجار وشەی رۆژناوەی خسـتۆتە نـاو جوتکەوانەوە. دیارە مەبەستی لە وشەی رۆژناوە هەمان وشەی رۆژنامەیە کە ئیستا بە کار دیَ، بـەڵام ئـەویش لە زمانی کوردیدا نەیتوانیوە جیَی خۆی بکاتەوە.

**هەتاوی کورد** (ئەسـتەموڵ، 1913- 1914) و، بـانگی کـورد (بەغـداد، 1914) وشـەگەلی (غەزەتـە، جەریدە، مەجموعە، رسالە) یان بە کار هێناوە.

**تێگەیشتنی راستی** (بەغدا، 1918) رەنگە یەکەمین بڵاوکراوەی کوردی کـە بـۆ ناسـاندنی خـۆی بـە خوێنەرەکانی وشەی رۆژنامەی بە کار هێنابیَ. کە دەسـەڵاتی ئینگلیـز لـە 1 ی 1 ی 1918 دا، واتـە لـە دوا ساڵی یەکەمین جـەنگی جیهـانیدا لـە بەغـداد دەری کـردوە. لـە ژێـر نـاوی یەکـەمین ژمـارەیدا نوسـیوێتی: (رۆژنامەیەکی سیاسی و ئیجتیماعی و خادیمی یەکبون و سەربەستی کوردانـە) ئـەم پێناسـەیەی خـۆی تـا دوا ژمارەی، کە ژمارە 67 ە، دوبارە کردۆتەوە.

**پێشکەوتن** (سلێمانی، 1920- 1922) لە ژێر ناوەکەیدا نوسیوێتی: (حەفتەی جارێک دەردەچێت) لە زۆری ژمارەکـانی سـەرەتادا نـاوی (غەزەتـە) و (جەریـدە) و (رۆژنامـە) نابـا و بـە خـۆی ئـەڵیَ: (دائیـرەی

پێشکەوتن). بەڵام لە ژ 13 دا نوسیوێتی: (بۆ زانین: ئەوانە کە هەتا ئیستا پارەی پێشکەوتنیان نەداوە وا لە مەولا بۆیان نانێرین. بەڵام تا ئیستا کە 13 قەزاتەیان بۆ چوە پارەی ئەوە دەبێ بنێرن و بیدەن. ئەوانە کە بۆ سێ مانگ پارەیان دابو ئەگەر دەیانەوێ قەزاتەیان بۆ بچێت پارەی تر بنێرن ئەگینا بۆ ئەوانیش نانێرین). لێرەدا وشەی قەزاتە بە هەڵە لە باتی غەزەتە بە کار هاتوە. بەڵام لە ژمارەکانی تریدا وشەکە راست کراوەتەوە و، هەندێ لە رۆژنامەکانی ئەو سەردەمە کە وەکو سەرچاوەی هەواڵ لە پێشکەوتن دا باس کراون بە غەزەتە و جەریدە ناوبراون. لە ژ 55 دا وشەی غەزەتەی تایمسی بەغداد و لە ژ 71 دا غەزەتەکان و لە ژ 96 دا غەزەتەی ایلری و غەزەتەی اقبال و غەزەتەی ایران و، لە ژ 85 دا وشەی (جەریدە) و (جەرائیدی ئەستانبول) ی بە کار هێناوە.

لە ژ 118 یدا کە دواژمارەیەتی نوسیوێتی: (لەم رۆژانەدا بۆ خزمەتی وڵات و بەرزکردنەوەی مەعاریف جەمعیەتێک بە ناوی جەمعیەتی کوردستانەوە لە سلێمانی تەشەکولی کردوە. بە ناوی بانگی کوردستانەوە ئیمتیازی غەزەتەیەکیش وەرگیراوە کە ئەم جەمعیەتە ئیدارەی دەکات و جەنابی حاجی مستەفا پاشا مودیری مەسئولێتی. ئەو غەزەتەیە لە مەولا هەفتەی جارێک دەردەچێت)

**بانگی کوردستان** (سلێمانی، 1922) کە راستەوخۆ بە دوای (پێشکەوتن) دا دەرچوە لە ژێر ناوەکەیدا نوسیوێتی: (عیلمی، ئیجتیماعی، ئەدەبی، غەزەتەیەکی حورِ و سەربەستی میللی‌یە).

**رۆژی کوردستان** (سلێمانی، 1922) کە بە دوای بانگی کوردستان دا دەرچوە نوسیوێتی: (سیاسی، ئەدەبی، ئیجتیماعی، غەزەتەیەکی رەسمی‌یە)

**بانگی حەق** (جاسەنە، 1923) لە ژێر ناوەکەی دا نوسیوێتی: (سیاسی، ئەدەبی، ئیجتیماعی، غەزەتەیەکی رەسمی‌یە لە قەرارگاهی عمومی ئۆردوی کوردستان تەبع دەکرێ).

**ئومێدی ئیستیقلال** (سلێمانی، 1923- 1924) نوسیوێتی: (سیاسی، ئەدەبی، ئیجتیماعی، غەزەتەیەکی رەسمی‌یە).

ژیانەوە (سلێمانی، 1924- 1926) لە ژێر ناوەکەیدا نوسیوێتی: (ئەم غەزەتەیە غەزەتەیەکی حکومەتی‌یە هەفتەی جارێک دەردەچێ).

**ژیان** (سلێمانی، 1926- 1938) کە بە دوای ژیانەوەدا دەرچوە ئەویش لە ژێر ناوەکەیدا نوسیوێتی: (ئەم غەزەتەیە غەزەتەیەکی سیاسی، ئەدەبی، ئیجتیماعی‌یە. هەفتەی جارێک دەردەچێ). ژیان تا ژ 410 ی 15 ی مایسی 1934 هەر وشەی (غەزەتە) ی بە کار هێناوە. لە 1934 بە دواوە ئینجا وشەی (رۆژنامە) ی بە کار هێناوە و نوسیوێتی: (ژیان: رۆژنامەیەکی کوردیە).

**دیاریی کوردستان** (بەغداد، 1925- 1926) رەنگە یەکەمین بڵاوکراوەی کوردی بێ، لە دوای (تێگەیشتنی راستی، بەغداد، 1918) کە وشەی رۆژنامەی بە کار هێنابێ. دیاریی کوردستان لە دێباچەی یەکەمین ژمارەیدا نوسیوێتی: (لە پایتەختی حکومەتی فەخیمەی عیراقیەدا جەریدەیەکی سیاسی و یەومی لازم بو کە لیسانحاڵی میلەتی کورد بێ، ئەوەڵەن بۆ ئیمتیازی رۆژنامەیەکی سیاسی و ئیجتیماعی و ئەدەبی و ئیقتیصادی ئیستیدعایەکم دابو، لاکین قەوانین و ئەوامیری حکومەت بۆ نەشری جەریدەی سیاسی دو هەزار روپیەی نەقدی دیپۆزیتۆی تەلەب ئەکرد). لە دوا لاپەڕەی بەرگەکەیدا خۆی بەمجۆرە بە خوێندەوار ناساندوە، بە کوردی نوسیوێتی: (رۆژنامەیەکی ئیجتیماعی و ئەدەبی و مصەوەرە) و، بە زمانی عەرەبی یش نوسیوێتی: (جریدە، ادبیە، اجتماعیە، مصورە). ئەبێ دیاری لە بەکارهێنانی وشەی (رۆژنامە) دا مەبەستی هەمان وشەی تورکی (غەزەتە) و وشەی عەرەبی (جەریدە) بو بێ کە بە گشتی بۆ چاپکراوی رۆژانە و هەفتانە و مانگانە بە کار هێنراوە. ئەگینا دیاریی کوردستان لە شێوەی گۆڤاردا چاپکراوە.

**زاری کرمانجی** (ڕەواندز، 1926- 1932) لە ژێر ناوی یەکەمین ژمارەیدا نوسیوێتی: (کۆوارێکی ئیجتیماعی، تاریخی، فەنی، ئەدەبی، مانگییە) ئەم پێناسەیە تا دوا ژمارەی کە ژمارە 26 ە دوبارە بۆتەوە. لەو سەردەمەدا لە زمانی ڕۆژنامەوانی عەرەبی و تورکی و فارسیدا وشەی (مەجموعە) کە تەرجەمەی (کۆلێکسیۆن) ی فەرەنسییە بە کار هێنراوە. حوزنیی موکریانی ڕەنگە وشەی (کۆوار) کە بە کۆڤار ئەخوێنرێتەوە لە باتی (مەجموعە) و (کۆلێکسیۆن) داتاشی بێ و بە کار هێنابێ.

**هاوار** (شام، 1932) لە ژێر ناوی یەکەمین ژمارەیدا نوسیوێتی: (کۆمەلا کوردی) کە دیارە مەبەستی لە وشەی (کۆمەل) هەمان (مجموعە) ی عەرەبییە. بە تایبەتی چونکە لە بەشە عەرەبییەکەی هەمان ژمارەدا نوسیوێتی: (لقد اسسنا مجموعة هاوار لغاية علمية وادبية محضة) لە ژ 5 یدا وشەی کومەلی گۆڕیوە بە کۆڤار و لە ژێر ناوی هاوار دا نوسیوێتی: (کۆڤارا کوردی). هەر لەم ژمارەیەدا نامەیەکی حوزنی موکریانی بڵاو کردۆتەوە. دور نیە لە سەر پێشنیاری ئەم، جەلادەت بەدرخان وشەی کۆمەڵی گۆڕی بێ بە کۆڤار. لە ژ 8 ی هاوارەوە لە تەنیشت (کۆڤارا کوردی) نوسیوێتی (مجله کردیه).

**ڕوناکی** (هەولێر، 1935) کە ئەویش وەکو زاری کرمانجی حوزنی موکریانی سەرنوسەر و بەڕێوەبەری بوە، لە ژێر ناوەکەیدا نوسیوێتی: (کۆوارێکی هەفتەیی عیلمی ئیجتیماعی ئەدەبی کوردییە).

**گەلاوێژ** (بەغداد، 1939- 1949) لە ژێر یەکەمین ژمارەیدا نوسیوێتی: (گۆڤارێکی ادبی و ثقافی مانگی کوردییە). تا دوا ژمارەی هەمان وشەی بە کار هێناوە.

**نیشتمان** (موکریان، 1943) لە ژێر ناوەکەیدا نوسیوێتی: (کۆوارێکی کۆمەڵایەتی، ئەدەبی، خوێندەواری، مانگی کوردیە)

**دەنگی گێتیی تازە** (بەغداد، 1943- 1946) کە ئەویش حوزنی سەرنوسەری بوە، لە ژێر ناوەکەیدا نوسیوێتی: (کۆوارێکی ئەدەبی-خوێندەواری، زمانی، ئیجتیماعی، پەیامی، هەفتەیی - کوردیە)

**نزار** (بەغداد، 1948) لە ژێر ناوی بەشی کوردیدا نوسیوێتی: (گۆڤارێکی حەفتەیی سیاسی کوردی و عەرەبییە)

**ڕۆژا نو** (1943- 1946)، کامەران بەدرخان لە چەندین ژمارەیدا کە بە کرمانجی و بە پیتی لاتینی لە بێروت دەری کردوە لە ژێر سەردێری (چاپا کوردی) دا نوسیوێتی: (نها ب زمانێ کوردی هەڤدە کۆڤار و ڕۆژنامە دەردکەڤن). لەم هەواڵە کورتەدا ناوی ڕۆژنامە و گۆڤارەکانی ئەو سەردەمە و شوێنی دەرچونیان باس ئەکا.

**هەتاو** (هەولێر، 1954- 1961) نوسیوێتی: (کۆڤارێکی وێژەیی - ادبی- کوردیە).

لە چلەکانی سەدەی بیستەمەوە وشەی (ڕۆژنامە) لە باتی وشەی (غەزەتە) ی تورکی و (جریدە) و (صحیفە) ی عەرەبی و، وشەی کۆڤار (کۆوار)، کە دواتر بۆتە گۆڤار، لە باتی وشەی (مجلە) ی عەرەبی لە زمانی ڕۆژنامەوانی کوردیدا لە عیراق و سوریا و ئیران چەسپیوە و جێگیر بوە.

## 2. کێشەی دارایی‌ی ڕۆژنامەوانی‌ی کوردی

سەرباری کێشەی سنورداریی ئازادیی ڕۆژنامەوانی‌ی کوردی، کێشەی دارایی، بە واتایەکی تر کێشەی دابینکردنی پارەی بارەگا و چاپ و بڵاوکردنەوە و کارکەرانی ڕۆژنامەکە، مەسەلەیەکی ئاڵۆز و پڕ لە گیروگرفت بوە. ڕۆژنامەوانی دەزگا و دامەزراو نەبوە و، نە بۆتە کارێکی بازرگانی تا بتوانێ خۆی بژێنێ. بەڵکو کارێکی یەکتەنی بوە. بەستراوە بە دەسپێشکەری و توانای دارایی خاوەنەکەیەوە. لە بەر ئەوە هەندێ لە ڕۆژنامە کوردییەکان، بێ ئەوەی دەزگاکانی حکومەت دایان بخەن، لە بەر بێ دەرامەتی، خۆیان پەکیان کەوتوە.

سەرچاوەی بژیوی ڕۆژنامەی کوردی بریتی بوە لە:

1. توانای دارایی خاوەنی ڕۆژنامەکە و،
2. ئابونەی بەشدارەکانی و،
3. پارەی ئیعلانات، بە تایبەتی ئیعلاناتی حکومەتی.
4. یارمەتی خێرەومەندانی کورد، ئەگەر بوبێ.

ئابونەی بەشدارەکان سەرچاوەی سەرەکی بوە. لە بەر ئەوە هیچ ڕۆژنامەیەکی کوردی نیە، لەم بوارەدا هاواری لێ هەڵنەستابێ و، گلەیی لە ئابونەکانی نەکردبێ و، داوای ناردنی نەکردبێ.

لێرەدا چەند نمونەیەک ئەنوسمەوە:

### 2. 1. پێشکەوتن

یەکەمین ڕۆژنامە کە لە سلێمانی دەرچوە (پێشکەوتن) بوە. ئەگەرچی ڕۆژنامەیەکی حکومەتی بوە و، دەسەڵاتی داگیرکەری ئینگلیزی لە پشت بوە، لە گەڵ ئەوەیشدا کێشەی ئابونەی هەبوە. لە ژ 11 ی ڕۆژی 8 ی جولای 920 دا مستەفا مەزهەری بەڕێوەبەری ڕۆژنامەکە نوسیویێتی:

"بۆ خزمەت کڕیارەکان: ئەوانەی کە هێشتا پارەی کڕینی (پێشکەوتن) یان نەداوە ئەگەر پارە نەنێرن لە مەولا بۆیان ناچێت. کڕیارەکانی ناوشار پارە بنێرن بۆ بەندە. هینەکانی دەرەوە بە پۆستەدا بینێرن بۆ پێشکەوتن.

"کڕیارەکانی دەرەوە ئەبێ پارەی پۆستە، کە (پێشکەوتن) یان بۆ دەبا، جارێ نیو ئانەیە، لە گەڵ هی کرێنەکەدا بینێرن. مستەفا"

له ژ 19 ی 2 ی سەپتەمبەری 920 دا دیسانەوە نوسیوێتی:

"بۆ کڕیارەکان: ئەو زاتانەی کە هەتا ژمارە 13 ی (پێشکەوتن) یان بۆ چوە و هێشتا پارەیان نەداوە تکام وایە کە ئەو پارەیە کەرەم بکەن و بینێرن بۆ پێشکەوتن.

"ئەم پارەیە کە بە پێشکەوتن دەدرێ بەشی کاغەزەکەیشی نیە. ئینجا کەوابو پێ بە کەڵکەوە نەنێن باشە. ئەوی خوا پێمان دەبەخشێ و بۆمان دەگەیەنێ ئاگاداری بکەین، قەدری بگرین، شوکر و سەنای لە سەر بکەین، تا زیاترمان دەست کەوێت. ئەگینا پەشیمان دەبینەوە، پەشیمانیش کەڵک ناگرێت. مستەفا"

دوای دەرچونی زیاتر لە 100 ژمارەیش لە ژ 106 ی 4 ی مەی 1922 دا نوسیوێتی:

"پێشکەوتن: لە ژمارەی 104 ەوە دوەم ساڵی پێشکەوتن تەواو بوە لە ژمارە 105 ەوە کڕیارەکان قەرزداری ساڵی تازەن، ئەوی تالبە سەرلەنوێ قەید دەکرێتەوە. ئەوانەی کە لە ئابونەی پار قەرزدارن تکا دەکەین لە گەڵ هی ساڵی تازەدا ئابونەکانیان بگەیەنن. هەچکەس تالبی قەید کردنەوە نیە مەعلومات بدا تاکو غەزەتەی بۆ نەنێررێت."

## 2 .2. دیاریی کوردستان

بە 3 زمانی کوردی، عەرەبی و تورکی لە بەغداد دەرچوە، لە دوا لاپەڕەی هەمو ژمارەکانیدا نوسیوێتی:

"کڕیاری: لە بەغدا ساڵی بە 12، شەش مانگی بە 7، لە دەرەوە ساڵی بە 15، شەش مانگی بە 8 روپییە. بۆ قوتابی و فەقێ، لە بەغدا ساڵی بە 10، لە دەرەوە بە 12 روپییە.

"بۆ مەمالیکی ئەجنەبیە، ئوجرەتی پۆستەی ئەخرێتە سەر.

"بۆ ئیعلانات، مشتەری لە تەک ئیدارەخانە پێک یەت."

لە ژ 14 ی 21 ی تشرینی یەکەمی 1925 دا لە ژێر ناوی (رجا) دا نوسیوێتی: "دەستگیر و یاریدەدەرمان خزمانە، خێرخواهان و ئاشنایانە، هیوامان هەر بە وانە و بە سەعی و غیرەتی خۆمانە. سەرمایەیەکی تر و پشتیوانێکی ترمان نیە. بۆ دەوام و گەورەبونی (دیاریی کوردستان) و نەفعی هەمومان ڕجا ئەکەین قیمەتی کڕیاری فەرامۆش نەفەرمون. بە پۆستەدا بینێرن. ئەوانەی کڕیار نین و جەریدەیان بۆ ناچێ داوا بکەن، خۆیان گەورەیەتی بنوێنن، بۆمان بنوسن."

لە ژ 16 دا لەژێر سەردێڕی: (بۆ هەمو برا و خزمان) دا نوسیوێتی:

"دیاریی کوردستان، بە حەسەبی وەزعیەت و رەسم و نەفاسەتی، مەسرەفی لە ئەمسالی گەلێ زیاترە. بۆ کەس زەرەری نەبوە. بۆ خێر و نەفعی میللەت و ئەمسالی تەئسیر و خزمەتی بوە. وەک دائیمەن گوتومانە ئەمە هی خۆمانە، هیوامان هەر بە خۆمانە و بە غیرەتی برا و خزمانە. حسێن ئەفەندی تەحسیلدارمان بە عائیدات بۆ دەرەوە نارد زۆر رجا ئەکەین تەئخیری مەکەن. لە ژێر ژمارەی موتەسەلسیل، موقابیلی مەقبوزی مەتبوع و مەمهور بە ئیمزای صاحیبی ئیمتیاز و مۆری ئیدارەخانە، قیمەتی کڕیاری پێ کەرەم بفەرمون. ساڵانەی هەزار لاپەڕەی بە پانزە رۆپیە زۆر نیە. قەناعەت و فیداکاری تیادایە. گەلێ مەسرەفی لێ کراوە مەسرەفی خۆی دەرنەهێناوە. مەتلەبمان بۆ نەفع و خێری میللەت و مەملەکەتە. مان و گەورەبونی بە بەخێوکردنی وەجیبەی هەمومانە. بۆ ئەمە ئابونە بون و فەرامۆش نەکردنی ساڵانەی کافییە هیچی تری پێ ناوێ. ئەوی بۆ خودا و خۆ بێ لە کیس ناچێ."

**2. 3. ژیان**

ژیان لە ساڵی دوەمیەوە چەندین جار و بە چەند چەشنی جیاواز، داوای پارەی لە ئابونەکانی کردوە:

لە ژ 55 و 56 و 59 و 61 و 64 و 69 و 74... دا ئەم داوایەی دوبارە کردۆتەوە:

"ژیان

"ئەتانەوێ ئەم قەزاتەیە بەرێوە بچێ و بژی حەقی کڕیارییەکەی دوا مەخەن و زو بینێرن."

لە ژ 58 دا نوسیوێتی:

"تکا لە کڕیارە موحتەرەمەکانمان

"لە کڕیارەکانی دەرەوەمان خاسەتەن تکا ئەکەین کە بۆ ئەمەی بە رێکوپێکی غەزەتەکانیان پێ بگات و، مەیدانی گلەیی نەمێنێ، لەمەودوا لوتفەن لە گۆڕینی ناوونیشانیان زو خەبەردارمان بفەرمون.

"وە دیسان تکا ئەکەین ئەوانەی کە قەرزداری ژیانن و بەدەلاتی ئیشتیراکیان پڕ نەکردۆتەوە بە بێ دواخستن بە ناوی ئیدارەخانەوە بە ناردنی هیمەت بفەرمون."

لە ژ 79 دا نوسیوێتی:

"تکا لە کڕیارەکانی دەرەوەمان

"تا ئێستا بۆ ناردنی بەدەلاتی ئابونە کە لە بەقایادا ماوەتەوە گەلێ جار عەرزمان کرد. کڕیارە موحتەرەمەکانی دەرەوەمان لە گەڵ ئەمەی کە ئەمرۆ مودەتێکە غەزەتەمان دەرئەچێ هێشتا ئەعزەمیان بەدەلاتی ئیشتیراکیان نەداوە، ئەمە ئەبێتە مانیعی بەرێوەچونی (ژیان) مان. بۆ هەمو لایەک خسوسی میقداری مەتلوباتمان عەرز کردوە، رجا ئەکەین بە بێ دواخستن هەرکەسە حسابی خۆی پڕ بکاتەوە و دیسان تکا ئەکەین بۆ ئەمەی مونتەزەمەن غەزەتەکانیان پێ بگات و مەیدانی گلەیی نەمێنێ لەمەودوا لوتفەن لە گۆڕینی ناوونیشانیان زو خەبەردارمان بفەرمون."

لە ژ 89 دا نوسیوێتی:

"بۆ کڕیارە موحتەرەمەکانمان

"تەبیعی هەمو ئەیزانن ئیدارەکەمان مەساریفاتی زۆرە. بۆ تەبعی غەزەتەیەک پارەیەکی زۆر لازمە. موقابیل بە هەمو سەرفیاتێ واریداتی پێویستە. رجا لە کڕیارەکانمان ئەکەین و ئەم مەسئەلەیە حەواڵەی ویجدانیان ئەکەین، ئەوانەی کە حەقی دو ساڵ سێ ساڵیان لە سەرە و لە ئیبتیدای نەشری ئەم غەزەتەوە هێشتا هیچیان نەداوە یا بە جارێ وە یاخود بە قیست پارەی ئابونەکەیان بنێرن. ژیان"

لە ژ 133 دا بە هەڕەشەوە نوسیوێتی:

"ئاخر رجا

"هەتاکو ئێستا بۆ تەراکومی بەدەلاتی ئابونەی غەزەتەکەمان موتەعەدید دەفعە رجامان لە مشتەریەکانمان کرد لەوانەی کە هێشتا حەقی 3 و 4 ساڵیان لایە، رجا ئەکەین بۆمان بنێرن وەئیلا وەکو غەزەتەکەیان بۆ نانێرین مەجبور ئەبین بە موراجەعەتی قانونی و لە غەزەتەیشا ناویان دەرج ئەکەین. ژیان"

پێ ئەچێ هەمو ئەم رجا و تکا و هەڕەشەیە کەڵکی نەبوبێ، لەبەر ئەوە یەکێ لە فەرمانبەرەکانی چاپخانەیان ناردوە بۆ کۆکردنەوەی. لە ژ 184 دا نوسیوێتی:

"تکایەکی تایبەتی

"هەمو ئەیزانین لە موحیتی کوردستانا هەر ئەم غەزەتە کوردیە هەیە و، ئەمەیش چونکی مشتەریەکانی معاوەنەتی ناکەن و حەقەکەی لە میعادی خۆیدا تەسلیم ناکەن نەک قابیل نیە ئینتیزامێکی پێ بدرێ بەڵکو ئەگەر هەر وا بمێنێتەوە ناژی. ساڵانەی غەزەتەکە ئەوەندە نیە کە ئەهمیەتی بێ، حەقی چوار ساڵی موقابیل

حەقی ساڵێکی غەزەتەیەکی ترە. لە سەر هەمو حەمیەتمەندێک و وەتەنپەروەرێک پێویستە بە جدی معاوەنـەتی بکات و بیژێنێ.

"ئینجا بۆ ئەوەی غەزەتەکەمان بژی و بتوانین ئینتیزامێکی پێ بـدەین رجـا لـە مشـتەریەکانی خـاریج و داخـل ئەکـەین وە بیلخاسـە لـە قیسـمی مـەئمورین و ئەوانـەی کـە هێشـتا حـەقی چـوار سـاڵیان لا مـاوە و مەبلەغێکی زۆر قەرزدارن، ئیتر مەیدانی نوسین و بەعزێ معامەلە نـەدەن و، بـە ئـەوەل واسـیتەدا بـە نـاوی سندوقی بەلەدیەی سلێمانیەوە چەند قەرزدارن بۆمان بنێرن و رجاکەمان تەرویج بفەرمون.

"زاتەن لە موەزەفینی مەتبەعـە شـێخ تـەیب ئەفەنـدی بـۆ کۆکردنـەوەی بـەدەلاتی غەزەتەکـە نێـررا بـۆ کەرکوک، هەولێر، رەواندز، کۆیە، شەقڵاوە، ئیستیرحام ئەکەین معاوەنەتی بفەرمون و بەدەلاتەکەی بـە تـەواوی تەسلیم بکەن."

عەلی عیرفان لە ژ 82 ی 20 ی 9 ی 1927 دا، بە ناونیشانی (تەشەکورات و رجا) نوسیوێتی:

"..... لـە 1 ی ئـەم مانگـەوە هەفتـەی دو کـەرەت: دوشـەموان دەفعەیـەک و پێنجشـەموان دەفعەیـەک، غەزەتەکەمان ئینتیشار ئـەکات. وە تـەبیعی لەمـەودوا مەتبەعەکـەمان مەسـرەفێکی فەوقـەلعادە زیـاتر بـە نـاوی خزمەتی میلەت و وەتەنەوە ئیختیار ئەکات، لەبەر ئەوە رجا ئەکەین لە مشتەریەکانمان کە معاوەنەتمان بفەرمون و، لە وەقت و میعادی خۆیدا بەدەلی ئابونەی غەزەتەکە بە ناوی بەلەدیەوە بۆمان رەوانە بفەرمون..."

لە ژ 97 دا ئەم (تکا) یەی بڵاو کردۆتەوە:

"لە موەزەفینی دائیرەی مەتبەعە تەیب ئەفەندی بۆ کۆکردنەوەی بەدەلاتی ئابونەی ژیان نێررا بۆ لیـوای کـەرکوک، هـەولێر، قـەزای چەمچـەماڵ. تکـا لـە مشـتەریەکانمان ئەکـەین بەدەلاتەکـەی بـە تـەواوی تەسـلیم و معاوەنەتی لازمەی لە حەق ئیجرا بفەرمون."

لە ژ 184 دا ئەم ئاگاداریەی بڵاو کردۆتەوە:

"... لە موەزەفینی مەتبەعە شێخ تەیب ئەفەندی بۆ کۆکردنەوەی بەدەلاتی غەزەتەکە نێررا بـۆ کـەرکوک، هەولێر، رەواندز، کۆیە، شەقڵاوە، ئیستیرحام ئەکەین معاوەنەتی بفـەرمون و بەدەلاتەکـەی بـە تـەواوی تەسـلیم بکەن."

لە ژ 220 یش دا ئەم ئاگاداریەی بڵاو کردۆتەوە:

"تکایەکی تایبەتی

"ئیدارەی غەزەتەکەمان، بۆ کۆکردنەوەی بەدەلاتی ئابونە، ئەوی لە خزمەت ئەو زەواتە کیرامانەیە کە لـە بەغدادن، جەنابی شاکیر موجریم ئەفەندی کردوە بە وەکیل، دەفتەرێکی موسەدەقی بۆ نـاردوە، ئیسـتیرحام لـە مشتەریەکانی بەغدادمان ئەکەین ئەو میقدارە پارەیەی کە لە خزمەتیانایە و کە لای شاکیر ئەفەندی مەعلومە بـە تەواوی تەسلیمی بفەرمون.

"ئومێدی قەویمان بە کریـارە موحتەرەمـەکانمان هەیـە کـە بـۆ یاریـەدانی غەزەتەکـەمان هـەمو نەوعـە معاوەنەتێک دریغ نەفەرمون و تیکراری ئیستیرحام ئەکەین بەدەلاتەکەی بە تەواوی تەسلیم بفەرمون. ژیان"

پیرەمێرد، شێخی رۆژنامەوانەکانی کورد، لە (**ژیان**، ژ 458 ی، 12 ی تشرینی یەکـەمی 1935) دا لـە ژێر سەردێری: (ژیان و ئاخر قسەی) دا بە تورییەوە نوسیوێتی:

"ژیان، ئەمە ساڵێک و دو مانگ لە ساڵ تێپەری کە بۆ ئابونەکانمان دەچـێ. هەنـدێ پارەیـان نـەنارد. چەند زەواتی کیرامان هەیە کە میللەتپەروەرن و، دارا و، بووەن، رۆژی وا هەیە چارەک دیناری بە هەوا خەرج ئەکەن بە ساڵێ چارەک دیناری بۆ رۆژنامەکەی خۆیان نانێرن، کـە کوردسـتان هـەمو چرایـەکی کوژاوەتـەوە

تەنها ژیانی رەنگێکی میللەتەکەی خۆی دەنوێنێ و، تا ئێستا بۆ هەمو تەنگانەیەک لە پێشـەوە بـوە و لـە هـیچ نەترساوە و نایشترسێ. خوا یاربێ، لە هیچ لایەکیشەوە هیچی بۆ نەیێ هەر دەژی. خۆی پیـرە بـەڵام رۆحـی نەوجەوانانی لە پشتە، ئەو نەوجەوانانەی کە بۆ پارێزگاری میللەتەکەیان لە مەیـدان نـەعرەیان کێشـا و ژیـانی پیریان هێنایە جۆش.

"ژیان هەنـدێ پارچـەی وەک رۆحـی مەولـەوی و، پەنـدی پێشـینان و، دوازدە سـوارەی مـەریوان و، مـەم و زینی تیایە، کە کۆلیکسیۆنەکەی بە دینارێکە، چ جای ئەمە ساڵی صەد و پەنجا فلسمان بە پولی پۆستەی داوە.

"ئەوانەی کە بۆمان ناردون بە پیاومان ناسیون، ئێستا ئەگەر پارەی ئابونـە نـەنێرن، چونکـو عەکسـی ئەمەلن، ئیتر رۆژنامەیان بۆ نائێرین و، لە مەودوا هەرکەسێکیش پێشین پارە نەنێرێ رۆژنامەی بۆ ناچێ.

"تا هەفتەی ئایندە هەرچی پارەی ئابونەی نەداوە لە ژێر ناوی سەرچەوتیدا ناوی ئیعلان ئەکەین. ئیتر کەیف و خەتای خۆتانە!"

هەر پیرەمێرد لە (ژین، ژ 562، 13ی نیسانی 1939) دا لە ژێر سـەرناوی: (گلەییـەکمان لـە زاتێکـی بزورگ) دا نوسیوێتی:

"جەنابی جەمیل ئاغای سەرداری عەشرەتی هەمو گەردی 3 ساڵ لەمەوپێش لـە خدمـەت ئەحمـەد بـەگی موتەصەرپفی هەولێردا خۆی و 3 رەئیسی ئابونەی ژیان بون. 2 ساڵ بە پۆستەدا بە واسیتەی وەستا ئـەمینی بەربەرەوە لە هەولێر غەزەتەمان تەقدیم کردن، قدومی غەزەتەیشی بۆ بەخێر گەڕا، ئـەو هـەمو دەوڵەتـە معاشـی مەبعوسی یشی چوە سەر، ئێمە لە بیر چوینەوە، وامان زانی چونکە بە هەمو کوردەواری تەنها چاوێکمان هەیە کوێری ناکەن!"

لە سەر هەمان بابەت لە (ژین، ژ 565، 11 ی مایسی 1939) دا نوسیوێتی:

"جاری بەرو نوسی بومان کە جـەنابی جـەمیل ئاغـای گـەردی و 3 ئاغـای تریـان ئابونـەی 2 سـاڵی ژیانیان لە لایە بۆیان نەناردوین، هیچ دەنگێکیان نەبو، وا دوبارەمان کردەوە ئەگەر ئەمجارەیش جـواب نـەبێ بە رادیۆ داوایان لێ دەکەین."

دیسان لە (ژین، 571، 22 ی حوزەیرانی 1939)دا نوسیوێتی:

"یەکدوجار لە غەزەتەدا بە گوێی جەمیل ئاغای گەردیمانا هەڵدا کە پارەی ئابونەی ژیانمان بـۆ بنێـرێ نەی بیست ناچار ماین لە مەحکەمەدا ئیقامەی دەعوامان کرد. رۆژی 22 ی 7 ی 939 میعادی محاکەمەیە ئەو رۆژە هەرکەسێ لە هەولێرەوە بۆ سەیری محاکەمە بێت ئیدارەی ژین مەسرەفی ئەکێشێ."

دیسان لە (ژین، ژ 581، 21 ی ئەیلولی 1939) دا نوسیوێتی:

"سپاسی ئاشکارا

"ئێمە لە هەمو شیمالی کوردستان دا لە سەر قەڵای هەولێر چرایـەکی عـیلم و سـەماحەتمان هەیـە نـاوی گچکەیە خۆی زۆر گەورە و مەزنە، مەولەوی یش مەعدومە، ئیستایش مەوجودە.

"ئـەم زاتـە کـە ئـەمرۆ ئەمسـالی نـەماوە و یەگانـە شەخسـە ئـەمجارە بـەیانی خۆشـنودی دەربـارەی غەزەتەکەمان فەرموە، ئەمە بۆ ژین سەرمایەی ژینە، وە بە ڕاستی یش ژین خۆی دەیەوێ بۆ خدمەت ئەو بچـێ چونکو تێی دەگا، خاوەندی ژین ساڵی سێ رۆژ بە تایبەتی ئەچێ بۆ خدمەت سەید ئەحمـەدی خانـەقا تـەنها بۆ ئەوەی کە تێی دەگا، رەند و قەلەندەر لە کێوی عەرەفات یەکتریان ناسـیوەتەوە، ئێمـە بـێ مـەعنای ئـەڵێین نەکا جابێ سەید نوکتەیەکی پیرێژنی تێ خا.

"بڵێین چی شیمال ئەم نەوعە زەواتەی تیایە، لەو لایشەوە جـەنابی جـەمیل ئاغـای گـەردی بـۆ بـەدەلی ئابونە خستینیە محاکەمەوە ناچار ماین حوکمی مەحکەمەمان وەرگـرت داومانـە بـە دائیـرەی ئیجـرا چونکـو

دەرەجەی ئیقتیـداری ئینکـار نـاکرێ. تـەبیعی لـە دائیـرەی ئیجـرا تەڵـەبی حەپسـمان کـردوە و تـەنفیزیش دەکرێ..... (لە بەر دڕانی لاپەڕەکە ناخوێنرێتەوە)"

**2. 4. روناکی**

حسێن حوزنی موکریانی یش لە (ژ 10 ی، 25 ی نیسانی 1936 ی **روناکی**) دا لە ژێـر سـەرناوی: (پاڕانەوە و تکا و خواهیشت) دا نوسیوێتی:

"لە بەر ئەوە کە ئەم مەجەللە جگە لە دراوی موشتەریکە موحتەرەمەکان چی ڕێگایـەکی دیکـەی نیـە بـۆ خۆ ژیاندن، بە تایبەتی لە بەر موشتەریکە خۆشەویستەکان دەپاڕێینەوە، بۆ ئەمە کە ئەم مەجەللە ئیدارە بکـرێ و نەکەوێ، بەدەلی ئیشتیراکی ساڵانەمان پێ لوتف بفەرمون."

هەروەها لە (ژ 11 ی، 16 ی مایسی 1936 ی روناکی) دا لەوتارێکیدا لە ژێر سەرناوی: (فەیلەسوف مەرحوم جەمیل صدقی زەهاوی) دا نوسیوێتی:

"کتێبە چاپکراوەکانی ئێمە ئەمڕۆکە گەیشتۆتە 22 نوسخە و، چاردە جلد کتێبی گـەورەم نوسـراون و، حازرن و چاپ نەکراون، هەروا ماون. وە لە ئیحتیرام و نان، رۆژی صەد پایە سەرەوژێرم نەک بەرەوژور. کـە داوای حەقی نوسخەیەکی کتێب لە گەورەیەکی کورد بکرێ وەدەزانـێ سـواڵ (دەرۆزە) ی لـێ دەکـرێ، کـە لـە گەلێک جێگایان ڕوی داوە. لە هەرە گەورەکانی کورد، لە عاصیمەیە داوای بەدەلی ئابونـەی سـاڵێکی مەجەللـەی روناکی، کە 750 فلسە، لێ کرا بو، فەرمو بویان بـە مەرقـەدی بـاوکم فلوسـێکم نیـە بـەڵام مانـگ بـە مانـگ مومکینە بیدەم، ئەگەرچی 50 – 60 دینار جیرە وەردەگرێ."

**2. 5. گەلاوێژ**

گەلاوێژ کە لە سەردەمی خۆیدا خوێنـدەوارێکی زۆری هـەبوە و، رۆشـنبیرانی کـورد بـە تـەنگ مـان و دەرچونی بەردەوام و ڕێکوپێکی گۆڤارەکەوە بون. لـە سـاڵی یەکەمیـەوە تـا داخرانـی لـە سـاڵی دەهـەمیدا، بەردەوام هەمان کێشەی هەبوە.

لە ژ 5 و 6 ی مایس و نیسانی 1940 دا کە هێشتا لە ساڵی یەکەمی تەمەنیدا بو نوسیوێتی:

"تکا: هەتا ئیستە بەشی زۆری خوێندەواران پارەی ساڵانەی گەلاوێژیان نەناردوە لامان وایـە ئەمـە لـە بەر ئەوەیە کە نازانن بۆ کوێ و بۆ کێی بنێرن بۆیە تکایان لێ ئەکەین کە ساڵانەی گەلاوێژ بەم ناونیشانەیە و بە پۆستەدا بینێرن:

بغداد: فندق وادی السلام

ابراهیم احمد محامی

ئیتر هیوامان هەیە گەلاوێژ فەرامۆش نەکەن. گەلاوێژ"

دیسان لە ژ 7 ی حوزەیرانی 1940 دا نوسیوێتی:

"تکا: تکا لەو خوێندەوارانە ئەکەین کە هێشتا پارەی ئابونەیان نـەداوە بـە حەواڵـە بـەو ناونیشـانەی خوارەوە بۆمانی بنێرن:

بغداد: فندق وادی السلام ابراهیم احمد"

لە ژ 8 ی تەموزی 1940 دا دیسان نوسیوێتی:

"تکا لە خوێندەوارە خۆشەویستەکانمان: لە کاتێکدا کە ئومێـد ئـەکرا گـەلاوێژ بـە تاقانـە نەمێنێتـەوە کەچی داخەکەم ئیستا خواخوای ئەوەمانە بتوانین خۆیمان پێ بە خێو بکرێ، ژمارەی ئەم گۆڤارە هەتا ئیسـتا

گەیشتۆتە 9 هێشتا زۆری وا هەیە گەلاوێژ سفتاحی لە دەستی نەکردوە. ئینجا لە بەر ئەوەی ناتەواوی گەلاوێژ، کە لە دەمێکەوە ئاواتەخوازی هەلاتنی بوین، ناتەواوی کوردزبان پیشان ئەدا، هیوامان هەیە بۆ یاریدەدانی هەرکەسێ بە پێی توانای هەوڵ بدا تاکو گەلاوێژ هەمیشە گەش و روخۆش بێ"

لە سەر وتاری ژ 11 و 12 دا کە پێکەوە لە بەرگێک دا دەرچون نوسیوێتی:

"گەلێ تکامان لەو خوێندەوارانە کرد کە تا ئیستە پارەی گەلاوێژیان نەداوە بینێرن، داخمان ناچێ هیچیان دیار نەبو. ئیستەش کەوا ساڵی یەکەم ئەبڕێتەوە نزیکەی 200 کەس ئابونەیان لا ماوە. ئینجا تکامان لەم خوێندەوارانە ئەوەیە کە لەم مانگەدا ئابونەکەمان بۆ بنێرن و، ئەگەر گەلاوێژیان ناوێت ئاگادارمان بکەن، کەڵەشێریش نەبێ خوا ڕوژ ئەکاتەوە! ئیتر لە گەلاوێژیش گەشی و لە خوێندەوارانی بە هیمەت یارمەتی."

دوای چەندین ساڵ ئەم گرفتەی گەلاوێژ هەر بە چارەسەرنەکراوی ماوەتەوە، بەم هۆیەوە توشی کێشەی کەمدەرامەتی بوە. خەریک بون گۆڤارەکە بوەستێنن. بەم بۆنەیەوە پیرەمێرد لە (ژین، ژ 876 ی، 26 ی حوزەیرانی 1947) دا لە ژێر سەردێری: (بەرەو دوا) نوسیوێتی:

"ئۆف عەلائەدین رۆڵەی باوانم

"ئاگرت بەردایە ژین و ژیانم

"ئێمە لەم دوایی رۆژەمانا هیوایەکی تازەمان بۆ پەیدا بو کە میللەتەکەمان بە خۆیانا هاتون و کەوتونە سەودایەکی خۆ بە خەڵک ناسین و، نیازیانە بکەونە ریزی میللەتە خواپێداوەکان و، ئەم هیوایەیش زۆرتر بەوە پەیدا بو کە لە پایتەخت دا گۆڤارێکی کوردی چاک و پاک و روناکمان هەیە وەک گەلاوێژ بە هەمو لایەک دا شەوق و پرشنگی ئەروا و هەست و زانستی کوردان لەو تریفەی نوری ئاسمانی دا دەردەخا. چەند خۆش بو لە ئێران و توران و لوبنان و کۆنە شاری فیرعەونەکانا دەنگی دابوەوە. بارەها ژیان و ژینم لە دەور ئەگێڕا و بە نەغمەیەکی دڵشادیەوە ئەمنوسی: (گەلاوێژ خوشکە باڵا بەرزەکەی ژین) و، ساڵەوساڵ بالۆرەیەکی پیرۆزانەم بۆ ئەگوت. کەچی لە کەچی بەختی ئێمە و کەچرەوی گەردون ئەو پەریە نازدارەمان کەوتۆتە گیانەڵا. ئەمەیش دیارە لە بەر ئەوەیە کە پارەی ئابونەی بۆ نانێرن.

"مادام گەییە ئێسکم با پەردە لە روی پەچەپۆشەکان هەڵماڵم. هەر لەم شاری خۆمانەدا زۆری وا هەیە کە نازانێ بە ریکوپێکی عەرەبی بخوێنێتەوە ئابونەی یەکدو غەزەتەی عەرەبی پێشەکی ئەنێرێ غەزەتەی بۆ دێت. هی وایشمان هەیە رەهبەری ئەکا غەزەتەیەک بە تەواوی ئەژێنێ. لە شارەکەی خۆمانا چەند دەستەیەک و کۆڕی پۆکەری مەکشوف ئەبینم هەمو خۆیان بە ئەدیب و شاعیر و مەلیک ئەل شوعەرا و مەنسوبی مەعاریف ئەزانن شەوی وا هەیە پارەی ئابونەی دە ساڵی گەلاوێژی تیا ئەبڕێتەوە کە بە رۆژ باسی پارەی ئابونەی گەلاوێژی لە لا بکەی وەک شەمشەمە کوێرە چاو ئەقوچێنن. کە ئیش یەتە مەیدانی میللیەتپەرەوەری بە باڵ ئەفڕن، لاوە قوڕ بە سەرەکانیش بەم چەکە و کەوانەوە کەوتنە سەودای قەومیەتەوە، دیارە گەنجێک کە هێشتا نەکەوتۆتە دەست و مەقامی خۆی و پارەی نیە، دڵ بە پارەدارەکان ئەبەستێ. تو خوا میللەتێک کە دەربارەی سەقافە و چرای رێی بەختیاری خۆی وا بجوڵێتەوە چ حەقێکی هەیە بە لاوە بڵێت تۆ بۆچ نامناسیت؟ وەڵڵا بە هەمو مەعنایەکەوە کسپە لە دڵمەوە دێت کە ئەم سەجییەی پیاوماقوڵ و پارەدارانە ئەخەمە پێش چاوی دۆست و دوژمن. تفی بەرەو بایە. بەڵام ئەڵێی چی؟ وا نوسیم بۆ ئیدارەخانەی گەلاوێژ دەفتەری ئەو نامەردانەم بۆ بنێرێ و وەکالەتیش وەرئەگرم. هەر بۆ بەدناوی و تەرزیل کردنیان ئیقامەی دەعوا ئەکەم. برایمیش ناکەم بە وەکیل. ئەوقاتێکی لاوە دێنم بە مەسرەفی محاکەمە و (ناوی مەنێ) لێ نانەوە ئەو پارەیەیان لێ ئەسێنم. شەرتە بۆ ژینیش تەنها یەک زات لە بەگزادە بەو دەردە بەرم. خوا لە وەجاخیا نەیەڵێ ع. ح."

گەلاوێژ لە هەندێ ژمارەکانیدا ناوی هەندێ لە قەرزدارەکانی بڵاو کردۆتەوە، بەڵام ئەویش بێ سود بوە.

لە ژ 1 ی ساڵی 10 ی کانونی دوەمی 1949 دا کە دوا ساڵی تەمەنی بوە (مەساریفی ژ 1 ی ساڵی 10 ی) بڵاو کردۆتەوە مەسرەفی ئەو ژمارەیە 54 دینار بوە، بەڵام دەرامەتی گەلاوێژ لەو مانگەدا 39 دینار بوە، واتە 15 دینار کورتی هێناوە، خۆی بە توانجەوە نوسیوێتی: "جارێ وا لەم سەرەتای ساڵەدا کورتی بو بە ئەمەندە".

هۆی ئەم خوێنساردیەی خوێندەواری کورد بەرامبەر ئابونەی ڕۆژنامە و گۆڤاری کوردی، زیاتر لەوەی دەسکورتی دارایی خوێندەوارەکە بێ، ئەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە خوێندنەوەی ڕۆژنامە و گۆڤار لە لای کورد هێشتا نەبوە بە خو، وەکو لای گەلانی ئەوروپی و، دانیشتوانی هەندێ لە پایتەختەکانی وڵاتانی ناوچەکە، بوە بە خویەکی ڕۆژانە.

جا بۆچی نەبوە بە خو؟ ئەهێنی لێکۆڵینەوەی تایبەتی مەیدانی و ئاکادیمی لە سەر بکرێ.

### 2. 6. هەتاو

لە ژمارەی ڕۆژی 2 ی 12 ی 1960 ی ڕۆژنامەی ژیندا گیوی موکریانی، خاوەنی ئیمتیازی گۆڤاری (هەتاو) ی هەولێری، ئەم نامە کراوەیەی بڵاو کردۆتەوە، هەواڵی داخرانی هەتاو بە بەشدارەکانی ئەدا:

"چاپخانەی کوردستان

"ساڵی 1915 دامەزراوە 8 ی 12 ی 1960

"بۆ بەشدارە بەڕێزەکانی گۆڤاری هەتاو!

"دڵسۆزی بەرز و بەڕێز و خۆشەویست!

"ڕۆژتان باش، بە پەرۆشەوە پێتان ڕادەگەیەنم کە گۆڤاری ڕەنجکێشی (هەتاو) چیتر دەرناچێ. وە منیش بە هەویای قەرزەکانی هەتاوەوە زۆر وەڕێر باری قەرزداری و نەهاتی کەوتوم و، لە ئێوەش بەدەر کەسێکی ترم نیە کە باری سەرشانم سوک کات، بەڵکو چاوم تەنها لە یارمەتی و پیاوەتی ئێوەیە.

"مەبەستیشم لە یارمەتی ئێوە تەنها ئەوەیە کە ئێوە (چەندەی) قەرزداری هەتاون، کە بۆ ئێوە ئەرکێکی وای نیە، بەڵام بۆ من کەلێنێکی گەورە پڕ دەکاتەوە. بەو هۆیەوە ئومێدم وایە کە لە ڕوی دڵسۆزیەتیەوە بە زوترین کات بینێرن، چونکو لەمەودوا خەریکی چاپی فەرهەنگی کوردی و عەرەبی و کتێبانی مێژویی وێژەیی دەبم، دڵنیام خوا یار بێ لەمەودوا زۆر خزمەتی لە هەتاو گرنگترتان پێشکەش دەکەم.

"هەر یارمەتیەکی من بدەن، یارمەتی چاپخانەی کوردستان دەدەن، ئەو چاپخانەیەی کە 47 ساڵی ڕەبەقە، بە بێ یارمەتی و بە بێ وەستان، خزمەتی زمان و وێژە و مێژوی ئێوە دەکات. کەوایە چاپخانەی خۆتانە، جا بۆ ئەوەی کە چاپخانەی کوردستانیش لە بەر قەرزداری و هەژاری نەکەوێتە ژێر هەوری نەگبەتیەوە، هانام بۆ ئێوە هێناوە و، چاوەڕێی مرۆڤایەتی و ئاکاری مەردانەتانم.

گیو موکریانی"

## 3. رۆژنامەی (أختر) ی ئەستەموڵی و هەواڵی کورد

### 3. 1. رۆژنامەوانی بە فارسی لە تورکیا

لە 1729 دا لە تورکیا چاپ دامەزراوە. بەم دەزگایە چەندین کتێبی فارسی چاپ کراوە.

ساڵی 1831 ز/ 1247 ک (**تقویم وقایع**)، یەکەمین رۆژنامەی تورکی رەسمی دەرچو.

دەرچـونی یەکـەمین رۆژنامـەی تـورکی نزیکـەی 60 سـاڵ دوای نوسـینی سـتونە فارسـیەکانی رۆژنامەکانی کەلکەتە و 9 ساڵ دوای رۆژنامەی (**مرات الاخبار**) ی فارسی و، 6 سـاڵ پـێش (**کاغـذ اخبـاری**) میرزا ساڵحی شیرازی، یەکەمین رۆژنامەی فارسی لە ئێران، بڵاو بۆتەوە.

هونەری چاپ و رۆژنامەوانی لە قەڵەمرەوی عوسمانیدا لە چاو ئێران دا زوتر داهاتوە و، ئەگـەرچی لـە ژێر چاودێری حکومەت دا سانسۆری بە هێزی لە سەر بوە، بەڵام پێشکەوتو تـر بـوە. بـۆ ئـەوەی وێنەیـەکی بەراوردکارانەی رۆژنامەوانی ئـەو سـەردەمەی نـاو دەوڵـەتی عوسـمانی و دەوڵـەتی قاجـاری ئێرانـی بهێنینـە بەرچاو، چاک وایە ئەم هەواڵەی أختر وەکو خۆی بنوسینەوە.

ژ 7 ی ساڵی سێیەمی 24 ی شوباتی 1877 (10 صفر 1294) ی أختر نوسیوێتی:

"ئەو رۆژنامە و گازێتانەی لە ئیسلامپول و بیک ئۆغلی چاپ ئەکرێن جگە لەوانەی داخراون بە تەرتیبی حروفی هیجا ئەنوسرێن:

| ناوی رۆژنامە تورکیەکان | رۆژانی چاپ |
|---|---|
| اتحاد | هەمو رۆژێ جگە لە هەینی |
| استقبال | وەکو ئەو |
| بصیرت | وەکو ئەو |
| تقویم وقایع | رەسمیە دو جار چاپ ئەکرێ |
| جریدە حوادث | هەمو رۆژ جگە لە یەکشەمە |
| چایلاق | گاڵتەجاڕیە و حەفتەی دو رۆژ |
| جریدە عسکریە | دوشەمە و سێشەمە |

﴿ شماره ﴾ ۱ ﴿ سال بیست ویکم ﴾ ۱

( مطبعه واداره خانهٔ اختر )

اسلامبول خان والده در دائرهٔ مخصوصه است کارهای متعلق باداره باقا محمد طاهر راجع است

اسامی وکلای کرام در ممالک دور ونزدیک گاهی در صفحهٔ آخرین نگاشته میشود

سه‌شنبه ۶ محرم ۱۳۱۶

۲۸ حزیران ماه رومی سنه ۱۳۰۹

۱۰ زوئیه ماه فرنگی سنه ۸۹٤

اختر

۱۲۹۲

L'AKHTER

( تعرفه بهای سالیانه )

درسعادت ٤ مجیدی سیم
دیگر ممالک محروسهٔ عثمانی ٥ مجیدی
ممالک محروسهٔ ایران ۲۵ قران
ممالک هندوستان وبنادر ۱۲ روپی
ممالک روس وقفقاز ۱۰ منات
ممالک اروپ ۲۵ فرانک
یک نسخه ۶۰ پاره است
اجرت پوست همه جا بعهدهٔ اداره است.

منشی اول حاجی میرزا مهدی تبریزیست

( دراین روزنامه از هرگونه وقایع واخبار وسیاسیات وپولیتیک وعلم وادب ودیگر منافع عمومی سخن گفته میشود. هفتهٔ یکبار طبع )
( میگردد اوراق ونوشتهای سود مندرا بامتنان میپذیریم • درنوشتن کاغذهایی که از خارج میرسد اداره مختار است• کاغذی راکه )
( نوشته نمی شود صاحبش حق استرداد آنرا ندارد کاغذ هایی‌که پول پوست ندارد گرفته نمی شود • )

( فهرست مندرجات )



﴿ عرض مخصوص ﴾

سپاس خدای را که مارا توفیق کرامت فرمود بدین سال بیست ویکم انتشار اجرای روزنامه‌که خادم حقیقی اسلامیت وانسانیت است .

بزرگان ملت را پوشیده نیست که از آغاز تأسیس این نامه ازمقصود اصلی که خدمت بعالم اسلامیت وانسانیت است بقدر قوه انحراف نورزیده‌ایم وپیشرفت آن مقصود مقدس را برهمه چیزی مقدم داشته باوجود صدمات متوالیه بقدریکه مقدور بوده بحصول آن مقصود همت گماشته ایم . واین بارگران را درظرف این مدت طولانی بتنهایی بدوش کشیده چون سایر روزنامها ازهیچ طرفی وظیفه ومعونتی نداشته‌ایم مگر معدودی ازبزرگان ملت که گاهی باقتضای قدر شناسی وبلندی همت مبلغی اعانت فرموده اداره‌را مرهون منت خود داشته‌اندکه تاحیات داریم انسانیت ایشانرا فراموش نکرده زبان ازثنایشان کوتاه نخواهیم داشت. ازهموطنان محترم‌که درممالک محروسهٔ عثمانی وخطهٔ وسیع هندوستان ومملکت قفقاز اقامت وتجارت دارند وازمشترکین روزنامه هستند نیز نهایت تشکر را داریم زیرا که این جوانمردان باقتضای بصیرتی‌که دروضع خارجه دارند بیش ازدیگران ازمراتب منافع روزنامه آگاهی حاصل نموده وجه روزنامه را مانند سایر ملل پیشکی میپردازندکه درحقیقت پیشرفت امور اداره‌ماز این رهگذر است، بالعکس ازمشترکین محترم ممالک محروسهٔ ایران دربعض نقاط اداره یکساله بلکه هیجده ماهه طلبکار است وسبب عمدهٔ این معنی نیز مسامحهٔ وکلای محترم است وگرنه مشترکین گرامی باورنداریم‌که درادای این مبلغ جزئی تااین پایه ایستادگی نمایند . زیرا که میدانند بسبب تنزل

| | |
|---|---|
| جریده طبیه عسکریه | حەفتەی یەک جار |
| حقیقت | هەمو رۆژێ جگە لە هەینی و یەکشەمە |
| خیال | گاڵتەجاڕییە حەفتەی 3 جار |
| صداقت | هەمو رۆژێ جگە لە یەکشەمە |
| صباح | هەمو رۆژێ جگە لە یەکشەمە |
| لطیفه | گاڵتەجاڕییە و حەفتەی 2 رۆژ |
| مدنیت | وێنەدارە بە جۆرێکی دیاری نەکراو چاپ ئەکرێ |
| مساوات | هەمو رۆژێ جگە لە یەکشەمە |
| وقت | هەمو رۆژێ چاپ ئەکرێ |

**رۆژنامەی فارسی و عەرەبی:**

| | |
|---|---|
| اخبار دارالخلافه | رۆژانی چوارشەمە |
| اختر | رۆژانی شەمە و چوارشەمە |
| الجوائب | عەرەبییە رۆژانی چوارشەمە چاپ ئەکرێ |

**گازێتەکانی کە بە زمانی فەرەنسییە:**

| ناو | رۆژانی چاپ |
|---|---|
| استانبول | هەمو رۆژ جگە لە یەکشەمە |
| اوربان فینانسیه | هەفتەی 1 جار |
| پتی ژورنال دەقستنتینوپول | هەمو رۆژێ جگە لە یەکشەمە |
| ژۆرنال دە زمستیوتر | هەفتەی 1 جار |
| سیما فور دە قستنتینوپول | هەمو رۆژێ جگە لە یەکشەمە |
| فار دو بۆسفۆر | وەکو ئەو |
| فوریە دوران | وەکو ئەو |
| لاترکی | وەکو ئەو |
| لوانت هرالد | وەکو ئەو |

**رۆژنامە بە زمانی رۆمی**

| | |
|---|---|
| اسیا صغرا | هەمو رۆژ |
| انا تولیقوس استیر | هەفتەی 2 جار |
| ویزانتیس | وەکو ئەو |
| تراکی | هەمو رۆژێ جگە لە یەکشەمە |
| فلوقس | هەفتەی 1 جار |
| مومۆس | هەفتەی 2 جار |
| نیولوغوص | هەمو رۆژێ جگە لە یەکشەمە |

**ڕۆژنامە بە زمانی ئەرمەنی:**

| | |
|---|---|
| اوودابر | ڕۆژانی شەمە |
| پونج | شەمە و چوارشەمە |
| لویس | وەکو رسالە مانگی جارێ |
| ماسیس | سێشەمە و پێنجشەمە و شەمە |
| مامول | چوارشەمە و شەمە |
| منظومة افکار | هەمو ڕۆژ جگە لە هەینی و یەکشەمە |

**ڕۆژنامە بە زمانی بولغار:**

| | |
|---|---|
| استوچنو ورورمە | هەفتەی 1 جار |
| ناپرەداق | وەکو ئەو |

**ڕۆژنامە بە زمانی یەهودی**

| | |
|---|---|
| تسامسیو | هەمو ڕۆژێ جگە لە هەینی و شەمە |
| ژورنال ناسیونال | هەمو ڕۆژێ جگە لە هەینی و یەکشەمە |

"لە ولایاتی مەمالیکی پارێزراوی عوسمانیەدا، لە هەر یەکێکیان دا یەکێ و، لە هەندێ شوێن چەندین ڕۆژنامە چاپ ئەکرێ، کە ژمارەیان نزیکەی 30 گازێتی ڕۆژانە و هەفتانە ئەبێ. وە لە 31 جێ لە ولایاتی باسکراو ساڵنامەی جیا چاپ و بڵاو ئەکرێتەوە.

"لە ئیسلامبول و لای بیک ئۆغلی جگە لە چاپخانەی دەوڵەتی 62 باسمەخانە و چاپخانە هەیە کە هەمیشە لە کاردان."

ساڵی 1846 سوڵتانی عوسمانی چەند بڕیارێکی دەرکرد، سنوری ئازادیی ڕۆژنامەوانی تەسک کردەوە. ساڵی 1867 (عالی قرارنامە) دەرچو. ئەم قەرارنامەیە بە ناو بۆ ریفۆرم دەرچو، بەڵام بڕیارە توندەکانی پێشوی خاوتر و کۆتوپێوەندەکانی ئازادیی ڕۆژنامەوانی شلتر نەکردەوە. سەرەڕای ئەمەیش ساڵی 1876 دەزگایەکی تایبەتی بە ناوی (ئیدارەی مەتبوعات) هوە بۆ سانسۆری ڕۆژنامەکان دانرا. زۆر جار ڕۆژنامەکان دائەخران و ڕۆژنامەوانەکان توشی سزادان ئەبون.

ئەو کۆتوپێوەندانەی ئازادیی ڕۆژنامەوانییان سنوردار ئەکرد تا ئینقیلابی عوسمانی (1908) مایەوە.

بۆ ئەوەی بەراوردکاریەکە رونتر بێ ئەمە گەشتێکە بە مێژوی ڕۆژنامەوانیی ئێرانیی ئەو سەردەمەدا:

1836 (1252 ک) دەرچونی (طلیعە کاغذ اخبار)

1837 (1253 ک) دەرچونی کاغذ اخبار

1848 (1265 ک) دەرچونی زاهریرا دی باهرا (تیشکی ڕۆشنایی). ئەم ڕۆژنامەیە مژدەدەرانی مەسیحی بە زمانی سریانی لە ورمێ دەریان کردوە.

1850 (1267 ک) دەرچونی وقایع اتفاقیە

1858 (1275 ک) دەرچونی روزنامەی ملتی مملکت محروسە انربایجان (اخبار دار السلطنە انربایجان)

| | |
|---|---|
| 1860 (1277 ک) | دەرچونی روزنامەی دولت علیه ایران |
| 1863 (1280 ک) | دەرچونی روزنامه علمیه دولت علیه ایران |
| 1866 (1283 ک) | دەرچونی روزنامـه دولتـی، روزنامـەی علمیـه دولـت علیـه ایـران، روزنامـه ملت سنیه ایران (روزنامه ملتی)، روزنامه حکیم الممالک |
| 1867 (1284 ک) | دەرچونی روزنامەی اردوی همایون |
| 1870 (1287 ک) | دەرچونی روزنامەی وقایع عدلیه |
| 1871 (1288 ک) | دەرچونی روزنامه ایران و روزنامه مرات السفر |
| 1872 (1289 ک) | خولی دوەمی روزنامەی ملتی محروسه انربایجان<br>دەرچونی روزنامه (المنطبعه فی الفارس) |
| 1873 (1290 ک) | دەرچونی لاپاتری (نیشتمان) دوای ژمارەی یەکەمی داخراوە.<br>دەرچونی روزنامه نظامی علمیه و ادبیه، روزنامه علمی |
| 1878 (1296 ک) | دەرچونی پەخشەی مریخ، فرهنگ و تبریز |
| 1879 (1297 ک) | دەرچونی جریده تجارت بڕوانە: (سید فرید قاسمی، تـاریخ روزنامـەنگاری ایران، جلد دوم، سازمان چاپ و انتشارات وزارت فرهنگ و ارشاد اسلامی، تهران 1379، ص 611 - 613) |

لێرەدا پێویستە چەند سەرنجێ تۆمار بکرێ:

**یەکەم**، ئەم رۆژنامانە هەمویان حکومەتی بون. لە لایەن کاربەدەسـتانی قاجـارەوە دەرکـراون. زۆریـان تەمەنیان کورت بوە. پاش چەند ژمارەیەک یان پاش چەند ساڵێک داخراون.

**دوەم**، رۆژنامـەکانی وقـایع اتفاقیـە، روزنامـە دولـت علیـە، ایـران، بـە درێژایـی دەیـان سـاڵ بـە دوای یـەک دا دەرچـون بـۆ تۆمـارکردنی فـەرمانی رەسـمی و هـەواڵ و رووداوەکـانی دەربـاری ناسرەدین شا.

**سێیەم**، ئەگەرچی ئەم رۆژنامانە هەمویان کاربەدەستانی دەرباری قاجار دەری کردون و حکومەتی بـون و هیچ رۆژنامەیەکی ئەهلی لەو ماوەیەدا ریگای دەرچونی نەدراوە، لە گەڵ ئەوەیشدا ناسرەدین شا بـۆ ئـەوەی بە تەواوی رێ لە ئازادی بیر و رۆژنامەوانی ببـڕێ سـاڵی 1287 فـەرمانی (سانسـۆری مـەتبوعات) و سـاڵی 1296 (قانونی جەزا) ی دەرکرد.

**چوارەم**، رۆژنامەکانی ئێران لە روی هونەری رۆژنامەگەریەوە لە چاو رۆژنامـەکانی وڵاتـی عوسـمانیدا دواکەوتو بون. ژمارەیەکی زۆر کەمیان نەبێ کە بـە پیتـی قورقوشـم چـاپ کـراون ئـەوانی تـر هـەمویان بـە دەسخەت نوسراون و بە چاپی سەنگی چاپ کراون.

## 3. 2. دەربارەی رۆژنامەی أختر

### 3. 2. 1. دەرچونی

ژ 1 ی سـاڵی یەکـەمی لـە پینجشـەمە 13 ی کـانونی دوەم (ژانویـە) ی 1875 (16 ی زیلحیجـەی 1292) لە ئەستەموڵ چاپ و بڵاو کراوەتەوە و.

دوایـــین ژمـــارەی ژ 10 ی ســـاڵی 23 هەمـــە لـــە 8 ی ئـــەیلول (ســـەپتەمبەر) ی 1896 (30 ی رەبیعولئەوەلی 1314) دەرچوە.

له سەرەتادا حەفتەی 5 جار و، له ساڵی دوەمیەوە حەفتەی 2 جار ڕۆژانی دوشـەمە و چوارشـەمە و لـە ساڵانی دوایی‌دا حەفتەی 1 جار بڵاو بۆتەوە.

له مـاوەی دەرچـونی‌دا چەنـد جـارێ بـە هانـدانی کاربەدەسـتانی ئێرانـی و چەنـد جـارێ لـە لایـەن کاربەدەستانی عوسمانیەوە داخراوە.

مودیر (بەڕێوەبەر و خاوەنی) اختر محەمەد تاهیر قەراچە داغی تـەبریزی (؟ - ئەسـتەموڵ 1325 ک) بوە کە بازرگان و خاوەن چاپخانە بوە و، مونشی ئـەوەل (سەرنوسـەر) ی ڕۆژنامەکـە یـش میـرزا مەهـدی خانی تەبریزی (تەبریز 1255 – ئەستەموڵ 1325 ک) بوە. میرزا مەهدی هەر بەم بۆنەیەوە بە أختـر نـاو نراوە. بڵاوکەرەوەی ڕۆژنامەی (حکمت) ی قاهیرەیی یش ناوی میرزا مەهـدی خـان بـوە. ئەگـەرچی هاونـاو بون، بەڵام دو کەسی جیاوازن.

### 3. 2. 2. بڵاوبونەوەی

اختر وەکـو خـۆی نوسـیوێتی لـە چەنـدین شـاری عوسـمانی و ئێرانـی و هینـدی و قافقاسـی دا بـۆ بڵاوکردنەوەی ڕۆژنامەکـە و وەرگرتنـی ئابونـە باوەڕپێکراویـان هـەبوە. جگـە لـە ئەسـتەموڵ، لـە ئـەرزرۆم، دیاربەکر، موسڵ، بەغداد، نەجەف، تاران، تەبریز، ورمێ، سنە، کرماشان... باوەڕپێکراویان هـەبوە. بـەم پێیـە گەیشتۆتە دەس زۆر لە خوێندەوارانی ئەو زەمانە لەوانە خوێندەواری کورد. وەفایی موکریانی، هاودەمی شـێخ عوبەیدوڵای شەمزینی، لە قەسیدە نەورۆزیەیە درێژەکەی‌دا کە بەم بەیتە دەس پێ ئەکا:

نەسیمی بادی نەورۆزی شەمیمی عەبهەری هێنا
بەریدی عاشقان دیسان پەیامی دولبەری هێنا
بەم جۆرە باسی ڕۆژنامەی أختر ئەکا:
حیکایاتی غەریبەی پێیە بولبول جوملە خۆکردی
دەڵێی چاپاری ئێران ڕۆژنامەی أختری هێنا

اختر لە هەمو ژمارەکانی‌دا لە لاپەڕەی یەکەمی‌دا لە ژێر سەردێڕی (سیاسی) دا سەروتاری نوسـیوە. بـە زۆری تەرخانی کردوە بۆ لێکۆڵینەوەی ڕوداوێکی سیاسی دنیا.

اختر بایـەخێکی زۆری بـە بڵاوکردنـەوەی هـەواڵ داوە. ئەشـێ بـوترێ ڕۆژنامەیـەکی خەبـەری بـوە. سەرەڕای ئەوەی چەردەیەکی باشی هەواڵی دەوڵەتی عوسمانی نوسیوە، لە زۆری ژمارەکانی‌دا هەواڵی سیاسـی لە ڕۆژنامە بە ناوبانگەکانی ئەوسـای ئینگلسـتان، فەرانسـا، ڕوسـیا، ئـەڵمانیا و نەمسـاوە تەرجومـە کـردوە. هـەروەها لـە ڕۆژنامـە تـورکی و عەرەبیـیـەکانی وڵاتـانی عوسـمانی و لـە ڕۆژنامـە فارسـییەکانی ئێـران و هیندستانەوە دەنگوباسی وەرگرتوە.

### 3. 2. 3. داخرانی

لە 8 ی سەپتەمبەری 1896 (30 ی ڕەبیعولئەوەلی 1314) بە فەرمانی حکومەتی عوسمانی داخراوە.

(ئیـدارەی مـەتبوعات) ی عوسـمانی چەنـد جـارێ اختـری داخسـتوە. لـە بـەیانێکدا کـە بـە بۆنـەی داخستنیەوە دەری کردوە نوسیوێتی:

"دەربارەی هەندێ ڕوداو و هـەواڵی نـاوخۆ کـە بڵاوکردنـەوەیان بەنـدە بـە پەسـند کردنـی ئیـدارەی قەشەنگی مەتبوعات و بە بێ پەسندکردن و ڕاستبینینی ئەو ئیدارەیە ڕۆژنامەکان نابێ شتێ بنوسن..."

### 3. 3. دەوری اختر لە خەملاندنی هۆشی سیاسی ئێرانیدا

ڕۆژنامەی اختر لە ماوەی دەرچونیدا دەورێکی گرنگی دیوە لە ڕۆشنکردنەوەی بیری سیاسی، کۆمەلایەتی، فەرهەنگی و، بیری قانونی و دەستوری و ئازادیخوازی خوێندەوارانی ئێرانیدا.

أختر مەتنی تەواوی قانونی ئەساسی عوسمانی بە فارسی بلاو کردۆتەوە. هەواڵ و گفتوگۆکانی مەجلیسی مەبعوسانی نوسیوە. قانونە گرنگەکانی دەوڵەتی عوسمانی کردۆتە فارسی و بلاوی کردونەتەوە. ئەمەش هۆشی سیاسی ڕۆشنبیرانی ئێرانی ئەگەشاندەوە و ئاگاداری ئەکردن لە رەوتی جێگیر بونی پاشایەتی دەستوری و مەرجدار و، ماف و ئازادیەکانی هاوولاتیانی عوسمانی.

أختر هەواڵی شەڕەکانی عوسمانی و دەوڵەتانی تر و، مەتنی ڕێککەوتننامە نابەرامبەرەکانی بلاو کردۆتەوە.

أختر هەواڵەکانی ئێرانی نوسیوە. عەیبەکانی پۆلیس و دادگوستەری باس کردوە. دژی دانی ئیمتیاز بون بە بێگانە. دژی زۆرداری و نەزانی و خورافات دواوە. باسی دواکەوتنی باری ئابوری، کۆمەلایەتی، ڕۆشنبیری کردوە. داوای ئازادی بیری کردوە.

ڕۆژنامەکانی ئێران لەو سەردەمەدا، کە هەمویان حکومەتی بون، لەم باس و بابەت و ڕوداوانە بێدەنگ بون.

ڕۆژنامەی (قانون) کە ڕۆژنامەیەکی ئازادیخوازی بەرهەڵستکارانی ئێرانی بوە، میرزا مەلکۆم خان لە لەندەن بلاوی کردۆتەوە، لە هەڵسەنگاندنی اختردا نوسیویێتی: "ڕۆژنامەی اختر لە حەفتا وەزیری ئەعزەم (وەزیری ئەعزەم لەو سەردەمەدا بە سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران وتراوە. نم) زۆرتر خزمەت بە دەوڵەت و میللەتی ئێران ئەکا."

### 3. 4. هەواڵی کورد لە ڕۆژنامەی اختر دا

اختر لە ماوەی دەرچونیدا چەندین هەواڵی بلاو کردۆتەوە کە پێوەندییان بە کوردەکانی عوسمانییەوە هەیە. لێرەدا چەند نمونەیەک لە ژمارەکانی پێنج ساڵی یەکەمی هەڵئەبژێرم:

#### 3. 4. 1. کورد لە جەنگی ڕوسی- عوسمانی (1877) دا

لە سەدەی نۆزدەهەمدا هۆشی نەتەوایەتی لە ناو زۆر لە گەلانی ئەوروپادا گەشایەوە، لەوانە گەلانی باڵقان کە لە ژێر دەستی ئیمپراتۆریەتی عوسمانیدا بون. سالانی 1875– 1876 شۆڕش لە باڵقان دژی دەسەلاتی عوسمانی و لە پێناوی سەربەخۆییدا هەڵگیرسا. دەوڵەتی عوسمانی هێزێکی گەورەی ناردە سەر سربستان و کێوە ڕەش بۆ کوژاندنەوەی شۆڕشەکەیان. ڕوسیا ئەمەی بە هەل زانی بۆ ئەوەی بە ناوی (پاراستنی برا سلاڤیەکانی) وە دەس بخاتە ناو کاروباری باڵقانەوە.

سەرکردایەتی سپای ڕوس پلانی جەنگی دانا. بە یارمەتی بولغار و ڕۆمانیەکان لە 12 ی نیسانی 1877 دا لە یەک کاتدا لە دو قۆڵەوە پەلاماری خاکی عوسمانی دا. قۆڵی یەکەمیان لە باڵقان و قۆڵی دوەم لە قافقاس. مەیدانی سەرەکی شەڕەکە باڵقان بو. هێزی تورک 190 هەزار شەڕکەر بو. ڕوس 260 هەزار شەڕکەری ناردە سەریان، بۆ ئەوەی باڵقان بگرێ و بچێتە سەر ئەستەموڵ.

ئەگەرچی شەرگەی قافقاس مەیدانێکی لاوەکی جەنگ بو، مەبەستی ڕوسیا لەو هێرشە خەریک کردنی سپای تورک بو، بەلام لەو قۆڵەشەوە پێشڕەوی زۆریان کرد. لە 12 ی نیساندا شارە کوردنشینەکانی بایەزید و ئەرزنجانیان گرت و قەلای قارس کە زیاتر لە 20 هەزار شەڕکەری تێدا بو گەمارۆدا و، لە 5 ی کانونی یەکەمی 1877 دا قەلاکەیان گرت و 17 هەزار شەڕکەری عوسمانییان تێدا بە دیل گرت.

شەڕەکە دوای ئەوەی 14 مانگی خایاند، عوسمانی لە ترسی داگیرکرانی ئەستەموڵ، بە شکاوی لـە 19 ی شوباتی 1878 دا بـە ناچـاری شـەڕی ڕاگـرت و کەوتـە گفتوگـۆی دو قـۆڵی. لـە 3 ی مـارتی 1878 دا ڕێکەوتننامەی سان ستیڤانۆی لە گەڵ ڕوسیا مۆر کرد.
تورک لەم ڕێکەوتننامەیەدا دانی نا بـە سـەربەخۆیی ڕۆمانیـا، سـربیا، کێـوە ڕەش، بۆسـنە، هەرسـەک و، بـە بولغاریای گەورەدا کە ئەبو لە بولغاریا و ڕۆم ئێلی و مەکەدۆنیا پێک بێ. ڕوسیا قـارس و بـاتۆمی لـە تـورک و بسارابیای لە ڕۆمانیا سەند و، بولغاریای گەورە ئەبو بـە ناوچـەی نفـوزی ڕوسـیا و، بـەم ڕێگەیـە ڕوسـیا نفوزی ئەگەیشتە دەریای سپی ناوەڕاست. ئەمەیش هاوسـەنگی هێـزی لـە ناوچەکـەدا تێـک ئـەدا و بریتانیـا و نەمسای ترساند. لە بەر ئەوە بەم ڕێکەوتنە ڕازی نەبون داوایان کرد چاوی پیّدا بخشێنرێتەوە و دەسکاری بکرێ. بۆ چاوگێڕانەوە بەم ڕێکەوتننامەیەدا لە 13 ی حوزەیران– 13 ی تـەموزی 1878 بـە ئامـادە بـونی نوێنەرانی بریتانیا، نەمسا، فەرەنسا، ئیتالیا بە سەرۆکایەتی بیسمارک، ڕاوێژکاری پروسیا کە لە ناکۆکیەکـەدا وڵاتەکەی بێلایەن بو، کۆنفرەنسی بەرلین بەسترا. ڕێکەوتننامەیەکی نوێیان مۆر کرد. ڕێگەیان لـە پێکهێنـانی بولغاریای گەورە گرت، ڕوسیا قارس و باتۆم و بریتانیا جزیرەی قوبرسی دەس کـەوت. بڕوانـە: (الموسـوعە العسکریە، المؤسسە العربیە للدراسات والنشر، بیروت 1977، ص 554 - 557). اختر چەردەیەکی باشی لە هەواڵەکانی ئەم شەڕە بڵاو کردۆتەوە.

**لەم جەنگەی ڕوس و تورک دا کورد لە چەند لاوە تێوە گلاوە:**

**یەکەم**، مەیدانێکی شەڕەکان قافقاس بو هێزەکانی ڕوس گەیشتنە شارەکانی سەروی کوردستان لەوانـە بایەزید و ئەرزنجان.

**دوەم**، دوای ڕاگرتنی جەنگ لە هەردو پەیماننامەدا دەوڵەتی عوسمانی بـەڵێنی بـە ڕوسـیا و دەوڵـەتانی تری ئەوروپی دا ئەرمەن لە دەسدرێژی کورد و چەرکەس بپارێزێ.

اختر لە ژ 13 ی سـاڵی چـوارەمی 29 ی ڕەبیعولئـەوەلی 1295 بەرامبـەر 3 ی ئاوریـل (نیسـان) ی 1878 دا دەقی ڕێککەوتننامەی سان ستیڤانۆی بڵاو کردۆتەوە. لە مادەی شانزەهەم دا نوسراوە:

"م 16: ئەگەر قشونی ڕوس ئەرمەنستان چۆڵ بکا و بیدا بە دەوڵەتی پایەبـەرزی عوسـمانی ئـەتوانێ ببێتە مایەی موناقەشە و جیاوازی لە پێوەندییەکانی هـەردو دەوڵـەت دا. بابیعـالی لـەو ئیالەتانـەدا کـە زێـدی ئەرمەنییەکانە بە پێی پێویستییەکانی ناوچەکە بە بێ دواخستن ریفۆرم ئەکا و دڵنیا کردنی عیساییەکان لـە کورد و چەرکەس ئەگرێتە ئەستۆی خۆی."

لە ژ 29 ی ساڵی چوارەم 23 ی ڕەجەبی 1295 بەرامبەر 24 ی تەموزی 1878 دەقـی پەیماننامـەی بەرلینی بڵاو کردۆتەوە. لە مادەی شەست و یەکەمی دا نوسراوە:

"م 61: بابیعالی بەڵێن ئەدا، لەو ئیالەتانەدا کە ئەرمەنی تیا نیشتەجێن، ریفـۆرم و ڕێکوپێکیـەک کـە پێویستییە ناوچەییەکان ئەیخوازن بە بێ دواخستن ئەنجام بدا و ئاسایشی ئەرمەنی لە کـورد و چەرکـەس بپارێزێ. بابیعالی لەو تەگبیرانەی لەم بارەیەوە ئەیان کا، دەم بە دەم، ئاگاداری دەوڵەتەکان ئەکا و دەوڵەتـەکان یش چاودێری ئەکەن."

**سێیەم**، پێ ئەچێ کورد بەشداری هێزەکانی هەردو لایەنی شەڕەکەی کردبێ:

کوردەکانی ژێر دەسەڵاتی عوسمانی بەشداری لایەنی عوسمانی بون بە ناوی غـەزا و جیهـاد و شـەڕی کافرانەوە.

کوردەکانی ژێر دەسەڵاتی ڕوسیاش بەشداری لایەنی ڕوسی بون وەکو بەشێ لەو هێزانەی کـە ڕوسـیا لە عەشائیر بە ناوی (قازاخ) ەوە ڕێکی خست بون.

اختر له ژ 24 ی ساڵی سێیەم، 28 ی اوریل (نیسان) ی 1877 دا نوسیویێتی:

"پایەبەرز بەحری بەگ، لە کوڕانی بەدرخان بەگی خوالێخۆشبو، کە لـە جـەنگی سربسـتاندا ئازایـەتی نواند و زامداریش بو بو، بۆ سەرکردایەتی چەند هـەزار پیـادە و سـوارەی خۆبەخشـی کـورد، کـە بـە هـۆی نامەکاری و پێوەندی گرتنی پێشترەوە، لە ئەناتۆلی‌یەوە ئامادە بون، لەم ڕۆژانەدا بە ڕێ ئەکەون."

شێخ عوبەیدوڵای شەمزینی، دواتر ڕابەری شۆڕشی 1880 ی کورد، ئـەویش چـوە بـۆ بەشـداری لـەم غەزایەدا بەڵام پێ ئەچێ هێزەکانی دەستیان نەپاراست بێ لە تاڵان و ڕاووڕوت.

أختـر لـە ژ 42 ی 19 ی جیمـادی ئـاخری 1294 بەرامبـەر 30 ی ژون (حـوزەیران) ی 1877 نوسیویێتی:

"شێخ عوبەیدوڵای شەمزینانی کە لـە ڕۆژنامـەکاندا نوسـییان لـە گـەڵ 50 هـەزار سـوار و پیـادە بـۆ یارمەتی عەسکەرەکانی شاهانە ئامادە و حازرە. ئیستا کەسانی ئەو بونەتە کۆمەڵێ لە لای سنورەوە لـە خـەتی وان بگرە تا بایەزید کەوتونەتە ڕاووڕوتی دێهات و تاڵانی سامان و کەلوپەلی تەبعە و ئەهالی ئەو نـاوە. ئـەم مەسەلەیە، کە بارودۆخی ئەو ناوچەیە بەم چەشنەیە، عەرزی بابی عالی یش کراوە."

لە هەمان ژمارەدا ناوی فەرماندە جەنگیەکانی ئۆردوی عوسمانی بـڵاو کردۆتـەوە. لـە ڕیـزی (تەبەقـەی موشیران) دا کە بەرزترین پلەی جەنگی بوە نوسیویێتی:

"ئیسماعیل حەقی پاشا

"لە کوردەکانە بە هۆی جەسارەتی عەسکەری‌یەوە لە لای دیاربەکر و ئەرزڕۆم بـە لەقـەبی (قـورد) بـەگ ناوی دەرکردوە. لە حیکایەتی (قوزان) دا هاوڕێی دەروێـش پاشـا بـوە. لـە تـاریخی 1284 دا بـە ڕوتبـەی موشیری چەند ساڵ لە والیگەری دیاربەکردا بوە. لەم ماوەیەدا کە والی ئەرزڕۆمە داخلی جەنگ بوە. سـاڵی لـە شەست تێ پەڕیوە."

### 3. 4. 2. کورد و ئەرمەن

لە هەمان ژمارەدا بابەتێکی تـری دەربـارەی پێوەنـدی کـورد و ئەرمـەنی نوسـیوە کـە ڕوناکیـەک، ئەگەرچی کزیش بێ، ئەخاتە سەر ناکۆکی خوێناوی دواتری کـورد و ئەرمـەنی و پێوەنـدی لـە گـەڵ ئـەم جەنگەش دا هەیە و دواتر لە هەردو پەیمانی سان ستیفانۆ و بەرلیندا مادەیەک بە قازانجی ئەرمـەن و بـە زەرەری کورد نوسرا.

أختر نوسیویێتی:

"گازێتی (مەنزومەی ئەفکار) کە بە خەتی ئەرمەنی و زمانی تورکی چاپ ئەکرا کاغەزێ کە لە (وان) ەوە بەو گەیشت بو لە ژمارەکانی خۆیدا ڕایگواستوە و لە کۆتایی‌یەکەیشیدا هەندێ لێدوانی نوسـی بـو. لـە بـەر ئەوە ئیدارەی قەشەنگی مەتبوعات گازێتی ناوبراوی ئیتال و خاوەنی ئیمتیازەکەیشی ڕاکێشاوەتە دادگا.

"ناوەرۆکی کاغەزی باسکراو و لێـدوانێ کـە خـاوەنی مەنزومـە لـە کۆتاییەکـەیدا نوسـیوێتی هـەموی دەربارەی دڵسوتان دەرحەقی ئەرمەنیەکانی ئەوێ و دەرخستنی ستەملێکراوی و سەرنج ڕاکێشـانی حکومـەتی پایەبەرز بوە، دەربارەی ئەحواڵێ کـە ئـەڵێن بـە سـەر ئـەوان هـاتوە. خـاوەنی مەنزومـە لـە بـەر هاومیللـەتی و هاودینی یا تەکلیفی ڕۆژنامەنوسی، ئەیتوانی هەندێ لەو کاغەزانـەی لـەو بابەتـە بـاس و خواسـی بـە نـەرم و نیانی نوسراون نەقڵ بکات و لە کۆتایی‌یەکەیدا باوەڕی خۆی ڕون بکردایەتەوە و حکومەتی پایەبەرز یـش بە پێی ئەوە لێکۆڵینەوەی پێویستی بکردایە. ئەگەر بە پێچەوانەی مەبەستی پیرۆزی حکومـەت و لـە دەرەوەی ئایینی ڕەعیەتداری ڕوی دابێ و ڕو بدا، بکەوێتە چارەسازی.

"بەڵام کار بە تەواوی بەوجۆرە نیە کە خاوەنی مەنزومە و هاوچەشنەکانی ئەو تێی ئەگەن. بارودۆخی ئەرمەنیەکان کە لە ناوچەکانی وان دان، تا کەسێ نەیبینێ و تێکەڵییان نەکا، مومکین نیە ئاگایی بە دەس بێنێ. ئەوانە لەو سەرحەدەدا لە گەڵ کورد و یەکەیەکەی خێڵ و هۆزەکاندا بە جۆرێکی تێکەڵاو زیندەگانی ئەکەن و لە ناو گەورەتر لەوان زۆر کەسی نالەبار و، سەرباری نالەباریی، حیلەکار و ساختەکار هەیە بە چەشنێ کە کوردەکانی ئەوێ بە دەستیانەوە زەبون و بێچارەن. جگە لەمە هەموارە پەنجەیەکی روسەکانیان لە ناودایە کە بە هەر وەسیلەیەک دڵی ئەهالی لە حکومەت بڕەنجێنن و بەو هۆیەوە هەر جۆر کاری ناپەسند و فەساد و شەرارەت لە یەکە یەکەی ئەرمەنیەکانی ئەو ناوچانە لەم کاتەدا ئەتوانێ سەر دەربێنێ و تەنانەت جاسوسی بۆ روسەکان ئەکەن. دور نیە هەواڵنوسی مەنزومەش رەگێکی تەرەفداری روسیای پەیدا کردبێ و هەرچی دڵی خواستویەتی نوسیبێتی. بەڵام درێژەی بارودۆخی ئەو شوێنانە ئیستا نوسینی بە کار نایەت بۆ دوای ئەمە ئەبێ تەگبیرێکی لێ بکرێ."

## 3. 4. 3. روس سەرانی کورد لە سێدارە ئەدا

لە ژ 46 ی ساڵی سێیەم، 25 ی ژون (حوزەیران) ی 1877 دا نوسیوێتی:

"ئەرزرۆم

"ئەیوب ئاغا کوڕی جەنەراڵ جەعفەر (جەعفەر ئاغای سەرتیپ) و 21 کەس لە بنەماڵەکەی، کە لە سەرانی کوردن و لە خاکی روسدا نیشتەجێ بون، بە فەرمانی جەنەراڵ ملکۆف بە بڕیاری دیوانی جەنگ لە دار دراون.

**"أختر**

"ئەم ئەیوب ئاغایە و گەورەکانی تری کورد کە نوسیویانە گوایە لە تایەفەی (زیلان) ن، کە وەکو باس کرا، لە خاکی ئیرەواندا نیشتەجێن، بە قەدەر هەزار و پێنجسەد سوارەی ئەوان لە ئۆردوی قافقازدا هاوڕێی جەنەراڵ ملکۆف بون. ئەوانە، کە موتەدەین بە دینی ئیسلامن، دور نیە لە یەکێ لە شەڕەکانی دوایی‌دا کە ئۆردوی ملکۆف شکانێکی گەورەی توش بو، جوڵانەوەیەکیان لێ دەر کەوتبێ. ملکۆف یش ویستبێتی شکستەکەی خۆی بگێڕێتەوە بۆ ئەو هۆیە و، ئەوانەی بە خیانەت تاوانبار کردبێ و کوشتبنی. بەڵام حکومەتی روس بەم هۆیانەوە روی تایەفەیەکی گەورەی لە خۆی وەرگێڕاوە و ئومێدی بڕیون، ئەوانی تریش کە لەم بابەتەن وریا ئەکاتەوە و بە ئاگا ئەهێنێ.

"دەوڵەتی روس بەو باوەڕەی: کە من لە هەر تایەفە و میللەتێ قشون و سەرباز ئەگرم و بە قانونەکانی عەسکەری دەرهەقی ئەوان رەفتار ئەکەم و هەمویان کەم کەم بە دەسهەڵگرتن لە پێویستی‌یەکانی تەعەسوبی دین و ئایینی خۆیان رام و ئارام ئەکەم. بەڵام ئەمە خەتایەکی زۆر گەورەیە. ئەگەر ئومێدی بە خاوەنی مەزەبەکانی تر هەبێ جێگەی قسە نیە، بەڵام دەربارەی موسوڵمانان زۆر دورە بەڵکو (ممتنع الوقوع) ە.

"وە هۆی سەرەکی یشی ئەوەیە: کە نەڕوانێتە تەبیعیاتی ئەقوام، کە هەر قەوم و میللەتێ تەبعەن میلیەت و مەزەبی ئابا و ئەجدادی خۆی بە ئاسانی تەرک ناکا و، بە غەیری هاوجنسی خۆی یەکرەنگ نابێ مەگەر زۆر کەم کە ئەویش حوکمێکی نیە. ئەبێ سەرنجی ئەوە بدرێ کە لە مەزەبەکانی ئەهلی کیتابدا هەمو حکومەتێک لە لایەن خوداوە ئەزانن هەروەکو دەقی ئینجیل هەم دەلالەتی لە سەر ئەمەیە بەرخیلافی موسولمانان و ئیسلام کە بە جۆرێکی موتلەق حکومەتەکانی تر بە حکومەتی حەقە نازانن بە تایبەتی لە سورەتێکا عەدل و راستی نەبێ، هەروەها لە بەر ئەوەی بەوپەڕی ئەستوریەوە باوەڕیان بە دینەکەی خۆیان

کردوە و، بە بەرزترین و باشترین دینەکانی ئەزانن و شوێنکەوتنی ئەوانی تر بە جایز نازانن. ئەمەیە کە زۆر ئیشکالی هەیە کە هاورەنگی لە گەڵ میللەتانی ترا بە زویی قبوڵ بکەن و سەرەرای هەمو ئەمانـە لـە سـورەتێکا ببینن کە ئەوان لە دژی مەزهەب و دینی ئەو بۆ مەیدانی جەنگ ئەنێرن و ئەڵێن سەرباری ئیسلامیەت ئـەبێ برایانی موسوڵمانی خۆت بکوژی لە گەڵ ئەوەی ئێمە بە حکومەتی خەقە نازانی بـە سـەر دەوڵـەتی ئیسـلامدا زاڵ بێ. ئەم کارە وەکو ئەوە وایە کە ئەهلی مەزهەبێ بە سوکایەتی و ئیهانەتی دیـن و ئـاینی خـۆی مـەجبور بکەی. زۆر سەیرە کە دەوڵەتی روس ئەم نوکاتە تێ نەگەیشتوە موسـوڵمانان ئـەبا بـۆ جـەنگی موسـوڵمانان و چاوەروانی خزمەت و گیانبازییان لە رێی خۆی و ئەتکی ئابرووی ئیسلام ئەکا، یا ئەوەی سەرباری زانینی، ئەڵێ بەڵکو بەرە بەرە موسوڵمانان لە غیرەتی دینیی خۆیـان هەڵگێرمـەوە، ئەوانـە بکـەم بـە روس و روسـی زادە. ئەفسوس کە هـەمو جـۆرە ئینقـیلاب و خراپـی لـە سـەر روی زەوی لـە بـێ ئینسـافی و حیـرس و لـە سەرۆکایەتیخوازی پەیدا بوە، کە مەعنای ئەم سەرۆکایەتیخوازیە ئەبێ عمومیەتی بدرێتی تا لە هەر مەقامێکا بە پێی حاڵ و وەزعەکە حوکمەکانی ببینرێ، ببێتە هۆی عیبرەت و ئاگایی.

## 3. 4. 4. شۆرشی کورانی بەدرخان پاشا

لە ژ 48 ساڵی چوارەم 9 ی زیلحیجەی 1295 بەرامبەر 4 ی دێسمبەر (کانونی یەکـەم) ی 1878 دا نوسیویێتی: "لە سەمتی کوردستان زادەگانی بەدرخان پاشا بە هەوای یاغیگەری کـەوتون، جـەمعێکیان لـە گـەڵ خۆیان کردۆتە هاوداستان و، لەو سامانەدا کەوتونەتە تێکدانی ئیخلالی ئاسـایش و کارەکـەیان تونـد کـردوە، مەئمورەکانی دەوڵەتیان لە کـار خسـتوە و خۆیـان جڵـەوی حوکمرانـییـان گرتۆتـە دەسـت، تەنانـەت ئـەڵێن تەلگرامەکانیان خستۆتە ژێر ئیدارەی خۆیانەوە. لە لایەن دەوڵەتەوە بۆ تەمێکردن و تەنبیهی ئەوانە هێزێ کـە پێویست بو، نێردرا."

### لەشکری عوسمانی ئەچێ بۆ سەرکوتکردنی

لە ژ 50 ی ساڵی چـوارەم 23 ی زیلحیجـەی 1295 بەرامبـەر 18 ی دێسـمبەر (کـانونی یەکـەم) ی 1878 دا نوسیویێتی:

"مەسەلەی یاخیبونی کورانی بەدرخان پاشا لە سەمتی کوردستان و دیاربەکر و مـەئمورکردنی جـەنابی عیزەت پاشا بۆ تەنبیهـو تەمێکردنیان مەعلومە. ئەگەرچی ئەم کارە زۆر گرنگی نەبو بەڵام هەر کاتێ پشـتگوێ بخرایە یەقین کار گەورە ئەبو. وەلێ ئیستا بە بایەخ پێدانی جەنابی ئەورەحمان پاشـا، والـی دیـار بـەکر، بـە کەمالی ئاسانی بەری ئەم شۆرشە بە تەواوی گیرا، بەو جۆرەی کە لە روی تەلگرافنامەیەکەوە کە بە چاپخانـەی وقت لە 2 ی کانونی یەکەم (19ی زیلحیجە) دا گەیشتوە ئەنوسین."غائیلەی کورانی بەدرخان کـە لـە (بۆتـان) و (جزیرە) عاسی بون و دەرەجەی ئەهمیەتی ئەو کـارە بـە پـێی ئـەوزاعی کوردەکـان و، تەئسـیرێ کـە ئـەو خانەوادەیە لە میزاجی کوردا هەیەتی، لە کەسانێ کە ئاگاداری حەقیقەتی حاڵن پۆشراو نیە. ئەوەی ئەمانـە بـە پەنهانی گەیشتونەتە بۆتان، بە ئیقدامات و کارئاگاهی کە لە لایەن والی ولایەتەوە کراوە و، بە قەدەر دو فـەوج نیزام کۆ کراونەتەوە و لە گەڵ عەسکەرانی هاوکاردا کە پـێش وەخـت لـە سـعرد تـەرتیب کـرا بـون لـە گـەڵ موتەسەریفی سعرد لەوێوە رو بە تەرەفی ئەوانە رەوانە کران و سەمتی مدیان (ئەبێ میدیات بێ. نم) گیـرا. لـە شەرناخیش بە قەدەر 3 هەزار نەفەر لە عەسکەرانی هاوکار رێک خرا و رێی تەنینەوە و گەورە بونی غائیلەکە بەسترا. لە سەمتی سعردەوە حسێن بەگ بە شکاوی بریندار بو. عوسمان بەگ یـش لـە حاڵـەتێکا کـە بـە 4 هەزار نەفەرەوە هەڵی کوتا بوە سەر شەرناخ عەسکـەرانی هاوکـار کـە لـە وێ بـون شـکاندویانە پەرێشـانیان

کردوە. ئیستا هەردو برا راکردون و خۆیان شاردۆتەوە. مەبەست بەیان کردنی ڕێوشوێنی خێرا و کاریگەری والیی ولایەت نیە، کە لە مەئموریەتی گەورەدا ئیقتیدار و کارئاگایییان بینراوە و بیستراوە، تەنیا بۆ بەشارەت دان کە بە پشتیوانی خوا و لە سایەی شاهانە، دەوڵەت و ئەو ناوچانە لەم غائیلەیە رزگار بون ئەم بابەتە رائەگەیەنین. جەنابی عیزەت پاشا کە بۆ ئەم کارە مەئمور کراوە پاش چەند رۆژی تر ئەگاتە دیاربەکر."

**خۆ بە دەستەوە دانیان**

لە ژ 8 ی ساڵی پێنجەم 20 ی سەفەری 1296 بەرامبەر 12 ی فوریە (شوبات) ی 1879 دا نوسیوێتی:

"کوڕانی بەدرخان پاشا کە حسێن بەگ و عوسمان بەگ ناو بون لە ئەملاوئەولای کوردستان دا عوصیان و توغیانیان کرد بو پاش ئەوەی بە سەتوەتی سەڵتەنەتی پایەبەرز پشت شکاو و هەراسان بون، لە دەرگای ئیستیمانیان دا. تەسلیم و گرفتار بون هاوڕێ لە گەڵ سەعادەت مەئاب کازم بەگ، کە لە ئاجودانەکانی حزور (یاوەر) ی حەزرەتی شەهریارییە، بۆ دەری سەعادەت نێردران."

سورەیا بەدرخان (بلەچ شێرکۆ) روداوەکە بە جۆرێکی تر ئەگێڕێتەوە. لەم بارەیەوە نوسیوێتی:

"لە ساڵی 1877 ز یش دا جەنگی نێوان تورک و رووس رویدا بابی عالی خەڵکێکی زۆری (متطوع) ی کوردستانی کرد بە سەرباز و بەشێکی زۆری ئەم هێزانەی بەنەوەکانی میر بەدرخان سپارد.

"حسین کەنعان پاشا و، عوسمان پاشاش ئەم هەلەیان لەو سەرکردانە قۆستەوە و، لەگەڵ ئەو ئەفسەر و سەرکردانەدا رێکەوتن، کە لە ژێر فەرمانداریێتیاندا بون و لەناوخۆیاندا بڕیاریاندا بە مەبەستی هێنانەدی ئەو ئاواتە پیرۆزەی کە باوکە مەزنەکەیان تیایدا ژێر کەوت، رو بکەنە کوردستان بۆ جێ بەجێ کردنی کە – یەکێتیی کوردستان و رزگارکردنی بوو – بۆ ئەمە، ئەم دوو میرە کوردە ساڵی 1879 ز بە نهێنی چونە کوردستان و، لە ناکاوێکدا لە (جزیرە) سەریان هەڵدا و دەستیان بە سەر کاروباری ئەوێدا گرت و، دەستبەجێ بانگی سەربەخۆیی کوردستانیان ئاشکرا کرد، چەند جارێکیش بەسەر ئەو هێزە سەربازییە تورکیانەدا سەرکەوتن، کە لە هەموو قوژبنێکەوە هێرشیان ئەهێنایە سەریان، تا نزیک (جولەمێرگ) لە مەڵبەندی هەکاری و زاخۆ و ئامێدی و ماردین و مدیات و نصیبین یشیان گرت و، میر عوسمان کە گەورەکەیان بوو بانگی میرایەتی میرنشینی دا و، لەجیاتی ناوی سوڵتانیش، لە وتاری هەینیدا ناوی ئەم هێنرا.

"ئیتر بەزینی یەک لە دوای یەکی هێزەکانی تورک و بڵاوبوونەوەی دەسەڵاتی میر عوسمان، لە سەرتاسەری وڵاتی کوردیدا، سوڵتانی سەردەم، سوڵتان عەبدولحەمیدی ناچار کرد سیاسەتی خۆی بەرانبەر بە کورد و کوردستان بگۆڕێ، بەتایبەتیش بەرانبەر بنەماڵەی بەدرخانییەکان. ئەوشتانەی کە بابی عالی ناچاربوو بیکات بەربانی هەموو ئەوانە بوو کە لە بنەماڵەی بەدرخان گیرابوون، راسپاردەشی ناردە لای هەردوو میرە تێکۆشەرەکەی کوردستان، تا پێیان بوترێ با ئیتر خوێنی موسڵمانان نەڕژێ و ئامادەشە بە رێگای ئاشتی وەڵامی داخوازیەکانیان بداتەوە، ئیتر هەردوو میر لە سەر قسەی براکانیان و خزمەکانیان کە ئەو کاتە لە ئەستانە بوون و ئەوەیان سەلماند کە سیاسەتی ئەم دواییەی سوڵتان، سیاسەتێکی نەرمە، هەردوکیان کەوتنە وتوویژ لە گەڵ تورک دا، لەسەر رێکەوتن و هێنانەدی داخوازیەکانی کورد، ئەوەیشی کە ئەوەندەی تر متمانەی هەردو میری بە تورک پەیدا کرد، ئەو پێشوازی و بە پیرەوە هاتنە گەرمە بوو، کە لە هەموو کۆبونەوەکاندا لەگەڵیان ئەکردن و قسەی گفتوگۆکەرانی تورک بوو، لەوەدا کە ئەیان وت داخوازیەکانی هەردوو میر ئەهێننەدی، نەک هەر تەنیا لە سنوری میرنشینی بۆتان دا، بەڵکو لە سەرتاپای کوردستان دا

چونکە گفتیان ئەدا کە سەربەخۆیی نـاوخۆی کوردسـتان ئـەدەن، بەرانبـەر بـە هەنـدێ مـەرجی شـاراوە، کـە پێویستی بەزۆرتر وردبونەوە و، بیرکردنەوەی تر هەیە.

"ئەم هەموو دیاردانەی لای تورک، کاریان لەهەردوو میری بەدرخان کردو، وایان لێ هات ژمـارەی ئـەو پاسەوان و یاوەرانەیان کەم ئەکردەوە کە لە گەڵیان ئەهاتن و ئەچوون بـۆ کۆبونـەوەکان و تـا بارەگـای کـۆڕ و کۆبونەوەکان لەگەڵیان ئەهاتن و ئەمانـەوە، تورکـەکانیش هـەر بـە ئـارەزوو، جێگـا گۆڕکێیـان لـە جێگـای کۆبونەوەکاندا ئەکرد، ڕۆژێکیـان کۆبونـەوەکـەیان لـە جێگایەکـدا گـرت، هێـزی تـورکی چەنـدان ئەوەنـدەی هێزەکەی کورد ئەبوو، ئیتر تورکەکان بە هەلیان زانی و پێشتریش پیلانەکەیان سازکردبوو، بۆیە هێزی تورک دەوری هەردوو میر و پاسەوانەکانیان دا و دەسگیریان کردن و گرتنیان و بەدەست بەسـتراوی ناردیـانن بـۆ ئەستانە. دیارە واش چاوەڕوان ئەکرا بەلای کەمەوە لەسێدارە بدرێن، بەڵام سوڵتان لەرزی ئـەوەی لـێ نیشـت نەک ئاگری شۆڕشێکی سەرتاسەری لە کوردسـتاندا کڵپـە بسـێنێ، لـە بەرئـەوە بەوەنـە وازی لـێ هێنـان کـە ماوەیەک لە قوڵایی زیندانەکانی ئەستانەدا توندیان بکات و پاشان بەرەڵڵای کـردن و لـە ئەسـتانە دەسـت بـە سەر هێشتنیەوە."(**سەرچاوە**: بلەچ شێرکۆ: کێشەی مێژینـە و ئیسـتای کـورد، وەرگێڕانـی لـە عەرەبیـەوە بـۆ کوردی محەمەد حەمە باقی، چاپی سێیەم، 1991. ل 44 – 45.)

ڕۆژی کورد، ژ 2 ی 14 ی شەعبانی 1331 بەرامبەر 6 ی تەموزی 1329 ی ڕۆمـی، ئەسـتەموڵ، بـە تورکی هەواڵی کۆچی دوایی لە ژێر سەرناوی (زیاعی عەزیم) دا بڵاو کردۆتەوە.

ڕۆژی کورد، ژ 3 ی 11 ی ڕەمەزانی 1331 بەرامبەر 1 ی ئاغستۆسی 1329 ڕۆمی، ئەسـتەموڵ، لـە سەر بەرگەکەی وێنەی حسێن کەنعان پاشا و، وتارێکی تورکیشی لە ل 4 – 6 دا لـە ژێـر سـەرناوی (حیـات مشاهیر: بدرخانی حسین پاشا) تەرخان کردوە بۆ ژیاننامەی.

دیـاریی کوردسـتان، ژ 9 ی 28 ی ئـەیلولی 1925، بەغـداد، وێنەیـەکی حسـین کـەنعانی لـە گـەڵ ژیاننامەی بە کوردی و بە عەرەبی بڵاو کردۆتەوە. پێ ئەچێ سەرچاوەی سەرەکی زانیاریەکانی دیـاری هـەمان وتاری ڕۆژی کورد بێ.

### 3. 4. 5. بەستنی شارەزور و سلێمانی بە موسڵەوە

لە ژ 9 ی ساڵی پێنجەم 27 ی سەفەری 1296 بەرامبەر 19 ی فوریەی 1879 دا نوسیوێتی:

"شارەزور و سلێمانی لە ولایەتی بەغداد جیا کرانەوە و خرانە سەر ولایەتی موسـڵ و والیگـەری ئـەوێ بە سەعادەتمەئاب فەیزی پاشا والی پێشتری ترحالە سپێردرا."

دورخستنەوەی 23 سەرۆکی کورد

لە ژ 34 ی ساڵی پێنجەم 4 ی ڕەمەزانی 1296 بەرامبەر 21 ی ئوتی 1879 دا نوسیوێتی:

"لە ولایەتی دیاربەکر 23 نەفەر لە سەرۆکەکانی کورد کە سەرچاوەی شەرارەت و فەساد بون لـە لایـەن جەنابی عابیدین بەگەوە، کۆمیسەری عوسمانی، گیران و بـە جـارێ لـە ئـەناتۆلی نـەفی و دور خرانـەوە. بـەم هۆیەوە مەردمانی موفسید و شەرارەت پیشە دوچـاری تـرس و هـەراس بـون لـە داخلـی ولایـەتدا ئەمنیـەت و ئاسایشی تەواو جێگیـر بـوە. عەسـکەر (جانـدارم) کـە بریـار بـو پێـک بهێنـرێ، نەفـەرات و خـاوەن پلـە و پایـەکانی بـە جـۆرێکی وەک یـەک بـێ جیـاوازی لـە ئیسـلام و ئەرمـەنی تەشـکیل کـراوە، کەوتونەتـە جێبەجێکردنی مەئموریەتیان. جلوبەرگی تایبەتی کە بۆ عەسـکەرەکانی جانـدارم درواوە لەوپـەڕی قەشـەنگیدا بوە."

## 3. 4. 6. لێکۆڵینەوە لە ناسنامەی کوردەکانی ئەستەموڵ

لە ژ 45 ی ساڵی پێنجەم 21 ی زیلقەعیدەی 1296 بەرامبەر 6 ی نۆڤەمبەری 1879 دا نوسیوێتی:

"کوردانێ کـە لـە دەری سـەعادەت دان و بـە چەنـد جـۆر کاسـبی و کـار خـەریکن و زۆریـان عەمەلـە و هەندێکیشیان بێکار و حاڵ و بار نەزانراون. لە بابەت تابیعیەتی ئەم کوردانەوە لە لایەن حکومەتەوە دیقەت نەکراوە. هەندێکیان خۆیان بە هیچ دەوڵەتێکەوە نەبەستۆتەوە. هـەروەخت لـە لایـەن حکومەتـەوە ویسـتراوە شتێکیان بەرامبەر بکرێ، یا بۆ ئیجرای حەقێ ئامادە بۆ مەحکەمە جەلب بکرێن، هەر کاتێ کەسی ئامادەکەر لە مەئمورانی دەوڵەتی پایەبەرزی عوسمانی بێ، ئەڵێن: ئێمە ئێرانین و ئەگـەر لـە مـەئمورانی سـەفارەتی بڵنـدی ئێران بێ، ئەڵێن: ئێمە تەبەعەی عوسـمانین و، هەندێکیشـیان لـە نـاو ئـەم هەلومەرجـە حوشـترمورغیەدا دو تەسکەرەی ئیقامەتی پەیدا کردوە لە کاتی پێویستدا پشت بە یەکێکیان ئەبەستێ (مثل النعامة لاطير ولاجمل). بڕێکیشیان، بە ئیشتیباهکاری، ئێرانییەو ناوی سلێمانی دانـاوە و بـە درۆ لـە تەبەعـەی دەوڵـەتی پایەبـەرزی عوسمانییە و بڕێکیش بە پێچەوانەوە لە تەبەعـەی دەوڵـەتی پایەبـەرزی عوسـمانییە بـە بیـانوی ئـەوەی کـە خەڵکی سنە و سەقز و شوێنی ترە تەزکەرەی ئێرانی پەیدا کردوە. کارەکانی خۆیان بـەوجۆرە ئەبەنـە پـێش و لەم پایتەختەدا بونی ئەم چەشنە کەسانە، بەم بارە نادیارە، بۆ ئاسایشی گشتی زیانبـەخش و بـۆ مافـەکانی هەردولا پێشێلکەرە. لە بەر ئەوە وا وتراوە لە نێوان سـەفارەتی مـەزنی دەوڵـەتی بڵنـدی ئێـران و بابیعـالیدا موخابەرە کراوە، بڕیاریـان داوە کۆمیسـیۆنێ دروسـت بکـرێ لـە حـالات و تەبەعیـەتی ئـەو کوردانـەی لـەم جێگایانەدان بکۆڵنەوە و دیاری بکەن و کەسانی حاڵنادیار و ئەوانەی گومانیان لـێ ئـەکرێ، پێکـەوە بڕیـاری دورخستنەوەیان لێرە بدرێ."

## 4. رۆژنامەی (الزوراء) ی بەغدادی و هەواڵی خێڵەکانی کورد

مەدحەت پاشا (1822- 1884) دانرا بە والی بەغداد. لە نیسانی 1869 دا هاتە بەغداد. بۆ چاکسازی هات بو.

مەدحەت پاشا 3 ساڵ لە عیراق مایەوە. گەلێ چاکسازی گرنگی لە بوارە جیاجیاکانی ژیانی خەڵکی عیراقدا کرد: چاکردنی رێگاوبانی کاروان و راکێشانی تەلگراف و رێکخستنی بەرید، چاکردنی روبارەکان و هاتوچۆی ئاوی بۆ بازرگانی و گوێزانەوە. چاکردنی سیستەمی کۆکردنەوەی باج و دانی زەویوزار بە کرێ بە هەرزان بە جوتیار و رەوەندەکان. دانانی مەدرەسەی صەنائیع و نەخۆشخانە و کردنەوەی قوتابخانەی ئەعدادی و عەسکەری و ملکی. دامەزراندنی کارگەی چنین (عباخانە)، پاڵاوتنی نەوت لە مەندەلی. کوژاندنەوەی ئاژاوە و پشێوی عەشایەر و دانانی قانونی تەجنید.

### 4. 1. الزوراء

رۆژنامەوانی لە تورکیا لە چاو رۆژنامەوانی لە دنیادا شتێکی تازە بو.

(تقویم وقائع) کە تاکە رۆژنامەی رەسمیی حکومەتی تورکیا بو لە 1831 ەوە بە فەرمانی سوڵتان مەحمود لە ئەستەموڵ بە تورکی دەرئەچو.

بەر لە هاتنی مەدحەت پاشا خەڵکی عیراق نەیانئەزانی رۆژنامە چیە. ژمارەیەکی کەم رۆژنامەی عەرەبی لە پایتەخت و ناوەندی هەندێ لە ولایەتەکان دەرئەچون. بەڵام بە هۆی بڵاوی نەخوێندەواری و، خراپی بەرید و پێوەندی نێوان ولایەتەکان، مەگەر هەندێ لە کاربەدەستانی بەرزی دەوڵەت، بۆ ئاگاداری لە روداوەکانی وڵات و بڕیارەکانی بابی عالی لە ئەستەموڵەوە جاروبار رۆژنامەیان بۆ هاتبێ. رۆژنامەی عەرەبی بە دەگمەن هەبوە. بە ناوبانگترینیان (الجوائب) بوە کە لە ئەستەموڵ دەرچوە و، تاکوتوک گەیشتۆتە دەس خوێندەوارانی عیراق.

مەدحەت پاشا بەر لە هاتنی دەزگایەکی چاپی میکانیکی لە پاریس بە کرێن دابو، وەستای بەکارهێنانی بۆ ئامادە کردبو. هەروەها سەرنوسەری رۆژنامەکەی دانا بو. بە گەیشتنی خۆی دەزگاکەی پشی گەیشت و ناو نرا (مطبعة الولاية).



زوراء

مواد مخصوصه

لە ڕۆژی سێشەمە 5 ی ڕەبیعی ئەوەلی 1286 بەرامبەر 15 ی حوزەیرانی 1869 بە 4 لاپەڕە، 2 لاپەڕە بە تورکی و 2 لاپەڕە بە عەرەبی دەرچوە. لە ناوچەوانی ڕۆژنامەکەدا نوسراوە:

"هذه الغزتة تطبع في الاسبوع مرة يوم الثلاثاء وهي حاوية لكل نوع من الاخبار والحوادث الداخلية والخارجية"

تا ساڵی 1908، کە گۆڕینی دەستوری بو لە دەوڵەتی عوسمانیدا، الزوراء (لێرە بە دواوە ئەنوسم زەورا) تەنیا ڕۆژنامە بوە کە لە بەغداد دەرچوە. دوای 1908 لە بەغداد چەندین ڕۆژنامە و گۆڤاری عەرەبی دەرچون. لە بەر ئەوە زەورا ماوەیەک هەمو نوسینەکانی کرد بە تورکی، زۆر لەوانەی تورکییان نەئەزانی و هەروەها نەتەوەپەرستەکانی عەرەب، نارەزاییان دەربڕی لەبەر ئەوە کرایەوە بە تورکی و عەرەبی.

### 4. 1. 1. نوسەرەکانی

یەکەم سەرنوسەری زەورا رۆژنامەوانی تورک ئەحمەد مەدحەت ئەفەنـدی بـوە. نوسـینەکانی زەورا بـە زۆری لە لایەن فەرمانبەرانی ولایەتەوە ئامادە کراوە لە بەر ئـەوە زۆر جـار نوسـینە عەرەبیـەکانی کـاڵوکرچ و پڕ لە هەڵە بون. هەندێ لە رۆژنامە عەرەبیەکانی ولایەتەکانی تر بە رەخنـەوە باسـی ئـەوەیان کـردوە کـە رۆژنامەیەک لە بەغدای شاری ئەدەبی عەرەبی دەربچێ و لەو ئاستە نزمەدا بێ، بۆیە کاربەدەستانی عوسـمانی هەوڵیان داوە نوسەرە عەرەبە ناسراوەکانی عیراق بخەنە گەڕ، لەوانە: ئەحمەد عیزەت پاشا، مەحمود ئـەلفاروقی موصلی، عەبدولحەمید و ئەحمەد و عەبدولمەجید ئەلشاوی، تەها ئەلشەواف، مەحمود شـوکری ئالوسـی، فـەهمی مودەڕیس.

لە رۆژنامەی زەورادا دەیان کەس فێری نوسین و رۆژنامەوانی بون.

### 4. 1. 2. بابەتەکانی

کاروباری ولایەت و قانون و هـەواڵی رەسـمی و بـەرائاتی سـوڵتانی و دەقـی پەیماننامـەکان و بەڵگـە و دەنگوباسی سەڵتەنەت و دەوڵـەتانی تـری بـڵاو ئـەکردەوە. هـەروەها وتـاری ئـەدەبی و باسـی کشـتوکاڵ و تەندروستی و بازرگانی...

### 4. 1. 3. هەواڵەکانی

زەورا نزیکـەی 48 سـاڵ لـە نێـوان (1869- 1917) حەفتانـە 2607 ژمـارەی بـە رێکـوپێکی تـا داگیرکرانی بەغداد لە لایەن لەشکری ئینگلیزەوە بەردەوام دەرچوە.

ئەو ماوەیە لە مێژوی کوردستانی عیراقدا بە تایبەتی دوای روخانی میرایەتیـە کوردیـەکانی بابـان و سۆران و بادینان، قۆناغێکی ئـاڵۆزی پـڕ لـە روداو و پشـێوی و شەڕوشـۆڕ بـوە. سـەرچاوەکان زۆر کـەم ئاگادری دەربارەی ئەم قۆناغە و ئەم ناوچەیە بە دەستەوە ئەدەن. بۆ نمونـە: عەشـیرەتی هەمەوەنـد لـە نێـوان کەرکوک– دیالە – کرماشان دا نائارامیەکی زۆری دروست کـردوە، سـەرەنجام دوای لەشکرکێشـی گـەورەی عوسمانی بە دیل گیراون و لە کوردسـتان دور خراونەتـەوە. بـەڵام پـاش ماوەیـەک هـەڵاتون و گەڕاونەتـەوە ناوچەکە. تا ئیستایش هەندێک لەم چیرۆکانە دەماودەم ئەگێڕنەوە، بەڵام بە نوسین شتێکی تۆمار کراو لە بەر دەس دا نیە.

عباس العزاوي لـە بەرگـەکانی 7 و 8 ی (تـاريخ العـراق بـين احتلالـين) دا رۆژنامـەی زەورا ی وەکـو سەرچاوەیەکی گرنگ و سەرەکی بۆ گێڕانەوەی روداوەکانی عیراق بە کار هێناوە. لە ناو ئـەوەدا چەردەیـەکی باش هەواڵی خێڵەکانی هەمەوەند، جاف، سنجاوی، کەلوڕ، فەیلی، هەورامان، یەزیدی... باس ئەکا. بـە داخـەوە ژمارەکانی زەورا لە بەر دەس دا نین تا پشت بە نوسینەکانی ئەو ببەستین، لە بەر ئەوە هەڵ ئەدەم هەواڵـەکان لە مێژوەکەی عەزاوی هەڵێنجم.

ژ 1 ی زەورا تەرخان کراوە بۆ بڵاوکردنەوەی فەرمانی سوڵتانی عوسمانی دەربارەی دانـانی مەدحـەت پاشا بە والی عیراق و، خوێندنەوەی ئەم فەرمانە لە دیوانی حکومەتیدا لە بەغداد و، وتاری مەدحەت پاشـا بـۆ سپاسی ئەم فەرمانە و بەرنامەی کاری داهاتوی لە عیراق دا. ئەم دو بابەتە بە هەردو زمانی تـورکی و عـەرەبی بڵاو کراونەتەوە. بەڵام وەکو عەزاوی نوسیوێتی تەرجومەی عەرەبی هـەردو بابـەت رەوان نـین و لاوازن. (7: 172)

## 4. 1. 3. 1. هەواڵی هەورامان

ژمارەکانی 5 و 6 و 7 و 12 ی مانگەکانی ڕەبیعی ئاخەر و جیمادی ئەوەلی 1286 ک هەواڵی ڕوداوەکانی هەورامان ئەگێڕنەوە. نوسیویانە:

هەورامان بەشێکی هی عیراق و ئەوی تری هی ئێرانە. لە خێڵە گرنگەکانی کوردن. بەشی ئێرانی سەر بە سەنەندوج (سنە) و بەشی عیراق تابیعی لیوای سلێمانی‌یە، لە شوێنێکی سەختی کوێرە ڕێ دایە.

هەمیشە لە شەڕ و کێشەدا بون لە گەڵ ئێران. ئەمیرێک لە ناو خۆیانا هەڵئەبژێرن پێی ئەڵێن سوڵتان. ساڵێ لەمەوپێش حاکمی سنە فەرهاد میرزا یەکێ لە سەرۆکەکانیانی، حەسەن سوڵتان، بانگ کرد لە خۆی نزیک خستەوە و بە فێڵ کوشتی. لە سەر ئەوە خێڵەکەی ڕاپەڕین و کوڕەکانی لە سەر ئەم دەستدرێژی‌یە خرۆشان. فەرهاد میرزا هێزێکی ناردە سەریان. ئەم خێڵە شەبەیخونیان کردن و زەرەری زۆریان لێ دان. ئەمە بو بە هۆی ئەوەی حکومەتی ئێران بایەخێکی گەورەیان پێ بدا و، هێز بنێرێتە سەریان سەرکوتیان بکا و تۆڵەی ئەو کارەیان لێ بکاتەوە.

ئەم هێزە گەمارۆی شاخەکەی‌دا بە نیازی ئەوەی جەزرەبەیەکی کوشندەیان تێ بسرەوێنێ، لەشکری ئێران هیچی پێ نەکرا. بەڵام حکومەتی ئێران ئارام نەبوەوە. هێشتا هەر لەشکر ئەنێری و هەڵئەکوتێتە سەریان کەچی هەر ژێر ئەکەون. ئەمجارەیان حکومەتی ئێران فەتاح بەگ و چەند کەسێکی کەی لێ کوشتون. عەشیرەتەکە بڵاوەیان لێ کردوە.. لەشکرێکی تری بە سەرکردایەتی کەریم خان لە ڕێگەی بازلەوە لە گەڵ سەربازی بانە و سەقزدا ناردە سەریان، بەڵام ئەم لەشکرە 8 یان لێ کوژرا. ئینجا حکومەت نزیکەی 5 هەزار کەسی بۆ قەمەر عەلی خان سازدا، شەڕێ لە دزڵی بو 6 سەعاتی خایاند 32 سەربازی ئێرانی کوژران و ژمارەیەکیشیان بریندار بون. هەورامی‌یەکان هەندێ چەکیان دەس کەوت و دەسیان گرت بە سەر عەرەبانەی تۆپ و تفاقی جەنگی‌دا.

هەواڵەکانی سلێمانی ئەمەیان گەیاندوە.

ئەم عەشیرەتە 20 هەزار کەس زیاترن. لە ناوچەیەکی شاخاوی سەخت دان، بەڵام لە تواناباندا نەبو بەرگری ئێران بکەن. نەیانتوانی لە ڕوی دەوڵەتی ئێراندا بوەستن.. دوای ئەوە هەواڵی شکانیان هات.

ئێران ویستی سەریان پێ دابنەوێنێ. بەربەرەکانی‌یان کرد بەڵام نەیانتوانی درێژە بە جەنگ بدەن، ئەگەرچی زەرەریان لە ئێرانیەکاندا. بە هۆی جیاوازی مەزهەبی‌یەوە ڕقێکی زۆریان لێ هەڵگرتبون و بە ڕەقی ڕەفتایان لە گەڵ کردن. ئێرانیەکان کە چونە ناو شاخەکانەوە هەوڵیاندا هەمویان بکوژن. دەستیان کرد بە سوتاندنی ئاواییەکانیان و بە شێوەیەکی ناشیرین کەوتنە کوشتنیان. دەستیان لە ماڵ و ژن یش نەپاراست.. دەست و قاچی هەندێکیان بڕی بون، کە ئەبو بە هۆی ترسان و نەفرەتی زیاتری خەڵک. ڕویان کردە عیراق. داوای دەخالەتیان کرد. سەرۆک و میرەکانیان سکاڵانامەیان نوسی حالی خۆیان و ئەو زوڵمەی لێیان کراوە، ڕون کردەوە.

دەوڵەتی عوسمانی پابەندی مافی دراوسێ‌یەتیە. ئەبێ چاودێری حالی هەردولا بکا بۆ ئەوەی وەکو پێویست خزمەتی خۆی بە جێ بێنێ. هەوڵی‌دا ڕێکیان بخاتەوە و لە یەکیان نزیک بکاتەوە. فەرمانی دا بە فەرمانبەرانی سنور مشوری ئەم بەرژەوەندی‌یە بخۆن.

ئیرانیەکان وەڵامی ئارەزوی دەوڵەتیان نەدایەوە، گوێیان نەدایە ویستی فەرمانبەرەکان، بگرە درێژەیان دا بە کوشتن و تاڵان و وێران کردن و، سوربون لە سەر لە ناوبردنیان. سەرۆک و میرەکانیان ڕویان کردە عیراق. بە دوی ئەوانیشدا خاووخێزان لە ماڵ و ژن و پەککەوتە هاتن. داوای یاریدە و، بە پەرۆش

و پاڕانەوە قبوڵی دەخالـەتیان کـرد سـەبارەت بـەو توندوتیژیـیـەی توشـی بـون. فەرمانبـەرەکان نـەیانتوانی ژمارەیەکی زۆر کـە 7 هـەزار کـەس ئـەبون رەت بکەنـەوە. دەخالەتەکـەیان قبـوڵ کـردن. حکومـەت بـەزەیی و دڵنەرمی بەرامبەر بەو نگبەتی‌یەی توشیان هات بو پیشاندا. لە هەندێ شوێنی سـلێمانی نیشـتەجێی کـردن و رێوشوێنی پاراستن و ژیاندنی بۆ دانان.

شا کاربەدەستی نارد کە رێگە نەدرێن بێنە عیراقەوە. هەروەها فەرمانێک یش لـە بـابی عالیـیـەوە بـەم مەبستە هات. بەڵام کە حکومەتی بەغداد کەوتە لێکۆڵینەوە زانی ئەمانە ئەهلی سوننە و شـافیعی مـەزەبن، کـە بوبو بە هۆی ناکۆکی و، ئێران ئەیچەوساندنەوە و تەنگی پێ هەڵئەچنین.

لە شوێنێکی ترا هەواڵەکە ژمارەی پەنابەرانی هەورامی بە 20 هەزار کـەس ئەخـەمڵێنێ..... حکومـەت ماوەی 3 مانگ دالدەی دان تا موافقەتی لێبوردنی گشتی لە حکومەتی ئێران بۆ وەرگرتن کە لە سـزا و ئـازار بیەخشرێن، جگە لە هەندێ لە سەرۆکەکانیان کە نەگەڕینەوە شوێنەکانی خۆیان بەڵکو لـە ئازەربایجـان یـا لـە جێگایەکی تر دابنیشن. (7: 183-186)

ئەم روداوەی هەورامان روداوێکی ناسراوە لە مێژوی هەوراماندا. مێژونوسەکانی ئەردەلان، وەکو یەکێ لە سەرکەوتنە گەورەکانی فەرهاد میرزا بە درێژی گێڕاویانەتەوە. (بۆ ئاگاداری زیاتر بڕوانە: علی اکبـر وقـائع نگار. نەوشیروان مستەفا: کورد و عەجەم)

### 4. 1. 3. 2. هەواڵی هەمەوەند

عەزاوی لـە زمـانی ژ 6 و 7 ی 10 و 17 ی رەبیعـی ئاخـەری 1286 ک زەورا نوسـیوێتی: ئـەڵێن هەمەوەند یا حەمەوەند، عەشیرەتێکی کوردیە بە ئازایەتی ناسراوە، چەندەها ساڵە رێگـە ئـەبڕێ و ئاسـایش تێـک ئـەدا، بـە جـۆرێ بـە نمونـە ئەیانهێننـەوە، رێ بـە رێبـوار ئـەگرن و هێمنـی ئەشـێوێنن. جـوامێر لـە سەرۆکەکانیانە، ئەڵێن فلان بوە بە جوامێر.

سێ سەد سوار یا چوارسەد بون بە هۆی شەڕەوە لەم ماوەیـەدا نزیکـەی حـەفتا یـا هەشـتا سـواریان ماوە. چونە ناوچەی زەهاو پەلاماری دەوروبەریان ئەدا. بە بیست یا سی کەس تـالان و راووڕوتیـان ئـەکرد، سەرۆکەکانیان: 1. محەمەد میکائیل 2. جوکل (جوامێر) 3. بەچە شیرین 4. بەچە ئەمین.

هۆزی محەمەد میکائیـل لـە ناوچـەی سـلێمانی حکومـەت لەشـکرێکی نـاردە سـەری. رەئیسـێک و دو سەربازیان لێ کوژرا و محەمەد میکائیل بریندار بو. کە لە ئێران گەڕایەوە مرد. بەڵام بەچە شیرین فیرقەیـەک عەسکەر تەعقیبی ئەکرد.

کێشەی کورد لە نێوان ئێران و عیـراق دا تـەواو نـەبو ئەوانـە هێشـتا ئاسـایش ئەشـێوێنن و سـنور هەراسان ئەکەن. ئەم کێشەیە، بە تایبەتی هەمەوەند، لە ناو ئەو بابەتانەدا بو کـە لـە نێـوان ئێـران و عیـراقدا وتوێژی لە سەر کرا.

ئەوانە کە حکومەت راویان ئەنێ رو ئەکەنە ئێران یـا ئەگـەر ئێـران راویـان بنـێ ئەگەڕینـەوە عیـراق و ئیتر بەمجۆرە...

ئەمە پاڵی بە عیراق و ئێرانەوە نا کە هیچیان دالـدەی جـەردەی ئـەوی تـر نـەدەن. وە ئەگـەر حکومەتێکیان راوی نان، ئەوی تریان ئەبێ یارمەتی بدا بۆ لەناوبردنیان یا بـۆ تـەمێ کردنیـان. ئـەم رێکەوتنە کارێکی باشی کردبوە سەر پێوەنـدی هـەردو دەوڵـەت. بـەڵام ئـەمیرە ئێرانی‌یـەکان نـەیان ئەویست ئاسایش جێگیر بێ و بەری بچننەوە. بەم چارەسەرە قایل نەبون لە سەر بیرورا کۆنـەکانیان مانەوە...

مەدحەت پاشا قەڵای لە سنورەکان و تەنگەکاندا دروست کرد. هێزێکی لێ دانا بۆ ڕێگـری لـەم جـۆرە کارانە. ئێران ئەوەی نەکرد. ئەم قەڵایانەی لە لای زەنگاباد دامەزران، ئـەمجارەیان دوان لـە هەمەوەنـد گیـران و ئەوانی تر رویان کردە ئێران قوتار بون.

هۆزی بەچە ئـەمین لـە لای خانەقینـەوە کـاروانێکی روت کـردەوە. ئەوانـە زانیـیان دوان لـە روتکراوەکان ئێرانی بون، شتە تاڵانکراوەکانیان بۆ گێڕانـەوە و، شـتومەکی عەرەبـەکانیان بـرد. کـە حکومەت ئەمەی بیست، بە هۆی تەلگرافەوە لە شارەبان (مقدادیە) و قزلرەبات (سعدیە) ئەوانە ون بون. چوار رۆژ دواتر عەسکەریان نێردرایە سەر تـا لـە خانـەقین و قزلرەبـات تـەعقیبیان بکـەن. هـەروەها سوارەی عەشایەر یش کرایە سەریان، گەمارۆیان دان و بو بە شەڕ لە بەینی هەردولادا. عەبدوڵا بـەگی سەرۆکی عەسکەری قزلرەبات لاقی بریندار و، سوەیلم لە عەشیرەتی رەبیعە گولەیەک بەر سنگی کەوت. عەسکەر سەرۆکەکەیان کە بەچە ئەمین بو لە گەڵ دو پیاویدا کوشت و، دوانی تریشی بە چەکەوە لـێ دەسگیر کردن کە محەمەد رەش و محەمەد ساڵح بون. عەسکەر 6 ئەسپی لێ گرتن. شتومەکی تاڵانکراو گیرایەوە و گیراوەکان رەوانەی دادگا کران.. دادگایی کران، دانیان نا بـە تاوانـەکانیاندا، بـە ئیعـدام حوکم دران. (7: 181-183).

لە کتێبەکانی عەزاویدا، لە زنجیرەی هەواڵەکانی خێڵـی هەمەوەنـدا دابـڕان هەیـە. دوا هـەواڵی بـەرگی حەوتەم هی ساڵی 1286 ک و، یەکەم هەواڵی بەرگی هەشتەم هی 1289 یە، واتە زیاتر لـە 3 سـاڵ دابـڕان هەیە و، شتێکی ئەوتۆ دەربارەی روداوەکانی ئەو رۆژگارە لە بەر دەس دا نیە.

ژ 256 ی 12 ی رەبیعی ئاخەری 1289 ک نوسـیوێتی: سـەرۆکی هەمەوەنـد فـەقێ قـادر تەسـلیمی حکومەت بو گەیشتە بەغداد. سەرۆکی عەشـیرەتی گـۆران عـەزیزوڵاخان لـە عەشـایەری ئێـران، بـەڵێنی داوە هەمەوەند تەسلیم بکا.(8: 12)

فەقێ قادر پیاوێکی زانا و رۆشنبیر و شاعیر بـوە. ماوەیـەکی زۆر لـە زینـداندا ماوەتـەوە و، هـەر لـە زیندانەوە دوای ئەوەی زۆری پیاوەکانی هەمەوەند بە دیل ئەگیرێن دور ئەخرێنەوە بۆ دەرەوەی کوردستان و، لە ئاوارەیی سەری ناوەتەوە و مردوە.

لە زینداندا چەندین کتێبی بە هۆنراوە نوسیوە. دیوانێکی شیعریشی هەیە. بەشێ لـە بەرهەمـەکانی لـە لایەن مەلا کەریمی مودەڕیسەوە ساغ و بڵاو کراوەتەوە.

ژ 811 ی 24 ی رەبیعی ئەوەلی 1296 ک نوسـیوێتی: هەمەوەنـد پـەلاماری سـامەڕای داوە. (8: 43)

ژ 860 ی 9 ی رەمەزانی 1296 نوسیوێتی: برای جوامێر لـە هەمەوەنـد و نـەجم عەبـدوڵا ئاغـا لـە بەیات کاروانێکیان لە رێگای قزلرەبات روت کردەوە.(8: 47)

ژ 1023 ی 9 ی رەجەبی 1299 و ژ 1024 ی 23 ی رەجەبی 1299 ک نوسیوێتی: هەمەوەند لە لیوای سلێمانیدا عەشیرەتێکی پچوکە. نفوسـی لـە چوارسـەد یـان پێنجسـەد تێپـەڕ ناکـات. هـەمویان فێـری جەردەیی و یاخیبون و تاڵان و راوورِوت بون. دەربەندی بازیانیان کردۆتە مەکۆی خۆیـان. ئەوانـە لـە کـاتی هێمنی یشیاندا ئارام دانانیشن و لە کاری خراپ ناپونگێنەوە. ئەگـەر دەوڵـەت بکەوێتـە تـەعقیبیان لـە ترسـا هەڵدێن. تێکرا بێ جیاوازی ئەکەونە تاڵان و راوورِوت.

حکومەت ئەگەر تەنگی پێ هەڵچنین رو ئەکەنە ئێران، وە ئەگەر هـەردو دەوڵـەتی عوسـمانی و ئێرانـی رێک کەوتن دەخالەت ئەکەن. دوای تەنگ پێ هەڵچنین دەخالەتیان بە وەکیلی والی موسڵ محەمەد مونیر پاشـا کرد. دەخالەتی لێ قبوڵ کردن. بەڵام وازیان نەهێنا لە پەلاماردانی دێهات و، تاڵان و کوشتن.

سەرۆکەکەیان جوکل لە گەڵ تاقمێ لە پیاوەکانی هەڵاتن و ئەوانی تریان وەکیلی والی وردوخاشی کردن. بەڵام ئەوانەیان لە کاتی تێپەڕیندا خراپەی زۆریان کرد، عەزیز خان و محەمەد خالید یش دایانە پاڵیان. ئینجا موشیر جەزرەبەیەکی تێ سرەواندن لەوەو پێش جەزرەبەی وایان نەخوارد بو. جوامێر هەڵات بۆ ئێران، حکومەت هەوڵی زۆری دا بۆ گرتنی.(8: 63-64)

ژ 1177 ی 10 ی زیلقەعیدەی 1301 ک نوسیوێتی: شەڕێ لە بەینی هەمەوەند و جبور و کەرەویدا لە لای مەندەلی (بەندەنیجین) روی داوە 3 کەسی تێدا کوژراوە. سەرۆکەکانی هەمەوەند ئەمانە بون: 1. بەچە چاوشین 2. مەحمودی خلەبزە 3. حەمەی مام سلێمان.(8: 72)

ژ 1183 ی 17 ی زیلحیجەی 1301 ک نوسیوێتی: حکومەت تەکلیفی ئەمیر لیوا محەمەد فازیل پاشا داغستانی کردوە، تەعقیبیان بکا.(8: 72)

ژ 1199 ی 26 ی رەبیعی ئەوەلی 1302 نوسیوێتی: مێژوی هەمەوەند پڕێتی لە دەستدرێژی، بگرە مێژوی دەستدرێژییە بۆ سەر خەڵک لە تاڵان و راوڕوت و کوشتن.(8: 75)

ژ 1310 و 1311 و 1312 ی 5 و 17 و 19 ی شەعبانی 1304 ک نوسیوێتی: سەدساڵە هیچ ئیشێکیان نیە جگە لە تاڵان و راووڕوت. دەوڵەت زۆر جار ویستویەتی تەمێیان بکا، نەیتوانیوە. چونکە لە جێگەیەکدا جێگیر نەبون. دەوڵەت هەرچەند زۆری بۆ هێناون رویان کردۆتە ئێران. لەو ماوەیەدا ناوچەکانی بازیان و قەرەداخیان شێواند بو. سەرکردە محەمەد فازیل پاشا داغستانی لە لای خانەقین دانرا. ئێران هاوکاری دەوڵەتی کرد حوسامولمولک ئەمیر تومان حاکمی کرماشانی نارد، تەنگیان بە جوامێری سەرۆکیان هەڵچنی. لە هۆزەکانی تریان، سەرۆکی سێتەبەسەر عەزیز کاکی و سەرۆکی رەشەوەند مەحمود حاجی خان، سەرکوت کران. زۆر لە پیاوە گەورەکانیان لە ناو بران. شەڕیان بەردەوام بو. ساڵی 1298 و 1301 قەوماوەکانیان دوبارە بونەوە. زواری ئێرانی‌یان روت کردەوە و، لە نزیک مەنسوریە (دەلی عەباس) بەریدیان تاڵان کرد. ئەم جۆرە کارانەیان لە ژماردن نەئەهات.(8: 84)

ژ 1310 ی 5 ی شەعبانی 1304 ک نوسیوێتی: لە سەرۆکەکانی هەمەوەند مەحمود خدر و جەماعەتەکەی دەخالەتیان بە خاوەن دەوڵەت ئیسماعیل پاشای مورافیقی سوڵتان کرد، کە لەو موشیرانە بو چاکسازی کەرکوکی پێ سپێردرا بو. خۆیان و چەکەکانیان دا بە دەستەوە.(8: 84)

### 4. 1. 3. 3. هەواڵی جاف

ژ 30 ی 9 ی شەوالی 1286 ک نوسیوێتی: گوڵعەنبەر، سەرۆکی عەشایەری جاف محەمەد بەگ دانرا بو بە قائیممەقامی گوڵعەنبەر. لەقەبی پاشا بە خۆی و روتبەی قەپۆچی باشی بە کوڕەکەی درا.(7: 228)

ژ 352 ی 5 ی رەبیعی ئاخەری 1290 ک نوسیوێتی: جاف لە ژێر سەرۆکایەتی محەمەد پاشای قائیممەقامی گولعەنبەردایە. بو بە ئەمیر لیوا. هەمو ساڵێ 8 کەسیان لێ وەرئەگیرا بۆ جەیش، لە سەردەمی مەدحەت پاشادا کرا بە 30 کەس. سەرۆکایەتی عەشیرەتەکانیان بە مەحمود بەگی کوڕی بەخشرا. میرەکانی جاف کە روتبەی دەوڵەتی‌یان درایە:

1. محەمەد پاشا کوڕی کەیخوسرەو بەگ، روتبەی ئەمیر لیوای وەرگرت.
2. مەحمود بەگ (کوڕی). دوای باوکی لەقەبی پاشای پێ درا.
3. بەهرام بەگ.
4. قادر بەگ.

5. عەزیز بەگ.
6. عوسمان بەگ کوڕی محەمەد پاشا.
7. سلێمان بەگ کوڕی محەمەد پاشا.
8 حەسەن بەگ کوڕی محەمەد پاشا.
9. محەمەد بەگ لە بەگزادە، واتە لە کوڕی میرەکان. (8: 20)

### 4. 1. 3. 4. هەواڵی یەزیدی

ژ 2 باسی پەلاماردانی یەزیدییەکانی شەنگاری نوسیوە.

گۆیا یەزیدییەکان پێنج شەش ساڵە لە حکومەت یاخی بون. لە چیاکان (ئەبێ مەبەستی چیای شـەنگار بێ. نم) عاسی بون. ناهێڵن بێگانە بچێتە ناویان. بە بـەروبومی چیاکـە ئـەژیان و نەیانئەهێشـت کەسـی کـە کەڵکی لێ وەربگرێ.

سەرەڕای ئەوەیش بە هێمنی لە شوێنەکانی خۆیاندا نەئەمانەوە. ئاسایشیان ئەشێوان و زەرەریـان بـە هاتوچۆکەران ئەگەیان. هەندێ قەساب چوبون مەڕ لە قەبیلەکانی شەمەر و عەنەزە بکڕن، کە گەیشتبونە نزیـک چیا توشی چەند یەزیدییەک بون. پێیان وتبون لە چیا مەڕی هـەرزانتر و باشـتری لێیـە، تـەماعی قـازانجی زۆرتریان خسـتبونە بـەر و بردبویـانن بـۆ شـاخەکە. لـەوێ کوشـتبویانن و هـەرچی دراوێکیـان پـێ بوبـو بردبویان.

ئەمە ڕێکەوتی هاتنی مەدحەت پاشای کرد بۆ موسڵ. لە روداوەکە ئاگادار بو. داوای لە یەزیدییـەکان کـرد ناوی بکوژەکان دیاری بکەن و تەسلیمی حکومەتیان بکەن. نـەیان کـرد. لـە بـەر ئـەوە بـە پێویسـتی زانـی کـە حکومەت ئاوڕ لەمە بداتەوە، بە هەر جۆرێ بێ ڕێوشوێنی گرتنـی تاوانکارەکـان دابنـێ و، ئـەو جـۆرە ئەشـرارە تەمێ بکەن.

دەسبەجێ عەسکەری موسڵ و ماردین و شارەزور کۆبونەوە. بون بە 3 فەوج و، 2 سـریە سـوارە و، 4 تۆپ و، چەردەیەک سەربازی گیراو. خرانە ژێر فـەرمانی ئەحمـەد بـەگی زەعیمـی موسـڵ لـە گـەڵ زیـا پاشـا موتەسەریفی لیوای موسڵ. فەمانیا پێ درا برۆن بۆ شەنگار و، ئامۆژگاری پێویست کران.

کە لەشکر گەیشتە شەنگار، یەزیدییەکان پەشۆکان. کشانە دواوە بۆ ناوچە سەختەکان کە ڕێگـە نـەبو بچنـە سەریان. وایان ئەزانی عەسکەر پەلاماریان ئەدا کەلوپـەلیان تـالان ئـەکا و ئـەیانکوژێ و کشـتوکاڵەکەیان ئەسـوتێنێ و دەس ئەگرێ بە سەر ئافرەتەکانیاندا... بەڵام زۆری پێ نـەچو زانییـان مەبەسـت پیاوخراپـە بکوژەکـانن، تێیـان گەیەنرا مەبەست بکوژە یاخیەکانن و هیچی تر. هێنایانن و هەر ئەوان دەسـگیر کـران و، خەڵکەکـەش بـۆ دەخالـەت هاتبون. تەنیا تاوانکارەکانیان گرت. بە گوێرەی ئامۆژگاری بـە پـێی قورعـە جەماعـەتێ لـە خـەڵکی چیـا کـران بـە عەسکەر و، ئەو پارەیەی حکومەت کە لە سەریان کەڵەکە بوبو لێیان سێنرا. (7: 172-174)

### 4. 1. 3. 5. هەواڵی جۆراوجۆر

ژ 1420 ی 29 ی جیمادی ئاخەری 1307 ک: هەواڵی دامەزراندنی چاپخانەی لە ولایەتی بەسـرا و، دەرچونی جەریدەی (البصرة) ی بە عەرەبی و تورکی و، گەیشتنی یەکەمین ژمارەی بە بەغداد بڵاو کردۆتـەوە. خاوەنی ئیمتیاز ئەدیب و نوسەر پایەبەرز محەمەد عەلی ئەفەندی مومەیزی محاسەبەی ولایەتی بەسرا بوە.

**هەندێ تێبینی:**

1. بۆ نوسینی ئەم باسە کەڵک لەم سەرچاوانە وەرگیراوە:

1.1. عباس العزاوي، تاريخ العراق بين احتلالين، ج7، بغداد 1955. ج8، بغداد 1956.

2.1. سامي رفائيل بطي (اعداد)، صحافة العراق، مكتبة رفائيل بطي، بغداد 1985. الجزء الاول. (ئەم سەرچاوەیە بریتیيە لە (مجموعة أحاديث ألقاها رفائيل بطي من اناعة بغداد سنة 1945). بەڵام ئیشارەتی تێدا نیە بۆ هیچ سەرچاوەیەکی گرنگ)

3.1. السيد عبدالرزاق الحسني، تاريخ الصحافة العراقية،

2. (مكتبة المتحف العراقي) ژمارەی یەکەمی زەورای هەبو. رۆژنامەی الجمهوريەی بەغدادی بە بۆنەی یادی سەدساڵەی رۆژنامەوانیی عیراق (1869– 1969) سەرلەنوێ کۆپی زەورای وەکو پاشکۆی تایبەتی ژ 471 ی رۆژی 15 ی 6 ی 1969 ی الجمهورية چاپ کردۆتەوە.

## 5. ڕاگەیاندنی بیستراو بە کوردی (1939– 1958)

تا ساڵی 1939 ڕاگەیاندن بە زمانی کوردی هەر خوێنراو (بە نوسین و خوێندنەوە) بو. لەوە بە دواوە لە پاڵ ڕاگەیاندنی خوێنراودا بیستراو (گوتن و بیستن) یش پەیدا بو. ئەگەر ڕاگەیاندنی خوێنراو بە دەزگای چاپ ئامادە ئەکرا و، تەنیا ئەوەی خوێندەواری هەبو ئەیتوانی بیخوێنێتەوە و کەڵکی لێ وەربگرێ، ئەوا ڕاگەیاندنی بیستراو پێویستی بە خوێندەواری نەبو. لە ڕادیۆ بڵاو ئەکرایەوە و بە گوێ لێ گرتن کەڵکی لێ وەر ئەگیرا. نەخوێندەوار یش وەکو خوێندەوار و نابینا یش وەکو بینا ئەیانتوانی کەڵکی لێ وەر بگرن.

لە سیەکانی سەدەی بیستەمدا کەم جێگای کوردستان کارەبای هەبوە و، کەم کەس خاوەنی ڕادیۆ بوە. ڕادیۆ هەندێکی بە کارەبا و هەندێکی بە پاتری کاری ئەکرد. تەنیا دەوڵەمەندەکان ئەیانتوانی ڕادیۆیان هەبێ.

عەلادین سوجادی باسی هێنانی یەکەم ڕادیۆ بۆ سلێمانی، بەمجۆرە ئەگێڕێتەوە:

"ساڵی 1932 بو بۆ یەکەمجار و یەکەم ڕادیۆ هاتە شاری سولەیمانی. ئەو چاخانەیە کە پێیان ئەوت چاخانەی (حەمە ڕەق) و شوێنەکەی لەم لا ئەسحابە سپی و لە سەر بازاڕی کورتاندروەکان بو، جادەکەی مەڵکەندی لە سەرەوە ئەهات بە بەر دەمیا و ئەچو بۆ ناو بازاڕ. لە دوایی‌دا ماوەیەکیش ئەو چاخانەیە مەجۆلی خامەی بە سەرەوە بو.

"جا خاوەنی ئەو چاخانەیە یەکەم کەس بو کە ڕادیۆی هێنایە شاری سولەیمانی و لە چاخانەکەی خۆیا داینا، لەو سەردەمەدا ڕادیۆ، وە یا بڵێین ئیستگەی ڕادیۆ هەر بە ئێواران ئیشی ئەکرد. هەرا کەوتە سولەیمانیەوە کە شتێک هاتوە قسە ئەکا و لە ڕواڵەتا هیچ زەلامیش نیە.

"هەر لە پاش بانگی شێوانەوە پیاوانی سولەیمانی لە مەڵکەندی و سەرشەقام، کانێسکان و سابونکەران، دەرگەزێن و گۆیژەوە بۆی ئەکشان بۆ ئەو چاخانەیە بۆ سەیرکردنی ئەم مۆجزەیە کە هاتوە، سا کێ پیاو بوایە زوتر بچوایە جێگای خۆی بگرتایە! نە کورسی چاخانە جێ ئەبوەوە، نە سەر ئەرزەکە جێ ئەبوەوە، ئێتقی ئەدایەوە بۆ سەر جادەکە دەرزیت هەڵخستایە نەئەکەوتە زەوی.

"مۆجزە (مەبەستی موعجیزەیە. نم) ئەکەوتە کار و بە زمانی عەرەبی قسەی ئەکرد، خۆ کەس لێی تێ نەئەگەیشت بەڵام دەنگێکی لێوە ئەهات، خەڵکەکە لەوە واقیان وڕ مابو کە ئەم دەنگە چیە لەو دارە ڕەقوتەقەوە! یەکێ ئەیوت زەلامە لە ناویا قسە ئەکا، یەکێ ئەیوت ئەمە سیحر و جادوە، زۆریش لە سەر ئەوە بون کە ئەو

قسەیە (میل) ە سورەکە ئەیکا. ئەوە ئیستە من ئەڵێم میل ئەگینا ئەو وەختە بە میل ناو نەئەبرا بەڵکو بە (ماسی) ناویان ئەبرد. ئاخر بڕیاری زۆرتری خەڵک هاتە سەر ئەوە کە ئەو دەنگە دەنگی ئەو ماسیە سورەیە و ئەو ماسیە قسە ئەکا. ئەگەر لە ئێمەش ئەپرسی ئێمەمانان لە سەر جادەکەش جێگامان نەئەبوەوە."(عەلادین سجادی، ڕشتەی مرواری، بەرگی پێنجەم، چاپخانەی مەعارف، بەغداد، 1972. ل 76 – 77)

ئەم گێڕانەوەیەی سوجادی، بیرەوەری خۆی بێ یان لە خەڵکی بیست بێ، پێ ئەچێ (موبالەغەی) تێ دا بێ.

پێش ئەو ساڵە بە چەندین ساڵ گرامەفۆن لە سلێمانی و لە زۆر شوێنی کوردستان دا، لە ماڵان و لە چایخانەکان دا، هەبوە. تەنانەت قەوانی تۆمارکراوی هەندێ لە گۆرانیبێژە ناودارەکانی عەرەب و کورد لە ناو خەڵکدا بڵاو بوە.

ژیان لە 1926 دا لە ژێر سەرناوی (پیانۆ) نوسیوێتی:

"صندوقێکی غرامۆفۆن کە بۆ مەنفەعەتی مەکتەب خرا بوە پیانۆوە ڕۆژی جومعەی ڕابوردو لە بینای جەمعیەتی زانستی دا بلیتەکانی ڕاکێشرا، لە نەتیجەدا بە ناوی مەئمورماڵی سورداشی شیمالی جەنابی حەمەکاکەوە دەرچو." (ژیان، ژ 38، 21 ی تشرینی ئەوەلی 1926)

لە ژمارەیەکی تری 1929 دا بە ناونیشانی (لە ڕیاسەتی بەلەدیەوە: ئیعلان) ئەم ئاگاداریەی بڵاو کردۆتەوە:

"بۆ لێدانی غرامۆفۆن لە جێگایانی عمومی دا وەکو چایخانە و ئەمسالی لە تەرەف مەجلیسی بەلەدیەوە بە شەو لە سەعات یەکی عەرەبیەوە هەتا سەعات چواری عەرەبی مودەت تەعین کراوە بە شەرتێ کە ریعایەت بە شەعائیری دینیە لە وەقتی هەمو بانگێک دا بە قەدەر نیو سەعات لێدانی غرامۆفۆن تەعتیل بکرێ هەرکەسێ خیلافی ئەم ئیعلانە حەرەکەت بکات و خاریجی ئەو میعادە کە دانراوە غرامۆفۆن لێ بدا بە پێی مادەی 126 ی قانونی عقوباتی بەغدادی تەجزیە ئەکرێ. بۆ ئاگاداری ئیعلان کرا."(ژیان، ژ 202، 7 ی تشرینی یەکەمی 1929)

خەڵکی جێگایەک بە گرامەفۆن ئەوەندە ئاشنا بوبن، ناشێ ڕادیۆیان ئەوەندە پێ سەیر بوبێ.

ڕۆژنامەی ژیان لە هەمان ساڵی 1932 دا ڕیپۆرتاجێکی بڵاو کردۆتەوە دەربارەی دانانی ڕادیۆیەک لە چاخانەی بەلەدیەی سلێمانی بۆ ئەوەی گوێ لە وتاری مەلیک فەیسەل بگرن. ڕیپۆرتاجەکەی کە پێش نوسینەکەی ڕشتەی مرواری بە 40 ساڵ بڵاوکراوەتەوە، ڕوداوەکە بەم شێوەیە ئەگێڕێتەوە:

"داخلی

"ئیستیماعی نوتق بە ڕادیۆ

"ئەمساڵ تەشریف هێنانی جەلالەتی مەلیکی عیراق بۆ سلێمانی، وەک کەوکەبەی سلێمانی، زینەتی جاویدانی هانی، نوتقەکەی ئێرەی بو بە ڕابیتەیەکی ڕوحانی.

"لەم بەینەدا کە وتیان لە مەعرەزی عاسیمەدا ئیرادی نوتق ئەفەرمون، بەو ڕابیتەیەوە هەمو مەملەکەت دەیویست شەرەفیابی ئیستیماعی ئەو نوتقە بێ و، بۆ تەئمینی ئەم ئارەزوی عمومیە و بۆ تەئیدی ئەو ڕابیتەیە، موتەسەریف وەکو تەهیەی ئەساسی کرد بو، تەهیەی ئەسبابیشی کرد. موستەعجەلەن لە گەڵ ڕەئیسی تازەی بەلەدیەدا، ڕادیۆیان زو بە زو وەک ڕادیۆ گەیاندە ئێرە و، لە عەینی ئەو شوێنە کە بیلزات جەلالەتی مەلیک ئیرادی نوتقی تیا فەرمو بو ڕادیۆ نەسب کرا و، لە شەرەفی ئەو نوتقە مەحروم نەماین. چایخانەی بەلەدیە بە عەینی تەزیینات ڕازابوەوە و، نەشیدی دڵپەسەندی منداڵانی مەکتەب لە گەڵ تەعزیماتی میلەت، تەقدیری قەدر و قیمەتی ئەو شەرەفەی دەنواند."(ژیان، ژ 318، 7 ی نیسانی 1932)

دوای گەیشتنی کارەبا ئیتر رادیۆش بڵاو بۆتەوە. جگە لە رادیۆی کارەبایی رادیۆی پاتری یش پەیدا بوە.

نیشتمان لە شیعرێکی بێ ناو و بێ سەرناودا لە سەر گرنگی رادیۆ ئەڵێ:

گوێ بگرە لە رادیۆ کە بە یەک سانیە دێنێ

باس و خەبەری لەندەن و پاریس و لەهستان(نیشتمان، ژ 1، ل 20)

### 5. 1. بەشی کوردیی رادیۆی بەغداد (بەغداد 1939)

بەرنامەی کوردیی رادیۆی بەغدا، بە پێی لێکۆڵینەوەی کەمال رەئووف محەمەد، رۆژی یەکشەممەی رێکەوتی 19 تشرینی دوەمی 1939 بۆ یەکەمین جار بە 10 - 15 دەقەی رۆژانە دەستی پێکردووە. (کەمال رەئووف محەمەد: هونەری درامای رادیۆیی کوردی، سلێمانی 2000، ل6)

ئەم بەرنامە کوردیە لەو ساوە، بێ راوەستان، بەردەوامە.

ژ 52 ی ساڵی 3 ی 30 تیرمەهی 1945 ی (رۆژا نو) دەربارەی ئەم رادیۆیە نوسیویێتی:

"لە بەغداد

هەمو رۆژێ پاش نیوەرۆ لە سەعات 4 دەس پێ دەکا تا سەعات 5 دەوام ئەکا.

درێژایی شەپۆلەکانی: 42 مەتر و 37 سانتیمەتر، شەپۆلی کورت."

بەشی کوردی سەرەتا 15 دەقیقە بوە بەڵام ساڵ لە دوای ساڵ زیادی کردوە. یەکەمین رادیۆ بوە بە زمانی کوردی بەرنامە بڵاو بکاتەوە. سەرەڕای گۆڕانی هەلومەرجی سیاسی ناوخۆی عیراق بەرنامەی کوردی رادیۆی بەغداد بێ وەستان بەردەوام بوە.

ئیستگەی رادیۆی بەغداد جگە لە بەرنامە رادیۆییەکانی، گۆڤاری (هنا بغداد – ئێرە بەغدادە) یشی بڵاو کردۆتەوە، کە گۆڤارێکی مانگانەی گشتی بوە. (مديرية التوجيه والاذاعة العامة) بە عەرەبی و کوردی لە بەغداد لە 1950 تا 14 ی تەموزی 1958 بڵاوی کردۆتەوە. کات و ناونیشانی بابەتی بەرنامە کوردییەکانی ئەو مانگەی رادیۆی تێدا بڵاو کراوەتەوە. هەندێ جار شیعر و وتاریشی بڵاو کردۆتەوە.

بەشی کوردی ئیستگەی رادیۆی بەغداد، بە درێژایی دەیان ساڵ پەخش، بەشداریەکی کاریگەری کردوە لە بوارە جیاوازەکانی رۆشنبیریی کوردیدا، وەکو:

بڵاوکردنەوەی دەنگوباسی عیراق و جیهان

تۆمارکردنی گۆرانی و مۆسیقای دەنگخۆشەکانی کورد

چیرۆکی شانۆ

شیعر و ئەدەب

تەفسیری قورئان

رادیۆی بەغداد دەیان گۆرانیبێژی کوردی بە گوێگرەکانی ناساندوە:

لە پیاوانی گۆرانیبێژ: عەلی مەردان، عارف جەزراوی، حەسەن جەزراوی، تایەر تۆفیق، رەسول گەردی، حەسەن زیرەک، کاویس ئاغا، مەلا کەریم، سەید عەلی ئەسغەری کوردستانی، سێوە...

لە ژنانی گۆرانیبێژ: دایکی جەمال، مریەم خان، نازدار و ئەسمەر فەرهاد، نەسرین شیروان...

رەنگە لە ئارشیفی ئەم رادیۆیەدا بە سەدان گۆرانی خۆشی کوردی هەبن کە گوێگری ئیستا نەیانناسن لەوانە: مەلا برایمی حەزین، ساڵح کارگەچی، تالیب...

رادیۆی بەغداد دەیان چیرۆکی شانۆیی کوردی و تەرجومەکراوی پێشکەشی گوێگرەکانی کردوە.

### 5. 2. **ڕادیۆی کوردستان لە یافا** (1942 – 1944)

حکومەتی بریتانیا لە ساڵانی دوەمین جەنگی جیهانیدا بایەخێکی زۆری داوە بە پڕۆپاگاندە بە زمانەکانی گەلانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست. بە ڕێگەی ڕاگەیاندنی خوێنراو (چاپەمەنی) و، بیستراو (ڕادیۆ) و، بینراو (فلیمی سینەمایی).

بە زمانی کوردی یش پڕۆپاگاندەی جەنگی کردوە:

لە بەغداد کۆمەڵێ چاپکراوی بڵاو کردۆتەوە لەوانە دەنگی گیتیی تازە.

لە هەندێ لە شارەکانی کوردستان دا بە سینەمای گەڕۆک فیلمی پیشان داوە.

لە شاری یافای فەلەستین کە (ئیستگەی ڕادیۆی ڕۆژهەڵاتی نزیک)ی لێ دامەزراندوە بەشێکی بە کوردی بە ناوی (ڕادیۆی کوردستان) کەوتۆتە پەخشی بەرنامەی کوردی. کاری ئەم ڕادیۆیە بەشێ بو لە پڕۆپاگاندەی جەنگی ئینگلیز و هاوپەیمانەکانی دژی ئەڵمانیای نازی.

بەرنامەی کوردی ڕادیۆی کوردستان لە ئابی 1942 تا کۆتایی 1944 بەردەوام بوە. کاربەدەستانی ئینگلیز لە بەغداد، گۆران، ڕەفیق چالاک، ڕەمزی قەزاز، کە 3 شاعیر و نوسەری کوردستانی عیراق بون، هەڵبژاردوە بۆ ئەم کارە. هەر سێکیان بردون بۆ شاری یافا لە فەلەستین، کە ئەو کاتە لە ژێر ئینتیدابی بریتانیدا بوە. لەوێ بەرنامەکانیان بڵاو کردۆتەوە. بە تەواوبونی جەنگ ئەمیش ڕاوەستاوە.

ڕۆشنبیران و هێزە سیاسییەکانی کورد بە جۆری جیاواز پێشوازییان لەم ڕادیۆیە کردوە.

نیشتمان، بڵاوکەرەوەی بیری ژ. ک. لە ژ 3– 4 ی کانونی دوەمی 1944 لە ژێر سەرناوی: (ئیستگەی ڕادیۆی کوردستان) دا نوسیوێتی:

"ئەم چەند خواهیشتەمان لە گەڕێنەندە و کاربەدەستانی ئیستگە هەیە و تکای پێکهێنانیان ئەکەین.

"شەپۆلی 37 مەترونیوی چاک کار ناکات بگۆڕدرێ باشە.

"لە بەشی زۆری شارەکانی کوردستانا بروسکە (بروسکە تەرجومەی برقی فارسییە. مەبەستی کارەبایە. نم) بە ڕۆژ کار ناکا بەرنامەکان بخرێنە سەعاتێکی وا کە لە هەمو کوردستانا ڕۆژ ئاوا بوبێت.

"ئەگەر هیچ بەرهەڵست و پێشگرێک نەبێ لە سەرەتای هەمو بەرنامەکانا، دەنا هەفتەی دو جار مارشی کوردستان لێ بدرێ.

"ڕۆژنامەیەک بە ناوی (ڕۆژنامەی ئیستگەی ڕادیۆی کوردستان) هەفتەی جارێک دەربهێنرێ و بڵاوکراوەکانی هەفتەیی تێدا بنوسرێت.

"مۆسیقای بێ دەنگ و قەوانەکان کە لێ دەدرێن ئارەزوی دڵی هەمو گوێگرەکان پێک ناهێنن. مۆسیقای بە دەنگ و قەوانی لە هەمو ڕەنگیان بۆ لێ بدەن و بەین بەینە قەوانەکان بگۆڕن.

ا/ ل. ب ئیدارەخانەی کۆواری نیشتمان"(نیشتمان، ژ 3-4، ل 3)

(دەمی ڕاپەڕینە) کە سرودێکی شۆڕشگێڕانەی پڕ جۆش و خرۆش بوە، نیشتمان لە ژ 2 دا کە بڵاوی کردۆتەوە، ئیشارەتی بەوە داوە لە (ئیستگەی ڕادیۆی کوردستان) وەری گرتوە. دەمی ڕاپەڕینە شیعری گۆران و ئاوازی ڕەفیق چالاک بوە.

عەلادین سوجادی کە ئەو سەردەمە مدیری ئیدارەی گۆڤاری گەلاوێژ بوە لە بەغداد، گفتوگۆیەکی خۆی لە گەڵ ئەدمۆنس ئەگێڕێتەوە. دەربارەی ڕادیۆی کوردستان بیروبۆچونێکی جیاوازی لە هی نیشتمان هەبوە. نوسیوێتی:

"ساڵی 1942 ڕۆژی 6 ی مانگی ئاغستۆسی ئەو ساڵەیە. دیارە ئەو ساڵانە من خەریکی کاروباری نوسینی گۆڤاری گەلاوێژ بوم کە لە بەغدا دەرئەچو. شەڕە گەورەکەی جیهانی دوەمیش لە ساڵی 1939 دا

هەڵگیرسا بو. دنیا هەمو بوبو بە ئاژاوە. ئینگلیزەکان ئیستگەیەکی کوردییان بۆ پرۆپاگەندەی خۆیان لە یافا دانا بو. لە عیراق عەبدولا گۆران، رەمزی قەزاز و رەفیق چالاک یان نارد بو بۆ یافا کە کاروباری ئەو ئیستگەیە هەڵسورێنن، بە راستی ئیستگەش لەو رۆژانەدا گڤەی ئەهات."

سەجادی ئینجا باس ئەکا کە بۆ کاروباری گەلاوێژ چوە بۆ (مدیریەتی دعایەی عامە) لە وەزارەتی داخلیە. لەوێ بە رێکەوت توشی ئەدمۆنس ئەبێ. ئەدمۆنس داوای لێ ئەکا پاش تەواوبونی کارەکەی سەری لێ بدا. سەجادی سەردانەکەی و گفتوگۆکەی بەمجۆرە ئەگێرێتەوە:

"هەر کە چومە ژورەوە ئەدمۆنس هەستا و هات بە پێشوازمەوە، زۆر بە گەرموگوڕی دەستی کرد بە قسەکردن و لە زەنگەکەی دا، کابرای سکرتێر هاتە ژورەوە، ئەدمۆنس پێی وت چا و قاوەمان بۆ بێنن و کەسیش ئیتر نەیەتە ژورەوە. دو بە دو ماینەوە.

"پاشان وتی: ئەوا ئێمە لە یافا ئیستگەیەکمان بە زمانی کوردی بۆ ئێوە داناوە، دیارە ئەم ئیستگەیە خزمەتێکی چاک ئەکا بە زمانی کوردی، بە تایبەتی ئەو کەسانەش کە لە سەرین ئێمە بڕوامان پێیانە کە خزمەتێکی باش ئەکەن بە زمانەکەتان. ماوەیەکە ئەمەوێ چاوم پێت بکەوێ لەم روەوە پرسیارێکت لێ بکەم، ئەوا ئیستە باش بو رێ کەوت. لەو کاتەدا دو قاوەیان بۆ هێناین و پیاوەکە چوەوە دەرەوە. وتم: فەرمو!

"وتی: پرسیارەکە ئەبێ بە دو پرسیار. یەکەم، بیروباوەڕی کوردەکان چیە بەرانبەر بەم ئیستگەیە کە ئێمە دامانناوە؟ دوەم، بیروباوەڕی خۆت چیە لەم روەوە؟

"وتم: میستەر ئەدمۆنس بە لامەوە زۆر سەیرە ئەم پرسیارە کە تۆ لە منی ئەکەی. من چیم تا وەڵامی تۆ بدەمەوە.

"وتی: وا مەڵێ! تۆ گۆڤارێکی وەکو گەلاوێژت لە بەر دەستایە، بە حوکمی رۆژنامەچێتی هەڵسوکەوت لە گەڵ هەمو جۆرە کەسێکا ئەکەی بە تایبەتی خوێندەوارانی کورد، کەم کەس هەیە وەکو خاوەن گۆڤار و رۆژنامە پەیوەندی لە گەڵ خەڵکا هەبێت.

"وتم: میستەر ئەدمۆنس تکات لێ ئەکەم ئەم پرسیارە لە یەکێکی تری بکە!

"وتی: هەر لە تۆی ئەکەم، چونکە کەم کەس هەیە بە ئەندازەی تۆ لە گەڵ خەڵکا بێت.

"وتم: تکا ئەکەم وازم لێ بێنە!

"وتی: نابێ.

"وتم: میستەر ئەدمۆنس خەڵکی چی؟ ئەم خەڵکە تۆ ئەیانبینی دو بەشن: بەشێکیان هەر لە هیچ تێ ناگەن تەنها لە کاروباری تایبەتی خۆیان نەبێ، لە (ساحب) بەولاوە هیچی تر نازانن. بەشەکەی تریشیان کە دێنە لای یەکێکی وەکو جەنابت ئەڵێن (ساحیب) کە چونە دەرەوە جنێوتان ئەدەنێ.

"فڵانی هەر کە ئەوەم وت رەنگێکی هێنا و بردی، ئەو رومەتە گەش و سورەی وەکو لیمۆی زەرد هەڵگەڕا و هەتا بەینێک قسەی هەر پێ نەکرا. راستی منیش لە قسەکانم تۆزێ پەشیمان بومەوە.

"پاشان هاتەوە قسە و وتی: باشە باوەڕی خۆتم پێ بڵێ!

"وتم: میستەر ئەدمۆنس راستی باوەڕی من ئەوەیە، تا ئیشتان هەیە ئەم ئیستگەیە ئیش ئەکات، کە ئیشتان نەما ئیستگەکەش نامێنێ.

"وتی: مامۆستا چۆن شتی وا ئەبێ؟

"وتم: وەڵا ئەمە باوەڕی منە و تۆیش زۆرم لێ ئەکەی بۆ قسە کردن.

"بەڵام ئەوا هەستیش ئەکەم کە گەرموگوڕیەکەی نەماوە و لە دڵا زۆر پڕە.

"زەمان هێنای و بردی، لە مایسی 1945 دا شەڕ دوایی هات، دوای ئەوە ئیستگەی کوردی یافا کەوتە کز بون، زۆری پێ نەچو گۆران هاتەوە، پاش بەینێکی تر رەمزی قەزازیش هاتەوە، دواچۆڕ رەفیق چالاک گەڕایەوە و ئیستگە بە تەواوی سەری تیا چو. عەبدولاّ بەگ کە هەر هاتەوە کەوتە دەردەدڵ کردن کە چۆن هەر لە گەڵ دوایی هاتنی شەڕیان بلاّو کردەوە ئیتر لە گەڵ ئەوانیشا کەوتنە لوت و پوت.

"ڕێکەوت زۆر سەیرە. لە پاش چەند ساڵ و لە پاش دوایی هاتنی جەنگ و لە پاش نەمانی ئیستگەی کوردیی یافا، ڕۆژێکی تر هەر لە داخلیەوە، هەر لە هەمان شوێنی سەر قاڵدرمەدا توشی ئەدمۆنس بومەوە، من دەستپێشکەریم کرد، لە پاش چاکوچۆنی دەستم بۆ ریشە بێ ریشەکەم برد و وتم: ها میستەر ئەدمۆنس چیمان وت؟

"وتی: ئەی بێ قەزا بی مامۆستا ئەمە سیاسەتە!

"منیش وتم: بەڵێ ئاخر منیش ئەموت سیاسەتە.

"ئیتر لە یەک جیا بوینەوە، ئەو سەرەوخوار و من سەرەوژور بوینەوە."(عەلادین سجادی، رشتەی مرواری، بەرگی شەشەم، چاپخانەی مەعارف، بەغداد، 1978. ل 123 – 127)

## 5. 3. **ڕادیۆی کوردستان لە مەهاباد** (1946)

رۆژنامەی کوردستان ریپۆرتاجێکی بە ناونیشانی (کوردستان قسان دەکا) بەمجۆرە بلاّو کردۆتەوە:

"رۆژی سێشەمو 10 ی بانەمەڕی 1325 ئیستاسیۆنی رادیۆی مەهاباد، پایتەختی حکومەتی میللی کوردستان، دە گەڵ 5 دەستگا بڵیندگۆ کە: (1. لە حەوشی کانگای حیزبی دیمۆکرات. 2. لە پێشەمەرگەخانە. 3. روبەڕوی شارەوانی. 4. روبەڕوی خانوی حەزرەتی پێشەوا. 5. روبەڕوی مزگەوتی عەباس ئاغا نەسب کران) دانرا و، رەسمەن کرایەوە و جێژنێکی جوان گیرا بو.

"لەم جێژنەدا جەنابی حاجی سەید باباشێخ، رەئیسی هەیئەتی رەئیسەی میللی کوردستان و ئەندامەکانی کۆمیتەی مەرکەزی و کاربەدەستانی حیزبی دیمۆکراتی کوردستان و ژمارەیەکی زۆر لە ئاغایانی دەرەوە و ریجال و موحتەرەمینی شاری مەهاباد حزوریان بو.

"لە ساتی 4 ی پاش نیوەڕۆ ئاغای سەید محەمەد تەهازادە معاونی حیزبی دیمۆکرات جەلەسەی دەست پێ کرد و لە تەرەقیاتی و پێشکەوتنە... لە ئیتیحادی جەماهیری شورەویدا بەیاناتێکی چاکی کرد.

"پاش ئەو جەنابی حاجی سەید باباشێخ لە لایەن هەیئەتی رەئیسەی میللی، ئاغای محەمەد ئەفەندی لە لایەن ژەنەڕال مەلا مستەفا بارزانی، جەنابی قازی محەمەد لە لایەن کۆمیتەی لکی بۆکان، ئاغای سەلاح لە لایەن هێزی کوردستان، ئاغای عەلی خوسرەوی لە لایەن ئیتیحادیەی جەوانان، ئاغای دڵشادی رەسولی لە لایەن کۆمیتەی ناوەندی، ئاغای ئەحمەدی ئیلاهی لە لایەن زەحمەتکێشان و جوتێرانی کوردستان، ئاغای کوڕی کورد لە لایەن مەدرەسەی کوڕان، ئاغای حەسەنی داودی لە لایەن بازرگانان، ئاغای مایۆر عەلیزادە (هێنەری چتەکان) لە لایەن دەوڵەتی باشەهامەتی ئیتیحادی شورەوی، ئەیەزەن ئاغای دڵشادی رەسولی لە لایەن وەزارەتی فەرهەنگ، لە بەرانبەر میکرۆفۆن وتاری زۆر بە تینیان خوێندەوە و مەراتیبی سوپاسگوزاری خۆیان نیسبەت بە ئیتیحادی جەماهیری شورەوی کە ئیستاسیۆنی رادیۆ دەگەڵ پێداویستەکانی و، دەگەڵ یەک دەستگا ماشینی سینەمای سەیار یان بە نێوی ئەنجومەنی رەوابیتی فەرهەنگی بە کوردستان بەخشیوە، بە جێ هێنا.

"پاشان ئاغای سەید محەمەدی تەهازادە دەستگاکانی لە ئاغی مایۆر عەلیزادە تەحویل وەرگرت و، دیسان مەراتیبی سوپاسگوزاری لە لایەن میللەتی کوردستانەوە نیسبەت بە ئیتیحادی جەماهیری شورەوی نواند و، بە تایبەتی لە زەحمەاتی ئاغای مایۆر عەلیزادە کە زەحمەتی هێنانی ئەو چتانەی قبوڵ کرد بو، زۆری

تەشەکور کرد و، هەردوکیان دەستیان دە نێو دەستی یەکتر نا و، میهری موتەقابیلیان دەرحەق بە یەکتر ئیزهار کرد و، جێژن لە ساتی 6 ی پاش نیوەڕۆ دوایی هات."(کوردستان، ژ 43، 46/5/4)

بەم بۆنەیەوە قازی محەمەد لە سەعات 6 ی ڕۆژی 12 ی 2 ی 1325 دا (نوتقی ژێروی بە هۆی رادیۆ بە گوێی دانیشتوانی کوردستان گەیاند و بە بڵینگۆ بڵاو کرایەوە):

**"برایانی خۆشەویست!**

"لە دامەزراندنی دەستگای رادیۆ و ئەم موەفەقیەتەی کە دەستتان خستوە تەبریکتان لێ دەکەم. چونکو لە وەختی کردنەوەی دەستگای رادیۆ لێرە نەبوم ئیستا ئیحساساتی خۆم نیسبەت بە پێشکەوتنی ئێوە ئیزهار دەکەم. ئومێدەوارم کە لێرە بە دوا، رۆژ بە رۆژ، بتوانین لە مەسایلی مەدەنیدا پتر تەرەقی بکەین.

"لە هەمو شتێک چاتر بۆ ئێمە ئەوەیە کە بتوانین قسەی خۆمان بە گوێی دنیا بگەیەنین و تەسدیقی دەفەرمون کە هەمو شتێک وردە وردە تەرەقی پێ دەدرێ. دیسان دەتوانین بە هۆی ئەم دەستگایە دەرسی ئەخلاقی، فەلاحەتی و... بە برایانی خۆشەویست بڵێین و لە ئایندەش دا بەرنامەیەکی باش بۆ رادیۆکەمان دیاری بکەین."(کوردستان، ژ 44، 1946/5/6)

لە سەرەتای مانگی جۆزەردان دا عەلی خوسرەوی دانرا بە (معاونی وەزارەتی تەبلیغات) و (مودیری ئیستاسیۆن).(کوردستان، ژ 54، 1325/3/15)

لە گەڵ روخانی حکومەتی کوردستان دا ئەم رادیۆیەش لە قسان کەوتوە.

**رۆژا نو**

کە میر کامەران بەدرخان بە کرمانجی و فەرەنسی لە بیروت دەری کردوە لە ژ 52 ی ساڵی 3 ی 30 ی 7 ی 1945 دا دەربارەی بەرنامە کوردییەکانی ئەو کاتە نوسیوێتی:

"وەشینەکێن هە رۆژە ب کوردی ل بیرۆتێ:

ل سەر پێلێن کورت و ناڤین، هەڕۆ پشتی نیرۆ ل سەعات پێنج و سی دەقیقان دا نوچەێن جیهانێ ئێن داوین، ب زمانێ کوردی بەلاڤ دکە. درێژاییە پێلێن:

پێلێن کورت: 37 مێتر و 39 سێنتیمێتر، ئان 8.036 کیلۆسایکل

پێلێن ناڤین: 411 مێتر، ئان 730 کیلۆسایکل.

ل بەغدایە

هەڕۆ پشتی نیرۆ د سەعات چاران دا دەستپێ و هەتا پێنجان دۆم دکە. درێژاییا پێلێن 42 مێتر و 37 سێنتیمێتر پێلێن کورت.

**رادیۆیا کوردستانێ**

ل سەر پێلێن کورت دوەشینێ. درێژاییا د وێ 42 و هەتا 44 و نیڤ مێتران. هەڕۆ، بەری نیرۆ ل سەعات 11 و 45 دەقیقان دا دەست پێ دکە.

**رادیۆیا ئازەربایجانێ**

هەڕۆ پشتی نیرۆ سەعات پێنجان، ل سەر پێلێن درێژ ب کوردی دوەشینە. پێلێن درێژ: 1410 و هەتا 1415 مێتران.

**5. 4. بەشی کوردیی ڕادیۆی قاهیرە** (1957– 1960)

بە پێی گفتوگۆیەک کە مارف ناسراو لە گەڵ محەمەد شەیدا کردویەتی:

بەشی کوردیی ئیستگەی ڕادیۆی قـاهیرە لـە ڕۆژی شـەممە 1 ی 6 ی 1957 تا سـەعات 5 ی پـاش نیوەڕۆ بە کاتی قاهیرە کراوەتەوە. ئەم بەشە بەشێ بوە لە بەرنامەی ئاراستەکراو (البرامج الموجهة) کە بە 39 زمانی جیاواز لە قاهیرەوە بڵاو کراوەتەوە. زمانی کوردی 40 هەمین بەرنامە بوە.

بێژەرەکانی سەرەتا محەمەد حسێن مەلا و هوشیار تایەر بابان بون و دوای چەند حەفتەیـەک محەمـەد شەیدا یش چۆتە هەمان ڕادیۆ. ئەم 3 کەسە کە بون بە بێژەر هـەر سـێکیان لـەو کاتـەدا خوێنـدکار بـون لـە زانکۆکانی قاهیرە.

بەرنامەکە بە سرودی ئەی ڕەقیب دەستی پێ کردوە. ئینجا وتراوە: "ئێرە کۆماری عـەرەبی یـەکگرتوە لە قاهیرە بەشی کوردی، کردنەوەی ئەم ئیستگەیە بۆ بـە هێزکردنـی پەیوەنـدی برایـەتی نێـوان گـەلی کـورد و عەرەبە لە پێناو ڕێکخستنی خەباتی نەتەوایەتی هەردو گەلەکـە و بـۆ سـەقامگیرکردنی ئاشـتی و ئاسایشـی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست". ئینجا چەند ئایەتێ لە قورئان. پاشان دەنگوبـاس. گۆرانیـەکی کـوردی. سـەروتاری ڕۆژنامەی الاهرام. بژارێک لە وێژە و هەڵبەستی کـوردی. گـۆرانی داواکـراو. گاڵتەوگـەپ. شـتێک دەربـارەی مێژوی کورد. کورتەی دەنگوباس و کۆتایی بەرنامەکە بە سرودی ئەی ڕەقیب.

بەرنامەکە 45 دەقیقەی بۆ تەرخان کراوە. دوای ماوەیەک بۆتە 1 سەعات.

(سەرچاوە: مارف ناسراو، یادکردنەوەی ئەستێرە گەشاوەکانی ئەدەب و هونەر، "چاوپێکەوتن لـە گـەڵ بێژەر و ئامادەکەری بەرنامەکانی بەشی کوردی ئیستگەی ڕادیۆی قاهیرە بـەڕێز مامۆسـتا محەمـەد شـەیدا" ل 52 – 49)

دوای شۆڕشی 14 ی تەموزی 1958، نێوانی عیراق و کۆماری عەرەبی یەکگرتو تێکچو. خوێنـدکارە نەتەوەپەرستەکانی لایەنگری (وەحدەی عەرەبی) کەوتنە تـەنگ پـێ هـەڵچنین بـەو خوێنـدکارە عیراقیـانـەی لایەنگری حکومەتی عەبدولکەریم قاسم بون. بێژەرەکانی بەشـی کـوردی هـەر سـێکیان میسـر یـان بـە جـێ هێشت. بەڵام بەشی کوردیی ڕادیۆی قاهیرە تا ناوەڕاستی شەستەکان بەردەوام بو.

5. 5. جگە لەم ڕادیۆیانە، لـە **ڕادیـۆی یـەریڤان لـە ئەرمەنسـتان** بەرنامەیـەکی کـوردی هـەبوە. هـیچ زانیاریەکم لە بارەی ئەم بەرنامەیەوە دەس نەکەوتوە.

## 6. ڕۆژنامەوانیی کوردی و شۆڕشی 14 ی تەموزی 1958

لە بەرەبەیانی 14 ی تەموزی 1958 دا جەیشی عیراقی بە کودەتایەکی سپایی ڕژێمی پاشایەتی ڕوخاند و لە بەیانی یەکەمیدا جاڕی ڕژێمی جمهوری دا. ئەمە گۆڕینێکی چاوەڕوان نەکراو بو. لەو سەردەمەدا کە دنیا بە هۆی شەڕی ساردەوە دابەش بوبو بە سەر دو بلۆکی ناکۆکی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوادا، عیراق بەشێ بو لە پەیمانە جەنگیەکانی بلۆکی ڕۆژئاوا بۆ گەمارۆدانی یەکێتی سۆڤیت و دەوڵەتانی سۆسیالیستی. عیراق لە گەڵ تورکیا، ئێران، پاکستان و بریتانیا، ئەندام بو لە پەیمانی بەغدادا.

ڕژێمی نوێ، گۆڕینی بنەڕەتی لە هەلومەرجی سیاسی، ئابوری، کۆمەڵایەتی، ڕۆشنبیری ناوخۆی عیراق و، لە سیاسەتی دەرەوەیدا بە دی هێنا. هەمو ریکخراوە سیاسییە نهێنیەکان، لەوانە حیزبی شیوعی عیراق کە لقێکی چالاکی لە کوردستان دا هەبو، وە پارتی دیمۆکراتی کوردستان، هەروەها هەمو ڕۆژنامە و گۆڤارە کوردییەکان پشتیوانیەکی بێ سنوریان لەم شۆڕشە کرد.

ڕژێمی نوێ قانونی ئەساسیی سەردەمی پاشایەتی هەڵوەشاندەوە. لە جیاتی ئەو دەستورێکی کاتی ڕاگەیاند، کە لە مادەی سێیەمیدا بۆ یەکەمین جار لە مێژوی عیراق دا دانی بەوەدا نابو کە: (عەرەب و کورد لەم نیشتمانەدا هاوبەشن).

حیزبە سیاسییەکان و، ڕێکخراوەکانی مامۆستایان، قوتابیان، لاوان، جوتیاران، کرێکاران، ئافرەتان، بارەگایان دانا و، بە ئاشکرا کەوتنە چالاکی. ڕۆژنامە و گۆڤارە کوردییەکان، کە بە پێی ئیمتیازە قانونییەکەیان سیاسی نەبون، کەوتنە نوسینی باس و وتاری سیاسی. نوسەرانی سەر بە حیزبی شیوعی عیراق و پارتی دیمۆکراتی کوردستان، کە هێشتا ڕۆژنامەی ئاشکرایان نەبو، لاپەڕەکانی ئەم بڵاوکراوانەیان کردە مەیدانی دەربڕینی بیروڕا و هەڵوێستی سیاسی حیزبەکانیان.

### 6. 1. قانونی چاپەمەنی

بە پێی لێکۆڵینەوەی مێژونوسی عیراقی، سەید عەبدوڕەزاق حەسەنی:

لە 23 ی ئابی 1921 ەوە تا 14 ی تەموزی 1958، واتە لە سەردەمی ڕژیمی پاشایەتیدا 16 جار ئەحکامی عورفی لە عیراق دا ئیعلان کراوە. کۆی ڕۆژەکانی ئەکاتە 3992 ڕۆژ، واتە 11 ساڵ و 32 ڕۆژ.

بە پێی (قانونی ژمارە 57 ی ساڵی 1933 و تەعدیلی ژمارە 33 ی ساڵی 1934 و تەعدیلەکانی تری) 193 گۆڤار و رۆژنامە رێگە درابون. بەڵام بە پێی (مەرسومی مەتبوعات ژمارە 34 ی ساڵی 1954) هەمویان لەغو کران و، ئەبو سەرلەنوێ بە پێی مەرجەکانی مەرسومەکە خۆیان رێک بخەنەوە. (عبدالرزاق الحسني، تأريخ الوزارات العراقية، ج 10، 1968، ص 322)

کاربەدەستانی شۆڕشی 14 ی تەموزی 1958 ئەگەرچی لە بوارەکانی: ئیسلاحی زەراعی، ئەحوالی شەخسی، نەوت.. دا، قانونی رادیکاڵی گرنگیان دانا و، دەسکاری زۆر لە قانونەکانی سەردەمی پاشایەتیان کرد، بەڵام لە بواری رۆژنامەوانیدا هەمان "مەرسومی مەتبوعات" ی ساڵی 1954 یان بۆ کار پێ کردنی قانونی، لە بواری رۆژانامەوانیدا، بە زیندویی هێشتەوە، تا حیزبی بەعس لە 1963 دا، بە کودەتایەکی سپایی تر، دەسەڵاتی گرتە دەس و قانونێکی نوێی چاپەمەنی دانا.

ژمارەیەکی زۆر کەم لە کاتنامەکانی سەردەمی پاشایەتی لە سەردەمی جمهوریدا لە دەرچون کەوت. یەکێ لەوانە حەفتەنامەی (پەیام) بو کە (کاروباری ئاڵوگۆڕی خوێندەواریی ئەمەریکا لە بەغداد) بە کوردی بۆ پرۆپاگاندە دەری ئەکرد. بە پێچەوانەوە کاتنامە کوردییەکانی سەردەمی پاشایەتی: حەفتەنامەی ژین لە سلێمانی، حەفتەنامەی هەتاو لە هەولێر، مانگنامەی کوردی– عەرەبی شەفەق لە کەرکوک، مانگنامەی هیوا و حەفتەنامەی کوردی- عەرەبی پێشکەتن لە بەغداد، بە تیراژی زۆرتر و لاپەڕەی زۆرترەوە بڵاو ئەکرانەوە.

ئەم قۆناغە لە مێژوی سیاسی عیراق دا قۆناغێکی بێ وێنەیە لە روی بەکار هێنانی ئازادی سیاسییەوە بۆ حیزبایەتی و بۆ رۆژنامەوانی کە دو نیشانەی (پلوراليزم) ن. ژمارەیەکی زۆر رۆژنامە و گۆڤار بە عەرەبی و کوردی بڵاو کرانەوە.

### 6. 2. شۆڕشی تەموز و رۆژنامەوانیی کوردی لە عیراقدا

بە درێژایی سەردەمی پاشایەتی لە عیراق دا (1921- 1958) ئەگەرچی چەندین حیزبی سیاسی دروست کران و هەڵوەشێنرانەوە و، چەندین رۆژنامەی سیاسی دەرچون و داخران و دەرچونەوە، بەڵام ریگە بە کورد نەدرا، تەنانەت بەوانەش کە لایەنگری دڵسۆزی خۆیان بون، حیزبی سیاسی کوردی دابمەزرێنن و، رێ بە هیچ کوردێ نەدرا رۆژنامەی سیاسی بە زمانی کوردی بڵاو بکاتەوە. تەنیا جار کە رێگەی گۆڤارێکی حەفتانەی سیاسی عەرەبی - کوردی درا، دوای راپەرینی گەلی عیراق (وەسبەی کانونی 1948) و روخاندنی وەزارەتی ساڵح جەبر و، دامەزراندنی وەزارەتی سەدر بو، کە هەندێ ئازادی بۆ ماوەیەک دا بە گەلی عیراق، گۆڤاری (نزار) بو کە عەلادین سوجادی ئیمتیازی وەرگرت. ئەویش سەرەڕای ئەوەی لە ژێر چاوی سانسۆردا بوە و رێی نەدراوە بە ئازادی بنوسێ، لە پاش 22 ژمارە داخراوە.

کە شۆڕشی 14 ی تەممور بو، هەمو رۆژنامە و گۆڤارە کوردییەکان بێ سڵەمینەوە، کەوتنە نوسینی وتار و بابەتی سیاسی. هەردو حیزب: حیزبی شیوعی عیراق و پارتی دیموکراتی کوردستان، بۆ رونکردنەوەی هەڵوێست و بیروبۆچونەکانی خۆیان کەڵکیان لەم گۆڤار و رۆژنامانە وەر ئەگرت، تا خۆیان ئیمتیازی دەرکردنی رۆژنامەیان وەرگرت. لە سایەی جمهوریدا بە دەیان گۆڤار و رۆژنامەی سیاسی حیزبی و سەربەخۆ دەرچون.

ئەم کاتنامانە ئەشێ پۆلێن بکرێن:

لە روی ناوەرۆکەوە: سیاسی، ئەدەبی، کۆمەڵایەتی، خوێندکاری، پیشەیی

لە روی خاوەنێتی ئیمتیازەکەیەوە بۆ: حیزبی، نەقابی، حکومەتی، ئەهلی

لە روی شوێنی دەرچونەوە: بەغداد، کەرکوک، سلێمانی، هەولێر، موسڵ

لە روی ناوچەیی و نیشتمانی و نەتەوەییەوە: هەندێکیان ناوچەیی بون، تەنیا لە مەڵبەندەکەی خۆیاندا بڵاو بونەتەوە. هەندێکیان لە سەر ئاستی کوردستانی عیراق و، هەندێکیشیان لە هەمو عیراقدا.

**6. 2. 1. ڕۆژنامەی حیزبی**

**6. 2. 1. 1. ڕزگاری (بەغداد 1959)**

گۆڤارێکی کوردی– عەرەبی بوە.

زمانی پارتی دیمۆکراتی کوردستان بوە.

خاوەنی ئیمتیازی ساڵح حەیدەری و، سەرنوسەری فوئاد جەواد بوە.

ژ 1 ی لە نیسانی 1959 لە بەغداد دەرچوە. دوای چەند ژمارەیەک بە هۆی ناکۆکییەکانی ناو دەرونی پارتییەوە لە دەرچون کەوت.

ڕزگاری بە هەمان ناوەوە ناو نراوە کە لە سەردەمی پاشایەتیدا ئۆرگانی پارتی بوە.

**6. 2. 1. 2. خەبات– النضال (بەغداد 1959 – 1961)**

(ڕۆژنامەیەکی ڕۆژانەی سیاسی) کوردی - عەرەبی بوە.

زمانی پارتی دیمۆکراتی کوردستان بوە.

خاوەنی ئیمتیازی پارێزەر ئیبراهیم ئەحمەد بوە.

ژ 1 ی لە 4 ی نیسانی 1959 لە بەغداد بڵاو کرایەوە. تا داخستنی لە 28 ی مارتی 1961 دا 462 ژمارەی لێ دەرچوە.

لە سەرەتادا هەندێ ژمارەی بە کوردی و هەندێ ژمارەی بە عەرەبی دەرچوە. دوایی هەمو ڕۆژنامەکە بە عەرەبی دەرچوە.

ئیبراهیم ئەحمەد، حیلمی عەلی شەریف (ئاسۆ)، جەلال تاڵەبانی (پیرۆت)، حەبیب محەممەد کەریم، جەرجیس فەتحوڵا، لە نوسەرە چالاکەکانی ڕۆژنامەکە بون.

لە سەردەمی پاشایەتیدا ئۆرگانی نهێنی پدک ناوی (خەباتمان) و (خەباتی کوردستان) بوە. ناوی خەبات هەر لەو ناوانە وەرگیراوە، ئەمیش درێژەپێدانی ئەوان بوە.

**بۆ ئاگاداری زۆرتر بڕوانە:**

عەبدوڵڵا زەنگەنە: دادگایی کردنی خەبات یەکەمین ڕۆژنامەی سیاسیی ڕۆژانەی کورد، گۆڤاری وەرزیی (ڕۆژنامەڤانی)، هەولێر، بەشی یەکەم، ژ 2، ئابی 2000، ل129-164. بەشی دوەم، ژ 3، کۆتایی ک1 2000. ل28-92. بەشی سێیەم، ژ 4، نیسانی 2001. ل 62-129.

**6. 2. 1. 3. کوردستان (بەغداد 1961)**

ڕۆژنامەیەکی سیاسی ڕۆژانە بوە.

خاوەنی ئیمتیازی ئیبراهیم ئەحمەد و، سەرنوسەری پارێزەر جەلال تاڵەبانی بوە.

ژ 1 ی لە 4 ی مارتی 1961 دا لە بەغداد دەرچوە. ئەگەرچی ئیمتیازەکەی بۆ ڕۆژانە بوە، بەڵام حەفتانە دەرچوە. دوای 5 ژمارە داخراوە.

پێش ئەوەی پارتی دیمۆکراتی کوردستان ئیجازەی کاری قانونی لە حکومەتی عیراق وەربگرێ، ئیبراهیم ئەحمەد ئیمتیازی ڕۆژنامەی خەباتی بە ناوی خۆیەوەوە وەرگرت. بەڵام کە پارتی دیمۆکراتی کوردستان ئیجازەی کارکردنی ئاشکرای قانونی پێ درا، ئیبراهیم ئەحمەد دەستی لە ئیمتیازی ڕۆژنامەی خەبات هەڵگرت بۆ پارتی و، خۆی ئیمتیازی ڕۆژنامەیەکی نوێی وەرگرت بە ناوی کوردستان ەوە.

**بۆ ئاگاداری زۆرتر بڕوانە:**
کاوە حاجی عەزیز. لە گەلاوێژی نوێدا وتارێکی لە سەر هەمو ژمارەکانی نوسیوە.

**6. 2. 1. 4. ئازادی (کەرکوک 1959 – بەغداد 1960)**

ڕۆژنامەیەکی سیاسی ڕۆژانە بوە.
زمانی حیزبی شیوعی عیراق بوە.
خاوەنی ئیمتیازی پارێزەر نافیع یونس بوە.
ژ 1 ی لە 1 ی ئایاری 1959 دا لە کەرکوک دەرچوە. هەرچەندە ئیمتیازەکەی بۆ ڕۆژانە بوە، بەڵام نەی توانیوە ڕۆژانە دەربچێ. دوای هەراکەی کەرکوک بارەگای ڕۆژنامەکە گوێزرایەوە بەغداد. لە کۆتایی تشرینی دوەمی 1960 دا داخرا. بە هەموی 156 ژمارەی لێ دەرچوە.
محەممەدی مەلا کەریم، گۆران، دلزار... لەم ڕۆژنامەیەدا کاریان کردوە.
لە سەردەمی پاشایەتیدا ئۆرگانی نهێنی لقی کوردستانی حشع لە 1945 ەوە تا ساڵی 1956 ناوی (ئازادی) و، لەوە بە دوا ناوی (ئازادی کوردستان) بوە. ناوی ئەم ڕۆژنامەیە یش هەر لەو وەرگیراوە و، درێژەپێدانی ئەو بوە.

**6. 2. 1. 5. ڕای گەل– رأي الاهالي (کەرکوک 1959 – 1961)**

ڕۆژنامەیەکی ڕۆژانەی کوردی- عەرەبی بوە.
خاوەنی ئیمتیازی محەمەد سدیق بلوکینی و، بەڕێوەبەری بەرپرسی محەمەد مەردان قەلەمچی بوە.
ژ 1 ی لە 6 ی ئەیلولی 1959 لە کەرکوک دەرچوە و ژ 72 کە دوا ژمارەیەتی لە 15 ی ئەیلولی 1961 دا دەرچوە.
ئەم ڕۆژنامەیە زمانی حیزبی وەتەنی دیمۆکراتی بوە، کە کامیل چادرچی سەرۆکی بو.
محەمەد سدیق بلوکینی، بە هۆی بیروباوەڕی سیاسییەوە وەکو بەشێ لە جێبەجێ کردنی سیاسەتی دەرپەڕاندنی کورد لە کەرکوک، لە یەکێ لە شەقامەکانی کەرکوک دا، کوژرا.
حیزبی وەتەنی دیمۆکراتی، جگە لە ڕۆژنامەی ڕۆژانەی (الاهالي) کە لە بەغدادی پایتەخت دەری کردوە، لە شارەکانی تری عیراقدا چەندین کاتنامەی دەرکردوە. لەوانە:
(شعلة الاهالي) لە کەربەلا، (صدى الاهالي) لە موسڵ، (صوت الاهالي) لە عەمارە، (نداء الاهالي) لە بەسرا. (رأي الاهالي) یش لە کەرکوک یەکێ بوە لەو زریزەیە.

**6. 2. 2. ڕۆژنامەی ئەهلی**

**6. 2. 2. 1. ڕۆژی نوێ (سلێمانی 1960– 1961)**

لە ژێر ناوەکەیدا نوسراوە: (گۆڤارێکی ئەدەبی، سیاسی، کۆمەڵایەتییە). گۆڤارێکی مانگانە بو لە سلێمانی لە چاپخانەی کامەران چاپ کراوە.
خاوەنی ئیمتیازی پارێزەر جەمال شالی و، کامەران موکری سەرنوسەری بوە.
ژ 1 ی لە مارتی 1960 دا دەرچوە. تا وەستانی لە مانگی ئەیلولی 1961 دا 18 ژمارەی لێ دەرچوە.
ڕۆژی نوێ سەر بە پارتی دیمۆکراتی کوردستان بوە.

**بۆ ئاگاداری زۆرتر بڕوانە:**
جەمال شاڵی، گۆڤاری ڕۆژی نوێ لە ڕۆژێکی نوێدا، سلێمانی، 2002.

### 6. 2. 2. 2. راستی– الحقیقة (موسڵ 1959)

ڕۆژنامەیەکی ڕۆژانەی سیاسی سەربەخۆ بوە. بە عەرەبی و کوردی لە موسڵ بڵاو کراوەتەوە. خاوەنەکەی پارێزەر جەرجیس فەتحوڵڵا و ئەنوەر مائی سەرپەرشتی بەشە کوردی‌یەکەی کردوە.

ژ 1 ی لە 7 ئایاری 1959 دا دەرچوە. دوای دەرچونی ژمارە 24 ی لە 3 ی نیسانی 1960 دا ڕاگیراوە و، لە 6 ی ئابی 1960 دا وەزارەتی ئیرشاد ئیمتیازەکەی لێ سەندۆتەوە.

موسڵ، بە درێژایی زەمان شارێکی تێکەڵاو بوە لە عەرەب و کورد و تورکومان و، موسوڵمان و مەسیحی. بەڵام هەمیشە ناوەندێکی گرنگ و چالاکی نەتەوەپەرستەکانی عەرەب یش بوە. ئەگەرچی ئەو سەردەمە پارێزگای دهۆک دروست نەکرا بو، هەمو بادینان لە روی بەڕێوەبەرایەتی‌یەوە سەر بە موسڵ بو، بەڵام ئەوە یەکەم جار و دواجار بو کە بڵاوکراوەیەک بە کوردی لە موسڵ بڵاو بکرێتەوە.

دوای 14 تەموز ناکۆکی‌یەکی توندوتیژ کەوتە نێوان ئەفسەرانی جەیشەوە، نەتەوەپەرستەکانیان ئەیانویست عیراق دەسبەجێ لە گەڵ جمهوریەتی عەرەبی یەکگرتو یەکبگرێ، حشع و دیمۆکراتەکان دژی ئەمە بون. عەبدولکریم قاسمی پێشەوای شۆڕشی 14 تەموز یش دژی ئەمە بو. ڕۆژی 8 ی 3 ی 1959 عەبدولوەهاب شەواف کە ئەفسەرێکی پلەبەرزی جەیش بو، بە پشتیوانی حیزبی بەعس و نەتەوەپەرستەکانی تر هەڵگەڕانەوەی خۆی ڕاگەیاند. بەڵام شەواف و چەند کەسێ لە هاوڕێکانی کوژران و جوڵانەوەکە شکستی خوارد. شیوعی‌یەکان بە توندی کەوتنە سەرکوتکردنی نەتەوەپەرستەکان. هەندێ دادگایان دانا بۆ سزادانی بەشدارانی جوڵانەوەکە و هەندێکیان کوشت و لاشەکانیان بە شەقامەکاندا ڕاکێشان. ئەمە بارێکی ئاڵۆزی لە ناو موسڵ دا خوڵقاند.

ڕێبازی ڕۆژنامەی (الحقیقة- ڕاستی) لە چەپی‌دا و، لە دوژمنایەتی نەتەوەپەرستەکانی عەرەب و، دژایەتی ڕێبازی ناسری دا توندڕەو بو. تاوانی بەشداریکردن لەو ڕوداوانەدا درایە پاڵ جەرجیس. هەم فەرمانی گرتنی لە لایەن حکومەتی ئەوساوە بۆ دەرچو، هەم ڕۆژامەکەیشی داخرا.

بۆ ئاگاداری زۆرتر بڕوانە:

د. عبدالفتاح علی بۆتانی: ڕۆژنامەی الحقیقي - ڕاستی یەکەمین ڕۆژنامەی عەرەبی - کوردی بو لە شاری موسڵ، گۆڤاری (سەنتەری برایەتی)، ژ 5 ی 22 ی نیسانی 1998، ل 173 – 178.

الدکتور عبدالفتاح علی بوتانی: جریدة الحقیقة – راستی اول جریدة عربیة کوردیة في مدیني الموصل، دهوک، 1998.

### 6. 2. 2. 3. نەورۆز (سلێمانی 1959)

لە سەر بەرگی دواوەی نوسراوە: (گۆڤارێکی ئەدەبی و زانیاری و کۆمەڵایەتی کوردیە)

خاوەنی ئیمتیازی پارێزەر کەمالی میرزا کەریم و، دەستەی نوسەرانی بریتی بوە لە: کامەران، مستەفا قەرەداخی، ئەمین میرزا کەریم.

ژ 1 ی لە نەورۆزی 1959 دا و ژ 3 ی لە حوزەیرانی هەمان ساڵدا، لە سلێمانی لە چاپخانەی کامەرانی چاپ کراوە. پاش 3 ژمارە کراوە بە ڕۆژنامە و، پاش ماوەیەک ناوەکەی گۆڕی بۆ بروا.

**بۆ ئاگاداری زۆرتر بڕوانە:**

عەبدوڵڵا زەنگەنە: (گۆڤاری نەورۆز لە نەورۆز)، گۆڤاری (سەنتەری برایەتی)، هەولێر، ژ 5 ی 22 ی نیسانی 1998. ل 11 – 20.

**6. 2. 2. 4. بڕوا (سلێمانی** 1960– 1963**)**

ڕۆژنامەیەکی حەفتانە بوە.

خاوەنی ئیمتیازی پارێزەر کەمالی میرزا کەریم بوە.

ژ 1 ی لە 2 ی تەمموزی 1960 دا لە سلێمانی دەرچوە تا داخستنی لە کانونی دوەمی 1963 دا 95 ژمارەی لێ دەرچوە.

بڕوا، سەردەمێ بو بە زمانی حیزبەکەی داود سایغ، کە عەبدولکەریم قاسم بە ناوی حیزبی شیوعی عیراقەوە ڕێگەی کارکردنی قانونی دا بو.

ماوەیەک ڕەفیق چالاک سەرپەرشتی دەرکردنی ئەکرد.

**6. 2. 2. 5. ڕۆناهی (بەغداد** 1960– 1962**)**

لە سەر بەرگی دەرەوەی نوسیوێتی: (گۆڤارەکا ئەدەبی، زانیاری، ئو کۆمەلیەیە)

لە سەر بەرگی ناوەوەی نوسیوێتی: (کۆڤارەکا هەیڤانەیە بۆ بەرزکرنا زانیاریا کوردی)

ڕۆناهی گۆڤارێکی مانگانە بوە. بە هەردو زاراوی کرمانجی سەرو و خوارو وتار و شیعری بڵاو کردۆتەوە. خاوەنی ئیمتیاز و سەرۆکی نڤیسەڤانا حافز مستەفا قازی بوە.

ژ 1 ی لە مانگی تەموزی 1960 لە بەغداد و ژ 3 ی لە ئابی 1962 دا دەرچوە.

حافز قازی سەرلەنوێ بە ڕێنوسی تازە هەمو ژمارەکانی ڕۆناهی چاپ کردۆتەوە.

**بۆ ئاگاداری زۆرتر بڕوانە:**

حافز قازی: ڕۆناهی کۆڤارەکا کوردی بوو د ناڤبەرا 1960- 1962 یدا ل بەغدا دەرکەتیە، چاپا دووێ، هەولێر- سپیرێز، 2005.

**6. 2. 2. 6. دەنگی کورد (بەغداد** 1960**)**

ڕۆژنامەیەکی ڕوژانەی سیاسی کوردی– عەرەبی سەربەخۆ بوە.

خاوەنی ئیمتیاز و سەرنوسەری پارێزەر عومەر جەلال حەوێزی بوە.

ژ 1 ی لە 9 ی شوباتی 1960 دا دەرچوە. تا ڕۆژی 14 ی مایسی 1961، 75 ژمارەی لێ بڵاو کراوەتەوە.

بە بیانوی وتارێکەوە کە لە سەر هەلومەرجی نالەباری کەرکوک نوسی بوی، خاوەنەکەی گیرا و ڕۆژنامەکە داخرا.

**6. 2. 3. ڕۆژنامەی نەقابی**

**6. 2. 3. 1. ئەدەبی‌ی عیراقی (بەغداد** 1961**)**

یەکێتی ئەدیبانی عیراق دەری کردوە. ژ 1 ی لە تەموزی 1961 دا بڵاو کراوەتەوە. تەنیا یەک ژمارەی لێ دەرچوە.

# روناهی

ژمارە ١

**گوڤارەکە بو بەرزکرنا زانیاریا کوردی**

ژمارە ــ ١ ــ    سالا ــ ١ ــ    چریائیکی ــ ١٩٦٠

**خودانی ڤی گوڤاری کتیبەک پیش کیش کر بو سیادەتا سەروکی وەزیرا. ئو پشتی چەند وەختەک بسەرڤە جوی، سکرتیری وی یی روژنامەڤانا چاپا خودانی گوڤاری بڤی نامی دا.**

جەمهوریەتا عیراقی

دیوان خانا جڤاتا وەزیرا

بەغدا

ژمارە: ٤٨٦/٢٧

روژ : ١٩٦٠/٧/١٩

برادەر حافظ مصطفى قاضی

٤٠ ب/٨٤ صالحیة - بەغدا

سەلاڤەکا گولانە..

بمن خوشەمنەت کاریا سیادەتا پیشەڤای عبدالکریم قاسم، سەروکی وەزیرا بگەهینمە هەوە، ژ بەر خەلات کرنا دانەکی ژ کتیبا «مەسەلا ئیک

١

**6. 2. 3. 2. بڵێسە (سلێمانی** 1959**)**

لە ژێر ناوەکەیدا نوسراوە: (گۆڤارێکی ئـەدەبی و زانیـاری و کۆمەڵایـەتی کوردییـە مـانگی جارێـک دەرئەچێت لە لایەن نەقابەی مامۆستایانەوە لە سلێمانی).

ژ 1 ی لە مانگی ئابی 1959 لە سلێمانی و ژ 10 ی لە مایسی 1960 دا بڵاو کراوەتەوە.

هەندێ بڵاوکراوەی تر لە شێوەی گۆڤار یان ڕۆژنامەدا دەرچون، لە لایەن هەندێ ڕێکخراوی پیشەییەوە بڵاو کراونەتەوە، بەڵام بەردەوام و تەمەندرێژ نەبون. ئیستا بە دەگمەن دەس ئەکەون، لەوانە:

**ئافرەت**

یەکێتیی ئافرەتانی عیراق بە عەرەبی و کوردی لە بەغداد دەری کردوە.

ژ 1 ی لە مایسی 1959 دا دەرچوە.

**هیوای کوردستان**

یەکێتیی قوتابیان لە سلێمانی دەری کردوە. ژ 1 ی لە تشرینی دوەمی 1959 دا دەرچوە.

**دەنگی قوتابیان**

یەکێتیی قوتابیانی عیراق بە عەرەبی و کوردی ساڵی 1959 لە بەغداد دەری کردوە.

**دەنگی قوتابیان**

لقی کەرکوکی یەکیتیی قوتابیانی عیراق ساڵی 1959 بە کوردی و عەرەبی و تورکومانی لە کـەرکوک دەری کردوە.

**ژیان**

یەکێتیی گشتی قوتابیانی عیـراق لقـی هـەولێر دەری کـردوە. ژ 1 ی لـە تشـرینی دوەمـی 1960 دا دەرچوە. تەنیا 2 ژمارەی لێ دەرچوە.

**6. 2. 4. ڕۆژنامەی حکومەتی**

**6. 2. 4. 1. عیراقی نوێ (بەغداد** 1960**)**

بەمجۆرە خۆی بە ناسین داوە: (گۆڤارێکی نیگارینی مانگانەیە وەزارەتی ئیرشاد دەری دەکا)

ژ 1 ی لە تشرینی یەکەمی 1960 دا دەرچوە. بە هەموی 24 ژمارەی لێ دەرچوە.

محەمەدی مەلا کەریم و فاروق مستەفا ڕەسول سەرپەرشتی وەرگێڕان و چاپیان کردوە.

**6. 3. شۆڕشی تەموز و ڕۆژنامەوانیی کوردی لە ئێراندا**

ئاڵوگۆڕە سیاسییەکانی ناو کوردستانی عیراق و، بە هێزبونی جوڵانەوەی کورد و، ڕەنگدانەوەی ئەوە لـە دەزگاکانی ڕاگەیاندنی عیراقدا: بەرنامەی کوردی ڕادیۆی بەغداد و، تەنینەوەی لێشـاوی ڕۆژنامـەوانی کـوردی و، ئازادی چـالاکی سیاسـی حیزبـی و ڕێکخراوەیـی، کـاری لـە پارچـەکانی تـری کوردسـتان کـرد و، بزوتنـەوەی کوردایەتی لەو پارچانە یش دا گەشانەوەی دیاری بە خۆیەوە دی. کاربەدەستانی ئێرانی و تـورکی و عـەرەبی لـە سوریا ترسیان لێ نیشت. بۆ بەرگری لە لێشاوی ئەم بزوتنەوەیە، هەر یەکەیان لە لای خۆیەوە کەوتە شـاڵاوبردن بۆ تێکۆشەرانی کورد و، زۆریان لێ گرتن. هەندێکیشیان ناچار بون پەنایان بۆ کوردستانی عیراق هێنا.

حکومەتی ئێران بۆ ئەوەی ئەم بزوتنەوەیە دابمرکێنێتەوە، لە لایەکەوە پەلاماری ڕێکخراوەکانی حیزبی دیمۆکراتی کوردستانی دا و، دەیان کەسی لێ گرتن و بە سەدانیشیان پەڕیوەی کوردستـانی عیـراق بـون، لـە

لایەکی ترەوە لە رادیۆی تاران بەشێکی کوردی تەرخان کرد بۆ پرۆپاگەندە دژی هەلومەرجی کوردستانی عیراق و، حەفتەنامەیەکیشی بە زمانی کوردی لە تاران بە ناوی (کوردستان) ەوە بڵاو کردەوە. دوای روخانی حکومەتی کوردستان لە مەهاباد ئەوە یەکەم جار بو حکومەتی ئێرانی رێگەی بە کارهێنانی زمانی کوردی بدا.

## 6. 3. 1. **کوردستان (تاران** 1959**)**

خۆی بەمجۆرە بە ناسین داوە: (رۆژنامەیەکی حەوتەیی کوردییە، حەوتەی جارێ چلێکی دەرئەچێ)

خاوەنی ئیمتیاز و مدیری لێ پرسراو عەبدولحەمید بەدیع ئەلزەمان و بە چاودێری دەستەی نوسەر: محەممەد سدیق موفتی زادە، عابیدی سیراجەدینی، شوکروڵای بابان و، لە ژ 38 ەوە ناوی خوسرەوی شێخکانلوی میلانی خراوەتە سەر.

رۆژنامەی کوردستان لە لایەن حکومەتی ئێران، بە تایبەتی لە لایەن ساواک ەوە، ئاراستە کراوە.

ژ 1 ی لە 29 ی نیسانی 1959 دا لە تاران بە زاراوی جیاجیای کوردی دەرچوە.

بەدیع ئەلزمان، خەڵکی سنە و، مامۆستای زمان و ئەدەبی عەرەبی بوە لە دانشگای تاران. سدیقی موفتی زادە یش، خەڵکی سنە و، مامۆستا بوە لە دانشگای تاران. جگە لەو ناوانە عەبدورەحمانی موفتی زادە و ئەحمەدی موفتی زادە لە هاوکارە چالاکەکانیان بون. محەمەد سدیق و عەبدولڕەحمان برا بون و، ئەحمەد یش برازایان بوە. سوارەی ئێلخانی زادە، فاتیحی شیخولئیسلامی، عەلی حەسەنیانی، کە بە نوێکەرەوەی شیعری کوردی دائەنرێن لە کوردستانی ئێران دا تێیدا نوسیویانە. هەروەها هێمن و خاڵە مین و ئەمیری حەسەنپور.

ئەم رۆژنامەیە:

لە روی سیاسیەوە، تەرخان کرابو بۆ دیفاع لە رژیمی شاهنشاهی ئێران و، بۆ هێرش کردن بۆ سەر رژیمی جمهوری عیراق و، دژایەتی جوڵانەوەی کورد و تێکۆشەرەکانی.

لە روی زمانەوە، بە لەهجەی جیاواز نوسیوێتی. لەوە یش چەند مەبەستێکی هەبوە، لەوانە:

**یەکەم**، بۆ قوڵکردنەوەی دەلاقەی نێوان لەهجە جیاوازەکانی زمانی کوردی و،

**دوەم**، بۆ ئەوەی دەری بخەن کە کوردی زمانێکی یەکگرتوی سەربەخۆ نیە، بەڵکو چەندین لەهجەی ناوچەیی جۆراوجۆری ئێرانی‌یە.

داگیرکەرانی کوردستان زمانی کوردی‌یان بۆ هەر مەبەستێکی تایبەتی خۆیان بە کار هێنا بێ، تەنانەت ئەگەر بۆ شێواندنی روی پرشنگداری بزوتنەوەی نەتەوەیی کورد و، ئەدەب و زمان و رۆشنبیریەکەیشی بوبێ، سەرەنجام هەر بە قازانجی زمانی کوردی شکاوەتەوە. بە شێوەیەکی ناراستەوخۆ بەشدار بوە لە گەشەپێدانی زمان و رۆشنبیری کورد و لە پێگەیاندنی نوسەرانی کوردینوس‌دا. کوردستانەکەی تاران یش، هەم ژمارەیەک کوردینوسی پێگەیاند و هەم ژمارەیەکی باش شیعر و ئەدەبیاتی دێرینەی کوردی، بە تایبەتی بە لەهجەی گۆران، زیندو کردەوە.

رۆژنامەی کوردستان سەرەتا بە ئازادی لە بازاڕدا ئەفرۆشرا. لە بەر ئەوەی زۆر بە گەرمی لە لایەن خەڵکەوە پیشوازی لێ ئەکرا و ئەفرۆشرا و دەستاودەستی ئەکرد، بۆیە لە دوای ژمارەی 4 ەمیەوە، بۆ ئەوەی هاووڵاتیانی ئاسایی کەڵکی لێ وەرنەگرن و نوسینی کوردی فێر نەبن، لە بازاڕی شارەکاندا ئیتر نە فرۆشراوە و لە ناو خەڵکدا بڵاو نە کراوەتەوە، بەڵکو لە سنورێکی دیاریکراودا نێردراوە بۆ هەندێ کەس و کاربەدەست و دەزگا و دامەزراو. تا حکومەتی ئێرانی پێیان بسەلمێنێ کە نوسین و رۆژنامەوانی بە زمانی کوردی لە ئێران دا ئازادە. جگە لەو شوێنانە بە بار بۆ ناو کوردستانی عیراق ئەنێردا و، بە پۆستەیش بۆ ئەندامەکانی کۆمەڵەی خوێندکارانی کورد لە ئەوروپا.

لـە گـەڵ هەڵگیرسـانی شۆڕشـی ئـەیلولی کوردسـتانی عیـراقدا کوردسـتان بـە خۆشـیەوە هەواڵـە ناخۆشەکانی شەڕ و بۆردومانی بڵاو ئەکردەوە و، بە هاودەردیەوە لە سـەر ڕوداوەکـانی ئەنوسـی. حکومـەتی ئێران ئیتر پێویستی بە ڕۆژنامەی کوردستان نەما و رایگرت.

**بۆ ئاگاداری زۆرتر بڕوانە:**

فەرهاد عەونی: ڕۆژنامەی کوردستان و بیبلۆگرافیای بابەتە پەیوەندیدارەکانی بە کورد و کوردستانەوە، گۆڤاری وەرزیی ڕۆژنامەڤانی، ژ 4، ل 50-61.

### 6. 3. 2. کوردستان (مەهاباد– 6 ی دیسامبەری 1945)

#### ئۆرگانی حیزبی دیمۆکراتی کوردستان

روخانی رژیمی پاشایەتی و، بە هێزبونی جوڵانەوەی کورد و، گەشانەوەی ژیانی سیاسـی، رۆشـنبیری، کۆمەڵایەتی، لە کوردستانی عیـراقدا، لـە ئـەنجامی شۆڕشـی 14 ی تـەموز دا، کـارێکی گـەورەی کـردە سـەر جوڵانەوەی کورد لە پارچەکانی تری کوردستان، لەوانـە کوردسـتانی ئێـران. حیزبـی دیمـۆکراتی کوردسـتان رێکخراوەکانی بوژانەوە و پـەرەیان سـەند و چالاکیـان زیـادی کـرد. یـەکێ لـە چالاکیـەکانیان دەرکردنـی کوردستان، ئۆرگانی حیزب بو. کوردستان لە سەر لاپەڕەی یەکەمی بەم جۆرە خۆی ناساندوە: (بڵاو کەرەوەی حیزبی دیمۆکراتی کوردستان، گۆوارێکی ئەدەبی و کۆمەڵایەتی سیاسی کوردیە، هەر پازدە رۆژ جارێـک بـڵاو دەکرێتەوە). کوردستان بە تایپ و رۆنیۆ لە چاپخانەی کوردستان لە مەهاباد چاپ کراوە.

ساواک شاڵاوێکی توندی بردە سەر حدک و، چەند کادری سەرکردایەتی و ئەندامی حیـزب گیـران و، چەند سەد کەسێکیشیان رویان کردە کوردستانی عیراق. کادرەکـانی حـدک بـە یارمـەتی پـارتی دیمـۆکراتی کوردسـتان رێکخراوەکـانی حیزبەکـەیان رێکخسـتەوە و، بـەردەوام بـون لـە سـەر دەرکردنـی کوردسـتان. هەڵگیرسانی شۆڕش لە کوردستانی عیراقدا و، دروستبونی نـاکۆکی لـە نـاو ریـزی حـدک دا، کاروبارەکـانی شێواندن و، حیزبەکەیانی پارچە پارچە کرد. زۆرتر خۆیان بە روداوەکانی ناو کوردستانی عیراقەوە خـەریک ئەکرد، تا کاروبارەکانی خۆیان، لە بەر ئەوە کوردستان تا ساڵانێکی درەنگ لە دەرچون کەوت.

#### کۆتایی بەهاری ئازادی

عیراقـی جمهـوری ئـارامی و ئاسایشـی بـە خۆیـەوە نـەدی. زۆر زو ناکۆکیـەکانی نێـوان نەتەوەپەرستەکانی عەرەب، کە ئەیانویست عیراق دەسبەجێ لە گەڵ جمهوریەتی عەرەبی یەکگرتو یەک بکـەوێ، لە گەڵ شیوعیەکان و دیمۆکراتەکان و لە گەڵ کورد، تەقیەوە. نەتەوەپەرستەکان کەوتنە پیلانگێـڕان. لـە موسـڵ هەڵگەڕانەوەیەکی سپاییان ساز کرد و، لە بەغداد تەقـەیان لـە عەبدولکـەریم قاسـم کـرد و زاماریـان کـرد. لـە کەرکوک فیتنەیەکی نەتەوەییان لە نێوان کورد و تورکومان دا نایەوە.

عەبدولکەریم قاسم، سەرکردەی شۆڕشەکە، رێگەی نەدا ژیانی دیمۆکراتی لـە عیـراق دابمـەزرێ، حیزبـە سیاسیەکان بە ئازادی کار بکـەن و، هـەڵبژاردنی گشـتی بـۆ پارلـەمانێکی ئـازاد بکـرێ. تـا ئـەهات بـەرەو دیکتاتۆریەتی فەردی ئەچو. تەنگی بە حیزبە سیاسیەکان هەڵئەچنی و، رۆژنامە نارازییەکانی دائەخست. ئەو دەسکەوتانەی کورد بە دەستی هێنـا بـون، یەکـە یەکـە لـێ ئەسـێنرایەوە. تـەنگیان بـە رۆژنامـە و گۆڤـارە کوردیەکان هەڵچنی و یەکە یەکـە دایـان خسـتن. ئەنـدامانی حیزبـی شـیوعی عیـراق و پـارتی دیمـۆکراتی کوردستان راوئەنران، ئەگیران و دور ئەخرانەوە بۆ گرتوخانەکانی ناوەڕاست و خوارەوی عیراق.



بەناوی خودای بەرزوپی هاوتا

آبونمان
بەکساله ٣٠٠ ریال
شەش‌مانگە ١٦٠ ریال
دانەی ١ ریال

# کوردوستان

کوردوستان لە لایەن هەیئەتی تحریریە دەر دەچی

بلاو کەرەوەی بیری حزبی دیموکراتی کوردوستان

ژمارەی ــ١ | سالی یەکەم | پێنج شەمو ٢٠ – ١٠ – ١٣٢٤ | ١١ـ ژانویە ١٩٤٦

## آمانجی ایمە

لەم‌کاتە دا کەخاکی کوردوستان لە هەمو وەختێك زیاتر پیویستی فیداکاری کورەکانیەتی .

...

سید محمد حمیدی

## ژنرالیسموس ستالین (بەبونەی شصت وشەشەمین سالی لەدایك بونی)

...

استالین لە وەختی انقلابی ١٩٠٥-١٩٠٧ لە رأسی بالشویکەکانی ماوەراء قفقاز دابو ویەر بەرەکانی کارگەران وجوتیرانی ماوەراء قفقازی راهنمائی دەکرد ، سالانی ١٩٠٧ – ١٩١٠ تشکیلاتی بلشویکیی باکوی ادارە دەکرد و لە سالی ١٩١٢ عضویتی کمیتەی مرکزی حزبی بلشویك هەلبژیردرا وکاروباری انقلابی روسیە لە گەل لینین رەهبەری کرد .

استالین لە مدتی فعالیتی انقلابی خوی‌دا هەشت جار حەبس و حەوت جار تبعید کرا . بەلام شەش جار لە تبعید هەلات ؛ پاش انقلابی فوریە سالی ١٩١٧ لە آخرین تبعید آزاد بوو ورویشتە پترو گراد (لینین گراد) وفعالیتی کمیتەی

ماوەی لە لاپەرەی ٣

## گفتو گوی جنابی قاضی محمد

پیشوای بەرزی کوردوستان دەگەل خاوەنانی روزنامەی تاران

هیندیی لە مدیرانی جراندی تاران : آغای فضلی خاوەنی روزنامەی ( ایران‌ما ) آغای عباس‌شاهندە خاوەنی روزنامە ی ( فرمان ) آغایانی بزرك علوی و هرمونوسەرانی دوروزنامەی ( رهبر و ایران ما ) بو آگاداری لە وەضعی کوردوستانی خود مرختار هاتە مهاباد و لە گەل جنابی قاضی محمد رهبری میللەتی کورد بەکتری دیت و گفتگویان کرد بو آگاداری‌خوێندەوارە بەرزەکان یەك‌یەك پرسیاری ئەوان و وەرامی جنابی‌قاضی دەنوسری :

پرسیار ـــ لە تاران دەلین کوردان بەرەهبەری‌جنابت

ماوەی لە لاپەرەی چوار



# کوردوستان

*********

بلاو ئەرەوەی بیری حزبی دیموکراتی
کوردوستان

(گواریکی ئەدەبی و کومەلایەتی سیاسی کوردیە)

هەر پازدە روزاجاریك بلاو دەکریتەوە

زمارە ۲ سالی یەکەم ۳۰ سەرماوەز ۱۳۲٤ ۲۱ دسامبر ۱۹٤٥

## لەم ژمارەیەدا



مهاباد چاپخانەی کوردوستان

## 6. 4. شۆڕشی تەموز و گێچەڵ بە کاتنامە کوردییەکان

لە ژ 9 ی کانونی یەکەمی 1961 ی گۆڤاری (ڕۆژی نوێ) ی سلێمانیدا لە ژێر سەرناوی: (ڕۆژنامەی خەبات) دا نوسیویێتی:

"مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەدی تێکۆشەر، سکرتێری کۆمیتەی ناوەندی پارتی دیمۆکراتی کوردستان، وە سەرنوسەری ڕۆژنامەی خەبات درا بە ئەنجومەنی عورفی. وە ڕۆژی 21 ی 11 ی 1960 ئەنجومەنی عورفی کۆبوەوە وە بڕیاری دا کە موحاکەمەکە بخرێتە ڕۆژی 27 ی 11 ی 1960.

"ڕۆژنامەی خەبات، ئۆرگانی پارتی دیمۆکراتی کوردستان، وە دەنگی دڵسۆزی نەتەوەی کورد لەسەر ئەوە دراوە بە مەحکەمە چونکە وتارێکی بڵاوکردۆتەوە دەربارەی مادە 2 ی دەستوری وەختی، کەئەم مادە 2 ە ئەڵێ عیراق بەشێکە لە عەرەب. وە خەبات لەوە دووا بو کە گەلی عیراق بەشێک نیە لە گەلی عەرەب، بەڵکو عەرەبی عیراق بەشێکن لە گەلی عەرەب وە کوردی کوردستانی عیراق بەشێکە لە نەتەوەی کورد، وە هەروەها دەری خست بو کە کوردستانی عیراق خۆی بەشێکە لە کوردستان.

"بەم بۆنەیەوە بە هەزاران و هەزاران بروسکەنامە لێ دراوە، کە داوا ئەکرێ موحاکەمەی (خەبات) نەکرێ کە ڕۆژنامەیەکی تێکۆشەرە، وە هەمیشە هەوڵی ئەوە ئەدا کە برایەتی کورد و عەرەب بەهێز بکا و، یەکێتی ڕاستەقینەی عیراق پتەو بکا و، بەو پەڕی دڵسۆزییەوە هەوڵی پاراستنی کۆماری داوە و ئەیدا و وە خەباتێکی خاوێن ئەکا لە پێناوی دیمۆکراتێتی و مافی نەتەوەی کورد دا.

"هەر بەم بۆنەیەوە ژمارەیەکی ئێجگار زۆر لە پارێزەران خۆیان ئامادە کردووە کەپشتگیری خەبات بکەن وە پارێزەرانی شاری سلیمانی ڕۆژی 25 ی 11 ی 1960 ئەچون بۆ بەغدا بۆ ئەو پشتگیری کردنە.

"ڕۆژی نوێ داوا لە حکومەت ئەکا لە موحاکەمە کردنی خەبات گەڕێت وە بەشانازییەوە دەری ئەخا کە ڕۆژنامەی خەبات بە ڕۆژنامەی هەرە بەرزی کورد دائەنێ.

"ئەی خوێندەواری بەڕێز! تکای لێ بوردن ئەکەین لەوەدا، کە لەم ژمارەیەدا، فریای ئەوە نەکەوتین دەربارەی موحاکەمەکەی ڕۆژی 27 ی 11 ی 1960 بنوسین."

لە ژ 10 ی کانونی دوەمی 1961 ی (ڕۆژی نوێ) دا لە درێژەی مەحکەمەکەی خەبات دا بابەتێکی لە سەر هەندێ لە گۆڤار و ڕۆژنامە کوردییەکان نوسیوە، کە هەلومەرجی ڕۆژنامەوانی ئەو سەردەمە ڕون ئەکاتەوە، لێرەدا وەکو خۆی ئەینوسمەوە:

### 6. 4. 1. خەبات

"ئەنجومەنی عورفی لە کۆبونەوەی ڕۆژی 11 ی 12 ی 1960 یدا، بڕیاری دەرکرد بەوەی، کە ڕۆژنامەی خەباتی تێکۆشەر، لەو وتارەدا کە لە سەری درا بو بە مەحکەمە، تاوانبار نیە.

"خەبات، ئۆرگانی پارتی دیمۆکراتی کوردستان، وە دەنگی دلێر و پیرۆزی نەتەوەی کوردی تێکۆشەر، لەسەر ئەو وتارە درابو بە مەحکەمە کە دەربارەی مادە 2 ی دەستوری وەختی بڵاوی کردبوەوە، وە لە وتارەکەدا دەری خستبو وەک (ڕاستەقینەیەک) کە کوردی کوردستانی عیراق بە شێکن لە نەتەوەی کورد، وە خاکی کوردستانی عیراقیش بەشێکە لە کوردستان. بێگومان ئەم ڕاستەقینەیە نەکەس ئەتوانێ لاریی لێ بێ وە نەکەسیش ئەتوانێ بڵێ کوردستان نیشتمانی کورد نییە.. بەم پێیە ئەنجومەنی عورفیی دوهەم لە شاری بەغدا بڕیاری دەرکرد بەوەی ئەم وتارە (ڕەخنەیەکی خاوێن) ە وە هیچ زیانێک نادا لە برایەتی کورد و عەرەب.

"بێگومان بەوەی کە دان بنرێ بەوەدا کە کوردی کوردستانی عیراق بەشێکن لە نەتەوەی کورد، برایەتی کورد و عەرەب بە هێزتر ئەبێ و، یەکێتی ڕاستەقینەی عیراق پتەوتر ئەبێ.

"ڕۆژنامەی خەبات بەو وتارە مێژوییـە بـە نرخـەی هـەنگاوێکی پیـرۆزی نـا لـە پێنـاوی پێشـکەوتنی بیروباوەڕی کوردایەتی، وە بەهێزکردنی برایەتی کورد و عەرەبا، وە بڕیاری ئەنجومەنی عـورفیش بەڵگەیەکـە بۆ دڵسۆزی خەبات، وە ڕاستی و پاکی لە تێکۆشانندا.

"پڕ بە دڵ پیرۆزبایی لە ڕۆژنامەی خەباتی کورد ئەکەین لەم ئەنجامە جوانەدا کـە ڕێـک لەگـەڵ گیـانی دیمۆکراتێتیدا چەسپە.

"هەر بەردەوام بێ خەباتی تێکۆشەر بـۆ خزمـەت کردنـی بیروبـاوەڕی پـاکی کوردایـەتی وە کۆمـاری هاوبەشی کورد و عەرەب.

**6. 4. 2. هەتاو**

"مامۆستا گیو موکریانی خاوەنی چاپخانەی کوردستان و گۆڤـاری (هـەتاو) ی بـەڕێز دور خرابـوەوە، بەڵام هەواڵێک وا ئەگەیەنێ کە مامۆستا دەست بەسەرییەکەی لەسەر لابرا و گەڕایەوە بۆ هەولێر... پـڕ بـەدڵ پێخۆشحاڵیمان دەرئەبڕین وە ئاواتەخوازین کـە هـەتاو ڕێی بدرێتـەوە بـە دەرچـون. تـا لـە کـۆڕی خـەباتا خزمەتی کوردایەتی و کۆمارەکەمان بکا.

**6. 4. 3. ژین**

"ڕۆژی 8 ی 12 ی 1960 ڕۆژنامەی (ژین) ی بەڕێز کەوتەوە دەرچـون. ژیـن کـە ماوەیـەک بـو بـە فەرمانی سیادەتی حاکمی عەسکەریی گشتی داخرابو، لەئەنجامی سەردانی مامۆستا ئەحمەد زرنگ لە سیادەتی حاکم و گفتوگۆ کردنیان، سیادەتی حاکم فەرمانی دا بە دەرچونەوەی. پیرۆزبـایی لـە (ژیـن) ی خۆشەویسـت ئەکەین وە هیواداریـن هەر لە خزمەت کردنا بێت.

**6. 4. 4. دەنگی کورد**

لە هەمان ژمارەی ڕۆژنامەی ژیندا ئەم هەواڵە بڵاو کراوەتەوە:

"ڕۆژنامەی (دەنگی کورد) لەسەر وتارێک کە دەربارەی وەزعی شاری کەرکوک نوسی بوی، لـێپرسراوەکەی کە مامۆستا عومەر جەلال حەوێزییە گیرا. وە بەهۆی گرتنی ئەوەوە لە دەرچون کەوت، هیواداریـن کاربەدەسـتانی دڵسۆزی کۆمارەکەمان لێپرسراوی ڕۆژنامەی ناوبراو بەر بدەن وە ڕۆژنامەکە بکەوێتەوە دەرچون."

**6. 4. 5. داخستنی چاپخانەی کامەران**

ژین، لە ژ 12 ی مارتی 1961 یدا لە ژێر سەرناوی: (چاپخانەی کامەران داخرا) دا نوسیوێتی:

"ڕۆژی 10 ی 2 ی 1961 چاپخانەی کامەران بە فەرمانی سیادەی حاکمی عەسکەریی گشتی داخرا.

"تـا ڕۆژی 23 ی 2 ی 1961 چـاوەڕێی کردنـەوەیمان ئـەکرد بـەڵام لـەو ڕۆژەدا کـە چاپخانەکـە نەکرایەوە، ژمارە 12 ی ڕۆژی نوێمان برد بۆ چاپخانەی ژین چاپی بکا.

"زۆر سوپاسی مامۆستا ئەحمەد زرنـگ، خـاوەنی چاپخانـەی ژیـن وە کرێکـارانی ژیـن و چاپخانـەی کامەران ئەکەین کە هەوڵێکی بێ پایانیان لە پێناوی ئەوەدا دا کە ژمارە 12 دوا نەکەوێ.

"ئەم ژمارەیە تا لاپەڕە 40 ی لە چاپخانەی کامەران چاپ کراوە، وە لەو لاپەڕەیەوە لە ژین."

ئەگەرچی چاپخانەکە بە بیانوی ترەوە داخرا بەڵام هۆی ڕاستەقینەی داخستنی چـاپ کردنـی گۆڤـاری ڕۆژی نوێ بو.

### 6. 4. 6. داخستنی کاتنامە کوردییەکان

رۆژ لە دوای رۆژ نێوانی بزوتنەوەی نەتەوەیی کورد و عەبدولکەریم قاسم ساردتر ئەبو. بەرەو گرژی و پێکادان ئەچو. تا ئەوە بو لە 11 ی ئەیلولی 1961 دا کەرتەکانی جەیشی عیراق لە دەربەندیخان و لە دەربەندی بازیانەوە بەرەو سلێمانی بە رێ کەوتن و، شەڕ هەڵگیرسا.

لە دوا مانگەکانی حوکمی قاسمدا زۆری رۆژنامە و گۆڤارە کوردییەکان راوەستێنرا بون و، بە هاتنی بەعس بۆ سەر کار، لە شوباتی 1963 دا، ئیتر بە تەواوی هەمو بڵاوکراوە کوردییەکان قەدەغە کران.

بەعس قانونێکی تازەی دەرکرد ئیمتیازی هەمو کاتنامەکانی سەردەمەکانی پێشوی لە عیراقدا، بە کاتنامە کوردییەکانیشەوە، هەڵوەشانەوە. بەمەش کۆتایی بە قۆناغێ هات.

### 6. 5. هاتنی بەعس و پاوانکردنی مافی رۆژنامەوانی

قانونەکانی چاپەمەنی هەر لە سەرەتای دامەزراندنی دوڵەتی عیراقەوە تا هاتنی بەعس بۆ سەر حوکم، هەمیشە پەراوێزێکی تەسکی تێدا بوە بۆ ئازادی رۆژنامەوانی کەرتی تایبەت. وەرگرتنی ئیمتیازی دەرکردنی رۆژنامە و گۆڤار و بڵاوکراوەی دەوری، وەکو موڵکیەتی تایبەتی هەر شتێکی تر سەیری ئەکرا، ئەگەر بە رواڵەت یش بوبێ، ئەمە مافێکی هاوولاتی عیراقی بوە.

کە بەعس بۆ جاری یەکەم لە 8 ی شوباتی 1963 دا هاتە سەر کار، هەمو گۆڤار و رۆژنامە کوردییەکانی، کە لە سەردەمی قاسمدا دانەخرابون، بە یەکجاری داخست. یەکێ لەوانە رۆژنامەی بە تەمەنی (ژین) ی سلێمانی بو.

کە بۆ جاری دوەم لە تەمموزی 1968 دا هاتەوە سەر کار، نیزامێکی شمولی (تۆتالیتێر) ی دامەزراند. رۆژنامەوانییشی کردە بەشێکی ئەم نیزامە شمولیە. قانونەکەی گۆڕی و، ئیتر کەس مافی وەرگرتنی ئیمتیازی دەرکردنی رۆژنامەی نەما. مەگەر لە هەندێ حاڵەتی نائاساییدا، کە خۆیان مەبەستیان بو. ئەم مافە بۆ حکومەت و بۆ حیزب (بەعس خۆی و هاوپەیمانەکانی لە حکومەت و جەبهەدا) پاوان کرا. هەمو رۆژنامە و گۆڤار و بڵاوکراوە دەورییەکان خرانە ژێر دەسەڵاتی دەوڵەتەوە.

لە ناوەڕاستی شەستەکانەوە، پارتی دیمۆکراتی کوردستان بو بو بە دو کەرتەوە. هەردو باڵ بە ناوی پارتییەوە چالاکی سیاسی، رێکخراوەیی، راگەیاندن.. یان ئەنواند. بڵاوکراوەکان یشیان هاوناوی یەکتری بون. هەر بەو جۆرە حیزبی شیوعی عیراق یش بو بو بە دو کەرتەوە. هەردو باڵ بە هەمان ناوەوە چالاکییان ئەنواند.

بەعس بەرنامەی تایبەتی خۆی هەبو بۆ رەفتارکردن لە گەڵ کێشەی کورد. سەرەتا هەوڵیدا لە گەڵ هەردو باڵی جوڵانەوەی کورد پێک بێ و، هەردولا بەشداری وەزارەت و دەسەڵاتی سیاسی بن. ئەمە سەری نەگرت. باڵی بارزانی کەوتە شەڕێکی قورسەوە لە گەڵ هێزەکانی حکومەت و لە گەڵ باڵەکەی تری پارتی و، باڵەکەی تریش درێژەی بە چالاکیەکانی خۆی و بە هاوکاری دا لە گەڵ حکومەت. هەردو باڵ چەندین بڵاوکراوەیان، بە کوردی و بە عەرەبی، لەوانە ئۆرگانی حیزبەکەیان، لە چاپخانە و بارەگا نهێنیەکانی خۆیان دا، چاپ و بڵاو ئەکردەوە.

بەعس، لە جەنگەی شەڕدا لە گەڵ سەرکردایەتی بارزانی، دۆستایەتی باڵی مەکتەبی سیاسی ئەکرد و، هەندێ مافی نەتەوەیی کوردی سەلماند:

- زانکۆی سلێمانی دامەزراند،
- زۆری قەزا و ناحیە کوردنشینەکانی بادینان لە موسڵ جیا کرانەوە و پارێزگای دهۆک دروست کرا،

- نەورۆز کرا بە جەژنی رەسمی‌ی عیراق،
- رێگە درا بە دامەزراندنی یەکێتی‌ی نوسەرانی کورد،
- بڕیاری دامەزراندنی کۆڕی زانیاری کورد درا.
- دەزگاکانی حکومەت خۆیان چەند گۆڤاری کوردی و، پاشکۆی کوردی گۆڤاری عەرەبی دەرکرد و، ئیجازەی دەرکردنی رۆژنامە و گۆڤاریدا بە باڵی مەکتەبی سیاسی.

لە ژێر سایەی دەسەڵاتی بەعسدا رۆژنامەوانی‌ی ئاشکرا 6 جۆر بو:

- حکومەتی،
- پیشەیی،
- سیاسی و رۆشنبیری،
- حیزبی،
- ریکخراوەیی،
- کەرتی تایبەت.

لە پاڵ رۆژنامەوانی‌ی ئاشکرادا، رۆژنامەوانی‌ی نهێنی یش بەردەوام بو. پدک و حشع بڵاوکراوە کوردی‌یەکانیان بەردەوام بو.

## 6. 5. 1. رۆژنامەوانی‌ی حکومەتی

راگەیاندن یەکێکە لە کۆڵەکە سەرەکیەکانی ئایدیۆلۆجی بەعس. پرۆپاگەندە بۆ سەدام حسێن و بڵاوکردنەوەی وێنە و وتارەکانی و پرۆپاگەندە بۆ حیزبی بەعس و بیروبۆچون و هەڵوێستە سیاسی‌یەکانی، بەشێکە لەو کارە ئایدیۆلۆجیەی کە ئەبێ لە هەمو بوارەکانی ژیانی هاوولاتی عیراقیدا، بە تایبەتی لە دەزگاکانی راگەیاندن دا، رەنگ بداتەوە. بەعس بودجەیەکی گەورەی بۆ ئەم مەبەستە تەرخان کرد و، بەوپەڕی دەسبڵاویەوە کەوتە خەرج کردنی پارە لە سەر داوودەزگاکانی راگەیاندن و کارکەرانی ئەو بوارە.

## 6. 5. 2. بڵاو کراوە پیشەیی‌یەکان

هەندێ لە وەزارەتەکان و نەقابە و رێکخراوە ناوەندی‌یەکان، بڵاوکراوەی تایبەتی خۆیان هەبوە. هەندێک لەمانە بەشێکیان بۆ کوردی تەرخان کردوە. بەڵام ئەم گۆڤارانە هەر لە ناو خۆیاندا بڵاو بونەتەوە و، زۆر کەم گەیشتونەتە خوێندەواری ئاسایی. بە زۆری باس و بابەتەکانیان لاواز و بێ پێز بون، لەوانە:

### 6. 5. 2. 1. کاری میللی

پاشکۆی کوردی العمل الشعبی بو. وەزارەتی ئیرشاد لە بەغداد دەری ئەکرد. ژ 1 ی لە 11 ی تشرینی دوەمی 1968 دا و، دوا ژمارەی لە تەموزی 1969 دا دەرچوە.

### 6. 5. 2. 2. صوت الفلاح – دەنگی فەلاح

یەکێتی گشتی جوتیارانی عیراق دەری ئەکرد. ژ 1 ی لە 10 ی مایسی 1971 دا دەرچوە.

### 6. 5. 2. 3. وعي العمال – هوشیاریی کرێکاران

یەکێتی‌ی گشتی‌ی کرێکارانی عیراق دەری ئەکرد. ژ 1 ی لە 7 ی کانونی یەکەمی 1972 دا دەرچـوە. لە ژ 189 ەوە بەشێکی بە زمانی کوردی ئەنوسی.

### 6. 5. 3. بڵاوکراوەی سیاسی و رۆشنبیری

بەعس جوڵانەوەی کوردی وەکو یەکێ لە گـەورەترین هەڕەشـە ناوەکی‌یـەکانی ئاسایشـی نیشـتمانی‌ی عیراق و ئاسایشی نەتەوەیی عەرەب دائـەنا، بۆیـە لـە پـاڵ دانـانی رێوشـوێنی سـەرکوتکردندا، رێوشـوێنی دەستەمۆکردنی ئایدیۆلۆجی یشی، بۆ دائەنا، کـە یـەکێ لـە رێگـەکانی کـارکردن بـو لـە مەیـدانی رۆشـنبیری و رۆژنامەوانی‌دا.

### 6. 5. 3. 1. بەیان

ژ 1 ی لە تشرینی دوەمی 1969 لە لایەن وەزارەتی راگەیاندنەوە لە بەغداد دەرچـو. بەرپرسـیارەکەی د. ئەکرەم فازیڵ و، سکرتێری نوسینی جەلالی میرزا کەریم بو. بەیان لە پاش چەند ژمارەیەک درا بە دەزگای رۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی.

### 6. 5. 3. 2. هاوکاری

(دار الجماهیر للصحافة) هەفتانە لـە بەغـداد دەری ئـەکرد. دار الجمـاهیر، دەزگایـەکی رۆژنامـەوانی و چاپەمەنی‌ی گەورە بو. ئەگەرچی بە ناو دامەزراوێکی سەربەخۆی خاوەن کەسایەتی قانونی و مەعنـەوی بو، بەڵام لە چوارچێوەی ئایدیۆلۆجی بەعسدا کاری ئەکرد و سەر بە وەزارەتـی راگەیانـدن بـو. چەنـدین رۆژنامە و گۆڤاری بە زمانەکانی عەرەبی، ئینگلیـزی، کـوردی، تورکومـانی دەرئـەکرد، لەوانـە هەفتەنامـەی هاوکاری.

ژ 1 ی لە 9 ی کانونی دوەمی 1970 دا دەرچوە.

### 6. 5. 3. 3. رۆشنبیری نوێ و کاروان

ئەم بڵاوکراوانە دو لایەنیان هەبو: لایـەنێکیان، پرۆپاگەنـدە بـو بـۆ سـەدام و داوودەزگاکـانی بـەعس و بیرو بۆچون و هەڵوێستە سیاسی‌یەکانیان، کـە خـۆی لـە وێنـەکانی سـەدام و، وتـاری بـێ پێـز و نزمـی‌ی سیاسی‌ی لاپەڕەکانی پێشەوەی بڵاوکراوەکاندا ئەنواند. لایەنەکەی تری، ئەو وتار و شیعر و لێکۆڵینەوانە بو، کە نوسەر و لێکۆڵـەرەوەکانی کـورد بـۆ خزمـەتی ئـەدەب و رۆشـنبیری و میـژوی کـورد لـەم بڵاوکراوانـەدا ئەیاننوسی. ئەگەر نوسەرانی کورد بیانویستایە بایکۆتی ئەم بڵاوکراوانە بکـەن، جگـە لـەوەی رەنگـە توشـی راونان و سزادان ببونایە، ئەبو هیچ بەرهەمێکیشیان بڵاو نەکردایەتەوە.

### 6. 5. 4. رۆژنامەوانی‌ی حیزبی

بەعس کە هاتـە سـەر کـار، بـۆ ئـەوەی دەسـەڵاتی خـۆی جێگیـر بکـا و بـۆ ئـەوەی داوودەزگاکـانی دابمەزرێنێ، هەوڵی‌دا لە گەڵ هەردو باڵی جوڵانەوەی کوردا بسازێ. سەرکردایەتی بـارزانی پـاش ئاشـتییەکی کورت، نەیتوانی لە گەڵی پێک بێ، کەوتەوە شەڕ. ئەو ماوەیـە (1968- 1970) بـەعس لـە گـەڵ بـاڵی م س هاوکاری ئەکرد و، رێگەی کاری ئاشکرا و ئیمتیازی رۆژنامە و گۆڤاری بە وان دا.

ساڵی 1970 بەعس لە گەڵ سەرکردایەتی بارزانی پێکهات و، بەیاننامەی 11 ی ئازاری 1970 خوێندرایەوە. ئەم بەیاننامەیە دەسکەوتێکی گەورە بو بۆ گەلی کورد. بۆ یەکەمین جار حکومەتی عیراق مافی نەتەوەیی کوردی لە سەر بنچینەی ئۆتۆنۆمی سەلماند و، لە دەستوری کاتیی عیراقدا، دانی بەوەدا نا کە گەلی عیراق پێکدێ لە دو نەتەوەی سەرەکی عەرەب و کورد.

بەعس ئەو ماوەیە (1970- 1974) هاوکاری لە گەڵ سەرکردایەتی بارزانی ئەکرد و، ڕێگەی کاری ئاشکرا و ئیمتیازی ڕۆژنامە و گۆڤاری بەوان دا و، ئەو مافەی لە باڵەکەی تر سەندەوە. ئەم هاوکاریە تا ساڵی 1974 ی خایاند. لەو ساڵەدا شەڕ بە سەختی هەڵگیرسایەوە، تا بە ڕێککەتننامەی 1975 ی جەزائیری شا - سەدام کۆتایی هات.

**6. 5. 4. 1. التآخي– العراق**

بەعس چەند تاقمێکی کارتۆنیی دروست کرد. بە ناوی پارتی و هەندێ ڕێکخراوی ترەوە کاریان ئەکرد. لە پێشدا بە ناوی ڕۆژنامەکەی پارتی (التآخي) و، دواتر ئیمتیازی ڕۆژنامەیەکی پێ بەخشین بە ناوی (العراق) هوە، کە پاشکۆیەکی کوردی یشی هەبو.

ساڵی 1973 بەعس لە گەڵ حشع (جەبهە) ی پێکهێنا و، حشع بەشداری وەزارەت بو و، کەوتە کاری ئاشکرا و، دەرکردنی ڕۆژنامە و گۆڤار. ئەم هاوکاریە تا ساڵی 1979 ی خایاند. لەو ساڵانەدا کورد کەوتە بەر شاڵاوی دڕندانەی تەعریب، تەرحیل، تەهجیر و تەبعیس. حشع نەیتوانی پارێزگاری کورد بکا. سەرەنجام خۆیشی کەوتە بەر شاڵاوی بەعس و، بە ناچاری ملی ڕێگای شاخی گرت.

**6. 5. 4. 2. النور– روناکی**

زمانی پارتی دیموکراتی کوردستان (باڵی مەکتەبی سیاسی) بو. ڕۆژانە لە بەغداد بە زمانی عەرەبی دەرئەچو. ئیمتیازەکەی بە ناوی حیلمی عەلی شەریف و سەرنوسەرەکەی عومەر مستەفا بو. لە مایسی 1969 تا مارتی 1970 بەردەوام بو. ئەم ڕۆژنامەیە هەموی بە عەرەبی دەرچوە. تەنیا دو ژمارەی روناکی کە پاشکۆی هەمان ڕۆژنامە بو بە کوردی، ئەویش لە شێوەی گۆڤاردا، دەرچوە. ڕەحمانی زەبیحی سەرپەرشتی ئەکرد.

**6. 5. 4. 3. رزگاری**

گۆڤارێکی هەفتانەی گشتی بو. بیروڕای باڵی چەپی پارتی دیموکراتی کوردستان (مەکتەبی سیاسی) دەرئەبڕی. ئیمتیازەکەی بە ناوی نەوشیروان مستەفا (نوسەری ئەم دێڕانە) و سەرنوسەرەکەی شازاد سائیب بو. چەند ژمارەیەکی لە بەغداد و ئەوی تری تا ڕاوەستانی لە سلێمانی چاپ کرا. ژ 1 ی لە نیسانی 1969 و ژ 15 ی لە مارتی 1970 دا دەرچوە.

**6. 5. 4. 4. التآخي– برایەتی**

التآخي زمانی پارتی دیموکراتی کوردستان (سەرکردایەتی بارزانی) بو، لە کاتی گفتوگۆدا لە گەڵ حکومەتی عەبدولڕەحمان عارفدا، لە بەغداد دەری ئەکرد. ژ 1 ی لە 6 ی مایسی 1967 دەرچو. ئیمتیازی ڕۆژنامەکە بە ناوی ساڵح یوسفی یەوە بە عەرەبی بو، بەڵام پاشکۆیەکی کوردییان لە گەڵ دەر ئەکرد. ئەم خولەی دەرچونی برایەتی لە تشرینی دوەمی 1968 دا تەواو بو.

دەرچون و راوەستانی (التآخي- برایەتی) بەند بو بە جۆری پێوەندیی سەرکردایەتیی بارزانیـەوە لـە گەڵ حکومەتی بەغداد. لە گەڵ راگرتنی شەڕ و دەس پێ کردنی گفتوگۆدا دەستی ئەکرد بە دەرچون و، لە گەڵ هەڵگیرسانەوەی شەڕدا رائەوەستا. بەم جۆرە چەند جارێ دەرچو و چەند جارێ راوەستا.

دوای 11 ی ئازاری 1970 التآخي لە بەغداد دەستی کردەوە بە دەرچون. خاوەنی ئیمتیـازی حـەبیب محەمەد کەریم و سەرنوسەرەکەی دارا تۆفیق بو. التـآخي رۆژانــە بــە عــەرەبی لـە بەغـداد دەرئـەچو. پاشـکۆ کوردییەکەی سەردەمێک لە شێوەی گۆڤاردا لە بەغداد و سەردەمێک لە سلێمانی دەر ئەچو. ژمارەکـانی بەغـداد سەعید ناکام و رەفیق چالاک و ژمارەکانی سلێمانی رەمزی قەزاز سەرپەرشتی ئەکرد.

ساڵی 1974 بو بە رۆژنامەیەکی رۆژانە لە بەغداد بڵاو ئەکرایەوە. بـە هـۆی هەڵگیرسـانەوەی شـەڕی 1974 ەوە لە دەرچون وەستا.

دوای هەڵگیرسانەوەی شەڕ لە کوردستاندا، بەعس حیزبێکی کارتۆنی لە چەند کۆنـە پارتـیـیـەک دروسـت کرد و، رێگەی دان بە رۆژنامەیەکی رۆژانەی عەرەبی بە ناوی التآخي و پاشکۆیەکی کوردی بە ناوی برایەتـیـەوە دەر بکەن. ئیمتیازەکەی درا بو بە عەزیز عەقراوی. چەند ژمارەیەکی لێ دەرچو، ئیتر پەکی کەوت.

دوای راپەڕین پارتی بە هەمان ناوەوە و لە سەر ژمـارەی پێشـوی لـە هـەولێر کەوتـەوە بڵاوکردنــەوەی التآخي.

**6. 5. 4. 5. بیری نوێ**

رۆژنامەی حشع بو. ئیمتازەکەی بە ناوی فەخری کەریم زەنگەنـە و سەرنوسـەرەکەی د. حسـێن قاسـم عەزیز بو. ژ 1 ی لە 17 ی حوزەیرانی 1972 دەرچوە. لە گەڵ تێکچونی نێوانی حشـع و بـەعس لـە سـاڵی 1979 دا، ئەمیش راوەستا.

**6. 5. 4. 6. العراق و پاشکۆ کوردییەکەی**

ئەمانە زمانی حیزبە کارتۆنییەکان بـون. رۆژنامـەی حیزبـی تـا ئـەو زەمانـەی حیزبەکـە هاوپـەیمان و هاوکاری بەعس بو ماوەی بڵاوکردنەوەی ئەدرا، لە گەڵ تێکچونی پێوەندییە سیاسییەکانی بـەعس لـە گـەڵ ئەو لایەنەدا رۆژنامەکەیشی را ئەوەستێنرا. لە بەر ئەوە ئەم رۆژنامانە نەیان توانیوە بەردەوام بن.

**6. 5. 5. رۆژنامەوانیی رێکخراوەیی**

**6. 5. 5. 1. نوسەری کورد**

لە شێوەی گۆڤاری کتێبیدا دەرچوە. یەکێتی نوسەرانی کورد لە بەغداد دەری ئەکرد. ژ 1 ی لـە مـارتی 1971 دا دەرچوە. ساڵی 1974 زۆری نوسەر و ئەدیبەکانی کـورد چونـە شـاخ بـۆ بەشـداری لـە شۆڕشـی کوردا. لەوێ ژمارەیەکی تری لێ دەرچو. پاش شـکانی شۆڕشـەکە دیسـانەوە چەنـد ژمارەیـەکی لـێ دەرچـو. ئەگەرچی ئەبو گۆڤارەکە مانگانە بێ، بەڵام نەیتوانیوە بە رێکوپێکی لە کـاتی خـۆیدا بـڵاو بکرێتـەوە. چەنـد جارێ سەرنوسەر و دەستەی نوسەرانی گۆڕاوە.

**6. 5. 5. 2. رۆژی کوردستان– شمس کردستان**

گۆڤـارێکی عـەرەبی و کـوردی بـو. کۆمەڵـەی زانسـتی کـوردی لـە بەغـداد دەری ئـەکرد. ژ 1 ی لـە حـوزەیرانی 1971 دا دەرچـوە. سەرنوسـەری ژمارەکـانی سـاڵانی 71- 74 سـاڵح یوسـفی و، سـکرتێری نوسینی سەعید ناکام و، بگێڕی کاروبار جەمال خەزنەدار بوە. دواتر د. موکەڕەم تاڵەبانی بۆتە سەرنوسەری.

**6. 5. 5. 3. گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد**

کۆڕی زانیاری کورد، بە کوردی و عەرەبی ساڵی ژمارەیەک یان دوانی لە بەغداد لێ دەر ئەکرد. ژمارەی لاپەڕەکانی هەندێ ژمارەی، بەرەوژوری 800 لاپەڕەیە. ئیحسان شێرزاد سەرنوسەری بو.

**6. 5. 6. ڕۆژنامەوانیی کەرتی تایبەت**

**6. 5. 6. 1. ژین**

ژ 1 ی لە 10 کانونی یەکەمی 1970 دا دەرچوە. خاوەنی ئیمتیازی کاکەی فەلاح و سەرنوسەرەکەی عەبدولقادر بەرزنجی بوە.

**6. 5. 6. 2. زانیاری**

لە شێوەی گۆڤاردا دەرچوە. ژ 1 ی لە ئۆکتۆبەری 1970 لە بەغداد دەرچوە. خاوەنی ئیمتیازی د. عەزیز ئەمین و تەلعەت نادر و، سەرنوسەری نوری ئەمین بو. تەرخان کرابو بۆ لێکۆڵینەوەی زانستی. پسپۆڕ و مامۆستا کوردەکانی زانستگەکان بۆیان ئەنوسی. دوای چەند ژمارەیەک لە دەرچون کەوت.

**6. 5. 6. 3. هی تر**

دوای 11 ی ئازاری 1970 چەندین بڵاوکراوە لە شێوەی گۆڤار و ڕۆژنامەدا لە بەغداد، سلێمانی، هەولێر، دهۆک، کەرکوک دەرچون. هەندێکیان هی یەکێتییەکانی قوتابیان، ئافرەتان، مامۆستایان بون و، هەندێکیان مامۆستایان یان قوتابیانی قوتابخانەیەک دەریان کردون. ئەمانە هەندێکیان 1 ژمارە یان چەند ژمارەیەکی کەمی لێ دەرچوە و وەستاوە. ئەمانە جێگەیەکی ئەوتۆیان لە بواری سیاسی، ڕۆشنبیری، ئەدەبی ڕۆژنامەوانیی کوردی دا نیە.

بێجگە لەوانە (**ڕوانگە**) 3 ژمارە و (**دەفتەری کوردەواری**) 3 ژمارەی لێ دەرچوە. لە چەند سەرچاوەیەکدا ئەمانیش لە لیستەی گۆڤارەکاندا نوسراون، ئەگەرچی هەردو بڵاوکراوە باس و بابەت و شیعری باش و جۆراوجۆری چەند نوسەر و شاعیری جیاوازیان تێدایە، بەڵام ئەمانە گۆڤار نەبون، بەڵکو وەک هەر کتێبێکی تر چاپ و بڵاو کراونەتەوە.

## 7. قوتابخانەکانی رۆژنامەوانیی کوردی

### 7. 1. شام: قوتابخانەی رۆژنامەوانیی بەدرخانییەکان

#### 7. 1. 1. بنەماڵەی بەدرخان

#### 7. 1. 1. 1. نەوەی یەکەم

بەدرخان ئەگەرچی بە تێشکاوی دورخرایەوە بۆ جەزیرەی کریت و، دواتر بۆ شـام، بـەڵام پـێ ئـەچێ پیاوێکی رۆشنبیر و ئاگادار بوبێ لە گرنگی خوێندەواری و زانیاری نوێ. هەر بۆیە مناڵەکانی خسـتۆتە بـەر خوێندن و، چەندین سیاسی روشنبیری گەورەیان تێدا هەڵکەوتوە. لە ناو ئەوانـەدا: میقـداد مەدحـەت، ئـەمین عالی، حسێن کەنعان، خەلیل رامی، بەحری، عەبدولڕەحمان، عەبدولڕەزاق...

روژنامەوانی لە ناو ئەم بنەماڵەیەدا بوە بە پەیامێکی پیرۆز و نـەریتێکی پێڕەوکـراو. میقـداد مەدحـەت بەگ یەکەمین رۆژنامەی کوردی لە قاهیرە دامەزراند، کە ئەم بە هۆی نەخۆشی یان لە بەر هەر هۆیەکی تر لـەم کارە کشایەوە، عەبدولڕەحمان بەگی برای بە ئیسرارێکی زۆرەوە درێژەی بە بڵاوکردنەوەی دا. ئـەم بنەماڵەیـە لە رێگەی ئەم رۆژنامەیەوە ئەیانویست پەیامی کوردایەتی بە گەلەکەیان بگەیـەنن، بۆیـە بـە بـێ کۆڵـدان، ئـەم رۆژنامەیەیان گرت بە کۆڵەوە و، سەرەڕای هەمو گوشـارێکی کاربەدەسـتانی سـوڵتان عەبدولحەمیـد و، دەردی دەربەدەری و نەبونی، وڵات بە وڵات ئەیان گێڕا.

#### 7. 1. 1. 2. نەوەی دوەم

ئەمین عالی بەگ، کەسایەتی ناسراوی ئەستەمول و، یـەکێ لـە چالاکـەکانی بزوتنـەوەی کوردایـەتی و، یەکێ لە دامەزرێنەرانی جەمعیەتی تەعالی و تەرەقی کورد، باوکی سـورەیا و جـەلادەت و کامـەران بـو. ئـەم 3 کوڕە کە لە ناو ئەم بنەماڵە تێکۆشەرەدا چاویان هەڵهێنا بو، لە ئەستەموڵ خوێند بویان و، جەلادەت و کامەران لە ئەوروپا درێژەیان بە خوێندنی بەرز دابو.

سەرکەوتنی مستەفا کەمال رێگەی گەڕانەوەی بۆ تورکیا لێ بەستن. پەڕیوەی شام و لوبنان بون. دوای تێشـکانی شۆڕشـەکەی شـێخ سـەعید (1925) و، خـۆ رێکخسـتنەوەی چالاکـەکانی کـورد لـە رێکخـراوی خۆیبونـدا، جەلادەت یەکێ بو لە دامەزرێنەر و چالاکەکانی ئەم حیزبە. کە شۆڕشی ئـاگری (1929- 1931)

تێشکا، پێ ئەچێ جەلادەت و کامەران ئیتر نائومێد بوبن لە کاری سیاسی و چەکدار، لە بەر ئەوە بە تەواوی خۆیان بۆ کاری رۆشنبیری تەرخان کرد. چەندین گۆڤاریان دەرکرد و چەندین کتێبیان نوسی.

### 7. 1. 1. 2. 1. رۆژنامەی کوردستان

لە سەر دەستی ئەم بنەماڵەیەدا رۆژنامەی کوردستان بە 3 قۆناغ دا تێپەڕیوە:

**قۆناغی یەکەم** (1898– 1902) لە قاهیرەوە میقداد دەستی پێ کرد و، عەبدولرەحمانی برای بەرەو جنێڤ، لەندەن، فۆلکستن، جنێڤ، درێژەی بە رێپێوانەکە دا، تا لە بەر هەر هۆیەک بێ، ئیتر ڕاوەستاوە.

**قۆناغی دوەم** (1908) دوای ئینقیلابی عوسمانی سورەیای ئەمین عالی برازای لە ئەستەموڵ دەستی پێ کردەوە تا ئیتیحادی‌یەکان دایان خست.

**قۆناغی سێیەم** (1917- 1918) دیسانەوە سورەیا لە قاهیرە تێ هەڵچوەوە.

### 7. 1. 1. 2. 2. گۆڤاری هاوار

جەلادەت بەدرخان ئیمتیازی دەرکردنی گۆڤارێکی کوردی بە ناوی هاوارەوە وەرگرت. ژ 1 ی لە 15 ی مایسی 1932 دا لە شام بڵاو کردەوە. تا 15 ئابی 1943 بەردەوام بو. بە هەموی 57 ژمارەی لێ دەرچو. بە سەر یەکەوە 808 لاپەڕەن.

ئەگەرچی چەند نوسەری کە وەکو: کامەران بەدرخان، عوسمان سەبری، جگەرخوێن، قەدری جان.. لە نوسینەکانی‌دا بەشدار بون، بەڵام جەلادەت خۆی نوسەری سەرەکی بوە و، بەشێکی زۆری نوسینەکانی هی ئەون.

بە هۆی ناوبانگی باشی بنەماڵەی بەدرخان و، بە هۆی ئەو تۆڕە رێکخراوەیی‌یەی کە خۆیون لە کوردستانی عیراق دا هەی بو، زۆر زو ژمارەکانی هاوار گەیشتنە دەس رۆشنبیرانی کوردستانی عیراق. شاعیر و نوسەرەکانی کەوتنە پیرۆزبایی لێ کردن و هاندانی و، ناردنی بەرهەمەکانیان بۆی. پیرەمێرد وەفدی کوردستان و، بێکەس ئەی وەتەن و، شێخ سەلام کۆمەڵی گەلان و، ئەسیری سنوری کوردستان و، گۆران ئیلهامی هاواری، بۆ یەکەم جار لێرەدا بڵاو کردۆتەوە.

زۆری بابەتەکانی هاوار بە کوردین (بە تایبەتی بە زاراوی پاک و پاراوی جزیرە و بۆتانی کرمانجی‌ی سەرون)، دەربارەی ئەدەب و زمان و فۆلکلۆر و هۆزەکانی کوردن. بەڵام لە هەمو ژمارەیەکی‌دا بەشێکی فەرەنسی تێدایە. ناو بە ناو یش وتاری کورتی بە عەرەبی و تورکی بڵاو کردۆتەوە.

ژمارەکانی 1– 24 ی تێکەڵاوە لە رێنوسی حەرفی عەرەبی و لاتینی. دوای ئەوە ئیتر هەموی بە لاتینی نوسراوە.

هاوار لە سوید سەرلەنوێ بە ئۆفسێت چاپ کراوەتەوە.

د کەمال مەزهەر وتارێکی بە ناونیشانی: (گۆڤاری هاوار و کوردی عیراق) لە ژ 183 ی 1999 ی گۆڤاری بەیان‌دا نوسیوە و ئەڵێ: هاوار بە لایەنی کەمەوە 4 نامەی ماجستێر هەڵدەگرێت: شوێنی هاوار لە رۆژنامەنوسی‌ی کوردی‌دا و، ئەدەب، زمان و، مێژو لە هاواردا.

دو کەسی تر لە ژ 75 ی نیسانی 1998 ی گۆڤاری مەتین کە مانگانە لە دهۆک دەرئەچێ لە سەر هاواریان نوسیوە:

دیار دۆسکی: کۆڤارا هاوار و زارێ کرمانجی‌یا ژێری، مەتین، ژ 75، نیسانی 1998، ل 28- 34

انور محمد طاهر: رۆلێ هـاوار بـۆ پێشخسـتنا چیرۆکـا کوردیـیا هونـەری، مـەتین، ژ 75، نیسـانی 1998، ل 35- 43

جەلادەت لە 26 ی نیسانی 1893 لە دایک بوە و لە 15 ی تەموزی 1951 دا مردوە.

### 7. 2. جەنگی جیهانیی دوەم و رۆژنامەوانیی کوردی

هەڵگیرسانی دوەمین جەنگی جیهانی و ململانێی نێوان هاوپەیمانەکان و دەوڵەتانی میحوەر، پێویسـتی بە پرۆپاگاندەیەکی زۆر هەبو. هاوپەیمانەکان بە کوردی یش ئەم کارەیان کرد. لە بەغداد دەنگی گیتی تازەیان بڵاو کردەوە و، لە یافا بەرنامەیەکی کوردییان لە رادیۆی (الشرق الادنی) کردەوە. ئەمانە بە کرمانجیی خوارو بون. بە کرمانجیی سەرو یش یارمەتی جەلادەت و کامەرانیاندا چەند گۆڤارێ بڵاو بکەنەوە. لـە گـەڵ تـەواو بونی جەنگدا ئەم گۆڤارانە یش راوەستان.

#### 7. 2. 1. رۆناهی

جەلادەت عالی بەدرخان مانگانە دەری کردوە. ژ 1 ی لە 1 ی نیسـانی 1942 دا و ژمـارە 28 ی کـە دوا ژمارەیەتی لە مارتی 1945 دا لە شام، بە کرمانجیی سەرو و، بە حەرفی لاتینی دەرچوە. لـە گـەڵ تـەواو بونی دوەمین جەنگی جیهانیدا راوەستاوە. زۆری بابەتەکانی بۆ پرۆپاگەندەی جـەنگیی هاوپەیمانـەکان دژی ئەڵەمانیا تەرخان کراوە.

#### 7. 2. 2. رۆژا نو

د. کامەران عالی بەدرخان دەری کردوە و جەلادەتی برای یارمەتی داوە. ژ 1 ی لە مایسـی 1943 دا لە بێروت، بە کرمانجیی سەرو و، بە حەرفی لاتینی دەرچـوە. لـە گـەڵ تـەواو بـونی دوەمـین جـەنگی جیهانیدا راوەستاوە. زۆری بابەتەکانی بۆ پرۆپاگەندەی جەنگیی هاوپەیمانەکان دژی ئەڵـەمانیا تـەرخان کراوە.

#### 7. 2. 3. ستێر

د. کامەران عـالی بـەدرخان دەری کـردوە و جـەلادەتی بـرای یارمـەتی داوە. ژ 1 ی لـە 6 ی کـانونی یەکەمی 1943 دا لە شام، بە کرمانجیی سەرو و، بە حەرفی لاتینی دەرچوە. لـە گـەڵ تـەواو بـونی دوەمـین جەنگی جیهانیدا راوەسـتاوە. زۆری بابەتـەکانی بـۆ پرۆپاگەنـدەی جـەنگیی هاوپەیمانـەکان دژی ئەڵـەمانیا تەرخان کراوە.

هـەواڵی ئـەم بڵاوکراوانـە بـە خۆشـیەکی زۆرەوە لـە نـاو رۆشـنبیرانی کوردسـتانی عێـراقدا دەنگـی داوەتەوە. پیرەمێرد لـە (ژیـن، ژ 738 ی، 6 ی نیسـانی 1944 دا) لـە ژێـر سـەرناوی: (چـاورونی) دا لـەم بارەیەوە نوسیویێتی:

"کورد کە شابازی ئەوجی ئازایی و سەرئازادی بو، چەنـدێک بـە نـارەوایی لانـەیان شـێواندن، پەروباڵیان قرتاندن، رۆڵەی نازدار و جگەرگۆشەی بەکاریان خنکاندن، من هـەمو سـاڵێ لـەم هـەیوەدا شین و زاری و شیوەن و ناڵەکاریم بۆ دەکردن، ئێستا خوا رەوای بینی وەکو ئارایشی بەهار ژیانەوە و بوژانەوە و لە گردی یارەوە شەوقی ئاگری رۆژی نەویان ئەگاتە جیلوەگاهی (رۆژی نەو) ی بێـروت و لوبنان.



SAL 1
HEJMAR 1
ÇARŞEMB
1 NÎSAN 1942

# RONAHÎ

ANNEE 1
NUMÉRO 1
MERCREDI
1 AVRIL 1942

SUPPLÉMENT ILLUSTRÉ DE LA REVUE KURDE HAWAR



Balafirên ingilizî di peravên Norvêjê de bi ser vapo rên dijmin de girtine û ew dane ber bimbeyên xwe. Balaf iran hingafte vaporekê û ew bin av dibe.

ŞAM—1942
ÇAPXANA SEBATÊ



1-4
MAR 1-28
SAN 1942
R 1945

ANNEE 1-4
NUMÉRO 1-28
1 AVRİL 1942
MARS 1945

# RONAHÎ

SUPPLÉMENT ILLUSTRÉ DE LA REVUE KURDE HAWAR

**Mîr CELADET BEDÎRXAN**
**Xwedî û Berpirsiyarê Kovarê**

ŞAM - 1942-1945
ÇAPXANA SEBATÊ
ÇAPXANA TEREQIYÊ

BERHEVOK : ÇAPXANA JÎNA NÛ

"ئەم روناکیە لە گەڵ روناکی شاما یەکدگیر بو. شامی کردین بە سەحەر. هـەمو هەفتەیـەک رۆژنامـەی رۆژی نویَ و ئەستێر و ڕوناکی مان بۆ دێت، چاوی وڵاتی پێ ڕون دەبێتەوە. جـۆش و خرۆشـێکی خسـتۆتە ناو ئەم وڵاتە کە هیوای وریایی و ڕاپەڕینی لێ دەوەشێتەوە.

"خـوا هیمـەتی بەدرخانی‌یـەکان بەرقـەرار کـا کـە زینـەتی لاپـەڕەی کـوردەوارین و فیـداکاری گـەل و نیشتمانن."

## 7. 3. سیماکانی قوتابخانەی رۆژنامەوانی‌ی بەدرخان

لێکۆڵینەوەی کوردستانەکان، هاوار، ستێر، رۆژا نو، رۆناهی، دەری ئەخەن کە ئەم بنەماڵەیـە داهێنـەری قوتابخانەیەکی تایبەتین لە رۆژنامەوانی‌ی کوردیدا:

1. لە بارەی زمانەوە، زاراوی جزیرە و بۆتانی کرمانجی‌ی سەرویان کرد بە بنچینـەی زمـانی نوسـین و دەوڵەمەندیان کرد بە وشەی زاراوەکانی تر و، بە وشەی تازە دارێـژراو. میـر جـەلادەت چونکـە شـارەزای چەند زمانێکی رۆژهەڵاتی و ئەوروپایی بو، لەم مەیدانەدا وەستایەکی داهێنەر بو.

2. لە بارەی گۆڕینی حەرفی عەرەبیەوە بە حەرفی لاتینی. تا ئەو کاتـە نوسـینی کـوردی هـەر بـە حەرفی عەرەبی ئەنوسرا. ئەمان ئیتر حەرفی لاتینیان کرد بە ئامرازی نوسـینی کـوردی. ئەگـەرچی ئەمـە لاسایی کردنەوەی تورک بو، بەڵام کارێکی پێویست بو چونکە لە تورکیا ئیتـر بـە یـەکجاری وازیـان لـە حەرفی عەرەبی هێنا و، لاتینی‌یان کرد بـە حـەرفی نوسـین. ئـەمان یـش بڵاوکراوەکانیـان بـە زۆری بـۆ کوردی تورکیا بوە.

3. لە بارەی زیندوکردنەوەی کەلەپور و فۆلکلۆری کوردی‌یەوە. لاپەڕەکانی گۆڤارەکانیان بە دەیـان چیرۆکی فۆلکلۆری و پەندی پێشینان و باسی هـۆز و تیرەکـانی کـورد و داب و نەریتـەکانی کـوردەواری تێدایە.

4. لە بارەی گەشە پێدانی ئەدەبەوە، چەنـدین وتـاری ڕەنگینـی لـە سـەر ئـەدەبی کـوردی و شـاعیرە ناودارەکانی تێدا نوسراوە. سەرەڕای چەندین شیعری کلاسیکی و نویَ.

بە هۆی ئەم گۆڤارانەوە چەندین نوسەر و شاعیر پێگەیشتن و دەرکەوتن و ناسران، لەوانـە: عوسـمان سەبری، قەدری جان، جگەرخوێن، نورەدین زازا...

5. بەرزی و جوانی هونەری رۆژنامـەوانی‌ی بڵاکراوەکـانی. شـام و بێـروت لـە کۆنـەوە دو ناوەنـدی گرنگی رۆشنبیری و رۆژنامەوانی‌ی عەرەبی بون و دەزگای نوێی چاپیان تێدا بـوە، بۆیـە لـە روی هونـەری رۆژنامەوانی‌یەوە بڵاوکراوەکانی چلەکانی بەدرخانی‌یەکان ئاستێکی بەرز و جوانی هەیە و، بـە ژمـارەی زۆری وێنەی جۆراوجۆری دەنگوباسی جەنگ ڕازێنراونەتەوە.

6. لـە دەرەوەی کوردسـتان ژیـاوە. تـا ئـەو کاتـەی سـوریا و لوبنـان لـە ژێـر دەسـەڵاتی ئینتیـدابی فەرەنسی‌دا بون، کورد کەڵکی لە هەندێ لە مافە روشـنبیری‌یەکانی، بـە تایبـەتی بـە کارهێنـانی زمانەکـەی بـۆ نوسین و بڵاوکردنـەوەی رۆژنامـە و کتێـب، وەرئـەگرت. کـە سـوریا و لوبنـان سـەربەخۆیی‌یان وەرگـرت و، نەتەوەپەرستەکانی عەرەب کاروباریان گرتە دەس، ئەم مافەیان لە کورد سەندەوە. ئیتر رێگـەی بڵاوکردنـەوەی هیچ رۆژنامە و گۆڤار و کتێبێکیان بە زمانی کوردی نەدا. لە تورکیـا یـش لـە سـەرەتای بیسـتەکانەوە زمـانی کوردی قەدەغە کرابو. لە بەر ئەوە ئەم قوتابخانەیە نزیکەی نیو سەدە لە دەرەوەی کوردستان لە چالاکی‌دا بـو، ئیتر کوێر بوەوە.

## 7. 4. عیراق: قوتابخانەی رۆژنامەوانیی گەلاوێژ (1939– 1949)

گەلاوێژ، ژ 1 ی لە کانونی یەکەمی 1939 دا دەرچوە. لە ئابی 1949 دا بە بیانوی گرتنـی ئیبـراهیم ئەحمەدەوە حکومەتی عیراق دایخست. بە هەموی 105 ژمارەی لێ دەرچوە. گەلاوێژ لە مێژوی رۆژنامەوانیی کوردیدا شوێنێکی تایبەتی هەیە. ئـەگونجێ وەکـو قوتابخانەیـەکی تایبـەتی رۆژنامـەوانیی کـوردی سـەیری بکرێ. سیماکانی ئەم قوتابخانەیە:

1. دابەشکردنی لاپەڕەکانی بە سەر بابەتی جیاوازدا: وتار، لێکوڵینەوەی مێژویی، ئەدەبی، زمانـەوانی، دیوانی گەلاوێژ، چیرۆکی ژمارە (هەندێکیان نوسەرانی کورد نوسیویانە، بەڵام بە زۆری لە ئەدەبی جیهانیـەوە کراوەتە کوردی)

2. زمانێکی پاراو و ڕەوان و، بەکارهێنانی وشەی ڕەسەنی کوردی.

3. بایەخێکی زۆری داوە بە وەرگێڕانی وتار و، بابەتی رۆشنبیری و، زانیاریی گشتی، بە تایبـەتی لـە زمانی ئینگلیزییەوە. بۆ ئەوەی ئەدەبی کوردی لە گەڵ ئەدەبی جیهانی گرێ بدا.

4. بڵاوکردنەوەی بیری پێشکەوتو و دژایەتی دەرەبەگایەتی و بانگەشە بۆ ژیانی دیمۆکراتی.

5. قسەی نەستەق و پەندی پێشینان و نوکتەی بە پێز.

**نوسەرەکانی:**

ئەوانەی لە گەلاوێژدا نوسیویانە زۆرن. ئیبراهیم ئەحمەد (بە زۆری بە نـاوی خواسـتراوەوە وەکـو ن. أ، هـ. ل. ب)، عەلادین سجادی، تۆفیق وەهبی، ئەمین زەکی، پیرەمێـرد، شـێخ محەممـەدی خـاڵ، فایـەق هوشیار، ع چالاک (عەبدوڵلا جەوهـەر)، شـاکیر فـەتاح، بێکـەس، دڵـدار، گـۆران، ڕەشـید نـەجیب، نـاجی عەباس، قادر قەزاز، قادر خەفاف...

گەلاوێژ لای هەمو نوسەرانی کورد و بڵاوکراوە کوردییەکانی ئەو سەردەمە پایەیـەکی تایبـەتی هـەبوە و بە ڕێزەوە ناویان بردوە. پیرەمێرد زۆر جار لە ژیـندا بـە ستایشـەوە باسـی کـردوە. زۆر جـار لـە یـادی ساڵانەیدا بە شیعر و پەخشانی جوان بالۆرەی خۆشی بۆ وتوە.

بە بۆنەی دەرچونیەوە نوسیوێتی: "......"

کـە توشـی کێشـە و گیروگرفـت بـوە لـە (ژیـن، ژ 876 ی 26 ی حـوزەیرانی 1947) دا لـە ژێـر سەردێڕی: (بەرەو دوا) نوسیوێتی:

"ئۆف عەلائەدین رۆڵەی باوانم
ئاگرت بەردایە ژین و ژیانم

ئێمە لەم دوایی رۆژەمانا هیوایـەکی تازەمـان بـۆ پەیـدا بـو کـە میللەتەکـەمان بـە خۆیـانـا هـاتون و کەوتونە سەودایەکی خۆ بە خـەڵک ناسـین و، نیازیانـە بکەونـە ریـزی میللەتـە خواپێـداوەکان و، ئـەم هیوایەیش زۆرتر بەوە پەیدا بو کە لە پایتەخت دا گۆڤارێکی کوردی چاک و پاک و ڕوناکمان هەیـە وەک گەلاوێژ بە هـەمو لایـەک دا شـەوق و پرشـنگی ئـەڕوا و هەسـت و زانسـتی کـوردان لـە تریفـەی نـوری ئاسمانی دا دەردەخا. چەند خۆش بو لە ئێران و تـوران و لوبنـان و کۆنـە شـاری فیرعەونـەکانا دەنگـی دابوەوە. بارەها ژیان و ژینم لە دەور ئەگێرا و بە نەغمەیـەکی دڵشـادیەوە ئەمنوسـی: (گـەلاوێژ خوشـکە باڵا بەرزەکەی ژین) و، ساڵەوسـاڵ بالۆرەیـەکی پیرۆزانـەم بـۆ ئـەگوت. کـەچی لـە کـەچی بـەختی ئێمـە و کەچرەوی گەردون ئەو پەریە نازدارەمان کەوتۆتە گیانەڵا. ئەمـەیش دیـارە لـە بـەر ئەوەیـە کـە پـارەی ئابونەی بۆ نانێرن.

"مادام گەییە ئێسکم با پەردە لە روی پەچە پۆشەکان هەڵماڵم. هەر لەم شاری خۆمانـەدا زۆری وا هەیـە کە نازانێ بە رێکوپێکی عەرەبی بخوێنێتەوە ئابونەی یەکدو غەزەتەی عەرەبی پێشەکی ئـەنێرێ غەزەتـەی بـۆ دێت. هی وایشمان هەیە رەهبەری ئەکا غەزەتەیک بە تەواوی ئەژێنێ. لە شارەکەی خۆمانـا چەنـد دەسـتەیەک و کۆڕی پۆکەری مەکشوف ئەبینم هـەمو خۆیـان بـە ئـەدیب و شـاعیر و مـەلیک ئـەل شـوعەرا و مەنسـوبی مەعاریف ئەزانن شەوی وا هەیە پارەی ئابونەی دە ساڵی گەلاوێژی تیا ئەبرێتەوە کـە بـە رۆژ باسـی پـارەی ئابونەی گەلاوێژی لە لا بکەی وەک شەمشەمە کوێرە چاو ئەقوچێنن. کە ئێش یەتە مەیـدانی میللیەتپـەرەوەری بە باڵ ئەفڕن. لاوە قوڕ بە سەرەکانیش بەم چەکە و کەوانەوە کەوتنـە سـەودای قەومیەتـەوە، دیـارە گـەنجێک کە هێشتا نەکەوتۆتە دەست و مەقامی خۆی و پارەی نیە، دڵ بە پارەدارەکان ئەبەستێ. تو خـوا میللـەتێک کـە دەربارەی سەقافە و چـرای ڕێی بـەختیاری خـۆی وا بجوڵێتـەوە چ حـەقێکی هەیـە بـە لاوە بڵێـت تـۆ بـۆچ نامناسیت؟ وەڵڵا بە هەمو مەعنایەکەوە کسپە لە دڵمەوە دێت کە ئەم سەجیبەی پیاوماقوڵ و پارەدارانـە ئەخەمـە پێش چاوی دۆست و دوژمن، تفـی بـەرەو بایـە. بـەڵام ئـەڵێی چـی؟ وا نوسـیم بـۆ ئیدارەخانـەی گـەلاوێژ دەفتەری ئەو نامەردانەم بۆ بنێرێ و وەکالەتیش وەرئـەگرم. هـەر بـۆ بـەدناوی و تـەرزیل کردنیـان ئیقامـەی دەعوا ئەکەم. برایمیش ناکەم بە وەکیـل. ئـەوقاتێکی لاوە دێـنم بـە مەسـرەفی محاکەمـە و (نـاوی مـەنێ) لـێ نانەوە ئەو پارەیەیان لێ ئەسێنم. شەرتە بۆ ژینیش تـەنها یـەک زات لـە بـەگزادە بـەو دەردە بـەرم. خـوا لـە وەجاخیا نەیەڵێ ع. ح."

پیرەمێرد لە ژیندا بە بۆنەی داخستنیەوە نوسیوێتی:

داد لە دەست جەورت، هەی چەرخی سەرچەوت! وا گەلاوێژ کەوت، گەلاوێژ بۆچ کەوت؟
ئاسۆی ئەدەبی کوردی پڕ تەمە سفیدەی بەیان شینە، ماتەمە
ژین بۆ گەلاوێژ بو بو بە پەرژین ئێستا لە دوای ئەو بێزارە لە ژین
ئیبراهیم لە ناو نارا سوتاوە سوجادەی تەقوا بێ رایەڵ ماوە
هیوامان وایە کە چەرخ وەر گەڕێ سوجادەم بە سەر شەت دا بگەڕێ
پیاوێکمان ئەمرێ تەعزێی بۆ دەگرین بۆچ بۆ گەلاوێژ نەگرین تا ئەمرین
گەلاوێژ هەرچەند جار جارە هەڵدێ لە بورجی خۆیدا دوایی هەر هەڵدێ.

## 7. 5. ئێران: قوتابخانەی رۆژنامەوانیی موکریان

### 7. 5. 1. گۆڕانی سیاسی لە ئێران دا

#### 7. 5. 1. 1. روخانی رەزا شا

لە دوەمین جەنگی جیهانیدا ئەگەرچی ئێـران بـە رواڵـەت بێلایـەنی راگەیانـد بـو، بـەڵام چـالاکی بـە قـازانجی دەوڵـەتانی میحـوەر، بـە تایبـەتی بـە قـازانجی ئەڵـەمانیا، لـە نـاو ئێـران دا لـە زیـاد بـون دا بـو. هاوپەیمانەکان بۆ ئەوەی رێ لەم مەترسیـیە بگـرن و، بـۆ ئـەوەی رێگـەی لوجسـتی نێـوان یـەکێتی سـۆڤێت و خەلیج دابین بکەن، لە لای سەرویەوە لەشکری سـۆڤێت و لـە لای خوارویـەوە لەشـکری ئینگلیـز، پـەلاماری ئێرانیان دا و گرتیان. رەزا شایان ناچار کرد بە قازانجی محەممـەدی کـوڕی دەس لـە تـەختی شـایەتی هـەڵ بگرێ. ناوچەی موکریان وەکو هەرێمێکی بێلایەن لە نێوان ئەم دو هێـزەدا مایـەوە. چالاکـەکانی کـورد، دوای ساڵانێکی درێـژی چەوسـاندنەوەی سـەردەمی رەزا شـا، کـەڵکیان لـەم بۆشـاییە وەرگـرت بـۆ گـەرمکردنی چالاکیی سیاسی و رۆژنامەوانی.

**7. 5. 1. 2. دامەزراندنی ژ. ک. و دیمۆکرات**

کۆمەڵەی ژ ک دامەزرا و، کەوتە دانانی ڕێوشوێنی بڵاوکەرەوەی بیری ڕێکخراوەکە. هەر لەو ساڵانەدا ناوچەکە گۆڕانی بنەڕەتی بە خۆیەوە دی. ژ ک گۆڕا بۆ حیزبی دیمۆکراتی کوردستان و، حیزبی دیمۆکرات، جمهوریەتی کوردستانی دامەزراند. ئەم قۆناغە سەرەڕای کورتیی ماوەکەی، قۆناغێکی دەوڵەمەندی کاروانی ڕۆژنامەوانیی کوردییە.

**7. 5. 2. چاپکراو بە کوردی**

**7. 5. 2. 1. نیشتمان**

ژ 1 ی لە پوشپەڕی 1322 دا بەرامبەر جولای 1943 دەرچوە. لە سەرەوەی لاپەڕەی یەکەمیدا نوسراوە: "بژی سەرۆک و کورد و کوردستان و هیوا" لە سەرەوەی ناوی نیشتمان لە ناو خۆریکی پرشنگداری خڕدا بە حەرفی لاتینی نوسراوە (J.K) و، لە ژێریدا نوسراوە نیشتمان "بڵاوکەرەوەی بیری کۆمەڵەی ژ. ک" و، لە ژێر ئەو یشدا نوسراوە: "گۆڤارێکی کۆمەڵایەتی، ئەدەبی، خوێندەواری و مانگی کوردیە"

د جەمال نەبەز بە لێدوانەوە ژ 1– 6 ی (نیشتمان) ی لە ئەڵەمانیا بە ئۆفسێت سەرلەنوێ چاپ کردۆتەوە.

**7. 5. 2. 2. هاواری کورد**

ژ 1 ی لە ڕەزبەری 1324 ی هەتاوی بەرامبەر ئەیلول– تشرینی یەکەمی 1945 دەرچوە. 30 لاپەڕەیە. قەوارەی 20 x 14 سم ە. م. ح (سەید محەمەدی حەمیدی) وتارێکی بە فارسی لە ژێر سەرناوی (نویسندگان فارسی بخوانند) نوسیوە. ئاراستەی نوسەرانی فارسی کردوە. داکۆکی لە ڕەسەنیی زمان و ئەدەبی کوردی ئەکا.

پێ ئەچێ ئەم ژمارەیەی هاواری کورد، دوای گیرانی ڕەحمانی زەبیحی و هاوڕێکانی و ڕاوەستانی نیشتمان، ئەمیش هەر بە نهێنی، دەرچوبێ. ناوی خاوەن و بەرپرس و، ناونیشانی گۆڤارەکە و، شوێنی چاپ و ناوی چاپخانەی تێدا نەنوسراوە. لەو ماوەیەدا گۆڕینی سیاسی بە سەر هەلومەرجی موکوریاندا هاتوە. زەمینەی دامەزراندنی حیزبی دیمۆکراتی کوردستانی ئێران و حکومەتی کوردستان خۆش بوە و ئیتر گۆڤار و ڕۆژنامەکان بە ئاشکرا دەرچون.

**7. 5. 3. دەزگای چاپخانە لە مەهاباد**

**7. 5. 3. 1. گۆڤاری کوردستان**

ژ 1 ی لە 15 ی سەرماوەزی 1324 بەرامبەر بە 6 ی دیسەمبەری 1945 لە چاپخانەی کوردستان لە مەهاباد چاپ و بڵاو کراوەتەوە. لە ژێر ناوەکەیدا نوسراوە: (بڵاوکەرەوەی بیری حیزبی دیمۆکراتی کوردستان) و، (گۆڤارێکی ئەدەبی، کۆمەڵایەتی، سیاسیە، هەر پازدە ڕۆژ جارێک بڵاو دەکرێتەوە)

سەید محەمەدی حەمیدی سەرنوسەری بوە. لە سەروتاری گۆڤارەکەدا ئامانجەکانی بەم جۆرە ڕون کراوەتەوە:

"کوردستان، گۆڤارێکی ئەدەبی، تاریخی، کۆمەڵایەتی (اجتماعی) مانگیی کوردیە. یەکەمین ئارمانی بژار و ژیانەوەی زمان و ئەدەبیاتی کوردیە و زیندوکردنەوەی کورد و کوردستان بە پێی

شارستانێتی ئەمڕۆ و بۆ ژیانەوەی نێو و ئاساری زانایانی کورد تەقەلا دەدا، لە بەر ئەوە تکا لە خوێندەوارانی خۆشەویست دەکەین هەر کەس بەیت و حیکایات و سەرگوزەشتی پیاوێکی مەزن وە یا عەشیرەتێکی کوردی لە کن بێ وە یان نوسراوێکی لە لا بێ، یا لە بەری بێ: کوردی، فارسی، عەرەبی... مادامێک هی زانایانی کورد بێ و لە چاپ نەدرابێ بۆمان بنێرن کە بە یارمەتی خودا لە چاپی بدەین کە بە سەرهاتی ڕۆژگار لە نێوی نەبا."

هەندێ بابەتی جۆراوجۆری تێ دایە لەوانە: شەرحی حاڵی ستالین و پەیامی من بە میللەتی کورد، بۆ پەیدا نەبونی جەنگی سێیەم. کردەوەی حیزبی دیمۆکرات. دیموکراسی چیە. شیعری هەژار، خاڵەمین، م م عیشقی. کۆکەیی سانی.

گرنگترین بابەتی ئەم ژمارەیە ڕیپۆرتاجێکە لە سەر یەکەمین کۆنگرەی حیزبی دیمۆکراتی کوردستان.

ژ 2 ی لە 30 سەرماوەز بەرامبەر 21 ی دیسەمبەر 1945 دەرچوە.

ئەمیش وەکو پێشو شیعری سیاسی بڵاو کردۆتەوە. گرنگترین بابەتی ئەم ژمارەیە ڕیپۆرتاجێکە لە سەر هەڵکردنی ئاڵای کوردستان لە نەغەدە.

ژ 3 ی لە خاکەلێوەی 1325 دا بەرامبەر مارتی 1946 دەرچوە.

گرنگترین بابەتی ئەم ژمارەیە ڕیپۆرتاجێکە لە سەر هەڵکردنی ئاڵای کوردستان لە مەهاباد.

### 7. 5. 3. 2. ڕۆژنامەی کوردستان

لە سەر ناوی ڕۆژنامەکە نوسراوە: (بە نێوی خودای بەرز و بێ هاوتا) و لە ژێریشیدا نوسراوە: (بڵاوکەرەوەی بیری حیزبی دیمۆکراتی کوردستان)

ژ 1 ی لە ڕۆژی پێنجشەمو 20 ی 10 ی 1324 بەرامبەر بە 11 ی کانونی دوەمی 1946 دەرچوە. کوردستان ڕۆژە نا ڕۆژێ بە 4 لاپەڕە دەرچوە. وەکو ئەڵێن 112 یان 114 ژمارەی لێ دەرچوە. بە ڕوخانی جمهوریەتی مەهاباد ئەمیش ڕاوەستاوە. 60 ژمارەی بە مایکرۆفیلم لە کتێبخانەی کۆنگرێسی ئەمەریکیدا هەیە و، ژمارەکانی تری لە بەردەستدا نین.

### 7. 5. 3. 3. هاواری نیشتمان

(بڵاوکەرەوەی بیری یەکەتی جەوانانی دیمۆکرات) و، (گۆڤارێکی ئەدەبی، سیاسی، کۆمەڵایەتی) بوە. ص. ئەنجیری ئازەر مدیری مەسئولی بوە. ژ 1 ی لە 1 ی خاکەلێوەی 1325 دا بەرامبەر 21 ی مارتی 1946 لە مەهاباد لە چاپخانەی کوردستان دەرچوە.

### 7. 5. 3. 4. هەڵاڵە

لە بۆکان دەرچوە. حەسەنی قزڵجی سەرنوسەری بوە.

### 7. 5. 3. 5. گڕوگاڵی منداڵانی کورد

کرێکارانی چاپخانەی کوردستان دەریان کردوە.

بلاو کەرەوەی بیری یەکەتی جەوانانی دیموکرات

باسەواد بیخوێنەوە بو بی سەوادان

مدیر مسئول: ص. انجیری - آذر

# هاواری نیشتمان

وەختابەکی ایمە پیروزدەبین کەابونها
کومەلی زەحمەت کیشن بە مبارەزە
بخوازین . . . . . لە بین گەورە
پیشی انقلاب .

زمارە ۱ سالی هەوەل ۱ خاکەلیوە ۱۳۲۵ ۲۱ مارس ۱۹۴۶

لە ژیر چاوەدیری هەیئەتی تحریریە دەردەچی

بسم الله الرحمن الرحیم

آماجی ئیمە بە پشتیوانی خودا سەرخستن و روناك كردنەوەی بیری هەموانە



[لە لایەن دەستەی نوسەران وەدەردەكەوی]

الله لا اله الا هو الحی القیوم

( قرآنی مجید )

خودایا هەر ئەتوی پەرستراو، هەر بویە هەر دەبی، بوی تو پیشایی و دوایی نیە، بی نیازی لە هەمو شتیكو هەر چی شتە محتاجی تویە.

خودایا بە ئەمری تو آسمان پرە لە ئەستیرە، بە فەرمانی تو هەور دەبارینی باران و بەفر و گلیرە، بە ارادەی تو باغ و چیمەن دەمیك روت و قوتە و وەختیكیش زەنویرە.

خودایا غیری تو كەس دەستەلاتی نیە، كەسی چی كاری چكولەت دروستكردنی بشر و زەوییە، هوش و بیر لە بارەگای تو دا سەرزیان نەوییە، ایمە كە ناتوانین چون شت دەزانین و ئەسبابی زانینمان چیە، دەم كوتنمان لە گەورەیی تو زیادیە.

بەنیوی خودای بی‌هاوتا بژی کوردو کوردستانی مەزن

# گروگالی منداڵانی کورد

یری کارگەرانی چاپخانەی کوردستان

ژمارە ١

سالی ١

١ بانەمەر ١٣٢٥

**7. 5. 4. دەنگدانەوەی لە کوردستان دا**

بە درێژایی حوکمی رەزا شا لە ئێران رێگا بە زمانی کوردی نەدراوە وەکو زمانێکی نەتەوەیی لە فەرمانگەکانی حکومەتدا بە کار بێ، هەروەها لە خوێندنگا و دادگاکان دا. رێگای پێ نەدراوە کتێب و گۆڤار و رۆژنامەی پێ بڵاو بکرێتەوە. لە بەر ئەوە دەرچونی گۆڤار و رۆژنامە و کتێب بە زمانی کوردی لە ئێران، بە خۆشی‌یەکی زۆرەوە، لە لایەن ناوەندە سیاسی و رۆشنبیری‌یەکانی کوردەوە پێشوازی کراوە. بە ستایشەوە هەواڵەکەی بڵاو کراوەتەوە.

"**گەلاوێژ**"، کە لە بەغداد دەرچوە، بە بۆنەی دەرچونی "نیشتمان" ەوە لە ژمارە 9 ی ساڵی 4 ی ئەیلولی 1943 دا نوسیوێتی:

"مژدەیەکی خۆشی کتوپڕ، دڵی هەمو کوردێکی شاد کرد، هۆشی کوردایەتی پێ بزوت، "ژین" ی ژیانەوە و "گەلاوێژ" یشی پێ گەشایەوە. ئەو مژدەیە مژدەی هاتنی گۆڤاری "نیشتمان" بو... سەردێڕی بابەتەکانی ژمارەی یەکەمی بڵاو کردۆتەوە. "بۆ پیرۆزیش" وتارێکی لە ژێر سەردێڕی: "کوردستان ماڵی کوردە" سەرلەنوێ وەکو خۆی نوسیوەتەوە.

"**رۆناهی**"، کە لە بێروت دەرچوە، بە بۆنەی دەرچونی "نیشتمان" ەوە لە ژمارە 19 ی ساڵی 2 ی 1 ی ئۆکتۆبەری 1943 دا لە ژێر سەردێڕی "مزگێنی بۆ چاپی کوردی" نوسیوێتی:

"ریاسەت بێ سیاسەت گەنجە
ئەمما گەنجی بێ دەربان
سیاسەت بێ ریاسەت رەنجە
ئەمما رەنجی بێ دەرمان" حاجی قادری کۆیی

مزگێنی ئێمە بۆ چاپی کوردی، دەرچونی گۆڤاری نیشتمانە. گۆڤاری نیشتمان گۆڤارێکی کوردیە، بە تیپی عەرەبی دەرئەچێ، لە لاهیجان (مەنتیقەی موکریان– ئێران) لە لایەن گەلێک لاوی بە نرخەوە.

ئەمە ژمارەی یەکەمی نیشتمانە بە دیاری گەیشتە گەلاوێژ، هاوار و رۆناهی، تا پێکەوە دەس بکەین بە خەبات بۆ ئازادی کورد و کوردستان، لەو وەختەدا کە هەمو میللەتانی دنیا بۆ سەربەستی دەنۆڕن و دیمۆکراتی شەڕی بۆ ئەکات، نابێ ئێمەش لێی بێ بەهرە بین."

"**ژین**"، کە لە سلێمانی دەرچوە، بە بۆنەی دەرچونی "نیشتمان" ەوە، لە ژمارە 814 ی 20 ی کانونی یەکەمی 1945 دا وتارێکی پیرەمێردی لە ژێر سەردێڕی: "دەمەوبەیان" دا بڵاو کردۆتەوە، لە درێژەی وتارەکەی‌دا وتویەتی:

"…. خوا نەیکوشتم تا ئەو هیوایەم هاتە دی. وەکو تاریکەشەوێکی سارد و سەرما کە شارێکی بێ چرا ئەکێشێتە ژێر پەردەی کشوماتیەوە و دەمەوبەیان، کەناری ئاسمان بە مژدەی شەفەق رون ئەبێتەوە و، لە منارە و هەمو سەربانی مزگەوتێکەوە، دەنگ و ئاوازەی بانگی بەیانی بەرز ئەبێتەوە وا لە هەمو کوردستان دا بانگی ئازایی و وشیاری درا. ئەم هەمو گۆڤار و گوڵدەستە مەتبوعاتە پەیدا بو، وەک گوڕەی باوەگوڕگوڕ کە نەوتی رەشی گڕی گەیشتە دەریای سپی، رۆژهەڵاتی ئێمەش بە رۆژهەڵاتی هیوای گەل و تیشکی "گەلاوێژ" و"گێتی تازە" یان روناک کردەوە. گۆڤاری تازەی "نیشتمان" م دی، هەزاران ئافەرینی لێ بێ، بەو شێوە ئەدەب و ئەدەبیاتەیە پیرەمێردی جوان کردەوە."

هەر پیرەمێرد لە (ژین، ژ 816 ی 10 ی کانونی دوەمی 1946) دا بە بۆنەی دەرچونی گۆڤاری "کوردستان" ەوە لە ژێر سەردێڕی: (مژدە) دا نوسیوێتی:

"خوا لێمان نەسێنێ وا گۆڤارێکی ناوداری بە ویقار و پڕ لە گوڵدەستەی ئەشـعاری ترمـان لـە مـەهاباد دەرچو ناوی کوردستانە. ئای کوردستان چ ناوێکی بەرز و خۆشتەرزی. لـە مەعنـەوییاتی ئایینمانـا ڕوی داوە پێغەممەران زۆریان لە دەورەی پیرییەک دا کە ئیتر هیوای مێردی و نەوە پێگەیاندنیان نـەماوە خـوا ئـەولادی وای داونێ کە پێغەممەری جێنشینی خۆیان بوە. وا (ژین) ی پیرەمێردیش دوا بە دوای یەک، خوا نـەوەی لـە خۆی باشتری لێ ئەخاتەوە و، بەوە ژین ژیانی تازە ئەبێتەوە. ژین سەراپا ئەم چەند ساڵە دادخـوازی غەزەتـە و ئەدەبیاتی قەومی بوە، کە زانیویە هەر خوێندەواری و ئەدەبە میللـەتێک دەبـا بـە ڕێـوە و سـەری ئـەخا.... ئاسـارێکی کـوردی چرائێکـە... برائێکـە، تیـغ و تفـەنگ پیشـەی شـەڕ و شـۆڕە و پیـاوکوژ سـەری شـۆڕە، سەربەرزی لە ئەدەب دایە و یەکێتی‌یە کە سیلاحی دەعوایە."

### 7. 5. 5. سیماکانی قوتابخانەی ڕۆژنامەوانی‌ی موکریان

1. ڕۆژنامەوانی و حیزبایەتی پێکەوە لە دایک بون و گەشەیان کرد و پێکەوە یـش ئـاوا بـون. هـەمو بڵاوکراوەکان لە روی ڕێبازی سیاسی و ناوەرۆکی باس و بابەتەکانی لە یەک ئەچن. بە زۆری هـەمان نوسـەر و شاعیر بەرهەمەکانی لە هەمویاندا بڵاو ئەکردەوە.

2. لەم بەهاری ئازادیەدا توانا شاراوەکانی ڕۆشنبیرانی موکریان دەرکەوت و درەوشـایەوە. دەرچـونی ئەو هەمو بڵاوکراوانە لەو ماوە کورتەدا نیشانەی ئەوەیە کە توانایەکی زۆری نوسینی کوردی هەبوە.

3. لە روی زمان و شێوەی نوسین و ڕێنوس و ڕێکخستنی بابەتەکانیەوە لە ژێر تەئسیری قوتابخانەی سلێمانی و قوتابخانەی گەلاوێژدا بوە. بەڵام ئەم لایەنی سیاسی بە سەر هەمو بابەتەکانی‌دا، تەنانەت بـە سـەر شێوە و ناوەرۆکی شیعرەکانیشی‌دا، زاڵە. بە تایبەتی هەر یەکێ لـەم بڵاوکراوانـە زمـانی یـەکێ لـە ڕێکخـراوە سیاسی‌یەکانی ئەوسای موکریان بوە. بە گشتی دژی زوڵم و زۆری کۆمەڵایەتی و دژی دەرەبەگایـەتی بـون و، بانگەشەیان بۆ بیری پێشکەوتو و دیمۆکراسی کردوە. داکۆکییان لە مافی کورد و حوکمڕانی کورد کردوە.

ئەم قوتابخانەیە دەوامی نەکرد. بە ڕوخانی جمهوریـەتی مـەهاباد و ڕێگەنـەدانی قـانونی بـە نوسـینی کوردی، لە لایەن حکومەتی ئێرانەوە، ئەمیش کۆتایی هات.

## 8. گەلاوێژ: لێکۆڵینەوەی تایبەت

### 8. 1. هەلومەرجی دەرچونی

ژ 1 ی لە کانونی یەکەمی 1939 لە بەغداد دەرچوە. دوا ژمارەی لـە ئاغستۆسـی 1949 دا دەرچـوە. بە هەموی 105 ژمارەی لێ دەرچوە.

خاوەنی ئیمتیازی ئیبراهیم ئەحمەد و سەرنوسەری عەلادین سجادی بوە.

گەلاوێژ لە سەر ئاستی کوردی و عیراقی و ناوچەیی و جیهانی هاوزەمانی روداوی زۆر گرنگ بوە.

**لە سەر ئاستی جیهانی**

ئەو کاتەی یەکەمین ژمارەی دەرچوە دنیا لە بەردەم هەڵگیرسانی دوەمین جەنگی جیهانیدا بو. جـەنگ هەڵگیرسا. دنیا دابەش بو بە سەر دو ئۆردوگای جەنگدا. ساڵی 1945 کۆتایی هـات. پێـنج سـاڵی خایـان. جەنگی گەرم کۆتایی هات. بەڵام جەنگێکی تر دەستی پێ کرد، کە بە جەنگی سارد ناو ئـەبرێ. دیسـان دنیـا دابەش بو بە سەر دو ئۆردوگای جەنگدا.

**لە سەر ئاستی کوردی عیراق**

حیزبی هیوا دامەزرا. ناکۆکی تێ کەوت. پارچە پارچە بو. هەڵوەشا.

ژ. ک. لقی لە کوردستانی عیراق دامەزراند. درێژەیدا بە کار تا جمهوریەتی کوردسـتان روخـا. خـۆی هەڵوەشاندەوە و چوە ناو پارتییەوە.

شۆڕشی بارزان هەڵگیرسا. گفتوگۆی لە گەڵ حکومەتی عیراقی دەس پـێ کـرد. شـۆڕش سـەرکوتکرا. بارزانییەکان کشانەوە کوردستانی ئێران.

لقی کوردیی حیزبی شیوعی دامەزرا و ئۆرگانی بە زمانی کوردی دەرکرد.

پارتی دیمۆکراتی کورد دامەزرا.

راگەیاندنی بیستراو و راگەیاندنی نهێنی حیزبی داهات.

**لە سەر ئاستی عیراق**

شۆڕشی 1941 ی رەشید عالی دژی ئینگلیز بەرپا بو و، تێشکا.

خۆپیشاندانەکانی 1948 و گۆڕانی وەزارەت و سەرلەنوێ تێشکانی خەباتی خەڵک.




گوڤاریكي أدبی وثقافي مانگی کوردی یە

ژمارە ۱ سال ۱ كانون أول ۹۳۹

خوێندەوارانی خوشەویست!

خوم گەلی بە بەختیار ئەزانم کە ، بە یارمەتی گەورە ودوست وبرادەران ، یەکەم ژمارەی « گەلاوێژ » تان پیشکەش ئەکەم وهیوایەکي زوریشم هەیە کە ئێوە هەر بەدلی خوشەوە لێی وەرگرن، هەریەکەشتان بەپێی توانا ولە سنووری دەسەلاتی خوتانا یارمەتیم بدەن لە بلاوکردنەوە وژیاندن وپێشخستنی دا تا ئەی گەیێنینە ریزی گوڤارە هەرەچاکەکانی ولاتان . چونکە بێ گومان ئەو هوش ولێکدانەوە وپێزانینەی منی خستوتە سەر دەر هێنانی ئەم گوڤارە لەدلی ئێوەدا گەلی گەرم وبەتین ترە، هیچ گومان نابەم کەهەمووتان وەکو من سەرشور ئەکەن وشەرمەزار ئەبن کەبەربکەوت یابەپرسیاری بیگانەیەك یەتەوە بیرتان کەلەسەردەمی رووناکی وخوێندن وزانینا ، لەم پلە بەرزەدا کەشارستانیتی گەیشتویەتی لەروی زەمینا گوڤاریکی کوردی نیە !

نەکەس لە بری ئەبێ بە کورری ، نە ئێمەش بە گەورەیی وپوشتەیی وخوێندەواری لە دایك بوین ، هەموشتی سەرەتا ودەست پێ کردنیکی

**8. 2. دەرچونی**

ئیبراهیم ئەحمەد چیرۆکی دەرکردنی گەلاوێژی بۆ گەلاوێژی نوێ، ژمارە 4، ساڵی یەکەم، تشرینی دوەمی 1997، ل6- 19، لە ژێر ناوی (لێکۆڵینەوە، گەلاوێژی دێرین، چۆن هەڵهات؟) دا نوسیوەتەوە. بۆ زانیاری پێویست سەبارەت بە چۆنێتی دەرچونی گەلاوێژ، خوێنەر ئەتوانێ بگەڕێتەوە بۆ ئەو سەرچاوەیە.

**8. 3. داخرانی**

دوای ئەوەی نوری سەعید دانرایەوە بە سەروەزیری عیراق ئەو نەختە ئازادیە سیاسییەی لە ئەنجامی راپەڕینی ساڵی 1948 دا خەڵک بە دەستی هێنابو، سەنرایەوە. ساڵی 1949 ئیجازەی حیزبەکانی وەرگرتەوە. هێرشێکی بەربڵاوی بۆ سەر چالاکەکانی بواری ژیانی سیاسی هەمو حیزب و رێکخراوە ئاشکرا و نهێنییەکان دەس پێ کرد و دانی بە دادگا. ژمارەیەکی زۆر گۆڤار و رۆژنامەی داخست.

ئەم هێرشە کوردیشی گرتەوە.

لە ناو ئەوانەدا کە بەر گرتن کەوتن و دران بە دادگا و حوکم دران، ئیبراهیم ئەحمەد بو. ئیبراهیم ئەحمەد ئەو دەم پارێزەر و، بەرپرسی لقی سلێمانی پارتی دیمۆکراتی کورد بو.

لە ناو ئەو گۆڤارانە یشدا کە بەر داخستن کەوتن و ئیمتیازەکانیان لێ سەنرایەوە هەردو گۆڤاری کوردی "گەلاوێژ" و عەرەبی- کوردی "نزار" بو.

**8. 4. نوسەرەکانی**

ئەمین زەکی، تۆفیق وەهبی، رەفیق حیلمی، رەشید نەجیب، شاکیر فەتاح، شێخ محەمەدی خاڵ، پیرەمێرد، فایەق هوشیار، قادر قەزاز، رەمزی قەزاز، حامید فەرەج، حسێن حوزنی، عەبدوڵا جەوهەر، جەمال خەفاف، حەسەن فەهمی جاف.

م. مەحمود (شەهید محەمەد قودسی) چەند وتارێکی تێدا نوسیوە.

لە ئێران، یەدوڵای رەزائی کەڵهوڕ، ناسری ئازادپور، ئیبراهیمی نادری، دڵشادی رەسولی، سەید تاهیری هاشمی.

**8. 5. سەرچاوەی دەرامەتی**

سەرچاوەی دەرامەتی بریتی بوە لە ئابونەی ئەندامەکانی و یارمەتی عەلی کەمال بەگ.

**8. 6. بڵاوبونەوەی**

لە عیراقدا لە سنورێکی فراواندا بڵاو بۆتەوە. یەکەم، خۆی چەند سەد ئابونەیەکی هەبوە کە بە پۆستە بەردەوام بۆیان ناردون. دوەم، لە زۆری شارەکانی کوردستاندا باوەڕپێکراوی هەبوە، مانگانە گۆڤارەکەیان بۆ فرۆشتنی گشتی بۆ چوە.

وەکو لە پشتی هەندێ ژمارەیدا نوسراوە، جگە لە کوردستانی عیراق، لە تاران و کرماشان و سنە یش باوەڕپێکراوی هەبوە.

گەلاوێژ گەیشتۆتە سوریا و لوبنان یش.

### 8. 7. بابەتەکانی

بەراوردکردنی گۆشـەکانی ژمارەکـانی یەکـەمین سـاڵی، لـە گـەڵ گۆشـەکانی ژمارەکـانی نۆهـەمین و دەهەمین ساڵی دەری ئەخەن، کە نەک گـۆڕینی بنـەڕەتی یـا تەنانـەت گـۆڕین لـە جـۆری دابەشـکردنی بابەتەکانیدا نەبوە، بەڵکو زۆری گۆشەکانی بە درێژایی ئـەو سـاڵانە بـە زیندویـەتی ماونەتـەوە. ئەگـەر گۆڕانێ بوبێ لە کلێشەی بابەتەکەدا بوە، یان گۆشەیەکی نوێ زیادی کـردوە. ئەمـەیش نیشـانەی ئەوەیـە کـە دەرهێنـەرانی گـەلاوێژ هـەر لـە سـەرەتاوە بەرنامەیـەکی ڕێکوپێکیـان بـۆ ناوەرۆکەکـەی و جـۆری دابەشکردنی بابەتەکانی داڕشتوە.

گۆشە هەمیشەییەکانی بریتی بون لە: دیوانی گەلاوێژ، چیرۆکی ئەمجارە، کـوردانی بـەناوبانگ. کـورد لای بێگانە، لە هەر باخێ گوڵێک، ئەوانەی نامرن...

یەکێ لەو گۆشانەی لە ساڵەکانی دواییدا زیادی کردوە، گۆشەی مۆسیقا بوە.

### 8. 7. 1. دیوانی گەلاوێژ

لە گۆشەی دیواندا شیعری ئەم شاعیرانە بڵاو کراوەتەوە:

گۆران، بێکەس، فایەق زێوەر، شێخ سەلام، قانع، موفتی پێنجوینی، ع. ح. ب، دڵـدار، بلـە، شـێخ نـوری، هەژار، هێمن، لاوی بادینی.

پیرەمێرد، زێوەر، بێخود، عەلی کەمالی باپیر، ئەحمەد شاکەلی، سـەید تـاهیری هاشـمی، سـەفوەت، مـەلا محەمەدی چروستانی.

نالی، کوردی، سالم، ئەحمەدی خانی، مەلای جزیری، مەولەوی، بێسارانی، سەیدی هەورامی.

بە بۆنەی تێپەڕینی ساڵێک بە سەر دەرچونیدا لە ناملکەیەکی تایبەتیدا شیعرە مێژوییـە درێژەکـەی سالمی بڵاو کردۆتەوە.

### 8. 7. 2. چیرۆکی ئەمجارە

دوا لاپەڕەکانی تەرخان کردوە بۆ چیرۆک. لە یەکەم ژمارەیەوە تا داخستنی، هەمو ژمارەیەکی لـە ژێـر ناوی (چیرۆکی مانگ) یان (چیرۆکی ئەم مانگە) یان (چیرۆکی ئەمجارە) چیرۆکێکی بڵاو کردۆتەوە.

لە ژ 1 ی س 1 دا ئەحمەد عەزیز (کورێکی ئازا) و، س. ئەمین زەکـی بـەگ لـە ژ 2 دا (شـێرەژن) و، حامید فەرەج لە ژ 3 دا (گەردانە) و، لە ژ 5– 6 دا (شەهادەتنامەیەک) و لە ژ 8 دا (دوارۆژی کلیۆپاترە) و، لـە ژ 4 دا ع. ع (داستانی کچێک) و، بە بێ ئیمزا لە ژ 7 دا (لیرەیەک) و لە ژ 9 دا (فێڵی ژنێک) و، ع قـەزاز لـە ژ 10 و 11– 12 دا چیرۆکێکی کەی بڵاو کردۆتەوە.

ئیبراهیم ئەحمەد، چالاکترین نوسەری گۆشەی (چیرۆکی ئەم جارە) بوە. بە چەندین نـاوی جیـاوازەوە وەکو: هـ. ل. ب (کە هەڵگەڕاوەی حەرفەکانی بلە یـە) و، ن. أ. چیرۆکـەکانی بـڵاو کردۆتـەوە. دەیـان کورتـە چیرۆکی لە زمانی ئینگلیزییەوە کردۆتـە کـوردی. خۆیشـی چەنـد کورتـە چیرۆکێکـی نوسـیوە. نـاوەرۆکی چیرۆکەکانی خۆی باسـی زوڵمـی کۆمەڵایـەتی و چینایـەتی و بۆگـەنی ڕیژیمـی بەڕێوەبەرایـەتی، ئـابوری، کۆمەڵایەتی وڵات ئەکا. (ئەم چیرۆکانـە بـە کـۆکراوەیی چـاپ کراونەتـەوە: ئیبـراهیم ئەحمـەد، کـوێرەوەری، چاپخانەی نەجاح، بەغداد، 1959)

عەلادین سوجادی یش چەند چیرۆکێکی نوسیوە و بڵاو کردۆتـەوە. (ئـەم چیرۆکانـە بـە کـۆکراوەیی چاپ کراونەتەوە: عەلادین سجادی، هەمیشە بەهار، چاپخانەی مەعارف، بەغداد)

چەند کەسی تر بە چیرۆک بەشدار بون لەوانە: شێخ سەلام، فایەقی کاکەمین و مستەفا سائیب.

### 8. 7. 3. کورد لای بێگانە

فرامرز (ڕەشید نەجیب) بە زنجیرە لە ژ 1 تا 8 و ژ 10 و 11– 12 دا (گەشتێ لە کوردستانا)

بابا عەلی بابەتی (کوردستان) ی لە (ئینسیکلۆپیدیا بریتانیکا) وە وەرگێڕاوە، لە ژ 5 – 6 و 10 دا بڵاوی کردۆتەوە. هەروەها لە نوسینی سۆن (کورد و وڵاتەکەیان) لە ژ 11 – 12 دا بڵاو کراوەتەوە.

لەم گۆشەیەدا نوسینی هەندێ لەو گەڕیدانەی هاتونەتە کوردستان و، لێکۆڵینەوەی هەندێکیان لە سەر کورد، کراوە بە کوردی.

ناجی عەباس، لە ژ 5 ی مایس و، ژ 6 ی حوزەیران و، ژ 7 ی تەموز و، ژ 8 ی ئاب و، ژ 9 ی ئەیلولی 1944 دا، لێکۆڵینەوەکەی مینۆرسکی لە سەر (گۆران) ی لە ئینگلیزیەوە کردوە بە کوردی و بڵاوی کردۆتەوە.

ناجی عەباس، (گەشتێ لە کوردستان هەشتا ساڵ لەمەوبەر) کە بەشێکە لە گەشتەکەی فریدریک میلینگن، لە ژ 5 ی مایس و، ژ 6 ی حوزەیران و، ژ 7 ی تەموز و، ژ 8 ی ئاب و، ژ 9 ی ئەیلول و، ژ 10 ی تشرینی یەکەم و، ژ 11 ی تشرینی دوەمی 1945 و، ژ 12 ی کانونی دوەمی 1945 دا (ئەبێ هەڵەی چاپ بێ. نم)، بڵاو کردۆتەوە.

ناجی عەباس، (گەشتی کلۆدیۆس ریچ لە کوردستان)، لە ژ 8 ی ئاب و، ژ 9 – 10 ی ئەیلول و تشرینی یەکەم و، ژ 11 ی تشرینی دوەمی 1947 دا بڵاو کردۆتەوە.

قادر خەفاف، لە ژ 5 ی مایس و، ژ 6 ی حوزەیران و، ژ 7 ی تەموز و، ژ 8 ی ئاب و، ژ 10 ی تشرینی یەکەمی 1946 دا (بەغدای ڕۆژانی رابوردو) کە بەشێکە لە گەشتەکەی ریچ، بڵاو کردۆتەوە.

هەر قادر خەفاف، لە ژ 4 ی نیسان و، ژ 5 ی مایس و، ژ 6 ی حوزەیران و، ژ 7 ی تەموزی 1945 دا (کتێبەکەی مێجەر سۆن بە کورتی) وەرگێڕاوە و، لە ژ 9 ی ئەیلولی 1945 دا بیرورای خۆی (بە دوای کتێبەکەی مێجەر سۆندا) نوسیوە.

گەلاوێژ، ئەو بەشەی دەربارەی کوردە لە کتێبی (کەمینەکانی جیهانی عەرەب) ی ئەلبێرت حۆرانی وەرگێڕاوە. لە ژ 1 ی کانونی دوەم و، ژ 2 ی شوبات و، ژ 3 ی مارتی 1948 دا، بڵاوی کردۆتەوە.

کورد لای بێگانە، عبدالرحمن عزام، ژ 11، تشرینی دوەمی 1943.

کوردستان، لە اخبار الحرب وەرگیراوە، ژ 3، مارتی 1944.

ع حیشمەت (مەسەلەی کورد) ی ئیلفستون

ئەمین زەکی لە ساڵی یەکەمیدا لە ژێر ناوی کوردانی بە ناوبانگدا لە ژ 1 دا (سوڵتان سەلاحەدینی ئەیوبی) و لە ژ 2 دا (میر محەمەد پاشا) و لە ژ 3 و 4 دا (ئەمیر خانی برادۆست) و لە ژ 4 دا (لە قەبرستانی تاریخا- ئەحمەدی زوحاک) و لە ژ 5 – 6 دا (مەلیک عادل سەیفەدین ئەبوبەکر محەمەد) و لە ژ 7 دا (باباتاهیر) و لە ژ 8 دا (مەلیک ئەفزەل) و لە ژ 9 دا (مەلیک ناسر سەلاحەدین) و لە ژ 11– 12 دا (ئەبولفیدا) ی بڵاو کردۆتەوە.

### 8. 7. 4. جوغرافیای کوردستان

مستەفا نیعمەتوڵا، کە مامۆستای جوغرافیا بوە، بە زنجیرە لە ژ 9 تا 12 ی 1941 و، لە ژ 1 تا 12 ی 1942 و، لە ژ 1 و 3 و 5 و 9 ی 1943 دا (جوغرافیای کوردستانی عیراق) ی نوسیوە.

### 8. 7. 5. ڕەخنەی ئەدەبی

ڕەفیق حیلمی، بەرگی یەکەمی شیعر و ئەدەبیاتی کوردی بـە کتێبێکـی سـەربەخۆ بـڵاو کردبـوەوە. لـە گەلاوێژدا بە زنجیرە چەند بەشێکی لە بـەرگی دوەمـی کتێبەکـەی بـڵاو کردۆتـەوە. لـە سـەر سـالم و دڵـداری نوسیوە. پرۆگرامی لێکۆڵینەوەکەی لەم بەشەدا، لە چاو بەرگی یەکەمیدا، پێشکەوتنی زۆرتری پێـوە دیـارە. لـە گەڵ ئەوە یشدا بە هۆی هەڵبژاردنی هەندێ لە شاعیرەکانیەوە کەوتۆتە بەر ڕەخنەی هەندێ لە خوێندەواران.

یەکێ لە سەر دڵدار ڕەخنەی لێ گرتوە. دڵدار خۆی وەڵامێکی خۆشی داوەتەوە.

بێکەس مشتومڕێکی ڕەخنەیی دروست کردوە. چەند ڕەخنەیەکی نوسیوە لە أ. ب. هەوری و م. ئـەمین مەنگوڕی، شیعرەکانی هەڵسەنگاندون. ئەوانیش وەڵامیان داوەتەوە.

دڵدار لە سەر خەیامی نوسیوە.

سەید تاهیری هاشمی لە سەر بێسارانی.

گەلاوێژ خۆی چەند وتارێکی لە سەر ئەدەب، لە ئینگلیزییەوە وەرگرتوە.

### 8. 7. 6. ژیننامە

گـەلاوێژ ژیننامـەی کۆمـەڵێ لـە نوسـەر و شـاعیر و گـەورەپیاوانی کـوردی هاوچـەرخی خـۆی بـڵاو کردۆتەوە. هەندێکیان هێشتا خۆیان لە ژیاندا بون. هەندێکیشیان بە بۆنەی کۆچی دواییانەوە.

لەوانەی هێشتا لە ژیاندا بون:

لە ژ 6 ی حوزەیرانی 1943 دا (محەمەد ئەمین زەکی بەگ) و، لە ژ 7 ی تەموزی 1943 دا (کـوردی بەناوبانگ، عەلی کەمال بەگ) و، لە ژ 8 ی ئاغستۆسـی 1943 دا (ئـەدیبی بـە ناوبـانگی کـورد پیرەمێـرد). هەروەها (کامەران بەدرخان).

بە بۆنەی کۆچی دواییانەوە:

لە ژ 11 ی تشرینی دوەمی 1944 دا (تەرجومەی ژیانی مامۆستا مەلا محەمەدی کـۆیی) و، لـە ژ 3 ی مارتی 1945 دا (ئەدیبی بە ناوبانگی کوردساڵح زەکی بەگی ساحێبقران) و،

لە ژ 9– 10 ی ئەیلول و تشرینی یەکەمی 1947 دا بۆ کۆچی دوایی حوزنی موکریانی (ماتەم) و،

لە ژ 7 ی تـەموزی 1948 دا (ئـەمین زەکـی کـۆچی کـرد) و، (شـیوەنی ئـەمین زەکـی) لـە نوسـینی پیرەمێرد و، (ئەمین زەکی) لە نوسینی ڕەشید نەجیب.

لە ژ 1 ی کانونی دوەمی 1949 دا ژیننامەی (زێوەر) و،

لە ژ 2 ی شوباتی 1949 دا (یەک لە دوای یەک ئاوابونی چوار ئەستێرە لـە ئاسـمانی کوردسـتاندا) کە باسی مردنی ئەمین زەکی و زێوەر و دڵدار و ژیاننامەی دڵدارە.

### 8. 7. 7. بابەتی سیاسی

گەلاوێژ گۆڤارێکی سیاسی نەبوە. بـەڵام چەنـد جـارێ بابـەتی سیاسـی بـە وتـار و بـە شـیعر بـڵاو کردۆتەوە.

یەکێ لەو بابەتە گرنگانە وتارێکی عەلی کەمال بەگە لە سەر (کورد و یەکیـەتی عـەرەب، ژ 12، کـانونی یەکەمی 1943). چەند پێشنیارێکی کردوە بۆ ڕێکخستنی پێوەنـدی نێـوان ئـەم دو گەلـە. دوایـی لـە یافـاوە ڕەفیق چالاک، کورد و یەکیەتی عەرەب، ژ 4، نیسانی 1944، لە سەری نوسیوە.

عەلی کەمال، ئیسلاحات لە کوردستانا، ژ 7، تەموزی 1944.

یەکێکی کە لەو بابەتانەی گەلاوێژ لە سەری نوسیوە خۆپیشـاندانەکانی سـاڵی 1948 بـوە. پۆسـتەی کوردەواری، ژ 3، مارتی 1948.

جگە لەم دو ڕوداوە عیراقییە زنجیرەیەک وتاری لە سەر خەباتی گەلی چین بڵاو کردۆتەوە.

ڕەشید غەفور، کورد و فەلەستین، ژ 11، تشرینی دوەمی 1947.

چەند شیعرێکی سیاسی بڵاو کردۆتەوە، لەوانە:

(یاران) ی ئیبراهیم ئەحمەد بە بۆنەی لە سێدارەدانی قازی محەمەدەوە.

(قەومی کورد) و (داری ئازادی) ی بێکەس. یەکەمیان، بە بۆنەی لە سێدارەدانی 4 ئەفسەرەکەوە لـە 19 ی حوزەیرانی 1947 دا و دوەمیان، بە بۆنەی ڕاپەرینی 1948 ەوە.

(ئەی نائومێدی) ی پیرەمێرد بە بۆنەی ڕوخانی جمهوریەتی کوردستانەوە.

### 8. 7. 8. بابەتی پزیشکی

د. ئەورەحمان عەبدوڵا لە چەند ژمارەدا لە سەر چەندین نەخۆشی نوسیوە. ئـەم وتارانـە جگـە لـەوەی کەڵکێکی زۆری هەبوە بۆ ئاشناکردنی خوێندەواری کورد بەو نەخۆشییانە، نرخێکی زمانەوانی گەورە یشـی هەبوە. چونکە هەوڵی داوە ناوە باوە کوردییەکانی نەخۆشییەکان بدۆزێتەوە و لە گەڵ ناوە زانستییەکانیان بەرامبەریان بکا.

د. ت. ب. مەریوانی یش لە ئەمەریکاوە بەشداری ئەم هەوڵە بوە.

دکتۆر ت. ب. مەریوانی، علوم لە کوردستاندا، ژ 8، ئابی 1949.

### 8. 7. 9. بابەتی کۆمەڵایەتی و ئاینی

شێخ محەمەدی خاڵ، کۆمەڵێ وتاری کۆمەڵایەتی بە ناونیشانی کۆشی دایک نوسیوە.

لە ژ 2 ی شوباتی 1945 دا لە سەر (شێخەوڵای خەرپانی) و، لە ژ 2 ی شـوباتی 1947 دا لـە سـەر (پێغەمبەر) و، لە ژ 8 ی ئابی 1949 دا لە سـەر (مـوفتی زەهـاوی) و، بـە زنجیـرە تەفسـیری قورئـانی بـڵاو کردۆتەوە. لە ساڵانی دواییدا تەفسیری خاڵ بە چەند بەرگ چاپ کراوە.

### 8. 7. 10. زانیاری گشتی

حسێن حوزنی، ئەرمەن وەتـەنی قـەومییان چـۆن دروسـت کـرد، ژ 1 ی کـانونی دوەمـی 1944 و ژ 3 ی مارتی 1944. جەمالەدینی ئەوغانی، ب 1: ژ 10، تشرینی یەکەمی 1944. ب 2: ژ 1، کانونی یەکەمی 1945.

فایەق هوشیار، موحاکەمەی لویسی شازدەهەم، ژ 9، ئەیلولی 1945. ژ 11، تشـرینی دوەمـی 1945. ژ 12، کانونی یەکەمی 1945.

### 8. 7. 11. وەرگێڕان

گەلاوێژ بایەخێکی تایبەتی داوە بە وەرگێڕان. بەر لە گەلاوێژ هەنـدێ لـە گۆڤـار و ڕۆژنامـەکان بـاس و بابەت و شیعریان لە زمانەکانی ترەوە وەرگێڕاوە. بەڵام وەرگێڕان بۆ ئەم، بەشێ بوە لە ڕێبـازی گۆڤارەکـە. بابەتی جۆراوجۆری لە زمانەکانی ترەوە، بە تایبەتی لە زمانی ئینگلیزییەوە وەرگێڕاوە. لـە گـەلاوێژدا دەیـان چیرۆک، وتار، لێکۆڵینەوە، نوسینی خۆرئاواییەکان لە سەر کورد، بابەتی زانستی.. بڵاو کراونەتەوە. ڕەنگـە هیچ ژمارەیەکی نەبێ بابەتێ یان چەند بابەتێکی تەرجومە کراوی تێدا نەبێ.

ئەمە بۆ ئەو ڕۆژگارە کە کتێبخانەی کوردی زۆر هەژار بوە، سەرچاوەیەکی گرنگی دەوڵەمەن کردنی گەنجینەی زانیاریی گشتی خوێندەواری کورد بوە.

**8. 7. 12. بۆ پێکەنین، قسەی نەستەق، پەندی پێشینان**

کورد لە روسیە، ژ 6، حوزەیرانی 1944.

کورد لە وڵاتی کەلات دا، ژ 6، حوزەیرانی 1948.

کوردی عیراق، وەرگیراوە، ژ 5، مایسی 1948.

کوردی عیراق، مجید سەعید وەری گێڕاوە، ژ 7، تەموزی 1945. ژ 8، ئابی 1945، ژ 10، تشرینی یەکەمی 1945.

**8. 7. 13. گەلاوێژ و پیرەمێرد**

پیرەمێرد خاوەنی ژین، هەر لە سەرەتاوە بە خۆشی‌یەوە پێشوازی لە گەلاوێژ کردوە. یەکێ لە شیعرە نایابەکانی کردۆتە دیاری بۆ یەکەمین ژمارەی. هەم لە ژین و هەم لە گەلاوێژدا بڵاوی کردۆتەوە. بە بۆنەی داخستنی یشیەوە شیوەنێکی بە سۆزی بۆ نوسیوە.

بەشداریەکانی پیرەمێرد چەند جۆرێکە:

بە شیعر.

بە پەخشانی ئەدەبی.

بە بالۆرەی ساڵانە.

بە پشتیوانی کردنی لە رۆژنامەی ژین دا.

**8. 7. 14. بابەتی مێژویی**

**ساڵح قەفتان:**

لە ژ 1– 2 ی کانونی دوەم و شوباتی 1941 دا (کۆچ و رەوی ئەقوامی کۆن تاریخی هێناوەتە کایەوە)،

لە ژ 5– 6 ی مایس و حوزەیرانی 1942 دا (نەزەریەی پەیدا بونی ئەقوامی هندو ئەوروپایی)،

لە ژ 11– 12 ی تشرینی دوەم و کانونی یەکەمی 1942 دا (لە بابەت پەیابونی نەتەوەی قەفقاسی و ئاریەوە)،

لە ژ 5 ی مایسی 1943 دا (بە پەیا بونی ئاینی ئیسلام بۆچ کەیانی ئاریی کۆن روخا؟)

ساڵح قەفتان، پەروەردەکار و لە مامۆستا کۆنەکانی سلێمانی بوە. دەرسی مێژوی وتۆتەوە. ساڵانی 1937– 1941 (موحەریری) حەفتەنامەی زبان بوە، کە شارەوانی سلێمانی دەری کردوە. چەندین وتار و بابەتی مێژویی نوسیوە، لەوانە:

بەراوردێکی تاریخی، سلێمانی، 1936.

پەندی تاریخی، بەغداد، 1937.

نەتەوەی کورد تورکومان نین، سلێمانی، 1959.

گرنگترینی کتێبەکانی: مێژوی نەتەوەی کورد، حاڵەتی سیاسی، مێژویی، ئاوەدانیی گەلی کورد لە سەرەتای مێژوەوە، بەغداد، 1969.

**حەسەن فەهمی جاف**، لە سەر شاهەکانی زەند:

لە ژ 10 ی تشرینی یەکەمی 1943 دا (کەریم خانی زەند)،

لە ژ 1 ی کانونی دوەمی 1944 دا (لوتفعەلی خانی زەند)،

لە ژ 4 ی نیسانی 1945 دا (عەلی موراد خانی زەند) ی نوسیوە و،

لە ژ 7 ی تەموزی 1943 د (شازادەی بتلیس)،

لە ژ 8 ی ئابی 1944 دا (چەن وتارێکی بە نرخی پیاوە گەورەکانی تاریخ)،

لە ژ 12 ی کانونی یەکەمی 1944 دا (مێژوی خولمار) ی بڵاو کردۆتەوە.

حەسەن فەهمی، دوای ئەوەیش درێژەی بە بەرهەمی مێژویی داوە لەوانــە: گەڕانــەوەی دەهــەزار یۆنـانی و پاڵەوانی زەند.

**گەلاوێژ:**

لە سولەیمانی بۆ هەڵەبجە، ژ 9– 10، ئەیلول– تشرینی یەکەمی 1947.

لە هەولێر، ژ 11، تشرینی دوەمی 1947.

**گەلاوێژ** لە کتێبەکەی ئەمین زەکیەوە، سـەلاحەدین و ئـەهلی خـاچی تەرجومـە کـردوە و لـەم ژمارانـەدا بڵاوی کردۆتەوە:

ژ 6، حوزەیرانی 1949،

ژ 7، تەموزی 1949،

ژ 8، ئابی 1949.

**گەلاوێژ:**

جەژنی نەورۆژ، ژ 4، نیسانی 1945.

جەژنی نەورۆژ، ژ 4، نیسانی 1946.

جەژنی نەورۆژ، ژ 4، نیسانی 1947.

**یەدوڵا ڕەزائی کەڵهوڕ**، لە ئێرانەوە (وە زوان کوردی کەڵهوڕ) بەشداری نوسینی کردوە:

لە ژ 4 ی نیسانی 1944 دا (سەرەنجامی پادشایە سەفاریەیل)،

لە ژ 11 ی تشرینی دوەمی 1944 دا (پەڕەیەک لە تاریخی کەڵهوڕ).

**بەکر بلێر:**

لە ژ 8، ئابی 1949 دا (نەژادی کورد) ی تەرجومە و بڵاو کردۆتەوە،

لە ژ 5، مایسی 1949 (یەکەم فەرماندەی گۆتی لە بابل).

**ئەحمەد خواجا**، (دەشتی قەراج)، ژ 12، کانونی یەکەمی 1948.

**ئیبراهیم نادری**، سەرەنجامی عەلی موراد خانی بەختیاری، ژ 4، نیسانی 1944.

**ب. ع. ی**، شیکاری مێژویی، ژ 12، کانونی یەکەمی 1943.

بابەعەلی لە ئینگلیزیەوە کردویە بە کوردی (بیرکردنەوە لە کورد) ژ 11، تشرینی دوەمی 1944.

**پشکۆ**، کورد لە ئینسیکلۆپیدیای تورکیدا، ژ 2، شوباتی 1944.

**محەمەد ئەمین زەکی**، نەورۆز، ژ 1، کانونی دوەمی 1943.

**پیرەمێرد**، نەورۆز، ژ 3، مارتی 1943.

**ناجی عـەباس**، لـە ژ 1– 2 ی کـانونی دوەم و شـوباتی 1941 دا (لاپەڕەیـەکی زێـڕین لـە تـاریخی ئەربیل) ی نوسیوە.

**عەبدولسەمەد محەمەد**، مێژوی جوڵانـەوەی ژنـان لـە سـەدەی (عەسـری) تـازەدا، ژ 9– 10، ئـەیلول– تشرینی یەکەمی 1942.

**قادر قەزاز** تەرجومەی کردوە لە لۆرانس راین. وتارێک لە بارەی تاریخی گۆڤار و رۆژنامەی کوردیەوە، ژ 4، نیسانی 1945.

**گۆڤان**. جەلالی. ژ 2، شوباتی 1945.

## 15.7.8. لێکۆڵینەوە لە زمانی کوردی

**تۆفیق وەهبی**، بە 4 بەش بابەتی (بنج و بناوانی زمانی کوردی لە توێکڵە گوێزێکدا) ی لـەم ژمارانـەدا بڵاو کردۆتەوە:

بەشی یەکەم: ژ 3، مارتی 1943.

بەشی دوەم: ژ 4، نیسانی 1943.

بەشی سێیەم: ژ 5، مایسی ژ943.

بەشی چوارەم: ژ 7، تەموزی 1943.

هەر **تۆفیق وەهبی** لەم ژمارانەدا ئەم بابەتانە یشی بڵاو کردۆتەوە:

لە ژ 1 ی س 1 ەوە دەستی کردوە بە بڵاوکردنەوەی (زنجیرەیە وتار لە بابەت زمانی کوردیەوە)،

لە ژ 2 دا (بڵاوەکردنی ئاریەکان بۆ ئەوروپا و ئاسیا)،

لە ژ 3 دا (کورد عەشیرەتێکی ماد بو)،

لە ژ 4 دا (گوم بونی ناوی ماد)،

لە ژ 5– 6 دا (کرمانج لە "کوردمانج"ەوە نەهاتوە)،

لە ژ 7 دا (اشتقاق و مانای کرمانج)،

لە ژ 8 دا (لە ناوچونی مادەکان کردەوەیەکی دین بو)،

لە ژ 9 دا (بنج و بناوانی زمانی کوردی)،

لە ژ 11– 12 دا (دینی جارانی کورد).

**محەمەد ئەمین زەکی**:

زمانی کوردی، ژ 3، مارتی 1943.

**چرۆ**، چەند کورد گەلاوێژ دەخوێننەوە، ژ 6، حوزەیرانی 1944.

**ف. ر**، تەیموری لەنگی ترسێنەر، ژ 10، تشرینی یەکەمی 1945.

**ن. أ**. لە ئینگلیزیەوە وەری گێڕاوە، جەنگیز خان، ژ 5، مایسی 1943 و ژ 6، حوزەیرانی 1943.

**رەسافی**، ژ 4، نیسانی 1945.

ع. **و. نوری**، ژان ژاک رۆسۆ، ژ 7، تەموزی 944.

**فایق هوشیار**، لەنین، ژ 5 – 6، مایس و حوزەیرانی 1942.

**گەلاوێژ**، ودرۆ ویلسن، ژ 9، ئەیلولی 1945.

**دڵسۆز**، تا گربداغ چوین، ژ 9 – 10، ئەیلول و تشرینی یەکەمی 1947.

نەوتی عیراق لە بیرەوە تا دەریا، ژ 6، حوزەیرانی 1947.

**زێوەر**، شارێکی کوردستان، ژ 6، حوزەیرانی 1944.

**رەفیق چالاک**، مشتێک خۆڵ، ژ 9، ئەیلولی 1944.

**8. 7. 16. بابەتی تیۆری**

**ساڵح حەیدەری**، لە ژ 5 ی مایسی 1944 دا (نیشتمانپەوەری چۆن پەیدا بو؟).

**محەمەد تۆفیق**، لە ژ 6 ی حوزەیرانی 1944 دا (خێزان (عائیلە) چۆن پەید بوە؟).

**عەونی یوسف:**

لە ژ 8 ی ئاب و،

لە ژ 9 ی ئەیلولی 1944 و،

لە ژ 2 ی شوباتی 1945 دا (لە دەرەبەگێتیەوە بۆ دەسمایەداری) بڵاو کردۆتەوە. ئەم بابەتەی لە ئینگلیزیەوە کردوە بە کوردی.

**فایەق هوشیار** چەندین بابەتی لە سەر دیمۆکراتی و هەڵبژاردن نوسیوە.

**8. 7. 17. کوردانی بە ناوبانگ**

**ئەمین زەکی بەگ** لە ژێر ئەم ناوەدا چەندین کەسایەتی نەناسراوی مێژوی کوردی بە ناسین داوە. باسەکانی پشت ئەستور بە سەرچاوەی مێژویی باوەڕپێکراو نوسیوە. ئەم وتارانە بون بە کەرەستەی کتێبێکی مێژویی کە سانیحەی کچی کردونی بە عەرەبی و بە ناوی (مشاهیر الکرد و...) لە بەغداد بە دو بەرگ چاپ کراون.

گەلاوێژ، لە ژ 5 ی مایسی 1947 دا ئەم کتێبەی هەڵسەنگاندوە.

جگە لە ئەمین زەکی، چەند نوسەری کە لەم گۆشەیەدا، یان بە بێ ئەم ناونیشانە لە سەر ناودارانی کوردیان نوسیوە.

**ن. ئازا**: هەڵۆ خان لە ژ 6، حوزەیرانی 1945، ل 25 – 28.

**ن. ئازاد**، ناسری ئازادپور، مێژوی ئەردەلانی مەستورەی چاپ کردوە و، هەندێ نوسینی فارسی لە کوهستاندا هەیە.

**محەمەد ئەمین کاردۆخی**:

لە ژ 12، کانونی یەکەمی 1944 دا (خەسرەو خانی والی) و،

لە ژ 5- 6، مایس و حوزەیرانی 1942 دا (ژنە کوردی بە ناوبانگ مەستورە) ی بڵاو کردۆتەوە. کاردۆخی ئەم بابەتانەی لە دەسنوسی کتێبی حدیقە امان اللهی وەرگێڕاوە کە دواتر خیامپور لە ئێران چاپی کردوە.

**محەمەد قەرەداخی**، شێخ تەقیەدینی شارەزوری، ژ 11، تشرینی دوەمی 1943. **مەحمود خاوەر**، ژ 11– 12، تشرینی دوەم و کانونی یەکەمی 1942.

**عەبدولموحسین هوشیار** لە سەر مەولانا خالیدی شارەزوری نوسیوە و لەم ژمارانەدا بڵاوی کردۆتەوە:

ژ 3– 4، مارت و نیسانی 1942 و

ژ 5– 6، مایس و حوزەیرانی 1942.

# Picking Flowers Along the Way

## The Kurdish Press Schools and the Age of Writing and Reviews

Nawshirwan Mustafa Amin

Volume 2

Book 2



ISBN 978-614-01-1020-5









الدار العربية للعلوم ناشرون
Arab Scientific Publishers, Inc.
www.asp.com.lb - www.aspbooks.com